

چاپی دووەم

بەرگی یەکەم و دووەم

# شازادەی حەمام

بیرەوەرییەکانی دکتۆر محەمەد حوسێن پاپۆلی یەزدی

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

تەها عەبدوڵڵا فەرەج/ سێکانیانی

پێداچوونەوە و داڕشتنەوەی

ساڵح بێچار





# شازادەی حه مام

هەڵبژاردەیەک لە بەرگی یەکەم و دووەمی
بیرەوەرییەکانی


## محه مه د حسين

## پاپولی يه زدی


وەرگێرانی لە فارسییەوە:

تەها سێکانیانی

پێداچوونەوە و دارشتنەوەی:

ساڵح بێچار


٢٠٢٣

سلیمانی

ناوی کتێب: شازادەی حەمام
نووسینی: محەمەد حسێن پاپولی یەزدی
بابەت: بیرەوەریی
وەرگێرانی: تەها سێکانیانی
پێداچوونەوە و داڕشتنەوەی: سالّح بێچار
تایپ: جەبار حەسەن
دیزاینی بەرگ و ناوەوە: هەرێم عوسمان
چاپ: چاپخانەی کارۆ
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم – ٢٠٢٣
شوێنی چاپ: سلێمانی - هەرێمی کوردستان
تیراژ: ١٠٠٠
نرخ: ١٠٠٠٠ دینار



لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٠٠٣ ) ی ساڵی ٢٠١٨ ی پێدراوە

## سەرباسەکان

## پێشەکی نووسەر:

هەرگیز کەسێکی تەمەن (٥٥) سال، تەنانەت ئەگەر کەسێکی زۆر بەهۆشیش بێت، ناتوانێت یەکەمین یادەوەریی تەمەنی خۆی وەکو خۆی بنووسێتەوە و بڵێت فلان یادەوەریی لە فلان ساڵ و فلان ڕۆژەدا بووە. لە یەکەمین یادەوریی مێشکی منداڵاندا شتی ون بوو هەیە. دیارە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا منداڵی دەوڵەمەندەکان کە نەوەی سەردەمی پێشکەوتن و تەکنەلۆژیان، دایک و باوکیان هەمیشە ڕووداوەکانی ڕۆژانەیان بۆ یاداشت دەکەن و بەرواری ساڵ و مانگ و ڕۆژ و کاتژمێریان بۆ دەنووسن، هەموو ڤارێک کە پیشانیان دەدەنەوە، لە دواڕۆژدا کاتێک تەمەنیان دەگاتە (٦٠-٧٠) ساڵ تەواوی یادەوەرییەکانی منداڵییان بیردێتەوە.

کەسانێک کە لە ساڵی (١٣٢٧-١٩٤٨) لە یەزد لەدایکبووبن، لەو سەردەمەدا کە کارەبا، بەفرگر، تەلەفزیۆن، ڕیکۆردەر، ڤیدیۆ، بۆریی ئاو، حەمام، توالێت و شەقامی قیرتاوکراو نەبوون، یادەوەریی منداڵییان لەڕووی مێژووییەوە بێسەروبەرەیە. ئەم یادەوەرییانەش بەهەمان شێوەیە، بەڵام دەتوانیت دەستنیشانی بکەیت کە کام یادەوەریی پەیوەندی بە پێش چوونە قوتابخانە و کام یادەوەریی پەیوەندی بە سەردەمی قوتابخانە و دوا قوتابخانەوە هەیە.

لێرەدا یادەوەریی بەم شێوەیە دەنووسرێتەوە، بەڵام هەمیشە ناتوانیت کات و سەردەمەکە ڕێکبخەیت. هەندێک یادەوەریی پەیوەندی بەپێش قوتابخانەوە هەیە بەڵام تا (٤٠) ساڵ بەردەوام دەبێت. هەر بۆیەش ڕێکخستنی مێژووی یادەوەرییەکان بەریەکدەکەون، بەڵام یادەوەرییەکە تەواو دەکات. ئومێدەوارم کە لە بەرگەکانی تردا یادەوەریی قوتابخانە و یادەوەریی ئامادەییم بەچاپ بگەیەنم.

**محەمەد حسێن پاپولی یەزدی**

## پێشەکی وەرگێر:

خوێنەری ئازیز ئەم کتێبەی لە بەر دەستی بەڕێزتایە بەناوی "شازادەی حەمام"ـەوە بیرەوەریی نووسەرێکی فارسی خەڵکی شاری (یـەزد) ی وڵاتی ئێرانە کە ئەویش "د. محەمەد حسێن پاپلو یەزدی" جوگرافیا ناسی گەورەی ئێرانە.

پاش خوێندنەوەی کتێبەکە زۆر سەرنجی ڕاکێشام و زۆر چێژم لێ بینی. پاشان ناوەرۆک و باسەکانی کتێبەکەم بۆ (ساڵح بێچار)ی هاوڕێم باسکرد، ئەویش گوتی کە ئەوەندە کتێبێکی سەرنجڕاکێشە، بۆچی نایکەیت بەکوردی. منیش گوتم ئەو کارە لە توانای مندا نیە، ڕاستە من زۆر لەمێژە خوێنەرم، بەڵام تاکو ئێستا ئەزموونی نووسین و وەرگێڕانم نییە. ئەویش گوتی تۆ دەستپێبکە، من هاوکاریت دەکەم و پێداچوونەوە و داڕشتنەوەی دەگرمە ئەستۆی خۆم. بەهەرحاڵ ئەم هاوڕێ بەڕێزەم سەری کردە سەرم و زۆری هاندام. منیش ناچار بەقسەی (بێچار)م کرد و ناوی خوام لێ هێنا و دەستم پێکرد.

نووسەر لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٨) ـە و خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لە بەشی جوگرافیناسیی زانکۆی سۆربۆنی فەڕەنسا و ئەندامی سەنتەری لێکۆڵینەوەی زانستی فەڕەنسایە.

لە سەرەتای بەرگی یەکەمی بیرەوەرییەکانیدا زۆر بەوردی باسی جوگرافیا و مێژووی کۆمەڵگە و زێدی خۆی واتە شاری (یەزد) دەکات. باسی باری هەژاریی و نەداریی یەزد و گوندەکانی دەوروبەری دەکات لە سەردەمی منداڵیی خۆیدا. ڕەنگە خوێنەر لە سەرەتاوە زۆر حەز بە خوێندنەوەی نەکات چونکە باسی شارێک دەکات کە بەلای زۆربەی خوێنەرانی کوردەوە تا ڕادەیەک نامۆ و نائاشنایە. بەڵام لەگەڵ هاوکات هەندێک ڕووداو و بەسەرهاتی ناوازە و سەرسووڕهێنەر دەگێڕێتەوە کە خۆی بەشدار و شاهیدیان بووە، کە بەلای خوێنەریشەوە جێگەی سەرنج و لێڕامانە. وەک بەسەرهاتەکانی "زەری سوڵتان، فاتمە جان، ئەسغەری بۆیاخچی و کەتیرەکردن و پەپوولە گرتن لە باشووری کوردستان" و چەندین بەسەرهاتی تر.

نووسەر سەبارەت بە چۆنێتی ژیانی ئەو سەردەمەی شارەکەی خۆی، هیچ شتێک نەماوە بەوردی باسی نەکردبێت، هەر لە هەژاریی و بێکاریی و برسێتیی و لێدانی منداڵان و چەوسانەوەی ژنان و بەشوودانی پێشوەختی کچان لە تەمەنێکی زۆر کەمدا بە پیاوانی تەمەن (٥٠-٦٠) ساڵ. دیارە خۆیشی لەو چەوسانەوە و بەدبەختییە بێبەش نە بووە. ئەو تاکو باوکی هەبووە و خاوەن پارە بووە پێیان گوتووە "شازادە" بەڵام

# شازادەی حەمام

کاتێک لە تەمەنی حەوت ساڵیدا و باوکی دەمرێت و پارە نامێنێت، ئەویش لە شازادەیی دەکەوێت و کەسێک ئاوڕی لێ ناداتەوە. هەر خۆیشی دەڵێت من هەتا تەمەنی حەوت ساڵی "شازادە" بووم. هەر بۆیەش بیرەوەرییەکانی ناوناوە "شازادەی حەمام".

ئەو سەردەمە شاری یەزد شاری ئایین و ئایینزا جیاوازەکان بووە، هەر لە موسڵمانی شیعە و سوننە تاوەکو یەهودیی و زەردەشتی. نووسەر خۆی موسڵمانێکی شیعەیە و زۆر بە ویژدانەوە ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە. وەک خۆی دەڵێت بە منداڵیی کورد و سوننە و یەهودیی و زەردەشتییان لێکردبووین بە چەتە و دڕندە، بەڵام کاتێک تێکەڵاویان بووم سەیرەکەم پێچەوانەکەی ڕاستە، نەک قسەکانی ئەوان.

ئەوەی کە زیاتر سەرنجی منی ڕاکێشا و هانیدام دەست لەو وەرگێرانە هەڵنەگرم ئەو گەشتە پڕ ڕووداوە بوو کە لە تەمەنی هەرزەکاریدا چووە بۆ شارەکانی مەهاباد و سەردەشت، بەمەبەستی سەردانی هاوشارییەکانی خۆی کە لەبەر هەژاریی و نەبوونی شار و زێدی خۆیان جێهێشت بوو هاتبوون بۆ نێو کوردەکان بۆ کەتیرە کردن. پاپولی لەو گەشتەیدا باشی و میهرەبانی کوردەکانی بۆ دەردەکەوێت کە چۆن هاوکاری ئەو خەڵکە هەژارە بوون. تەنانەت لەو ڕۆژگارەدا لە شاری سەردەشت دوکاندارێکی فارسی شیعە هەبووە، خەریکی قۆڵبڕینی خەڵکی ئەو شارە بووە، بەڵام پاپولی گوێ ناداتە هاومەزهەبی و هاو نەتەوەیی، بەزیرەکی و وریایی خۆی دزییەکانی ئەو حاجییە بۆ خەڵکی سەردەشت ئاشکرا دەکات. یاخود لە بەسەرهاتی ئەسغەردا زۆر بەویژدانەوە باسی تاوانبارە شیعەکە و خزمەت و بەهاناوەچوونی کوردەکان دەکات.

جێی ئاماژەیە، کۆی ئەم بیرەوەرییانە بریتیە لە چوار بەرگ، بەرگی یەکەم و دووەم لە یەک کتێبدا چاپ کراون کە بریتییە لە بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیی و هەرزەکاری. بەڵام من هەندێک باسم لێ لاداوە و وەرم نەگێڕاون، چونکە زیاتر تایبەت بوون بە کۆمەڵێک کەسێتی شاری یەزد کە بۆ ئێمەی کورد گرنگییەکی ئەوتۆیان نییە. ئێمەش بە هەمان شێوە ئەو دوو بەرگەمان کردووە بە یەک کتێب. بەرگی سێیەمیشی زیاتر باسی سەردەمی زانکۆی مەشهەد و کوردە کۆچەرییەکانی باکووری خۆراسان دەکات کە بەشێکی زۆر گرنگە و ئەویش ئامادەی چاپە. بەو هیوایەی ئەو بەرگەش بە زوویی بکەوێتە بەر دیدەی خوێنەرانی بەڕێز. بەرگی چوارەمیش تایبەتە بە سەردەمی خوێندکاری و ماموستایی لە زانکۆی سۆربۆنی فەڕەنسا و باسکردنی دۆست و هاوەڵانی لە دەرەوەی وڵات.

هاوکات لەگەڵ دەستپێکردنی وەرگێڕانی کتێبەکەدا لەڕێی تەلەفۆنەوە پەیوەندیم کرد بە نووسەرەوە، ئەویش خۆشحاڵی خۆی بە وەرگێڕانی بیرەوەرییەکانی بۆ سەر زمانی

کوردی، دەربڕی و زۆر خۆشحاڵ بوو. دواتریش لە هاوینی ڕابووردوودا هەلێکم بۆ هەڵکەوت و چوومە تاران، پاشان سەردانی شاری مەشهەدم کرد و چووم بۆ سەردانی ئاغای پاپولی، هەڵبەت لەو سەردانەدا گفتوگۆیەکی زۆرمان سەبارەت بە وەرگێڕانی کۆی بیرەوەرییەکانی و چۆنێتی چاپکردنی کرد و پاشانیش، پێکەوە چەند وێنەیەکمان وەک یادەوەریی لە نێو کتێبخانەکەیدا گرت.

**تەها سێکانیانی**

**١-١-٢٠١٨ -سلێمانی**

شازادەی حه مام          . لە فارسییەوە: بەها سنکانیانی

## بێوەژن و منداڵە برسییەکان

یەکەم بیرەوەریی کە بەتەواوی بیرم بێتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی (١٣٣٢-١٩٥٣). فاتمە تەمەنی (٨-٩) ساڵ بوو، کچێکی خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری ڕەفسنجان بوو، دایک و باوکی مردبوون. پووری بەخێوی دەکرد کە ئەویش کرێکاری کارگەی ڕستنی (ئیقبال) ی یەزد بوو. لە ژوورێکی بچکۆلەدا کرێچی بوون، وەک ژوورەکەی نەنە قەمەر. فاتمە کە هەمیشە برسی بوو، ڕۆژێک کۆترێکی دراوسێکەیانی گرتبوو، بەبێ چەقۆ هەر بەدەست سەری هەڵکەندبوو. پەڕەکانی لێکردبووەوە و بەبێئەوەی ناوسکەکەی دەربهێنێت کردبوویە مەنجەڵێکەوە و خستبوویە سەر ئاگر. کاتێک پووری لە کارگە گەڕایەوە، مەنجەڵی گۆشتەکەی ڕشت و زۆریش لێی تووڕە بوو. فاتمەش دەستیکرد بە گریان، چونکە بەنیازی گۆشت خواردن بوو. هاوکات پووری دەستیکرد بەلێدانی و گوتی: بۆچی کۆتری خەڵکت سەربڕیوە؟ کە سەرتبڕی بۆ ناوسکەکەیت دەرنەهێنا و پاشان بیخەیتە سەر ئاگر؟ نازانی کۆتر دزین و سەرنەبڕدراو ئەمانە هەمووی حەرامە!

خاوەن کۆترەکە زانیبووی کە فاتمە کۆترەکەی کوشتووە، لە گەڕەکدا کردی بە هەرا. پووریێ بەخاوەنی کۆترەکەی گوت: من کۆترەکەت بۆ دەبژێرم و پارەکەیت دەدەمێ، کەچی دراوسێکەیان قبوڵی نەکرد و گوتی: دەبێت فاتمە تەمبێ بکرێت! وردە وردە دەنگە دەنگەکە زیادی کرد و خەڵکی گەڕەک لێیان کۆبوونەوە، هەندێکیان لایەنی فاتمەیان گرت و هەندێکیشیان لایەنی خاوەن کۆترەکە... یەکێک دەیگوت: مێردەکەی (واتا مێردی پووری فاتمە) لەسەر دزیکردن لە کارگە گیراوە و ئێستا لە زینداندایە. یەکێکی دیکە دەیگوت: ژنە خۆی کرێکاری کارگەیە، ڕۆژانە کە دەچێت بۆ کارگە ئەم کچە بەتەنیا جێدەهێڵێت، بۆیە خووی بە دزییەوە گرتووە. لەم شارەدا هیچ کەسوکارێکی نییە، باشتروایە لەم گەڕەکە دەریانبکەین. یەکێکی تر دەیگوت: هاوسەرەکەی دزیی نەکردووە، بەڵکو کاری سیاسیی کردووە و ئەندامی حزب بووە، وەک کرێکارێک دژایەتی سەرمایەدارانی کردووە، بۆیە خراوەتە زیندانەوە. پێویست ناکات لەخۆتانەوە بوختان بکەن، هیچ کەسێک ئەوی نەبینیوە، کە دزی کردبێت، ئێستا ئەم ژنە ئامادەیە پارەی کۆترەکە بدات. بەهەرحاڵ خاوەنی کۆترەکە چوو شکاتی کرد و دوو پۆلیسی سوارە هاتن... ئێستاش ئەو کاتەم لەبەرچاوە کە ئەسپسوارەکان هاتن. پۆلیسەکان کردیان بەهەرا و گوتیان کچەکە دەبەین بۆ بنکەی پۆلیس. ئەو کچە باوکیشی لەسەر دزی

گیراوە و لە زینداندایە. پووریّ ڕۆیشتبوو تا چەند کەسێک لە خزم و ناسیاوی خۆی ئاگاداربکات و بێن هاوکاری بکەن لە چارەسەرکردنی کێشەکەدا.

کاتێک پووریّ گەڕایەوە، چەند کەسێکی لەگەڵدا بوو، هاواریان دەکرد مردن بۆ سەرمایەداران، مردن بۆ ڕەزایی. ڕەزایی، سەرۆکی کارگەی ڕستن بوو، ماڵی لە نزیک ماڵی ئێمەوە بوو.

ئەم کێشەیە بوو بە کێشەی کرێکارەکان و خاوەنکار، لە دواییدا، پۆلیسەکان (٥) تومەنیان لە پووریّ وەرگرت و کۆتاییان بە کێشەکە هێنا. لەو سەردەمەدا (٥) تومەن زۆر بوو، دەیکردە کرێی (٥) ڕۆژ کارکردنی پووریّ. پووریّ پارەکەی لە محەمەدی دوکاندار قەرزکردبوو، بەو مەرجەی کە سەری مانگ بیداتەوە. پووریّ زۆر ناڕەحەت بوو، بە خاوەنی کۆترەکەی گوت: من ئامادەبووم پارەکەت بدەمەوە کە نەچیتە لای پۆلیس و هاوسەر و منداڵی من بەدز ناونەبەیت، ئێستا کە لەگەڕەکدا ئابڕووی ئێمەت برد و پارەکەش بۆ تۆ نەبوو، چووە گیرفانی پۆلیسەکانەوە.

من یەکەم وانەی ژیانم لەوە فێربووم کە کەریم (هاوسەری پووری فاتمە) دز نەبوو، بەڵکو سیاسەتکار بوو. ڕەزایی سەرۆکی کارگە پیاوێکی بەد بوو، بەتۆمەتی دزیی ئەوی زیندانی کردبوو. ئەوکات نەمدەیزانی کاری سیاسی مانای چییە؟ کاک ئەحمەد کە ئەویش کرێکاری هەمان کارگەبوو، هەمیشە دەیگوت مردن بۆ سەرمایەداران. لە ماڵەوە ڕادیۆی هەبوو، هەمیشە بڵندگۆی لێدەبەست و ئێواران ڕادیۆکەی دەکردەوە و هاواری دەکرد "ئێرە دەنگی مۆسکۆیە".

ڕۆژێک گوتم: کاک ئەحمەد کاری سیاسی مانای چییە؟ گوتی مانای ئەوەیە کە دژایەتی سەرمایەدارانی وەک ڕەزایی بکەیت، یان دژایەتی شا بکەیت. دەبێت بڵێیت کارگە ماڵی کرێکارەکانە. گوتم: ئەی کەریمی مێردی پووری فاتمە دزیی نەکردووە؟ گوتی نا.. بابە گیان دزیی چی.. ڕەزایی دزە، کە مافی ئێمەی کرێکار نادات. کاک ئەحمەد بە منی دەگوت: حسێن تۆ لە ئایندەدا دەبیتە شتێک. گوتم: چۆن؟ گوتی: ئەوەتا لەنێو ئەم هەموو منداڵەدا تەنها تۆ پرسیار دەکەیت، بەڵام وریابە کە گەورە بوویت نزیکی سیاسیەت نەکەویت، چونکە سیاسەت مانای بێ باوک و دایکی و واتای درۆکردن. مانای تومەت هەڵبەستن. گوتم: مانای چی؟ گوتی: مانای ئەوەیە ئەم کەریمە پیاوێکی زۆر باشە و بەهیچ شێوەیەک دز نییە و بێ کەسیش نییە، چاوی لەدووی ژن و منداڵی کەس نییە، مەیخۆر نییە. بەڵام ئێستا کە زیندانیان کردووە، ئەم تومەتانەیان هەموو لە ناو فایلەکەیدا بۆ نووسیووە. ئەم بێ دایک و باوکانە کە خۆیان کردووە بە حاکمی

وڵاتی ئێمە، وەکو پیاو نایەنە مەیدان، کەسێک کە کاری سیاسی بکات و داوای مافی خۆی بکات، پێیدەڵێن دزە.

ئێستا پەیوەندییەکی نادروست هەیە، خۆیان هەرچی کاری خراپە هەیە دەیکەن، وڵاتیان وێران کردووە، سەروەت و سامانی میللەتیان بەباداوە، گەر کەسێک قسەش بکات پێیدەڵێن دژی وڵاتە.

ئەوکاتە من زۆر بچووک بووم، هیچ لەو قسانەی کاک ئەحمەد تێنەدەگەیشتم، تەنها ئەوەندەم دەزانی کە ڕەزایی پارە و پولێکی زۆری هەیە. هەر بۆیەش قەڵەوە و جلی جوان دەپۆشێت، پیاوێکی نەوسنە و هەر کەسێک دژایەتی بکات بە تۆمەتی دزی زیندانی دەکات. ئەوەش تێگەیشتم هەر کاتێک منداڵێکی برسی، کۆترێک بکوژێت بۆئەوی سکی خۆی پێ تێربکات، دراوسێکان جوێنی پێدەدەن و پۆلسی بۆ بانگدەکەن، پۆلیسەکانیش هیچ کارێک ناکەن، تەنها پارە وەردەگرن و دەیخەنە گیرفانیانەوە. پاشان حەسەن خاوەنی کۆترەکە، گوتبووی ئەویش (٥) تومەنی داوە بە پۆلیسەکان تا ماڵی پووری لە گەڕەک دەربکەن. من لەوە تێگەیشتم کە نەدەبوو کێشەیان دروستبکردایە، چونکە هەردوولا لەو کێشەیەدا زیانیان کرد، تەنها پۆلیس سوودمەندبوو. تازە فێربووم کە هەر کاتێک ئەگەر برسیت بوو و کۆترت بینی، نابێت سەری لێبکەیتەوە، چونکە حەرامە و نابێت گۆشتی حەرام بخۆیت. ئەگەر گۆشتی حەرام بخۆیت لەودنیا ئاسنی سورەوەکراو لە ملت دەکەن. بۆیە واباشترە کۆتر نەدزیت، ئەگەر کۆتریشت دزیی بە چەقۆ سەری ببڕە. باشترە بەبرسێتی بمێنیتەوە، نەک کۆتری دزیی بخۆیت.

کاتێک چوومە پۆلی سێیەمی سەرەتایی، لە یەکێک لە وانەکاندا، ئەم چیرۆکە نووسرابوو کە دوو کەس گوێزێکیان دۆزیبوەوە و شەڕیان بوو لەسەری. کەسی سێیەم هاتوو گوتی: من کێشەکەتان بۆ چارەسەردەکەم، گوێزەکەی شکاند و کاکڵەکەی خوارد و توێکڵەکەی کرد بە دوو بەشەوە هەریەکەی نیوەی توێکڵەکەی پێدان. من ئەوکاتە بیرمکردەوە کە ئەو پۆلیسانە (١٠) تومەنیان لەبری کۆترەکە وەرگرت، واتا کاکڵەی گوێزەکەیان خوارد.

چەند ڕۆژێک دوای کێشەی کۆترەکە، من لە ماڵەوە بووم گوێم لە ئاژێری کارگە بوو، کە دەنگێکی زۆر بەهێزی هەبوو. هاوکات دەنگی چەند تەقەیەکی تفەنگ یش هات. دایکم گوتی: شەڕە.. خێرا بڕۆرە ژوورەوە با فیشەکێکت بەرنەکەوێت. خێرا پانتۆڵەکەم لەپێکرد و چوومە کۆڵان و بەرەو کارگەی ئیقبال ڕامکرد، تا بزانم چی ڕوویداوە. ژمارەیەکی زۆر سەربازم بینی لەبەردەم کارگەکە وەستا بوون، سەربازەکان کڵاوی ئاسنیان لەسەردا بوو و چەکیان پێ بوو. دەرگای کارگە داخرابوو، دەرگای کارگە زۆر

# شازادەی حه مام

گەورە و پەنجەرەیی بوو، ناو کارگەکە دیار بوو. سەربازەکان بانگی کرێکارەکانیان دەکرد و تەقەیان دەکرد. من لای سەربازێکەوە وەستا بووم، یەکێک دەستی گرتم و گوتی: منداڵ چی دەکەی لێرە؟ خێرا برۆ با نەکوژرێیت.. گوتم: دەمەوێت سەیربکەم! پاڵێکی پێوەنام و گوتی: برۆ بۆ ماڵەوە. لە کۆڵان ژنەکان هەر هاواریان بوو، چەند ژنێک کە پیاوەکانیان کرێکار بوون و لەکارگەدا گیریان خواردبوو، دەگریان. هەندێکیان دەیانویست برۆن بۆ کارگە بۆ هەواڵی پیاوەکانیان. ژنی قاسم، هانی ژنەکانی تری دەدا کە بچن بزانن چی ڕوویداوە، دەیگوت: ئەگەر پیاوەکەم بکوژن وا باشترە کە منیش بکوژن، ئاخر من شەش منداڵ چی لێبکەم؟ بەڵام کاک حەبیب ئەحمەد ژنەکانی هێواشکردەوە و گوتی: بڕۆنە ماڵەوە وا من بەرەو کارگە دەچم و بەزوویی هەواڵتان بۆ دەهێنمەوە. دوانیوەڕۆ کاک ئەحمەد ڕادیۆی کردەوە، کە دەیگوت "ئێرە دەنگی مۆسکۆیە". من نەمدەزانی مۆسکۆ لە کوێیە، بەڕاستی وام بیردەکردەوە کە مۆسکۆ شوێنێکە (مس)ی لێدەفرۆشن، چونکە لە گەڕەکی ئێمە مسگەر و شاگرد مسگەری زۆر لێبوو.

بۆ سبەینی پاسەوانەکان هاتن ڕژانە سەر ماڵی کاک ئەحمەد، کاک ئەحمەد ڕایکردە سەربان، من وامزانی دیسان کەسێک کۆتری کەسێکی تری دزیوە، تا سکی تێر بکات. پۆلیسەکان ڕادیۆ و بڵندگۆی کاک ئەحمەدیان برد. کاک ئەحمەد چەند کتێبێکی هەبوو، ئەوانەشیان برد. ماڵی کاک ئەحمەد هەموو بەسەریەکدا درابوو. من تێگەیشتم کە هەمیشە لە ماڵەکاندا کۆتر نادزن، جاری وا هەیە پاسەوانەکان دێن ڕادیۆ و کتێب دەبەن. ژن و منداڵەکانی کاک ئەحمەد دەگریان. کاک ئەحمەد ماوەیەک لەسەر سەربانەکان دەژیا، چونکە سەربانەکانی (یەزد) هەموویان بەیەکەوە بەسترابوون، ئەگەر پاسەوانێک بە کۆڵاندا بهاتایە کاک ئەحمەد دەیتوانی بە چوار دەوری خۆیدا تا سەربانی سەد ماڵ ڕابکات.

ژنەکان دەیانگوت ئەو ڕۆژەی کە تەقەکان کرا، چەند کەسێکی وەک کاک ئاوارە لە نێو بازاڕ و لە مەیدانی میر چەقماق کوژراون. کەریمی مێردی پووری فاتمەش لە زینداندا بەهۆی لێدانی زۆرەوە مردووە، و پاسەوانەکان وایان بڵاوکردەوە کە کەریم دزە، بەهۆی شەڕەوە لەگەڵ زیندانییەکانی تردا، کوژراوە. خێزانەکەیان ئاگادارکردەوە بڕۆن لە گۆڕستان تەرمەکەی وەربگرنەوە. پووری فاتمە دەگریا، پیاوانی گەڕەک دەیانگوت هاوڕێ کەریم پیاوێکی ئازابوو، خۆی کرد بە قوربانی ئامانجەکەی. من نەمدەزانی هاوڕێ کەریم کێیە و ئامانج مانای چییە؟ بەڵام کاتێک پاسەوانەکان

دەیانگوت کەریم دز بووە و لە زینداندا شەڕی کردووە و بە کوتەک لە سەریان داوە، بۆیە مردووە. ئەم وشانە بۆ من سادەتر بوو، زووتر تێیاندەگەیشتم.

دایکم و بیبی هەلی، فاتمە جان و هەموو ژنەکانی گەڕەک و زۆربەی پیاوانی گەڕەک نەیاندەزانی کە هاوڕێ کەریم کێ بووە، ئامانجێک کە لەپێناویدا مردووە چییە؟ تەنانەت بیبی سەکینە کە دوو کوڕی کرێکاری هەمان کارگەبوون، هەمیشە دەیانگوت بژی شا. دەیانگوت: کەریم عاشقی ژنێک بووە کە ناوی ئامانج بووە و ئەو ژنە مێردی هەبووە و ئەو پیاوە لە کەریمی داوە و کوشتویەتی!. پاشان من تێگەیشتم کە ئامانج مانای چی؟ تێگەیشتم کە دەبێت لەگەڵ ژن و منداڵانی کۆڵان بە زمانێکی سادە بدوێم. خەڵکی گەڕەکی ئێمە بەهیچ شێوەیەک مانای وشەکانی (هاوڕێ، مۆسکۆ، ئامانج، حیزب، تودە و جەماوەر) یان نەدەزانی. ئەوان تەنها وشەکانی (نان، ئاو، کۆتر، برسێتی و دزیی) یان دەزانی. ڕۆژێک چوومە سەربان بۆ یاریکردن، بینیم کاک ئەحمەد لەسەر بانەکەی ئێمەیە، لە کولانەکەدا دانیشتین و کەوتینە قسەکردن، گوتی: بڕۆ کەمێک ئاوی ساردم بۆبێنە، منیش چووم یەک گۆزە ئاوی ساردم بۆهێنا، ئەوکات کارەبا و بەفرگر نەبوو، تەنها دەیانگوت لە ماڵی ڕەزایی خاوەنی کارگە کارەبا هەیە و بەفرگری کارەبایی و نەوتیی هەیە..

کاک ئەحمەد گۆزەکەی لێوەرگرتم و دەستیکرد بە ئاوخواردنەوە، گوتی: بینیت پیاوانی شا چۆن لە موسەدیقی و تودەییەکانیان دا و گرتیانن و لێیاندان؟ هەموو شتێک کۆتاییهات بۆیە من وا هاروهاج بووم.. من هیچ لەو وشانە حاڵی نەبووم، هیچم لە شا و موسەدیق و تودە نەدەزانی.

وامدەزانی موسەدیقییەکان و تودەییەکان وەک فاتمە برسی بوون، چوون کۆتری خەڵکیان دزیووە، تا سکیان تێربکەن و پیاوانی شا چوون سەرباز و پاسەوانیان هێناوە، تا لە تودەییەکان و موسەدیقییەکان بدەن و بیانکوژن و زیندانیان بکەن. بە بۆچوونی من ئەم هەموو شتە لەپێناوی سکدا بووە. گوتم: کاک ئەحمەد ئەم قسانەی تۆ، مانای چی؟ مانای کەسێک کۆتری کەسێکی تری دزیوە؟ کاک ئەحمەد قاقا پێکەنی و گوتی: حسێن تۆ زۆر خۆشیت. پاشان کاک ئەحمەد گوتی: واتا ڕەزایی پارەیەکی زۆری هەیە و خاوەنی کارگەیە و بەسەر خەڵکیدا زاڵ بووە و ئێمە ئێستا دەبێت لەپێناو ئەودا مەمرە و مەژی کاربکەین، ئینگلیزەکان دووبارە دێنەوە و نەوتی ئێمە بەتاڵان دەبەن بۆ خۆیان.

من هیچ لەم قسانە حاڵی نەبووم، تەنها لە مەسەلەی کۆترەکە حاڵی بووم، کە فاتمە ویستی بیخوات. بەڵام نەمدەزانی کێ دەیەوێت نەوت بخوات، دایکم چەندین جار دەیگوت نەوت شتێکی خراپە، وریابە نەیخۆیتەوە. ئاگاداربە سەری دەبە نەوتەکە

نەکەیتەوە بیخۆیتەوە وابزانی ئاوە. پێشتر بینیبووم کە ئەکبەر کوڕی دراوسێکەمان نەوتی خواردبووەوە و ڕشایەوە و بەپەلە گەیاندیانە نەخۆشخانە. ئەگەر درەنگ بگەیشتایەتە نەخۆشخانە ئەوا دەمرد. ئێستا ئەمریکا و ئینگلیز و پیاوانی شا، کە دەتوانن بەرمیل بەرمیل نەوت بخۆن و نەڕشێنەوە، و نەچنە نەخۆشخانە، دەبێت لەگەڵ ئێمەدا جیاوازبن. گوتم واباشە، بچمە سەربان لە کاک ئەحمەد بپرسم بۆچی ئینگلیز و ئەمریکا و پیاوانی شا کە نەوت دەخۆن نارشێنەوە و نایانبەن بۆ نەخۆشخانە.

وامزانی کە دنیا گەرمە بۆیە کاک ئەحمەد هاتووەتە سەربان، بۆ ئەوەی فێنکی ببێتەوە. چووم گۆزەیەکی تر ئاوم بۆ هێنا و گوتم بۆ ناچیتە ژوورەوە؟ گوتی: سەربان باشترە، ئەگەر پاسەوانەکان هاتن زوو وەرە ئاگادارم بکەرەوە.

بە هیچ کەسێک نەڵێیت کە منت لێرە بینیوە. بە کاک ئەحمەدم گوت: تۆ گوتت کە ئینگلیز و ئەمریکا نەوت دەخۆن؟ گوتی: بەڵێ.. گوتم: ئەی بۆ نارشێنەوە؟ کاک ئەحمەد دەهریی ببوو.. گوتم: ئەکبەری دراوسێمان کە نەوتی خواردەوە دەستیکرد بە ڕشانەوە و خەریکبوو بمرێت. بەپەلە بردیان بۆ نەخۆشخانە. کاک ئەحمەد قاقا پێکەنی و گوتی: ئەکبەر تەنها کەمێکی خواردوەتەوە و ڕشاوەتەوە، ئەمریکا و ئینگلیز و هاوەڵانیان یەک ملیۆن بەرمیل نەوت دەخۆن. ئەمانە چونکە نەوت زۆر دەخۆن، بەهیچ جۆرێک هەستی پێناکەن. دیسان تێنەگەیشتم کە کاک ئەحمەد چی دەڵێت، ئیتر پرسیارم نەکرد.

چونکە دنیا زۆر گەرم بوو، کاک ئەحمەد ئارەقی کردبووەوە و منیش زۆرم گەرما بوو لە سەربانەوە هاتمە خوارەوە.

ئیتر نازانم کە بابەتی لایەنگرانی شا و موسەدیقییەکان و نەوت چی بوو. تەنها ئەوەندم دەزانی کە کاک ئەحمەدیان لە کارگە دەرکرد وماڵیان لە گەڕەکی ئێمە نەما و ڕۆیشتن.

چەند ساڵێک لەوەدوا کە لە پۆلی (٤) بووم، ڕۆژی (٤)ی ئاب، لە قوتابخانەی ماکاری یەزد کاک ئەحمەدم بینی. کە لە پەنجەرەی پۆلەکەوە چاوم پێیکەوت بە خێرایی ڕامکرد و چووم بۆلای، جلێکی شڕی لەبەردا بوو، گۆرەپانەکەی گسکدەدا، سڵاوم لێکرد، ئەویش منی ناسییەوە، گوتی: ماشائەڵڵا گەورە بوویت، تکایە هەرگیز گوێ لە ڕادیۆی مۆسکۆ مەگرە، با وەکو من نەبیت بە گسک لێدەر، تەنها خەرکی خوێندنەکەتبە!.

من و دایکم لە یەک ژووردا دەژیاین، خانووی خۆمان نەبوو، دوایی زانیم کە باوکم ئەو ژوورەی بە (٣٠٠) تومەن ڕەهن کردبوو. خاوەنی خانووەکەی ئێمە، واتا کاک میرزا خۆی و (٤) منداڵ و ژنەکەی لە ژوورێکی تردا دەژیان. کاک میرزا خۆی شەو لە ژووری چێشتخانەکەدا دەنووست، شەوانە چەند تەڵە مشکێکی لە ژوورەکەدا دەنایەوە،

هەموو بەیانییەک چەند مشکێکی تۆپیوی دەخستنە کونی زێرابی توالێتەکەوە. کاک میرزا کار و کاسپیەکی تەواوی نەبوو، زۆر هەژار بوو، بەهەر جۆرێک بووایە، دەبوو بژێوی (٤) منداڵ و خۆی و ژنەکەی پەیدا بکات. هەندێک جاریش، شەوانە نەدەهاتەوە بۆ ماڵەوە، دایکم دەیگوت هەر شەوێک کاک میرزا نەتوانێت نان بۆ منداڵەکانی بکڕێت، ئەو شەوە نایەتەوە. یاخود بەرەبەیان بە هێواشی دێتەوە و دەچێت لە ژووری چێشتلێنانەکە دەخەوێت. ئەو شەوانەی کە کاک میرزا نەدەهاتەوە منداڵەکانی بە برسێتی دەنووستن یان دایکیان دەچوو بۆ ماڵی خوشکی، ئەوان گوزەرانیان باش بوو، کەمێک خواردنی بۆ منداڵەکان دەهێنا. زۆرجار کاک میرزا بەدەستی ژنەکەی لێدانی دەخوارد، یان تێر جوێنی دەکرد، دەیگوت: پیاوێک کە نەتوانێت منداڵەکانی بەخێوبکات، باشتروایە کە بمرێت. تەنانەت جارێک خشتێکی گەورەی کێشا بەسەری کاک میرزا دا.

من لەوە تێگەیشتم، کە پیاو پێویستە نان و خۆراک بۆ منداڵەکانی پەیدا بکات، ئەگەر نا بەدەستی ژنەکەی لێدان دەخوات. تەنانەت ژنی یەزدیش کە لە تەواوی ئێراندا بە ژنانی میهرەبان ناسراون. ژنی کاک میرزا دوو دەزگای چنینی هەبوو، خۆی بەیەکێکیان شتی دەچینی و ئەوی تریان لای دایکم بوو، قوماشی پێدەچینی. واتا دایکی من ئەو مرۆڤە هەژارە بوو، ئێستا سەیر بکەن دەبێت ژیانی ئێمە چۆن بووبێت.

ئەو کاتە کە باوکم لە ژیاندا بوو، شەوان دایکم لە قوڵکەی ئاگرداندا خەڵووزی دەگەشاندەوە، تلیاکی ئامادە دەکرد، سەماوەر و قۆریی دەهێنا و چای ئامادە دەکرد بۆ باوکم. کاک میرزا ئەحمەدیش دەهات و بەیەکەوە دەستیان دەکرد بە تلیاک کێشان و چا خواردنەوە. تەنها شتێک کە لەبارەی باوکمەوە، بیرم بێتەوە، ئەوەیە کە لەبەردەم مقەڵییەکەدا دادەنیشت و دەستیدەکرد بە تلیاک کێشان. کاتێک باوکم خەریکی تلیاک بوو، من دەنووستم کە بەیانی هەڵدەستام باوکم لە ماڵەوە نەبوو. باوکم سێ ژنی هەبوو، لە هەر ژنە و یەک منداڵی هەبوو، دایکم ژنی سێیەمی بوو، باوکم لەگەڵ ژنی دووەمیدا دەژیا، بەڵام شەوانە دەهاتە لای دایکم تلیاکی دەکێشا و پاشان بۆ خەوتن دەچووەوە بۆ لای ژنی دووەمی، کە ئەویش ماڵەکەی چەند کۆڵانێک لەولای ماڵی ئێمەوە بوو. باوکم زۆر میهرەبان بوو، هەرگیز لێینەدەدام. کەڵەشێرێکی چینیی و کۆمەڵێک یاریی منداڵانەی جوانی بۆ کڕیبووم، کە هەرگیز لەیادم ناچێت. شەوانە کە خەوم لێنەدەکەوت، دایکم ئاگری فتیلەکەی کز دەکرد و چیرۆکی بۆ دەگێڕامەوە، بەزوویی خەوم لێدەکەوت. هەرگیز چیرۆکەکانی دایکم تەواو نەدەبوو، چونکە من لە نیوەی چیرۆکەکەدا خەوم لێدەکەوت. بیرمنایەت کە کاتێک باوکم زیندوو بوو، دایکم

# شازادەی حه مام

قوماشـی چنی بێت، ڕەنگە دوای مردنی بـاوکم ئەوکـارە فێر بووبێت، کە مـن تەمەنـم شەش ساڵ بووە.

ئەو کاتە گەڕەکی ئێمە هیچ سـەرچاوەیەکی ئـاوی نەبـوو، واتـا مـاڵی ئێمە و چەندین ماڵی تر کانیاوێکی لێ نزیک نەبوو. ئاوی قەنات کە هەر دوانزە ڕۆژ جارێک بە گەڕەکی ئێمەدا دەهات، ئەویش ماڵی ئێمەی نەدەگرتەوە، ماڵی ئێمە و چەند مـاڵێکی تریش بیری ئاومـان نەبـوو. ئـاوی قەنـاتیش بەچەنـد مـاڵێکیتردا ڕەتـدەبوو، دەبـوو ئەوانیش بەچەند پلیکانەیەکدا بچوونایەتە خوارەوە بۆ سەر ئاوەکە، کە شوێنێکی فێنک بوو بۆ هاوینـان و کـاتی پشـوودان. هەنـدێک لە ماڵەکـان توانیبوویـان جۆگەی ئـاو بـۆ خۆیـان دروسـتبکەن. تەنهـا مـاڵی ئـێمە و مـاڵی فـاتمە جـان و مەعسـومە جـان و بیبـی ڕوبـاب، ئاومـان بـۆ نەدەهات.

زۆر بەلامەوە سەیر بوو کە بۆچی ئاو بۆ ماڵی ئێمە نایەت، پاشـان کە چوومە پۆلی سـێیەم تێگەیشـتم کە مـاڵی ئـێمە بەسـەر گـردۆڵکەیەکەوە بـوو، زۆر لە ئاسـتی ئـاوەکە بەرزتر بوو.

شـاری یەزد هێشتا پڕۆژەی ئاوی نەبوو. دەبوو بۆ دابینکردنی ئـاو بچینە چـاڵاوێکی قوڵەوە کە نزیکەی (٤٠-٥٠) پلیکـانە بـوو. نزیکترین ئـاوی تـانکی لانیکەم (٥٠٠) مەتـر لە مـاڵی ئێمەوە دوور بـوو. پێشـتر بـۆ ئـاو دەبـوو بچینە ئەو مـاڵانەی کە بیریـان هەبـوو، یاخود بچین ئاو لە بۆریی ئاوی کارگەی ئیقبال بهێنین.

حەوزێک لە ناوەڕاستی ماڵەکاندا هەبوو، کە بە یەک دوو مانگ جارێک بە (کونـدە)ی ئاو پڕیان دەکرد. ئەو کاتانەی کە ئـاوی حەوزەکە تـازە بـوو مـن و هاوڕێکانم زوو زوو دەچـووینە سـەر حەوزەکە و ئاومـان لێدەخواردەوە، بەڵام پـاش چەنـد ڕۆژێـک، ڕەنگـی ئاواکە تێکدەچوو کرمی هەڵدەهێنا.

بـۆ چوونە توالێتەکـانیش، دەبـوو هەر لە حەوزەکە مەسـینە پـڕ بکەیـن و بە پلیکـانە بچووینـایەتە خـوارەوە. چـاڵی قـوڵی (١،٥م) و پـان و فـراوان هەڵـدەکەنرا بـۆ پیسـایی. پاککردنەوە و دەردانی چاڵی تەوالێتەکانیش، بۆخۆی چیرۆکێک بوو.

کۆمەڵێـک حوشـتردار دەهـاتن کە خەڵکـی (زارچ)ی یەزد بـوون، توالێتەکانیـان لە خاوەنەکانیان دەکڕی بە (٢-٥) تومەن. پاشان بە حوشترەکان خۆڵیان دەهێنا و لەسەر جـادەکە بە گـڵ حەوزی بچووکیـان دروسـتدەکرد. سـەری بیـری تەوالێتەکانیـان هەڵـدەدایەوە و بە سـەتڵ ئـاوی چاڵەکەیـان بەتـاڵ دەکـرد و دەیـانکردە نـاو حەوزە بچووکەکەوە، کە ئاوەکە تەواو دەبوو کرێکارێک دەچووە ناو بیرەکەوە و پیسـاییەکەی دەکـردە سـەتڵەوە و کرێکـارێکی تـر بە گـوریس هەڵیدەکێشـایە سـەرەوە. تەواوی

پیسـاییەکەیان دەڕشـتە حەوزە بچـووکەکەوە. لەبیـرمە کە چـاڵی دراوسـێکەمانیان خـاڵی دەکردەوە، بەتاڵکردنی چاڵەکە سێ ڕۆژی ویست و ڕۆژی سێیەم گوریسیان لە کەمەری کەسێک بەست و شۆڕیانکرەوە بۆ ناو چاڵەکە. خاوەن کارەکە هاواری دەکرد ئەهای عەباس چاڵەکە باش پاکبکەرەوە تەشتەکە پڕ پڕبکە، پارەم پێداوە.

چەند ڕۆژێک پیسـاییەکە لەسـەر شـەقامەکە دەمـایەوە، تـاوەکو ئـاوەکەی دەبـوو بە هەڵم. پاشـان دەیـانکردە جەواڵەوە و لە حوشـترەکانیان بـاردەکرد، بـارەکە زۆر قـورس بـوو، کاتێک حوشترەکان دەیانویست هەڵسـن نەعرەتەیـان دەکێشـا. بەم کـارە دەگـوترا کەناسی. کەناسەکان ئەم کودەیـان بە جوتیارەکـان دەفرۆشـت، بیرمە کە تەمەنـم (٥-٦) ساڵ بوو بەکەسێکم گوت تۆ چۆن دەچیتە ئەو چاڵەوە و خۆت وا پیس دەکەیت؟گوتی مـن ژن و منـداڵم هەیە پێویسـتە ئەوان نـان بخـۆن. مـن منـداڵ بـووم تێنەدەگەیشـتم، وامدەزانی ژن و منداڵەکانی دەبێت لەم پیسـاییە بخۆن. زۆر بەلامەوە سـەیر بـوو چۆن دەبێت ئەو بچێتە ئەو چاڵە پیسەوە تا ژن و منداڵەکانی نان بخۆن.

دوایـی بەخـۆمم گـوت هەر چۆنێـک بێـت ئەم کـارە باشـترە لەوەی کە کـۆتری دراوسـێکەیان بدزێت، چـونکە بـۆ دزینـی کـۆتر پـۆلیس دێـن بۆیـان بەڵام بـۆ ئەم کـارە پۆلیس نـایەت. چەنـد سـاڵێکی پێچـوو کەناسـەکان نەدەهـاتن و چاڵەکـانیش پڕ بـوون و کێشە بۆ خەڵک دروستبوو. سەرەتا کەناسەکان چاڵەکانیـان بەپارە دەکرڕی، پاشـان وای لێهات چاڵەکانیان نەدەکرڕی و بەبەلاش بەتاڵیـان دەکردن و پیسـاییەکەیان دەبرد. دواتر بەپـێچەوانەوە خەڵکـی پارەیـان دەدا بە کەناسـەکان تـا چاڵەکـان بەتـاڵ بـکەن. ئەمە سـەرەتای گۆڕانکـاریی بـوو لە ژیـانی چەنـد هەزار سـاڵەی خەڵکـی یەزددا. سـەرەتای نوێسـازیی بوو لە (یەزد)، پاشـان کە من (١٠-١١) سـاڵ بـووم، فەرمـانگەی تەندروسـتی بڕیاریدابوو نابێت چاڵەکان وەک جاران بەتاڵ بکرێت و لە نێو کۆڵانەکاندا حەوزی خۆڵ دروست بکرێت و دەبێت ئۆتۆمبێل بێت، چاڵەکان بەماتۆڕ بەتاڵ بکات. بۆیە ئەمەش بـوو بەکێشەیەک چونکە کۆڵانەکانی یەزد زۆر تەنگەبەر بوون و ئۆتۆمبێل نەیدەتوانی پێیاندا ڕەت ببێت. دواتر دەوڵەمەندەکان خانووەکانیان بە هەرزان دەفرۆشت و دەچوونە قەراخ شار خانووی تازەیان دروست دەکرد.

گەڕەکە نوێکان جادە و ڕێگەوبانیان پان و فراوان بوو، ئاو و کارەبایـان بـۆ ڕاکێشـرا بوو. ڕۆژبەڕۆژ دەوڵەمەندەکان خانووەکانیان دەفرۆشت و دەچوون بۆ گەڕەکە نوێکان. خەڵکـــی هەژاری دەوروبەری شـــاریش دەهـــاتن ئەو خانووانەیـــان دەکـــڕی کە دەوڵەمەنـــدەکان دەیانفرۆشـــتن. دەوڵەت ڕێگـــای نەدەدا ئەو خـــانووانە بڕوخێنـــرێن و

خانووی نوێیان لێ دروست بکرێته‌وه. ده‌بوو ئه‌و خانووانه بمێنن، بۆئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر گه‌شتیاره بیانییه‌کان هاتن با بیانبینن و سه‌یری کولتوری ئێران بکه‌ن.

حاجی عه‌لی ڕه‌سول ده‌یگوت ئه‌م بیانییه سه‌گبابانه هه‌موو گه‌شتکه‌ر و ته‌ماشاکه‌رن، ده‌یانه‌وێت ئێمه له‌م خانووه پڕ مشک و مار و دووپشکه بێ ئاو و بێ توالێتانه‌دا بمێنینه‌وه بۆئه‌وه‌ی که ئه‌وان هاتن سه‌یرمان بکه‌ن. بیانییه‌کان گه‌وادن ئه‌گه‌ر ڕاستده‌که‌ن، بابێن مانگێک له جێگه‌ی ئێمه له‌م خانووانه‌دا بژین. من ئه‌م شتانه‌م نه‌ده‌زانی، تازه خه‌ریکبوو گه‌وره ده‌بووم. خانوومان نه‌بوو، ده‌بوو هه‌ر دوو ساڵ جارێک خانوویه‌ک به‌کرێ بگرین. چه‌ند ساڵ له خانووی بیبی هه‌یلی و دوایی ژوورێکی کاک حسێن عه‌لی له ماڵی فاتمه جان و دواتر ژوورێک له ماڵی بیبی هاجه‌ردا بووین.

کێشه‌ی دابینکردنی (کود-په‌ین) بۆ جوتیاران کێشه‌یه‌کی گه‌وره بوو، من چه‌ندین یادگاریم له‌و باره‌یه‌وه هه‌یه. بمبه‌خشن که به‌شێک له‌م کتێبه‌دا چیرۆکی پیسی و توالێته، به‌ڵام ئه‌مه به‌شێکه له ژیانی ساڵانی ده‌یه‌کانی (١٣٣٠-١٩٥٠) خه‌ڵکی له شاره‌کانی وه‌ک شاری (یه‌زد).

ژیانێک که له ماوه‌ی (٣) هه‌زار ساڵ و ڕه‌نگه زیاتریش له وڵاتی ئێراندا به‌رده‌وامی هه‌بووه، بێ هۆ نییه که من ده‌ڵێم (٣) هه‌زار ساڵ ته‌مه‌نم هه‌یه. چونکه له درێژه‌ی (٣) هه‌زار ساڵدا ژیان به‌م جۆره بووه.

ئێمه دراوسێیه‌کمان هه‌بوو به‌ناوی کاک مه‌هدی به‌زاز، که له (ته‌رزجان) ی یه‌زد باخچه‌یه‌کی هه‌بوو، کاک مه‌هدی بۆ دابینکردنی کود بۆ دره‌خته‌کانی، له ماڵه‌وه ژوورێکی پڕ کردبوو له گڵی نه‌رم و به منداڵه‌کانی گوتبوو بچن ئه‌و ژووره بکه‌ن به توالێت. ته‌نانه‌ت به خه‌ڵکیشیان ده‌گوت له‌بری توالێت بچنه ئه‌و ژووره‌وه. کاک مه‌هدی پیساییه‌که‌ی له ژووره‌وه وشکده‌کرده‌وه و به‌هاران ده‌یکرده جه‌واڵه‌وه و ده‌یبرد بۆ باخه‌که‌ی. له ساڵی (١٣٣٣-١٩٥٤) دا، بۆ قورئان خوێندن چووم بۆلای خاتوو نه‌باتی، له‌وێش هه‌مان به‌زم بوو، یه‌کێک له داهاته‌کانی مه‌لا نه‌باتی بریتی بوو له فرۆشتنی پیسیایی وشکه‌وه‌بووی منداڵان. ئه‌م کوده کیمیاییه چ خزمه‌تێکی به خه‌ڵک و ته‌ندروستی ده‌گه‌یاند.

کودی پاشه‌ڕۆی مرۆڤه‌کان، به‌درێژایی (٤) هه‌زار ساڵ به هه‌مان شێوه گواستراوه‌ته‌وه بۆ سه‌رده‌می نوێ. ئه‌وانه‌ی که له ده‌ست کودی کیمیایی ده‌ناڵێنن ئه‌و دۆخه‌یان نه‌دیووه.

له ماوه‌ی چه‌ند ساڵێکدا به‌هێنانی چه‌ند کیسه کودی کیمیایی و په‌یدابوونی ئۆتۆمبێل و په‌مپ، ئیتر مێژووی چه‌ند هه‌زار ساڵه‌ی مرۆڤایه‌تی گۆڕانکاریی به‌سه‌ردا هات.

لە سەردەمی کۆنەوە چووینە سەردەمێکی پێشکەوتووەوە. هاوتەمەنەکانی من (٣) هەزار ساڵ تەمەنمان کردووە. ئەم قسانە تەنها قسەی شار و گەڕەک و کۆڵانەکانی ئێمە نەبوون، لە هەموو شوێنێک هەر ئەو قسانە بوو، بەتایبەت گوندەکانی دەوروبەری (کەوێر) کە لەلای ئەوان بەهیچ جۆرێک ئالف نییە، تاوەکو گا و مەڕەکانیانی پێ بەخێو بکەن و سوود لە پەینی ئەو ئاژەڵانە وەربگرن بۆ زەوییە کشتوکاڵییەکانیان. ڕۆژێک لەگەڵ دکتۆر (عەواز کوچەکی) کە خەڵکی (ئیوز) ی فارسە، لە تەمەنی (٥٥) ساڵیدا ناوی خۆی گوڕی بە (عەلی ڕەزا) و دکتۆر ئەمین عەلی زادە خەڵکی گوندی (تەربەت) ی حەیدەریەیە، ئەوان هەردووکیان لە من گەورەتر بوون، لەم بارەیەوە قسەمان دەکرد، دیار بوو کە لە گوندەکانی ئەوان دۆخەکە زۆر لە (یەزد) ی لەمەڕ ئێمە خراپتر بوو، بۆیە دەیانگوت ئێمە ژیانی (٤) هەزار ساڵ پێشترمان بینیوە.

من وا دەزانم کە دکتۆر محەمەد ئیبراهیم پاشا کە لە دایکبووی (١٩٢٥) ی زایینیە و خەڵکی گوندی (پاریزە) بەدڵنیاییەوە (١٥) هەزار ساڵ تەمەنی بووە.

وەک پێشتر گوتم ئەو بیابانەی نزیکی (یەزد) ئەوەندە بێ ئاو و لەوەڕ بوو، کە خەڵکەکەی نەیاندەتوانی مەڕومالات بەخێوبکەن. خاکەکەی هیچ بەرزاییەکی تێدا نییە. دەبوو خۆیان ئالف بۆ ئاژەڵەکانیان پەیدابکەن. چاندنی وێنجە و شەبدەریش ئاو و زەوی باشی دەویست، کە ئاو و زەوی بەپیتیش لە دەوروبەری گوندەکانی (کەوێر) کەم بوو.

واتا ئەگەر خەڵکیی بیانویستایە ئاژەڵداری بکەن دەبوو ئالف بچێنن، ئەوکاتەش دەبوو یان خۆیان بەبرسێتی بمێننەوە یان ئاژەڵەکانیان لەبرسا بمرن. هەر بۆیە خەڵکەکە خۆیان بە بێڵ و پاچ زەوییەکانیان دەکێڵا و نەیاندەتوانی سوود لە گاجوت وەربگرن. گاجوت زۆر کەم بوو، ئەگەر هەشبووایە مانگا هەبوو. مانگاش بۆ ئەوان باشتر بوو، چونکە شیرەکەشیان دەخوارد و گۆلکەکەشی سوودێکی تر بوو. خەڵکی خۆیان کاری گاکانیان دەکرد. خودا ماڵی ئەو کەسە ئاوەدان بکات کە تراکتۆری دروستکرد و پاش (٤) هەزار ساڵ خەڵکی خستە ئیسراحەتەوە.

بیابانە وشکەکانی نزیک کەوێر جێگەی بەخێوکردنی ئەسپ نەبوو، کاتێک کە ئەسپ نەبێت، شەڕیش نابێت. کەمی ئالف بووە هۆی ئەوەی خەڵکی شارەکانی وەک یەزد ئاشتیخوازبن نەک شەڕانگێز. کەسانێک کە ئەسپیان نەبێت و نەتوانن ئاژەڵداری بکەن دەبێت لە قولایی زەویدا ئاو دەربهێنن و بەدەستی خۆیان زەوییەکانیان بکێڵن. ئەو خەڵکانە کوا کاتی شەڕیان هەیە، ئەوان هەمیشە لەگەڵ سروشتدا لەشەڕدابوون، بۆیە پێویستی نەدەکرد لەگەڵ خەڵکانی تردا شەڕبکەن.

من لە کۆتایی ڕۆژەکانی سەردەمێکی مێژووییدا، یان باشترە بڵێم یەک سەدەی درێژ یان سەردەمی کۆن یاخود سەردەمی جوتیاری هەزار ساڵ پێشینەم هەبووە، ئەو سەردەمەی کە من منداڵ بووم، شارەوانی ئەوەندە خاوێنکەرەوەی نەبوو کە زبڵ و خاشاک کۆبکاتەوە. بەواتایەکی تر شارەوانی بەهیچ شێوەیەک کۆکردنەوەی زبڵ و خاشاکی بەئەرکی خۆی نەدەزانی، تەنها (٤) کارمەندی هەبوو، کە شەقامەکانیان خاوێن دەکردەوە.

ئەو سەردەمە خاشاک هەر نەبوو، نە پلاستیک، نایلۆن، قوتو، شووشە و کاغەز، هیچ شتێک نەبوو. نەنانەت پرتەقاڵ و لالەنگی زۆر کەم بوو، بەڵام شووتی و کاڵەک هەبوو، توێکڵەکەیان دەدا بە بەرخۆلەکانی گەڕەک. دیارە لە گەڕەکی ئێمە، بەتایبەت دەوروبەری ماڵی ئێمە هەموو هەژار بوون، بۆیە هیچ خاشاکێک نەبوو. حسێن بیبی ڕوباب دەیگوت: دەبێت نان بە هەنجیرەوە بخۆین، چونکە توێکڵێکی وای نییە و هیچی خەسار نابێت. ئەو بەو بڕوا ئابورییەوە لە تەمەنی (٤٠) ساڵیدا بەهۆی بەدخۆراکییەوە، مرد. خەڵکەکە کاڵەک و شووتی‌یان دەخوارد و ناوکەکیان کۆدەکردەوە و توێکڵەکەشیان دەدا بە مەڕی دراوسێکانیان.

بیبی هاجەر، خودا لێی خۆش بێت، بەرخێکی هەبوو، خەڵکی گەڕەک توێکڵە کاڵەک و شووتی‌یان بۆ دەبرد. ئەوکات خواردن هەر ئەوەندە هەبوو کە بە ژەمێک دەخورا، کەس لێی هیچی لێ زیاد نەدەبوو، بۆیە خاشاک نەبوو تا فڕێبدرێت. تەنانەت خەڵکە دەوڵەمەندەکانیش خاشاکیان نەبوو. یەکێک لە دراوسێکانمان کە بە عەروس بیبی ڕوباب ناسرا بوو، (٤) منداڵی هەبوو، هاوسەرەکەی کرێکاری کارگە بوو، دەچوو تۆوی کاڵەکی دراوسێکانی کۆدەکردەوە و جوان جوان دەیکوتی و توێکڵەکەی لێ جیادەکردەوە و دەرخواردی منداڵەکانی دەدا. لە گوندەکانی لای (بافوق) ی یەزد هەرزنیان دەکرد بەچێشت و نانیشیان لێ دروستدەکرد. هەر بۆیە زۆربەی دراوسێکانمان پێش تەمەنی (٤٠) ساڵی دەمردن. ئەگەر کەمێک نانی وشک هەبووایە لەگەڵ تووە وشکە یان گوێز لە دەسکەواندا دەیانکوتی و دەیانخوارد. لەو گەڕەکانە پێش (٤٠-٥٠) ساڵ، ئەگەر کەسێک تۆزێک نانە ڕەقی فڕێبدایە ئەوە کوفری نیعمەت بوو. بۆیە ئەگەر خاوێنکەرەوەی شارەوانی بهاتنایە چییان کۆبکردایەتەوە. شارەوانی خاوێنکەرەوەی نەبوو خەڵک خاشاکی نەبوو، هەندێک ماڵ کە گوزەرانیان باش بوو چاڵێکیان هەڵدەکەند و پاشماوە و خاشاکیان تێفڕێدەدا، ئەو چاڵەش بەچەند ساڵێک پڕ نەدەبوو.

هەمان ئەو چاڵانەش کە زەویناسان بە شوێنی بەپیت ناوی دەبەن، دیارە هەموو چاڵی لەو جۆرەن کە پاشماوەیان تێفڕێدراوە. کاتێک زەویناسان باسی ئەو خاکە

بەپیتانە دەکەن، من بیرم بۆ ئەوە دەچێت کە لە سەردەمی زوودا خەڵک (سەرەنگوێلک)ی هەبووە، هەموو شتەکانیان لێ فڕێداوە. کاتێک لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) هاتمە مەشهەد، لەوێش بە عەرەبانەی ئەسپی خاشاکیان کۆدەکردەوە و دەیانبرد بۆ باخچەکانیان. با شتێکی تر باسبکەم، ئەو فاتمەیەی کە لەبرسا کۆترەکەی سەربڕی بوو، لە تەمەنی (٩-١٠)ساڵیدا شووی کرد بە پیاوێک کە تەمەنی (٦٠) ساڵ بوو، دوو ژنی تریشی هەبوو، بەڵام دەیانگوت کاروبارێکی باشی هەیە و لە ڕەفسنجان کاری بستە دەکات و لە (جیرفت) کشتوکاڵی هەیە. بە سێ مانگ چەند ڕۆژێک دەهاتەوە بۆ یەزد. فاتمە لە دوای شووکردنی لە خانووەکەی نەنە قەمەرەوە لەگەڵ پووری چوونە خانوویەکی تر کە زۆر لەو خانووە باشتر بوو، تەنها خاوەن خانووەکەی تێدابوو. فاتمە هەمیشە خۆی ئارایشت دەکرد و هاوسەرەکەشی جلوبەرگی تازە و جوانی بۆ دەهێنا، دەیانگوت هاوسەرەکەی بە فەردە خواردنی بۆ دەهێنێت. پووریشی بە بەردەوامی دەچوو بۆ کارگە. ئیتر فاتمە کۆتری کەسی نەدەدزی، بەڵام کەم کەم لەنێو خەڵکیدا دەنگۆی ئەوە بڵاوبوەوە، دەیانگوت کاتێک کە هاوسەرەکەی لە ماڵ نییە و پووریشی دەچێتە کارگە، جەواد و ئەکبەر و حەسەن و گەنجەکان سەردانی دەکەن بۆ ماڵەوە. من ئەوکات نەمدەزانی بۆچی سەردانی دەکەن یان بۆچی کێشەیە، کە سەردانی دەکەن. ژنانی گەڕەک زۆر باسیان دەکرد، تا وای لێهات پووری وازی لە کارگە هێنا و بەدیارییەوە دانیشت.

نزیکەی (٢٥) ساڵ دواتر کە من لە یەزدم جێهێشت، فاتمە تەمەنی ببوو بە (٣٥) ساڵ و هاوسەرەکەشی تەمەنی (٨٥) ساڵ بوو، لە شاری کرمان دەژیا و لە ساڵێکدا چەند ڕۆژێک دەهاتەوە یەزد بۆ لای فاتمە. بیستبووم کە کوڕانی گەڕەک سەردانی فاتمەیان دەکرد، فاتمە دوو منداڵی هەبوو لە تەمەنی (٤٣) ساڵیدا نەخۆشکەوت و مرد.

خانم سیمۆن دی بۆڤوار، نووسەری جنسی دووەم، ئەم کێشەیە لێکبداتەوە، فاتمە تەنها کچی گەڕەک نەبوو کە لە تەمەنی (٩-١٠) ساڵیدا بەشوو درابێت، دەیان کچ هەبوون کە لەو تەمەنە بچووکەدا، دایک و باوکیان لەپێناو پارووە نانێکدا دەیاندان بەشوو، دەیاندان بە پیاوێکی بەتەمەن و تلیاکخۆر. تەنانەت چەندان دەناسم کە لە خوار تەمەنی (٢٠) ساڵییەوە خۆیان کوشتووە. یەکێک لەوانە کچێکی تەمەن (٩) ساڵ بوو، کە درابوو بە پیاوێکی ژن مردووی تەمەن (٥٠) ساڵ.

کاتێک مامۆستا بووم لە زانکۆی مەشهەد، هەمیشە لە گوندەکانی سیستان و بلوجستان، باشووری خوراسان خەریکی لێکۆڵینەوە بووم، لە سەدان گوندا، دەمبینی کچی (٨ تا ١٢) ساڵەیان بە (٢٠٠-٤٠٠) هەزار تومەن فرۆشتبوو. من وا بیردەکەمەوە

کە لەپـێش (٣) هەزار ساڵیشـدا برسـی و هەژارەکـان کچـانی خۆیـان فرۆشـتووە بە دەوڵەمەندەکان، بەڵام ئێستا بەم فرۆشتنە دەڵێن هاوسەرگیریی.

نووسـینێکم هەیە بەنـاوی هاوسـەرگیری پێشـوەخت، ئەگەر بیخـوێننەوە، تێدەگەن کە ئەم کچـۆڵانە دەبێـت چەنـد چەوسـابنەوە کە لە گوندەکانـدا ڕۆژ تـا ئێـوارە لە کـاری کشتوکاڵیدا بەهیلاک براون و لە شاریشدا لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە لە کارگەی چنین بەهیلاک دەبرێن تـا پـارووەیەک نـان پەیدابکەن، پاشـان لە تەمەنی (١١) سـاڵیدا دەدرێن بەپیاوێکی (٦٠-٧٠) ساڵەی تلیاکخۆر کە ناچارن ژیانی لەگەڵدا بەسەربەرن.

کاتێـک دەگەیشـتنە تەمەنـی (١٨-٢٠) سـاڵی، هاوسـەرەکانیان دەمـردن و دەبـوونە بێـوەژن. ئەگەر بەختیـان هەبـووایە جـارێکیتر دەبـوونەوە بە خێزانـی پیـاوێکی دیـکەی هەژار، ئەگەر بەختیشیان نەبووایە دەبوو تا مردن بەبێوەژنی بمێننەوە و چەند منداڵێک بە نەهـامەتی بەخێو بکەن. جا لەم کـاتەدا منداڵەکانیان بەنـاوی دایکیـانەوە بانگدەکرێن. چـونکە بێ بـاوکن بۆ نمـوونە حسـێنی خەدیج، کـازمی سـەکینە، ئەسـغەری مەعسـومە، ڕەزای کەلسـووم، ئەگەر کۆمەڵناسـێک بێـت و لێکـدانەوەی بـۆ بکـات، کە چـۆن منـداڵ بەنـاوی دایکییەوە ناودەبرێت، وادەزانـن ئەمە پاشـماوەی سـەردەمی دایکسـالارییە، کـام دایکسالاریی، دایک داماویی.

مـن (٣) هەزار سـاڵە دەزانـم کە لە هەمـان (١٠) هەزار سـاڵ پێشـتر پیـاو تەنهـا چەنـد سـاڵێک لەلای ژن بـووە. دوایـی ڕۆیشـتووە و ژنـی بەدبەختـیش ناچـاربووە منـداڵەکانی بەخێوبکات، چونکە باوک نەبووە، منداڵەکە بەناوی دایکییەوە بانگکراوە.

ئێستا کۆمەڵناسان لە زانکۆکاندا دەڵێن سەردەمی دایکسالاریی، ئێمەی پیاو هیچ کـات ڕێگەمـان نەداوە بە ژنـان کە سـالاربن هەر منـداڵێک تـا بـاوکی لە ژیانـدا بێـت بەنـاوی باوکیەوەیەتی. من حاڵی (٤) هەزار سـاڵم بینیوە و نەمبینیوە دایکەکان سالاربن، کاتێک پیاوەکـان خەریکی ڕاو و کـۆکردنەوەی خـۆراک بـوون، مرۆڤەکـان بە کـۆمەڵ ژیـاون و هیچ خانوویان نەبووە، دایکەکان ئاگاداری منداڵەکان بوون.

دیارە کە منداڵەکان بەنـاوی دایکیـانەوە ناسـراون، دەبێتە سـەردەمی دایک سـالاریی، سالاری کێ؟ سـالاری منداڵی بێ بـاوک، کاتێک مـرۆڤ فێری کشتوکاڵ بـوو، خـانووی دروسـتکرد، دانیشـت و سـکی کەمێک تێرکـرد. شـەوانە بەدیـار ژنەکەیەوە بـووە و خـۆی بەخاوەن موڵک زانیوە و ژنەکەشی بە موڵکی خۆی زانیوە. منداڵەکان بەناوی باوکیانەوە بوون و سەردەمی پیاو سالاریی دەستپێکرد.

لە گەڕەکی ئێمە هەر باوکێک لە ژیاندا بووایە منداڵەکان بەنـاوی خـۆیەوە بـوو. وەک حەبیب ئەحمەد، ڕەجەب ئەحمەد، حسـێن مـحەمەد، هەر منداڵێکیش کە بـاوکی نەمـابوو

بەناوی دایکییەوە ناسرابوو وەک حسێن بیبی هلی، حسێن بیبی ڕوباب، محەمەد فاتمە و حسێن خەدیج.

## حوجره

من (٥) ساڵ ته‌مه‌نم ته‌واو نه‌کردبوو که ناردیانمه حوجره بۆ لای مه‌لا، مه‌لا ژنێکی خه‌ڵکی ڕه‌فسنجان بوو، ناسرا بوو به مه‌لا نه‌باتی. دو سێ کۆڵان له‌ولا ماڵی ئێمه‌وه، له نزیک کۆگای خودالێخۆشبوو محه‌مه‌د ئاوریشمی له ماڵێکدا به‌ناوی وه‌کیل ساداتدا ده‌ژیا و حوجره‌که‌ش هه‌ر له هه‌مان ماڵدا بوو. له حه‌وشه‌ی خانووه‌که‌دا حه‌وزێکی بچکۆلانه هه‌بوو که هه‌میشه چه‌ند شوڵکه هه‌نارێکی تێدابوو بۆ لێدانی منداڵه‌کان. زۆر خراپ لێیده‌داین و پاشان دووانیشی ده‌کێشا به ڕانماندا. له‌لایه‌کی تری حه‌وشه‌که‌وه ژوورێک هه‌بوو شوێنی پشووودانی خاتوو مه‌لا بوو، له زستاندا هه‌ر له‌و ژووره‌دا وانه‌مان ده‌خوێند. ژوورێکی تر هه‌بوو مه‌لا مریشک و کۆتری تێدا به‌خێوده‌کرد، چه‌ندین جار ڕوویداوه له کاتی وانه خوێندن دا مریشه‌کان ڕیقنه‌یان له‌نێو ژووره‌که‌دا کردووه.

هه‌ریه‌ک له منداڵه‌کان دۆشه‌که‌ڵه یان پێسته‌یان هه‌بوو، که له‌سه‌ری داده‌نشتن، منداڵی واش هه‌بوو هیچیانی نه‌بوو. هه‌ریه‌ک به‌جۆرێک ده‌یانخوێند، هه‌بوو (سورة الحمد)ی ده‌خوێند، هه‌بوو (جزء عمّ). هه‌ندێکیان قورئانیان خه‌تم ده‌کرد.

من پێسته‌یه‌کی خۆشکراوم هه‌بوو له‌سه‌ری داده‌نیشتم، هه‌رکاتێک خه‌و ده‌یبردمه‌وه یان باوێشکم ده‌هات به شوڵکه هه‌ناری مه‌لا لێم ده‌درا و ڕایده‌په‌ڕاندم. هه‌ر منداڵێک ڕۆژی یه‌ک نانی له‌گه‌ڵ خۆی ده‌هێنا بۆ حوجره، ئه‌وکاته نانێکی یه‌زدی بایی یه‌ک ڕیاڵ بوو، مه‌لا نانێکی ده‌کرد به‌دوو که‌رته‌وه و ده‌یدا به دوو منداڵ و نانێکی ساخی بۆخۆی هه‌ڵده‌گرت.

مه‌لا نانه‌کانی خۆی ده‌فرۆشت و ئه‌وه‌ش داهاتێکی باش بوو. له زستاندا فێرخوازه‌کان ده‌چووینه (٢٠) که‌س و هاوینان تا (٣٥) که‌س ده‌چووین. هه‌ر فێرخوازێک مانگانه (١٠-١٢) ڕیاڵی ده‌دا به خاتوو مه‌لا، هه‌بوو تا (٢٥) ڕیاڵی ده‌دا. دایک و باوکی هه‌ندێک منداڵ، له هاویندا کاڵه‌ک و شووتی‌یان بۆ مه‌لا ده‌هێنا. کرێی مه‌لا هه‌م پاره بوو

هەم شتومەک. هەر فێرخوازێک شتێکی نوێ فێر ببوایە، دەبوو باوک و دایکی نوقڵیان بهێنایە و مەلا منداڵەکەی لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا لەسەر تەنەکەیەک دادەنیشاند، نوقڵ و نەباتی بەسەردا دەپرژاند و منداڵانی تر هەڵیاندەگرتەوە. کەمێک پارەی زیادەیان دەدات بە مەلا، بەڵام ئەو منداڵانەی هەژار بوون پارەی زیادەیان نەدەدا، دەیانگوت هەژارین و نیمانە.

مەلا، فێرخوازەکانی دەکرد بە دوو بەشەوە، هەر بەشەی لەلایەک دایدەناین، و نەدەبوو ئەو دوو بەشە تێکەڵاوی یەکتربیین. ئەگەر بگوترایە بۆچی ئەم منداڵانە دەکەیتە دوو بەش؟ تەواو ڕادەما و دەیگوت با بیری لێبکەمەوە. دیارە خۆی دەیزانی بۆ وا دەیکاتە دوو دەستە و بیرکردنەوەی نەدەویست. خۆ ئەگەر لە گەنجێکی (٢٠-٣٠) ساڵە بپرسیت نازانێت هۆی چی بووە. ئێستا تۆش نازانی بۆ دەیکردن بە دوو دەستە.

هەڵبەت ئەو سەردەمە ئەسپێ زۆر بوو، مەلا منداڵە ئەسپێیاوی و ڕشکاوییەکانی دەکردە لایەکەوە و بێ ئەسپێ و پاک و خاوێنەکانیشی دەکردە لایەکی ترەوە.

لەو ڕۆژگارەدا هیچ ماڵێک حەمامی نەبوو، لە هەموو گەڕەکی پشتی باخ و تەنیشتی باخ، کە گەڕەکێکی گەورە بوو، جگە لە ماڵی کاک جەلیلی کە نوێنەری هەردوو ئوستانی یەزد و ئەسفەهان بوو، هیچ ماڵێکی تر حەمامی نەبوو. خەڵکی دەچوون بۆ حەمامی دەرەوە. تەنانەت ماڵ هەبوو لەبەر هەژاریی مانگی جارێک نەیاندەتوانی بچنە حەمام. بەڵام فێرخوازەکان بە فشاری مامۆستا هەر پانزە ڕۆژ جارێک یاخود هەفتەی جارێک دەبوایە بچنە حەمام.

پیاوەکان بۆ دەرکردنی وسڵ دەچوونە سەر جۆگە ئاوەکان، یان لە زستاندا بەیەک مەسینە ئاو خۆیان پاکدەکردەوە. تازە زاواکان بۆ دەرکردنی لەشپیسی دەبوایە بچنە حەمام، دەنا خەڵکی بەکافریان دەزانین، یان دەیانگوت لەگەڵ خێزانەکانیان کێشەیان هەیە و پیاوەتیان تێدا نییە. هەژاریی وای لە خەڵک کردبوو کە نەیاندەتوانی ساڵانە لە یەک دەست جل زیاتر بۆ منداڵەکانیان بکەن. زۆربەی منداڵەکان جلە کۆنەکانی باوک یاخود برا گەورەیان چاک دەکرد و لەبەریان دەکرد. جلشۆر و سابوون و تایت هەر نەبوو. خەڵکی دەبوو لە تەشت دا جلەکانیان بشۆرن. لەبری سابوونیش (ئەسپۆن) بەکاردەهێنرا، کە جۆرە گیایەکە. جلشۆرین تەنها کاری ژنان و کچان بوو، ئەوەندە هەڵدەتروشکان بۆ جلشۆرین هەمو تووشی چەندین نەخۆشی دەبوون، وەک ئازاری ئەژنۆکان، نەخۆشی منداڵدان. چەند ماڵێکی دەوڵەمەند هەبوون خۆیان جلەکانیان نەدەشۆرد، دەیاندا بە خەڵک بەکرێ بۆیان بشۆن.

هەندێک جلی قورس هەبوو، ئەمانە زیاتر بەدارێک پیایاندەکێشا، وەک پاڵتۆ و عەبا، هەندێک شوێن بەو دارلێدانەیان دەگوت (گازەرگا) و شوێنی تایبەت هەبوو بۆ شۆرینی ئەو جلە قورسانە. ساڵی (١٣٨٢-٢٠٠٣) لەگەڵ (میهر شاهی) و چەند خوێندکارێکی زەردەشتی یەزدی چووینە گوندی (شەرەفئاوا) پیرەژنێکی زەردەشتی ڕێبەرمان بوو، گوتی: ماڵم لە تەنیشت (کیتل گا) یە، ژنێک ئەگەر (٤) منداڵی هەبوایە و بیویستایە خۆی و هاوسەر و منداڵەکانی جلەکانیان بشۆرن و پاک و خاوێنبن، دەبوو هەفتەی لانیکەم (١٥) کاتژمێر جل بشۆرن.

ژنانی کۆڵانی ئێمە و کۆڵانی پێشتریش کە زۆربەیان لە ماڵەوە چاڵی جۆلاییان هەبوو، یان لە کارگە کاریان دەکرد، ئەوەندە کاتیان نەبوو کە جلوبەرگەکانیان بشۆرن.

جگە لە کاری سەرپەرشتی منداڵ و مێرد. زۆربەیان تەنها ئەو جلوبەرگەیان هەبوو، کە لەبەریاندا بوو، دەبوو بە زوویی بشۆردرێن و وشکبکرێنەوە و لەبەربکرێنەوە.

کاتێک کارەبا هات و نەوت نرخی پەیدا کرد، گوزەرانی خەڵکیی کەم کەم بەرەو باشی دەچوو. جلشۆر پەیدابوو، سابون و تایت زۆر بوو، مێژووی (٤) هەزار ساڵ ڕۆیشت و ژنان و کچان ئاهێکیان پێداهاتەوە. زۆربەی خەڵکیی جلشۆریان کڕی، بەڵام هەندێک دەیانگوت جلشۆرمان بۆچییە؟ خۆتان بۆ بێکار دادەنشین و جلەکانتان ناشۆرن. ئەم ژنانە دەیانگوت جلشۆر جوان جلەکان پاکناکاتەوە، جوان لەئاوی هەڵناکێشێت. خۆمان کە بەدەست دەیشۆرین چەند جارێک لەئاوی پاکی هەڵدەکێشین.

ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) کە لە مەشهەد لە زانکۆ بووم، خێزانی خوداڵێخۆشبوو دکتۆر لوتف ئەڵڵا موفەخەم، لە فەڕەنسا خوێندنی تەواو کردبوو، دەیگوت جلشۆر جلەکان باش پاکناکاتەوە، هەر بۆیەش جلشۆری نەدەکڕی. کەچی هەر هەمان ژن کاتێک خزمەتکارەکەی بەجێیهێشت، یەکەم کارێک کە کردی کڕینی جلشۆر بوو. ساڵی (١٣٦١-١٩٨٢) لە پاریس چاوم بەو ژنەکەوتەوە و پێمگوت ئەریّ ئێستا جلشۆر جلەکان پاکدەکاتەوە یان نا؟ گوتی: پاکیان دەکاتەوە، بەڵام خەڵکی تەمەڵ کردووە. ئەوکات کە ئاوی بۆریی نەبوو، تەنها حەمامی ناو بازاڕ هەبوو، ئەویش هێندە پاک و خاوێن نەبوو منداڵ هەموو ئەسپێی لێدەدان. هەڵبەتە ئەو منداڵانەی کە ژیانیان باشتر بوو، هەفتەی جارێک دەچوونە حەمام و ئەسپێ لێینەدەدان.

لە حوجرەش وای لێهاتبوو ئەسپێیاوییەکان لەلایەکەوە دادەنیشتن و بێ ئەسپێکانیش لەلایەکی ترەوە. ئەگەر منداڵێک پارچە نانێکی کەمتر بهێنایە، یان پەنیر و شتێکی کەمتر بهێنایە، یاخود جارجارێک کەللە شەکری نەهێنایە و کرێی مانگانەی لەیەک تومەن کەمتر بوایە، تەنانەت ئەگەر خاوێن و بێ ئەسپێش بوایە، ئەوا مەلا هەر

دەیخستە لای منداڵە ئەسپیاوییەکانەوە. ئەسپێ پێوەری چینی کۆمەڵایەتی بوو. لە هەمان کاتدا ئەسپێ بەهانەیەک بوو بەدەست مەلاوە. من لە تەمەنی (٥) ساڵیدا بەهۆی ئەسپێوە جیاوازیی چینەکانم بۆ دەرکەوت، ئەگەر پارەداربیت ئەوا بێ ئەسپێیت و هەمیشە لە ڕیزی بێ ئەسپێکاندایت، ئەگەر بێ پارەش بیت و ئەسپێشت پێوەنەبێت، دەبێت لە ڕیزی ئەسپیاوییەکاندا بیت. هەندێک منداڵ خاوێن بوون، بەڵام کاتێک باوکیان دەمرد و هەژار و بێ پارەبوون، هەرچەندە هەر خاوێنیش بوون، بەڵام دەچوونە ڕیزی ئەسپیاوییەکانەوە. خۆ مارکس و ئەنگلزیش هەر بەوشێوەیە خوێندویانە و بێ پارە و پولیش بوون، بەڵام بوون بە گەورەترین لێکۆڵەری ئابووریی و کۆمەڵایەتی. دەبێت هەوڵبدەیت تا جێگەی کۆمەڵایەتی خۆت دەدۆزیتەوە .

هەر بە نەبوونی حەمام و پێویستیەکانی شۆرین ڕشک، کە گەرای ئەسپێیە لەنێو قژە درێژەکانی کچاندا بە زۆری دەردەکەوتن.

کچێکی (١٢) ساڵەی دراوسێی ئێمە هەموو سەری پڕ بوو لە ڕشک، هەرچەند بەئاو دەیشۆری لەنێو نەدەچوون بەڵکو زیادیان دەکرد. سەریان تاشی بەڵام ڕشکەکان هەر بەپێستی سەرییەوە مانەوە. ناچار سەریان بە نەوت بۆ شۆری، داماوە سەری سووتایەوە و ماوەیەک تووشی نەخۆشی دەروونیی یش بوو. ئەو کچە (٥) ساڵ لە من گەورەتر بوو چەند ساڵێک پێش ئێستا لە یەزد میوانیان بووم باسی ڕشک و ئەسپێ هاتە پێشەوە، ئەویش چیرۆکی ڕشک و ئەسپێی بۆ منداڵ و نەوەکانی دەگێڕایەوە و دەیگوت خودا مرادی ئەو کەسە بدات کە سابون و تایتی دروستکرد و ئاوی ڕاکێشا بۆ ماڵان و حەمامی نێو ماڵی دروستکرد.

لە ساڵی (١٣٧٨-١٩٩٩) خوێندکارەکانم برد بۆناوچەی (سەربیشەی بیرجەند) لە هەندێک لە گوندەکاندا منداڵم دەبینی کە سەریان ڕشکی لێداوە. دیارە (سەربیشە) نزیکەی (٤٥) ساڵ لە دوای شاری یەزدەوەیە.

کە گەیشتینە هاوین، منداڵی گەورەتر، کوڕ و کچی (١٥) ساڵی هاتن بۆ حوجرە. بەهاتنی ئەم منداڵانە کە لە ئێمە گەورەتر بوون ناو حوجرە گۆڕانکارییەکی بەخۆیەوە بینی، جار جار مەلا دەرۆیشتە دەرەوە، هەندێک جار دوو کاتژمێری پێدەچوو تا دەهاتەوە، یەکێک لە فێرخوازەکانی دەکرد بە چاودێر کە لە هەمووان گەورەتر بوایە، بیرم دێت کە لە هاویندا مامۆستا دەچووە دەرەوە، فێرخوازە گەورەکان زوو زوو دەچوون بۆ توالێت لەگەڵ سەکینە دا. من نەمدەزانی بۆچی ئەو منداڵانەی تەمەنیان (١٢-١٤) ساڵە، بەیەکەوە دەچنە توالێت و بۆچی سەکینە دەبەنە ژێرزەمینەکەوە. نەمدەزانی بۆچی کاتێک دەچن بۆ توالێت منداڵەکانی تر دەستیان دەکرد بە پێکەنین. ڕۆژێک دایکی سەکینە هات بۆ حوجرە و دەستی سەکینەی گرت و لە حوجرە بردیە

دەرەوە. دوایی سەکینە ون بوو، دایک و براکانی زۆر لە نێو شاردا بۆی دەگەڕان، بەڵام نەیانـدۆزیەوە. کاتێـک تەمەنـم گەیشـتە (٨-٩) سـاڵ بیسـتم، کە کـاک حسـێن شـوفێری ئۆتۆمبێل گوتبووی کە سـەکینەی لە گەڕەکێکی خراپی شـاری عەبـادان بینیوە. من وام بیرکـردەوە کە گەڕەکێکـی خـراپ نـاو کۆڵانەکانیـان کـۆن و خـراپە وەک گەڕەکەکـانی خۆمـان. چەنـد سـاڵێکی پێچـوو تـا تێگەیشـتم مەبەسـت لە گەڕەکـی خـراپ چییە! دایکی سەکینە کە لە گوندەوە هاتبوو بۆ شاری یەزد، لە ژێرزەمینێکی تاریکدا کرێچی بوو، بە ژیـانێکی مەمــرەومەژی کــاری چنینــی دەکــرد، کە ئەو هەواڵەی بیســت لە مەراق دا نەخۆشکەوت و ئەو گەڕەکەشی بەجێهێشت.

سـاڵێک دواتـر لە داخـی سـەکینە دیقیکـرد و مـرد. درەنگێـک مـن زانـیم کە خەرجـی حوجرەی سەکینە خاوەن کارەکەی دایکی دابووی.

کچێکی تریش هەبوو ناوی (هاجێک) بوو، ئەویش باوکی لە کارگەی پەموو پاککردن تووشی سیل ببوو مرد بوو، دایکیشـی کرێکاری پـارچە چنین بـوو، دوو بـرای بچـووکی هەبوو، لە ژوورێکدا بەکرێچێتی دەژیان، هاجێک تەمەنی (١٥) ساڵ بـوو، نەهـاتە حوجرە ئەویش وەک دایکی لە ژێرزەمینێک دا خەریکی پارچە چنین بوو، بە نرخی یەک مەتـر بە یەک ڕیـاڵ و نیـو. واتە تـۆپێکی (٢٠) مەتریـی بە (٣٠) ڕیـاڵ، واتە سـێ تـومەن، چنینـی تۆپێک (٢-٣) ڕۆژی دەویست.

هاجێک ڕەنگـی زەردبـوو، هەمیشـە برسـی بـوو، دەیـانگوت لە بێ حەمـامی سـەری ڕشـکی لێداوە. مـووی سـەریان بە مقەسـت بڕی تـا ڕشـکەکان نەبـن بە ئەسـپێ. لەگەڵ سـەکینەدا بەیەکەوە ون بـوون هەردووکیـان لە گەڕەکە خـراپەکەی عەبـادان سـەریان هەڵدابوو. دواتر کاتێک کە خوێندکاری زانکۆ بووم، وانەی 'گوند و کۆچی بێ هۆ'مـان دەخوێند و ساڵانی دواتریش هەمان وانەم بە خوێندکاران دەگوتەوە، هەر کاتێـک وشـەی (کۆچ)م گوێ لێدەبوو یان بە دەممدا دەهات، شێوەی ئەو دوو کچە دەهاتەوە پێش چاوم کە لە هەمـوو تەمەنـم دا لەبیرم نـاچنەوە. وەک سـیمبولی کـۆچی بەناچاری لە مێشـکمدا دەمێنـنەوە، هەڵـبەت ئەم دوو کـچە لەبەر هەژاریـی دەسـتیان کردبـوو بە لەشفرۆشـی، ئەگەر لە گوندەکەی خۆیاندا بمانایە چی ڕوویدەدا.

خەڵکـی لە ترسـی مـردن لە گونـدەکانیان هەڵـدێن تـا لە شـار تووشـی هەژاری و ڕیسوایی بێن

دیــارە هەنــدێک لە کـۆچبەران خــاوەنی پــارە بــوون، بەڵام ئەگەر لە گونــدەکان بمانایەتەوە لەبرسا دەمردن، هەرچەندە لە شاردا بەژیانی هەژارانە دەژین. دکتۆر ئەمین عەلیـزادە مامۆسـتای پێشـکەوتووی زانکـۆی فیردەوسـی لە مەشـهەد کە هەنـدێک لە کتێبەکانی گەیشـتوونەتە چـاپی چلەمین، دەیگوت کاتێک کە منداڵ بـووە خـۆی نائارامی

# شازادەی حه مام

بە فارسییەوەنەها سەرکانیانی

جوتیـارێکی بینیـوه که خـاوەنی هـیچ زەویـیەک نەبـووە، زۆر گەڕاوە هـیچ کەسـێک بەنیوەکار نەیگرتووە. بێکاربوونی جوتیارێک واتە ساڵێک ئەو جوتیارە بێکار دەبێت. ئەو جوتیـارە دامـاوە هێنـدە نـاڕەحەت ببـوو، بـۆیە خـۆی گەیانـدبووە ئـاوی ئەنبـار و خـۆی تێفڕێدا و خۆی کوشت.

لە دەیەی سـاڵی (١٣٣٠-١٩٥٠) دا، کە عەلیـزادە ئەم قسـانە دەکـات شـارەکان پێویستیان بە کرێکار نەبووە، و کۆچ بۆ شـارەکان هیچ واتـایەکی نەبووە. گەر واتاشـی هەبووبێت، واتـاکەی سـواڵ و ریسـوایی بـووە. کەسـێکی بێکـار لە گونـدەکان یـان خـۆی دەکوشـت یـان هەژار و گەدا دەبوو پاشـان لەبرسـاندا دەمـرد. بەڵام کۆچکردن بۆ شـار خۆکوشتنە و مردنێکی هێواش و لەسـەرخۆیە. ئەوانەی کە ئامۆژگـاری خەڵـک دەکەن و دەڵـێن لە گونـدەکان بمێننەوە و مەیەنە شـار بـا خۆیـان بچنە گونـدەکان و خانووەکـانی خۆیان بدەن بە گوندنشینان.

لە کۆتاییـدا سـەکینە لە حـوجرە ڕۆیشـت و مەلاش هەمـوو ئەو کچـانەی لە حـوجرە دەریکـرد کە تەمەنیـان گەیشـتبووە (١١) سـاڵ و پێیگـوتن ئێـوە گەورەن، چیتـر پێویسـت ناکـات بێنە حـوجرە. بەڵام بـا، کـوڕە گەورەکـان بمێننەوە. ئەوەش زوڵمێکی تـر بـوو لە کچەکان کرا.

هەر کاتێـک بڕیارێـک هەبـوایە لە کوڕێـک و کچێـک یەکێکیـان دەربکرێـت هەمیشـە دەرکراوەکە کچەکە بووە. کۆتایی هاوین بوو دایک و بـاوکی کـازم هـاتن بۆ حـوجرەکە، ئەکبەریـان گـرت و تـا توانیـان لێیانـدا. ڕۆژی پێشـووتر، مەلا بـۆ مـاوەی کاتژمێرێـک لە حـوجرە ڕۆیشـتبووە دەرەوە ئەکـبەری (١٥) سـاڵ لەگەڵ کـازمی (٩) سـاڵ بەیەکەوە چووبوونە ژێرزەمین بۆ توالێتەکە.

کاتێـک کـازم لە ژێـرزەمینەکە هـاتە دەوەرەوە دەسـتیکرد بە گریـان، دوایـی چەنـد کەسێک هاتن بۆ حوجرە و داوایان لە مەلا کرد هەر فێرخوازێک کە تەمەنی گەیشتۆتە (١٠) سـاڵ لە حـوجرە دەریـان بکـات، گەر وانەکـات ئەوا نـاهێڵن منداڵەکانیان بچـنەوە بـۆ حـوجرە. مەلاش بە زوویـی هەمـوو ئەو فێرخـوازانەی لە پۆلی (٤) بەرەوژوور بوون، لە حـوجرە دەریکـردن. ئیتـر حـوجرە هـێمن بووەوە و منـداڵەکان کەمتـر دەچـوونە تەوالێتی ژێرزەمینەکە. دوایـی بـاوکی چەنـد فێرخوازێـک هـاتن لە تەنیشـت دیـواری حەوشـەکەوە توالێتیان بۆ منداڵەکان دروستکرد، ئیتر هیچ فێرخوازێک نەدەچووە توالێتی ژێـرزەمینەکە و مامۆسـتاش کەمتـر لە حـوجرە دەچـووە دەرەوە. مـن ئەسـڵی ئەم بـابەتەم نەدەزانـی دوایـی کەسـێک بـابەتەکەی تێگەیانـدم. بەڵام کـچە (٩-١٠) سـاڵەکان قسـەیان دەکـرد و پێدەکەنین، بچووکەکانیش هیچ حاڵی نەدەبوون.

# شازادەی حە مام

## هەتاوی سەردیوار

مانگی تیری ساڵی (١٣٣٤-١٩٥٥) بوو، منداڵەکان لەلای دیواری حەوشەوە خەریکی خوێندنی قورئان بوون، مەلا گوتبووی کاتێک هەتاو گەیشتە سەر دیوارەکە بڕۆنەوە. منداڵەکان چاوێکیان لەسەر قورئانەکە بوو چاوەکەی تریان لەسەر دیوارەکە. منیش سەیری دیوارەکەم دەکرد. دیوارەکە زۆر بڵند بوو، هەتاو درەنگ لەسەر دیوارەکەی دەدا.

مەلا دوو سێ شوڵکە هەناری بەدەستمدا کێشا، کە ئاگام لە قورئانەکە بێت، مەلا گوتی: هەر کاتێک هەتاو لەسەری دیوارەکەیدا من خۆم پێتاندەڵێم. بەڵام من هەر چاوم لە دیوار و هەتاو بوو.

هێشتا هەتاو لەسەر دیوارەکەی نەدابوو کە ژنێکی دراوسێی حوجرە لە سەربانەوە هاتە سەر دیوارەکە و بە مەلای گوت: حسێن بنێرەوە ماڵەوە، باوکی مردووە، من تێنەگەیشتم باوکم مردووە واتای چی. مەلا ناردمیەوە و ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە، بینیم دایکم دەگریا و لەگەڵ دراوسێکان جلی ڕەشیان لەبەرکردم. منیش چوومە ڕیزی هەتیوانی کۆڵانەوە.

حسێن و حەسەن، نورستە و ملوکە بیبی هەلی و شەش منداڵی مەعسومە قاسمی ئەسفەهانی و کاک وەلی عاشقە مەندەلەک و خوشکەکەی و (بەتول)، منداڵەکانی سەید حەکاک و ئەمانە هەموو باوکیان مردبوو، کۆڵان پڕ بوو لە بێوەژن و هەتیوو. دایکی من هەمیشە وەک شێرەژن دەیگوت: کوڕی من هەتیوو نییە، من خۆم هەم باوکم و هەم دایک. چەندین جار دایکم بەشەڕدەهات لەگەڵ ئەو پیاو و ژنانەی، کە بەمنیان دەگوت هەتیوو.

دووەم ڕۆژی پرسەی باوکم، یەکێک لە دراوسێکانمان کاک ئەحمەد ئنتیزاری برای مەهدی بەزاز، منی سواری پاسکیل کرد و بردمی بۆ ڕێوڕەسمی پرسەکە بۆ مزگەوتی

ڕێگ لە (شەقامی شا- شەقامی قیام ی ئێستا). من دوو مامم هەبوو، تا ئەو ڕۆژە کەسیانم نەدیبوو. خەڵکی دەیانگوت ئەوانە مامی تۆن، و چەند کەسی تر کە ئەوانیش کوڕە مام بوون، بەڵام نە ئەوان قسەیەکیان لەگەڵ من کرد و نە من قسەم لەگەڵ ئەواندا کرد.

من دوو سێ ڕۆژ نەچوومەوە بۆ حوجرە پاشان چوومەوە و دەستمکردەوە بە خوێندنی قورئان. هەرئەو ڕۆژە (سورەتی یاسین) م لەبەرکرد و نوقڵباران کرام، گوایە پارەی دەستخۆشی مەلا کەم بووە. بۆیە ڕۆژی دواتر پێیگوتم کە بچم لە ڕیزی ئەسپێیاوییەکان دابنیشم، منیش یەکەم نارەزاییم دەربڕی و هاوارمکرد خۆ من ڕشک و ئەسپێم پێوە نییە.

مەلا کە هەرگیز نارەزایی لە کەس نەبینیبوو، ناچار منی لە جێگەی خۆم دانیشاندەوە، نیوەڕۆ کە ڕۆیشتمەوە بە دایکم گوت: مەلا ویستی من لای ئەسپێیاوییەکانەوە دابنێت! دایکم دوانیوەڕۆ دەستیگرتم و بردمی بۆماڵی مەلا و لەگەڵ دەستی خۆیدا یەک کەللە شەکر و دوو شووتی گەورەی بۆ مەلا برد. ئیتر مەلا جارێکیتر پێینەگوتم لای ئەسپێیاوییەکانەوە دانیشە. من لەوە تێگەیشتم کە هەرگیز نارەزایی بێ هۆ نییە، بەڵام دایکم پێیگوتم دەبێت شەکر و پارە و پارچە قوماش بدەینە مەلا، تا من لەلای ئەسپێیاوییەکانەوە دانەنێت، خەباتێکی زۆرم کرد لەپێناو مانەوەم لە جێگەی خۆم.

من وا هەستدەکەم ئێستاش ئەو خەباتە بەردەوامە، ئەم خەباتە هەمیشەییە. نارەزایی من لە بەرامبەر مەلا بەهۆی کەللە شەکر و شووتییەوە بەئەنجام گەیشت. ئەمە وانەیەک بوو بۆ تەواوی تەمەنم کە دەبێت لەگەڵ نارەزاییدا بەرتیلیش بدەیت.

کۆڵان پڕ بوو لە بێوەژن، لە نزیکەی (٨) خانووی ئەمبەر و (١٢) خانووی ئەوبەر لانیکەم (٣٦) بێوەژنی تێدابوو. لە هەندێک لە خانووەکاندا (٤) بێوەژنی تێدابوو. یان پارچە چنینیان دەکرد یان جوڵایی. ئەمانە بەتێکڕا پیاوەکانیان (٢٠-٣٠) ساڵ لە خۆیان گەورەتر بوون، زۆربەیان (ئالوودە - موعتاد) بوون. کرێکاریش بوون، چونکە خواردنێکی باشیان نەبوو، زووتر لە ژنەکانیان دەمردن. شتێک کە لە یادم مابێت ژنەکان بەرهەمهێن بوون. بەڵام هیچ پشتیوانییەکی ماڵی و کۆمەڵایەتییان نەبوو، هەژار و دەستکورت بوون، زۆربەیان لەو خانووانەدا دەژیان کە ئاو و کارەبای تێدا نەبوو. فاتمە جان یەکێک بوو لەوانە کە مێردی یەکەمی مردبوو. فاتمە جان سیغەی پاسەوانێکی تلیاکخۆر بوو، ئەم پاسەوانە چەند ژنێکی تری هەبوو، ئێواران دەهاتە ماڵی فاتمە جان و تا بەرەبەریان تلیاکی دەکێشا، کە تلیاکەی تەواو دەبوو دەڕۆیشتەوە بۆ

ماڵی خۆی. زۆر جار کە من گوێ ئێشەم دەگرت، دایکم دەیبردمە لای ئەو تلیاکخۆرە و دوکەڵی تلیاکی دەکردە گوێمەوە. یاخود ناوکە ئالوباڵویەکی لای ئاگری مقەڵیەکەوە دادەنا، کە گەرم دەبوو لۆکەی تێدەپێچا و دەیخستە گوێچکەمەوە. کاتێک ئەم پاسەوانە مرد، فاتمە جان (ماسورە) ی هەڵدەپێچا. ڕەزایی وەکیل سادات، چەند مەکینەیەکی چنینی کارەبایی هێنابوو، بەڵام ماسورەکان ژنانی گەرەک بەهاوکاری مەکینەی ڕستنەکە ئەنجامدەدرا. بە مەکینەی تایبەت ماسورەکەیان هەڵدەپێچا. ماسورەکەیان دەخستە ناو مەکینەکە و خۆی دەیچنی. فاتمە جان ڕۆژانەکەی ڕیاڵ و نیوێک بوو. بەم ڕیاڵ و نیوە نەیدەتوانی گۆشت بکڕێت، چێشتی بەبێ ڕۆن لێدەنا یان کەمێک ڕۆنی تێدەکرد، چێشتەکە تەنها سکی تێردەکرد دەنا هیچ تام و لەزەتێکی نەبوو. قابلەمەیەک چێشتی لێدەنا و هەڵیدەگرت بۆ چەند ڕۆژێک. کاتێک تێری دەخوارد دەستیدەکرد بە جنێودان و دەیگوت: ڕاستە خودایە من تێربووم، بەڵام هیچ تامێکم نەکرد! جارێک دایکم پێیگوت: فاتمە جان کەمێک گۆشت بکەرە چێشتەکەتەوە، تامی خۆش دەکات! فاتمە جان گوتی: من حەزم لە گۆشت نییە! ڕۆژێک خاوەنی کارگە مەڕی سەربڕی بوو، کەمێک گۆشتی بۆ فاتمە ناردبوو، بەڵام فاتمە گۆشتەکەی بۆناردەوە و گوتی: من حەزم لە گۆشت نییە.

فاتمە جان (٢٧) ساڵ دوای مردنی مێردەکەی، مووچەی خانەنشینی مێردەکەی بۆ دەرچوو. بۆ هەر مانگێک (٨٠) تومەن بوو، ساڵی دەیکردە (٩٦٠) تومەن و بۆ ئەو (٢٧) ساڵە نزیکەی (٢٦) هەزار تومەنیان پێدا. هەڵبەت ئەو بڕە پارەیە بۆ ئەو سەردەمە یەکجار زۆر بوو، چونکە ئەو کاتە بە (٥) هەزار تومەن خانوویەکی (٣) هەزار مەتری دەکڕدرا. فاتمە جان بە نزیکەی (٨٠) تومەن فەرش و چرای نەوتی و چرای سێ فتیلە و لەمپا و هەندێک شتی دیکەی کڕی. پاشان مەڕێکی کڕی و سەری بڕی، خواردنێکی زۆری دروستکرد و هەموو دراوسێکانی داوەتکرد. شەو هاواریدەکرد و دەیگوت: خودای گەورە، تەمەنی ئەوانە درێژ بکەیت کە منیان کرد بە (شا)، بە (٢٦) هەزار تومەن خۆی بە شا دەزانی. پاشان زۆر بەتاسوقەوە گۆشتی دەخوارد. سەکینەی دراوسێیان گوتی: فاتمە جان، خۆ تۆ جاران دەتگوت حەز لە گۆشت ناکەم، ئەی ئێستا چۆن وا گۆشت دەخۆیت؟ ئەویش گوتی: هەی وا و وا... لێکراو.. ئەوسا پارەم نەبوو، بۆیە دەمگوت حەز لە گۆشت ناکەم، دەتویست سواڵبکەم؟ یا گۆشتی خێری ئەو کەسانە وەربگرم کە هیچ ڕوحمێکیان بەمن نەدەکرد؟ ئێستا کە پارەم هەیە، هەموو ڕۆژێک گۆشت دەخۆم، نزای خێر بۆ (شا) دەکەم. ئێوەش نزام بۆ بکەن کە بژیم و بخۆم. فاتمە جان تەمەنێک چێشتی بێ ڕۆن و بێ گۆشتی خواردبوو، گۆشت و ڕۆن بۆ ئەو باش نەبوو، هەر بۆیە پاش ساڵێک سەکتە لێیدا و مرد.

## شازادەی حه مام

زۆربەی ژنانی گەڕەک پارچەی (جیم) یان دەچنی، (جیم) پارچەیەکی ڕەش بوو کە ژێر شەرواڵیان لێ دروستدەکرد. زیاتر خەڵکی گوند و خێڵەکی بەکاریاندەهێنا. لە ساڵەکانی (١٣٣٥-١٣٤٠_١٩٥٦-١٩٦١) کرێی چنینی ئەم (جیم) ە، بۆ هەر مەترێک ڕیاڵ و نیوێک بوو، پارچەی (٢٠) مەتریی بوو کە بایی (٣٠) ڕیاڵ بوو. ئەو ژنانەی کە دەیانچینی هیچ جۆرە بیمەیەکیان نەبوو، هەرچەندیان بچنینایە هەر پارەی ئەوەیان وەردەگرت.

بیمەی کۆمەڵایەتی یەکێکە لە باشترین دەستەکەوتەکانی سەدەی نوێ. بیمە و خانەنیشینی کارێکی زۆر بەسوودە بۆ سەردەمی پیریی و کوێریی مرۆڤ، بەتایبەت بۆ ژنان. من دەیان ژنی کرێکاری یەزدی دەناسم کە هەموو کرێکاری کارگە گەورەکان بوون، چونکە بیمەیان هەبووە ئێستا خانەنشین کراون، چەندین کرێکاری کارگە بچووکەکانیش دەناسم هاوتەمەن و هاوپیشەی ئەوانی تر بوون، بەڵام چونکە بیمەیان نەبووە، خانەنشین نەکراون و تەنانەت لە نەخۆشیی و هەژاریی و مردنیشدا پارەیان نادەنێ. بیمەی دەرمان و مافی خانەنشینی هەرگیز ئەو نرخە بریتی نییە لە هیلاکبوونەکە. یەکێک لە چارەسەرە بنەڕەتییەکان کە وڵات دەیەوێت، جێبەجێکردنی یاسای ژمارە (٢٩) یە کە دەڵێت: "هەموو تاکێکی وڵات دەبێت خاوەنی بیمە بێت".

تەواوی ژنە هەژارەکانی گەڕەک، نموونەی فاتمە جان بە قەناعەتەوە دەژیان، سەکینە نابینای کچی بیبی ڕوباب، ماسورەی هەڵدەپێچا، کۆمەکی لە هیچ کەسێک وەرنەدەگرت. ئەو کات من لە مەشهەد خوێندکار بووم، کاتێک بۆ پشووی جەژنی نەورۆز چوومەوە یەزد سەکینەی نابینا مرد بوو. سەکینە بەهەقدەستێکی کەمی چنین ژیانێکی زۆر هەژارانەی هەبوو. من ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) بڕی (٥٠) تومەنم بۆ ڕاگرت، ئەوکاتە نرخێکی هەبوو، هەر چەندمکرد لێی وەرنەگرتم و گوتی: لەبری من، بیدەرە کەسێکی تر یان بڕۆ لە حەرەمی ئیمام ڕەزا دایبنێ. لەو سەردەمەدا هەموو ماڵەکەی سەکینە بایی (٥٠) تومەن نەدەبوو، من هەمیشە بیردەکەمەوە کە پێویستە دەوڵەت بیمە بداتە ژنانی پەککەوتە و بێکەس.

## شازادەی حەمام

تا ئەو جێیەی لە بیرم مابێت، هەموو جارێک باوکم دەیگوت دەچم بۆحەمام، حسێن یش بنێرن. بۆ تەمەنی من حەمام لە ماڵی ئێمەوە دوور بوو، بەڵام من بەتەنها دەچووم بۆ حەمام. حەمامی گەڕەک لە پشتی باخەکەوە لە ناوەڕاستی گەڕەکەکەدا بوو، لە تەنیشت مزگەوتی حسێنیە و بازاڕە بچکۆلە و تانکی ئاوەکە. حەمامی ژنان و پیاوان لە یەکتری جیابوون. هەندێک گەڕەک یان گوند یەک حەمامیان هەبوو، کاتژمێرێک بۆ پیاوان و کاتژمێرێک بۆ ژنان بوو، ئاوی حەمام بەهۆی گایەکەوە بە (ناعورە) لە بیر دەردەهێنرا. حەمام و بیری ئاوەکە بەتەنیشت یەکەوە بوون، باسی حەمام و گا، نووسینی زۆر هەڵدەگرێت کە لە توانای ئەم بیرەوەرییەدا نییە. لە بیرەوەرییەکی تردا بەناوی (سوودەکانی گا) باسمکردووە.

حەمامی پیاوان ڕاڕەوێکی تەسکی هەبوو، ناو حەمامەکە هۆڵێکی گەورەی هەبوو، هەر کەسێک بوخچەی جلەکانی لە تەنیشت ژوورەکەوە دادەنا، دیواری ژوورەکان نزیکەی یەک مەتر بەرزبوون، لە ناوەڕاستی هۆڵی حەمامدا حەوزێک هەبوو، لە تەنیشت حەوزەکەوە ڕاخەری سەرتاشەکان ڕاخرابوو، کە سەر و ڕیشی خەڵکیان دەتاشی، لە بەردەم دەرگای چوونە دەرەوە جێگای وەستا جەعفەری حەمامچی بوو، پەنجەرەیەکی گەورەش هەبوو بۆ ڕووناککردنەوەی حەمامەکە.

کاتێک گەیشتمە حەمام باوکم کاتژمێرێک دەبوو ڕۆیشتبوو بۆ حەمام، سەرتاشی حەمام پێشتر بوخچەی منی بردبوو. کاتێک چوومە ناو حەمامەکەوە، ڕەزای سەرتاش دەیگوت شازادە هات لە پشتی پەنجەرەکەوە هاواریدەکرد و دەیگوت: کاک میرزا ئەحمەد، شازادە هات. بەسڵاوات لێدان منی بڵند دەکردەوە و دەیبردمە ژوورەکەوە، جلەکانمی دادەنا و پەشتەماڵێکی بچووکی لە کەمەرم دەبەست و بەرزی دەکردمەوە و لە پشتی پەنجەرە شووشەکەوە هاواریدەکرد: کاک میرزا سەیری شازادەکە بکە. پاشان

منی دەبردە ناو حەمامەکەوە و قاپی حەمام گەورە بوو هەمیشە خەڵکی لە ناوەڕاستی حەمـام دەنووسـتن. لەولاوە سەرتاشـەکان خەریکـی سەرتاشـینی کەسـانی تـر بـوون. سەکۆیەکی تر هەبوو کە خەڵکی دوای سەرتاشین لەسـەری دادەنیشتن و سەرتاشـەکان لفکەیـان لە پشـتیان دەدا و دەیانشـۆرین. لە لاتەنیشـتەوە حەوزی بچـووک هەبـوو، ئەم حەوزە هەر بەدەم حەوزە گەورەکەوە بـوو، منـدالانیش دەچـوونە حەوزە بچـووکەکەوە. کاتێـک چـوومە هـۆڵی حەمـامەکەوە، پەشـتەماڵەکەم کـردەوە و چـوومە نـاو حەوزە بچووکەکەوە. چونکە ئاوەکە گەرم و خۆش بوو، یەکسەر هەستمکرد کە سکم ناڕەحەتە و پیسایيم دەکردە ناو ئاوەکەوە، وام هەستکرد، کە پیسیاییەکەم لە ئاوەکە جیا دەبێتەوە و دەچێتە لایەکەوە. هەمیشە چەندین منداڵ دەچوونە ناو حەوزەکەوە. خودا دەیزانێت لە سەدا چەندی ئاوەکە پیسایی منداڵەکان بووە. ئەوکاتە تازە دوشی حەمام پەیدا ببوو، هەنـدێک کەس دەیـانگوت دوش پیـاو پـاک ناکـاتەوە، بـۆ بـۆ وسـڵ دەرکـردن دەچـوونە حەوزەکەوە. من نەمدەزانی وسڵ چییە! بەڵام ئەمە ڕاسـت بـوو یـان نـا مـن وسـڵی دۆش فەرامۆش ناکەم.

جارێکیان باوکێک لە نێو حەمامەکەدا دەستیکرد بەتێهەڵدانی کوڕە تازە زاوا کەی، کە بۆچی لە حەوزەکە وسڵ دەرناکات و دەچێتە ژێر دۆشـەکە. پیرەمێرد لە کوڕەکەی دەدا و دەیگوت: وسڵی ژێر دۆش بەتاڵە و وسڵی دەرناچێت، تۆ هەمیشە پیسـی هەر کەسێک لەشــی پــیس بێــت منــداڵەکانی حەرام زادە دەبــن! بەڵام گەنجەکــان دەیــانگوت ئــاوی حەوزەکە دەبێتە هۆی گەڕیی و کەچەڵی و تراخومای چاو، پیرەمێردەکان دەیـانگوت ئەم قسانەی ئێوە قسەی بێدینەکانە، بۆیە هەمیشە کێشە لە نێوان گەنجەکان و پیرەمێردەکان هەبوو. پیرەمێردەکان ڕیشـیان دەهێشـتەوە و خەنەیـان لێدەدا. بەڵام گەنجەکـان ڕیشـیان دەتاشی، پیرەمێردەکان لەگەڵ گەنجەکان هەرایان بوو، دەیانگوت ڕیش تاشین حەرامە.

محەمەد حسێن دوکاندار دەیبۆڵاند بەسەر کوڕەکەیدا و دەیگوت: تۆ سـەرت دەتاشـی و ڕیشــت ســوور دەکەی. مــحەمەد کە مــجەوری مــزگەوت بــوو کــوڕەکەی و هەمــوو ئەوانەی ڕیشیان دەتاشی بەکافر و بێدین دەزانی.

دەیگوت هەر کەسێک ڕیش بتاشێت لە بەراز خراپترە. من وام بیردەکردەوە کە ڕیش تاشراوەکان لە حەسەن بەراز خراپترن، چونکە حەسـەن بەراز ڕۆژانی عاشـورا سـواری ئەسپ دەبوو، دوو منداڵی بەدوای ئەسپەکەدا ڕادەکێشا، بیرمدێت ڕۆژێک کـاک مـحەمەد خەنەی لە سەرو ڕیشی دابوو، لە ناوەڕاسـتی حەمـام خەوی لێکەوتبوو، لەناکـاو لە خەو ڕاپەڕی و گوتی: ئاگرم تێبەربـوو. دەسـتیبرد بۆ ڕیشـی و یەک مشـت مـوو بەدەسـتیەوە هاتە دەرەوە. سەرتاشەکان هاواریانکرد ئەمە کـاری کـاک وەلییە. پاشـان چەند سـەتڵێک

ئاویان بەسەر و دەموچاوی کاک محەمەد دا کرد. پیرەمێرد شێت و هار ببوو، گوتی: ئاوێنەم بۆ بهێنن.. کە ئاوێنەیان بۆ هێنا و سەیری خۆی کرد، دەستیکرد بە گریان. دیار بوو ئەوە کاری کاک ولی بوو کە منداڵێکی(١٢-١٣) ساڵ بوو. دەرمانێکی تێکەڵی خەنە و ڕەنگەکەی کاک محەمەد کردبوو، کاک محەمەد لە حەمام ڕۆیشت و سەر و دەموچاوی بەجۆرێک پێچـایەوە، کە دەرنەکەوێت، چـونکە دامـاوە تەواوی مـووی سـەرو ڕیش و بـرۆی هەڵـوەری بـوو، هەر لە کەللــە سـەری مەڕ دەچوو،کاتێـک کە چـاک دەکـرا بـۆ خواردن.

کـاک محەمەد یەک هەفتە نەیتـوانی لە مـاڵ بێتە دەرەوە، ئەو دەرمـانەی کە تێکەڵـی خەنەکە کرابوو، پێیان دەگوت (واجبی)، پاشان زانیم کە (واجبی) چەند ترسناکە و نابێت مـن ئەو دەزمـانە تێکەڵـی خەنەی خەڵکـی بـکەم. پـاش سـەرچاککردنی مـن لەلایەن سەرتاشــەوە، شــازادە لە حەوزەکەدا یـاریی دەکـرد. سەرتاشـێک هـات و شـازادەی لە حەمــامەکە دەرهێنــا و زۆر لەســەرخۆ دەســتیکرد بە لفکەلێـدان و شــۆرینی. پاشــان شازادەی بەخاولی وشک کردەوە و لە باوەشی کرد و بردی بۆلای کاک میرزا ئەحمەد لە ژوورێکدا لە تەنیشتییەوە داینا. جلیان لەبەرکرد و لەگەڵ باوکیدا ڕۆیشتەوە بۆماڵەوە.

من لە منداڵیدا، بە (شازادە) ناسرا بووم، هەموو حەزو ئارەزووم پیسایکردن بـوو لە حەوزی حەمامەکەدا، کاتێک باوکم مرد هەفتەی دواتر لەگەڵ خاڵمدا چووم بۆ حەمـام، بەڵام مـاڵی خـاڵم لە گەڕەکی ئێمەوە دوور بـوو، بـۆ مـن نـاخۆش بـوو کە بـوخچەکەم بەدەستمەوە بگرم و بڕۆم بۆ گەڕەکی ماڵی خاڵم. بۆیە بەدایکمم گوت: ئیتر من بەتەنهـا دەڕۆم بـۆ حەمـام. (١٥) ڕیـاڵی دامـێ و چـوومە حەمـام. سەرتاشـی هەمیشـەیی (ڕەزای سـەرتاش) سـاڵی (١٣٦٣-١٩٨٤) کۆچی کـرد خـودا لێـی خۆشـبێت، کاتێـک چـووم هـیچ هـاواری نەکـرد کە شــازادە هـات، هەر وەک منـی نەدیبێـت  . ســڵاوم لێکـرد، وەڵامـی نەدامەوە.

ژوورەکە یەک مەتـر بەرزتـر بـوو، پلیکـانەی نەبـوو هەرچۆنێـک بـوو سـەرکەوتم و چــوومە ژوورەوە، لە چاوەڕوانیــدا بــووم، بەڵام کەس نەهــات بەلامەوە بــۆیە خــۆم پەشـتەماڵم بەسـت و لە ژوورەکە هـاتمە دەرەوە. لەو کـاتەدا پەشـتەماڵەکەم کـرایەوە و بەربـوەوە و زۆر شـەرمەزار بـووم، شـەرمەزارییەک، کە هەرگیـز بیرنـاچێتەوە. ئـارەقەم کـردەوە لەشـەرما. دووبـارە پەشـتەماڵم بەسـتەوە و چـوومە نـاو حەمـامەکەوە. ئەو پیــاوانەی لە حەمــام دا بــوون هــیچ کەســێک هەواڵــی شــازادەی نەپرســی. هەمیشــە سەرتاشـەکان هەواڵـی شـازادەیان دەپرسـی بەڵام ئەمجـارە کەس لێـی نەپرسـی. ڕەنـگە لەبەر هەڵـم منیـان نەبینـی بێت. وەک جـارانیتر چوومەوە حەوزەکە و مـاوەیەک یـاریم

تێداکرد، بەڵام هیچ سەرتاشێک نەهات بەلامەوە. لە حەوزەکە، هاتمە دەرەوە ماوەیەک لەسەر سەکۆکە دانیشتم، کەس لفەکەی لێنەدام و نەیشۆردم. چڵکەکە هەر بەلەشمەوە بوو بە پەشتەماڵ خۆم وشککردەوە و جلەکانم لەبەرکردەوە و هاتمە لای وەستا جەعفەر. گوتی: پارەبدە! منیش (١٥) ریاڵەکەم کردە دەستیەوە. هیچم نەگوت و گەڕامەوە بۆماڵەوە. دایکم سەیری کرد نەشۆراوم. گوتی:، کێ تۆی شۆرد؟ گوتم: هیچ کەسێک! گوتی: بۆ سەرت چاک نەکردووە؟ گوتم: کەس سەری چاک نەکردم. پاشان دایکم دەستیگرتم و بردمی بەرەو حەمام، بانگی وەستا جەعفەری کرد و پێیگوت: مەگەر من پارەم نەدابوو بە ئەم منداڵە؟ نرخی ئێوە چەندە؟.. جاران لەگەڵ باوکی دەهات ڕێکوپێک سەرتان چاکدەکرد و جوان بۆتان دەتاشی، ئێستا نە سەری بۆ چاک کراوە و نەشۆردراوە.

وەستا جەعفەر داوای لێبووردنی کرد و گوتی: بیهێنەرەوە بۆ حەمام، بەڵام دایکم دەستیگرتم و بردمیەوە بۆ ماڵەوە. جاری دواتر دایکم لەگەڵ خۆی دا بردمی بۆ حەمامی ژنان، چەند جارێک لەگەڵ دایکم ڕۆیشتم بۆ حەمامی ژنان. هەندێک لە ژنەکان وەکو فاتمە جاان بەیانیان زوو دەچوون بۆ حەمام و ئێوارە درەنگ دەهاتنەوە. وەستای حەمام ئەوانی بە زۆر لە حەمام دەکردە دەرەوە. زۆربەی ژنەکان لەگەڵ خۆیاندا میوە و نانی نیوەڕۆیان دەبرد لە بەیانی زووەوە تا ئێوارە درەنگ لە حەمامدا دەمانەوە. حەمام بۆئەوان جۆرێک لە خۆشگوزەرانی بوو، حەمامی ژنان لە حەمامی پیاوان زیاتر گرنگی پێدرابوو. لە حەمامی ژناندا ژنی بازرگان و پیاوە ناسراوەکان شوێنی تایبەتیان هەبوو، قاپ و تەشتی تایبەتیان هەبوو. شاگردی حەمام ڕۆژی پێشووتر پەیوەندی پێوە دەکردن و پێویستیەکانیانی بۆ دەبردن بۆ حەمام. ئەم ژنانە بۆیان هەبوو، سوود لە سینی مس وەربگرن بۆ دانیشتن، بەڵام ژنی کرێکار و هەژارەکان بۆیان نەبوو لەسەر سینی دابنیشن و دەبوایە لەسەر زەوی دابنیشن.

ژنی کۆیلەکان و غەریبەکان لە کۆشکەکانی حەمام دا جێگایان هەبوو، لە گەڕەکی پشتی باخ ژمارەیەک کولی لە چەند کۆلانێکدا هەبوون، کاری ئەمانە دروستکردنی شتی جوانکاریی بوو بۆ ژنان، کە لە پێستی بزن دروستیان دەکرد. هەروەها دروستکردنی چەقۆ و شیشی کەباب، حەمامی پیاوانیش تاڕادەیەک چینایەتی بوو بەڵام نەک وەک حەمامی ژنان.

پاش چەند جارێک چوونم بۆ حەمامی ژنان، ژنێک بە دایکمی گوت: بۆ خاتری خودا، ئیتر ئەم کوڕە مەهێنە بۆ حەمام، چونکە گەورە بووە و هەموو شتێک دەزانێت. ئەم ژنە تاڕادەیەک مافی خۆی بوو، من هەموو شتێکم نەدەزانی بەڵام هەموو شتێکم لەیادە.

بڕیارماندا ئیتر من لەگەڵ دایکم نەچمە حەمام و لەگەڵ خاڵم بڕۆم. بەڵام ماڵی خاڵم لە ماڵی ئێمەوە دوور بوو، چەند جارێک لەگەڵ خاڵم چووم بۆ حەمام، حەمامی گەڕەکی ئەوان حەمامێکی نوێ بوو حەوزی تێدا نەبوو، پاشان بڕیارمدا هەر خۆم بەتەنها بچم بۆ حەمامی گەڕەکی خۆمان.

لە پۆلی دووەمی سەرەتایی بووم، هەڵبەت من دوای مردنی باوکم حسێن بووم نەک (شازادە)، بەپێدانی(٣) ڕیاڵ زیادە، واتا هەژدە ڕیاڵ وەک هەر کەسێک ڕۆیشتم بۆ حەمامی وەستا جەعفەر.

من لە ماوەیەکی کەمی ژیانمدا شازادە بووم، بەڵام شازادەی حەمام، شازادەییەک خۆشییەکەی تەنها لە گوکردندا بوو لە نێو حەوزی حەمامەکەدا و هیچی تر. پاشان تێگەیشتم کە باوکم بۆ چوونە حەمامی من (٧) تومەنی دابوو، جگە لەوەی لە جەژنی نەورۆزدا یەکباری حوشتر شووتی و دە (مەن)ی یەزد واتا (٦٠) کیلۆ ئاردی دابوو بە خاوەن حەمامەکە.

بەڵێ، من بەو جۆرە شازادە بووم، کە هیچ کەسێک بە (١٥) ڕیاڵ نابێت بەشازادە. وەک پێشتر گوتم من پێش قوتابخانە چوومە حوجرەی خاتوو مەلا نەباتی، کە وانەی گوڵستانی پێدەگوتین لە هەندێ ڕستەدا دەیگوت (١٠-٢٠) جار دووبارەی بکەنەوە.. تاوەکو بەباشی بچێتە مێشکمانەوە، بەڵام مەلا نەباتی دەیگوت ئەم ڕستەیە لە پێش هەموو ڕستەکانی تردا دووبارە بکەنەوە:

(هر کە را زر در ترازوست زور در بازوست و آنکە بر دینار دسترش ندارد در همە دنیا کس ندارد)

واتا: (هەر کەسێک زێڕ لە تەرازوویدابێت، بازنەی زێڕی لەدەستدایە و هەر کەسێکیش دەستی بە دینار نەگات لە دنیادا بێکەسە).

من چەندین جار شاهید بووم، سەرتاشەکان شازادەکانیان دەخستە سەر دەستیان و لە پشتی پەنجەرەکەوە هاواریاندەکرد، کاک سەفار کاک مەهدی شازادە هات. شاهیدم کە دوای مردنی باوکەکان منداڵەکان شازادە نەدەمان. تەنها پارە دەیتوانی وا بکات کە سەرتاشەکان ڕەحم و بەزەییان هەبێت بەرامبەر بە منداڵان. پارە تەرازووی شازادەیی بوو. من کە لە شەش ساڵیدا لە شازادەیی کەوتم و سەرتاشەکان باوەشیان نەکردم بۆ ناو حەمام، ئیتر خۆم فێربووم کە چۆن بچمە ناو حەمام و قاچم وا دابنێم کە نەخزێم و نەکەوم. خۆم بتوانم خۆم پاکبکەمەوە. تەختی حەمام تەختی ژیانی من بوو، لە سەردەمێک دا، کە لە گەڕەکێک دا تەنها یەک حەمام هەبوو، لە ماڵانیشدا بەهیچ جۆرێک حەمام نەبوو.

# شازادەی حەمام

حەمام جێگەی بڵاوبوونەوەی هەواڵەکان بوو، حەمام شوێنی کۆنترۆڵکردنی خەڵکی بوو، ئەگەر کەسێک ژنی بهێنایە و نەچووایە بۆ حەمام، سێ حاڵەتی هەبوو، یا بێ دین بوو، یا نوێژی نەدەکرد یان پیاوەتی تیا نەبوو. پیاو و ژن دەبوایە هەردووکیان وەڵامی دراوسێکانیان بدەنەوە، کە بۆچی ناچن بۆ حەمام، مەلا بانگی دەکرد کە تۆ تازە زاوای بۆچی ناچیت بۆ حەمام، زۆر لە ژنان و پیاوان بەکۆمەڵ دەچوون بۆ حەمام بەکۆمەڵ وسڵیان لەخۆیان دەردەکرد. تا بە کافر ناویان نەبەن، یاخود تا لەبەرچاوی خەڵک باسی نامەردی پیاوانیان نەکرێت. ئەگەر پیاوێک لە ژنەکەی خۆی بدایە بۆ سبەینێ هەموو کەس لە حەمام دەیزانی کە ئەو ژنە لێدانی خواردووە. پاشان مەلای مزگەوت پێیدەزانی و بانگی پیاوەکەی دەکرد و ئامۆژگاری دەکرد. هەندێک جار لەسەر مینبەری مزگەوت باسی ئەو کێشانەی دەکرد بەبێئەوەی ناوی کەس بهێنێت، بەڵام هەموو خەڵک دەیزانی کە کێ ئازاری ژنەکەی خۆی داوە، چونکە نەچووەتە حەمام یان نەچووە بۆ مزگەوت. حەمام شوێنێکی کۆمەڵایەتی و هەواڵی بوو، جێگای ئالوگۆڕی هەواڵ و زانیارییەکان بوو. حەمام گشتی بوو هەموو کەسێکی بۆ دەهات هەربۆیە هەموو هەواڵێک لەوێ هەبوو. ژنەکان بەدیقەت سەیری لەشولاری کچانیان دەکرد، تا کاتی خوازبێنی هەموو شتێک لەبارەیەوە بزانن. حەمامی گشتی شوێنێک بوو، کە خەڵکەکە هەموو شتێکی لەبارەی ڕوح و لەشەوە دەزانی، دیواری ژیانی خەڵکەکەی دەڕوخاند، حەمام لە هەمان کاتدا هۆیەک بوو، کە خەڵک ڕەفتاری دوولایەنە بگونجێنێت، حەمام شوێنی یەکتر بینینی خەڵکەکان بوو، کەمتر ڕێدەکەوت کەسێک بچێت بۆ حەمامێکی تر، حەمام بریتی بوو لە هاوڕێیەتی و پەیمانبەستن و خۆشەویستی. هەموو بەیانییەکی هەینی ڕیش سپییان و گەورە پیاوانی گەڕەک دەچوونە حەمام بۆ چارەسەرەکردنی تێکڕایی کێشەکانیان، لە هەمان کاتدا حەمام جێگەی هاوبەشی نێوان ژن و پیاو بوو.

هەر پیاوێک کە ژنی ئازاربدایە تەواوی خەڵکی گەڕەک دەیزانی. ڕەنگە لە سەردەمی حەمامی گشتی دا کەمتر خەڵک تووشی کێشە و ناڕەحەتی بووبێت، کاتێک حەمام بوو بە دوش و تایبەتی خەڵکیش کەوتنە قۆناغێکی تازەی ژیانەوە.

حەمامی کۆن پێش ئەوەی لە ڕوانگەی تەندروستییەوە گرنگ بێت لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتیشەوە گرنگ بوو، کاتێک حەمام بوو بە نمرە، مرۆڤەکان دوای چەند سەدەیەک توانیان بۆ لەشساغی خۆیان کەسێک بهێنن لە هەندێک مەزهەبی ئیسلامی و لە هەندێک کەمینەدا حەمامی گشتی و خۆڕووتکردنەوە، لە ڕوانگەی خەڵکانی ترەوە تەنانەت بۆ پیاوانیش حەرامە، هەر بۆیەش لەم ناوچانەدا هەرگیز حەمامی گشتی نەبووە

## یەکەم گەشت

یەکەم گەشتی من بۆ بیدەی موبید بوو، گوندێک کە نزیکەی (٤٥ کم) لە یەزدەوە دوورە، بەتەواوی بیرم نییە کە ئەم گەشتە چ کاتێک بوو، بەڵام دەزانم تەمەنم (٥) ساڵ بوو، لەبیرمە (پوورە خانم) پووری گەورەم لە یەکێک لە گوندەکانی موبید دەژیا. باپیرە گەورەم خەڵکی بیدە بوو، کە بە نەخۆشیی سیل مرد بوو، ژنەکەشی هەر سیلی بوو، نە دەوڵەت نەهیچ کەسێک هاوکارییەکیان پێشکەش نەکردبوو. هاوکاری وڵات لەم ساڵانەی دواییدا دەکرا، کاتێک کە پارەی نەوت پەیدا بوو، ئەو لەگەڵ خوشکی ژنە بچووکەکەیدا، کە چەند ساڵ دوای مردنی ژنەکەی، مارەی دەکات و لەگەڵ کچە بچکۆلانەکەیان دێنە یەزد و لەوێ نیشتەجێ دەبن، لە کارگەی ئیقبال کە تازە خەریکی دروستکردنی بوون بە بەنا دادەمەزرێت، تا کۆتایی تەمەنی لەوێ ماوەتەوە، لە خێزانی دووەمی کە خوشکی ژنی ڕەحمەتی بوو، ببووە خاوەنی (٤) کچ و کوڕێک. کچە گەورەکەی لە ژنی یەکەمی بوو، کە بە پوورە بیبی ناسراو بوو. پووری گەورەم لە بیدە شووی کردبوو، واتا پوورە خانم لە بیدە دەژیا، ئێستا کە ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) بە تەمەنی (٩٠) ساڵە، لە بیدە دەژی و زۆر بەهۆش و گۆشە. خودا تەمەنی درێژ بکات ساڵی (١٣٣٣-١٩٥٤) پووری هاتبوو بۆ یەزد، پێمخۆش بوو منیش لەگەڵ پوورم بڕۆم بۆ بیدە. لە یەزدەوە تا بیدە جادەکەی زۆر خراپ بوو ئۆتۆمبێل بەکەمی دەچوو. دەبوو بە حوشتر بچین بۆ بیدە، هەڵبەت ئەوە بۆمن زۆر خۆش بوو. هاوین بوو، هەوا گەرم بوو، دەمە و ئێواران هەوا فێنکتر دەبوو. پوورم سواری حوشترێک بوو منی لە بەردەمی خۆیەوە سوار کرد. لەگەڵ چەند حوشتری تر کە ئەوانیش باریان لێ بارکرابوو، یان خەڵکی تر سواریان ببوو، لە یەزدەوە بەرەو موبید کەوتینەڕێ. ڕێگاکە هەمووی خۆڵ بوو، وردە وردە دنیا تاریک دەبوو، نەسیمی فێنکی (کەوێر) لە دەموچاوی دەدایـن، دەنگی زەنگۆڵەی

حوشـــترەکان بێـدەنگی بیابانیـــان دەشـــکاند. ملیارەهـــا ئەســـتێرە ئاســـمانی کەوێریـــان داپۆشیبوو.

حوشـترەکان بەهێواشـی هەنگاویـان هەڵدەهێنا، گونـدەکانی نزیـک ڕێگـاکە هیچیـان کارەبایان نەبوو، تەنها لە ڕووناکی مانگەشەودا تارمایی خانووەکان دەبینرا. لە پوورمم پرسـی: ئێـرە کـوێیە و چ دێـیەکە؟ پـوورم گـوتی: ئێـرە (زارچ)ـە زەوی حەکـیم ئـاوای ئەشکەزەر و جەعفەرئاوا و ئاگریی پیرۆزی زەردەشتییەکانە.

لە ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤) دا لەگەڵ دکتۆر داریۆش میهر شاهی و چەند خوێندکارێکی زەردەشتی لەم جەعفەرئاوایە کە هەمووی ژێر بەرد و گڵ کەوتبوو و قوتابخانەکەشیان ڕووخابوو، سەیرمکرد پیاوێکی زەردەشتی کە مامۆستایەکی خانەنشین بوو، ئاگردانی زەردەشـتییەکانی لەژێـر بەردو گـڵ دەرکـردۆتەوە، دروسـتی کـردۆتەوە و ئـاگرەکەی ڕۆشن کردۆتەوە. هەموو ڕۆژێک لە یەزدەوە (٣٠کم) بە ئۆتۆمبێل دەبڕی تا ئاگردانەکە بـۆئەوەی ئاگـای لە ئـاگری پیـرۆز بێت و بە ڕۆشـنی بیهێڵێتەوە. لەوانەیە ئەمە دوایـین هەوڵ بوو بێت بۆ بەڕۆشنی هێشتنەوەی ئـاگری پیـرۆز. ئاگردانێک کە تەنهـا و نـامۆ لە نێـو چەو و بەردی دەشـتی کەوێـر بـۆ پاسـەوانیکردنی لە ئـایینی (٤) هەزار سـاڵە، ئایـا دوای ئەم پیـاوە کەسـێکی تـر ئاگـاداری ئەم ئـاگرە دەبێـت و نەهێڵێـت بکـوژێتەوە. بەبۆچوونی من تەنهـا گەشـتیاران دەتوانن ببنە هـۆی ئاگاداری و ڕۆشـن مـانەوەی ئەم ئـــاگردانە، بەهەرحـــاڵ، نیوەشـــەو گەیشـــتینە کاروانســـەرای شەمســـە، ئەم گونـــدە کاروانسەرای باشی هەبوو. حوشترەکان بەنێو گردۆڵکە و چەو و بەردا (٦-٧) کـاتژمێر ڕێگایـان بڕیبـوو، زۆر مانـدوو ببـوون. بـۆیە دەبـوایە پشـوویەک بـدەن، خەڵـکەکەش کە چەنـدین کـاتژمێر سـواری حوشـتر ببـوون هـیلاک ببـوون، شـەو لەسـەر سـەکۆکانی کاروانسەرا خەوتم، بەیانی زوو بەرەو بیدە بەڕێکەوتین. شەوێکی یادگاری بوو، قافڵەی تریش گەیشـت بوونە شەمسـی، حوشـترێکی زۆر لە دەوروبەری کاروانسـەراکە بـوون، بەهێواشـی کاوێژیـان دەکـرد، خەڵـکەکە بـاری حوشـترەکانیان داگـرت و لە تەنیشـت حوشترەکان یان لەسەر سەکۆکان پشوویان دەدا.

کـاتی بـانگی بەیـانی تێکـڕا ژن و پیاوەکـان هەڵسـان نوێژیـان کـردو بەرەو بیـدە بەڕێکەوتین. نزیکەی کاتژمێر (٩)ی بەیانی گەیشتینە بیدە. بیدە گوندێکی کۆنە، ماڵەکانی گوندەکە لەسـەر گـردۆڵکەیەک دروسـتکراون و خانووەکـان زۆر بەسـەر یەکەوە بـوون، کۆڵانەکانیان تەسک و تاریک بوو، حوشترەکان نەیاندەتوانی بڕۆنە پێش ماڵەکان. عەلی مستەفای مێردی پوورم کە زانـی ژنەکەی لە شـارەوە دەگەڕێتەوە، بە وڵاخەکەیەوە لە دەرەوەی دێ چاوەڕوانی دەکرد، بارەکەی لە وڵاخەکەی خـۆی بـارکرد و منیشـی خستە

سەربارەکە و بەرەو ماڵ بەڕێکەوتین. ماڵی پووره خانم لە بەزترین شوێنی گوندەکە لەسەر گردۆڵکەیەک بوو، بەسەر هەموو ماڵەکاندا دەیڕوانی، لە سەربانەکەیانەوە هەموو دەشتی موبید دیار بوو، بەڵام ئاوهێنان بۆ ئەم ماڵە کارێکی گران بوو.

پووره خانم سێ کچی هەبوو، هەموویان چەند ساڵێک لە من گەورەتر بوون، یەکێک لە کچەکانی زیاتر یاریی لەگەڵ دەکردم و دەیبردم بۆ دەشت و باخ. ساڵی دوایی نەخۆشکەوت و لە موبید دکتۆر نەبوو، جگە لە حوشتر هیچ هۆیەکی گواستنەوەی تریش نەبوو تاوەکو بهێنن بۆ شار، بەهۆی درەنگ هێنانی و درەنگ هەستکردن بە نەخۆشییەکەی، کاتێک گەیشتبوونە یەزد چارەسەر نەکراو لە تەمەنی (٩) ساڵی دا لە نەخۆشخانەی پەهلەوی کە دوای شۆڕش ناوی گۆڕدرا بۆ (فەرخی)، گیانی لەدەستدا. پوورم کولێرەی (کوماج)ی بۆدروست دەکردین چ کولێرەیەک کە دوای (٥٠) ساڵ، هێشتا تامی لە بنی ددانەکانمدا ماوە.

کشتوکاڵیان درەو کردبوو، بەڵام لە باخ دا جۆرەها میوە هەبوو، پوورم باخێکی هەبوو، باخێکی بچووکیش کە باخی بابە گەورە بوو بە دەست ئەوانەوە بوو، باخەکانیان بەئاوی جۆگە ئاودەدرا، باخی پڕ لە هەنار، کە هەنارەکەی لە هەموو وڵاتدا بەناوبانگ بوو، هەر سێ هەناری کیلۆیەک زیاتر بوو، دەنکەکانی وەک یاقوت بوون، ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤) هەمان ڕێگام بە ئۆتۆمبێل بە (٢٥) خولەک بڕی، بینیم بیدە زۆر گۆڕا بوو، خانووی جوان و کارەبا و ئاوی بۆریی هەبوو، پارەی کوێت هەموو شتێکی گوندەکانی موبیدی گۆڕی بوو. ئاوی جۆگەکەش وشکی کرد بوو، شوێنەواری نەمابوو، باخی هەنار هەر نەمابوو، پارەی کوێت و خزمەتگوزارییەکانی وڵات بیدەی ئاوەدان کردبۆوە. بەڵام گوندی تەکیەبەر کشتوکاڵی نەبوو، تەنها داهاتی کۆچبەرانی بیدە بوو بۆ کوێت، بیدە ئێستا گوند نییە بەڵکو شارۆچکەکەیە بەناوی (کوێت ئاوا)وە.

---

١- کوماج: جۆرێک کولێرەیە، ئەستوور و تورتە، لە قاپێکی تایبەت بەخۆیدا دروست دەکرێت.

٢- خەڵکی ئەو ناوچانە بۆ ئیش و کار دەچنە کوێت.

## پیاوانی شینپۆش و پێپەتی

مـن چەنـدین جـار لەگەڵ پیـاوانی شـین پـۆش، بە سـواری حوشـتر چـوومە گونـدە بەردەڵانییەکان، هەموو جلوبەرگیان لە بوزووی شـین بـوو کە ژنەکانیـان دەیـانچنی و لە هەمان گوند ڕەنگیان دەکردن.

خەڵکەکە زۆر هەژار بـوون، زۆربەی پیـاوان و تەواوی منداڵان پێپەتی بـوون. هێنـدە بەپێی پەتی ڕۆیشتبوون بنی پێیان وەک سمی حوشتری لێهاتبوو. لە بیابان بەپێی پەتـی و زۆر بەخێرایی بەناو دڕک و داڵدا ڕایاندەکرد، وەک ئەوەی باشـترین پێڵاویـان لە پێدا بێت. خواردنیان بەزۆریی ناگۆشتی بوو، نان، شیر، ماسـت، پەنیر، کەرە و ڕۆن، هەمـوو ئەمانە بەرهەمی خۆیان بوو، لە گونددا دوکان نەبـوو کەس کڕین و فرۆشـتنی نەدەکرد. کڕینیان تەنها شەکرو چا بوو. پەیوەندییان بەشارەوە نەبـوو، شەقامیشـیان نەدەویسـت، ئەگەر سـەردان نەبـوایە و مڵکـانەی ئاغـا نەبـوایە. ئەمـانە بەدرێژایـی تەمەنیـان لە گوندەکانیان نەدەچوونە دەرەوە. لە هەمان ئەو شوێنەی کە دەهـاتنە دنیـاوە هەر لەوێش دەمـردن. کە پێویسـتییەکان سـەریانهەڵدا و پـارە بـوو بە پێویسـتی، ئیتـر دەبێـت زیـاتر کاربکەی، چونکە لە گوندەکانی ناوچەکە کار نەبوو، پیاوانی گوند بۆ کـارکردن دەچـوونە کوێت، ئابوورییان بەند بوو بەئابووریی کوێتەوە. خەوی سەربانە بڵندەکان کە دەیڕوانـی بەسـەر ئەو دەشـت و دەرەدا، یادگـارییەک بـوو بۆخـۆی، سـەربانەکان هەمـوو بەیەکەوە بوون، بەپێچەوانەی سەربانەکانی یەزدەوە، کە دیواری نزم یان بڵند سەربانی مـاڵێکی لە مـاڵێکی تـر جیـادەکردەوە. لێرە دیـوار نەبـوو، یـا دیوارەکـان زۆر نـزم بـوون، نـزیکەی (٣٠سم) دەبوون. دراوسێکان یەکتریان دەبینی. ئەوان شتێکیان نەبوو جگە لە هەژاریـی، لەم میراتەدا هەموویان بەشداربوون پێویستی نەدەکرد، کە دیـوار لە نێوانیـان دا هەبێـت بۆ شـاردنەوەی شمەکەکانیان. جارێکیان لە بیدە بووم لە دەوروبەری گوند پڵنگیـان بینـی بـوو، هەمـوو خەڵـک دەترسـان. شـەوانە سـەگ و چەقەڵ بەنێـو گونـدەکەدا دەهـاتن. مـن چەنـدین شـەو سـەگ و چەقەڵـم دیـوە کە بەتەنیشـت جـێگەی خەوتنەکەمـدا دەهـاتن، وامدەزانی پڵنگن و لەترسا سەرم دەکرد بەژێر لێفەکەوە و خۆم بەدۆشەکەکەوە چەسـپ دەکرد.

## چێشتی خێری بیدە

جارێکیان کە چووم بۆ بیدە سەرەتای موحەڕەم بوو، خوانی عاشورا ڕازابوەوە، لە موبید و گوندەکانی دەوروبەری موبید (بیدە، یەخدان، خانەقا، بەفرۆئیە) ئامادەکاریی کرابوو بۆ عاشورا. لە حسێنیەی بیدەش ئامادەکاری کرابوو، بەڵام لە هەمووی گرنگتر خوانی چێشتی خێر ڕاخرابوو. سەرپەرشتی گوند خێری کردبوو، کە دەبێت لە هەر دە ڕۆژی سەرەتای مانگی موحەڕەم دا چێشتی خێر لێبنرێت. ڕۆژی یەکەم هەموو خەڵکی ڕۆیشتن بۆ وەرگرتنی چێشت. چێشتێکی زۆر خۆش بوو، هەموویان خوارد، ڕۆژی دووەم دیسان خەڵکی هێرشیان برد بۆ وەرگرتنی چێشت، ڕۆژی سێیەم هەندێ خەڵک نەهاتن، ڕۆژی چوارەمیش خواردنەکە تەواو بوو، ڕۆژی پێنجەم لە کۆڵان هاواریان دەکرد خەڵکینە وەرن چێشت وەرگرن، ڕۆژی شەشەم هەندێک لە چێشتەکەیان دا بە گا و گامێش و گوێدرێژەکان. هەژارەکان چێشتەکەیان دەخوارد بەڵام گەدەیان پێی تێکچوو بوو. لە هەموو گوندەکانی دەوروبەری چێشت لێنرابوو، ئەو گوندانەش چێشتیان نەدەخوارد، چێشتەکە دەمایەوە و کەس نەیدەخوارد، بەڵام چونکە نیتی لێهێنرا بوو دەبوایە دە ڕۆژی تەواو دروست بکرایە. ڕۆژانی حەوتەم و هەشتەم چێشتەکەیان دا بە گامێش و وڵاخەکان. لە کۆتاییدا ئەو چێشتە زیادەی، کە مابوەوە فڕیاندایە ئاوەکەوە تا ماسیەکان بیخۆن، دیارە ماسییەکان چێشتەکەیان خوارد، بەڵام هەندێک لە ماسییەکان چونکە لۆبیا و نۆکیان قوت دابوو مردن. بەو پارەیەی کە درابوو بەو خواردەمەنییانە، پیلاویان بۆ خەڵکەکە بکڕیبایە زۆر باشتربوو، هەم خێرتریش بوو. بیدە جۆگەیەکی پڕئاوی هەبوو، ئاوەکەی ئەوەندە زۆر بوو کە منداڵی دە ساڵەی دەبرد. ژن و منداڵ بۆ شۆرین و ئاو بردن دەهاتنە سەری، ئەم ئاوە ساڵی (١٣٨٢-٢٠٠٣) کە من سەردانی بیدەم کرد وشکی کردبوو.

بیدە ئاشێکی هەبوو، کە تەنوورێکی قوڵی هەبوو، گوایە ئەم ئاشە بەئاوی حەسەنئاوا کاردەکات، ئەم حەسەنئاوایە، کە لە خوار بیدەوە بوو گوایە موڵکی زەردەشتییەکان بوو،

له نه‌ورۆزی (١٣٨٣-٢٠٠٤) سه‌ردانی حه‌سه‌نئاوام کرد ژماره‌یه‌ک زه‌رده‌شتی له‌وێ نیشته‌جێ بوون. ئاگردانه‌که‌یان هێشتا ڕۆشن بوو. جارێکی تر که چووم بۆ بیده هاوینی ساڵی (١٣٣٧-١٩٥٨) گه‌رم بوو، گه‌نجه‌کان به‌و ته‌نووره مه‌ترسیداره‌دا خۆیان ده‌خسته‌ ناوی و ده‌چوونه ئاوه‌که‌وه. گه‌نجێک له ته‌نووری ئاشه‌که‌وه چوو بووه ژێرئاوه‌که‌وه، به‌هۆی فشار و ڕاکێشانی ئاوه‌که‌وه به‌ر په‌ڕه‌ی ئاشه‌که که‌وتبوو، له ژێر ئاوه‌که‌دا گیرببوو کاتێک ویستیان لاشه‌که‌ی ده‌ربهێننه‌وه ڕۆژێکی ڕه‌ش بوو بۆخۆی.

خه‌ڵکی بیده ساڵانه به‌خۆشی و سه‌یر و سه‌فا ژیانیان ده‌گوزه‌راند. له دوو مانگی موحه‌ڕه‌م و سه‌فه‌ردا، به‌سه‌ر دوو ده‌سته‌دا دابه‌ش ده‌بوون، هه‌ر ده‌سته و کۆمه‌ڵه خه‌ڵکێک بوون و دژایه‌تی و دوژمنایه‌تی یه‌کتریان ده‌کرد. له‌م دوو مانگه‌دا دوو برا هه‌ریه‌که‌یان سه‌ر به ده‌سته‌یه‌ک بوون له‌گه‌ڵ یه‌کدا دوژمن بوون، شه‌ڕ و کێشه‌یان هه‌بوو ئێستاش هه‌مان داب له زۆربه‌ی شار و شارۆچکه و گونده‌کاندا ماوه. به‌ڵام ئێستا به جل شینه‌کان ناوده‌برێن. له ئێستادا که ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) یه، به‌جۆرێکه ئه‌گه‌ر گوندێک شه‌وی (٦) هه‌زار تومه‌ن بدات ئه‌وا گونده‌که‌ی تر (٨) هه‌زار تومه‌ن ده‌دات بۆ ئه‌م نمایشه. له ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) هه‌ندێک له گونده‌کانی یه‌زد به‌تایبه‌تی ده‌وروبه‌ری موبید که کوێتیه ده‌وڵه‌مه‌نده‌کانن، له (١٠) ی موحه‌ڕه‌مدا، بڕی (١٠) ملیۆن تومه‌ن ده‌ده‌ن و نانخواردنیش ئاماده ده‌که‌ن. له ده‌یه‌ی یه‌که‌می موحه‌ڕه‌م باشترین هاوشێوه له ده‌وروبه‌ری یه‌زد له ئه‌رده‌کان و موبید و گونده‌کانیان هه‌ڵده‌بژێردرا.

له هه‌موو پارێزگای یه‌زد، بۆ هاوشێوه‌ی باش و گونجاو سوودیان له‌م ده‌وروبه‌ره ده‌بینی. باشترین نمایش له حسێنیه‌ی خانه‌قا ئه‌نجامده‌درا. شه‌وانه بیده‌ییه‌کان به‌پێ و له تاریکی شه‌ودا به فانۆسێکی نه‌وتیی ڕێگای خانه‌قایان ده‌گرته‌به‌ر، مه‌حمود ئاغا شه‌وانه به پاسکیل منی ده‌برد بۆ خانه‌قا بۆ مه‌راسیمی پرسه. منداڵ و پیاوان له نمایشه‌که دا ڕۆڵی خولی، شمر، حه‌رمه‌له، ئه‌بوفه‌زڵ یان ده‌بینی، ئه‌مانه به‌گشتی بۆ کاری خۆیان پاره‌یان وه‌رنه‌ده‌گرت.

که‌سێک که ڕۆڵی ئیمام فه‌زڵ یا ئیمامی عه‌لی یا ئیمامی حسێنی بدیبایه، ده‌بوایه له ته‌واوی ته‌مه‌نیدا ئاگاداری ڕه‌وشتی خۆی بێت و له دزی و درۆ و بوختان و هه‌موو کارێکی ناشایسته خۆی به‌دوور بگرێت. هیچ پاداشتێک نه‌ده‌درا به‌و که‌سانه‌ی که هیلاک ده‌بوون و به‌کاره‌که هه‌ڵده‌ستان. هه‌میشه ڕێز و حورمه‌تێک هه‌بوو بۆ خۆیان و بۆ گوند و شاره‌که‌شیان، به‌ڵام ئێستا پاره ڕۆڵی سه‌ره‌کی ده‌بینێت، سه‌رده‌مه‌که گۆڕانی به‌سه‌ردا هاتووه، هه‌رکه‌سێک پاره‌ی زیاتر بدات پایه‌ی کۆمه‌ڵایه‌تی به‌رزتره.

## حسێنیە و سنگکوتانی گەڕەکی ئێمە

ئێستا کە قسە لەسەر پرسە و هاوشێوەیە، دەبێت شتێک لەسەر سنگکوتانی (یەزد) باسبکەم، هەموو گەڕەکێکی شاری یەزد کۆمەڵەیەک و حسێنیەکی هەبوو، حسێنیە جێگای هەموو چالاکییەک بوو. کۆمەڵە خۆنوێییەکان هێز و سەرمایەی گەڕەکەکان بوون، زۆربەی گەڕەکەکان دژایەتی یەکتریان دەکرد. ئەم دژایەتییە ڕیشەی ئابووریی، تایەفی، سیاسیی هەبوو. پشتی باخ ڕۆحانی‌یان لە تارانەوە دەهێنا و شەوانە بەهەزاران تومەنیان دەدایە، هەر بۆیەش، کۆڵانی میر قوتبییەکان، سەلامییەکان و فەهەدانییەکان، ناچاربوون، کە ڕۆحانی لە تاران و ئەسفەهان و قومەوە بهێنن. بەڵام دژایەتی پارە و پول زۆر نەبوو، تەنها ئەوکاتە گەڕەکەکان بەدوای ڕۆحانی و مزگەوتی باشدا دەگەڕان. بەڵام ئێستا (١٣٨٢-٢٠٠٣) بەدوای مەدح و ڕۆژی (٣٥٠-٥٠٠) هەزار تومەنەوەن. ئەوکات نمایش بوو بەشێوەی نواندن بەڵام ئێستا بە دەنگ و ئاوازە، گەڕەکەکانی پشتی باخ، گەڕەکی تەل و دەروازەی قەسابەکان، فەهدان، یوزدارون، جەنگەڵ، مەیدانی شا، دوژمنی سەرسەختی یەکتر بوون. نزیکەی (٤٠) ڕۆژ پێش موحەڕەم ئامادەکاریی دەکرا بۆ دروستکردنی خواردن و دیاریکردنی هاوشێوەکان. گەورە پیاوانی گەڕەک هەر چەند لە توانایاندا بووایە پارەیان خەرج دەکرد، پارە خەرجکردن زۆرتر نیشانەی لێهاتوویی سەرۆکی گەڕەک بوو. پارە خەرجکردنی ئەوکات وەک پارە خەرجکردنی ئێستا نەبوو، بەهیچ شێوەیەک پارەیان نەدەدا بەکەس، تەنها خواردنیان دەدا جگە لە دارتاش و بەرگدروو بە هەندێکی دیکەش کە کاریان دەکرد.

ئەوانیش هەمیشە ٥٠% یان دەکردە خاتری ئیمام حسێن، من خەڵکی گەڕەکی پشت باخم و چونکە حاجی کازم (نازمی) سەرۆکی گەڕەک بوو تا ڕادەیەک لەنێو کارەکاندا بووم، حسێنیە شوێنی خۆپیشاندان و جێگای خەڵکی گەڕەک بوو، لەکاتی مەراسیم دا حسێنیەی پشتی باخ جێگای (٢٥٠٠) کەس دەبووەوە. سەرۆکی گەڕەک و ژمارەیەک لە

کەسایەتیە دیارەکانی گەڕەک بە ڕیز دەوەستان و بەخێرهاتنی خەڵکیان دەکرد. چەندین ساڵ کاک سەید عەلی نانەوای گەڕەکی ئێمە بوو، بەڵام کارەکەی لە ژێر چاودێری حاجی کازم ئاغا ئەنجام دەدا، کەسێک یان کەسانێک کاک سەیدی عەلی نانەوایان کوشت، بەڵام هەرگیز پیاوکوژەکە نەدۆزرایەوە. تەرمەکەیان هێنایە حسێنیە و لەوێ شۆردرا و کفن کرا. دوای ئەو حاجی مەحمودی زاوای بوو بە سەرۆکی گەڕەک، ئەویش هەر لەژێر چاودێری حاجی کازم ئاغادا، بەڵام کاتێک حاجی کازم ئاغا تەمەنی (٤٥-٥٠)ساڵیدا بوو بە تەنها سەرۆکی گەڕەک بوو، چەندین ساڵ بەو شێوەیە مایەوە تا سەکتەی دەماغ لێیدا و مرد. پاشان ڕاستەوخۆ وەستا غەزنەفەری بوو بە سەرۆکی گەڕەک، کە ئەویش لە ساڵی (١٣٨٢-٢٠٠٣) دا لە تەمەنی (٨٠) ساڵیدا مرد و لە حسێنیە کفن کرا.

ئیتر پاش ئەوە گەڕەک سەرۆکی نەبوو، هەر (٤) لای حسێنیە سەکۆی پان بوو، لای بەرامبەر دەرگای هاتنە ژوورەوە، پشتی مینبەر، شانیشی کە سێ قاتی هەبوو، بەڵام بە گشتی کەس لەو ژوورە دانەدەنیشت. ژنەکان لە پشتی سەربانەکەوە دادەنیشتن، پێویستە ئەوەیش بڵێم لە گەڕەکدا کەسانێک هەبوون کە مەزهەبیی نەبوون و دژایەتی مەزهەبیان دەکرد و پارەیان نەدەدا، و بۆ کاروباری مەزهەبییش پروپاگەندەی خراپیان دەکرد. ئەوانەی سەر بە حزبی تودە بوون، مەراسیمی عاشورایان بەکارێکی باش نەدەزانی. دوای چەند هەزار ساڵ تازە حزبابەتی ڕەواجی پەیداکردبوو، جا حزبێکیش سەر بە شۆڕەویی بوون و بەرنامەی کۆمۆنیستیان پیادە دەکرد.

بەگشتی ڕێکخستنی بەڕێوەچوونی مەراسیم بەئاگاداری نوێنەرانی وڵات بوو، مۆڵەتی لە دەستی ئەواندا بوو، واتە مەزهەبیەکان و لایەنگرانی شا، بەڵام تودەییەکان، کە زستان دەهات (١٠-١٥) دەست لێفە و دۆشەکیان دروستدەکرد و تەشتی گەورەیان پڕ دەکرد لە خەڵوز و بە ئۆتۆمبێل دەیانگێڕا و هوتافیان دەکێشا و هاوار هاوار بەسەر هەژاراندا دابەشیان دەکرد. بەڵام چونکە هەژارەکان ئامادە نەبوون بە بانگە بانگ و هەیاهۆ لێفە و دۆشەک و تەشتە خەڵوز وەربگرن بەناچاری دەیانگێڕایەوە بۆخاوەنەکەی.

ئەمانە شتومەکیان لە نێوان هەوادارانی خۆیاندا دابەشدەکرد، زۆربەی گەڕەک هەواداری مەراسیمی عاشورا و سنگکوتان بوون، بەگشتی دۆستی (شا) بوون بۆ بەهێزکردنی ڕژێم لە دوای کودەتای (٢٨ی مورداد ی١٣٣٢بەرامبەر ١٩-٨-١٩٥٣) تێکۆشانی کەمینەیەک کە مابووەوە، تودەییەکان بوون. ئەوان وابیریان دەکردەوە کە ئەمانە هەموویان سەربە ڕژێمی شان و پەیوەندی بە مەراسیمەوە نییە. پایەی سەرەکی

حسێنیە و کۆمەڵە دروستکردنی گەڕەکی ئێمە، چەند بنەماڵەیەک بوون حەوت کەسی و شەش کەسی، کە ئەمانە بەگشتی مسگەرەکان بوون، ئەمانە بەڕۆژ خەریکی کاری خۆیان بوون و شەوانەش تا درەنگ لە حسێنیە کاریان دەکرد. ئەو پارەیەی کە لە خەڵک کۆیان دەکردەوە لەژێر چاودێریی سەرۆکی گەڕەکدا خەرج دەکرا، ئەویش زیاتر بۆ کڕینی خواردنەکانی وەک بگۆشت، کەباب، برنج، خەیار و ماست خەرج دەکرا. حسێنیەی پشتی باخ خاوەنی شەش مێزی چا بوو، دوو مێزی گەورە لە دوو لای بیناکەوە، دانرابوون کە تایبەت بوون بە مسگەرەکان زیاتر چایان بە مسگەرەکان دەدا. مسگەرەکان گەورەترین دەستەی گەڕەک بوون کە خاوەنی دامەزراوەی سەرۆکی پۆلەکان بوون، لەهەمان کاتیشدا مسگەرەکان مایەی سەرهەڵدانی کێشە و شەڕ و نائارامی بوون. سەرۆکایەتی کۆمەڵی سنگکوتان هەر ئەمان بوون. وەستا غەزنەفەر کە زیاتر لە (٥٠) ساڵ سەرۆکی گەڕەک بوو، نێرگەلەکان هەر ئەمان دابەشیان دەکرد، لە نیوەی مەراسیم دا بۆنموونە ئەگەر مەراسیم کاتژمێر (٥ بۆ ١٠) بوایە کاتژمێر نزیکەی (١٠) کە ئەمان کە زۆرتر شاڵی سەوزیان لەپشت دەبەست، نێرگەلەکانیان دەستبەدەست ڕەوانە دەکرد. گەورە سەید کە ناسرابوو بە ئاغای نێرگەلە لە ڕیزەکەدا دەوەستا ئەو بڕیاریدەدا کە نێرگەلە بەکێ بدەن. بەگشتی کاتی دابەشکردنی نێرگەلە کەسێک هەڵدەستا دەستیدەکرد بە مەدحکردن، لە ڕاستیدا کاتی دابەشکردنی نێرگەلە کاتی پشوو بوو.

مسگەرەکان زۆرینەی گەڕەک بوون، بەڵام دەوڵەمەند نەبوون، مێزەکانی مسگەرەکان هێندە گەورە بوون کە چەندین کەس لەسەری دادەنیشتن و چایان تێدەکرد و پیاڵەیان دەشۆرد. (٤) مێزی تر لە (٤) گۆشەی حسێنیە دانرابوون، بەڵام ئەم مێزانە بچووکتر بوون کەسێک لە پشتی مێزەکەوە دادەنیشت چای تێدەکرد، کەسێک چای دەگێڕا، کەسێکیش پیاڵە بەتاڵەکانی دەبردەوە. مێزێک هی شووشە فرۆشەکان بوو کە حاجی ئاغای سادقیان نوێنەریان بوو. مێزێک هی سەراجەکان بوو کە نوێنەرەکەیان ئاغای سەراجیان بوو. مێزێک هی برادەرانی ئەسەدوڵلاهی بوو، کە زیاتر کارمەند بوون، نوێنەری کارمەندانی گەڕەک بوو، مێزێک تەنها بۆ حاجی محەمەدی سەفار بوو، کە خۆی چاودێری گەڕەک بوو، زۆرترین مەسرەفی دەکرد، هەندێک کەس دژایەتیان دەکرد بۆیە نەیتوانی ببێت بە سەرۆکی گەڕەک. پاشان تەنها بۆ خۆی لە دەرەوەی شار حسێنیەکی دروستکرد بەناوی حسێنیەی سەفار کە ئێستا (دەروازەی قورئانە)، بەجیا مەراسیمی تێدا ئەنجام دەدا، ئەم کارەی دوای کێشەی حەوت کەسەکە لەگەڵ سەفار و دروستبوونی ناکۆکییەکان پەیدا بوو، بەڵام چاودێرییەکی زۆر هەبوو لەنێوان دوو باڵی سیاسی دا. تودەییەکان و لایەنگرانی شا، یەکێک لە لایەنگرانی تودە ئەندامی شورای

شار بوو، هەر خۆشیان پشتگیرییان لێدەکرد، بەڵام محەمەد سەفار دژایەتی دەکرد. لایەنگرانی هەر چینێک یان ئەندامی هەر لایەنێک لەلای مێزی خۆیانەوە دادەنشتن، گەورە پیاوانیان لەسەر سەکۆ بەرزەکە بوون. ئەگەر کەسێک بهاتایە و لە گەورە پیاوانی گەڕەک نەبوایە، یان شارەزا نەبوایە و بەبێ بانگهێشتن بهاتایە حسێنیەکە و لە جێگای گەورە پیاوان دانیشتایە، یان لەلای مێزێک دانیشتایە کە هی لایەنێکی تر بوو، ئەوا دەستیان بەسەر شانیدا دەکێشا و ئەویش تێدەگەیشت کە ئەو شوێنە شوێنی ئەو نییە. ئەگەر هەر دانیشتبایە ئەوا بەدەست دووریان دەخستەوە. چەند کەسێک کە لێپرسیراو بوون، بۆ ڕێکخستنی شێوازی ناو حسێنیەکە بەرێز و ئاراممییەوە خەڵکەکەیان دەبردە ناوەڕاستی حسێنیەکەوە. ناوەڕاستی حسێنیەکە تایبەت بوو بە کرێکاری کارگە و هەلاجەکان و تێکرای هەژاران. کۆمەڵە خەڵکێک هەبوون کە هیچ دەستە و گرووپیان نەبوو، بێ سەرۆک بوون، کەسێک نەبوو پارێزگارییان لێبکات، وەک کرێکاری کارگەکان و دەستچنەکان. بەڵام هەر لە کۆنەوە مسگەر و سەراجەکان دەستەی خۆیان هەبووە، دیارە پێش کودەتای (٢٨ی مورداد‌ی١٣٣٢بەرامبەر ١٩-٨-١٩٥٣) و ڕووخانی حکومەتەکەی دکتۆر موسەدیق، کرێکارەکان خاوەنی حزبێکی گەورەبوون، کە حزبی تودە بوو، بەڵام دوای ڕووخانی موسەدیق ئەمان بێ ڕێکخراو مانەوە، لە گەڕەکدا جێگایەکیان نەما تا لێی کۆببنەوە، هەر بۆیەش پەنایان دەبردە بەر حسێنیەکە و لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا کۆدەبوونەوە، زۆر بەکەمی چا و نێرگەلەشیان دەدانێ. سەربانی حسێنیەکەش جێگای ژنان بوو کە هەمان دابونەریت لەنێو ژنانیشدا پەیڕەو دەکرا.

ساڵێکیان موحەڕەم کەوتبووە هاوینەوە، لە گەڕەکی پشتی باخ بازاڕێکی چڕوپڕ هەبوو، کە درێژییەکەی (١٠٠) مەتر دەبوو، چەند لۆرییەک، کە هەموو باریان لێ بارکرابوو لەوێ وەستابوون.

لە سەرەتای بازاڕدا بارەگای یەزید هەبوو، دیلەکانی بیابانی کەربەلا لە گۆشەیەکەوە وەستابوون، یەزید لەسەر کورسییەکی ئاڵتونی دانیشتبوو، سەری براوی ئیمام حسێن لە تەشتێکدا لە بەردەمی بوو، جار جارێک بەدارەکەی دەستی دەیکێشا بەسەرە براوەکەدا، لە هەمان کاتیشدا سەرە براوەکە قورئانی دەخوێند. بڵندگۆکان کە بە پاتری ئۆتۆمبێلەکان کاریان دەکرد، قورئانەکەیان بڵاودەکردەوە، لە گۆشەیەکی تری بارەگاکەدا سەفیری فەرەنگ لەگەڵ چەند کەسێکی فەرەنگی وەستا بوو. مەلا محەمەد کە ڕۆڵی سەربڕەکەی دەبینی سەری تاشرابوو، ڕیشی لە خەنە گیرابوو، تەشتێکی گەورەی لەبەردەمدا بوو کە پڕکرابوو لە برنج، هەر واتدەزانی سەرە براوەکە لە نێو تەشتەکەدایە. ئەو ساڵە حاجی کازم ئاغا گوتبووی دوو پارچە دار لەلای سەری

یەزیدەوە ڕەتبکەن و بە بزمار بە سەرییەوە دایبکوتن و سەرەکانی تری دارەکە بە دیوارەکەوە دابکوتن تاکو مەلا محەمەد نەتوانێت جوڵە بکات.

عاشووورای ئەو ساڵە لە گەرمای هاویندا بوو، دوانیوەڕۆ بوو، پلەی گەرمای یەزد چوو بووە چل پلەی سەدی. قەرەباڵغی ئێوارانی بازاڕی گەڕەکی پشتی باخ، گەیشتبووە سەر مەیدانی میر چەقماقی یەزد. سەربڕەکە بە پچڕ پچڕی دوعا و نزای دەگوتەوە، هەموو لایەک چاویان لەسەر سەربڕەکە بوو، ژنەکان دەستیان کردبوو بە شیوەن و گریان. حاجی ئاغا بە یەزید ئەردەکانی گوتبوو کاتێک گەیشتینە سەری مەیدانی میر چەقماق و ئاماژەیەکم بۆ کردی بەهەموو هێزی خۆت داردەستەکەت بکشێنە بەدەموچاوی سەربڕەکەدا، بەجۆرێک کە سەروچاوی بشکێنێت و خوێن بە گیانیدا بێتە خوارەوە، تاکو خەڵکی زیاتر بگرین. هیچ کەس ئەم بابەتەی نەدەزانی جگە لە حاجی کازم و یەزید ئەردەکانی. من بەهۆی ئەوەی کە کوڕە مامی حاجی کازم بووم، جگە لەوەش یەکێک بووم لە منداڵە فەرەنگییەکان، مەترێک لە یەزید و سەربڕەکەوە دوور بووم. لە نزیکەوە بەسەرهاتەکەم بینیی کە چۆن یەزید دارەکەی بەرزکردەوە و کێشای بەسەری سەربڕەکەدا، بەجۆرێک کە خوێن لەدەم ولوتییەوە فیچقەی کرد. کتوپڕ لەبری نزا خوێندن، دەستیکرد بە جنێودان و بڵندگۆکان تەواوی جنێوەکانی بڵاودەکردەوە.

چەند کەس هاواریان دەکرد ئەو بڵندگۆیانە بکوژێننەوە، بەڵام کوژاندنەوەی بڵندگۆکان کاتی دەویست، گریان و هاوار گۆڕادرا بە پێکەنین. ئیتر مەلا محەمەد هەستا و یەزید ڕایکرد. ژنەکان دەگریان و هاواری حەسەن و حسێنیان دەکرد وناڵەیان دەچووە ئاسمان. خەڵکەکە بەچاوێک دەگریان و بەوچاوەکەی تر پێدەکەنین. حاجی کازم ئاغا تەریقبوەوە و شێت بوو، گوتی: بەخودا حەیای گەڕەکەکەمان چوو. چەندین جار حاجی کازم ئاغا کە لەدایکبووی (١٣٠٠-١٩٢١) بوو ئەم یادگارییەی دەگێڕایەوە.

لە تەنیشت حسێنیەی پشتی باخ چاڵێک هەبوو کە (١٠) مەتر لە ئاستی ژوورەکە نزمتر بوو، پلیکانەیەکی خراپی هەبوو لە زەوییەوە بۆ چاڵەکە. حەسەن کلاغ لەم چاڵەدا کشتوکاڵی دەکرد، پیاوێکی کەتە و زل بوو، هەموو ڕۆژێک چوارپەلی گوێدرێژەکەی دەبەست و بەکۆڵی خۆیدا دەدا و بە پلیکانەکاندا دەیبردە خوارەوە، لەوێ کاری کێڵان و چاککردنی زەوی دەکرد و ئێواران بەهەمان شێوە گوێدرێژەکەی دەهێنایەوە سەرەوە و سواری دەبوو دەڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە.

ئەم کە لە نمایشەکەدا ڕۆڵی (خولی) دەبینی، کاتێک منداڵەکانی موسلیم لە ماڵەکەیدا هەڵدێن، ئەویش بە سواری ئەسپ بەدوایاندا دەگەڕا کە یەکێک بوو لە دیمەنە جوانەکانی نمایشەکە، ئەو هەردوو دەستی دوو منداڵەکەی بەپەتێک دەبەست و سەری پەتەکەی بە

زینی ئەسپەکەیەوە دەبەست و ئەسپەکەی تاو دەدا. دەبوو منداڵەکانیش بە خێرایی بەدوای ئەسپەکەدا ڕایانبکردایە.

حەسەن کلاغ یان خولی، جارێکیان ئەسپەکەی زۆر بەخێرایی تاودا، کە منداڵەکان کەوتنە سەر زەوی و ئەسپەکە بەدوای خۆیدا ڕایکێشان و هەموو دەموچاویان بریندار بوو، لەو کاتەدا شیوەنی ژنەکان دەگەیشتە ئاسمان، پیاوانیش دەستەسرەکانیان لە گیرفانیان دەردەهێنا و دەگریان، گەورە پیاوانی گەڕەک دەستیان بەیەکدا دەهێنا و خۆشحاڵبوون، کە تیپی پشتی باخ لە تیپی (فەهادان) باشتر بوون. کاتێک حەسەن لە ئەسپەکە دادەبەزی ئەملاولایان ماچ دەکرد، چونکە ڕۆڵەکەی جوان بینیوە، دوو منداڵی موسلیمی بێ بەختیش کە لەپی دەست و سەرئەژنۆ و دەموچاویان بریندار هەمووی خوێنیان لێدەچۆڕا. حەسەن کەلاغ هەرگیز نوێژی نەدەچوو، لە تەواوی ساڵدا چاوەڕوانی ڕۆژی نمایشی دەکرد و نزای دەکرد تا ساڵێکی تر نەمرێت و خزمەتێک بە ئیمامی حسێن بکات.

بەڵام پیاوانی دیاری گەڕەک زۆر بەدین نەبوون، شتێک کە بەلای ئەمانەوە گرنگ بوو قوردرەت بوو، گەیشتن بە قودرەت و پاراستنی ئەو قودرەتە، تا لەگەڕەکدا هەر منداڵێک کە لەگەڵ خولی دا ڕۆڵی دەبینی خوێناویتر دەبوو.

هەرچی پیاو و گەنجێک سنگکوتان و زنجیر لە خۆدانیان باشتر بکردایە و خوێن لە پشتیان بهاتایە ئەمانە دڵخۆش تر دەبوون.

## هەرای بێ هۆ و هاوار بۆ دابەشکردنی میرات

باوکم کوڕی بازرگانێکی ئاسایی بوو، مامەکانم هەرچەند کەسانێکی تلیاکخۆر بوون، بەڵام بازرگانیش بوون، میرزا ئەحمەدی باوکم سێ ژنی هەبوو، لە هەر ژنێک منداڵێکی هەبوو، خانم ملوک لە ژنی یەکەم، سەفا خانم لە ژنی دووەم، من لە ژنی سێیەم. باوکم هەرچەندە کاروکاسپییەکی ڕێکوپێکی نەبووە، بەڵام هەندێک پارەی بەدەست چەند کەسێکەوە هەبووە و هەندێک موڵکی کشتوکاڵی و چەند پارچە زەوییەکی بچووک و پەرتوبڵاوی لە باوکیەوە بە میرات بۆ مابوەوە. شەو و ڕۆژێک ئاودێری لە ئەشکەزەر، باخێکی یەک هیکتاری لە حەکیمئاوای نێوان زارج و ئەشکەزەر، نیوە شەوانە، ڕۆژێک ئاودێری لە بەندەرئاباد، نیوە شەوانە ڕۆژێک ئاودێری لە حەکیمئاوا، (٥٠) بەش لە بەشەکانی کارگەی یەزد چەند دانگ لە کاروانسەرایەک لە شاری مەشهەد و خانوویەک لە کۆڵانی ئاوە تفت. بەڵام چەندین کەس قەرزاری باوکم بوون، یەکێک لە قەرزارەکان مامە گەورەکەم بوو، یەکێکی تریان مامە بچووکەکەم بوو، یەکێکی تر کوڕە مامەکەم بوو، یەکێکی تر لە قەرزارەکان حاجی ئاغای سەوان زەڕەنگەر بوو، هەندێک لە کاسبکارانی ناوبازاڕ، باوکم خانوویەکیشی هەبوو لە یەزد کە ژنی دووەمی تێیدا دەژیا. خوشکە گەورەکەشم شووی کردبوو، دایکیشی کە ئالوودە (موعتاد) بوو لەگەڵ ئەودا دەژیا. من و دایکم بەبێلانە مابووینەوە، لە تەنها ژوورێکدا دەژیاین کە بە (٣٠٠) تومەن ڕەهن کرابوو. خانوویەکی بێ ئاو لەگەڵ خاوەن خانوویەکی هەژاردا کە خۆی و (٤) منداڵ لە ژوورێکدا ژیانیان بەسەردەبرد و مێردەکەشی پیاوێکی تلیاکخۆر بوو، لە چێشتخانەکە دەخەوت، شەوانە مشک لە ژوورەکەیدا تەراتێنیان دەکرد، هەموو میراتییەکە بەهۆی قۆرخکارییەوە هاتە سەر هیچ.

کاک بومان عەلی حەسەنی پارێزەری من بوو، پیاوێکی باش و خاوەن بەڵێن بوو، بڕیاڕ بوو دوای یەکلاییکردنەوەی میرات، هەقی ماندووبوونی خۆی وەربگرێت. هەڵبەتە

دوای (١٠-١٢) ساڵ کە دەستیدەکرد بە دابەشکردنی میرات، سەرچاوەی ئاوەکان وشک ببوون و بەشە ئاو و موڵک نرخی نەما، قەرزارەکان هەندێکیان مردبوون و زۆربەیان لە پێش هەموویانەوە مامی گەورەم قەرزەکەیان نەدایەوە. تەنها یەک کەس ئاغای بەحرینی بەندەرئاباد، قەرزەکەی دایەوە.

بەهەرحاڵ تەنها کەسێک هەبوو، کە ویستی مافی منداڵە هەتیووێک بدات، وابزانم ئەویش تەنها (١٠٠٠) تومەنی دا بە پارێزەرەکەم لەبری هیلاکی (١٠-١٢) ساڵ. ئاغای بومان عەلی حەسەنی وەک پارێزەرەکانی ئەم سەردەمە نەبوو، کە سەرەتا پارە وەربگرێت و دوایش دیار نەبێت چی دەکات. لە ساڵی (١٣٨١-٢٠٠٢) پارێزەرێک لە مەشهەد، (٥) پەڕەی داواکاری بەناونیشانی لایحە بۆمن نووسی، (١٥٠) هەزار تومەنی لێوەرگرتم، ناونیشانی خۆیشی بە هەڵە بەدادگا دابوو، و فایلەکەم بەهۆی ناونیشانی هەڵەوە لە دادگا سەری تێداچوو، چونکە دادگا بەڵگەی تەواوی دەویست، پارێزەری بەڕێزیش ناونیشانی هەڵەی دابوو. نامەکانی دادگای بەدەست نەگەیشتبوو، فایلەکەم تێداچوو مافی منیش خۆڕایی ڕۆیشت و پارێزەرش پارەی خۆی وەرگرت.

خودا لە دایک و باوکی هەموو پیاوێکی نموونەیی وەک بومان عەلی حەسەنی خۆشبێت و پارێزەری خوشکەکەم ئاغای ئوستادیان بوو، پارێزەری خوشکەکەی تریشم حیدرپور بوو، من لە تەمەنی (٦) ساڵیدا و پێش چوونە قوتابخانە، ڕێگای دادگام گرتۆتەبەر، بۆ وەرگرتنی مافەکانی خۆم، بەهۆی کێشەی مۆڵکایەتی و وەرگرتنەوەی کەمێک لە میرات. هەر بەو هۆیەشەوە دەستبەسەر کراوم. من زوو تێگەیشتم، کە دەبوو بۆ ئەم کێشەیە خۆمان و ڕیش سپیان ڕۆڵمان ببینیایە و بەو کارە هەستاینایە نەک ڕێگای دادگا بگرینەبەر.

دایکم لەپێناوی پەیداکردنی کەمێک پارە، دەستیکرد بە کاری چنین و کاری بۆ خاوەن خانووە هەژارەکەمان دەکرد، جا وەرە تۆ لێکیبدەرەوە، دەبێت ژیانی ئێمە چۆن بووبێت، دایکم کە پارچەی دەچنی، بۆ هەر مەترێک یەک ڕیاڵ و نیوی وەردەگرت، بۆ تۆپێکی (٢٠) مەتری بڕی سی ڕیاڵی وەردەگرت، ئەگەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە کاری بکردایە بە دوو ڕۆژ و نیو تۆپێکی تەواو دەکرد. هەر بەو داهاتە کەمە دەبوایە پارەی مەلا و قوتابخانە و کتێب و دەفتەری من بدات. بنەماڵەی دایکیشم زۆر هەژار بوون و نەیاندەتوانی هاوکاری دایکم بکەن. ئێمە هیچ هاتوچۆیەکمان لەگەڵ بنەماڵەی باوکمدا نەبوو. تەنها نەورۆزان دەچوومە ماڵی پوورە حاجی بیبی زەهرا و ئەویش دوو ڕیاڵ جەژنانەی دەدامێ، پوورە فاتمەش هەر کاتێک منی ببینیایە بەزۆر پارەی دەکردە گیرفانمەوە. نەنە سەکینە هەمیشە پارەی دەدامێ (٢) ڕیاڵ، (٤) ڕیاڵ، (٥) ڕیاڵ کە

ئەوکات (٢) ڕیاڵ نرخێکی هەبوو، بە (٢٠) ڕیاڵ کیلۆیەک هەنجیری وشکم پێدەکڕی. من زۆر حەزم لە هەنجیری وشک بوو. ساڵی(١٣٨٣-٢٠٠٤) یەک کیلۆ هەنجیری وشک بە (٥-٦) هەزار تومەن بوو. یەکێک لەو جوتیارانەی کە زەوی ئێمەی بەکاردەهێنا حاجی قاسم ئەکبەر بوو، لە ئەشکەزەر کە لە سەردەمی باوکمدا هەندێک بەروبوومی زەوییەکانمانی بۆ هێنابووین، گوتی: من لەکارەکەم بەردەوام دەبم و تا کێشەکەتان لە دادگا یەکلایی دەبێتەوە. کرێی زەوییەکانتان بۆ دەهێنم. ساڵی یەک دوو کیسە ئارد و چەند بار شووتی و چەند سندوقە هەناری بۆ دەهێناین، ئەمە هاوکارییەکی باش بوو بۆ ئێمە. نانی ماڵی ئێمەی دابین دەکرد. حاجی قاسم ئەکبەر خۆی گەنمەکەی دەبرد بۆ ئاش و دەیکرد بە ئارد و ئاردەکەی دەدا بە نانەواخانەکە، ئێمەش ڕۆژانە دەچووین نانەکەمان وەردەگرت. ڕەحمەتی خودا لە حاجی قاسمی ئەکبەری و تەواوی خەڵکی ئەشکەزەر، پاش چەند ساڵێک ئاوی جۆگەکەی ئەشکەزەر وشکی کرد. وشککردنی ئاوی جۆگەکە بەمانای وشکبوونی ئاردی ماڵی ئێمە. یەکێک لە نانەواخانەکانی گەڕەکی ئێمە کە بە ئاخوند نانەوا ناسرابوو. ئێستاش لە شەقامی ئێرانشەهری یەزد کۆڵانی ئاخوند نانەوایی هەیە، تەمەنم (٧-٨) ساڵ دەبوو کە ڕۆژێک چووم بۆ نانەواخانەی ئاخوند بۆ وەرگرتنی نان. مەشهەدی مێرزا محەمەد پاپولی، مامم کە بە مشتی پاپولی ناسرا بوو، لەوێ بوو ئەو کە ئاگاداری ئەوە نەبوو کە حاجی قاسم ئەکبەری، ئاردی لە نانەواخانەکە بۆ داناوین. ڕوویکردە نانەواکە و گوتی: ئاخوند ئەگەر نان بەقەرز بدەیت بەم منداڵە و دایکی پارەی نانەکە نەدات، داوای پارە لە من بکەیت من بەرپرسیارنیم و یەک قڕان پارەت نادەمێ. ئاخوندی نانەوا گوتی: تۆ زۆر سەیریت، خەڵکانی تر دێن بۆ خزم و کەسەکانی خۆیان دەناسێنن و دەڵێن نانیان بدەرێ، بەڵام تۆ دەتەوێت نانی ئەم منداڵە ببڕیت، ئەم منداڵە پێشتر پارەی داوە، ئەگەر پارەیان نەبێت من ئامادەم (٢٠) ساڵی تر بەبێ پارە نانیان بدەمێ. من لە هەموو تەمەنمدا سێ جار قسەم لەم مامەم بیستووە، خودا لێی خۆشبێت.

هەردوو مامەکانم قەرزاری باوکم بوون، بڕیار وا بوو لە دابەشکردنی میراتدا قەرزەکان بدەنەوە بە من، مامەکانم منیان بەداواکاری میرات حیساب دەکرد نەک وەک برازایەک، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مندا هەڵسوکەوتێکی تەماعکارانە بوو، مامەکەی ترم ئاغا عەلی ئەکبەر بڕی (٢٧٠٠٠) تومەنی من قەرزار بوو، بەڵگەکانم بردە لای. ئەو پارەیە لە (١٣٣٤-١٩٥٥) دا لە شاری یەزد دوو خانووی (٤٠٠) مەتریی، (٥) ژووریی پێدەکڕدرا. میرزا عەلی ئەکبەریش وەک میرزا محەمەد هەرگیز هەواڵی منی نەپرسیووە. بەڵام من جار جارێک سەردانی ماڵیانم دەکرد، نەک لەبەرئەوەی کە ماڵی مامە، بەڵکو

بەهۆی ئەوەی کە کارێکم هەبووە لە ماڵیان. هەرگیز وشەیەکی خۆشم لێیان نەبیستووە. تەنانەت تاقە جارێکیش ئەم مامەم پرسیاری نەکرد، ماڵمان لە کوێیە، یان چ کارێک دەکەیت، یا دایکت چی دەکات؟ یان بڵێت ئەوە دوو ریاڵ بۆخۆت خەرجی بکە. بە دابەشکردنی میراتیەکەدا دادگا بڕیاریدابوو کە ئەم مامەم و تەواوی قەرزدارەکانی تر، کە (١٢) کەس بوون، دەبێت قەرزەکان بدەنەوە بەمن. بەڵام لە نێو هەموو قەرزدارەکاندا تەنها پیاوێک بەناوی حەسەن بەحرینی کە خەڵکی بەندەرئابادی یەزد بوو، پارچەی ئۆتۆمبێلی دەفرۆشت قەرزەکەدی خۆی هێنایەوە. دوای چەند ساڵێکی تر دادگا مامە میرزای عەلی ئەکبەری ناچار کردبوو کە چەکی قەرزەکەمان بداتێ. ئەویش چەکەکەی بۆ ناردین بەڵام کاتێک دایکم چەکەکەی برد بۆ بانک، لە بانک بەدایکمیان گوتبوو، کە ئەم حیسابە داخراوە. دەبوو دووبارە دایکم بڕۆیشتایەتەوە بۆ دادگا و شکات بکات، مامە میرزا عەلی ئەکبەر، بالایەکی مام ناوەندی هەبوو، ڕەنگی سوور و سپی بوو، هەمیشە جوان و و ڕێکپۆش بوو، زۆر پاک و خاوێن بوو، هەموو ڕۆژێک بەپێ لەم سەری شارەوە بۆ ئەوسەری شار دەڕۆی، کەمتر دەیتوانی سواری ئۆتۆمبێل دەبوو.

هەربۆیەش ڕۆژانە دەمبینی و، سڵاوم لێدەکرد، ئەو (٩٠) ساڵ زیاتر تەمەنی کرد، لە (١٦-١٧) ساڵیەوە هەمیشە لەکاتی ژەمەکاندا بێ دواکەوتن ژمەنانی خۆی خواردووە، هەرگیز کاتی خواردنەکانی نەگۆڕییوە. نیوەڕۆیان دستنوێژی هەڵدەگرت و نوێژی دەکرد و دادەنیشت، بۆ نانی نیوەڕۆ، بەگشتی کەبابی دەخوارد، نزیکەی (٧٥) ساڵ هەمیشە لەگەڵ خواردنەکەی پیاڵەیەک تا پیاڵە و نیوێک (عەرەقی کشمیش)ی دەخوارد کە خۆی دروستی دەکرد. نیوەڕۆ و شەوان لەدوای نوێژ کەباب و عەرەقی دەخوارد، تلیاکیشی دەکێشا، بەمنی دەگوت تەواوی ئەو کارانەی کە باوکت کردوویەتی منیش کردوومە، تەنها من چەند ژنێکم نەهێنا، ئەو هەموو ژنانە باوکتیان کوشت. پێیگوتم کە ئێستا من قسە لەگەڵ تۆدا دەکەم (٢٧) ساڵە باوکت مردووە و باوکت (٢٥) ساڵیش لە من منداڵ تر بوو، ئێستا تا ئەم کاتە من (٥٣) ساڵ تەمەنم لە باوکت زیاتر کردووە، هۆی تەمەن درێژیی من ئەوەیە، کە چەند ژنێکم نەهێناوە. مامە میزا عەلی ئەکبەر تەنها یەک کوڕی هەبوو. هەرگیز ئامادە نەبوو ناسنامەشی بۆ دەربکات و مەسرەفی بکێشێت. ئەو هەمیشە دەیگوت: "پیاو دەبێت بۆ هێنانی ژنی دووەم، دڵی شێر و عەقڵی کەری هەبێت".

## بەڵێنی سەرخەرمانی مامم

تەمەنم (٦) ساڵ بوو کە باوکم مرد، میرزا عەلی ئەکبەری مامم تەنانەت یەک جاریش هەواڵی منی نەپرسی بوو. پاش چەندین ساڵ، کاتێک من لە پۆلی (١٢) بووم، ڕۆژێک لەبەر دەرگای گەراج ڕاوەستابووم، هەر کوڕی ئەو مامەم خاوەنی گەراجەکە بوو، من لەگەڵ ئەو ئامۆزایەم پەیوندییەکی باشم هەبوو. مامە عەلی ئەکبەر هات و چاکوچۆنییەکی زۆر گەرموگوڕی لەگەڵ کردم و گوتی: ڕۆڵە گیان چۆنیت.. شکور باشیت.. چی دەکەی.. دەزانم لە پۆلی (١٢) ی ئینشائەڵلا ئەگەر بەزوویی خوێندنەکەت تەواوبکەیت، دەمەوێت بتکەم بە زاوا. کامە لە نەوەکانی منت دەوێت پێشکەشتی دەکەم... دەستیکرد بەناوهێنانی نەوەکانی و بەردەوام بوو، گوتی: ڕۆڵە وەرە، با بەیەکەوە پیاسەیەک بکەین .مام و برازا بۆ یەکەمین جار لە شەقام بەیەکەوە پیاسەمان کرد. مامم مژدەی خۆشی دەدامێ و دەیگوت: بەردەوامبە لە خوێندنەکەت، بڕۆ بۆ زانکۆ هەموو خەرجییەکەت لەسەر من، تا ئێستاش من پارەیەکی زۆرم بۆ تۆ خەرجکردووە، نازانم دایکت پێیگوتوی یان نا. من بەردەوام پارەم داوە بە دایکت. هەڵبەت من دەمزانی کە ئەم قسانە هیچیان ڕاست نین. مامم بەردەوامبوو لە قسەکردن، دەیگوت: تۆ زۆر زیرەکیت، دڵنیام دەبیت بە دکتور. دیارە نەیدەزانی من لە بەشی ئەدەبی دەخوێنم و ناتوانم بچم بۆ خوێندنی دکتۆریی. وردە وردە گەیشتینە سەر مەیدانی میر چەخماق و چووینە سەر شەقامی شا. بە بەردەمی بازاڕی زەڕەنگەر و بازاڕی مسگەرەکاندا ڕۆیشتین، نزیک مەیدانی شا بووینەوە، نزیکەی (٣٥) خولەک پیاسەمان کرد. مامم وشەی شیرین و ئومێدبەخشی لە چوونە زانکۆ و خەرجییەکانم و تا بوونم بە زاوایان و مەسرەفی ئاهەنگی بووک گواستنەوە دەردەبڕی. کاتێک سەرم هەڵبڕی گەیشتبووینە بەردەمی دادگا. مامم منی بردە نێو دادگاوە و یەکسەر بۆ ژووری حاکم. سڵاوی لێکرد و حاکم لەبەرمان هەستا و تەوقەیەکی گەرمی لەگەڵ مامم کرد. هەڵبەت حاکم کرێچی مامم بوو،

واتە لە خانووی مامم دا دەژیا، میرزا عەلی ئەکبەر بە حاکمی گوت: بۆیە هاتووم کە چاوێک لە فایلی خۆم و برازاکەم بکەم، لە خودا بەزیادبێت ئێستا برازاکەم گەورە و تەواوە، هەموو شتێک دەزانێت و تەمەنی بووەتە (١٨) ساڵ، بۆخۆی دەتوانێت کارەکانی خۆی ڕایی بکات و خۆی بڕیار لە کارەکانی خۆی بدات. من بەدرێژایی ئەم چەند ساڵە خەرجیی خوێندنەکەیم داوە و چەند بەرامبەر بە قەرزەکەم پارەم داوەتێ، ئێستا کە خۆی هاتووە، دەیەوێت کۆتایی بەو کێشەیە بهێنێت. پاشان حاکم ژمارەی فایلەکەی دا بە کارگوزارەکەی و گوتی: ئەو فایلەم بۆ بێنە. تا هێنانی فایلەکە مامم بەڵێنێکی تری پێدام و گوتی: هەر ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ ڕێوڕەسمی مارەبڕینی نەوەکەی کە تەمەنی (١٤) ساڵە جێبەجێ دەکەین. کاتێک فایلەکەیان هێنا، حاکم سەیرێکی کرد و سەرەتا پیرۆزبایی ساڵڕۆژی لە دایکبوونی لێکردم و گوتی: ئاغای محەمەد حسێن پاپولی یەزدی، ئەمڕۆ (١٠ی ئەسفەند ١٣٤٥بەرامبەر ١-٣-١٩٦٧)، لەم ڕۆژەوە بەپێی یاسا خۆتان دەتوانن کارەکانتان ڕایی بکەن و لە ژێر چاودێریی دایکتدا نامێنیت. باوکی تۆ قەرزی لای چەندین کەسی وەک مامت هەبووە، چەند کەسێکی وەک مامت قەرزەکەیان نەداویەتەوە. چەند ڕۆژ لەمەوپێش دایکت لێرە بوو پێیگوتم کە مامت قەرزەکەی خۆی نەداوەتەوە، بەڵام ئەوەتا ئەمڕۆ مامت دەڵێت کە قەرزەکەی پێداونەتەوە. هەموو قەرزەکەی مامت مانگێک لەمەوبەر حیسابکراوە کردویەتیە (٤٧٥٠٠) تومەن (لە ساڵی ١٣٤٥-١٩٦٦بەو پارەیە لە یەزد دوو خانوی (٥٠٠) مەتریی و زەوی و بینای ٢٨٠م٢ دەکڕدرا). دادگا چەکێکی بەو برە پارەیە لە مامت وەرگرتووە، ئێستا فەرموو ئیمزای بکە و چەکەکە لەگەڵ خۆت بەرە. مامە عەلی ئەکبەر جارێکی تر بە حاکمی گوت: برازاکەم دەمێکە پارەی وەرگرتووە، تۆ چەکەکە بدە بە من. حاکم ڕووی تێکردم و گوتی: کاکە محەمەد حسێن پاپولی یەزدی، تۆ پارەت لە مامت وەرگرتووە؟ گوتم: بەڕێز حاکم، لەوساوە باوکم کۆچی دوایی کردووە، ئەم مامەم تەنها یەک ڕیاڵ پارە یاخود نانێک، جوتێ پێڵاو، دەفتەرێک، قەڵەمێک چییە، بۆ منی نەکڕیوە. تا ئێستاش نازانێت ماڵمان لە کوێیە! تەنانەت لە جەژنی نەورۆزیشدا ڕیاڵێکی جەژنانەی نەداوە بە من، ئەو چەکەی کە درابوو بە دایکیشم، ئەوە بوو گێڕامانەوە بۆلای ئێوە، چونکە ڕەسیدی نەما بوو! حاکم چەکەکەی دایەدەست من و بەمامی گوت: فەرموون بەڕێزتان لە دەرەوەی ژوورەکەی من، لەگەڵ برازاکەت ڕێکبکەون، ئەم کوڕە ئێستا خۆی گەورە بووە و بڕیارەکانی بەدەستی خۆیەتی. خودا سەلامەتی بکات ئەم حاکمە زۆر پیاوێکی باش و قازییەکی ڕاست بوو. مامم بە خەیاڵی خۆی وا بیری لێکردبوەوە چونکە حاکم کرێچییەتی، هەرچیەک بڵێت حاکم بۆی جێبەجێ دەکات. ئەو حاکمە، ئەگەر پیاوێکی ڕاست و باش نەبوایە، پاش (٢٥)

ساڵ خزمەت لە شارێکی وەک یەزد کرێچی نەدەبوو. کاتێک چەکەکەم بەدەستەوە بوو لەگەڵ مامم لە ژووری حاکم هاتینە دەرەوە، مامم هەرچی جوێنی ناشرین هەبوو پێیدام. دەبوایە چەکەکەم ببردایە بۆ بانک و پارەکەم وەربگرتایە، هەر بۆیە هەمان ڕۆژ چووم بۆ بانک بەڵام پێیان گوتم ئەم حیسابە دەمێکە داخراوە. (هەمان بەزم کە چەند ساڵ پێشتر بەسەر دایکمیاندا هێنا لەگەڵ منیش دووبارەکرایەوە). پاشان پێیان گوتم: ئەگەر دەتەوێت شکات بکەیت نووسراوت بۆ دەکەین بۆلای حاکم. منی نەزان، گوتم: شکاتکردن لە مامم بۆ وەرگرتنەوەی پارە و هێنان و بردنی مامم بۆ دادگا، لە من ناوەشێتەوە، خەڵک لۆمەم دەکەن، کە چۆن دەبێت مامی خۆم بدەم بەدادگا. بەهەرحاڵ بڕیارمدا لە ژوورێکی کرێدا دانیشین و مەسرەفەکانم لەسەر ئەستۆی دایکم بێت، نەک مامم ڕابکێشمە بەردەمی دادگا. مامم کە هەرگیز لە هەواڵی ئێمەی نەپرسی بوو، بەم کارە خۆی بە براوە دەزانی و هەرگیز بەڕووی خۆیدا نەهێنا، تەنانەت دوای مردنیشی کوڕەکەی قەرزەکەی ئێمەی هەر نەدایەوە. من هەرگیز بۆ وەرگرتنی پارەی قەرزەکانم کەسێکی ئاسایی نەبووم، هیچ کاتێک نەمتوانیوە و نەمویستووە مافی تایبەتی خۆم لە قەرزدارەکان وەربگرمەوە. یاخود کەسانێک کە مافی منیان خواردووە بیانبەمە بەردەم دادگا. تەنانەت ئێستاش کە تەمەنم (٦٣) ساڵە، ناتوانم مافی تایبەتی خۆم وەربگرمەوە، بەڵام بۆ مافی خەڵکانی تر سەری خۆم بەختدەکەم. نازانم لەم دنیا پڕ کێشەیە چۆن مامێکی تەمەن (٧٠) ساڵەی ملیۆنێر، دەیەوێت مافی برازایەکی هەژدە ساڵەی هاوپشتی خۆی بخوات!.

دەبێت مافی خۆت وەربگریتەوە چ کەسێک لە مامەکان و خاڵەکانی ئەم وڵاتە، لەم جیهانەدا بەبوونی پارەیەکی زۆرەوە، دەیانەوێت مافی منداڵی براکان و خوشکەکانیان بخۆن. خودا دەزانێت خەڵکانی وەک مامی من کە خۆیان لە خانووی (٣٠٠) مەترییدا دەژین و هەمیشە خزمەتکار و چێشتلێنەریان هەیە، برازاکانیشیان نانی شەویان نییە. ئەوکەسانە کەم نین، دەبێت دەوڵەت ڕێکخراوێک بۆ منداڵانی هەتیوو دروستبکات، بۆچاودێرییکردن و وەرگرتنەوی ئەو قەرزانەی کە هەیانە. دەبێت ڕێکخراوی (NGO – ناحکومیی) دروستبکرێت بۆئەوەی کاری خەڵک بەدەست خەڵکە خۆیەوە بێت. دیارە دادگا ساڵی (١٣٤٥-١٩٦٦) ئەرکی یاسایی خۆی ئەنجامدابوو، بەڵام منداڵ هەمیشە نرخی پارە نازانێت. بەمانایەکی تر ئەگەر بەهەژاریی گەورە ببوو، نازانێت پارە بەکەڵکی چی دێت. من تا تەمەنی (٥٥) ساڵی نرخی پارەم نەدەزانی، هەر کاتێک پارەم هەبوایە بەسادەیی لە دەستمدەدا، کاتێک لە ماڵێک دا گەورەبووی باسی پارە ئاڵوگۆڕکردن، چەکی پارە، بازرگانی، کڕینی قەنەفە و کورسی و ئۆتۆمبێل و شتی لەوجۆرە کرا، باش

دەزانیت پارە بەکەڵکی چی دێت؟ وا بەئاسانی لەمافی خۆت خۆش نابیت. بەتایبەت کە دایکت (١٢) ساڵ لەپێناویدا لەشەڕدا بووە. چیرۆکی دابەشکردنی میرات، بۆ من وەک چیرۆکی ئەو دوو برایە بوو کە برا گەورە دەیگوت ئەم خانووە زل و نالەبارە لە زەوییەوە تا سەربان بۆمن بێت و لە سەربانەوە تا ئاسمان بۆ تۆ. ئەو ئەسپە چەموش و لەقە وەشێنە با بۆمن بێت، پشیلە جوانەکەش بۆ تۆ بێت.

دوای مردنی مامم، تەنها یەکجار لە خەوندا بینیومە، تا ئەم کاتەی کە ئەم دێڕە دەنووسم (٣٠-٧-١٣٨٣ واتا ٢١-١٠-٢٠٠٤)، ئەو خەونەم بۆ هیچ کەسێک نەگێڕاوەتەوە؛ لە خەونم دا لە باخێکی زۆر گەورە و خۆشدا بووم، مامیشم لەوێ بوو، بەیەکەوە پیاسەمان دەکرد، زۆر شاد و دڵخۆشبوو، پێدەکەنی کاتێک گەیشتینە دەرگای باخەکە ویستم برۆمە دەرەوە گوتی: تۆ برۆ من ناتوانم لەم دەرگایەوە بچمە دەرەوە. کاتێک دەستی هێنا تەوقەم لەگەڵدا بکات، دەستی وەک دەستی مەیمون ڕەش و تووکن و نینۆکەکانی ڕەش و درێژ بوون. بەڵام هەموو لەشی وەک جاران وا بوو، جگە لە دەستەکانی. بەهەرحاڵ خودا لێی خۆش بێت.

## قوتابخانەی سەرەتایی

سەرەتای مانگی مهر (کۆتایی ئەیلول)، چوومە قوتابخانەی هیدایەت لە گەڕەکی پشتی باخ لە یەزد، بینای قوتابخانە چیرۆکێکی سەرنجڕاکێش بوو. قوتابخانە حەوشەیەکی فراوان و خانوویەکی زۆر کۆن و گەورە بوو. لە دەرگایەکەوە دەچووینە ژوورەوە، سەرەتا دەچووینە ڕاڕەوێکی درێژ کە هەشت مەتر دەبوو، پاشان دەگەیشتینە دیوارێکی بچووک لە ناوەڕاست دا حەوزێکی بچووک هەبوو، کە شوێنی تێپەڕبوونی ئاوی تفت بوو لە گۆشەی دیوارەکەوە ڕێگایەک بە پلیکانە دەچووە سەربان. لەسەر ڕێگای پلیکانەکان دەرگایەک هەبوو، کە دەچوو بۆ گەوڕی مەڕەکان. لەم گەوڕەدا بزن و مەڕ هەبوون، تا ئەوکاتەی من گەیشتمە پۆلی پێنجەم، ئاغای عەلی میرزا لە شیری ئەو بزن و مەڕانە ماستی دروستدەکرد بۆ بەڕێوەبەر و چاودێری قوتابخانە. دیارە ئاغا میرزا عەلی فەڕاش خۆیشی بێبەش نەبوو لە ماست و پەنیر، دەرگایەکی تریش هەبوو دەچووە چێشتخانە گەورەکەوە کە زۆر تاریک بوو لە کونی سەربانەوە ڕووناکی وەردەگرت. چێشتخانەکە دەرگایەکی تری هەبوو کە لە ژووری فەڕاشەکەوە دەکرایەوە، ئەم چێشتخانەیە کرابووە پۆلی قورئان خوێندن. ژنی ئاغا میرزا عەلی فەڕاش، کە مەلا بوو سوودی لێ وەرگرت، دەرگای سێیەم بە دالانێکی گەورەدا کە چەند پلیکانەیەک نزمتربوو لە دیواری یەکەمەوە دەکرایەوە، لە دالانەکەوە بەیەک پلیکانە دەچووینە هۆڵەکەوە. باخچەیەکی تاڕادەیەک گەورە هەبوو، کە جۆرەها درەختی تێدابوو بەتایبەت داری هەنار. حەوزێکی کەمێک گەورەش لە هەمان لای حەوشەوە لەبەردەمی ژووری بەڕێوەبەر و ڕێکخەری قوتابخانە و پۆلی شەشەم لەلایەکی تری حەوشەکەوە بوو.، هەمیشە یەکێک لە دوو فەڕاشەکان بەتەنیشت دالانەکەوە دادەنیشت. هەر قوتابییەک بەبێ مۆڵەتی مامۆستا بڕۆیشتایەتەوە دەیانگرت. ژێرزمینێکی گەورەش هەبوو، سەر ژێرزەمینەکە، پۆلەکانی خوێندن بوون. پۆلەکان شەش پلیکانە لە زەویی بەرزتر بوون.

ڕۆژی یەکەمی قوتابخانەم زۆر باش لەبیرە ژمارەی قوتابیانی پۆلی یەکەم زۆر بوون. دەبوایە بکرانایە بە دوو پۆل، پۆلی یەکەمی (ا) ڕووە و خۆر بوو. خانمی جەلیلی هاوسەری (ئاغای جەواد جەلیلی)، ڕێکخەری قوتابخانە، مامۆستای ئەو پۆلە بوو. پۆلی یەکەمی (ب) لەلای سەرەوە بوو، مامۆستای ئەم پۆلە ئاغای جەلیلی بوو، کە خزمی بەڕێوەبەر و ڕێکخەری قوتابخانە بوو. ئەم پۆلە زۆر سارد بوو، هەرگیز هەتاوی تێنەدەکەوت، دەیانگوت ئاغای جەلیلی پیاوێکی باش نییە. منداڵەکان هەموو دڵیان تەپ تەپ لێیدەدا و خواخوایان بوو بەر ئەو پۆلە نەکەون، منیش پێمخۆش بوو بچمە پۆلەکەی خانمی جەلیلی. ڕێکخەری قوتابخانە هەموو منداڵەکان و دایک و باوکیانی دەناسی، چونکە هەموو منداڵەکان خەڵکی گەڕەکێک بوون و کەسێک نەبوو لە دەرەوەی گەڕەکەکەوە هاتبێت. ئاغای جەواد جلیلی یەکەیەکە بانگی منداڵەکانی دەکرد و دەیگوت: حەسەن تۆ بڕۆ پۆلی خانمی جلیلی، حسێن تۆ بڕۆ بۆ پۆلی ئاغای جەلیلی. من کاتێک کە ٦-٧ ساڵە بووم چونکە پێشتر لە حوجرەکەی مەلا نەباتی دابەشکردنی منداڵەکانم بینیبوو کە بەهۆی ئەسپێوە دابەشیکردبوون، زوو تێگەیشتم کە ئاغای ڕێکخەر هەموو منداڵە خاوەن باوکەکان و پارەدارەکان دەنێرێتە پۆلی خانمی جلیلی و ئەو منداڵانەش کە باوکیان یاخود دایکیان کرێکاری کارگە بوون یاخود باوکیان شاگرد و مسگەر بوون، دەیناردنە پۆلی ئاغای جەلیلی. دیارە من بەپێچەوانەی حەزی خۆم بەر پۆلی ئاغای جەلیلی کەوتم، ئەو پۆلە لە سەرەتای ساڵ دا (٣٣) قوتابی تێدا بوو، لە کۆتایی ساڵدا تەنها (١٢) قوتابی مابوونەوە. لەو ماوەیە دا (٢١) منداڵ وازیان لە خوێندن هێنا، ساڵی دووەم، ژمارەی قوتابییەکان بەجۆرێک کەمیکرد کە هەموو هەر پۆلێک دەبووین. واتە هەمان ساڵی یەکەم نزیکەی ٥٠% قوتابیانی هەردوو پۆلەکە بەتایبەت پۆلی ئاغای جەلیلی بەهۆی هەژاریی و نەبوونییەوە وازیان لە خوێندن هێنا و هەریەکەیان چوونە سەرکارێک.

کارگەی پەموو پاککردن، سوودی لە منداڵان دەبینی بۆ دەرکردنی ناوکە پەموو. منداڵەکان ڕۆژانەیان (١٣-١٤) ڕیاڵ بوو، کارگەی پەموو پاککردن و دوکانەکانی مسگەریی ئافاتێک بوون بۆ خوێندن. منداڵانی گەڕەکی ئێمە، هێشتا فەرشی چنین زۆر برەوی پەیدانەکردبوو، لەو سەردەمەدا کچان زیاتر خەریکی فەرش چنین بوون، کوڕان فەرشیان نەدەچنینی. فاتمە و زەهرا دوو کچی دراوسێی ئێمە بوون کە باوکیان بە نەخۆشی سیل مردبوو، لە کارگەی فەرش چنین کاریان دەکرد و هەرگیز نەچوونە قوتابخانە. یادگاریم زۆرە لەسەر پۆلی یەکەم کە ئەگەر بمەوێت هەمووی بنووسمەوە بەیەک کتێبی گەورە تەواو نابێت. بەڵام لێرەدا تەنها سێ یادگاریی دەنووسمەوە، یەکەم

یادگارییم، یەکەم ڕۆژی خوێندنی وانە بوو، مامۆستا هاتە پۆلەوە، قوتابییەکان هەموو هەستانە سەرپێ، مامۆستا گوتی: دانیشن.. پاشان بە زوویی لەسەر تەختەڕەشەکە هەردوو پیتی (ئەلف و بێ)ی نووسی، گوتی: ئەمەیان (ئەلف)ـە هەمووتان بڵێن ئەلف، هەموو بەیەک دەنگ گوتمان: ئەلف. گوتی: ئەمەشیان (بێ) یە هەمووتان بڵێن بێ.. هەموومان گوتمان (بێ). پاشان گوتی: قەڵەم و دەفتەر دەربکەن و (٢٠) جار ئەلف بنووسن و (٢٠) جار (بێ) بنووسن.

سەرەتای مانگی مهر بوو (کۆتایی مانگی ئەیلول)، هەوا زۆر خۆشبوو، قوتابخانە پڕ بوو لە داری هەنار، پەنجەرەی پۆل کرابووەوە، مامۆستا کورسییەکەی هێنایە بەردەم پەنجەرەکە و ڕوویکردە حەوشە و پشت لە ئێمە لەسەر کورسییەکەی دانیشت. قوتابییەکان خەریکی نووسینی پیتەکانی (ئەلف و بێ) بوون، دیارە من و چەند کەسێک چونکە پێشتر چووبووینە حوجرەی مەلا نەباتی، بە ئاسانی دەمانتوانی (ئەلف و بێ) بنووسین. نیو کاتژمێر مامۆستا لەسەر کورسییەکەی هەڵنەستا، پاشان هەڵستا و سەیری سەر مێزی قوتابییەکانی دەکرد. لەناکاو زللەیەکی بەهێزی لە ئەسغەر دا، سەری ئەسغەریش بەر سەری قوتابییەکەی تەنیشتی کەوت و لە خەیاڵی قوتابییەکەی تریدا. قوتابییەکان گوتیان: ئەوە ئەسغەر چی کردووە. دووبارە مامۆستا بەهێزتر لێیدایەوە، گوتی: دەستی ڕاستت کردۆتە گیرفانتەوە و بەدەستی چەپ دەنووسیت! وەرە دەرەوە. ئەسغەری لات و بێهێز لە شوێنی خۆی هەستا و هاتە سەرتەختە ڕەش. مامۆستا گوتی: کەر، بێ عەقڵ، ئەحمەق، بۆچی دەستی ڕاستت کردوەتە گیرفانت، شەقێکی تێهەڵدا و ئەسغەری داماو سەری لە دیوارەکە درا، لە ناکاو دەستی لە گیرفانی دەرهێنا و دەستی کەوتە نێوان خۆی و دیوارەکەوە، دەستی ڕاستی لە مەچەکیدا نەبوو! ئەمە تاڵترین یادەوەریی ڕۆژانی خوێندنمە. لە یەکەم ڕۆژی پۆلی یەکەمی سەرەتایی کە بەوهۆیەوە هەر کاتێک چەپلەرێک ببینم مامۆستا و ئەسغەرم بیردێتەوە، هەموو چەپلەرەکانیشم خۆشدەوێن. بۆیە ئێستا دەتوانم بە نووسراوێک هەموو زانکۆکان ئاگادار بکەمەوە کە پێویستە لە هەر پۆلێک چەند کورسییەکی تایبەت بۆ چەپلەرەکان دابین بکەن. زۆربەی منداڵانی چەپلەر لە قوتابخانە و زانکۆ تووشی چەمانەوەی بڕبڕەی پشت (فەقەرات) بوون، مامۆستا واتە ئاغای جەلیلی واقی وڕما بوو، ئەسغەر لەبەردەمیا وەستابوو بەهۆی زللە و شەقەکان ئازاری دەستیەوە نەدەگریا و نە ناڵەیەکی دەکرد، ئیتر مامۆستا گوتی: قەیناکە، بڕۆ دانیشە و بەدەستی چەپ بنووسە.

ئەسغەر تا پۆلی سێیەم لەگەڵمان بوو، پاشان لەگەڵ دایک و باوکی داماڵیان ڕۆیشت بۆ کەرەج. دووەم یادەوەریی، زۆرترین قوتابیانی پۆلی یەکەمی (ب) هەژار

بوون، ئەحمەد (٥) خوشک و برای بچووکی هەبوو، باوکی لە بەشی هەلاجی کارگەی ئیقبال کاری دەکرد، دایکیشی جار جارێک لە کارگە کاری دەکرد. مامۆستا گوتبووی نووسینەکەتان بنووسنەوە، بەلاّم خەت بپەڕێنن، بەلاّم ئەحمەد کە نووسیبویەوە خەتی نە پەڕاندبوو، بەسەریەکەوە نووسیبویەوە، مامۆستا لەسەر ئەو نووسینەوەیە هەموو ڕۆژێک زللەی بەهێزی لێدەدا. ڕۆژێک مامۆستا زۆر تورە بوو لە ڕۆژەکانی تر زیاتری لێدا، گوتی: من پێتنالێم کاتی نووسینەوە خەتێک جێبهێڵە، ئەحمەد دەستیکرد بە گریان و گوتی: خودایە گیان من چیبکەم لە ماڵەوە لێم دەدەن، دەڵێن پارەمان نییە، ئەم کاغەزە بۆ خەساردەکەیت! لە قوتابخانەش مامۆستا لێمدەدات، دەڵێت: دەبێت خەتێک بنووسرێت و خەتێک جێبهێڵرێت. ئەو ڕۆژە ئەحمەد بەهۆی لێدانەوە لووتی پژا. مامۆستا گوتی: برۆ بۆ سەر حەوزەکە لووتت بشۆ. ئەحمەد کاتێک گەیشتە سەر حەوزەکە بۆ شۆردنی لووتی، ڕێکخەری قوتابخانە بەداریکەوە دەکەوێتە وێزەی وایزانیبوو لەگەڵ منداڵانی تردا شەڕی کردووە، ئەویش دەستدەکات بەلێدانی و ئەحمەد بەگریانەوە هاتەوە ناو پۆل و لەبەر پێی مامۆستادا کەوت. مامۆستا شەقێکی لە دەمی هەڵدا و گوتی: ساختەچێتی مەکە. بەلاّم ئەحمەد نەجولایەوە. مامۆستا لە پۆل ڕۆیشتە دەرەوە و پاشان لەگەڵ میرزا عەلی فەڕاشدا هاتنە ناو پۆل، ئەحمەدیان هەڵگرت و بردیانە دەرەوە، بەلاّم ئەحمەد جارێکیتر نەهاتەوە بۆقوتابخانە و لە هەلاجییەکەی کارگە دەستیکرد بەکارکردن. کاتێک کە بینیمەوە، ڕۆژی بە (٦) ڕیاڵ کاری دەکرد کە لە ساڵی (١٣٣٥-١٩٥٦) دا بەو پارەیە دەیتوانی (٢٥٠) گرام گۆشت بکڕێت. ئەحمەد لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا تووشی نەخۆشی سیل بوو، پاشان لە تەمەنی (٣٠) ساڵی دا کۆچی کرد.

سێیەم بیرەوەرییم، چونکە من پێشتر دوو ساڵ چووبوومە لای مەلا و پیتەکانم باش دەناسی و تەنانەت گوڵستانی سەعدیم لای مەلا نەباتی خوێندبوو، لە زۆربەی منداڵەکانی تر زیرەکتر بووم، هەر بۆیەش منیان کرد بە چاودێری پۆل، ڕۆژێکیان شەش کەس نووسینەوەیان نەنووسیبووەوە. مامۆستا هەر شەش منداڵەکەی لە پۆل هێنایە دەرەوە و بەمنی گوت بیانبە بۆ لای ڕێکخەری قوبتاخانە، ئاغای جەواد ڕێکخەر بوو، پیاوێکی (٤٥) ساڵی ڕێکپۆشی خاوێن بوو، چوارشانە و سوور و سپی بوو. شەلاقێکی بەدەستەوە بوو، هەمیشە یا لە ژوورەکەی خۆی دادەنیشت یاخود لە حەوشەکە پیاسەی دەکرد. شەلاقەکەی نزیکەی (١٢٠) سم دەبوو، سەرەکەی گرێی لێدرابوو. خودالێخۆشبوو ئاغا جەواد زۆر خراپ لە قوتابییەکانی دەدا. سەرەتا ئاغای جەواد بەمنی گوت: دەستت بگرە، ویستم بڵێم مامۆستا من چاودێرم بەخێرایی شەلاقێکی سرەواند لەڕانم، منیش ڕامکرد و مامۆستا دوامکەوت، هەر هاوارم دەکرد

بەخودا من نووسینەوەکەم نووسیوەتەوە. پاشان گرتمی و هێنامیەوە دوو شەلاقی لە هەردوو دەستم دا و قوتابییەکانی تر هەریەکەیان (٥) شەلاقیان لێدرا.

پاشــان ئاغــای ڕێکــخەر گــوتی: ئەو دوو شـــەلاقە بـۆ ئەوەیە جـارێکیتر لەبەردەم مامۆستا ڕانەکەی. پاشان هاتینەوە پۆل و مامۆستا زانی منیش لێدانم خواردووە، گوتی: لێدانی مامۆستا خۆشەویستی باوکە، بەڵام من لە خۆشەویستی باوک بێبەش بووم.

بەڵام لێدانی دەستی مامۆستام خوارد کە ئەوەش نیعمەتێک بوو. ئیتر لە پۆلدا وازم لە چاودێریی هێنا و تێگەیشتم کە چاودێرییش لێدانی هەیە، بۆیە لە تەواوی تەمەنمدا هەوڵمداوە کە پۆستی ئیداری وەرنەگرم.

## ڕۆیشتن بۆلای مەلا و ژنی کارگوزاری قوتابخانە

پۆلی یەکەم نیوە ڕۆژە بوو، واتە بەیانی تا نیوەڕۆ. پۆلەکانی تر دوو دەوامیان هەبوو، کاتژمێر (٨-١٢) ی نیوەڕۆ و (١٢-٤) ی دوانیوەڕۆ. دوانیوەڕۆوان بێکاربووم. بڕیارماندا دوا نیوەڕۆوان بچم بۆ لای مەلا نەباتی قورئان و گوڵستان بخوێنم. پێش قوتابخانە نزیکەی تەواوی چیرۆکەکانی سەعدیم لای مەلا نەباتی خوێندبوو. دیارە مەلا منداڵانی فێری خوێندنەوەی ئەلفوبێ دەکرد، بەڵام لە نووسینی هەواڵێک نەبوو. ژنی ئاغا عەلی فەراشی قوتابخانە وای بڵاوکردەوە کە مەلایە و وانەی قورئان دەڵێتەوە. بەدایکمی گوتبوو با حسێن بێتە لای من بۆ خوێندنی قورئان. بڕیارماندا کە دوانیوەڕۆوان نەچمە لای مەلا نەباتی و بچم بۆ لای ژنی ئاغا میرزا عەلی قورئان بخوێنم. ژنی ئاغا میرزا عەلی بە منداڵانی گوتبوو لە کاتژمێر (٣-٦) بچنە لای، نزیکەی (١٢) منداڵی پۆلی یەکەم بووین، لەگەڵ چەند منداڵێکی پۆلی دووەم و سێیەم. تێکڕای (٢٠) منداڵ بووین، کاتژمێر (٣) دەچووین تا کاتژمێر (٤) کەمێک قورئانمان دەخوێند. خوێندەواری ئەم ژنە لە خوێندەواری مەلا نەباتی کەمتر بوو. زۆر تووڕەتریش بوو، کاتژمێر (٤) چونکە قوتابیانی پۆلەکانی تر دەرۆیشتنەوە، قوتابخانە دادەخرا، ناچار ئێمە وازمان لە خوێندن دەهێنا. مەلا منداڵەکانی دەکرد بەچەند دەستەیەکەوە. دەستەی یەکەم دبوایە بچنە ژووری هەنار خواردنی قوتابخانە و هەنار بتەکێنن واتە هەنارەکان دەنک بکەن، دەستەی دووەم دەبوو بچن دارو چیلکە بهێنن بۆ سۆپاکانی قوتابخانە، ئەو کاتە سۆپای نەوتی نەبوو، تەنها سۆپای دار هەبوو. لە ژێرزەمینەکەدا دار هەبوو دەبوو منداڵەکان بچن دار بهێنن و لە تەنیشت هەر سۆپایەکەوە دایبنێن بۆ سبەی تا سۆپاکەی پێ گەرم بکەن. ساڵی (١٣٣٧-١٩٥٨) سۆپاکان گۆڕدران بە سۆپای نەوتی. دەستەی سێیەم، دەبوو خزمەتی گامێشەکانیان بکردایە. لە ژێر درەختەکانی قوتابخانە، گیایان هەڵکەندایە و کۆی بکەنەوە بۆ گامێشەکان، دەبوو ئەو وێنجەیەی لە دەرەوە کڕدراوە بەدار وردی بکەن. لە

هەمووی ناخۆشتر دەبوو گونجاڵە ئامادەبکرێت بۆ گامێشەکان. گونجاڵە بنەگیایەکی ڕەقە دەبوو بخرێتە ناو لەگەنە ئاوێکەوە بەدار پیایدا بکێشی، تا تەواو نەرم دەبووەوە و بەکەڵکی خواردن دەهات. دەبوو چەند منداڵێکیش سەری گامێشەکان بگرن و منداڵە گەورەکانیش گامێشەکان بدۆشن و شیرەکەی ببنەوە بۆ چێشتخانە بۆ لای ئاغا میرزا عەلی. دووربێت خۆ ئەگەر کەسێک شیرەکەی لە دەست بڕژایە ئەوا فەلاقە دەکرا.

دەستەی چوارەم، دەبوو ناو قوتابخانە گسک سبدەن و خاوێنی بکەنەوە، هەفتانە کاری منداڵەکانیان دەگۆڕی. هەر منداڵێکیش ئەگەر هەڵەیەکی بکردایە، ئاغا میرزا عەلی و ژنەکەی بە شوڵکە هەنار لێیان دەدا یان فەلاقەیان دەکرد.

داواکاری ئاغا میرزا عەلی و ژنەکەی لە منداڵەکان، ئەوە بوو کە نابێت بە دایک و باوکیان بڵێن لای مەلا و قوتابخانە چی دەکەن، خۆ ئەگەر لەماڵەوە باسیبکەن ئەوا ئاغا میرزا عەلی ئەوان لە چاڵە تاریکەکاندا زیندانی دەکات، یا لە قوتابخانە دەریان دەکات. منداڵەکان لە ترساندا هیچیان بە دایک و باوکیان نەدەگوت. دیارە هەندێک لە منداڵەکان ئەنجامی ئەم کارانەیان بەدانیشتن لە چێشتخانە و قورئان خوێندن لای مەلا بەکارێکی باش دەزانی. یەکەمین بێگارێک کە لەلایەن ئەم ژن و مێردەوە بەمن و هاوڕێکانم کرا، بەناوی قورئان خوێندنەوە ئەنجامدرا، کۆتایی ساڵ و نزیکی نەورۆز بوو، ڕۆژێک کاتی عەسر ئاغا میرزا عەلی و ژنەکەی منداڵەکانیان بۆ کارکردن دابەشکرد و گوتیان کە لە دەرەوەی قوتابخانە کاریان هەیە و کاتژمێرێک دەڕۆنە دەرەوە و زوو دەگەڕێنەوە، گوتیان ئێوە مەڕۆنەوە تا ئێمە دەگەڕێینەوە، کاتێک ئاغا میرزا عەلی و ژنەکەی ڕۆیشتن، من بە منداڵەکانم گوت وەرن با بەیەکەوە یاریی بکەین، هەموومان ڕۆیشتین بۆ یارییکردن و هیچ کەسێک کارەکەی ئەنجام نەدا. مانگاکان نەدۆشران، وێنجە ورد نەکرا، ئێمە بەردەوام بووین لە یارییکردن. هەموو کەوتینە ڕەشکردنی یەکتری بە دوکەڵ، کاتێک ڕۆژ ئاوا بوو ئاغا میرزا عەلی و ژنەکەی گەڕانەوە قوتابخانە، کە بینییان دەموچاوی هەموو منداڵەکان ڕەش بووە و هیچ کارێکیش نەکراوە؛ زوو زانی ئەمە کەتنی منە. گوتی: فەلاقە بهێنن منیان لەسەر زەوی ڕاکێشا و پێڵاوەکانیان لە پێ دانام و قاچیمان بە دارێکی درێژەوە بەستەوە و سەرێکی دارەکەی قاچمیان بە دار هەنارێکەوە بەست و سەرەکەی تری بەدەست ژنەکەی میرزا عەلییەوە بوو، دەستیانکرد بە لێدانی بنی پێم، نزیکەی (١٥-٢٠) شوڵکە هەناریان لە بنی پێمدا پاشان قاچمیان کردەوە و گوتیان دە بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە.

بە منداڵەکانیان گوت: ئێوەش دەموچاوتان لە حەوزەکە بشۆن و بڕۆنەوە بۆماڵەوە. منداڵەکان هەموو ترسا بوون و دەموچاویان شۆری و ڕۆیشتنەوە بۆماڵەوە، منیش بە

گریانەوە ڕۆیشتمەوە. دایکم گوتی: بۆچی دەگریەت؟ منیش هەموو ڕووداوەکەم بۆ باسکرد، لە گسکدان و دارهێنان و مانگادۆشین و ئالف ئامادەکردن و قورئان نەخوێندن و تێهەڵدان. دایکم هەمان شەو دەستیگرتم و بردمی بۆ ماڵی هەموو منداڵەکان، دایک و باوکی منداڵەکانی بانگکردە دەرەوە و باسی قورئان نەخوێندنی منداڵەکان و هەموو شتێکی پێگوتن. هەموو دایک و باوکەکان منداڵەکانیان کۆکردەوە چوون بۆ قوتابخانە ئاغا میرزا عەلی کە بینی (٣٠-٤٠) کەس لە بەردەرگای قوتابخانەن، ترسا چەند باوکێک چوون بەڕێوەبەر و ڕێکخەری قوتابخانەیان هێناو دایک و باوکی منداڵەکان لە ژوورەوە بوون و منداڵەکان لە حەوشەکە دا، قوتابخانە کارەبای نەبوو چرایەکی لامپایان هێنا، دایک و باوکی منداڵەکان لەگەڵ بەڕێوەبەر کەوتبوونە قسەکردن و داد و بێدادیان بوو، ئێمەش لە حەوشەی تاریکدا یاریمان دەکرد، لە کۆتایی دا بڕیاردرا هیچ منداڵێک نەچێتەوە بۆ خوێندنی قورئان و ژنی ئاغا میرزا عەلی‌یش جارێکی تر حوجرە نەکاتەوە. بەڵام تەویلە و گامێشەکان لەوێ مانەوە و تا کاتێک من گەیشتمە پۆلی پێنجەم تەویلە و گامێشەکان هەر مابوون. پۆلی یەکەم تەواوبوو هاوین هات بڕیاربوو بچمەوە لای مەلا نەباتی بۆ خوێندنی قورئان و گوڵستان، بەڵام مەلا پیر ببوو، سەرەتای هاوین نەخۆشکەوت و گەڕایەوە ڕەفسنجان. منداڵیش لە کۆڵاندا بەرەڵابوون. زۆربەی کۆڵانەکانی یەزد بەرد ڕێژ کراو بوون، کۆڵانەکان بەبەردی شینی جوان فەرش ڕێژ کرابوون، کە سەد ئەوەندەی قیرتاوی ئێستا جوانتر و باشتربوو، کۆڵانەکان تەنگ و باریک بوون، ئەوکاتە ئۆتۆمبێل نەبوو، چونکە ئۆتۆمبێل نەیدەتوانی بە کۆڵانەکاندا بڕوات. هەندێک کۆڵان ئەوەندە تەسک بوون کە بە کۆڵانی ئاشتەوایی ناسرابوون. ئەگەر دووکەس لەو کۆڵانانەدا بەرەو ڕووی یەکتری بهاتنایە، شانیان بەریەکتری دەکەوت، هەربۆیە پێیان دەگوتن کۆڵانی ئاشتەوایی. منداڵان لەم کۆڵانانەدا، جۆرەها یارییان دەکرد. هەندێک لە بەردی کۆڵانەکان هەڵکەندرابوون و گڵ دەرکەوتبوو. منداڵان دوو پارچە داریان دەهێناو بە چوپی تایەی پاسکیل بەیەکیانەوە دەبەستن و دارلاستیکیان لێ دروستدەکرد. یاخود ئاویان دەکردە کونی شارە مێروولەوە، دووپشک دەهاتە دەرەوە، دووپشکەکەیان دەکردە ناو شووشەیەکەوە یارییان پێدەکرد. هەندێک لە منداڵ یاریی زۆر سەیریان دەکرد. دەچوون شارە زەردەواڵەیان دەدۆزییەوە، داریان تێوەدەژەند و زەردەواڵەکانیان دەردەهێنا، پاشان چزووەکانیان دەبڕی و چەند زەردەواڵەکیان بە دەزوو بەیەکەوە دەبەست و کاغەزێکی بچووکیان بەسەری دووەمی دەزووەکەوە دەکرد و بەرەڵلایان دەکردن و گرەوییان لەسەر دەکرد بزانن هی کامیان زیاتر دەفڕێت. منداڵەکان دەچوون بۆ سەرئاوی جۆگەکە و خۆیان دەکرد بە ماڵێکدا و لە ماڵێکی ترەوە

سەریان دەردەهێنا، ئەم کارە چەندین جار کێشەی لێدەکەوتەوە و شەڕوشۆڕ ڕوویدەدا و زۆر جاریش سەری خەڵکی تێدا دەشکا. هاوین بوو لە پۆلی یەکەم بووم، دوانیوەڕۆیەک لەگەڵ چەند منداڵێکی تردا چووین بۆ گرتنی زەردەواڵە. زەردەواڵەکان لە سەر و ڕووم ئالان و چەند دانەیەک پێوەیدام، زۆرم ئازار هەبوو، بەپەلە بردیانم بۆ نەخۆشخانە دوای دوو ڕۆژ کەمێک باشتر بووم. دایکم گوتی: چونکە مەلا نەباتی نەماوە و ناچیت بۆ قورئان خوێندن ئەوا بۆت ناچێتە سەر. دەبێت دوا نیوەڕۆوان بچیتە دوکانێک کاربکەیت، ناکرێت بەرەڵابیت و لە کۆڵاناندا بسوڕێیتەوە. بڕیار بوو بچمە دوکانی گوریس فرۆشی ئاغای عاشقە مەدینە، لەوێ کاربکەم. بڕیار بوو ئاغای عاشقە مەدینە بەیانیان خۆی بێت بە شوێنمدا و بەپاسکیل لەگەڵ خۆیدا بمبات بۆ دوکان. شەویش بمهێنێتەوە، دەبوایە نانی بەیانی و نیوەڕۆ لەگەڵ خۆمدا ببمەم. دوکانی ئاغای مەدینە لە بەشی پشتەوەی بازاڕی خان بوو، لە تەنیشت دوکانێکی دۆندرمە فرۆشەوە بوو. من کارم نەدەکرد، دەبوایە لەوێ دابنیشتمایە و چاوم لەسەر گوریس و پەتەکان بێت، ون نەبن و نەدزرێن. دیارە من هیچ کرێیەکم وەرنەدەگرت، زۆرم حەز لە دۆندرمە بوو، هەموو ڕۆژێک یەک قاپی گەورە دۆندرمەم دەکڕی و دەمخوارد، دایکم ڕۆژانە (١-٢) ڕیاڵی دەدامێ، ئەو خواردنەی کە بەیانیان و نیوەڕۆوان لێم زیاد دەبوو، لەژێر گوریسەکانەوە دەمشاردەوە. ڕۆژێک ئاغای عاشقە مەدینە چاوی پێکەوت و هاواریکرد کە گوریسەکان خراپ بوون، ویستی دەرم بکات، بەڵام بڕیارمدا جارێکی تر ئەو کارە نەکەم. تەنها دوو مانگ چووم بۆ دوکانەکەی ئاغای عاشقە مەدینە و ئیتر قوتابخانە کرایەوە.

## یەکەمین قورئان خوێندن

لە گەڕەکی ئێمە، شەوانی هەینی هەمیشە لە یەکێک لە ماڵە گەورەکاندا کۆڕی قورئان خوێندن هەبوو. زۆرتر بەتەمەنەکان و گەنجەکان بەشداریان تێدا دەکرد و ڕێگا بە منداڵان نەدەدرا. بەڵام من زۆرم حەزدەکرد بەشداری لەو کۆڕانەدا بکەم و قورئان بخوێنم. شەوێک کۆڕەکە لە ماڵی حاجی مورتەزای زەرابی (سەرۆکی پۆلی مسگەرەکان) بوو، چوومەی لای مەلا نەباتی و گوتم: دەمەوێت لە کۆڕی قورئان خوێندندا بەشداری بکەم. مەلا نەباتی ڕێنمایی کردم بچمە لای چەند کەسێک کە ئەوانیش پێشتر لای مەلا نەباتی قورئانیان خوێندبوو. مەلا نەباتی هەرکەسێکی بۆ ئەو کۆڕە دەستنیشان بکردایە، ئەوان قبوڵیان دەکرد، بەڵام چونکە مەلا نەباتی خۆی ژن بوو، نەیدەتوانی لە کۆڕی پیاواندا بەشداری بکات. نایەتەوە بیرم، کە لە گەڕەکی ئێمەدا کۆڕی قورئان خوێندنی ژنان هەبووبێت. بڕیار وابوو کە من لەگەڵ محەمەد عەلی زەرابی -ئێستا سەرهەنگی دکتۆری دیوانی خانەنیشی ئەرتەشییە لە مەشهەد و لە شەقامی ئەحمەد ئاوا نۆڕینگەی هەیە- کە هاوتەمەن و هاوساڵی خۆم بوو لەو کۆڕەدا بەشداری بکەین. دوای نوێژی ئێوارە و خەوتنان کۆڕەکە دەستیپێکرد، دڵم لێیدەدا و ترسم هەبوو لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی بووم دەبوایە لەگەڵ پیاوانی (٦٠-٧٠) ساڵە دانیشم و قورئانم بخوێنم. سەرۆکی کۆڕەکە ئاغای نەجەفی، کە پیشەی مسگەر بوو، کۆڕەکەی بەڕێوەدەبرد، نزیکەی (٣٠) پیاوی گەورە لە ژوورەکەدا دانیشتبوون. تەنها دوو لاو من کە تەمەنم (٧) ساڵ بوو، لەگەڵ محەمەد عەلی، کە تەمەنی (٨) ساڵ بوو، ئامادەبووین. هەر کەسێک لاپەڕەیەکی قورئانی دەخوێند و ئاغای نەجەفی هەڵەکانی بۆ ڕاستدەکردەوە. بەدەستخۆشی لێکردن و سوپاسی هەموو خەڵکەکە، سەڵاواتیان لێدەدا، پاشان کەسی دواتر دەستیدەکرد بە خوێندنی قورئان. من لە جێگایەک دانیشتبووم کە

دەیەمین کەس بووم، دڵم تەپەتەپ لێیدەدا، دەموچاوم سوورهەڵگەڕا بوو، هیچ خزمێکی من لەو کۆڕەدا نەبوو.

بەهەرحاڵ سەرەی من هات، دەبوو دەستبکەم بە قورئان خوێندن. دەستمپێکرد و گوتم: (أعوذ بالله من الشیطان الرحیم) پەلەپەلی، یەکەم کاری خۆی کرد، من لەبری بڵێم (شیطان الرجیم)، گوتم (شیطان الرحیم). ئاغای نەجەفی هاواریکرد، گوتی: ئێرە کۆڕی قورئان خوێندنە؟ ئەم منداڵە بازارییە چییە؟ کێ قورئانی داوەتە دەست ئەم منداڵە؟ کێ گوتویەتی ئەم منداڵە بهێنن؟ ڕوویکردە خاوەن ماڵەکە و گوتی: حاجی ئەمە کۆڕی قورئان خوێندنە، بۆچی ئەم منداڵەت هێناوە؟ پاشان ڕوویکردە من و گوتی: منداڵ شیطان الرحیم چییە؟ ئەو قورئانەم بدەرێ. حاجی نەجەفی بەردەوامبوو گوتی: کێ ڕێی بەم منداڵە داوە بێتە ئەم کۆڕەوە. یەکێک گوتی: مەلا نەباتی ناساندویەتی، مەلا، مەلا، مە... نابێت حاشا مەلا نەباتی بەڕاست قوتابی باش پەروەردە دەکات. ئەم منداڵە شیطان الرجیم بە شیطان ڕەحیم دەخوێنێت. هەڵە دەکەن، مەلا کەسێکی تری گوتووە. لە دواییدا محەمەد کوڕی گەورەی حاجی مورتەزا بەکەسی دواتری گوت، فەرموو تۆ بیخوێنەوە. من لە خەجاڵەتیدا بووم بە دڵۆپێک ئاو، هیچ کەسێک بەرگریی لێنەکردم. کۆڕەکە تەواو بوو، ئیتر نەدەبوو من بچم بۆ ئەم جۆرە کۆڕانە. لە گەڕەکەکەماندا شوێنی تر نەبوو، کە کۆڕی قورئان خوێندنی تێدا بگیرێت. دیارە لە گەڕەکەکانی تریش بەهەمان شێوە بوو. زۆر باش تێگەیشتم نابێت لای کەسانی زۆر لە خۆم گەورەتر قورئان بخوێنم. ئەوەی ڕوویدا ئەوەیە کە ئیتر من نابێت جارێکیتر لە یەزدا بچمە کۆڕی قورئان خوێندن و قورئان بخوێنم. بەڵام لەم تورەبوونەی ئاغای نەجەفییەوە وانەم وەرگرت. کاتێک، کە خۆم بووم بە مامۆستا هەوڵمدەدا، هەرگیز لەگەڵ هیچ خوێندکارێکدا ئەو جۆرە هەڵسوکەوتە نەکەم. ئەگەر ئاغای نەجەفی خودا لێی خۆشبێت، منداڵانی گەڕەکی بۆ کۆڕی قورئان خوێندن بانگ بکردایە، هەم کۆڕەکە گەورەتر دەبوو، هەمیش خوێنی تازە دەچووە دەماری کۆڕەکانەوە. دوور نەبوو ئەمڕۆ سەدەها قورئان خوێن لە گەڕەکەکانماندا هەبوونایە. هەر ئەو قورئانەی کە مەلا نەباتی فێریکردم لە پاریس بووە هۆی تێکەڵبوونم بەدۆستە عەرەب و ئەفریقاییەکانم، وەک ئیبراهیم سەعید خەلیفە بن یەحیا لە تونس، جومعە ئەنتەج لە لیبیا و چەندانی تر. دیارە ئەگەر لەو کۆڕەدا چەند کەسێک لە خزمەکانم ئامادەبوونایە ئاغای نەجەفی بەو شێوەیە نەیدەشکاندم. بەڵام خزمەکانی باوکم، چونکە دەوڵەمەند بوون، هەرگیز نەدەچوونە کۆڕی قورئان خوێندن. هەر چەندە هەمووشیان چووبوونە لای مەلا و خوێندەوار بوون و ڕۆژووشیان دەگرت. خزمەکانی دایکیشم کە زیاتر کاسبکاری مامناوەندی بوون یا کرێکار بوون،

نەچووبوونە لای مەلا و نەیاندەزانی قورئان بخوێنن. لەوانەیە من تەنیا کەسێک بووبم لە نێوان ئەم دوو بنەماڵەیەدا، کە بەشداریی کۆڕی قورئان خوێندنم کردبێت، ئەنجامەکەشی ئەوە بوو کە باسمکرد.

من تێگەیشتم کە ئامادەبوون لەم جۆرە کۆڕانەدا پێویستی بە ڕیزبەندی و نەریتەوە هەیە. دەبێت لەلایەن کەسوکارەوە پشتگیریی بکرێیت. منداڵ دەبێت داریونیزمی کۆمەڵایەتی وردە وردە لە نێو خێزان و کۆمەڵدا فێربێت، مرۆڤ سروشتی گیانلەبەرێکی باشە. ئەوە کۆمەڵگەیە کە کەسێک دەکات بەشێر و کەسێک دەکات بە ڕێوی یا بە مشک. من تێگەیشتم کە بۆ چوونە نێو کۆمەڵ پێویستت بە پشتیوانی هەیە. نەبوونی باوک و برا، کێشە لەگەڵ مام لەسەر دوو قران داواکردنی مافێک یا دەبێتە دەرچوون لە کۆمەڵگە یا دەچیتە ناو شەڕوشۆڕێکی کۆمەڵایەتییەوە. دەبوایە هەرچی زووە گەڕەکەکەمان بگۆڕین و بچینە گەڕەکی ماڵە خزمانی دایکم، یا لەگەڵ مامەکانم کێشەکانمان چارەسەربکەین. هیچ کام لەم دوو کارەم نەکرد. لە گەڕەکدا مامەوە بەرگریم کرد، ئەوەتا شتێک کە لە بیری مندا بوو ویستم بوو لە ژیانمدا ئەنجامی بدەم، بەلام بەو شێوەیە کەوتەوە مانای ژیان هەر ئەوەیە. ساڵی (١٣٦٩-١٩٩٠) مامۆستای زانکۆی (سوربۆن) بووم لە فەرەنسا، لە هەمان کاتدا ئەندامی (C.N.R.S) واتا (سەنتەری نیشتمانیی بۆ توێژینەوەی زانستی) یش بووم. بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ ئێران. یەکێک لە هاوکارە فەرەنسیەکانم گوتی: بۆ دەچیتەوە بۆ ئێران، لێرە پاروە نانێک پەیدابووە و بیخۆ. پێمگوت: ئەمە وڵاتی تۆیە لێرە کەسێک نییە کە من توورە بکات و کێشەیەکم بۆ دروستبکات. چونکە ئەمە وڵاتێکە خەڵکی حەسوود کەمە و هەموو کارێک لێرە بەئاسانی دێتەدەست. ئێمە لە وڵاتی خۆمان بۆ هەر کارێک لە کڕینی بلیتی فڕۆکەوە تا کڕینی نان و گۆشت، بۆ بەچاپ گەیاندنی کتێب و وەرگرتنی مۆڵەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی دەبێت ماندووببیت، هەوڵی زۆری بۆ بدەیت، واستەی بۆ بکەیت، خۆت بناسێنیت و دیاری ببەخشیت، خۆت گەورە بکەیت، خۆت بچووک بکەیتەوە، توڕە ببیت و جارێک بدەینە ملهوڕیی، جارێک بچینە دادگا و شکات بکەین و ماوەیەک بێدەنگ و ئارام بین. ئێمە لە وڵاتی خۆمان ئەگەر گۆڤارێک چاپ بکەین چەند بەرتیل دەدەین خەڵکیش چەند حەسوودیمان پێدەبات. لە وڵاتی ئێوەدا هەزار گۆڤار چاپدەکرێت، لەم کاتەدا ئێمە گۆڤارێکمان چاپکردووە لە کۆتاییدا گوتم: وڵاتی ئێوە بۆ تەمەڵەکان زۆر باشە، بەڵام وڵاتی ئێمە وڵاتی تێکۆشانە، دەبێت بە چنگ و ددان بژین واتای ژیان تێکۆشانە، تووڕەبوونە، سەبرکردنە، ژیان واتە خەبات، تێکۆشان و سەبر و قەناعەت و ئارامگرتن.

## پۆلی دووه‌می سه‌ره‌تایی

ماموستای پۆلی دوو ئاغای خاکسار بوو، باوکی ئاغای خاکسار ده‌رویش بوو، له کۆلانی ئیمام زاده جه‌عفه‌ری یه‌زد خانه‌قایان هه‌بوو. ته‌نها یه‌ک پۆلی دوو هه‌بوو، زۆربه‌ی منداڵه‌کان له پۆلی یه‌که‌م وازیان هێنابوو. له نزیکه‌ی (٦٥) که‌س که هاتبوونه پۆلی یه‌که‌م (٢٧) که‌س بووین. له پۆلی دووه‌م، (٣-٤) که‌سی ساڵی پێشوو ده‌رکرابوون، تێکڕا له پۆلدا (٣٢) که‌س بووین. ئاغای خاکسار شیعری بۆ منداڵان ده‌خوێنده‌وه، چیرۆکی ده‌گێڕایه‌وه. من زۆر حه‌زم له چیرۆک بوو، زۆر حه‌زم له پۆله‌که‌ی ئه‌و بوو، منیش جار جار چیرۆکم بۆ منداڵانی پۆله‌که ده‌گێڕایه‌وه. گرنگترین یاده‌وه‌ریی پۆلی دوو تایبه‌ت بوو به ئه‌کبه‌ر ئاغای کوڕی تاجر باشی گه‌ڕه‌ک و عه‌باس کوڕه هه‌ژاری گه‌ڕه‌ک. ئه‌گه‌ر قوتابییه‌ک نووسینه‌وه‌ی نه‌نووسیبایه‌وه ماموستا ئه‌و قوتابیانه‌ی به چاودێردا ده‌نارد بۆ لای ڕێکخه‌ری قوتابخانه و ڕێکخه‌ریش بۆ هه‌ر که‌سێک لانیکه‌م (٦) شه‌لاقی لێده‌دا. (٣) شه‌لاق بۆ ده‌ستی ڕاست و (٣) شه‌لاق بۆ ده‌ستی چه‌پ. ڕۆژێکیان (٥) منداڵ نووسینه‌وه‌یان نه‌نووسیبۆوه. ماموستا هه‌موویانی به چاودێردا نارده لای ڕێکخه‌ری قوتابخانه، له ڕێگا ئه‌کبه‌ر ئاغا به عه‌باسی چاودێری گوتبوو بۆ لێدانه‌که‌م لێناکرێت و به چاودێری گوتبوو (٤) ڕیاڵت ده‌ده‌می له‌بری من تۆ لێدان بخۆ. عه‌باس گوتبووی به (٦) ڕیاڵ هه‌ر قامچییه‌ک به یه‌ک ڕیاڵ، عه‌باسی ئاغا قبوڵی کردبوو، که پاره‌که‌ی وه‌رگرتبوو (٤) ڕیاڵ و (٤) ده شایی، عه‌باس (٦) ڕیاڵی خستبووه گیرفانییه‌وه، خۆی کرد به قوتابییه‌ک که نووسینه‌وه‌ی نه‌نووسیوه‌ته‌وه، ئه‌کبه‌ر ئاغایش خۆی ده‌کات به چاودێر. ده‌چنه به‌رده‌می ڕێکخه‌ر هه‌ر قوتابییه‌ک (٦) قامچی له ده‌ستی ده‌درێت و ده‌گه‌ڕێنه‌وه بۆ پۆل. ڕه‌جه‌ب چونکه منداڵێکی دووزمان بوو، به ڕه‌جه‌به قه‌له ڕه‌شه‌که ناسرابوو. هه‌موو به‌سه‌رهاته‌که‌ی بۆ ماموستا گێڕایه‌وه و گوتی: ماموستا عه‌باسی چاودێر (٦) ڕیاڵی له ئه‌کبه‌ر وه‌رگرت و له‌بری ئه‌و (٦) قامچی خوارد. ماموستا که زۆر

هـێمن و لەسـەرخۆ و میهرەبـان بـوو، بەم هەواڵە زۆر تـوڕە بـوو. هـاواریکرد منداڵی پووڵەکی پارەت وەرگرتووە و تێهەڵدانت خواردووە؟ دوو داری بەپشتی عەباسدا کێشا و گوتی: تۆ ئیتر چاودێر نیت! هاواری لێکرد: هەر ئێستا پارەکەی بدەرەوە. عەباس توند پارەکەی لەدەستیدا گرتبوو، دەستیشی خستبووە گیرفانییەوە. مامۆستا، عەباسـی خستە ژێر پێلەقەوە، تێیهەڵدەدا و دەیگوت: ئەو پارەیەی بدەرەوە. عەباس بەگریانەوە هـاواری بەکرد: مامۆستا من پووڵەکی نیم، بەخودا پووڵەکی نیم.. مامۆستا بەتوڕەییەوە گوتی: ئەی بۆ پـارەت وەگرتـووە و لێدانت خـواردووە؟ بەڕاستی پێم بڵـێ دەنـا لە قوتابخـانە دەرتـدەکەم، دەی ڕاسـتییەکەم پێبڵـێ. عەبـاس بەترسـەوە گـوتی: مامۆسـتا.. ئەگەر ڕاستییەکەت پێبڵێم، دەهێڵیت پارەکە بۆخۆم بێت؟ مامۆستا گوتی: ئەگەر بەڕاست پێم بڵێیـت، لێـت ناسـەنمەوە. دەی بـزانم ئەو پـارەیەت بـۆچییە؟ عەبـاس گـوتی: مامۆسـتا دەمەوێت بەو پارەیە گۆشت بۆ دایکم بکرم، دایکم نەخۆشە. ساڵی (١٣٣٥-١٩٥٦) بـوو بە (٦) ڕیاڵ دوو سیر و نیو (نزیکەی ٢٠٠ گرام) گۆشتی مەڕت دەکڕی. مامۆستا، کە دەروێشـی تەریـقەت بـوو، سـەیرێکی دەموچـاوی عەباسـی کـرد وەک ئەوەی هەرگیـز عەباسی نەدیبێت و یەکەم جاری بێت چاوی پێکەوتبێت. عەباس لەچاو منداڵەکانی تردا بـاڵای بەرزتـر بـوو بەڵام لاواز بـوو ملـی بـاریکبوو، پـانتۆڵێکی دەڵبـی لەپێدابوو، بەو سـەرمای زسـتانە چـاکەتی لەبەردا نەبـوو، پـانتۆڵەکەی زۆر بەبەری گەورەبـوو بە قایشێکی چەرم بەستبووی. پێدەچوو تەمەنی قایشەکە (١٠٠) ساڵ زیاتر بێت. توند توند پانتۆڵەکەی لە کەمەری قـایم کـرد بـوو، کراسـێکی شـینی دڕاوی چڵکنـی لەبەردابـوو، لە چەند لایەکەوە پینەکرابوو. دیارە مامۆستا لەبیریەتی کە عەباس هەمیشە وانەکانی بـاش نووسـیوونەتەوە، هەرگیـز دەنـگە دەنگی نەبووە لەگەڵ منداڵەکانی پۆل و نـاوی کەسـی لەسـەر تەخـتە ڕەش نەنووسـیووە، کاتێـک مامۆسـتا لە پۆلـدا نەبوویێـت، بـۆ ئەوەی منـداڵەکان دەنـگە دەنـگ نەکەن، عەبـاس چیرۆکـی بـۆ گێـڕاونەتەوە. تێکـڕای منـداڵەکان عەباسـیان خۆشدەویسـت. عەبـاس لەبەردەم مامۆسـتا هەسـتا، ڕێـک وەسـتا، بێدەنگی پۆلەکە مامۆسـتای زیـاتر نـاڕەحەتکرد، مامۆسـتا لێـی پرسـی باوکت کـاری چییە؟ دوو منداڵ لە سەرەوە هاواریانکرد: مامۆستا باوکی مردووە. مامۆستا پرسـی: باوکت بەچـی مـرد؟ عەبـاس بەنـاڕەحەتی وەڵامـی دایەوە و گـوتی: مامۆسـتا بـاوکم، لە کـارگەی ئیقبـال کرێکاری پەموو پاککردن بوو، تووشی نەخۆشی سیل بوو مـرد. کاتێک بـاوکم مـرد مـن نەهاتبوومە قوتابخـانە، دایکم جێگەی بـاوکمی گرتەوە لەکارگە، ئێستا ئەویش تووشـی نەخۆشی سیل بووە و لە ماڵەوە کەوتووە، ناتوانێت هیچ کارێک بکات. مامۆستا پرسـی: چەند خوشک و برات هەیە؟ عەبـاس گوتی: مامۆستا بەخۆمەوە (٦). مامۆستا پرسـی:

هەمووتان لە قوتابخانەن؟ عباس گوتی: نەخێر، تەنها من دێمە قوتابخانە و دوو خوشکم لە خۆم بچووکترن، هێشتا کاتی قوتابخانەیان نییە، (٣) برام هەیە هەرسێکیان لە کارگەی ئیقبال کاردەکەن. مامۆستا پرسی: ئەو برایانەت کە لە کارگەی ئیقبال کاردەکەن تەمەنیان چەندە؟ عەباس لە وەڵامدا گوتی: مامۆستا، برا گەورەکەم (١٢) ساڵە و ئەویتر (١٠) ساڵە و ئەوی تریشیان (٩) ساڵە. مامۆستا گوتی: براکانت لە کارگە کاری چی دەکەن؟

عەباس گوتی: مامۆستا، قۆزاخەی پەموو پاکدەکەن، (واتە لۆکە، لە توێکڵەکەی جیا دەکەنەوە)، مامۆستا گوتی: براکانت ڕۆژانە چەند وەردەگرن؟ عەباس گوتی: برا گەورەکەم (٦) ڕیاڵ و دوو براکەی تریشم هەریەکەی (٥) ڕیاڵ وەردەگرن، ڕۆژانی هەینی و ڕۆژانی پشوو پارەیان نادەنێ. مامۆستا گوتی: خانووی خۆتان هەیە؟ عەباس گوتی: نا مامۆستا، کرێچین و یەک ژوورمان هەیە. مامۆستا گوتی: ئێستا دایکت نەخۆشە؟ عەباس گوتی: بەڵێ وەک گوتم تووشی نەخۆشی سیل بووە. دوو منداڵ گوتیان: مامۆستا دکتۆر پێیگوتووە نابێت کاربکات و دەبێت هەمیشە گۆشت و شیر بخوات. مامۆستا بەناڕەحەتی گوتی: ئەو پارەیە هی خۆتە و برۆ دانیشە. عەباس بەهێواشی چووەوە جێگاکەی خۆی دانیشت و (٦) ڕیاڵەکەی توند لە دەستیدا گرتبوو، زۆر دڵی پێی خۆشبوو. یەکەمین جاری بوو کە پارە بۆ دایکی بباتەوە، تا سیر و نیوێک گۆشتی پێبکڕێت. من زۆر ئاگادار نەبووم کە کاتی تەواوبوونی قوتابخانە بەهاوینان عەباس چ کارێکی دەکرد، بەڵام ساڵی دوواتر کە ئێمە چووینە پۆلی سێیەم، دایکی عەباس لە تەمەنی (٣٠) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. عەباس تا پۆلی (٤) هات بۆ قوتابخانە و هەمیشەش چاودێر بوو. لە ناوەڕاستی پۆلی (٤) لە قوتابخانە دەریانکرد. بوو بە شاگردی مسگەر. (چیرۆکی دەرکردنەکەی لە یادەوەریی پۆلی چواردا بخوێننەوە).

برایەکی کە تەمەنی (١٥) ساڵ بوو، لە کارگە دەستی ڕاستی لە ددانەکانی چەرخی کارگە گیرا و دەستی لە مەچەکییەوە بڕدرایەوە. برایەکی تری وازی لە کارگە هێنا و بوو بە شوفێری ئۆتۆمبێل. لە شەقامی (جیرفت) بە پێکدادانی ئۆتۆمبێل لە تەمەنی (٣٥) ساڵیدا مرد و (٧) منداڵی لەدوای خۆی بەجێهێشت. خوشکەکانیشی دەچوونە کارگەی ئیقبال و پەموویيان پاک دەکرد، لە ساڵی (١٣٥٤-١٩٧٥) یەکێک لە خوشکەکانی کە کرێکاری کارگە بوو، (٤) منداڵی هەبوو بەچارەنووسی دایکی چوو، ئەویش سیلی گرت و لە تەمەنی (٢٤) ساڵیدا مرد. باوک، دایک، برا و خوشک هەموو بوون بە قوربانی کارگەی پەموو پاککردن، بۆئەوەی سەرمایەداری لە یەزد گەشەبکات و دەوڵەمەندەکان بەناوی سەرمایەدارییەوە بەخۆشی و بەئارامی بژین لە ئێراندا.

## شازادەی حه مام

بەپیشەسازییبوونی بریتانیا سەرەتای سەدەی شۆڕشی پیشەسازیی بوو، بەڵام کرێکارانی بریتانیا لە کۆتاییدا بوون بە خاوەنی یەکڕیزیی و سەندیکا، بەڵام کرێکارانی پیشەسازی چنینی یەزد تا ئێستاش هەر لە جێگەی خۆیانن. ساڵی (١٣٧٩-٢٠٠٠)، تێکڕا (٤٥٠٠) کرێکاری کارگەی چنینی یەزد لە کارگە دەرکران، یەکێک لەوانە حسێن موقەدەم نەژادی نەوەی پووری من بوو. بە ژن و دوو منداڵەوە بە مافی بیمەی بێکاریی مانگانەی (٩٠) هەزار تومەن. تێکڕا نرخی (٢٠) کیلۆ گۆشت لە مانگێکدا کە دەبوو بەم پارەیە بژین. ئەو بۆئەوەی لەم خانەنیشینە سوودمەندبێت، مۆڵەتی کارکردنیان لە هیچ شوێنێکیتر نەدایە. ئێستا بیمەی کۆمەڵایەتی مۆڵەت نادات، کە منداڵانی بچووک لە هیچ شوێنک کاربکەن و زۆربەیان بیمەیان هەیە. کاتێک کە لە پۆلی دوو بووم، دووبارە ژنی ئاغا میرزا عەلی فەراش بووەوە بە مەلا و چەند منداڵێک لای ئەو دەستیانکرد بە خوێندنی قورئان. منداڵە قورئان خوێنەکان بۆ منداڵەکانی تریان باسدەکرد کە چۆن داریان پێدەهێنن بۆ لای سوپاکە، دیارە دایک و باوکیان دەیاندەزانی کە قورئان ناخوێنن، بەڵام دەیانویست منداڵەکانیان سەرگەردانی کۆڵانەکان نەبن. ئەوکات نە کارەبا هەبوو نە ڕادیۆ نە شتێک هەبوو تا منداڵان یاریی پێبکەن. ژنان لە سەری کۆڵانان دادەنیشتن و دەستیاندەکرد بە قسە و غەیبەتکردن. خوداڵێخۆشبوو، بیبی هاجەری عاشقە مەدینە لە بەردەرگای خۆیان دادەنیشت و ژنانی لە دەوری خۆی کۆدەکردەوە. قسەی لەسەر هەموو کەسێک و هەموو شتێک هەبوو. ئامۆژگاری ژنانی دەکرد، بەڵام ئاگای لە منداڵەکانی خۆی نەبوو، منداڵیش بە کۆڵانەکاندا بەدوای توێکڵە شووتی و توێکڵە کاڵەکدا دەسووڕانەوە. ئەم ژنانە تا شەو درەنگ دادەنیشتن و قسەیان دەکرد و منداڵەکانیشیان لە کۆڵانەکاندا دەسووڕانەوە. گەورەترین سەرگەرمیی خەڵک، چوونە حسێنیە بوو بۆ مەراسیمەکان. مەراسیمی ساڵانە تەنها چەند جارێک بوو، وەک ئێستا نەبوو کە هەمیشە مەراسیم بەردەوام بێت، ساڵانە (١٠) شەو لە حسێنیەی پشتی باخ و لە حسێنیە بچووکەکاندا مەراسیم دەگیرا. (١-٢) کەس لە گەڕەکدا مەراسیمی هەفتەیان ئەنجامدەدا. واتە ڕۆژانی هەینی لە ماڵەکانی خۆیاندا مەراسیمی قورئان خوێندنیان سازدەکرد. ئەسەدوڵلا موتاب، کە خاوەنی (٥) منداڵ بوو کرێچی بیبی هاجەر بوو، لە تەنها ژوورێکدا دەژیان، هەموو شەوی هەینییەک لە ماڵەکەی خۆیدا مەراسیمی قورئان خوێندنی سازدەکرد و خێری دەکرد کە کاروبارەکانی باش بێت. پێش شەوی هەینی دەچوو لە بازاڕ هەموو پێداویستییەکانی مەراسیمی دەکڕی شەکر و چا و شتی تری دەهێنایەوە.

پارەی دەدا بە قورئان خوێنەکان. من ماوەیەکی زۆر لە مەراسیمەکانی ئەسەدوڵلادا چام دەگێڕا، منداڵانیش دەهاتن بۆ چاخواردنەوە، هەر کاتێک ئاغا عەلی بهاتایە کارێکی دەکرد، هەمووانی دەخستە پێکەنین. هاوینی پۆلی دووەم ئاغای عاشقە مەدینە گوتی کە شاگردی ناوێت، منیش چەند ڕۆژێک لە کوڵان خەریکی یاریکردن بووم. تا ڕۆژێک لەگەڵ مەملەک (محەمەد) بیبی سەنگین شەڕمکرد. دایکم گوتی: دەبێت هاوین بڕۆی بۆ کوێ؟ بڕیاربوو بچمە دوکانی پاسکیلخانەی ئاغای کەسایی، دوکانی ئاغای کەسایی لە شەقامی پەهلەوی یەزد بوو، تاڕادەیەک، لە ماڵی خۆمانەوە دوور بوو، لانیکەم بۆ منداڵێکی (٨) ساڵ دوور بوو، بەڵام دەبوو من هەموو ڕۆژێک بچمە ئەو دوکانە و لەوێ خەریکی چاککردنی پاسکیل بم. شۆردنی زنجیر و بۆڵبرینگی پاسیکیل بە نەوت، کارێکی ناخۆش بوو بۆ من، هاوین بوو ئاو و هەوای یەزدیش گەرم بوو، شۆردنی بۆڵبرینگ و زنجیر بە نەوت دەستمی سووتاند بوو، بەڵام چارەیەک نەبوو، دەبوو یان لە کوڵانان بەرەڵابم و یاریی بکەم یان لەگەڵ منداڵاندا بەشەڕبێم یانیش بەنەوت و زنجیر بۆڵبرینگی پاسکیل بشۆم. کاری پەنچەریشم دەکرد. دەبوو هەر لە بەیانییەوە تا شەو لەو دوکانە خەریکی کارکردن بم و هیچ هەقدەستێک یان ڕۆژانەیەکیشم نەبوو. هاوینی پۆلەکانی دووەم و سێیەم لە دوکانی ئاغای کەسایی بووم. (ڕەزا) ی کوڕی ئاغای کەسایی هاوپۆلی من بوو، بەڵام زیرەک نەبوو، بڕیاربوو من وانە بە ڕەزا بڵێمەوە، جار جار دەچوومە ماڵیان شەوانە وانەم پێدەگوتەوە. وردە وردە ناوم بڵاوبووەوە کە کەسێکی زیرەکم و دەتوانم وانە بە منداڵانی خوار تەمەنی خۆم بڵێمەوە. ناسرام و ئیتر بۆ من شتێک دروستبوو کە شەوانە بێتاقەتی خۆمی پێبڕەوێنم. ماوەیەک وانەم بە ڕەزا و خوشکەکەی دەگوتەوە، پاشان (٢-٣) ساڵ لە پۆلەکانی (٤، ٥، ٦)، وانەم بە شەمسی خانم و کازم ئاغا و دایکیان دەگوتەوە. مامۆستای پۆلی (٣) و (٤) خەڵکی یەزد نەبوو، بەڵکو تارانی بوو، پیاوێکی خاوێن و ڕێکوپێک بوو، ئەو کاتە مووچەی مامۆستا زۆر باش بوو، زۆر چاک پێی دەژیان، هەموو مامۆستاکان جلوبەرگی باشیان دەپۆشی و پێڵاوی تازە و هەمیشە بۆیاخکراویان لەپێدابوو. سێ مانگەی هاوین لە کوێستانەکانی یەزد ژیانیان بەسەردەبرد. لەو ساڵانەدا مووچەی مانگێکی مامۆستا بەرامبەر بە (٢٥٠) کیلۆ گۆشتی مەڕ بوو. بەڵام ئێستا مووچەی مانگانەی مامۆستایەکی زانکۆ بەرامبەر بە (٩٠) کیلۆ گۆشتی مەڕە. مامۆستای پۆلی سێیەم کەسێکی باڵابەرز بوو، چیرۆکی زۆر جوانی بۆ دەگێڕاینەوە. من لەگەڵ ئەو مامۆستایەدا یادگاریی زۆرم هەیە، بەڵام یادگارییەکان دووبارەن، پۆلی سێیەم تەواو بوو، هاوین هاتەوە، گوتم ناچمەوە دوکانی پاسکیلخانە، بڕیار بوو بچمە دوکانی مسگەریی و کۆنە چاککردنی ئاغای محەمەد

حسێن که خاڵیشم هەر لەوێ کاری دەکرد. دوکانەکەی لەسەر مەیدانی میر چەقماق تەنیشت دوکانی حاجی خەلیفەی ڕەهبەر بوو. دووریی دوکانەکە لە ماڵی خۆمانەوە زۆر لە پاشکیلخانەکە دوورتر بوو، بەڵام چارە نەبوو، من زۆر حەزم لە کاری نەخشەکێشانی سەر مس بوو، بەڵام حاجی حەسەن دەیگوت جارێ تۆ منداڵیت و دەبێت وانەکانت بخوێنیت. من هەموو ڕۆژێک دەچووم بۆ دوکانی مسگەرییەکە بەڵام کارم نەدەکرد. تەنها چەکوچەکانم کۆدەکردەوە و توندم دەکردننەوە، شتم دەگواستەوە بۆ ژێرزەمینەکە بۆلای دەزگاکە، تەنها شتێک کە لە مسگەریی بۆمن ماوەتەوە ئەوەیە کە فێری ناوی زیاتر لە (٢٠) جۆر چەکوچ بووم، کە هەریەکەی بۆ کارێک بەکاردێت و هەریەکەی ناوێکیشی هەیە. خاڵم جاروبار (٥) ڕیاڵی دەدامێ منیش دەمدا بە دۆندرمە و هەنجیری وشک. جارێکیش خاڵم جوتێک پێڵاوی چەرمی قەیتانداری بۆکڕیم، پێڵاوێکی زۆر باش بوون بۆ ڕێگای دوور لەپێم دەکرد و پێیانەوە غارمدەدا، بەشی یەک ساڵی کردم. هاوین تەواوبوو، دەبوایە بچمەوە قوتابخانە، چوومە پۆلی (٤)، لە پۆلی (٤) من چیرۆکم دەگێڕایەوە. هەر پۆلێک مامۆستای ئامادە نەبووایە، یاخود مامۆستا بیویستایە درەنگ بچێتە پۆلەوە، منیان بانگدەکرد بچمە پۆلەکانەوە بۆ هێورکردنەوەی قوتابیان چیرۆک بگێڕمەوە. من لە مەلا نەباتی و دایە گەورە و دایکم و مەراسیمی عاشورا، فێری چیرۆک ببووم، زۆرجاریش لە کتێب خوێندنەوە فێردەبووم، زۆر لە چیرۆکەکانی ئاغای سەمام کە زانایەکی گەورەبوو فێرببووم.

# شازادەی حه مام

لە فارسییەوە ئەها سکالانی

## گێڕانەوەی چیرۆکی شەوانە

لە هاوینی پۆلی (٣) و (٤) دا بوو کە یەکەمین کتێبم خوێندەوە، کتێبی حسێن کوردی شەبەستەری، ئەمیر ئەرسەلانی ناودار، چەندین کتێبی پۆلیسی. تەنها کتێبی ئەمیر ئەرسەلانی ناودار بەس بوو بۆ کە دەیان منداڵی پۆلەکانی پێ دانیشێنم و بێدەنگیان بکەم. قەرەباڵغترین پۆل و هارترین منداڵ چاوەڕوان بوون کە حسێن پاپولی بچێتە پۆلەکەیانەوە و چیرۆکەکانی ئەمیر ئەرسەلانی ناودار. شەمس وەزیر، قەمەر وەزیر، دایکی فولادزەر، فولادزەری دێو، زیندانیکردنی فروخ لەقا، باخی بەردین، بەردبارانی ئەم و ئەو، ڕزگاربوونی فروخ لەقا لەلایەن ئەمیر ئەرسەلانەوە. چیرۆکی ئەمیر هۆشەنگ، یان بۆ بگێڕێتەوە، کاتێک تەلەفزیۆن و سینەما و کۆمپیوتەر و کارەبا نەبوو، چیرۆکبێژ بازاڕیان گەرم بوو، خەڵکی حەزیان دەکرد لەدەوریان کۆببەنەوە.

- جاروبار ژنانی کۆڵان بانگیان دەکردم و دەیانگوت حسێن وەرە چیرۆکمان بۆ بگێرەوە، حسێن پێمان بڵێ لە کۆتاییدا فروخ لەقا چی سەرهات؟ من کاتێک چیرۆکی گرفتار بوونی فروخ لەقا و شەمس وەزیرم بەدەستی دایکی فولازەر بۆ دەگێڕانەوە، ژنەکان دەگریان و بۆ ڕزگاربوونیان دوعایان دەکرد. وەکئەوەی چیرۆکی فروخ لەقا و ئەمیر ئەرسەلان بەڕاستی ڕوویدابێت و ئێستا کە گرفتار بوون بەدەستی دایکی فولادزەر پێویستە نزای خێریان بۆ بکەن تا ڕزگاربن. بیبی سەکین ئەرزنجانی، ژنێک بوو کە خۆی گرفتاری دەستی هاوسەرێکی تلیاکخۆر و توورە و هەمیشە زیندانکراوی (٤٠) ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو، دوانزە مۆمی بە نییەتی دوانزە ئیمامی شیعە بۆ ئیمام جەعفەر کردبووە خێر کە دایکی فولادزەر خۆی ببێ بە بەرد و فەروخ لەقا ڕزگاری ببێت. ڕاستییەکەی ئەوە بووە کە بیبی سەکین خێری کردبوو کە خۆی لە شەڕی عەباس تلیاکی کە هەمان دایکی فولادزەرە، بۆ ئەوەی ڕزگار بێت. ژنانی هەژار و چەوساوە بە دەستی پیاوی زەمانە، ئامادەی گریان بوون بۆ هەر شتێک تەنانەت بۆ

چیرۆکی ئەمیر ئەرسەلانی ناودار و دڵسۆزی بۆ فەروخ لەقا دەگریان. لەو سەردەمەدا لە دەیەی سالانی (١٣٣٠-١٩٥٠) کاندا پێویستە بڵێین. کە گریان بۆ هەر دەردێکی بێ دەرمان دەرمان بوو، یەکێک لە ژنانی دراوسێمان کە ناوی بومان جان بوو، هاوسەری یەکەمی مردبوو، تەنها سەروەتێک کە بۆی جێهێشتبوو دوو منداڵ بوو، کوڕێک و کچێک، ناچار شووی بە پیاوێکی ژن مردوو کردبوو، کە ئەویش چەند منداڵی وردی هەبوو. ئاغا محەمەد سیراجی پیاوێکی چرووک و کەم مەسرەف بوو، بەیانیان کە لە ماڵ دەچووە دەرەوە ماڵەکەی وەک بیابانێکی بێ ئاو و لەوەڕ وابوو، نیوەڕۆوان نەدەهاتەوە بۆماڵەوە، تەنها شەوانە دەهاتەوە یەک سیر گۆشتی دەکڕی (١ سیر = ٧٥ گرام) لەگەڵ نان و نیوێکی یەزدیدا، دەچووە دوکانی بەقاڵی گەڕەکەکە و دەبەیەکی زۆر بچووکی هەبوو کە نزیکەی چارەکە لیترێک نەوتی دەگرت کە بایی یەک ڕیاڵ بوو، لەگەڵ بایی یەک ڕیاڵ چا و دوو ڕیاڵ شەکر و جارجارێکیش بایی یەک ڕیاڵ یا دوو ڕیاڵ پەنیری دەکڕی و دەیهێنایەوە بۆ ماڵەوە.

بومان جان، دەبوو بەم کەمە خۆراکە ژەمی شەوی خۆی و هاوسەر و منداڵەکانی بەڕێتەسەر. هەندێک جاریش ئاغا محەمەد، نۆک و لۆبیا و نیسک و ماشی دەهێنایەوە، بەڵام باوەڕبکەن بەشی تەنها شەوێکی نەدەکرد. بومان جان خۆی کاری ڕستنی دەکرد و نانی منداڵەکانی خۆی دابین دەکرد. هەندێک جار براکانیشی هاوکارییان دەکرد. تەواوی ڕۆژ جگە لە ئاو شتێکی تر لە ماڵەکەیدا نەبوو.

دراوسێیەکی ترمان ناوی حاجیک بوو، هاوسەرەکەی (٦) مانگ بە (٦) مانگ دەچووە ئەهواز بۆ کارکردن و پارەی بۆ حاجیک و منداڵەی نەدەناردەوە. ئەم ژنە پێشتر ژنی حەکاکێک بوو کە چەند ساڵ لەوەپێش مردبوو. دیار نەبوو کە منداڵەکانی چۆن گەورە کردبوون. ئەم منداڵەی تری، کە بچووک بوو لەگەڵ (٤) منداڵی مێردەکەی بەهاوکاری خوشکەکەی بەخێویان دەکردن. هەڵبەت ئەم ژنە زەحمەتکێشانەی کە بۆ ئازادی فەرەح لەقا خێریان دەکرد و دەگریان، خۆیان فەرەح لەقای سەردەم بوون کە بەدەستی فولادزەری سەردەمەوە گیریان خوارد بوو. ئەم جۆرە ژنانە ئێستاش هەن، ژنانی هەژارو پەککەوتەی بە حەیا و بەشەرم کە شتێک لە هیچ کەسێک وەرناگرن، لە تافی لاویدا بێ هاوسەر دەبن و بەحەیاوە دەژین. بەشێک لەو ژنانە بۆ بیستنی چیرۆکەکانی من دەهاتنە ماڵی بیبی هاجەر، زۆربەی کرێی چیرۆک گێڕانەوەکەم لەو ژنانە وەردەگرت کە زۆربەیان بێوەژن بوون، ژمارەیان لە (١٥) کەس زیاتر بوو، تەنها یەک یان دوو سەلکە شێلمی پاککراو بوو، کە لە سەری کۆڵانەکان دادەنیشتین و دەمانخوارد.

## شازادەی حە مام

من ڕادیۆ، سینەما، تەلەفزیۆن و شانۆیی ئەوان بووم و بوومە مایەی سەرگەرمی ئەوان. چیرۆکەکانم مایەی ئومێد و ئەندێشەی ئەوان بوو، چەندین جار ئەم ژنانە کە زۆربەیان بێوەژنی خاوەن چەند منداڵ بوون، هێناومنەتە گریان و پێکەنین. دوای (٤٥) ساڵ لەم چیرۆک گێڕانەوەیە لە شەوە تاریک و ساردەکانی کۆڵان بە کۆڵانی گەڕەکی پشتی باخی یەزد (کە بەهۆی تازەکردنەوەی گەڕەکەوە هیچ ئاسەوارێکی نەماوە) لە نێوان ئەم کۆمەڵە بێوەژنە دڵسووتاوانەدا جوانترین و شیرینترین یادگاری من دروست دەبێت. بەداخەوە زۆربەی ئەم ژنانە لە هەژاری و نەبوونیدا مردن، دڵنیایی بیمەی کۆمەڵایەتی بۆ ئەم ژنانە کارێکی بنچینەییە. وا نەزانی کە ئیتر ئەم جۆرە ژنانە نین و ئەم جۆرە ژیانە کۆتایی هاتووە. لە ساڵی (١٣٨٣-٢٠١٤) دا لانیکەم (١٠٠) هەزار کەس لەوانە لەدەوروبەری شاری مەشهەد ژیان بەسەردەبەن.

## سینەمای ئاغای پارچە

خاوەنی سینەمای ئاغای پارچە، پیاوێکی ڕێکپۆش، خاوێن، باڵابەرز، ڕووخۆش و بەئەدەب بوو، وابزانم کارمەندی شارەوانی بوو، بەئاغای پاچە ناسراو بوو. سینەمایەکی دانابوو کە تابلۆی نەبوو، بەڵام بە سینەمای ئاغای پارچە ناسرابوو. تەمەنم (١٠) ساڵ بوو، کە یەکەمجار چووم بۆ سینەما، سینەمای ئاغای پارچە لە کۆڵانی سینەما شەقامی کرمانی یەزد، ئەم سینەمایە سینەمای هاوینە بوو، ساڵۆنی سینەما پێکهاتبوو لە یەک دیوار بەدەوری گۆڕەپانەکەدا بەبێئەوەی سەری بگیرێت و بەبێ دانانی کورسی دیوارێکی سپی لە پێشەوە دروستکرابوو کە شوێنی نیشاندانی فیلمەکە بوو. سێ ڕیز تەنەکەیان دانا بوو، تەختە لەسەر ڕووی تەنەکەکان دانرابوو، کە پیاوە بەناوبانگەکان دەهاتن بۆ سەیری فیلم لە سەری دادەنیشتن. پشتەوەی قەنەفەکان بەرد و خشت دانرا بوون، خەڵک خۆی پارچە ڕاخەری دەهێنا و لەسەری دادەنیشتن، هەندێک کەس بەماڵ و منداڵەوە دەهاتن و لەسەر زەوییەکە دادەنیشتن.

جۆرەها خواردنیان دەهێنا وەک نان و پەنیر و دۆ. خەڵکەکە لەکاتی سەیرکردنی فیلمدا، گۆشتاویان دەخوارد، دەنگی کوتانی گۆشت و نۆکاوەکە بەبەرزی دەبیسترا. زۆر جار دەنگە دەنگی ژن و منداڵ لە دەنگی فیلمەکە بەرزتربوو. هەر کەسە و لای خۆیەوە بە دەنگی بەرز باسی بابەتی فیلمەکەی دەکرد کە چی ڕوودەدات و چی دەبێت.

بەتایبەت ئەو کەسانەی کە پێشتر فیلمەکەیان بینیبوو، بابەتەکەیان لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی بۆ خەڵکانی تر باسدەکرد. هەر بەو هۆیەشەوە لە نێو هەندێکیاندا ناڕەزایی دروستدەبوو، تەنانەت هەندێک جار شەڕە جوێن یش دروستدەبوو. ئەگەرچی خەڵکی یەزد بەگشتی شەڕانی نین. زۆر جاریش گاڵتەوگەپ دروستدەبوو. تەنانەت جارێکیان چەند منداڵێک پاڵیاننا بە ڕیزی سێیەمی دواوە و خستیانن بەسەر ڕیزی دووەمدا و ئەوانیش کەوتن بەسەر ڕیزی یەکەمدا ئیتر بوو بەقاقای پێکەنین.

جاری واش هەبوو، پاش (٢٠) خولەک لە دەستپێکردنی فیلمەکە کەسێکی خانەدان و گەورە یاخود کەسێک بەخێزانەوە دەهاتن؛ کەچی لێپرسراوی سینەما بانگی دەکرد ئاغای عەباسی، سەرۆکی شارەوانی هاتووە فیلمەکە لە سەرەتاوە دەستپێبکەرەوە. فیلم دووبارە دەستی پێدەکردەوە، منداڵان خۆشحاڵ دەبوون بە دووبارە کردنەوەی فیلمەکە و چەپڵەیان لێدەدا. جارێکیتر ماڵی کەسێکی تر دەهات دیسان لە سەرەتاوە فیلم دەستپێدەکردەوە. جارێکیان بیرمدێت کە فیلمەکە (٥) جار لە سەرەتاوە لێدرایەوە، هەر جارەش بەهۆی هاتنی کەسێکی دیارەوە بوو. چیرۆکی فیلمەکان زۆر خۆش بوون، بەڵام هێندەی داستانی ئەمیر ئەرسەلانی ناودار خۆش نەبوو. ئێستا، کە قسە هاتە سەر سینەما باسی دروستبوونی یەکەم سینەماتان لە یەزد بۆ دەکەم. پیاوێکی زەردەشتی کە ماوەیەکی زۆر لە هندستان ژیا بوو، هات بۆ یەزد لە شەقامی پەهلەوی (ئیمامی ئێستا) زەوییەکی کڕی و سینەما سوهەیلی لەسەر دروستکرد. ئەم سینەمایە (٢٥٠) مەتر لە خوار مزگەوتەکەوە بوو، کاتێک ئەم زەردەشتیە بینای سینەماکەی دروستکرد. بەڵام بەهۆی دژایەتیکردنی لەلایەن چەند کەسێکی دینییەوە کە دەیانگوت سینەما حەرامە و نابێت لە نزیک مزگەوتەوە بێت و نەیاندەهێشت سینەماکە بکرێتەوە، پاش (٣) ساڵ بەهاوکاری شارەوانی سینەماکە کرایەوە. من هەموو هەفتەیەک دەچووم بۆ سینەما، تەنانەت هەموو ئەو فیلمانەم بەخۆرایی دەبینی کە لەو سینەمایە پەخش دەکران، هەرگیز پارەم نەدەدا، هۆی پارەنەدانیشم ئەوەبوو کاتێک فیلمەکان لە تارانەوە بە پاس دەگەیشتنە یەزد، من لە گەراج فیلمەکانم وەردەگرت و دەمبردن بۆ سینەماکە، کرێکەشم بینی فیلمەکە بوو بێبەرامبەر. یادەوەرییەکی سینەماتان بۆ دەگێڕمەوە کە ئەوکات لە پۆلی (١١) بووم، ساڵی (١٣٣٤-١٩٥٥) ئەگەرچی دەبوایە ئەم یادەوەرییە لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا باس بکرایە.

## حاجی ئاغا دەچێت بۆ سینەما

کاتێک لە پۆلی (١١) بووم، مامۆستای کیمیامان بەتەمەن بوو، زۆر بەدین و بەڕێز بوو. حاجی ئاغا هەمیشە کڵاوی لەسەردا بوو، شاڵێکی لەسەری دەپێچا، بەپاسکیل دەهات بۆ قوتابخانە پیاوێکی پاک و خاوێن بوو، زۆر سادەش بوو. ڕۆژێک لە نێو پۆلدا قوتابییەکان بەحاجی ئاغایان گوت: مامۆستا تۆ تا ئێستا چوویت بۆ سینەما؟ ئەویش گوتی: یارەبی خودایە تۆبە، من بچم بۆ سینەما!. چەندین جار لەکاتی وانەی کیمیادا باسی سینەما دەهاتە پێشەوە، تا ڕۆژێکیان مامۆستا فەرمووی: ڕاستتان دەوێت من زۆر حەزدەکەم ئەم هونەری حەوتەمە ببینم، بەڵام لە یەزد ناکرێ ئەم کارە بکەم، ئەگەر من لە یەزد بچمە سینەما، دەبێت ئەم شارە جێبهێڵم. من بەحاجی ئاغای وەزیری (ئیمامی مزگەوتی گەورەی یەزد، دامەزرێنەری کتێبخانەی وەزیری یەزد) ناسراوم، دۆست و دراوسێم هەیە، ئەگەر ئەوان بزانن من چووم بۆ سینەما، من بەم کارە خەجاڵەت دەبم و ئەوا سەکتە لێم دەدات. لەدواییدا چەند قوتابیەک قسەیانکرد بەیەک و چوونە لای مامۆستا و گوتیان: مامۆستا، سینەما فیلمی (١٢) ئیمامی هێناوە و حاجی ئاغای وەزیریش چووە بۆ بینینی و فیلمی ژیاننامەی (١٢) ئیمام. هەڵبەت ئەم قسەیە درۆ و بوختانی قوتابییەکان بوو، تا حاجی ببەن بۆ سینەما. حاجی ئاغا گوتی: چۆن دەبێت حاجی ئاغای وەزیری چووبێت بۆ سینەما؟ قوتابییەکان سوێندیان بۆ خوارد کە چووە. قوتابییەکان لەگەڵ دوو مامۆستای گەنجدا قسەیان کرد، ئەوانیش بەحاجی ئاغایان گوت، کە لە چەند کەسێکی بەدینیان بیستووە کە فیلمێکی باشیان لەسەر ژیانی (١٢) ئیمام هێناوە، حاجی ئاغای وەزیری و حاجی ئاغای لەبخەندەقی و حاجی ئاغای مدرسی سەرەتای مانگ چوون بۆ سینەما و فیلمەکەیان دیوە. لە دواییدا حاجی ئاغا نەرم بوو گوتی: منیش دێم بۆ سینەما، بڕیار بوو کاتژمێر (٧) قوتابییەکان لەبەردەم سینەما چاوەڕوانی بکەن و لەگەڵیدا بچنە سینەما. کاتژمێر (٧) نزیکەی (٣٠) قوتابی لەبەردەم دەرگای سینەما بووین، بەڵام حاجی ئاغا نەهات. سبەینێ لە قوتابخانە لێیانپرسی: مامۆستا بۆچی نەهاتی؟ گوتی: پێم شوورەیی بوو بێم، کارێکی باشم کرد کە

نەهـاتم. منـداڵەکان گوتیـان: ئاغـا گیـان، سـینەما هـیچ شـوورەییەکی تێـدانییە. ئەوجـا پێیگوتبـوون: تکـایە وازم لێبهێنن، مـن نـایەم بـۆ سـینەما. پـاش هەفتەیەک قوتابییەکـان پێیانگوت: وا فیلمەکە کۆتایی دێت خێرا بڕۆ فریاکەوە، دوایی پەشیمان دەبیتەوە. حـاجی ئاغا گوتبووی ئەگەر ئێوە نەیکەن بە هەرا و لە نێو خەڵکدا بڵاوی نەکەنەوە، من ئەمشەو خۆم بە تەنها دەچم بۆ سـەیری فیلمەکە. ئیتر وا بڕیار بـوو ئێوارە دوو قوتـابی لەگەڵ حاجی دا بچن بۆ مزگەوت و پێکەوە نوێژبکەن و پاشان بەیەکەوە بچن بۆ سـینەما. ئەو شـەوە مـن لەوێ نەبـووم، ڕووداوەکەم لە چەنـد قوتـابییەک بیسـت. تەنـانەت خەڵکیش باســیان دەکــرد. (١٥) قوتــابی لەبەردەم ســینەماکە بــوون کە حــاجی بەســواری پاسکیلەکەیەوە هاتبوو، حاجی بە قوتابییەکانی گوتبوو من لەگەڵ ئێوە نایەم بۆ سـینەما، ئێوە خۆتان بڕۆن و من خۆم بەتەنیا دەچم. منداڵەکان دەڵێن زۆر باشـە و بڕیـاردەدەن. قوتابییەکان بلیت وەردەگرن و دەچنە ژوورەوە. بەڵام دووانیـان لە دوورەوە چاودێریی حاجی ئاغا دەکەن، حاجی ئاغا دەچێت بلیت وەربگرێت، پێیدەڵێن: بلیتی چەندیت دەوێ؟ حاجی ئاغا دەڵێت: من نازانم. پاشان بلیتفرۆش بلیتێکی (٥) ڕیاڵی دەداتێ و دەڵێت: بچۆ لە پێشـی پێشـەوە دانیشـە. سـینەما بەجۆرێـک دروسـتکرابوو کە دەچـوویتە ڕاڕەو و ساڵۆنەکەوە، یەکەمین دەرگا تایبەت بوو بە ژن و منداڵ، دەرگاکەی تر تـایبەت بـوو بە کورسییەکانی پێشەوە. قوتابیـانش هەمـوو چاوەڕوانی هـاتنی حـاجی ئاغا بوون، لە نێو تـاریکیی سـینەماوە چاویـان لە دەرگـاکە بـوو، سـەردەمی شـا کاتێـک دەچـوویتە سـینەما (٢٠) دەقیقەی سـەرەتا تەنها ڕیکلام بوو، پاشان سروودی شاهەنشـایی لێدەدرا و دەبـوو خەڵکی هەموو هەڵبستنە سەر پێ. حاجی لەو کاتەدا کە دەچێتە نـاو سـینەماکەوە، کـاتی سروودی شاهەنشایی دەبێت، هەموو خەڵک هەڵدەستنە سـەر پێ، پیاوێک کە (٤٠) سـاڵ مامۆسـتا بـووە، هەر کاتێـک چـووەتە نـاو پـۆل هەمـوو قوتابیـان لەبەری هەسـتاون، وایزانیبـوو ئەو خەڵـکە هەمـوو لەبەر ئەو هەڵسـاونەتە سـەر پـێ، ئەویـش دەسـتێکی بەسـنگییەوە دەگرێـت و بەدەسـتەکەی تـر ئاماژەیـان بـۆ دەکـات و دەڵێـت: فەرمـوون.. فەرموون توخودا دانیشن. هەمـوو کورسـییەکان خەڵکیـان لەسـەر بـووە، حـاجی دەچێـت لەلایەکی ساڵۆنەکە دادەنیشێت، بە بۆچوونی خۆی وای نیشـانداوە کە خۆی بەپیـاوێکی گەورە نازانێت، ئاگاداری ئەوە نییە کە ئەو بلیتی ڕیزی پێشەوەی بڕیوە. بەدانیشتنی ئەو سـرروودی نیشـتمانیی تەواودەبێـت. خەڵـکەکە هەمـوو دادەنیشـن هەنـدێک لە بنەمـاڵە ناسـراوەکانی یەزد لەگەڵ دەسـتپێکردنی فـیلمەکە دێـنە ژوورەوە، حـاجیش بەدەنگێکـی بەرز سوپاسی هەموو خەڵکەکە دەکات، خەڵکیش نەیـانزانیوە حـاجی بۆچی سوپاسـیان دەکات. قوتابییەکـانیش لەبەر پێکەنین خۆیـان بۆ ڕانەگیـراوە و دەسـتیان خسـتۆتە سـەر دەمیـان. دوای دەسـتپێکردنی فیلمـیش چەنـد خێزانێکـی تـر دێـنە ژوورەوە. کەسـێک ڕێنماییان دەکات بۆ شوێنی تایبەتی ژنان، بەڵام کە دەچن سەیردەکەن حاجی ئاغا لەوێ

دانیشتووە، شاگردەکە دەڵێت: حاجی جێگای تۆ لە پێشەوەیە بفەرموون بچنە ڕیزی پێشەوە. ئەویش دەڵێت: سوپاستان دەکەم ئێرە شوێنێکی باشە، ناچمە پێشەوە، پێشەوە جێگای پیاوە گەورەکانە. هەر شاگر دەڵێت: بڕۆ خوارەوە.. حاجیش ئینکاری دەکات و دەڵێت: جێگەکەم باشە و ناڕۆم، با ئەم ماڵ و منداڵە بەڕێزە بچنە ڕیزی پێشەوە. ناچار شاگردەکە بانگی هاوڕێکەی خۆی دەکات و بەزۆر دەچنە ژێر باڵی حاجی و هەڵیدەستێنن و دەیبەنە ڕیزی پێشەوە. بۆ سبەینێ حاجی دیار نەبوو بێتەوە بۆ قوتابخانە، بە هەمان شێوە ڕۆژی دواتریش هەر نەهاتەوە، یەک هەفتە حاجی نەهاتەوە بۆ قوتابخانە. قوتابییەکان نارەحەتبوون کە حاجی بۆچی نایەتەوە بۆ قوتابخانە. پاش هەفتەیەک حاجی هاتەوە بۆ قوتابخانە و گوتی: ئەی منداڵانی بێشەرم و حەیا و ساختەچی درۆزنینە، خۆ ئێوە بڕیارتان دابوو، بەکەس نەڵێن کە من هاتم بۆ سینەما، کەچی هەموو شارتان ئاگادارکردبوەوە و ئەو هەموو خەڵکە لەوێ بوون وهەموویان لەبەرم هەستان، پاشان بەزۆر بردیانم بۆ ڕیزی پێشەوە، من غەرقی ئارەق بووم، هەموو خەڵکی زانییان کە من لە سینەما بووم. پاشان فیلمەکە فیلمی (١٢) ئیمام نەبوو، بەڵکو ژنێک سەمای دەکرد ئەوە یەک هەفتەیە لە ژوورەوە نەهاتوومەتە دەرەوە. ئێستاش کوڵانە و کوڵان هاتووم، هەفتەیەکیشە نەچووم بۆ مزگەوت، بەهەموو کەسم گوتوە کە نەخۆش بووم، ئێستا من دەبێت ئەم شارە جێبهێڵم. نەعلەتی خودا لە ئێوەی شەیتان. قوتابییەکان گوتیان: بەڕێزت زوو نەهاتی بۆ سینەما کاتێک تۆ هاتی فیلمەکە گۆڕا بوو، ئێمە بە هیچ کەسێکمان نەگوتووە کە تۆ دەچیت بۆ سینەما، هەموو شار تۆ دەناسێت، ئیتر تاوانی ئێمە چییە؟ (٤) ساڵ لەوەودوا، کە ساڵی سێیەمی زانکۆم بوو، لەسەر شەقامێک چاوم بەحاجی کەوت، گوتم: حاجی ئاغا ئێستاش دەچیت بۆ سینەما؟ گوتی: پاپولی یەزدی، هەموو شار من دەناسێت، هیچ باشییەکی تێدانییە کە من لە یەزد بچمە سینەما، بەڵام چونکە نەخۆش بووم منداڵەکانم بردیانم بۆ تاران، لە تاران دوو جار چوومەوە بۆ بینینی هونەری حەوتەم، منداڵەکانم گوتیان هەرگیز فیلمی دوانزە ئیمام لە سینەما پیشان نەدراوە، ئێوە منداڵانێکی خراپ بوون کڵاوتان خستە سەرم، بەڵام من لێتان دەبوورم چونکە بەهۆی شەیتانیی ئێوەوە من هونەری حەوتەمم بینی.

لێکەوتەکانی مرۆڤ لەگەڵ دەرکەوتنی ئامرازەکانی تەکنەلۆژیای نوێ باسێکی گرنگە لە کۆمەڵگەدا، لە کاتی پەڕینەوە لە سەدەی کۆنەوە بۆ سەردەمی مۆدێرنەتە، ڕەفتاری هاوشێوەی حاجی ئاغای مامۆستای کیمیا مشتێکە لە خەروارێک.

## ڕۆیشتنی خەڵکی دیهات بۆ سینەما

هەمان ساڵ ڕۆژێک لە بەردەم گەراجی تەئمینات ڕاوەستا بووم، پیاوێکی گوندنشین بۆ پیاوێکی دیکەی باس دەکرد، نازانی چ هونەرمەندێکە، زۆر باش سەما دەکات، من (١٤) جار چووم بۆ سینەما هەر (١٤) جارەکە دەمبینی جلەکانی تا هەمان شوێنی ڕانی بوو، بۆ سەرووتر هەڵی نەدەکرد. ئەو گوندنشینە (١٤) جار چوو بوو بۆ بینینی فیلمێک، لەبەرئەوەی ژنێکی سەماکەر لە فیلمەکەدا سەمای کردبوو. جلی هونەرمەندە سەماکەرەکە تا سەر ڕانی ڕووت ببوو. ئەو داماوە گوندنشینە (١٤) جار پارەی دابوو، کە بەڵکو جارێک داوێنی جلەکانی بەرەو سەرووتر هەڵکشێت و شتێک لە ڕانی زیاتر ببینێت. بەڵام هەر (١٤) جارەکە دامێنی جلەکانی لەیەک ئاستدا بووە. لە ساڵەکانی سەرەتای سینەمادا خەڵکی سادە هیچ جیاوازییەکیان نەدەکرد لە نێوان فیلم و مرۆڤی زیندوودا، وایاندەزانی کە سینەما تەختەی شانۆیە، هەرچەندە ئەوسا شانۆشیان نەبینی بوو. لە شەقامی پەهلەوی کۆن، لە تەنیشت گەراجی تەئميناتەوە سەرتاشخانەی شیک هەبوو. دەرگاکەی سەرتاشخانەکە لەسەر شەقامەکە بوو، پەنجەرەیەکی گەورەی لەسەر گەراجەکە بوو، ئاغا ڕەزایی سەرتاش ڕادیۆیەکی گەورەی (٧) شەپۆلی هەبوو، کە هەمیشە کراوە بوو. زۆربەی خەڵکی گوندەکان کە دەهاتن بۆ شار دەچوونە سەرتاشخانەکە، یەکەمین جاریان بوو ڕادیۆ ببینن. ئەمانە لە نێو گەراجەکەدا لەسەر زەوی دادەنیشتن، سەیری پەنجەرەی سەرتاشخانەکەیان دەکرد و گوێیان لە ڕادیۆ دەگرت. چەندین جار دیومە کە پیاوانی لادێی دەستیان لە ڕادیۆکە دەدا و بەدەوریدا دەهاتن، دەیانویست دڵنیابن، ئاخۆ کەسێک لەنێو ڕادیۆکەدا هەیە یان نا. ئەوان وا بیریاندەکردەوە کە کەسێک لەنێو ڕادیۆکەدایە. ئەم ڕادیۆیەی ئاغا ڕەزا شیک، بووە هۆی ئەوەی کە چەندین کەس تەنها بۆ بینینی ڕادیۆ لە گوندەکانەوە بێن بۆ شار. ئەوان کاتێک لە ئۆتۆمبێل دادەبەزین یەکسەر دەچوون بۆ لای دوکانی ئاغا ڕەزا و لەنێو

گەراجەکەدا دادەنیشتن، نانی نیوەڕۆیان لەوێ دەخوارد و تێر گوێیـان لە ڕادیۆ دەگرت، دوانیوەڕۆش سواری ئۆتۆمبێل دەبوونەوە و دەگەڕانەوە بۆ گوندەکانی خۆیان.

ئەم ڕووداوە تـــایبەت بەســـاڵەکانی (١٣٣٧-١٣٤٠/١٩٥٨-١٩٦١) لەم ســـاڵانەدا کە ئۆتۆمبێل دەچوو بۆ گوندەکان ڕادیۆ لە گوند نەبوو.

شازادەی حه مام

## جوگرافیای کۆمەڵایەتی کۆڵانی ئێمە

کۆڵانی ئێمە کۆڵانی هەژار و بێوەژن و منداڵانی هەتیو بوو، لە ڕووی جوگرافییەوە، ئەم کۆڵانە تەنها نزیکەی دوو مەتر لە ڕووی کۆڵانەکانی ئەملا و ئەولای بەرزتر بوو. هەر ئەو دوو مەتر بەرزییە بەس بوو کە ئاوی جۆگەکە، بەم کۆڵانە نەگات و هەموو ماڵەکان بێ ئاوبن. هەربۆیەش بیری ئاو و ئاوی جۆگەکە لە ماڵی ئێمە و دراوسێکانماندا نەبوو، ئاوی تانکی یش لە ماڵی ئێمەوە زۆر دوور بوو، دەبوو ئاو لە سەرچاوەی ئاوی ماڵی دراوسێکەمانەوە بهێنین.

خودا لێیان ڕازی بێت، ئاغا.وەکیل سادات و تێکڕای وەکیل ساداتەکان شەو و ڕۆژ دەرگای ماڵیان کراوە بوو، خەڵک دەچوو لەوێ ئاوی دەهێنا، خەڵکی بە ترومپای دەستی لەسەر بیرەکە ئاویان دەردەکرد، کارگەی ئیقبال یش بۆرییەکی ڕاکێشابوو ئاوی گەیاندبووە نزیک شەقامەکە، هەندێک جار ئاومان لە بۆریی ئاوی کارگەوە دەهێنا.

ساڵانە یەک دوو جار حەوزی حەوشەی ماڵەوەمان بەتاڵ دەکرد، ئاوکێشەکان بە (کوندە) ئاویان لە جۆگەکەوە دەهێنا کە (٧٠٠) مەتر لە ماڵی ئێمەوە دوور بوو، تا حەوزەکەیان پڕ دەکرد. لە تەواوی ساڵدا جگە لە چەند ڕۆژێک کە تازە حەوزەکەیان پڕکردبووەوە لە ئاو، ئاوی حەوزەکە ڕەنگی دەگۆڕا، پڕ دەبوو لە کرم، هەربە هەمان ئاو قاپ و قاچاخیان دەشۆری، جار جارێک دوای شۆرین نیو مەسینە ئاوی خاوێنیان بەقاپەکاندا دەکردەوە، بۆ توالێت یش هەر لە ئاوی حەوزەکەیان دەبرد. ماڵی بیبی هاجەریش هەر بیری ئاویان هەبوو، دەرگای ماڵی ئەوانیش هەر کراوە بوو، بەڵام دەبوو بە چەرخ ئاوەکە دەرکەین، ئەم کارە گران بوو، لە توانای منداڵاندا نەبوو، بەگشتی ئاوهێنان لە ئەستۆی ژناندا بوو. دابینکردنی ئاوی خواردنەوە کێشە بوو، کاتێک من لە پۆلی (٩) بووم، شاری یەزد پڕۆژەی ئاوی بۆریی بۆ جێبەجێکرا، بەڵام تا ماوەی (٢) ساڵ ئاو لە بۆرییەکاندا نەبوو، تەنها هەوا دەردەچوو. لە ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤)

# شازاده‌ی حه‌مام

له فارسییه‌وه: به‌ها سنکانانی

زۆربه‌ی گونده‌كانی نزیک مه‌شهه‌د، وه‌کو گوندی فاز شوێنی له‌دایكبوونی (فیرده‌وسی) گوندی پرمه، گوندی موعین ئاوا، حسێن ئاوا، ئاوی خواردنه‌وه نه‌بوو له بۆرییه‌كانیاندا، له‌بری ئاو هه‌وا ده‌هات.

له سه‌ری هه‌ر كۆڵانێک بۆرییه‌كی ئاویان دانابوو. كه ئاوی لێده‌هات و خه‌ڵک ئاویان لێده‌برد، دیاره له كۆڵانی ئێمه‌دا نا، به‌ڵام له گه‌ڕكه‌كه‌ماندا خانوو و باخی گه‌وره هه‌بوو، كه چه‌ند ڕۆژێک یه‌كجار ئاوی جۆگه‌ی پێدا ده‌ڕۆیشت. ئه‌م ماڵانه سه‌رچاوه‌ی ئاو، حه‌وزی گه‌وره، ژێرزه‌مین، باڵكۆنی گه‌وره، ژووری میوان، ته‌ندوور و هه‌تا باخی پرته‌قاڵیشی تێدا بوو. هه‌ندێک له ماڵه‌كان له چه‌ندین سه‌رچاوه‌ی ئاو سوودیان وه‌رده‌گرت له ئاوی جۆگه‌كه و ئاوی بیر و ئاوی قه‌نات. خزمه‌كانی باوكم له ماڵه‌كانیاندا چه‌ندین سه‌رچاوه‌ی ئاویان هه‌بوو، هه‌مووشیان حه‌وزیان هه‌بوو. ته‌نانه‌ت هه‌ندێكیان باخی نارنجیشیان هه‌بوو. من منداڵی دوو چینی جیاوازی كۆمه‌ڵگه بووم كه زۆر جیاوازییان هه‌بوو، له‌یه‌كتری، من زیاتر په‌یوه‌ندیم به چینه هه‌ژاره‌كه‌وه هه‌بوو، كه كه‌سه‌كانی دایكم بوون و بێ ئاو بوون و له نێوان ئه‌وانه‌دا گه‌وره بووم. هه‌رچه‌نده له پۆلی پێنجه‌مه‌وه تا وه‌رگرتنی دبلۆم زۆربه‌ی كات له ماڵێكی (٤٠٠) مه‌تری كوڕی مامم دا بووم، كه هه‌م سه‌رچاوه‌ی ئاویان هه‌بوو، هه‌م ئاوی جۆگه‌شیان هه‌بوو. جگه له‌وه‌ش یه‌كه‌مین ماڵ بوو، كه بۆریی ئاوی بۆ كرابوو، له‌و كاته‌شدا من و دایكم له ژوورێكدا ده‌ژیاین كه به‌كرێمان گرتبوو. نیوه‌ی ژووره‌كه فه‌رشی تێدا ڕاخرابوو، له خانوویه‌كی بێ ئاودا ژیانمان ده‌گوزه‌راند، له سه‌رده‌مێكدا كه من له باوكمه‌وه میراتێكم بۆ به‌جێمابوو، هه‌مان میرات كه بووه كێشمه‌كێش له نێوان ژنه‌كانی باوكمدا. جارجارێک دایكم ده‌چوو بۆ دادگا ئه‌و ڕۆژه له ماڵه‌وه بێ ئاو ده‌بووین، له هه‌ر ڕوویه‌كه‌وه بیگریت به‌و جۆره نه‌بوو، كه له هه‌موو ماڵه‌كاندا ئاو نه‌بێت، له ماڵی ئێمه‌و دراوسێكانماندا ئاو نه‌بوو. ئاوهێنانیش زیاتر ئیشی دایكم بوو، منیش جارجارێک ئاوم ده‌هێنا، دایكم زۆر زه‌حمه‌تی كێشاوه بۆ من. ئه‌گه‌ر كێشه‌ی میراتی من به‌و ده‌رده نه‌چووایه و شتێكم ده‌ستبكه‌وتایه‌ته‌وه، ده‌متوانی خانوویه‌ک بكڕم و ببمه خاوه‌نی داهاتێک، دیاره كه له‌م خانووه بێ ئاوانه‌دا، چ چینێكی مرۆڤ ده‌ژین، زۆربه‌ی بێوه‌ژنان خاوه‌نی چه‌ند منداڵ بوون، وه‌ک بیبی هێلی (٤) منداڵ، مه‌عسومه قاسم ئه‌سفه‌هانی (٦) منداڵ، كه باوكیان كرێكاری كارگه‌ی ئیقبال بوو، خۆم ده‌مبینی كه ئاغای ئه‌سفه‌هانی كۆكه‌ی قوڵ و درێژی هه‌بوو، خوێن له سنگیه‌وه ده‌هات، به‌و حاڵه‌ته‌شه‌وه هه‌ر ده‌چوو بۆ كارگه. ئه‌گه‌ر نه‌ڕۆیشتایه له مووچه‌كه‌یان ده‌بڕی، ئه‌وكات مه‌سره‌فی (٨) منداڵ لاسه‌نگ ده‌بوو، هه‌موو پیاوانی دراوسێی ئێمه تاكو ڕۆژی مردن، بۆ دابینكردنی مووچه‌ی ماڵ و

منداڵیان، کاریان دەکرد. قاسم ئەسفەهانی تاڕۆژی مردنی لە کارکردن بەردەوام بوو، لە کۆتاییدا بەهۆی نەخۆشی سیلەوە مرد. بەدەستهێنانی قازانجی زۆر لەلایەن خاوەن کارگەکانەوە لەسەر ماندووبوونی خەڵکانی هەژار برەویکی زۆری هەبوو، یەزد تازە دەچووە مەیدانی سەرمایەدارییەوە و کارگەکانیان تاقیکردەوە. سەرمایەدارەکان سەرمایەدارتر دەبوون و لەسەر سامانی ئەم هەژارانە دەخەوتن. من واهەستدەکەم لە کارگەی هەلاجی دا هیچ کریکاریک نەیتوانیوە لە (١٠) ساڵ زیاتر بمێنێتەوە. ئەم کارگەیە تەنانەت یەک هەواکێشی تێدا نەبوو، سیستەمی ماتۆڕەکانی زۆر کۆن بوون، خەو و خواردنی کریکارەکان زۆر خراپ بوو. هەرکاتێک بێوەژنانی دراوسێمانم دەژمارد سەرم دەسوڕما، فاتمە جان، ژنی یەدوڵلای پاسەوان، سەکینە ژنی میرزا عەباس بیبی ڕوباب و (٤) منداڵی. سەکینە کوێری بیبی ڕوباب، کە تەشی دەڕست، هەمان جۆر برۆ تا دوا کۆڵان. ژنەکان جاروبار هەر خۆیان قسەی نەستەقیان دەکرد و دەیانگوت هەقوایە یەک لەشکر پیاو بهێنن لە سەری کۆڵانەکەمانەوە بەڕەڵلایان بکەن. زۆربەی ژنەکان لە ماڵەوە کاری ڕستنیان دەکرد. چەندانیش کریکاری کارگەی فەرش دروستکردن بوون، دایکم ماوەیەک لە یەکێک لەو ماڵانەدا کە (٥-٦) مەکینەی فەرش دروستکردنی ئەسفەهانی هەبوو کاریدەکرد، بێ هیچ بیمەیەک. دیارە لەم ژیانە دژوارەدا، زۆربەی منداڵان نەدەچوونە قوتابخانە، یەکێک شاگرد قەساب بوو، یەکێک شاگرد بەرگدروو بوو، یەکێک شاگردی ڕەنگکردنی بوزوو بوو. کچانیش خەریکی کاری ڕستن بوون، لەم کاتانە دا هەر منالێک کەمتر کاری بکردایە یان کەمتەرخەم بووایە لە کارەکەی ئەوا بەدەستی وەستاکەی لێدانی دەخوارد.

## لێدانی منداڵان لەلایەن خاوەن کارەوە

حسێن کە باوکی مرد بوو، دایکیشی هیچ داهاتێکی نەبوو، دەبوو (٤) منداڵیشی گەورە بکردایە. لەلای کوڕی خاڵی کە دەڵەمەندبوو کاری دەکرد، کوڕی خاڵی زۆر زۆری لێدەدا، هەمیشە حسێن تا نیوەی شەو لە دوکانەکەدا کاری دەکرد و تێهەڵدانی دەخوارد. نانی ئێوارەی نەدەخوارد و بە سکی برسی دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە. حسێن (٦-٧) ساڵ لە من گەورەتر بوو. کوڕی خاڵەکەی دوکانێکی گەورە هەبوو، لەو سەردەمەدا قاچاخچییەکی گەورە بوو، بە ئۆتۆمبێل تلیاکی دەهێنایە گەڕەک، تلیاکەکە لە کیسی (٧) کیلۆیی و (٣) کیلۆییدا پێچرابوونەوە، تلیاکەکەی بەسەر ماڵە هەژارەکاندا دابەشدەکرد، هەر ماڵەی چەند کیسەیەکی بەئامانەت پێدەسپاردن. لە ژووی ئێمەدا هیچ کاتێک تلیاک نەبوو، بەڵام لە خانووکەدا نازانم. وای بەحاڵی ئەو کەسەی بیویستایە کەمێک تلیاک بدزێت. هەموو خەڵکەکە بەگشتی هاوکاری قاچاخچییەکانیان دەکرد. من وا بیردەکەمەوە یەکێک لە هۆیەکانی ڕیشەکێش نەکردنی مادەی هۆشبەر لەلایەن حکومەتەوە هاوکاری خەڵکییە بۆ قاچاخچییەکان، چۆن دەتوانن تەواوی ماڵەکانی گەڕەکیک بگەڕێن کە ئەم خانوانە سەدان کون و کەلێنیان هەیە و هەموویان بەیەکەوە بەستراون و ژێرزەمین و سەربانیان بەیەکەوەیە.

دەورەبەری ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) بوو، کوڕە خاڵەکەی حسێن (حاجی س) زیاتر لە (١٥٥٠) کیلۆ تلیاکی گیرا، حاجی نزیکەی (٦) مانگ لە زینداندا بوو، لە دواییدا بەهۆی بەرتیلدانەوە لە زیندان ئازادکرا. حاجی تۆبەی کرد و بەیەکجاریی وازی لە قاچاخچێتی تلیاک هێنا و خەریکی کاری کشتوکاڵ بوو. لە جێگایەکی فراواندا دەواجنێکی گەورەی دروستکرد، کە یەکەمین دەواجن بوو. هەروەها حسێنیەکی گەورەی دروستکرد و ساڵی (١٠) ڕۆژ مەراسیمی عاشورای دەگێڕا، دواین جار کە لە ساڵی (١٣٨٢-٢٠٠٣) تەلەفۆنم بۆ حاجی کرد، کە ئەوکات تەمەنی (٨٠) ساڵ زیاتر بوو، هەواڵم پرسیی لە ماڵەوە

کەوتبوو. لە سویسرا نەشتەرگەریی دڵی بۆ کرابوو. دوو جار نەشتەرگەریی پرۆستات و گورچیلەی بۆ کرابوو، نەشتەرگەریی کیسەی زراوی بۆکرابوو. ئەم جاجیە دوایی تۆبەی کرد و بووە پیاوێکی باش و خێرەومەند. دیارە پێش ئەوەش کە زیندانی بکرێت هەر خێری کردووە، بەڵام پێش زیندانیکردنی پارەیەک کە داوێتی بە خەڵک کرێی شاردنەوە و ئاگاداربوونیان بووە لە تلیکەکەی کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەو پارەیەی پێداون.

حسێن لای کوڕی خاڵەکەی پێش ئەوەی زیندانی بکرێت و تۆبە بکات، کاری دەکرد و تێهەڵدانیشی دەخوارد. دەوروبەری ساڵی (١٣٣٧- ١٩٥٨) بوو، حسێن ئەوکات تەمەنی (١٣-١٤) ساڵ بوو، ڕۆژەکانی تاسوعا و عاشورا و ڕۆژانی دوایی نەدەهاتەوە بۆ ماڵەوە.

دایکی وایدەزانی لە ڕۆژانی تاسوعا و عاشورا دا لە ماڵی کوڕی خاڵیەتی لێی نەپرسیەوە، بەڵام ڕۆژی (٨) ی موحەڕەم بوو، بینیبووی کە کوڕە خاڵەکەی بە قامچی لێیداوە.

حسێن چەندین ساڵ ونبوو، دایکە داماوەکەشی کە نەیدەتوانی هیچ کارێک بکات هەر جارێک دەیویست لە تاران و ئەسفەهان بەدوایدا بگەڕێت، لەبەر بێ پارەیی نەیدەتوانی. تەنها کاری گریان بوو. شەوانە کە من چیرۆکم دەگێڕاییەوە دادەنیشت و دەگریا، شەوێک چیرۆکەکە بابەتی ونبوونی ئەمیر هۆشەنگ بوو لە باخی بەردین، دایکی حسێن دەستیکرد بە هاوار هاوار و لەخۆدان و بورایەوە. دوای (٤) ساڵ نامەی حسێن لە تارانەوە هات، ئەو لە یەزد ڕۆیشتبوو چووبووە تاران بۆلای خزمێکی دووری خۆی کە دوکانی شیر و ماستی هەبوو. لای ئەو کاری دەکرد. من نامەکەم بۆ دایکی حسێن خوێندنەوە، ئەو شادی و خۆشییەی کە لە کاتی نامە خوێندنەوەکەدا لە چاوی ئەو ژنە داماوەدا بینم، هەرگیز و هیچ کات نەمدیبوو. وەڵامی نامەکەشی هەر من نووسیم، دایکی تکای لێدەکرد کە سەردانی یەزد بکاتەوە تا چاوی پێیبکەوێت، لەدواییدا دوای (٤) ساڵ و نیو حسێن هاتەوە بۆ یەزد و چەند ڕۆژێک مایەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ تاران. ئەم هات و چوونەی حسێن بووە هۆی ئەوەی ئەو پیاوە ماستفرۆشەی کە بەبنچینە خەڵکی یەزد بوو، بێتە یەزد و لەگەڵ خوشکە گەورەکەی حسێن کە هاوتەمەنی خوشکە گەورەکەی من بوو و بەیەکیشەوە گەورەببوون، ژیانی هاوسەرێتی پێکبهێنێت. بەڵام منداڵی نەبوو، بۆیە پیاوەکەی ژنێکی تری هێنا و ئێستا چەند ساڵێکە پیاوەکە مردووە، ئەو ئافرەتە لەگەڵ هەوێکەی و منداڵانی پیاوەکەی لە تاران دەژین. پاشان حسێن بوو بە شوفێر و ئێستا لە یەزد تاکسی تەلەفۆنی هەیە و دەیەوێت نەشتەرگەریی دڵ بکات.

حسێن بەم هەموو هەوڵ و ماندووبوونە تا تەمەنی (٦٥) ساڵی نەیتوانی لە هەژاریی ڕزگاری ببێت.

مێردی پوورە گەورەکەم لە دەوروبەری ساڵی (١٣٢٧- ١٩٤٨) لە بیابانەکانی نێوان یەزد و مویبد ونببوو، هەرچەند گەڕابوون نەیاندۆزیەوە. (٤) منداڵی هەبوو، بێ سەرپەرشت و بێ پارە و پول مانەوە، دەبوو دایکیان و منداڵەکانیش کار بکەن. منداڵەکان (٢ کچ و ٢ کوڕ) دوو کوڕەکە لای عەبدولحسێنی مسگەر کاریان دەکرد. کچەکانیشی هەر لای ژنی عەبدولحسێن کلاشیان دەچنی. کوڕەکانی پوورم لای ئەو لە بازاردا کرێکاری و مەنجەڵ پاککردنەوەیان دەکرد. کوڕەکانی عەبدولحسێنی مسگەر هەمیشە لە کوڕە پوورەکانمیان دەدا، کرێکەشیان نانخواردنەکەی تێدانەدەبوو. ڕۆژێک، دووان لە کوڕەکانی مسگەرەکە ئەوەندەیان لە محەمەد عەلی کەمپانی تەمەن (٨-١٠) ساڵی کوڕی پوورم دابوو، تا لەهۆش خۆی چووبوو. ئەویش دواجار لە تەمەنی منداڵی (١٢) ساڵیدا لە یەزدی جێهێشت و ڕۆیشت. بەڵام ئەو بە دایکی گوتبوو کە دەڕوات. چەندین ساڵ لە تاران، بەندەر عەباس، بەندەر دیر، بەندەر خەمیر، بافوق نانەوایی کرد بوو. ئێستاش هەر نانەوایی دەکات و (٦) منالی هەیە، ئێستا پاش (٤٠) ساڵ کاری نانەوایی نەیتوانیوە نانەواخانەیەکی خۆی هەبێت. خوشکەکانیشی لەلایەن ئەم ماڵەوە هەر بەشیان لێدان بوو، کچەکانی پوورم دەبوو جگە لە کارەکەی خۆیان تەواوی ئەو ماڵە قەرەباڵغە پاکبکەنەوە و خزمەت بکەن، بەڵام تەنها کرێی کلاش چنینەکەیان وەردەگرت، ئاخۆ کرێی چنینەکەش چەند بووبێت.

بەبەراورد لەگەڵ منداڵانی دەورەبەرم، من ژیانێکی باشترم هەبوو. یەکەم، چونکە دایکم تەنها هەر منی هەبووم، هەربۆیە توانی بە باشترین شێوە بەخێوم بکات. خۆ ئەگەر (٤) منداڵی هەبوایە، بەدڵنیاییەوە من ئەمڕۆ نەمدەتوانی ئەم یادەوەرییانە بنووسمەوە، چونکە هەرگیز نەدەچوومە قوتابخانە. دووەم، ئارد و هەنار و شووتی لە ئەشکەزەرەوە بەدەستمان دەگەیشت. بەڵام کاتێک لە پۆلەکانی (٧و٨) بووم ئاوی جۆگەکان ڕووی لە وشککردن کرد، کرێ زەوییەکەمان ڕووی لە کەمی کرد و تا وای لێهات هەر نەما.

منداڵانی دراوسێمان زیاتر لێدانیان دەخوارد تا نان، جا چ بگات بە گۆشت و پلاو، خۆم چەندین جار دیومە کە دراوسێیەکمان (دایکی حسێن)، شەوانە پەتاتەی پاک دەکرد و دەیکردە ئاوەوە و بەهێواشی دەیکوڵاند تا منداڵەکانی بەسکی برسی خەویان لێدەکەوت، نیوە شەو لە خەو هەڵیدەساندن و دەیگوت هەڵسن گۆشتاوەکە ئامادەیە. منداڵەکانیش بەچاوی خەواڵووەوە نانی وشکیان لە ئاوی پەتاتەکە هەڵدەکێشا و بەتامی

ئـاوی گۆشـتاو دەیـانخوارد. گۆشـتی کـولاو هـەر نەبـوو، جـگە لە پەتـاتەی کـولاو، لەو سالانەدا (١ مەن = ٦ کیلو) پەتاتەی یەزدی بە (٨) ریـاڵ بـوو، تـازە تەبـاخی (٣) فتیلەیی نەوتی هاتبوو، پاشان پەرەمێز پەیدابوو کە شتێکی ترسناک بوو. پەرەمێز زۆر پێویست بوو بەڵام هەموو کەس لەتوانایدا نەبوو بیکڕێت. واتە بەدرێژایی چەند سـاڵ گۆڕانکاری چەند هەزار ساڵە ڕوویدا، سووتەمەنی ئـاگر لە دارەوە بـوو بە نەوت. پەرەمێزی نەوت بەفشاری هەوا گڕیدەگرت و هێزی ئاگرەکەی چەند بەرامبەر تەباخی (٣) فتیلەیی نەوتـی بـوو. لەیـادمە کە لە پـۆلی (١٠) بـووم دایکـم زۆر بـێ پـارەبوو، ڕۆژێـک دەیویسـت پەرەمێزەکە بفرۆشێت، منیش لە کۆڵان پەرمێزەکەم لەدەسـتی وەرگرت و گـوتم: نـاهێڵم بیفرۆشیت. گوتی: کورم پارەمان نییە. منیش گوتم: خـودا گەورەیە. دایکـم گـوتی: منداڵ، چـۆن چـۆنی خـودا گەورەیە؟ خـودایەک کە پـارە نـانێرێتە بەردەرگـای هـیچ ماڵێـک. ڕێکەوتێکی سـەیر بـوو کاتێـک گەیشـتینە مـاڵەوە، بینیمـان دوای (٤) سـاڵ حوشـترێک لە بەردەرگای ماڵی ئێمە پاڵکەوتووە، ئاغای حەسـەن بەحرینی بەنـدەر ئابـادی یەک فەردەی (٨٠) کیلـۆیی ئـاردی هێنـابوو، ئەوەندەشـی شـووتی هێنـابوو. (٤) سـاڵ بـوو ملکـانەی نەناردبوو، پیاوی خاوەن حوشتر گوتی: حاجی گوتـویەتی ئەمسـاڵ ئـاوی قەنـات کەمێک زیادی کردووە، ئەمەش بەشی ئێوەیە لەم بەروارەوە من باوەڕێکی پتەوم بەخـودا هەیە، باوەڕێکی قوڵم پێیەتی، بەبێئەوەی کە نزا و پاڕانەوە بکەم و شەونوێژ بکەم، پەنـام بـردە بەر خودای گەورەو داوای هاوکاریم لێکرد، چەندین جار لە خراپترین لێقەوماندا گوتومە خودا گەورەیە خودا دەینێرێت، خوداش ناردویەتی.

## پۆلی چوارەم

## (سوودەکانی مانگا)

لەم کات وساتەدا پۆلی (٤) ی سەرەتاییم تەواوکرد و دەبوو هاوین بچمە شوێنێک بۆ کارکردن، هەرچەندە کارکردنەکەم بێ پارەبوو، بەڵام لە سورانەوەی کۆڵان باشتربوو، ئەوە بوو لە دوکانی پاسکیلخانەکە بە نەوت دەستم سووتا و جلەکانم هەمیشە پیس بوون و لە گەرمای (٤٠) پلەی هاوینی یەزد وهاتوچۆی بەپێ لە ماڵەوە بۆ دوکانەکە و دوو بارە گەڕانەوە. تەنانەت یەک ڕیاڵ ڕۆژانەم وەرنەگرتووە، جا چ بکات بە شوێنی کاری تر، تازە شەوانە دەبوو وانە بە کوڕی وەستا بڵێمەوە. ئەم جۆرە کارکردنەی منداڵان بێ سوودە، ئەمە کارێکی ئاساییە لە وڵاتی ئێمە. ئێستاش تاڕادەیەک هەیە، لە پۆلی (٤) دا یادگارییەکی زۆرم هەیە، من تەمەنم نزیکەی (١١) ساڵ بوو، کە چیرۆکبێژی پۆل و قوتابخانە بووم، تازە دەستم کردبوو بە کتێب خوێندنەوە، ئەمیر ئەرسەلانی ناودار، حسێن کوردی شەبەستەری، ئەسکەندەرنامە و کتێبە پۆلیسییەکان. کەسێک نەبوو کە پێمبڵێت کام کتێب بخوێنمەوە و کام کتێب نەخوێنمەوە. هیچ جۆرە یاریی و سەرگەرمییەک نەبوو، کارەبا بەباشی نەبوو، تەلەفزیۆن، سینەما، ڕۆژنامە.. گۆڕەپانی یاریی، پارک، کتێبخانە... هیچ شتێک نەبوو، کاتی منداڵان لە کۆڵان و ڕاڕەو و سەربانەکان بێسود دەڕۆیشت. تەنها هۆکاری یارییکردنی منداڵان دروستکردنی تیرو کەوان بوو لە چوپی کۆنی پاسکیل و شوڵکە دارێک. هەندێ لە منداڵان خۆیان خەریکی کۆتربازی کردبوو، گێڕانەوەی چیرۆک لەلایەن ژنە بەتەمەنەکانەوە، یا هەندێک لەگەنجەکان دەچوونە سەر ئاوی جۆگەکان و چاویان بەکچان دەکەوت و وتووێژی خۆیان دەکرد. پیاوان زۆربەیان تلیاکخۆربوون، و خەریکی تلیاک کێشان بوون، ئەمانە زۆربەی کاتەکانیان بەدیار مقەڵی ئاگرەوە بەسەر دەبرد، ئەو کاتە تەنانەت هەژارەکانیش، مقەڵی و ئاگریان دەڕازاندەوە، لەسەر بەرەکی دڕاو و سەرینیکی کۆنە

پاڵیان دەدایەوە و دادەنیشتن، ئاگری مقەڵییان دەگەشاندەوەو چا پڕڕەنگیان تێدەکرد. ئەوکات وەکو ئێستا نەبوو کە شتێک گەرم دەکەن و دەچنە توالێت ودەستدەکەن بە کێشان.

مامۆستای پۆلی (٤) خزمی بەڕێوەبەر و ڕێکخەری قوتابخانە و مامۆستای پۆلی یەکەم بوو. قوتابخانەکەمان بنەماڵەیی بوو، هەموویان خزمی یەکتر بوون. لە پۆلی (٤) دارشتن یەکێک بوو لە وانەکان، دەبوایە هەموو قوتابییەکان دارشتنیان بنووسیایە، من لە یادەوەرییەکانمدا ئاماژە بە چەند دارشتنێک دەدەم. من هەر ئەو کاتە دارشتنی چەند قوتابییەکم وەرگرتووە و تا ئێستا لای خۆم پاراستومن. لەم کتێبەدا چەند دارشتنێکی سالانی (١٣٣٧-١٣٣٨، ١٩٥٨-١٩٥٩) لەسەر سوودەکانی مانگا، دەنووسمەوە. سوودەکانی مانگا کە زۆربەی منداڵانی ئەم وڵاتە، یان لانیکەم منداڵانی دەیەکانی ساڵانی (١٣٢٠-١٩٤٠_١٣٥٠-١٩٧٠) لە دارشتنەکانیاندا لەسەریان نووسیوە، چونکە بابەتەکە گشتییە لەوەیە هەموو خەڵکانی هاوتەمەنی من یادەوەرییەکانی خۆیان لەوبارەیەوە بیربێتەوە. بە بۆچوونی من ئەگەر هەر کەسێک دارشتنی سوودەکانی مانگا چاپ بکات، خوێنەرێکی زۆری دەبێت. پۆلی (٤) دیواری بەدیواری گەوڕی قوتابخانەوە بوو، دەنگی بۆڕەی مانگا و گوێرەکەکان لە کاتی وانە دا یاردگارییەکی تایبەتە. هەڵبەت لەیادتانە کە قوتابخانەی ئێمە لە گونددا نەبوو بەڵکو لە نێو شارێکی پیشەسازییدا بوو، کە دووەمین شاری پیشەسازیی ئێران بوو لە دوای شاری ئەسفەهان. لەم شارەدا لە تەنیشت دوو پۆلدا گەوڕی وڵاخ هەبوو. هەر کاتێک دەنگی بۆڕە بۆڕی مانگاکان دەهات مامۆستا کورسییەکانی وەردەگێڕا و ڕوو لە دیوارو پشت لە قوتابییەکان دادەنیشت و دەکەوتە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە، لەم کاتەدا من یان عەباسی چاودێر دەبوو چیرۆک بگێڕینەوە، تا قوتابییەکان بێدەنگبن. جاری وا هەبوو کە مامۆستا بەدرێژایی یەک کاتژمێر لە ناو پۆل تا لێدانی زەنگی پشوودان لەسەر کورسییەکە لە بیرکردنەوەدا بوو، نازانم ئەو لەبیری ئەوەدا بوو کە بۆچی بەرهەمی ئەو گەوڕە کە ماست و پەنیر و شیری نمرە یەکە، ئەو بەشی نەبێت، یا خودا نەکردە بێهۆشی مادە هۆشبەرەکان بووبێت.

لە کاتی چیرۆکەکانی ئێمەدا مامۆستا هاتەوە ناو پۆل، عەباسی چاودێر گوتی: هەستن! قوتابییەکان وەک ئیسپرینگ بەرزبوونەوە. عەباس گوتی: دانیشین! قوتابییەکان دانیشتنەوە. مامۆستا پرسی ئەمرۆ چیمان هەیە؟ قوتابییەکان بەدەنگێکی بەرز گوتیان دارشتن. مامۆستا بێدەنگ بوو، مانگی بەهمەن بوو (ک. دووەم - شوبات)، هەوای سارد و وشکی یەزد منداڵانی هێنابووە لەرزە. مامۆستا گوتی: حەسەن هەستە دارشتنەکەت

بخـوێنەوە. حەســەن هەســتا لەبەردەم تەخـتە ڕەشــەکەدا وەســتا و گـوتی: مامۆســتا بیخوێنمەوە؟ مامۆستا گوتی: بیخوێنەرەوە.

حەسەن: سوودەکانی مانگا.. لای هەمووان ڕوون و ئاشکرایە کە مانگا گیاندارێکی زۆر بەسـوودە، مانگـا تـا زینـدووە لە کارکردنـدایە، زۆر کاردەکـات، دیـارە، کە مانگـا گیانـدارێکی بەسـوودە شـیرەکەی دەخـۆین و ماسـت و پەنیـری لـێ دروسـت دەکەیـن، گۆشتەکەی دەخۆین، لە پێستەکەی چەرم دروستدەکەین، مانگا ئاژەڵێکی بەسوودە، زۆر کاردەکات بەڵام هێندەی باوکمان کارناکات.. مامۆستا قاقا دەستیکرد بە پێکەنین. ئەکبەر ئاغـا کوڕی حـاجی بازرگانیش پێکەنـی بەڵام هـیچ یەکێک لە قوتابییەکـانی تـر بـۆ زیـاتر کـارکردنی باوکیـان لە وڵاخەکـان، پێنەکەنـین. هەرکەس بـاوکی هەبـووایە، بـاوکی وەک بـاوکی حەسـەن کـاری دەکـرد، هەرکەسـێکیش بـاوکی نەبـوایە دایکـی ئەوەنـدەی بـاوکی حەســەن کـاری دەکـرد. مامۆسـتا گـوتی: حەسـەن باوکـت ئاوکێشـێکی باشــە مـن ئەو دەناسم، چۆن کاردەکات؟ مامۆسـتا باوکمـان کرێکاری کـارگەی ئیقبالە بەیانیـان کاتێک ئاژێری کـارگە لێدەدا هێشـتا خـۆر هەڵنەهـاتووە، دەڕوات بـۆ کـارگە، مامۆسـتا گیـان ئەو لەگەڵ خۆیدا نانی نیوەڕۆش دەبـات لەوێ (١٦) کـاتژمێر کاردەکـات. کاتێک دەگەڕێتەوە بـۆ مـاڵەوە پێشـئەوەی بێتە ژوورەوە مـن کـونەی ئـاوەکە دەدەمە دەسـتی و دەڕوات لە تـانکی ئـاوەکە ئـاو دەهێنێـت بـۆ مـاڵان، شـەوانە درەنـگ دەگەڕێـتەوە بـۆ مـاڵەوە، دوای نانخواردن ئێمە دەخەوین و دایکم وباوکم گورسـی مـوو بـۆ ئاغـای ئەسـەدوڵڵا دروسـت دەکەن. ئاغـا ئەسـەدوڵڵا مـوو دەهێنێـت و دایکـم و بـاوکم کوریسـی لـێ دروسـت دەکەن. مامۆستا پرسی: حەسەن تۆ چەند خوشک و برات هەیە؟ حەسـەن گوتی: مامۆسـتا (٩). ئەو ڕۆژە مامۆستا زۆر دڵخۆش بوو، کەیفێکی باشـی هەبوو بەکەیفەوە قسـەی لەگەڵ قوتابیان دەکرد.

مامۆسـتا گـوتی: داڕشـتنەکەت بخـوێنەوە. حەســەن گـوتی: مامۆسـتا تەواو بـوو. مامۆستا گوتی: فەرموو، دانیشە، جەعفەر تۆ هەستە و داڕشتنەکەت بخوێنەوە.

جەعفەر: وڵاخ گیاندارێکی بەسوودە لای ئێمە ئاشکرایە، کە مانگـا ئـاەژڵێکی زۆر زۆر بەسـوودە، گۆشـتەکەی دەخـۆین، شـیرەکەی دەکەیـن بەماسـت هەر کاتێـک کەسـێک نەخۆشـکەوت شـیری مـانگە زۆر زۆر باشـە بیخـواتەوە. پـار بـاوکی خـودا لێخۆشـووبم نەخۆش بوو، پزیشک پێیگوتبوو دەبێت ڕۆژانە شـیر بخـوات، ئێمە ڕۆژانە شـیرمان دەدا بە بـاوکم، بەداخەوە کە شـیری مانگـا زۆر گـرانە، لە شـاخی مانگـا دەسـکی چەقـۆ دروسـتدەکرێت، لە پێسـتەکەی پێڵاو دروسـتدەکرێت و ئێمەش لەپێـی دەکەیـن و بەپێـی پەتی ناگەڕێین، بە گاجوت زەوییەکانمان دەکێڵین، مانگا زۆر بەسوودە... مامۆستا تەواو.

مامۆستا: دانیشه.. حسێن هەسته دارشتنەکەت بخوێنەرەوە.

بەڵام کام حسێن، (٥) حسێن ناو له پۆلەکەدا هەبوو. حسێنی کوڕی وەستا جەعفەری حەمامی، حسێن من واهاتمه لای تەخته ڕەشەکە، وڵاخ گیانداریکی زۆر بەسوودە، ئەگەر گا نەبێت حەمام بێ ئاو دەبێت، گا لەبیرەوە ئاو دەردەهێنن، باوکم دەیگوت ئەگەر گا نەبێت حەمام بێ ئاو دەبێت، گا بەملا و ئەولادا سەرو ژوور سەرەو خوار دەڕوات، بۆ ئەوەی ئاو له بیرەکەوە دەربکات، خۆ ئەگەر ئاو نەبێت هەموو خەڵکی گەڕەک بەپیسی دەمێننەوە، ناتوانن وسڵ دەربکەن، شوێنی هاتوچۆی گا له حەمامەکەی ئێمه (٦٠) مەتره. شوێنی ڕژانه ئاوەکه سەرەوخوارە، گۆلێکی گەورە به گوریسێکەوە بەستراوەو سەرەکەی به غەرغەرەیەکەوە بەستراوە، ئەو سەری تری گوریسەکه به گاکەوە بەستراوە، که گۆلەکه پڕ ئاو بوو گاکه ناچار دەکەن بەرەو خوار بڕوات، گایەکه لەسەروو و خوارێکەوە بەرەو خوار دەڕوات و گۆلەکه پڕ دەبێت له ئاو. گا گیانداریکی پڕ سوودە، ئەگەر گا نەبێت حەمام بێ ئاو دەبێت، خەڵک بەپیسی دەمێننەوە و ئێمەش پارەمان دەستناکەوێت، سەرتاشەکانیش پارەیان دەستناکەوێت، گای حەمام که پیر بوو سەری دەبڕین و گۆشتەکەی دەخۆین و پێستەکەشی دەفرۆشین، گای حەمام شیر نادات چونکه نێرە، مامۆستا دانیشم؟ تەواو بوو.

مامۆستا: دانیشه، محەمەد ڕەسوڵ هەسته دارشتنەکەت بخوێنەوە.

محەمەد ڕەسول، هاته سەرتەخته ڕەشه و دەستیکرد بەخوێندنەوە: سوودی مانگا بۆ ئێمه ڕوون و ئاشکرایە، که مانگا گیانداریکی زۆر بەسوودە، باوکم دەیگوت مانگا گیانداریکی بەڕێز و ئازایە، باوکم (٤٠) ساڵه ئاگاداری گای حەمام دەکات، باوکم کاری به (١١) گا کردووە، گاکانی حەمام (٣-٤) ساڵ زیاتر ناتوانن لەسەر ناعوری حەمام کاربکەن، ئەم گایانه دەبێت زۆریان لبێدرێت، هەر بۆیەشه زوو پیردەبن. باوکم مانگای زۆر خۆشدەوێت، باوکم ئێستا زۆر خەفەت دەخوات، چونکه کارەبا هاتووە، وەستا جەعفەری حەمامچی بەباوکمی گوتووە، دەمەوێت ماتۆری ئاو بکڕم و به ماتۆر ئاو له بیرەکه دەربکەم، دەیەوێت گای سەر بیرەکه بفرۆشێت. باوکم دەیگوت کارەبا شتێکی باشه بەڵام ماتۆڕی ئاو باش نییە، چونکه ماتۆڕەکان جێگای گاکان دەگرنەوە، ئەوکات باوکم بێکار دەبێت. باوکم نازانێت له کوێ پارە پەیدا بکات و نان بۆ ئێمه بکڕێت، مانگا گیانداریکی بەسوودە و زۆر زۆر باشه چونکه نانی ئێمه لەسەر گایە. ماتۆڕ باش نییە چونکه باوکم بیکار دەبێت، مامۆستا تەواو دانیشم؟ مامۆستا: عەباس ڕەجەبی هەسته دارشتنەکەت بخوێنەرەوە.

عەباس: سوودی مانگا، مانگا گیانداریکی بەسوودە، مانگا زۆر کار بۆ ئێمه دەکات، مانگا شیرمان دەداتێ و گوێرەکەی دەبێت. باوکم دەیگوت مانگا ناندەدا به ئێمه، گای

ئێمه له خەرمان کاردەکات، ئەم گیان لەبەره بێزمانه هەموو ڕۆژێک له بەیانییەوه تاکو ئێـواره بەدەوری خەرمـانی کـونجیەکەدا دەسـوڕێتەوه. بەدەوری حەسـارەکەدا دەسووڕێتەوه ئێمەش ڕۆنی کونجی دەگرین، به ڕۆنی کونجی حەڵوا دروست دەکەین. باوکم کونجی له مەیدان دەکرێت و ڕۆنەکەی دەگرێت و دەیفرۆشێت. ئێمه به کونجی خواردن دروستدەکەین. کەمێکیش کونجی دەدەینه مانگاکەمان، باوکم دەیگوت ئەم مانگایەی هەمانه، که پیر بوو ئیتر گای تر ناکرێت، ئەو دەیەوێت مەکینەیەک بکرێت. مەکینه وەکو مانگا گوێرەکەی نابێ و شیری نییه بەرێگاشدا نارەوات. من ئێواران سواری پشتی مانگاکەی خۆمان دەبم و شەوانه دەگەڕێمەوه بۆ ماڵەوه. ئەگەر باوکم مەکینه بکرێت من ناچاردەبم بەپێ بڕۆم. بەڵام هەرکاتێک باوکم مەکینه بکرێت و مانگاکه بفرۆشێت، ئیتر له ماڵەوه نابێت ئاڵف و ئاوبدەین به مانگا. باوکم دەیگوت گەوڕی مانگاکه چاک دەکات و دەزگای فەرش چنین بۆ خوشکەکەم دادەمەزرێنێت، تاکو فەرش بچنێت، مانگا ئاژەڵێکی بەسوودە... مامۆستا تەواو دانیشم؟

مامۆستا: عەلی ڕەزایی زەحمەتکێش، وەره دارِشتنەکەت بخوێنەوه.

عەلی ڕەزایی: سوودی مانگا، هەمووماں دەزانین که مانگا ئاژەڵێکی بەسووده چەند ڕۆژێک پێش ئێستا لەگەڵ براکەمدا چووین بۆ کۆڵانی (بویک) یەک گاجوتی ئەمریکی زۆر زۆر گەورەیان هێنابوو، که ئەوەندەی چەند گای کۆڵانی بیوک دەبوو. بەڵام گا ئەمریکیەکه ئەوەندە گەورەبوو، که دەیانگوت ئەگەر لەو مانگایەی کۆڵانی بیوک بپەڕێت، ئەوا پشتی مانگاکه دەشکێت، بۆیه تەختە دارێکیان دانابوو، بۆئەوەی هێزی گایه ئەمریکیەکه نەگاتە سەرپشتی مانگای کۆڵانی بیوک، ئیتر یەک یەک مانگاکانی کۆڵانی بیوکیان دەبردە ژێر تەختە دارەکه و پاشان گای ئەمریکی سواریان دەبوو. هەموو خەڵکی دەیانگوت ئەم کاره دەبێتە هۆی ئەوه که مانگای بچووکی کۆڵانی بیوک گوێرەکەی گەورەیان ببێت.

براکەم دەیگوت گوێرەکەی ئەم مانگایه زۆر گەوره دەبێت، پاشان که گەوره بوو شیری زیاتر دەدات و هێزیشی زۆر دەبێت. مانگا ئاژەڵێکی بەسووده، مانگای ئەمریکی له مانگای کۆڵانی بیوک گەورەتر و بەهێزتره، مانگا ئاژەڵێکی بەسووده، مانگای ئەمریکی له مانگای کۆڵانی بیوک بەسوودتره، گوێرەکەکەشی گەورەتر و بەهێزتر و پڕ شیر تره. پاشان گوێرەکەی مانگای ئەمریکی باشره له مانگای کۆڵانی بیوک. براکەم دەیگوت هەرگیز له مانگای ئەمریکی نادات و بێڕێزی لەگەڵدا ناکەن، نایانکەنه ناو گەوڕی تەڕ و تاریکەوه و جوتیان پێناکەن و پزیشکیان بۆدەهێنن و دەرمانیان دەدەنێ. ئاڵفی باشیان دەدەنێ، براکەم دەیگوت ئەگەر له مانگای ئەمریکی بدەن یان بێڕێزی

پێیکەن ئەوا ئەویش بە شاخەکانی ورگی مرۆڤ هەڵدەدرێت. یاخود لەقە دەهاوێژێت یان تـوڕە دەبێـت و شـیرنادات. مـن کە بـاوەڕ بە قسـەکانی بـراکەم نـاکەم. بەڵام مانگـای ئەمریکی نازدارە، ڕێزی زۆرە، ڕەنگە هەر بەو هۆیەوەشـەوە بێ کە شیر زیاد دەدات. مانگا ئاژەڵێکی بەسوودە، مانگای ئەمریکی بەڕێزە، مانگای کۆلانی بیوک بێزێزن لێدان دەخۆن، سواریان دەبن، بەئەمانە زەوی دەکێڵن. لە بیرە ئاوەکان ئاویان پێدەردەهێنن، لە گەوڕەکاندا باش ئاگاداریان ناکەن، براکەم دەیگوت ئێستا بۆ مانگا پزیشکی تایبەتیان هەیە، ئەو دەیەوێت ببێت بە پزیشـکی مانگا تـا کە نەخـۆش کەوتـن چارەسـەیان بکـات. منیش دەمەوێت کاتێک گەورە بووم بڕۆم وانە بخوێنم و دەرمان دروستبکەم بۆ مانگا، پزیشک و دەرمانی مانگای ئەمریکی و کۆلانی بیوک هەردووکی یەکە .. مامۆستا تەواو.

مامۆستا: عەباسی چاودێر تۆش وەرە داڕشتنەکەت بخوێنەوە و ئیتر وانەی ئەمڕۆ تەواو بوو.

عەباس بە باڵای بەرز و لەشێکی لاتەوە هاتە بەردەم تەختە ڕەشـەکە. وانەکـانی زۆر باش بوو هەمیشە نمرەی (٢٠) ی وەردەگرت. ئەم عەباسـە هەمـان ئەو عەباسـەیە کە لە پۆلی دووەم (٦) ڕیاڵی وەرگرتبوو، لێدانی خوارد. کاتێک لە پۆلی (٣) بـوو دایکی مـرد و لە تەمەنـی (٥) سـاڵیدا باوکیشـی لەدەسـتدا بـوو. بەیانیـان دەهـات بـۆ قوتابخـانە و دوانیوەڕوان دەچوو بۆ لای مسگەر، کارەکەی زۆر قورس بوو، مەنجەڵـی گەورەی مس کە دەیانویست سپی بکەنەوە، بیسوونەوە، کەمێک زیخ و ئاویـان دەکردە مەنـجەڵەکەوە دەسـتی بە دیـوارەکەوە دەگـرت و دەچـووە نـاو مەنـجەڵەکەوە بەپێـوە و بەبنـی پێـی مەنجەڵەکەی دەسووەوە. بۆ هەر مەنجەڵێک نیو کـاتژمێری دەیوسـت بە هەردوو قـاچی فشـاری لێدەکرد و قـاچی لە نێو مەنـجەڵەکەدا دەسـوڕاند، وەک ئەوەی سـەما بکـات تـا مەنجەڵەکە پاک دەبووەوە. بۆ هەر مەنجەڵێکی گەورە ڕیاڵێک و بۆ مەنجەڵـی بچووکیش نیـو ڕیـاڵ کرێـی وەردەگـرت. بـاوکی پێشـتر و بەر لە دایکـی مردبـوو، لەگەڵ دوو خوشکەکەو سێ برای لە ژوورێکی کرێ لە خانوویەکی خراپدا، کە خـانووی نەنە قەمەر بـوو ژیانیـان دەگوزەراند. تەنهـا عەبـاس وانەی دەخوێند و هەموویـان کاریـان دەکـرد. خوشـکە بچـووکەکەی کە تەمەنـی (٦-٧) سـاڵ بـوو لە مـاڵی دراوسـێیەکیان کـارەکەریی دەکرد، پاشان چووە کارگە و نازانم کێ خـواردنی بۆ دروسـتدەکردن یـان جلەکـانی بۆ دەشـۆردن. پـوورێکی هەبـوو کە مێردەکەی شـاگردی دوکـانێکی بەقـاڵی بـوو لەسـەری کۆڵانەکە، ئەویـش (٧) منداڵی هەبـوو، جارێـک بینـم بـۆ مـاڵی ئەوان دەچـوو. پـوورەکەی تریشی، کە ژنی مامی بوو دایکی ئەسـغەری بێدەست بـوو، لە یەکەم ڕۆژی قوتابخـانەدا لەلایەن مامۆستاوە لێیدرا کە گوتی بۆچی بەدەستی ڕاستت نانووسیت. عەباسی چاودێر

هەموو قوتابییەکانی پۆلی خۆشدەویست، هەموو قوتابییەکان گوێیان لێ دەگرت، تا تێبگەن کە عەباس چی نووسیوە.

عەباس: مامۆستا بیخوێنمەوە؟ مامۆستا: دەی عەباس بیخوێنەوە.

ئێمە مانگامان نییە، تاکو بزانم سوودی مانگا چییە؟ بەڵام سوودەکانی مانگا زۆرە، هەفتەی پێشوو کە هەوا زۆر زۆر سارد بوو، من چوومە لای شیرفرۆشێک و گوتم هەوا زۆر زۆر ساردە خوشکە بچووکەکەم زۆری سەرمایە، ئاغای شیرفرۆش هەندێک تەپاڵەی وشکی دامێ، تەپاڵە وشکەکەم بردەوە بۆ ماڵەوە کردمانە مەقەڵییەکەوە و ئاگرمان تێبەردا تا بەیانی ژوورەکەمان گەرم بوو، هەموومان گەرم بووینەوە. ئاغای شیرفرۆش پیاوێکی زۆر باشە گوتی کاتێک سەرماتان بوو وەرن تەپاڵە ببەن، ئەو هیچ پارەیەکی لێ وەرنەدەگرتین، بەڵام براکەم هاوکاری دەکرد تا ئالف و ئاو بدات بە مانگاکان. پاشان تەپاڵە ئێمەی رزگارکرد لە سەرما. مانگا شیردەدات بەڵام شیر گرانە دایکم کاتێک نەخۆش بوو، دەبوایە هەموو ڕۆژێک شیری بخواردایە، بەڵام پارەمان نەبوو. دایکم هەفتەی جارێکیش شیری نەدەخوارد، ئەگەر شیری مانگا بۆ نەخۆشەکان بەخۆراییی بوایە زۆر باشتر دەبوو، ئەگەر دایکم هەموو ڕۆژێک شیری مانگای بخواردایە ڕەنگە نەمردایە، ئێمەش بێ دایک نەدەبووین. مانگا ئاژەڵێکی زۆر بەسوودە، لە پێستی مانگا پێڵاو دروستدەکەین، بەڵام پێڵاوەکانیش هەر گرانە، من هەمیشە کڵاش لەپێدەکەم چونکە پێڵاوی چەرم گرانە، بەڵام کڵاشەکان مامم دەمداتێ. مانگا ئاژەڵێکی ناحاڵییە بەڵام مانگای ئاغای شیرفرۆش بەم ناحاڵیبوونەوە، دەزانێت کە ئەسغەری بێدەست دەستی نییە، مانگا ئاژەڵێکی ناحاڵییە بەڵام هەست و شعوری لە ئاغای جەلیلی مامۆستای پۆلی یەکەم کە نەیزانی ئەسغەر دەستی نییە و لێیدا کە بۆچی بە دەستی چەپ دەنووسێت؛ زیاترە! مانگا... مامۆستا هاواریکرد کرد، خوێڕی جوێن بە مامۆستایەکی نازداری وەک ئاغای جەلیلی دەدەیت و تۆمەتی بۆ دروستدەکەیت؟ مامۆستا پەلاماری عەباسی دا و دەفتەرەکەی لە دەستی سەند و گوێی گرت و لە پۆل کردیە دەرەوە و بەڕاکێشان بردی بۆ لای ڕێکخەری قوتابخانە. عەباس لە هێڵی سووری چینایەتی تێپەڕی بوو، ئەو لە چینی هەژار و بێ هەموو شتێکی گەڕەک بوو، پێی کردبووە پێڵاوی گەورەترین بنەماڵەی یەزدەوە، دەبوایە زۆر باش تەمبێ بکرایە دەنا، سبەی هەر کەس هەرچی بگوتایە دەیگوت هەر شتێکی بویستایە دەیکرد. ئێمەی قوتابی نەماندەزانی لە ئیدارەی قوتابخانە چی ڕوویدا، تەنها دەزانم، کە ئیتر عەباس نەهاتەوە بۆ قوتابخانە. عەباس قوتابییەکی زۆر زیرەک بوو، هەمیشە نمرەی (٢٠) ی دەهێنا، یەکێک بوو لە چیرۆکبێژە باشەکان و ماوەی سێ ساڵ چاودێر بوو. پێدەچێت

ڕێکخەر و بەڕێوەبەر بۆ ماوەی یەک دوو ڕۆژ عەباسیان لە قوتابخانە دەرکردبێت، بەڵام ئەوەندە بەسە کە عەباس جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانە. لەدوای ئەم ڕووداوە ئەو قوتابیانەی لە دوکانی مسگەری خەریکی کاری سپیکردنەوە بوون، من کە تا پۆلی (١٢) لە یەزد بووم، هەمیشە عەباسم دەبینی بەدەستی بریندار و بەستراوەوە بنەپێی وەک قاچی حوشتر و گەورەتریش لەنێو مەنجەڵی مس دا.

وە لە مەراسیمی عاشورای گەڕەک هاوکاری چایچیەکان بوو، کاتێک من لە پۆلی هەشتەم بووم عەباس ساڵێکیش بوو چووە قوتابخانەی شەوانە، بەڵام لە کۆتاییدا وازی لە خوێندن هێنا، هەندێک لە ڕۆژانی هەینی لەگەڵ منداڵان لە کۆڵاندا یاری دەکرد. قارەمانی دوو گەڕەک بوو ئەو لە هەموو منداڵانی تر باشتر ڕایدەکرد. ڕۆژێکی هەینی چووم بۆ ماڵیان تا بانگی بکەم و بێت بۆ یاری، دەرگای ماڵیان کرابوەوە. عەباس لە پشتی تەشتێکەوە دانیشتبوو خەریکی جلشۆرین بوو، جلی خوشک و براکانی. ئەو یەک چنگ ئەسپۆنی (پێشئەوەی تایتی کیمیایی بۆ جل شۆرین پەیدابێت خەڵک بە ئەسپۆن کە جۆرە گیایەکە جل و بەرگیان دەشۆرد)، بە جلەکاندا دەکرد و بەدەستەکانی جلەکانی هەڵدەگلۆفی. گوتم: وەرە با بڕۆین بەیەکەوە یاری بکەین. گوتی: ئەمڕۆ دەبێت جل بشۆم، شۆرینی جل و بەرگی ماڵەوە لەسەر منە. لە ساڵی (١٣٤٦-١٣٨١، ١٩٦٧- ٢٠٠٢) واتە نزیکەی (٣٥) ساڵ عەباسم نەبینی. ساڵی (١٣٨١- ٢٠٠٢) ڕۆژێک بۆ سەردانی دایکم چووم بۆ یەزد، دڵم بۆ کۆڵانەکانی یەزد لێیدەدا، کاتی خۆر ئاوابوون بوو، هەوا ڕووی لە تاریکی بوو، ویستم لە کۆڵانی تەنگ و باریکی خەتیبەوە بڕۆم، لەپڕ زەنگی پاسکیل منی ئاگادارکردەوە، کە دەبێت لە لێوارەوە بڕۆم پیاوێکی سەر و ڕیش سپی، بە سواری پاسکیل بەلامدا تێپەڕی، هەر لەخۆمەوە گوتم: سڵاو! گوتی: سڵاو. ئەو دەنگە خورپەی بەدڵم خست و گوتم: تۆ عەباس ئاغا نیت؟ ئەویش لە پاسکیلەکەی دابەزی و گوتی: حسێن پاپولی چۆنیت؟! تۆ لە کوێ و ئێرە لەکوێ؟ عەباس بوو.

حەزیدەکرد لەگەڵیا بچمەوە ماڵەوە، من زۆر خۆشحاڵبووم کە هاوڕێیەکم پاش (٣٥) ساڵ بینییەوە. چووم بۆ ماڵیان کە دیوار بەدیواری خانووە کۆنەکەیانەوە بوو، دوو ژووری لەم خانووە کرێ بوو لەو دوو ژوورەی تردا دوو ماڵی تری تیابوو. ژنێک و (٥) منداڵی هەبوو، هەرسێ لە کچەکانی شوویان کردبوو، کوڕێکیانی ژنی هێنا بوو، کوڕەکەی تری سەرباز بوو، ژنەکەی عەباس کچە پووری خۆی بوو، کچی هەمان پیاو کە شاگردی دوکانی بەقاڵ بوو، لە ژوورەوە لەسەر پارچەیەک فەرش دانیشتم. خێزانەکەی چای بۆ هێنایین عەباس هێشتا شاگردی هەمان دوکان بوو. کە لە منداڵیدا لەوێ کاری مسگەری دەکرد و مەنجەڵی سپی دەکردەوە. بەڵام ئێستا مەنجەڵ و قاپ و

قاچاخ دەفرۆشێت، کاری مسگەری نەماوە، مەنجەڵ کەمە و کەم کەسیش سپییان دەکاتەوە. ژوورێکیان (٤×٣) مەتر بوو کە شوێنی خەوتن و نانخواردن و میوانداریی بوو. ژوورەکەی تریان شوێنی چێشتلێنان و زەخیرە بوو، هەموو شتی ناو ماڵەکەی بابی (١٠٠) هەزار تومەن نەدەبوو، بەڵام پیاوێکی بەویقار بوو، باسی یادگارییەکانی پۆلی یەکەم تا پۆلی چوار مان کرد و ئاهێکی هەڵکێشا گوتی: زۆرم حەز لە خوێندن بوو، ئەو دارشتنە نالەبارە بەرنامەکانی منی هەڵوەشاندنەوە. پاشانیش وەستا ئەبولقاسمی مسگەر گوتی: "خوێندن بۆ منداڵە هەژارەکان نابێت، تەنها بۆ دەوڵەمەندەکانە، تۆ کە نانێکت نییە بیخۆیت و دایک و باوکت هەر نەماون، وەرە لای من بۆ هەر مەنجەڵ سپیکردنەوەیەک ریاڵ و نیوێکت دەدەمێ". من لەم دوکانە مامەوە ئێستا (٤٤) ساڵە لێرە کاردەکەم، ساڵێکی تر خانەنشین دەکرێم و (١٦) ساڵ بە بێ بیمەکارم کرد. (١٥) ساڵیشە مەنجەڵی (مس)م سپی نەکردۆتەوە. چونکە مس نەماوە تا سپی بکەمەوە. مەنجەڵ و قابلەمەی نوێ لە کارگەی ئەسفەهانەوە دەهێنم و لێرە دەیفرۆشم، وەستاکەم مردووە و منداڵەکانیشی هەریەکە و بەلایەکدا رۆیشتوون، من ئێستا شاگردی ژنی وەستام، بۆ خۆم کاردەکەم و کرێی خۆم هەڵدەگرم و قازانجەکەی ئەدەمە خێزانی وەستا کەم. تەمەنم (٥٨) ساڵە سوپاس بۆ خوا کە هەژارم بەڵام یەک ریاڵ دزیم نەکردووە، عەباس هاوتەمەنی منە بەلام کە سەیری رووخساری دەکەیت وا هەستدەکەیت کە (٢٠) ساڵ لە من گەورەترە، سەروریشی سپی بووە، ددانەکانی هەموو دەستکردن، پشتی کەمێک کووڕ بووەو تا کاتژمێر (١١)ی شەو بەیەکەوە قسەمان کرد. هەواڵم بۆ دایکم نارد، کە درەنگ دەگەڕێمەوە، عەباس بۆ نانخواردنی ئێوارە نەیهێشت بڕۆمەوە، خێزانی برنج و کەبابی بۆ دروستکردبووین. پرسیاری ئەسغەری پوورزا و ئامۆزاییم لێ کرد هەمان ئەسغەری بێدەست و ئەسغەرێک کە ئەو دارشتنەکەی لەسەر نووسی، هەر لەسەر ئەویش لە قوتابخانە دەریانکرد، گوتی: ئەسغەر ئێستا لە کەرەجە و نووسینگەی کڕین و فرۆشتنی خانووی هەیە و نووسینگەیەکی ئۆتۆمبێلیشی هەیە، حاڵی زۆر زۆر باشە. عەباس گوتی: کچەکەی خۆمم دا بە کوڕەکەی ئەسغەر هەر خۆی هەموو شتێکی کڕی و تەنانەت کرێی چوونی کچەکەم بۆ کەرەج یەک تومەنم نەدا، خودا خێری بنووسێت، هەموو کارەکان خۆی کردی، کچەکەم لە ماڵی ئەوان دا زۆر خۆشبەختە، ئەسغەر جارجارێکیش هاوکاری من دەکات، منداڵەکانی ترم زۆر هەژارانە دەژین، عەباس درێژەی بەقسەکانیدا گوتی: هەر کەسێک ئەم شارەی بەجێهێشت و رۆیی ژیان و گوزەرانی باش بووە، من وخوشک و براکانم بێ دایک و باوک بووین، ناچاربووین لە هەمان شارو کۆڵاندا ژیان بگوزەرێنین. بێ جوڵەیی ئێمە چونکە هەژار

بووین ئێمەی بەم شارەوە چەسپاند. عەباس زۆر لایەنگری کۆچکردن بوو لە شاری یەزد، گوتی: بە کورە بچووکەمم وتووە هەرکاتێک سەربازییت تەواوکرد، زوو ئەم شارە بەجێبهێڵە و برۆ بۆ کەرەج. پرسیارێکم لێکرد، گوتم ئەو ڕۆژەی کە دارشتنەکەت خوێندەوە و بردیانی بۆ لای چاودێری قوتابخانە، هەر ڕاستەوراست دەریانکردی، یاخود خۆت ڕۆیشتی؟ گوتی ڕاستیەکەی ڕێکخەری قوتابخانە پێی گوتم باشترە کەرێکی وەکو تۆ چەند ڕۆژێک بچێتە دوکانی مسگەری تا نرخی قوتابخانە و مامۆستا بەڕێزەکان بزانێت. منیش کە ڕۆیشتمە دەرەوە یەکڕاست چووم بۆ دوکانی وەستا ئەبولقاسم، وەستا بێئەوەی پێمبڵێت وا بەم بەیانییە زووە هاتووی، گوتی عەباس ئەم مەنجەڵە گەورانە ماونەتەوە، کارەکانت زۆر دواکەوتوون، خێرا خێرا دەستپێبکە و لە ئەمڕۆوە بۆ هەر مەنجەڵێک ڕیاڵ و نیوێکت دەدەمێ. منیش دەستمکرد بەکارکردن، ڕۆژی سێیەم گوتم: وەستا سبەی بەیانی دەچمەوە بۆ قوتابخانە. وەستاش گوتی: قوتابخانە بۆ منداڵانی دەوڵەمەندە، تۆلێرە بمێنەوە من خۆم ڕۆژانەکەت بۆ زیاد دەکەم. هاوینان وەستا بۆ سپیکردنەوەی مەنجەڵەکانی عەشیرەتەکانی قەشقایی دەچوو بۆ ئاباده و کێوەکانی فارس. منیشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، سێ مانگ لای خەڵکانی فارس مەنجەڵم سپیدەکردەوە، ئەوان لەبری کرێی سپیکردنەوە، ڕۆنی زەرد و کەشک و خوریان دەداینێ، نان خواردنیشمان هەر لەسەر ئەوان بوو.

دوای سێ مانگ گەڕاینەوە یەزد وەستا نیو مەن ڕۆنی زەرد و کیسەیەک کەشکی دامێ، گوتی: برۆ بیبە بۆ ماڵی ڕێکخەری قوتابخانە. گوتم: وەستا پارەکەی لێوەبگرم، وەستاش گوتی ئەوە کرێی دەرکردنی تۆیە لە قوتابخانە. دیارە وەستا ویستی هەندێک قسە بکات بەماناوە، بەڵام من تێگەیشتم کە وەستا دەورێکی هەبووە لە دەرکردنی من لە قوتابخانە، چونکە ئەوکات هەموو دوکانەکانی مسگەری، سپیکردنەوە، پێڵاو دروستکردن، ڕەنگکردن، چنین و پەموو پاککردن و کارگە بچووکەکان کارەکانیان زیاتر بە منداڵی ١٠-١٢ ساڵە ئەنجامدەدا.

ئەگەر تێکڕای منداڵانی گەڕەک بە هەژار و دەوڵەمەندەوە بچوونایە بۆ قوتابخانە تەواوی کارەکانی کاسبکارەکان و کارگەی پەموو پاککردن لەکاردەکەوتن، دیاربووکە وەستا کارەکان دەمی ڕێکخەر و بەڕێوەبەری قوتابخانەیان چەورکردبوو، تا منداڵە هەژارەکان لەسەر بچووکترین کێشە لە قوتابخانە دەربکەن، ئەوان بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هاوکاری وەستاکارەکان و خاوەن کارگەکانیان دەکرد بەدابینکردنی کرێکار، بێهۆ نەبوو کە ئێمە (٦٥) کەس بەیەکەوە چووین بۆ قوتابخانەی هیدایەت، بەڵام تەنها (٢٢) کەس توانیمان پۆلی شەشەم تەواو بکەین. هەڵبەت چەندین ساڵ دواتر خۆم

## شازادەی حه مام

لە ساڵەکانی (١٣٥٠-١٣٥٤_١٩٧١-١٩٧٥) ئەم دیاردەم بەزۆری لە گوندەکانی خۆراسان بینی. لە گوندەکانی (بەنجورد، ئەسفەراین و بیرجەند) پەیوەندی نێوان بەڕێوەبەری قوتابخانەی گوندەکان و وەستاکارەکانی فەرش چنین. پەیوەندییەکی پتەو بوو، بەڕێوەبەریَ قوتابخانە منداڵانی لەسەر سادەترین هەڵە لە قوتابخانە دەردەکرد. دیارە ئەم دەرکردنە فەرمی نەبوو، کەسێک سکاڵای نەبوو، کە بۆچی بەڕێوەبەری قوتابخانە منداڵان دەردەکات، لێکۆڵینەوەش بەهیچ شێوەیەک نەبوو، وەستاکارەکان کاتێک دەیانزانی کە منداڵێک لە قوتابخانە دەرکراوە، بەزوویی دەچوون بەلایەوە و پەلکێشیان دەکرد بۆ کارکردن لەوەشە بەڕێوەبەر ئاگادارکرابێتەوە کە فلانەکەس دەربکات، پۆلیس یش یاسای بەزۆر کارپێکردنی منداڵانی خوار (١٢) ساڵی جێبەجێ نەدەکرد، دیارە لەم نێوانە دا ئاڵوگۆڕی پارە هەبوو، ئێستا پێش (١٧-١٨) ساڵ لە دەوروبەری یەزد کارکردن بە ڕۆن و کەشک بوو، خودا هەموو لایەک ببەخشێت تا نیوەی شەو لەگەڵ عەباس دا بەیەکەوەبووین و هەواڵی چەند کەسم لێ پرسی.

هەرکەسێک لە یەزد ڕۆیشتبوو، عەباس هەواڵی دەزانی کە ژیانیان باشە، هەریەک لە منداڵانی هەژار کە لە یەزد مابوەوە تا ئێستاش لەگەڵ هەژاریدا لە ململانێدان، دیارە منداڵی دەوڵەمەندەکان بوون بە خاوەنی ماڵ و منداڵ و کارگە، یاخود دوکانی باش و لە گەڕەکە کۆنەکان ڕۆیشتوون. دەوروبەری کاتژمێر (١١) ویستم لە ژوورەکە بێمە دەرەوە عەباس گوتی: بەڕاست دەمەوێت یەک یادگارییت پێشکەش بکەم، زۆر دەمێکە لای خۆم پاراستوومە و تەنها بەکاری تۆ دێت، بۆ من هیچ سوودێکی نییە. عەباس چووە ژوورەکەی تر و دەفتەری دارشتنی ساڵی (١٣٣٧-١٩٥٨) ی بۆهێنام، هەمان دەفتەر کە سوودی مانگای تێدا نووسی بوو. کاتێک ویستی دەفتەرەکەم بداتێ، فرمێسک بە چاویدا هاتە خوارەوە و کەوتە سەر دەفتەرەکە. ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی: خودا لە مامۆستا و ڕێکخەری قوتابخانە و بەڕێوەبەر و وەستا ئەبولقاسم خۆشبێت، بەڵام دەتوانرا ژیانی ئێمە جۆرێکی تر بێت. دەفتەری دارشتنەکەی عەباسم وەرگرت و بەڵێنم پێدا دارشتنەکەی چاپ بکەم. دەفتەرەکەی عەباس بوو بەهۆی ئەوەی کە من یادەوەرییەکانم بنووسمەوە.

نەورۆزی (١٣٨٢-٢٠٠٣) کە چووم بۆ یەزد، چووم بۆ سەردانی عەباس بابەتی یادگاریی و چاپکردنی دارشتنەکەیم بۆ باسکرد. لێمپرسی مۆڵەتم پێدەدەیت ناوی تەواوت بنووسم؟ گوتی: ئێمەی هەژار هیچ نازانین و هیچمان ناوێت، ناوی من چ کەڵکێکی هەیە بۆ خەڵکی.. لەوەیە باسکردنی دەرد و مەینەتی من، کە داخ و دەردی

هەزاران خەڵکــی هەژارە ســوودێکی هەبێــت. مەینەتیــیەکەم بنووســە، بەڵام نازنــاوم مەنووسە.

لەم وڵاتەدا چـوونی منـداڵی قوتـابی بـۆ کـارکردن، خـۆی لەخۆیـدا داســتانێکە. کـێ دەزانێت چ توانایەک لە کارگەکانی مسگەر، ڕەنگکردن، پەتچنین و فەرش چنیندا بەهەدەر چـووە، هەزاران کیمیـاگەر و فیزیـایی و لێکـۆڵەری گەورە، بەزۆر بـراونەتە کارگەکـانی فەرش چنین تا ئێمە شـانازی بکەیـن، کە فەرشـی ئێرانـی لە جیهانـدا نمـوونەیە. هەزاران بازرگـانی ئێرانــی و نـائێرانی بـوون بە ملیـاردێر، کاتێـک دەزگـای فەرش چنـین، فەرش دروستکردن لە دیهاتەکانی وڵاتی ئێمەدا پەرەیسەند. ئیتـر گوندەکان وەک جـاران چەقی بەرهەمهێنانی هونەرمەند و بیرمەند نەما، پێویسـتە، مامۆسـتایانی گەورەی نەریتپەروەر و مێژووناس و گوندناسەکانی وەکو دکتۆر مەحەمەد ئیبراهیم باستانی، ئیرەجی ئەفشار یەزدی و دکتـۆر مەنـوچەهری سـتودە و دکتـۆر مـحەمەد حسـێنی گەنجی لێکـۆڵینەوەی دەربارەی ئەم کێشەیە بکەن. خودا تەمەنی (١٥) هەزار ساڵ بدات بە نموونەی ئەمانە.

## قاچاخچێتی

هاوینی نێوان پۆلەکانی چوارەم و پێنجەم، بڕیار بوو بچمە دوکانی حاجی ڕەزا، ناسراو بە حاجی ئاغا ڕەزا کە مێردی پووری حسێن بوو. حاجی ڕەزا جگە لە کاری ئاسایی دوکانەکەی، هەموو ڕۆژێک زەرفێکی دەدامێ و دەیگوت ئەم زەرفەدا زەردە چەوەیە، یاخود دارچینی نەکوتراوە، بیبە بۆ ماڵی فلانە کەس و ناونیشانێکی دەدامێ. دەیگوت ئەم پاکەتە ببە بۆ ئەو گەڕەکە بۆ ئەو ماڵە. ئەوکات تەمەنم (١٠-١١) ساڵ بوو، زۆر بیرم لەوە نەدەکردەوە کە لەنێو ئەم زەرفەدا چی هەیە، چونکە ئەوەندە قسەیان لەبارەی ئامانەتەوە بۆ کردبووم، هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە پاکەتەکە هەڵپچڕم و بزانم چی تێدایە. زەرفەکانم دەبردە پێش دەرگای ماڵەکان، دیارە مەبەستم لە زەرفی نامەنووسین نییە، بەڵکو زەرفێکی کاغەزی زۆر بچووکە، لەو سەردەمەدا زەرفی نایلۆن هەر نەبوو، دوکانەکانیش زەرفی دروستکردنیان بەکاردەهێنا. (٤٠) ڕۆژ بەسەرچوو، من بە درێژایی ئەو (٤٠) ڕۆژە لانیکەم (٩٠) زەرفی نیو کیلۆیی تا کیلۆ و نیویم بەملا و ئەولادا برد. وامدەزانی حاجی ڕەزا زەردەچەوەی کردوەتە زەرفەکانەوە، دەمی زەرفەکەی کەپس دەکرد و دەیخستە نێو زەرفێکی ترەوە، پاشان دەیدایە دەست من تا بیگەیەنمە کڕیارەکان. ڕۆژێک حاجی زەرفێکی دایەدەستم تا بیگەیەنمە شەقامی ئێرانشەهر، کۆڵانی گوڵ، ماڵی ئاغای (ف) سەرەتای شەقامی ئێرانشەهر دوکانێکی گەورەی لەحیمکاریی ئۆکجسین هەبوو، ئەوکاتە لەحیمی کارەبایی پەیدا نەببوو، ڕەنگە هەبووبێت بەڵام هێشتا نەگەیشتبووە یەزد. من زۆرم حەز لە لەحیمکاریی بوو، هەموو جارێک بەدیارییەوە دەوەستام و سەیری لەحیمکردنم دەکرد. هاوین بوو، هەوا گەرم بوو ئاگری لەحیمەکە هەوای دەوروبەری گەرمتر کردبوو، یەکسەر پیاوی لەحیمکار سەری بەرزکردەوە و دەستیکرد بە بۆنکردن گوتی: بچکۆلە زەرفەکەت بهێنە پێش، منیش زەرفەکەم لێبردە پێشەوە و گوتی: ئەم زەرفە چی تێدایە؟ گوتم: زەردەچەوە.

پیاوە لەحیمچییەکە بەسەرسوڕمانەوە گوتی: زەردەچەوە؟ گوتم: بەڵێ.. گوتی: ئەو زەردەچەوەیەت لە کێ وەرگرتووە و بۆ کێی دەبەیت؟ گوتم: حاجی ئاغای ڕەزا پێیداوم تا بیبەم بۆ ماڵی حاجی (ف). پیاوە لەحیمچییەکە زەرفەکەی لێوەگرتم و کردیەوە، لە نێو زەرفەکەدا زەرفێکی تر هەبوو، ئەویشی کردەوە و گوتی: تەواوە تلیاکە.. دواتر گوتی: ئەمە تلیاکە، نەک زەردەچەوە. چەند جوێنێکی بۆ حاجی ڕەزا و کوڕەکەی نارد. پاشان لێیپرسیم: تۆ کوڕی کێیت؟ ماڵتان لە کوێیە؟ منیش ناوی خۆم و ئەدرەسی ماڵی خۆمانم پێگوت. ئەو منی ناسی، لە پشت خۆیەوە سواری پاسکیلی کردم و بردمی بۆ لای دایکم. بەدایکمی گوت، خانم ئاگاداری کوڕەکەتبە، ئەم کوڕەت بۆ کوێ ناردووە بۆ کارکردن، بۆ لای حاجی ڕەزای قاچاخچی؟ دایکم گوتی: بەخودا نەمزانیوە کە ئەوان قاچاخچین و هێنان و بردنی تلیاک بەکوڕەکەی من دەکەن. دایکم تلیاکەکەی وەرگرت و بردی بۆ ماڵی حاجی ڕەزا و بردیە ژوورەوە و فڕێدایە بەرپێی حاجی ڕەزا و دەستیگرتم و هاتینەوە بۆ ماڵەوە. ئیتر من نەچوومەوە بۆ دوکانی حاجی ڕەزا. بڕیارماندا ئیتر بۆ کارکردن نەچمە دوکانی هیچ بێگانەیەک. نزیکەی (٣) هەفتە پێش ئەم ڕووداوە، دەمویست بورجێکی ئیفڵ بەتەختەی سێگۆشە دروستبکەم، داوای سندوقێکی چا (سندوقی چا لە تەختەی سێگۆشە دروستکرابوو کە ٥٠×٥٠×٥٠سم) م، لە حاجی ڕەزا کرد، حاجی ڕەزا پێیگوتم: (١٥) ڕیاڵ لە دایکت وەربگرە و وەرە سندوقێک ببە، منیش پارەم لە دایکم وەرگرت و بۆم برد، ئەویش سندوقێکی شکاوی دامێ. پاش چەند ڕۆژێک زانیم، کە لە دوکانەکانی تر سندوق بە (١٠-١٢) ڕیاڵ دەیفرۆشن. واتە پیاوێک تلیاکی دەدامێ تاوەکو بۆ ئەم و ئەوی بەرم و هەمیشە دوکانەکەشی هەر بە من پاکدەکردەوە، تا ئەو ڕۆژەی کە سندوقەکەم لێکڕی (٣٥) ڕۆژ دەبوو لەلای ئەو کارم دەکرد لانیکەم (٦٠) کیلۆ تلیاکم بۆ ساخکردبوەوە، بەڵام ئەو تازە بەتازە سندوقی (١٠) ڕیاڵی بە من دەفرۆشت بە (١٥) ڕیاڵ. خودا لێی خۆشبێت بەبێهۆ وا دەوڵەمەند نەببوو. حاجی ڕەزا تلیاک فرۆشێکی ئاسایی بوو، باوکی هەمان ئەو کەسەیە کە چەند ساڵ لەوەدوا بە (١٥٥٠) کیلۆ تلیاکەوە گیرا. کارەسات ئەوە بوو، لەو ساڵانەدا تازە تلیاک قاچاخ کرابوو. وابزانم تلیاک لە ساڵی (١٣٣٤-١٩٥٥) دا قەدەغەکرا. ئەم شاگردییەی منیش (٤-٥) ساڵ دوای قەدەغەکردنی تلیاک بوو. واتە ئەگەر پۆلیس بیگرتمایە ئەوا لە تەمەنی (١٠-١١) ساڵیدا، فایلێکی قاچاخچێتی تلیاکیان بۆ دەکردمەوە. دوورنییە زۆربەی قاچاخچییەکان لە منداڵیدا شاگری ئەم جۆرە کەسانە نەبووبن.

## یەکەمین جار لە کتێبخانە

چیرۆکی ڕۆیشتنم بۆ کتێبخانە لە سەرەتای مانگی شەهریوەر (کۆتایی ئاب) دا بوو، دوای کارکردنم لە دوکانەکەی ئاغا ڕەزا، ئیتر من نەدەچووم بۆ کارکردن. دەبوو لە کۆلان لەگەڵ منداڵان یاریی بکەم، دیارە لە یارییکردن و کۆلانیشدا لێدان و سەرشکان ڕوودەدات. ڕۆژێک دوای ڕووداوی تلیاکەکە دایکم گوتی: مانگێکی ماوە بۆ دەستپێکردنەوەی قوتابخانە، من تا ئەو کاتە، چی لە تۆ بکەم؟ لە ماڵەوە دانانیشیت، لە کۆلانانیش بیت باش نییە. گوتم: دەچم بۆ کتێبخانە. دایکم گوتی: کام کتێبخانە؟ گوتم: کتێبخانەی مزگەوتی گەورە. دایکم گوتی: کوڕم ئێمە ماڵمان لەمسەری شارە و مزگەوتی گەورەش لەوسەری شارە، تۆ چۆن دەگەیتە ئەوێ، کێ دەڵێت هەر ڕێگاشت پێدەدەن؟ گوتم: دایە هەر دەچم بۆ کتێبخانە. دایکم گوتی: ئاخرت خێربێت. سبەینێ زوو لە خەو هەستام و کەوتمەڕێ، لە ماڵی خۆمانەوە تا مزگەوتی گەورە بەپێ نزیکەی یەک کاتژمێر دەبوو، خۆ ئەگەر لەبری شەقام کۆلانەو کۆلان بڕۆیشتمایە، نزیکتر بوو، بەڵام من هێشتا ڕێگای مزگەوتی گەورە لە کۆلانەکانەوە شارەزا نەبووم، هەربۆیە لە شەقامی گشتییەوە ڕۆیشتم تا گەیشتمە مزگەوت، ڕاستەوخۆ چوومە کتێبخانەی وەزیری. بینای کتێبخانەکە زۆر کۆن بوو، هێشتا بینا نوێیەکەی کە بە هاوکاری خودالێخۆشبوو (مەغفور) ئاغای هیراتی دروستکرا، تەواو نەببوو، ئەوکات کتێبخانەکە لە بەشی دواوە بوو.

من تا ئەو ڕۆژە نەچووبوومە هیچ کتێبخانەیەک و شێوازی وەرگرتنی کتێبم نەدەزانی، تەنانەت ناوی هیچ کتێبێکیشم نەدەزانی. تەنها ناوی موختارنامە، ئەسکەندەرنامە، ئەمیر ئەرسەلانی ناودار، حسێن کوردی شەبەستەریم دەزانی، ئەم کتێبانە شەوانە لەگەڵ کوڕی ئاغای دەبیری دراوسێمان دەمانخوێندەوە، چیرۆکی ئەم کتێبانەم بۆ منداڵانی پۆل و ژنانی گەڕەک دەگێڕایەوە، خۆیشم چەند کتێبێکم بەتایبەت

ئەمیر ئەرسەلان و حسێن کوڕی شەبەستەریم خوێندبووەوە. بەهەرحاڵ چوومە ڕاڕەوە تەسکەکەی کتێبخانەکە، دڵم تەپ تەپ لێیدەدا، تەمەنم (١١-١٢) ساڵ بوو، نیگەرانی ئەوە بووم کە کتێبم نەدەنێ، لە سەرەتای ڕاڕەوەکەدا و لەبەردەم دەرگاکە قەفەسێکی شووشە هەبوو کە کتێبی تێدا دانرابوو. کتێبێکی بچووکی بەرگ چەرمم بینی کە لەسەر بەرگەکەی نووسراوبوو، "ئامۆژگارییەکانی ئەفلاتۆن"، وامزانی ئەمەش کتێبێکە لە جۆری کتێبی حسێن کوردی شەبەستەری، چونکە کتێبەکە بچووک بوو، وام هەستکرد، کە ئەم کتێبە بۆ من باشە چونکە منیش بچووکم.

چوومە ناوهۆڵی کتێبخانەکە، چەند کەسێک خەریکی خوێندنەوە، پیاوێک لە پشتەوە دانیشتبوو، سڵاوم لێکرد و گوتی: فەرموو چیت دەوێت؟

گوتم: کتێب. گوتی: چ کتێبێکت دەوێت؟ گوتم: ئامۆژگارییەکانی ئەفلاتۆن! بەگاڵتەپێکردنەوە پێکەنی و هاواریکرد ڕۆڵە بڕۆ لە کۆڵان بۆ خۆت یاریی بکە.. کتێبی ئامۆژگارییەکانی ئەفلاتۆنت دەوێت؟ بڕۆ دەرەوە! ویستم بگریم و بڕۆمەوە دەرەوە، بەڵام من زۆرم حەز لە خوێندنەوەی کتێب دەکرد و بەڵێنیشم بە دایکمدا بوو، کە ڕۆژانە دەچمە کتێبخانە، ئێستاش کاتژمێرێک ڕێگام بەپێی بڕیوە و ئەم مامە شێخەش بەم شێوەیە لەگەڵمدا جولایەوە. دەنگی بەرزی سەرپەرشتیاری کتێبخانە لە هۆڵەکەدا دەنگیدایەوە، پیاوێکی تەمەن (٥٠-٥٥) ساڵی چاکەت و پانتۆڵ لەبەر دانیشتبوو خەریکی خوێندنەوە بوو، لەسەر خوێندنەوەکە هەستا و هات بەدەنگێکی نەرم لە منی پرسی: کاکە گیان چیتدەوێت؟ هاتە لامەوە و ڕوویکردە مامە شێخ محەمەد باقر و پێیگوت: لەگەڵ منداڵاندا هێواش و لەسەرخۆبە. منیش گوتم: کتێبم دەوێت پیاوەکە پرسی؟ کام کتێبەت دەوێت؟ گوتم: کتێبی ئامۆژگارییەکانی ئەفلاتون. پیاوەکە بە مامە شێخ محەمەدی گوت: کتێبی ئامۆژگارییەکانی ئەفلاتون بهێنە. مامە شێخ محەمەد گوتی: بەسەرچاو. حاجی ئاغا، کتێبەکەی هێنا و دایەدەست حاجی. حاجی دەستی منی گرت و بەیەکەوە بەرەو حەوشە بچووکەکەی کتێبخانە ڕۆیشتین. حەوشەکە چەند دار هەنارێکی تێدابوو، هەر لەوێ یەک دوو مێز و چەند کورسییەکیش دانرابوون. دەرگاکەی لە تەنیشت ژووری کتێبخانەوە بوو، هیچ کەسێکی لێنەبوو، حاجی گوتی: دانیشە. پاشان لێی پرسیم: بەڕاست تۆ دەزانیت ئەفلاتون کێیە؟ من تا ئەو کاتە ناوی ئەفلاتونم نەبیستبوو، گوتم: نەخێر. حاجی دەربارەی ژیانی ئەفلاتون، سۆکرات، ئەرەستۆ، یۆنان و فەیلەسووفە گەورەکان دەستیکرد بە قسەکردن تا بانگی نیوەڕۆ، واتە سێ سەعات و نیو چەند لاپەڕەیەک لە ئامۆژگارییەکانی ئەفلاتونی بۆ خوێندمەوە و بۆی ڕاڤە کردم. دەربارەی پەند و گوتەکانی ئەفلاتون قسەی بۆ کردم و چەندین نموونەی هێنایەوە،

دەنگی بانگی نیوەڕۆ هات و حاجی گوتی: کاکە گیان ناوت چیە؟ ناو و نازناوی خۆمم پێگوت، ئەو باوکمی دەناسی و گوتی،خودا لێی خۆشبێت. بووینە دۆست و ئاشنای یەکتر، ئەویش گوتی: منیش ناوم ئەفشارە. پاشان گوتی: من دەچم بۆ نوێژکردن، تۆش هەرکاتێک ویستت بڕۆی کتێبەکە بدەرەوە بە شێخ ئەحمەد باقر، بەڵام جارێکیتر کە هاتیت بۆ کتێبخانە کتێبی چیرۆک وەربگرە و بیخوێنەرەوە، خۆیشم بە شێخ محەمەد دەڵێم، کە کتێبی چیرۆکت بداتێ و ئەگەر ویستیشت کتێب لەگەڵ خۆتدا ببەیتە ماڵەوە ئەوا من دەبمە کەفیلت. حاجی ڕۆیشت بۆ نوێژ و منیش نیو کاتژمێری تر خەریکی خوێندنەوەی کتێبەکە بووم. پاشان چووم کتێبەکەم دایەوە بە شێخ محەمەد باقر، لەکاتێکدا کە کتێبی ئامۆژگارییەکانی ئەفلاتونی لێوەرگرتم بەگاڵتەپێکردنەوە پێیگوتم: فەیلسوف ئێستا لەسەر ئەفلاتون هەندێک قسەمان بۆ بکە، شێخ محەمەد باقر ئاگاداری ئەوە نەبوو کە لەبەیانییەوە ئاغای ئەفشار وانەم پێدەڵێت، وایدەزانی هەر خۆم کتێبەکەم خوێندۆتەوە، ڕوویکردە دوو سێ کەس کە لە کتێبخانەکەدا بوون، گوتی: ئەم فەیلەسوفە بەیانی زوو هاتووە داوای کتێبی ئامۆژگاری ئەفلاتونی کرد، حاجی ئەفشار پێیگوتم کە کتێبەکەی بدەمێ، ئێستا فەیلەسووف دەیەوێت دەربارەی ئەفلاتون قسەبکات. من دەستم پێکرد لەبارەی سۆکرات، ئەفلاتون و ئەرەستۆ، هەندێک قسەمکرد و چەند پەند و وتەی ئەفلاتونم باسکرد. واتە هەرچی حاجی ئەفشار بۆ منی باسکردبوو منیش دووبارە گوتمەوە. شێخ محەمەد باقر دەمی بۆ نەدەکرایەوە، گوتی: منداڵ تۆ خۆ ناتوانیت بەرگی کتێبەکەش بخوێنیتەوە. منیش کتێبەکەم کردەوە و دەستمکرد بەخوێندنەوەی هەمان ئەو سێ لاپەڕەیەی کە حاجی ئەفشار بۆی خوێندمەوە. یەکێک لە پیاوەکان گوێی لە خوێندنەوەکەم بوو، گوتی: یا شێخ تۆ کەمتر هاوکاری منداڵان دەکەیت و باش لە گەڵیاندا ناجوڵێیتەوە. هەر ئەو پیاوە بە جەنابی شێخی گوت کە یەکێک لە ئاماجەکانی ئاغای وەزیری ئەوەیە کە منداڵان زیاتر بێن بۆ کتێبخانە، بەڵام تۆ وا لە منداڵان دەکەیت، کە دووربکەونەوە لە کتێبخانە، ئەگەر جارێکیتر بەم جۆرە هەڵسوکەوت بکەیت لەگەڵ منداڵاندا، من لای حاجی ئاغای وەزیری شکاتت لێدەکەم. شێخ ڕەنگی دەموچاوی تێکچوو، ڕۆیشت بۆ مزگەوت. ئەو پیاوە پێیگوتم: کاکە گیان گوێ بەقسەی شێخ مەدە. هەموو ڕۆژێک وەرە بۆ کتێبخانە، منیش زیاتر دیمە ئێرە، ئەگەر پرسیارێکت هەبوو، لە من بپرسە. ئەم پیاوە چەند ساڵ دواتر بوو بە مامۆستای من، ئەو ئاغای کەیانی بوو لیسانسی هەبوو، لە ئەدەبیاتی فارسیدا، پیاوێکی هێمن و زیرەک و لەسەرخۆ بوو، ئەوکاتە مووچەی ئەم مامۆستایانە زۆر باش بوو، پێویستیان بەوە نەبوو کە هیچ کارێکی تر بکەن. هاوینان هەر خەریکی خوێندنەوە بوون، یا بۆ پشوودان دەچوونە

کوێسـتانەکان. ئەم پیـاوە خوێنـدەوارە گەورەیە لە پـێش تەمەنـی (٥٠) سـاڵیدا بەهـۆی نەخۆشـیەوە کـۆچی دوایـی کـرد. ڕۆژی دواتـر کە چـوومەوە بـۆ کتێبخـانە، شـێوازی گفتوگۆی شێخ مـحەمەد لەگەڵمدا زۆر لەسـەرخۆ بوو، کتێبێکی چیرۆکی پێدام بەناوی (دەکەسی قزڵباش) کتێبەکەی دامێ و گوتی: ئەم چیرۆکە بخوێنەرەوە. ئەگەر پێتخۆشـە ئەو کتێبە ببەرەوە بۆ ماڵەوە هیچ کێشـەیەک نییە، ئەم کتێبە (١٠) بەرگە، بەرگی یەکەم ببە بیخـوێنەرەوە و پاشـان بیهێنەرەوە، پاشـان بەرگەکـانی تر ببە تـا هەموویـان تەواو دەکەیـت. کتێـبەکەم لێوەرگرت و ئەویـش نـاو و ئەدرەسـی منـی نووسـی و لە ژێـرەوە نووسی لەسەر بڕیاری حاجی ئەفشار، پاشان گوتی: وەرە واژۆیەکم بۆ بکە.

لەوەیە ئەوە یەکەمـین واژۆی مـن بووبێـت. کتێـبەکەم وەرگـرت و بەغـاردان بەرەو مـاڵەوە ڕۆیشـتمەوە. نـزیکەی کـاتژمێر (١٢)ی نیـوەڕۆ بـوو گەیشـتمە مـاڵەوە، دایکـم نیگەرانی من بوو کە بۆچی درەنگ گەڕاومەتەوە. بەڵام کاتێک کە کتێبەکەی بەدەستمەوە بینی، ئارام بوەوە، ڕووداوەکانی کتێبەکەم بۆ دایکم گێڕایەوە، بەرگی یەکەمی کتێبی دە پیاوی قزڵباشم لە ماوەی دوو ڕۆژدا خوێندەوە. شەوانە چیرۆکی دە پیاوی قزڵباشـم بـۆ ژنانی کۆڵان و ئەو پیاوانەی دەچوونە لای دوکانی محەمەد ئاوریشمی دەخوێندەوە.

لە شەوی سێیەمدا کە من دەچووم بۆ کتێبخـانە هەمـوو چـاوەڕوان بـوون کە حسـێن پاپولی بێت و پاشماوەی چیرۆکەکە بگێڕێتەوە. لەبەردەم دوکانی ئاغـای ئاوریشـمی، لەو تاریکە شەوەدا چەند کەسێک کۆببوونەوە، لە دوکانەکەدا لامپایەکی نەوتییان دانـابوو بـۆ ڕوونـاکردنەوەی دوکـانەکە، وردە وردە ژمـارەی خەڵـکەکە زیادیـان دەکـرد. لە شـەوی حەوتەم و هەشـتەمدا ئاغـای مـحەمەدی سـەماوەرێکی هێنـا و کـۆڕی چـاخواردنەوەی پێکهێنا، چونکە ئەو خۆی چایچی بوو چای دەدا بەهەموو ئەوکەسـانەی کە لەوێ بوون. هەر (٤) پیاڵە و شەکردانێک شەکری نمرەیەک و چەندین دەنک نەباتی تێدابوو. چـایەکی بە ڕیاڵێک دەفرۆشت، بەڵام چای من بەلاش بوو، ڕەنگە ئەمە یەکەمـین کرێ بووبێت تـا ئەو کاتە لە ژیانمدا وەرمگرتبێت. هەمـوو شـەوێک دوو چـام هەبـوو، شـەو لەدوای شـەو خەڵکەکە زیاتر دەبوون، لە دوای (١٥) ڕۆژ بەردەمی دوکانی ئاغا محەمەد زۆر قەرەباڵغ بوو، ئاغا محەمەدیش یەک پاکەت شیرینی پێدام کە بەردەوامبم لە چیرۆک خوێندنەوە. وردە وردە وای لێهـات ژن و ومنـداڵیش دەهـاتن و لەلایەکەوە دادەنیشـتن، بەڵام ئەوان چایان نەدەخواردەوە، هەندێک شـەو هەندێک کەس نەدەهـاتن شـەوی دواتـر کە دەهـاتن دەیـانگوت چیرۆکـی دوێنـی شـەو دووبـارە بـکەرەوە. هەموویـان بەوە ڕازی بـوون کە چیرۆکەکە دووبارە بکرێتەوە، منیش چیرۆکەکەم زۆر بەشەوقەوە بۆ دەگێڕانەوە.

دەمگوت کاتێک قزڵباشە شیعەکان سەرکەوتن بەسەر ئوزبێکە سوننەکاندا، خەڵکەکە هەمــووی ســڵاواتیان لێــدەدا، دیــارە لە ســاڵەکانی (١٣٣٧-١٩٥٨/١١٣٣٨-١٩٥٩) پــێش پەیـدابوونی تەلەفزیـۆن خەڵکـی بەدوای شــانۆوە بــوون، کە چەنـدین جـار دووبـارە دەکرایەوە، لە دواییدا قوتابخانە کرایەوە و چیرۆکەکان بەناتەواوی مانەوە.

دەبوو شەوانە خەریکی کۆشش و نووسینەوەکانم بم، تەنها شەوانی هەینی چیرۆک خوێندنەوەم هەبوو، کە چیرۆکەکان تەواو بوون ئاغا محەمەد دەیگوت: تکایە چیرۆکێکی تر دەستپێبکە. بەڵام وانەکانم زۆر بوون، بەیانیان نەمدەتوانی بچم بۆ کتێبخانە، چونکە دەبوو بچم بۆ قوتابخانە، دوانیوەڕوان کە قوتابخانە تەواو دەبوو، کتێبخانە دادەخرا، بەڵام لە ناوەڕاستی زستاندا سەردانی کتێبخانەی شەرەفەدین عەلی یەزدیم کرد، کە لە نزیک مەیدانی میر چەقماق بوو. لێپرسراوی ئەو کتێبخانەیە پیاوێکی باش بوو، کتێبی هۆنراوەکانی لامارتینی پێدام کە بیخوێنمەوە، بەڵام ئەم کتێبە بۆ من قورس بوو، کتێبی حسێن کوردی شەبەستەری و ئەمیر ئەرسەلانی ناودارم لێوەرگرت و بۆ جاری دووەم دەســتمکرد بە خوێنــدنەوە. جــاری یەکەم لە مــاڵی ئاغــای دەبیــری ئەم دوو کتێــبەم بەشــێوەی خــول خوێنــدبووەوە، واتە چەنــد لاپەڕەیەکــی ئەکــبەر و عەلــی دەیبــرد دەیانخوێندەوە، چەند لاپەرەیەکیش من دەمخوێندەوە.

ئێستا کتێبی ئەمیر ئەرسەلان بەتەنها دەخوێنمەوە، دەگوترا هەر کەسێک کتێبی ئەمیر ئەرسەلان تا کۆتایی بخوێنێتەوە، ئەوا ئەو کەسە لە شار و وڵاتی خۆی دوور دەکەوێتەوە، هەر بۆیەش هەمیشە دوو سێ کەس بەیەکەوە دادەنیشتین و هەریەکەی چەند لاپەڕەیەکی لێ دەخوێندەوە و بەدەنگێکی بەرز بۆئەوەی هەموویان گوێیان لێبێت، کاتێک من ئەم کتێبەم خوێندەوە دایکم دەیگوت بەتەنها مەیخوێنەوە با دوورە وڵات نەبیت. چوومە پۆلی پێنج، پۆلی پێنجەم پۆلێکی گەورە و ڕوو لە هەتاو بوو، ژمارەی قوتابیانی (٣٢) کەس بوو، (٢٤) چوار کەس لە پۆلی چوارەمەوە هاتبووین و چەند قوتابیەکی تریش ساڵی پێشتر لە پۆلی (٥) دەرنەچووبوون. دوو سێ کەسیش لە گوندەکانەوە هاتبوون. من زۆر زیرەک بووم، هەمیشە نمرەی (٢٠) م وەردەگرت. ئاغای فەرەحناک مامۆستای پۆلی پێنجەم، منی دیاری کرد بۆ ئامادەکردنی تێکڕای نمرەکانی کۆتایی، هەموو هەفتەیەک دەفتەری پۆلی دەدامێ و دەبوو نمرەی هەموو وانەکان کۆبکەمەوە و تێکڕایی نمرەکان دەربکەم و ناوەکان بەزنجیرە بنووسم. واتە قوتابییەک کە نمرەی لە هەمووان بەرزتربوو ناوی لە لاپەڕەی یەکەم دا تۆماربکەم، ئەوەی کە تێکڕای نمرەی لە هەمووان کەمتر بوو، دەبوایە لە دوا لاپەڕە دا ناوی بنووسم. ئاغای فەرەحناک مامۆستایەکی زۆر بەڕێز و چالاک و خاوێن بوو، هەمیشە پێڵاوەکانی

بۆیاخکراو بوو، کەمێک قەڵەو و سوور و سپی بوو، لەو کاتە دا تەمەنی نزیکەی (٤٥) ساڵ دەبوو، یەکەم جار کە ویستی دەفتەرەکە بدات بە من، گوتی: ئەم دەفتەرە ئامانەتە، دەبێت زۆر وریای بیت، ون نەبێت. هەڵە نەکەیت لە کاتی نووسین دا، نمرەی قوتابییەکان کەم و زیاد نەکەیت، من لە تۆ دڵنیام کە ئامانەت دەپارێزیت. من لە ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) وە لە زانکۆ وانە دەڵێمەوە و نمرە دادەنێم. هەر کاتێک کە دەفتەری خوێندکارێک سەیردەکەم بۆ (تصحیح)، وتەکانی ئاغای فەرەحناک دێتەوە بیرم.

مامۆستایەکی دیکەی پۆلی (٥)، کە مامۆستای تایبەتی پۆلی (٦) بوو، ئاغای درەخشانی بوو، ئەویش پیاوێکی ڕێکوپێک و جوانپۆش بوو. بەڵام بەپێچەوانەی ئاغای فەرەحناکەوە، ئەم زۆر لاواز و بێهێز بوو. ئاغای درەخشانی جگە لەوەی مامۆستای پۆلی (٥) بوو، ڕێکخستن و کۆکردنەوەی نمرەی قوتابییەکانی پۆلی شەشەمیشی لە ئەستۆدا بوو. منیش لە کۆتایی هەموو هەفتەیەکدا نمرەی تێکڕای پۆلەکانی (٥ و ٦)م وەردەگرت و دەفتەرەکەم بەباشی ڕێکدەخست.

لە پۆلی (٥)، من تەنها کەسی چیرۆکبێژ بووم، چونکە عەباس لە قوتابخانە نەمابوو، کتێب خوێندنەوەی من کاریگەریی زۆریی هەبوو لەسەر چۆنێتی نووسین و داڕشتنەکانم، هەمیشە داڕشتنی چەند لاپەڕەییم دەنووسی. هەندێک لە قوتابیانی پۆلەکانی سەروو خۆم، تەنانەت هەندێک قوتابی پۆلەکانی ناوەندیی گەڕەکیش بۆ نووسینی داڕشتن دەهاتنە لای من. هەر لە پۆلی پێنجەمەوە بەبەردەوامی وەک مامۆستایەکی گەڕەک وابووم، چەندین کەس لە گەڕەک دەهاتنە لای من بێبەرامبەر وانەم پێدەوتنەوە. کچێکی بچووکی دراوسێی خۆمان کە گوزەرانیان زۆر باش بوو، باوکی لە بۆمبای وڵاتی هندستان کاری دەکرد و لە یەزدیش دوکانێکیان هەبوو، لە وانەکانیدا زۆر خراپ بوو، حاجی (بیبی) دایکی داوای لێکردم وانەی پێبڵێمەوە. بۆ ماوەی (٣) ساڵ لە پۆلەکانی (٥،٦،٧)، وانەم بەو کچە گوتەوە، دایکێکی نەخوێندەواری هەبوو، دەهاتە لای ئێمە دادەنیشت، وردە وردە ئەویش فێری خوێندن و نووسین بوو. نایەتەوە یادم کە ڕیاڵێک یاخود دیارییەکم لەو ماڵە وەرگرتبێت. یان کاتێک حاجی لە بۆمباوە گەڕابێتەوە دیارییەکی بۆ هێنابم. ماوەیەکیش وانەم بە کوڕەکەیان گوتەوە. بەڵام ڕۆژێک لە ماڵی ئەوان یاریم بە تۆپێکی لاستیک دەکرد، تۆپی ئەوسا وەک تۆپی ئێستا نەبوو، لاستیکی تۆپەکە زۆر ئەستوور بوو، دروستکراوی بریتانیا بوو، باوکیان لە هیندستانەوە بۆی هێنابوون، من شەقێکم لە تۆپەکە هەڵدا، تۆپەکە بەر شووشەی پەنجەرەی ماڵێک کەوت و شووشەکە شکا. خاوەن ماڵەکە پێی بژاردین و (٥) تومەنی لێوەرگرتین، ئەو پارەیە لەو کاتەدا زۆر بوو، ڕەنگە سێ بەرامبەری نرخی شووشەکە

بووبێت، پارەکەیان لە دایکم وەرگرت. لە نەورۆزی ساڵی (١٣٨٢-٢٠٠٣) چوووم بۆ سەردانی حاجی بیبی، ئەو خۆی گوتی ئەو خوێندەوارییە کەمەی هەمە، لە تۆوە فێربووم، چونکە من هەرگیز نەچوومەتە قوتابخانە. ئەو (٥) تومەنەی لە ماڵی ئەواندا لێیان سەندین لە دوای ئەو هەموو وانە وتنەوەیە بە منداڵەکانی، بۆ من زۆر ناخۆش بوو، بەڕادەیەک تا ئێستاش پاش (٤٥) ساڵ لە بیرەوەرییمدا ماوەتەوە، چونکە بەکارێکی ناڕەوا و بێویژدانی دەزانم. یەکەم چونکە پارەکە دوو تا سێ جار بەرامبەر پارەی شووشەکە بوو، دووەم هیلاکبوونی من لەبەرچاو نەگیرا، سێیەم لەو سەردەمە دا ئەو پارەیە بۆ دایکم زۆر زۆر بوو. شتێک کە لە پۆلی (٥) دا سەرنجی منی ڕاکێشا، گرفتی قوتابیان بوو لە تێکڕای پۆلەکاندا، لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە تەنها (٢٨) قوتابی مابوونەوە، کە گەیشتبوونە پۆلی (٥)، ئەوانی تریان هەموویان وازیان هێنا بوو، ڕۆیشتبوون بۆ کاری مسگەریی و ئاسنگەریی، بەتایبەت کارگەکانی هەلاجی و ڕستن. نزیکەی (٤٨) قوتابی وازیان لە خوێند هێنابوو، کاتێک من گەیشتمە پۆلی (٦) تەنها (٢٤) قوتابی بووین. کە ئاغای متوسلیان و ئاغای سەدری لە قوتابخانەیەکی ترەوە هاتبوون، (١٨) کەس چوونە پۆلی (٦) و پێنج کەسیش لە پۆلی (٥) کەوتبوون، نزیکەی (٥٠) قوتابی کە بەیەکەوە چووینە پۆلی یەکەمی سەرەتایی وازیان لە قوتابخانە هێنا بوو. ئەوانە نەچووبوونە قوتابخانەیەکی تر، دیارە من ئەم ئامارەم لەبەر نەبوو بەڵکو ساڵی (١٣٥٩-١٩٨٠) کاتێک لە پاریس دەمخوێند، نامەیەکم بۆ بەڕێوەبەری قوتابخانەی هیدایەتی یەزد نووسی، لیستی قوتابیانی ساڵەکانی (١٣٣٤تا١٣٤٠-١٩٥٥تا١٩٦١) ی بۆ ناردم. چونکە هەموو قوتابییەکان دەناسم و ناونیشانی ماڵەکانیشیان دەزانم. تەنانەت دەزانم هەندێکیان چ کارێکیش دەکەن. توانیم ئاماری تەواوی هەموو کەوتووەکان و بەردەوامبووەکان دەربهێنم، بەرامبەر بەم هەژاریی کۆمەڵگەی دواکەوتوو کارسبکار و دەوڵەمەندەکان و خاوەنکارەکان پێویستیان بەکاری منداڵانە و لەلایەکی تر فشاری هەندێک لە مامۆستا و بەڕێوەبەری شەلاقبەدەست و نەخوێندەواریی هەندێک بنەماڵە بووە هۆی ئەوەی، کە دوو لەسەر سێی ئەو قوتابیانەی چوونە پۆلی یەک، نەگەنە پۆلی شەش.

## سۆپای نەوتی و گۆرانکارییەکی تەکنۆلۆژیی

وابزانم زستانی پۆلی پێنجەم بوو، کە سۆپاکانی قوتابخانە بوون بە نەوتی. سۆپای نەوتییەکان لە تەنەکە و ئاسن دروستکرابوون و لە پۆلەکاندا جێگیرکران، بە بۆرییەک نەوت دەهات بۆ ناو سۆپاکە. بە دوکەڵکێشێک دوکەڵەکەی دەکرایە دەرەوە. جگە لەوەش لەلای سەرەوەی سۆپاکەوە سەرقاپێکی هەبوو، چەندین جار کە نەوتی زیاد بڕۆشتایە بۆ ناو سۆپاکە، ئەوا کڵپەی دەکرد و گڕی ئاگرەکە دەکەیشتە بنمیچی ژوورەکە. دەبوو بە خێرایی کەسێک قفڵی نەوتەکە بگرێتەوە. هەندێک جار منداڵە لاسارەکان سەری سۆپاکەیان قایم دەکرد و نەوتەکەیان زیاتر دەکردەوە و نەوتی زۆرتر دەڕۆیشتە سۆپاکەوە، سۆپاکە کڵپەی دەکرد.

ئەم گۆرانکارییە زۆر باش بوو، کە لە یەزد ڕوویدا، بەڵام تا ئەو کاتەی من دبلۆمم وەرگرت واتە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧)، زۆربەی تەنووری نانەواخانەکان هەر بەدار کاریان دەکرد. تەنانەت کاتێکیش کە من لە مەشهەد خوێندکاربووم تا ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) زۆربەی نانەواکانی مەشهەد بە دار کاریان دەکرد. زیادبوونی ژمارەی دانیشتووانی شارەکانی دەوروبەری کەوێر پێویستیان بە دار و خەڵوز هەبوو، ئەمەش بووە هۆی لەنێوبردنی دارستانەکانی کەوێر. یەزدییەکان بەمەیدانی بار دەڵێن (لەرد) وەکو لەردی باوەردی لەڕووی مەیدانی شا. لەردی مەیدانی میر قوتب، یەکێک لە سادەترین بەرهەمێک کە لە لەردەکان دەفرۆشرا، داری گەزۆ و داری بادامی کێوی بوو. دارستانەکانی بادامی کەوێر وەکو دارستانە بادامەکانی گۆڕەپانی روبات، یان دارستانەکانی تاق و غیچی گۆڕەپانی خان، گۆڕەپانی کەلمەرد، گۆڕەپانی گۆر، دەوروبەری بافوق و بەهاباد هەموویان لە تەنووری نانەواکان دا سووتان، یا بەهێواشی یان بەگڕی ئاگر کرایە خەڵووز. خەڵوزی بادەم یەکێکە لە خەڵوزە هەرە باشەکان بۆ تلیاک کێشان، هەر ئەوەش بووە هۆ بۆ سوودوەرگرتن لە دارستانەکانی

بادام و لەنێوبردنیان، تا دوایین بنەداری بادام. زۆرترین کووره خەڵوز لەم شوێنانەدا کران و خەڵوزێکی زۆریان دروستکرد و لەلایەن شوفێرانەوە گواسترانەوە بۆ شارەکانی یەزد، ئەسفەهان، کرمان و شارەکانی خۆراسان و سمنان و کاشان، لەوێش گەیشتە دەست لەردەکان و تلیاکییەکانیش بەهاوکاری گورزی ڕۆستەم هەموویان دەرخواردی تلیاک دا لەپێناو دووکەڵ و لە نێو هۆش و بیری خۆیان.

لە یەزد چەندین کەس هەبوون کاریان بارکردنی دار و خەڵووز بوو، کە بەناوبانگترینیان لە کوڕەکانی ڕەزا حەکیم بوون. ناسر ڕەزا حەکیم، مەنسور ڕەزا حەکیم، وابزانم چوار برا بوون هەموویان گەلابەیان هەبوو. ئەگەر ئەمانە لە ژیاندا مابن پێویستە لێپرسراوان پارەیان بدەنێ بۆئەوەی بیانبەن بۆ شوێنی دارستانەکان و ئەوانیش وابکەن ئەو شوێنانە دووبارە ببنەوە بەدارستان. لە گۆڕەپانەکان زۆر کەس کاریان دروستکردنی کوورەی خەڵوز بوو، وەک ئەحمەد خان کە دانیشتووی گۆڕەپانی کەل مرەد بوو، کاریشی داربڕین و ئامادەکردنی خەڵووز بوو. لە ساڵەکانی (١٣٤٦-١٣٥٠-١٩٦٧-١٩٧١) کە خوێندکاری زانکۆی مەشهەد بووم، بەردەوام لە نێوان شارەکانی مەشهەد و یەزد دا، لە هاتوچۆدا بووم. دارستانەکانی کەوێر کەم ببوون، بەڵام شوفێرەکان بەردەوام لە گۆڕەپانەکان خەڵوزیان دەکڕی و باریاندەکرد بۆ یەزد و بەنرخێکی زۆر دەیانفرۆشت، چونکە دروستکردنی کووره خەڵووز قەدەغەکرابوو، و سزایەکی زۆری لەسەر بوو، هەربۆیەش بووە داهاتێکی باش بۆ پۆلیس و گۆڕەپانی خان و گۆڕەپانی پشت بادام و پاسەوانی دارستان و شوفێرەکان. خەڵوزی بادام دیارییەکی جوان بوو بۆ تلیاکخۆرە دەوڵەمەندەکانی یەزد، کرمان، تەبسی، تەربەت، مەشهەد و تەواوی شارەکانی تر. پاشان قتوی خەڵوزی پێچراوەی نایاب لە بازاڕەکاندا زیادیکرد و ئامادەکردنی خەڵوز دەبوو لە شێوازە کۆنەکەوە گۆڕانکاریی تێدابکرێت بۆ شێوازی نوێ. لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی دانیشتووان و زیادبوونی تلیاکخۆرەکان، تەکنەلۆژیای کۆنی دابینکردنی گەرمی (بەتایبەت تەنوری نانەوایی و تونی حەمام و خەڵوز و پێویستییەکانی تری ماڵان لە زستاندا) دوای ئەم ڕاستیانە دارستانەکانی کەوێر تەواو لەبنهاتن. ئێستا بە خزمەتکردنی سەرچاوە سروشتییەکان و کەمبوونەوەی تلیاک کێشان بە خەڵوز (چۆن تەکنیکی تلیاک کێشان گۆڕاوە) دووبارە ژمارەیەکی کەم درەخت لە دەوروبەری گوندەکان و گۆڕەپانەکان گەشەیان کردووە. پێویستە بە هەر ڕێگایەک بێت بەهاواری ئەم دارستانانەی کەوێرەوە بگەن، تابتوانن ئەم هێرشی لەنێوبردنە جڵەو بکەن، بەتایبەت کە لەم ساڵانەدا مافەکانی مرۆڤ بەگشتی و مافی منداڵان و ژنان و سروشت بەتایبەتی دەخرێتە ژێر پێوە.

دانــانی ســۆپای نەوتــی لە قوتابخانەکانــدا کــارێکی بــاش بــوو بــۆ کەمکــردنەوەی بەکارهێنانی دار. ئەم سۆپا نەوتیانە نموونەیەک بوو بۆ تەواوی خەڵک کە لەبری دار، سوود لە نەوت وەربگرن. دەستپێکی مۆدێرنیزم بوو، نوێ ساوی وتووێژ بوو، کە ئایا بەکارهێنانی نەوت باشە یا خراپە. نزیکەی (٦٠) ساڵ دوای دۆزینەوەی نەوت لە وڵاتدا وردە وردە بەکارهێنانی گەیشتە قوتابخانەکان. لێرەوە بەپێی یاسا بەهەموو جێگایەکدا بڵاوبووە. بەدرێژایی پاییز و زستان چەندین جار سەردانی کتێبخانەی وەزیرم کرد، کتێبم وەردەگرت و دەمخوێندەوە. بیرمدێت ڕۆژێک کاتی ئێوارە بوو هەوا زۆر سارد بوو لە کتێبخانە دەگەڕامەوە، لە بەردەم مزگەوتی (بەرخورداری) یەزد پیاوێک بەناوی حەسەن تیمسار شێلمی کوڵاوی دەفرۆشت، نازانم هەر بەتیمسار ناسرابوو یا تیمسار ناوی بنەماڵەکەی بوو؟! دوکانی سەوزە فرۆشتنی هەبوو، بەڵام ئێوارانی زستان هەر لەبەردەم دوکانەکەیدا شێلمی کوڵاو و چەوەندەر و هەندێک جاریش پاقلەی دەفرۆشت. لەو سەردەمەدا پیاوێکی (٤٥) ساڵە و جەستەی مامناوەندی و لات بوو، ئەو ڕۆژە دەوری قەرەباڵغ بوو، منیش ڕیاڵێکم دایەو گوتم شلێمم بدەرێ، ئەویش چەند کەسێکی تری بەڕێکرد، جارێکی تر پێمگوتەوە، شێلمم بداتێ، چونکە پێشتر پارەکەی لێ وەرگرتبووم، کەچی گوتی: پارەم بدەرێ. گوتم: ڕیاڵێکم دایتێ. ئەویش گوتی: کوا پارەت نەداومێ؟ دیسانەوە گوتم: لەپێشدا پارەکەم داتێ. دیسانەوە گوتی: نا پارەت نەداوە. منیش زۆر تەریقبوومەوە و چوومە قەراخ شەقامەکە، وردە وردە تاریکی دەبوو، دەترسام کە درەنگ بگەمەوە ماڵەوە، بەرەو ماڵەوە ڕێگەم گرتەبەر. گوێم لێبوو حەسەن تیمسار بە خەڵکەکەی گوت ئەگەر ئەم منداڵە ڕیاڵێکی بە من بدایە، ئێستا وا بەئاسانی نەدەڕۆیشت. بەڵام من ڕۆیشتم و فێربووم، کە هەمیشە یەکەمجار شتەکە وەربگرم و دوایی پارەکە بدەم. لەو کاتەوە تاکو ئێستا (٤٥) ساڵە هەر وا دەکەم. هەندێک جار بمەوێت شتێک بکڕم یا سواری تاکسی ببم تا شتەکە وەرنەگرم یا تا لە تاکیسیەکە دانەبەزم پارە نادەم. خودا لە حەسەن تیمسار خۆشبێت هەرچەندە ناوی بنەماڵەی نازانم، وانەیەکی وای فێرکردم کە تاکۆتایی ژیانم لەیادی نەکەم.

## لەشکرکێشی ئەسکەندەر و بەرگریی ئاریۆ برزون
## ڕاهێنان بۆ خۆشەویستی نیشتمان و ناسیۆنالیزم

یەکێک لە یارییەکانی منداڵان لە قوتابخانە، لەشکرکێشی بوو، لە پۆلی (٥) بووم کە ڕۆژێک هەردوو پۆلی (٥ و ٦) دەستیانکرد بە یاریی لەشکرکێشی و شەڕکردن لەگەڵ یەکتریدا. پۆلی (٥) لەشکری ئاریۆبرزون بوون، پۆلی (٦) یش لەشکری ئەسکەندەر بوون. لەشکرکێشی و هێرشکردن دوای جیاکردنەوەی دەستەکان بوو، فەرماندە دیاریکردن، فەرماندەی لەشکرەکان دیاریدەکران. هەندێک جار لە نێوان خۆیاندا کەسێکیان دەستنیشان دەکرد، جاری واش هەبوو لە (٥) پارچە کاغەزدا ناوەکان دەنووسران و پاشان تێکەڵیان دەکردن و پارچەیەکیان دەردەکرد، ناوی کێ بەدەستەوە بهاتایە ئەو دەبوو بە سەرلەشکر.

لە بەشی کۆتایی حەوشی قوتابخانە، لە پشت دار هەنار و دار تووەکان، هەردوو لەشکر ڕووبەڕووی یەکتر دەوەستان و پەلاماری یەکیان دەدا، یەکتریان تەواو هیلاک دەکرد. جارجارێک خودا لێخۆشبوو مەغفور ئاغای سەید جواد جەلیلی، ڕێکخەری قوتابخانە بە خۆی و قامچییە چەرمییەکەوە دەهات بۆمان، هەریەکە و بەلایەکدا ڕاماندەکرد.

هەندێک جار چەند کەسێک فریای ڕاکردن نەدەکەوتن و لێدانیان دەخوارد. لە یەکێک لە ڕۆژەکانی کۆتایی پۆلی (٥) دا بوو، هەردوو لەشکر ئەسکەندەور و ئاریو بورزن ڕووبەڕووی یەکتر وەستابوون، هەریەکەمان ئامادەی هێرشبردن بووین. منیش تەواو خۆم ئامادەکردبوو کە هێرشبەرم، هەستمکرد گۆڕەپانی جەنگ هێمنە، نەمزانی کە ڕێکخەری قوتابخانە لە پشت سەرمەوە وەستاوە. هاوکات، زللەیەکی زۆر بەهێزم لە بناگوێی بومان عەلی دۆستان سرەواند، کە یەکێک بوو لە فەرمانەدەکانی لەشکری ئەسکەندەر، ئاغای جەلیلی هاواری کرد و گوتی: دووبارە شەڕە؟ منداڵان هەموو بێدەنگ بوون، ڕێکخەری قوتابخانە ڕوویکردە بومان عەلی و گوتی: پاپولی باشی لێدایت.

دەفەرموو تۆش ئاوەها لێی بدەرەوە. بومان عەلی گوتی: ئاغا ئێمە یارییمان دەکرد ئەو بەیاریی زللەی لەمندا، ئێستا ئەگەر من زللەیەکی لێبدەم، ئەوکات دەبێتە شەڕی ڕاستی نەک یاریی. ڕێکخەری قوتابخانە ئینکاری کرد و گوتی: هەر دەبێت تۆ زللەیەک لە پاپولی بدەیتەوە. بومان عەلی ئینکار بوو گوتی: ئێمە یارییمان دەکرد، چۆن دەبێت ئێستا من بیکەم بەشەڕ و لێیبدەمەوە، دیارە تۆ بەشەڕمان دەدەیت، من بە یاریی ڕۆژی لە چەند کەس دەدەم و چەندین کەسیش لەمن دەدات، ئیتر یاریی ئەوهایە. ڕێکخەری قوتابخانە گوتی: ئەگەر لە پاپولی نەدەیتەوە، ئەوا من لە تۆ دەدەم، بومان عەلی گوتی: باشە تۆ لە من بدە.

ئاغا سەید جەواد گوتی: ئاخر من هێندە قامچی لە دەستت دەدەم کە ناچار بیت زللەکە لە پاپولی بدەیتەوە. پاشان ڕێکخەری قوتابخانە بە بومان عەلی (١١-١٢) ی ساڵی گوت دەستت بگرە. ئەم قارەمانەش هەردوو دەستی بۆ ڕاگرت، منداڵانی تر دەستمان کرد بە ژماردن، ڕێکخەر قامچییەکی لە دەستی ڕاستی دەدا و قامچییەکی لە دەستی چەپی دەدا، دەنگی منداڵان بەرزبوەوە (٢-٣-٤-٥-٦)، ڕێکخەر بەهەموو هێزی خۆیەوە قامچییەکەی بەرزدەکردەوەو لێیدەدا، ئەم منداڵە بەستەزمانە بەئازایەتیەوە هەردوو دەستی بۆ ڕاگرت بوو بەبێئەوەی هاواربکات یاخود قسەیەک بکات. دەنگی منداڵان زیاتر بەرزبوەوە (٤٨-٤٩) قامچی لە دەستیدا، ڕێکخەر تەواو هیلاک ببوو، بەڵام بەردەوام بوو، هەموو جارێکیش دەیگوت: زللەکەی لێدەدەیت؟ بومان عەلی بەبێئەوەی قسەیەک بکات هەردوو دەستی ڕاگرتبوو. دەنگ بەرزبوەوە (٥١-٥٢)، خوێن لە هەردوو دەستی بومان عەلی دەهاتە دەرەوە. ڕێکخەر بەردەوامبوو لە لێدانی بومان عەلی و زەنگی چوونە ژوورەوە لێیدا مامۆستاکان چوونە پۆلەوە و کاتێک سەیریان کرد منداڵان هەروا کۆبوونەوە، ڕێکخەر لەکەسێک دەدات و کاتێک منداڵان گوتیان ئەوە (٥٣) قامچی، ئاغای خاکسار دەروێش مەسلەک کە مامۆستای پۆلی (٢) بوو، خۆی خستە نێوان ڕێکخەری قوتابخانە و بومان عەلی دۆستان، ئەم منداڵە داماوەی لە دەستی ڕێکخەر ڕزگار کرد، گوتی: ئەم منداڵە ئامادە نییە زللەیەک لە هاوڕێکەی بداتەوە. دەبوو خەڵات بکرایە نەک بەم شێوەیە لێی بدرایە. سڵاو لەو منداڵە لە هەموو ئەو منداڵانەی وەک شێر بوون، کە ڕێکخەریان نائومید دەکرد، مامۆستای پۆلی (٣) کە لە تارانەوە هاتبوو بەدەنگی بەرز هاواریکرد و ناڕەزایی دەربڕی و گوتی: چۆن دەبێت کاری وا بکرێت؟ تەنانەت کەریش بەم جۆرە تەمبێ ناکرێت! پێویستە وەزارەتی پەروەردە ئەم قامچییانە کۆبکاتەوە. مامۆستاکانیش بوون بە دوو بەشەوە بەشێکیان دەیانگوت، دەبێت لێدان نەمێنێت و بەشەکەی تر دەیانگوت دەبێت بمێنێت.

بومان عەلی دۆستان، چەند ڕۆژێک لە جێگادا کەوت و هەفتەیەک پێستی مەڕیان لە دەستی بەست، نزیکەی (١٥) ڕۆژ نەیتوانی قەڵەم بەدەستەوە بگرێت و ئەرکەکانی بنووسێتەوە، ئەم منداڵە (١٠-١١) ساڵە لە دڵی مندا وا جێگەی کرایەوە، کە هەرگیز ئەو ئازایەتی و مەردایەتیەی فەرامۆش نەکەم. ئێستا (٥٢) ساڵە هیچ هەواڵێکم لە بومان عەلی دۆستان نییە، ئەم لێدان و تەمبێکردنە یەکێک بوو لە هۆکارەکانی وازهێنانی منداڵان لە قوتابخانە. ئاغای جەواد جەلیلی دەیزانی کە باوکی بومان عەلی لە چینی هەژارانی گەڕەکە، توانای شکاتکردنی نییە، خۆ ئەگەر شکاتیش بکات هیچ کەسێک گوێی لێناگرێت. بەهەموو لێکدانەوەیەک بێکەسی و بێ پارەیی بوو، ئەگەرنا ڕێکخەری قوتابخانە ئەم کارە نەشیاوەی نەدەکرد. منداڵان لە قوتابخانە لەسەر پێگەی چینایەتیان لێدانیان دەخوارد، هەمیشە منداڵە هەژارەکان بۆ تەمبێکردنی منداڵە دەوڵەمەندەکان لێدایان دەخوارد.

## جوگرافیا کۆمەڵایەتی شار و گەڕەکەکەمان

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی گەڕەکە کۆنەکان ئەوەبوو کە چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بەتەنیشت یەکەوە دەژیان، واتە لە یەک گەڕەکدا دەوڵەمەند و سیاسەتمەدار و خاوەن پلەوپایە و کرێکار و تا هەژار ترین کەس بەیەکەوە دەژیان. ماڵی ئاغای سەید جەلیل جەلیلی کە خۆی ئەندامی ئەنجومەنی یەزد بوو. کوڕەکەشی، ئاغای جەلیلی نوێنەری پارێزگای ئەسفەهان و یەزد بوو. زاواکەشی، ئاغای دکتور خەتیبی سەرۆکی شیرو خورشیدی سوری وڵات بوو. هەموویان هەر لە هەمان گەڕەکی پشتی باخ جێگیر بوون. تەنیشت ماڵی ئاغای جەلیلی، ماڵی حەسەنە گەڕ بوو، کە خۆی کرێکار بوو، ژنەکەشی جلشۆری ماڵان بوو. لەو سەردەمەدا لە شاری یەزد ئاوی بۆریی و تەلەفۆن نەبوو، شەقامەکانیش قیرتاو نەکرابوون، بارودۆخی سنووردار و نەبوونی سەرچاوەکانی ئاو مۆڵەتی نەدەدایە دەوڵەمەندەکان تا بڕۆن لە دەرەوەی شار گەڕەکی تازە دروستبکەن. یاخود هەژارەکان بگوازرێنەوە بۆ ناوەندی شار. لەپێناوی ئاودا هەموویان بەسەر یەکەوە لەیەک گەڕەکدا دەژیان و لە یەک مزگەوت سوودیان وەردەگرت و لەیەک حسێنیەش دا کۆدەبوونەوە و لەژێر یەک ئاڵادا سینەکوتانیان دەکرد. لە تارانیش نێوانی کۆشکی گوڵستان و واتە ماڵی نەسرەدین شای قاچار تا بازاڕی تاران و شوێنی کارو کاسپی خەڵک تەنها (٢٠٠) مەتر دەبێت. ڕاکێشانی ئاو و پاشان هێڵی تەلەفۆن و قیرتاوکردنی شەقامەکان لەلایەن شارەوانییەوە و دابەشکردنی زەوی بەشێوازی ئەندازەیی، دیاریکردنی شوێنە گشتیەکان، لەو بارودۆخەدا و مۆڵەت پێدانی شارەوانی کارێکی وایکرد، کە دەوڵەمەندەکان لە گەڕەکی تایبەت بە خۆیان نیشتەجێ بکرێن و هەژارانیش لە شوێنی تایبەت بە خۆیان کۆببنەوە.

دیوارە بڵند و بێ پەنجەرەکانی خانووە کۆنەکانی یەزد و شارەکانی تر لە حەوشی ماڵەکانی قەتیس دەمانەوە، کە ئەمە بەشێک بوو بۆ خۆدوورخستنەوە لە گەرما و

جۆرێکە لە هۆکاری جیاوازی کۆمەڵایەتی. ئەو دیوارە بەرزانەی خانووەکان بوونە هۆی ئەوەی کە بۆنی کەبابی دەوڵەوەندەکان نەگاتە لوتی برسییەکانی گەڕەک. برسییەکانی گەڕەک یش کە هەموو ڕۆژێک چاویان بەچاوی دەوڵەمەندەکان دەکەوت، خۆیان بەخەڵکی گەڕەکی ئەو دەوڵەمەندانە دەزانی. بەهۆی ئەوەی تێبینی بارودۆخی کۆمەڵایەتیان دەکرد، لەم دراوسێیەتیانەدا هەرگیز شەڕو شۆڕ و ئاژاوە لە نێوانیاندا نەبوو. دەوڵەمەندەکانیش هەمیشە هەستی هەژارانیان هەبووە. لە سەردەمی نوێدا، دامەزراوی بۆریی ئاو و هۆکارەکانی هێنان و بردنی شتومەک و پەیوەندییە تازەگەرییەکان بوونە هۆی ئەوەی کە گەڕەکی دەوڵەندەکان و هەژارەکان پەیدابێت. هەژار و دەوڵەمەند لە ڕوانگەی ئاست و جێگاوە جیاوازبن، ڕووبەڕووی یەکتر نەبنەوە، یەکتری نەناسن و یەکتر نەبینن، چارەسەری کێشەکانیان بەهێز و شەڕ چارەسەر بکەن. لە سەردەمی نوێدا، جیاوازیی کۆمەڵایەتی بووە هۆی ئەوەی کە دیواری ماڵەکان بەرزتربن، خانووی دەوڵەمەندەکان لە شێوە و جۆریاندا، بەجۆرێک بوو، کە هیچ خانوویەکی دراوسێیان، دیواریان بەدیوارەوە نەبوو، لە هەر لایەکەوە خانووەکانیان دەکەوتە سەر کۆڵان و جادەکان، یا ئەگەر دیواریان بەخانووی تریشەوە بوایە، ئەوا ئەو خانووە ماڵی کەسە نزیکەکانی خۆیان بوون، وەک خوشک، برا، مام، خاڵ و پوور. بەگشتی خانووی دەوڵەمەندەکان قەڵایەکی بچووک بوون کە بەشێوەی یەکپارچەیی دەردەکەوت. لە هەندێک گەڕەکدا چواردەوری ماڵە دەوڵەمەندەکان خەندەک بوو، کاتێک لەلایەکی کۆڵانەوە بەپانی (٣) مەتر نوێنەری پارێزگای ئەسفەهان و یەزدی لێ نیشتەجێ بوو، لاکەی تری کۆڵان حەسەنە گەڕی کرێکار و چەندین کرێکاری کارخانە بوو. پەیوەندی ژن و ژنخوازی لە نێوان کوڕان و کچانی ئەم دوو چینەدا سفر بوو. دەبوو دیواری ماڵە دەوڵەمەندەکان بڵند و قەڵا ئاسابن نەوەک خودا نەکردە، سەیرکردن و عیشقبازی لە نێوان منداڵی دەوڵەمەند و هەژاراندا ڕووبدات. لە دەرکەوتنی سەردەمی نوێ و دامەزراندنی بۆریی ئاوی ماڵان و هۆکارەکانی هێنان و بردنی شتومەک و تەلەفۆن پەیدابوون. دەوڵەمەند و هەژار و چینی مامناوەند هەریەک لە گەڕەکی جیادا نیشتەجێ و دراوسێی یەکتری بوون. کەشی شاریش بە چینی کۆمەڵایەتیەوە پەیوەست بوو، کەشی جۆگرافیا لایەنی کۆمەڵانی بەخۆوە گرت کاتێک دراوسێکان هەموویان لەیەک چینی کۆمەڵایەتی بوون، یان داهاتیان لەیەکەوە نزیک بوو، چۆن دیوارەکانیان بەرز دەکردەوە، دیواری نزم مەسرەفی زۆر کەمترە، ئەگەر دیسانەوە سەیرکردنی کوڕی ئەم ماڵ بۆ کچی ماڵەکەی تر ڕووبدات، ئەوکات خوازبێنی دێتە پێش و دوو دراوسێ کە لە یەک ئاستی کۆمەڵایەتیدان، یا لەیەک چینی کۆمەڵایەتی بەیەکەوە

پەیوەستدەبن و هیچ کێشەیەک نایەتە پێش. پاشان دیواری بڵندی خانووە کۆنەکانی شار زیاتر دیواری جیاوازیی کۆمەڵایەتییە تا ڕزگاربوونیان لە سەرما و گەرما. ئێمە کە بەم جۆرە لە شار و گەڕەکەکاندا گەورەبووین دەبێت چ هەستێکمان هەبێت. واتە هەستدەکەین کە دیوارە بەرزەکان بەر لە هەر شتێک بەرئەنجامی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانە، نەک مەرجی سروشتی و ژینگە کە هیچ کاریگەریەکی نەبێت. بەڵام لە کۆتاییدا دوا ئەنجامی کۆمەڵایەتی، ئێستا کۆمەڵناسان و ژینگەناسانی ئەوروپا و ئەمریکا و خوێندکارانیان هەرچیان دەوێت بابڵێن، ئێمە دڵسۆزی ئەوانیشین.

دیواری نێوان سەربانی ماڵە هەژارەکان هەر زۆر نزم بوون. لە بیدە کە هەموو هەژار بوون لە سەربانەکانیان بەهیچ جۆرێک دیوار نەبوو، بۆچی زیادە مەسرەفی بکەن و لە نێوان خانووەکانیاندا دیوار دروستبکەن؟ چ شتێکیان هەیە، تا بیانەوێت لە دراوسێکانیانی بشارنەوە.

لە یەزد دیواری سەربانی ماڵە دەوڵەمەندەکان لەگەڵ ماڵەکانی تردا دەگاتە (٢-٣) مەتر، منداڵانی دراوسێ بەئاسانی نەیاندەتوانی لە دیوارەکە سەرکەون. بەڵام دیواری نێوان سەربانەکانی ماڵە هەژارەکان بەجۆرێک بوو، کە منداڵان بەئاسانی دەیانتوانی تا (٥٠) ماڵ بەملاولای سەربانەکەدا بڕۆن. لە نێوان سەربانی ماڵە هەژارەکاندا بەهیچ جۆرێک دیوار نەبوو. ئەگەر لە هەندێک شوێن دیواریش هەبووایە بەرزییەکەی نەدەگەیشتە مەتر و نیوێک. شەوانی هاوین ماڵەکان لە سەربانەوە نان و خواردنیان بە دەستیاو دەدایە یەکتری. هەژاران خەم و خۆشییەکانی خۆیان لە نێوان یەکتریدا دابەش دەکرد. ئەوان سنگکوتانی گەڕەک بوون و دەوڵەمەندەکان دابینکەری خەرجیی مەراسیمەکان بوون. لە کۆندا هەردوو لا پەیوەستی یەکتری بوون، بەڵام دیوارە بڵندەکان لەمپەری پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان بوون، چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بەهۆی پەیوەندی ڕووبەڕووەوە ڕێزێکیان هەبوو، یەکێک لە هۆکارەکانی کە دەمارگیریی ڕەوشتی کەم دەکردەوە، هەر ئەو جیاوازیی جوگرافییەی چینە کۆمەڵایەتییەکان بوو. کاتێک کوڕی دەوڵەمەندێک لە گەڕەکدا سەیری کچی هەژارێکی دراوسێیان دەکات یا بەپێچەوانەوە، کچەکە وا هەست دەکات کە ئەم سەیرکردنە ناگاتە هاوسەرگیری یا ئەگەر بشگات ئەوا کارێکی نابەجێ دەبێت. هەژارەکە دەیەوێت لە ماڵە دەوڵەمەندەکە میرات وەربگرێت، هەربۆیەش ئاگر دەکەوێتە نێوانیان و چەقۆ لەیەکتری دەسوون. لەڕاستیدا ڕیشەی بەشێکی گرنگ لە دەمارگیریی غیرەو ناموس لە سەدە کۆنەکاندا هۆکاری ئابووریی و کۆمەڵایەتی هەیە نەک بەرگریی لە خوشک و خزم و کەسوکار.

بەشی گرنگی بەرگری لە ناموسمان بەرگریکردنە لە سەرمایە و پارە و موڵک و میراتی بەجێماوی باوک، نەک بەرگریی لە کچە مام و کچە پوورو شتی تر.

ئاوی جۆگەی شار، کە لە گەڕەکێکەوە دێتە نێوشار و لەلایەکی ترەوە دەڕواتە دەرەوە. لەو ماوەی دووری ئاوەدا تا ئاوەکە زیاتر بڕۆیشتایە پیستر دەبوو. تا دەگەیشتە خوارەوە بەتەواوی لیڵ و لیخن دەبوو، بەڵام هەمیشە دەوڵەمەندەکان چونکە لە سەرەوە جۆگەی خۆیان جیاکردبوەوە ئاوەکەیان خاوێن بوو، ئاوی تانکییەکانیش هەمیشە بەپیسی دەمایەوە، چونکە لەلای خوارەوەی ئاوەکە بوو. من چەندین جار ئاگاداربووم کە میراوەکە هاواری کردووە کە ئەو ئاوە دەچێتە ناو تانکییەکەوە، تکایە ئاگاداربن و پیسیی تێمەکەن. ژنان هەر لەو ئاوەدا کە دەخورایەوە جل و بەرگیشیان تێدا دەشۆرد و ئاوەکەیان پیس دەکرد. جارێک چەند ژنێک کە خەریکی کەلوپەل شۆردن بوون، خۆم پێمگوتن ئاوەکە پیس مەکەن، ئەم پیسییە میکرۆب دروستدەکات و ئاوەکە دەچێتە نێو تانکییەکانەوە. ئەوانیش گوتیان باشە باش، ئەم لادێییانە چەند ساڵێکە چوونەتە قوتابخانە و قسەی سەیر و سەمەرە دەکەن. ژنێک کە ناوی مەعسومە بوو پێیگوتم: بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە، ئاوی ڕۆیشتوو هەمیشە پاکەو میکرۆبی نییە، ئێمە هەرگیز چاومان بە میکرۆب نەکەوتووە. هەزار ساڵە لەم ئاوە دەخورێتەوە، ئەگەر تۆش نایخۆیتەوە مەیخۆرەوە. هەندێک کەس وا هەستدەکەن کە شاری تاران هەزار ساڵە بۆریی ئاوی بۆ ڕاکێشراوە. بەڵام بەگشتی دامەزراندنی ئاوی تاران بە بۆریی لە دەیەی ساڵی (١٣٣٠-١٩٥٠) دا دەستپێکردووە. پێشتر ئاوی خواردنەوەی تارانییەکان بەشێوازی جۆراوجۆر دابیندەکرا، بە ئەسپ و عەرەبانە لە کانیاوەکانەوە ئاویان دەهێنا و بەسەتڵ دەیانفرۆشت. ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) کە من چووم بۆ تاران خاوەن چایخانەکان ئاویان لە عەرەبانەی ئەسپی دەکڕی. تەنانەت تا ساڵی (١٣٥٤-١٩٧٥) یش لە دەوروبەری مەیدانی ژاڵە (مەیدانی شەهیدان) بە ئەسپ و عەرەبانە ئاویان دەفرۆشت. ئێستاش خەڵکی تاران دەیانەوێت ئەوە دووبارە بکەنەوە و ئاوی خواردنەوەی خۆیان بە ئاوی بتڵ دابین بکەن. لە ساڵی (٢٠٠٤) دا یەک پەرداخ ئاو بە (٤٢) تومەن بوو، یەک بتڵی (١,٥) لیتری ئاوی دەماوەند نرخی (٢٥٠) تومەن بوو. بتڵێکی یەک لیتر و نیوی ئاو یەکسانە بە (٦) پەرداخ، کەواتە هەر پەرداخێک ئاو بایی (٤٢) تومەنە. تەنها (٣٠-٤٠) ساڵ تارانییەکان توانیان لە ئاوی بۆریی بە نرخێکی هەرزان ئاو بخۆنەوە، دووبارە دەبێت ئاوی پەرداخی (٤٢) تومەنی و زیاتر بخۆنەوە. بەدڵنیاییەوە لە ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) دا دەگاتە (١٠٠) تومەن ئەگەر زیاتریش نەبێت، کە زۆر نزیکە زۆر لەو نرخەش زیاتر ببێت. واتە لە ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤) ئاوی خواردنەوە نرخەکەی دوو

به‌رامبه‌ری به‌نزین بوو، به‌نزین لیتری به (٨٠٠) ڕیاڵ بوو، ئاو یه‌ک لیترو نیوی به (٢٥٠٠) ڕیاڵ بوو.

له یه‌زد ئاوگێڕه‌كان له هه‌موو شوێنێک ئاویان ده‌فرۆشت، جاری وا هه‌بووه، كه‌سێک خێری كردووه، كه چه‌ند ڕۆژێک ببێت به ئاوگێڕ و ئاو به‌به‌لاش بدات به خه‌ڵكی. منیش له ڕۆژانی تاسوعا و عاشورا دا ده‌بووم به ئاوگێڕ. به كۆڵه‌پشتی كونده‌وه ئاو و شه‌ربه‌تم ده‌دا به خه‌ڵكی، هاوارم ده‌كرد به‌یادی حسێن بۆ پڕكردنی كونده‌ی ئاوه‌كه، كه (٦-٧) لیتر ئاوی ده‌گرت له هه‌ردوو ڕۆژی تاسوعا و عاشورا ده‌بوایه (٢٠-٣٠) جار له پلیكانه‌كانی تانكییه‌كه‌وه برۆمه خواره‌وه و بێمه سه‌ره‌وه. به‌تایبه‌ت ئه‌و چه‌ند ساڵه‌ی كه تاسوعا و عاشورا ده‌كه‌وته هاوینه‌وه، خه‌ڵكه‌كه زیاتر ئاوی ده‌خوارده‌وه. ئه‌م كاره بۆ من زۆر نارِه‌حه‌ت بوو به‌ڵام له هه‌مان كاتدا خۆشییه‌كی زۆریشی پێده‌به‌خشیم، ئاوی بۆریی پێویستییه‌كانی هه‌ژار و ده‌وڵه‌مه‌ندی یه‌كسان كرد، هه‌رچه‌نده ئێستا ده‌وڵه‌مه‌نده‌كان ئاوی بتڵ ده‌كڕن و ده‌یخۆنه‌وه، جیاوازی خۆیان له‌گه‌ڵ هه‌ژاره‌كان به‌م ڕێگایه دووباره ده‌كه‌نه‌وه. ئه‌وكاته من له ناوه‌ڕاستی پۆلی پێنجدا بووم، كه گه‌وڕی نێوان پۆلی پێنجه‌م و پۆلی چواره‌م لابرا و شوێنه‌كه به‌تاڵ كرا، بڕیاردرا ئه‌و شوێنه بكرێته فرۆشگه‌ی قوتابخانه. به‌ڵام گه‌وڕێک كه له حه‌وشێكی بچووكی قوتابخانه‌دا بوو تا چه‌ند ساڵێک هه‌ر هه‌بوو، وابزانم تا خانه‌نشینكردنی برایان جه‌لیلی كه یه‌كێكیان به‌ڕێوه‌به‌ر و یه‌كێكیان ڕێكخه‌ر بوو ئه‌م گه‌وڕه هه‌ر هه‌بوو. باشه كام سه‌رۆكی په‌روه‌رده‌یی ده‌یتوانی له به‌ڕێوه‌بردنی قوتابخانه‌یه‌ک بێ هه‌ڵوێست بێت كه پێنج كه‌س له یه‌ک بنه‌ماڵه ئه‌و قوتابخانه‌یه به‌رنبه‌ڕێوه. هه‌روه‌ها هه‌مان بنه‌ماڵه لانیكه‌م (٣) كه‌سیان به‌دوای یه‌كدا له چاره‌نووسی خه‌ڵكی یه‌زدا كه‌سی یه‌كه‌م بوون. باخچه‌ی قوتابخانه و گه‌وڕی ئاژه‌ڵه‌كان هه‌ر تایبه‌ت بوون به‌و بنه‌ماڵه‌یه، به‌و چاوه چینایه‌تییه‌وه كه ئاغای ڕێكخه‌ری قوتابخانه هه‌یبوو، ده‌بوو منداڵی هه‌ژاره‌كان لێیان بدرایه تا منداڵی ده‌وڵه‌مه‌نده‌كان فێری ئه‌داب و ڕه‌وشت ببن. دیاره منداڵی ده‌وڵه‌مه‌ند و خانه‌دانه‌كانی یه‌زد له قوتابخانه‌ی هیدایه‌ت نه‌یانده‌خوێند، منداڵی ده‌وڵه‌مه‌نده‌كان زیاتر ده‌چوونه قوتابخانه‌ی نموونه‌یی (لای ناوه‌ندی ئێرانشه‌هر) یا ده‌چوونه قوتابخانه‌ی كه‌یخوسره‌وی و ماكار. قوتابخانه‌ش ڕۆڵی گرنگی هه‌بوو له پیشاندانی جیاوازیی چینایه‌تی و كۆمه‌ڵایه‌تیدا، ڕۆژ به ڕۆژ ئه‌م ڕۆڵه به‌ره‌و پێشتر ده‌ڕۆیشت، هه‌ندێک له قوتابخانه‌كان ڕۆڵی سیاسییان هه‌بوو، چه‌ند قوتابخانه‌یه‌كی گرنگ و ناسراوی شاری تاران سیاسه‌تمه‌دارانی ئه‌سڵی وڵاتیان په‌روه‌رده ده‌كرد، ژماره‌یه‌كی زۆر له خه‌ڵكانی دیار له دوای شۆڕش له چه‌ند قوتابخانه‌ی تایبه‌ت خه‌ریكی خوێندن بوون.

لە یەزد پەروەردەی باش هەبوون، هەردوو بنکەی ماکار و کەیخوسرەوی کەلەلایەن دوو زەردەشتی خێرخوازەوە دروستکرا بوون، ئێستاش ئەم دوو بنکەیە زۆر بەکارن، قوتابخانەی ماکار لە فلکەی سەعاتی ماکار شەقامی کرمان بوو، کە ئێستاش هەر کراوەیە قوتابخانەی کەیخوسرەوی لە شەقامی هیراتی بوو، بەڵام گەورەترین قوتابخانەی یەزد (ئێرانشەهر) بوو، کە ئێستاش بەشێکی کراوەیە، بەڕاستی زەردەشتییەکان لە ئاوەدانی شاری یەزددا دەستێکی باڵایان هەبووە. دامەزراندنی کارەبای یەزد سەرەتا لەلایەن بنەماڵەی کەیخوسرەوەوە دامەزرا، تێکڕای ماڵەکان هەر لەوێوە کارەبایان وەردەگرت زۆرترین خەڵکیش پارەی کارەبایان نەدەدا و ئەوانیش کارەباکەیان نەدەبڕی.

دابینکردنی بۆریی ئاویش چەند ساڵێک لەلایەن ئاغا سەید محەمەد ئاغاوە دابینکرا لە هەموو وڵاتدا و بەتایبەت شاری یەزد. سەرەتای مۆدێرنیزم بەشێکی تایبەت و کاریگەرتری لە بەشی دەوڵەت بوو، لانیکەم لە یەزد بەم جۆرە بوو، هیراتییەکان نەخۆشخانەیان دروستکرد، رەوسڵیان قوتابخانەیان دروستکرد، زەردەشتییەکان کارەبا و قوتابخانە و سینەمایان دامەزراند، دەستتێوەردانی زیاد لە کاروباری وڵاتدا لە هەموو شتێکدا کاری بەڕێوەچوونی وڵاتی تێکداوە. ئێستا دەیانەوێت بەیاسا بەشی تایبەت گەشەپێبدەن، ئەمە نەکرنە، خەڵک دەیەوێت کارگە دروستبکرێت وڵات ببوژێتەوە، کار بدۆزنەوە و وڵاتێک، کە نەخشەیەکی بەجێی نەبێت و بەرنامەیەکی نەبێت، بەرنامەی ئامادەکراو گەڵاڵەکراوی بۆ ئاوەدانی نەبێت، لەم وڵاتەدا دەبێت دوو ساڵ خەڵکی ڕاکات بەشوێن وەرگرتنی مۆڵەتی دروستکردنی کارگەیەکدا، پاشانیش دەڵێن لێرە ئەقڵی کارو بنیاتنان نەماوە.

## چیرۆکی زەری سوڵتان – لوتکەی ڕەشبینی و نادادپەروەریی

ئەم بەسەرهاتە لە ساڵی (١٣٣٨-١٩٥٩) دا، کاتێک ڕوویدا کە من تەمەنم (١١) ساڵ بوو لە پۆلی پێنج بووم. سوڵتان سەکینە، کە مێردەکەی (٦-٧) ساڵ بوو مردبوو (٩) منداڵی هەبوو(٦ کوڕ و ٣ کچ) بچووکترین منداڵی کچێک بوو ناوی ڕوقیە بوو، تەمەنی (٦) ساڵ بوو، گەورەترین منداڵیشی کوڕێک بوو ناوی ڕەسوڵ بوو تەمەنی نزیکەی (٢٨) ساڵ بوو، ڕەسوڵ ژنی هێنابوو نیشتەجێی یەکێک لە گوندەکانی یەزد بوو، خەریکی کشتوکاڵ و مەڕداری بوو. سوڵتان سەکینە کە ناوێکی دیار بوو پێدەچێت هەر لە منداڵیەوە بێ باوک بووبێت، (٦ برا و ٢ خوشک)ی هەبوو، دایکی سواڵتان ناوی سەکینە بوو، نەنە زەینەب یش دایکی سەکینە بوو. واتە دایەگەورەی سوڵتان لە ژیاندا مابوو، سوڵتان تەمەنی (٤٢) ساڵ زیاتر نەبوو. سەکینەش نزیکەی (٦٠) ساڵ و نەنە زەینەب یش تەمەنی (٨٠) ساڵ بوو. نەنە زەینەب ژنێکی بەهێز و توانا بوو، بەڵام سەکینەی کچی هەمیشە نەخۆش بوو، سوڵتان دراوسێی ئێمە بوو. لە کۆڵانی بێوەژنان و هەتیوان، واتە کۆڵانێک کە ئاویان نەبوو، ماڵی سەکینەی دایکی سوڵتان (٤-٥) کۆڵان لەولاتر بوو، کۆڵانی ئەوان ئاوی هەبوو، ماڵەکەش گەورەتر بوو لە ماڵی کچەکەی واتە سەکینە. نەنە زەینەبی (٨٠) ساڵەش واتا دایە گەورەی سوڵتان لە گەڕەکێکی دوورەدەست نیشتەجێ بوو. خانوویەکی تارادەیەک باش کە ئاو و -ژێر زەمین- چەتری چینکۆی هەبوو، دیارە هەر کەسێک کە منداڵی زیاتر هەبێت هەژارتر دەبێت. زەری کچی سوڵتان (٤) ساڵ لە من گەورەتر بوو، کچێکی زۆر هەڵکەوتە و لێهاتووبوو. قورئان و گوڵستانی لای مەلا نەباتی خوێندبوو، هەموو قورئان و گوڵستانی لەبەر بوو. هۆنراوەکانی سائیبی تەورێزی- وحشی بافقی و هەتا فەخری ڕازی و عەراقی لەبەر دەخوێندەوە. هەر لە تەمەنی (١٠) ساڵییەوە مەلایەک بوو بۆخۆی. ئەوەندە زیرەک بوو، من لە (٦) ساڵیدا کە لای مەلا نەباتی گوڵستانم دەخوێند، هەر کاتێک بەتایبەت لە قورئان

خوێنـدن کێشـەکم هەبـوایە لە زەریەم دەپرسـی. چـونکە بـاوکم مردبـوو، دایکشـیم خوێنـدەواریی نەبـوو. زەری بۆخـۆی مامۆسـتای مـن بـوو، کە تـازەش چووبـوومە قوتابخـانە هەرکێشـەیەکم هەبـوایە دەچـوومە لای زەری، چـوکە بـۆمن لە هەمـوو مامۆستاکان باشتربوو. وانەی پێدەگوتم و زۆر میهرەبان بوو. زۆر حەزیشی لە وانە گـوتنەوە بـوو، بوسـتانی سـەعدی شـیرازیم لای زەری خوێنـد، زەری نەچـوو بـووە قوتابخانە تەنها چووبووە لای مەلا و نووسینیش هەر لەوێ فێرببوو. بۆ ئەو ژنانەی گەڕەکیش کە هاوسەرەکانیان ڕۆیشتبوون بۆ تاران و ئەهواز و بۆمبای و کوێت بۆ کارکردن، نامەی بۆ دەنووسین. دیارە کەسی نزیک و نەهێنی پارێزی ژنانی گەڕەک بوو. جار جاریش نامەی بۆ شەمسی (١٧) ساڵە دەنووسی، کە کچی حاجی عەلی ئاغای دەوڵەمەند بوو، شەمسی عاشقی ئەکبەر ئاغای (٢٠) ساڵ ببوو. نامەی بۆ دەنووسی، ئەکبەر ئاغا پێشتر شاگردی دوکانی باوکی شەمس ببوو، لەبەر ئەوەی کە حەزی لێکردبوو، شەمس هەمیشە لە ماڵەوە زیندانی کرابوو، نەیاندەهێشت لە ماڵەوە بچێتە دەرەوە. زەری لە سەربانەکەوە دەچووە ماڵیان و نامەی بۆ دەنووسی، زەری نامەکانی دەدایە دەست من، منیش نامەکانم دەبرد بۆ ئەکبەر ئاغا. شەمس لە تەمەنی (١٨) ساڵیدا بەهۆی عاشقبوونی بە ئەکبەر، وردە وردە بەهۆی زەری یەوە فێر خوێندن و نووسین بوو. دیارە ئەم کارە لە ماوەی (٤) ساڵدا بوو بەنهێنی و بەدزیی حاجی عەلی یەوە، خۆ ئەگەر حاجی عەلی بیزانییایە کە شەمس خۆی فێری خوێندن و نووسین دەکات، دوور نەبوو بیکوشتایە. حاجی عەلی کە دوکانێکی گەورەی وردە فرۆشی هەبوو، بەفەردە پێداویستی دەنارد بۆ گوندەکان بۆ فرۆشتن، هەمیشە دەیگوت ئەگەر کچ خوێندەوار بێت ئەوا دەبێتە مایەی شەڕو ئاژاوە بۆ کەسوکاری.

حاجی عەلی (٤) کچی تری لە تەمەنی (١٣-١٤) ساڵیدا شوویان کردبوو، بەڵام چونکە لە نێو خەڵکدا بڵاوببووەوە، کە شەمس عاشقی ئەکبەرە و شوو بە کەسی تر ناکات، گوتبووی ئەگەر بەزۆر بمدەن بەهەر کەسێکی تر، شەوی بووکێنی خۆم و زاواش دەکوژم. هەر بۆیەش هیچ کەسێک نەدەچووە خوازبێنی. باوکیشی گوتبووی، من ئەگەر کچەکەم بدەم بە ئەکبەری نەنە باقر. هەر خۆم کچەکەشم و ئەکبەریش دەکوژم. هەر بۆیەش شەمس بێ هاوسەر مایەوە ویستی لای زەری خۆی فێری خوێندن و نووسین بکات، تاخۆی نامە بۆ ئەکبەر ئاغا بنووسێت. عیشق هەزاران کار ئەنجامدەدات، یەکێک لەوانە دەتوانێت بەشێوەیەکی نهێنی مرۆڤ فێری خوێندن و نووسین بکات. دیارە زەری خوێندەوارییەکی باشی هەبوو، هۆنراوەی زۆر باشی لەبەر بوو. چیرۆکی نامەهێنان و نامەبردنی من (٣-٤) ساڵ بەردەوام بوو، بەڵام وردە وردە شەمس خۆی

نامەی دەنووسی و منیش دەمبرد بۆ ئەکبەر ئاغا. وابزانم تەمەنم (٦) ساڵ بوو کە یەکەمجار زەری نامەیەکی دامێ و گوتی بیبە بۆ ئەکبەر ئاغا. کە نامەکەم بۆ برد و چاوی پێمکەوت زۆر سەرسام بوو. گوتی: نامەکە تۆ نووسیووتە بەڵام نامەی شەمسە. دواجاریش کە نامەی شەمسم برد بۆ ئەکبەرئاغا تەمەنم (١٠) ساڵ بوو، زەریش تەمەنی (١٤-١٣) ساڵ بوو، ئێستا گرنگە باسی چیرۆکی ڕاستەقینەی زەری بکەین. زەری کچێکی زۆر بەدین بوو، هەمیشە لە کاتی خۆیدا نوێژەکانی دەکرد و سەدان نزای لەبەر بوو، ئەوکاتە وەک ئێستا خەڵکی نزایان نەدەکرد، ساڵی چەند جارێک لە شەوانی مانگی ڕەمەزان یان ڕۆژی تاسوعا و عاشورا دا دەگریان و نزایان دەکرد و ئیتر تەواوی ساڵەکە پێکەنین و خۆشی بوو. بەڵام لە تەواوی ساڵدا زەری هەر خەریکی نزاکردن بوو، منیش لەوەوە فێری جۆرەها نزاکردن بووم. زەری تەمەنی نزیکەی (١٤) ساڵ بوو، کە وردە وردە ڕەنگی زەرد دەبوو سکیشی بەرەو بەرزبوونەوە دەچوو، ژنانی دراوسێ کە دەیانبینی دڵی تێکەڵدێت و هێڵنجەدەدات، دەیانگوت زەری دووگیانە، ئەوەتا وردە وردە سکی گەورە دەبێت و بەرز دەبێتەوە. دواین جار کە پێش ئەم کێشەیە زەریم بینی لەیادمە ڕۆژی (٢٧ موردادی ١٣٣٨- ١٩-٨-١٩٥٩) بوو لە کۆڵانەکەوە ئیشارەتی بۆ کردم، کە بچمە سەربان، منیش ڕۆیشتم و زەری یش هات نامەیەکی شەمسی دەرکرد و دایەدەستم گوتی: بیبە بۆ ئەکبەر ئاغا. پاشان گوتی: ئەکبەر ئاغا ڕۆیشتووە بۆ سەربازیی بەڵام لە نامەی پێشوودا نووسرابوو کە ڕۆژی (٢٨) مرداد بۆ کڕینی خەڵوز دێتە مەیدانی پەهلەوی تۆ نامەکە بەرە و لەوێ بیدەرێ. ئەو پروپاگەندەیەم دەزانی کە دەربارەی زەری دەگوترا ئەوەشم دەزانی کە دەڵێن زەری دووگیانە، سەیرمکرد ڕەنگی تەواو زەردببوو. گوتی: حسێن ئەو قسانەی لەبارەی منەوە دەکرێت، تۆش بیستوتە؟ گوتم: بەڵێ، هەموویم بیستووە و هەموو کەسێکیش ئەمە دەزانێت. دەستیکرد بە گریان و گوتی: سوێند بەخودا من کاری خراپم نەکردووە.. گوتی: دڵم ئازارێکی زۆری هەیە. دەستی گرتم و لەسەر کراسەکیەوە خستیە سەر سکی خۆی و گوتی: سەیرکە سکم وردە وردە بەرز دەبێتەوە بەڵام سوێند بەخودای گەورە من کاری خراپم نەکردووە. دوای چەند ڕۆژێک دەنگە دەنگ و هاوار هاوار لە ماڵی ئەوانەوە بەرزبووەوە. عەباسی برای کە تەمەنی (١٨) ساڵ بوو، هاواری دەکرد و دەیگوت: دەیکوژم، زەری یش و هاوڕێکەشی دەکوژم. دەبێت هەر ئێستا پێمبڵێت ئەو نامەردە کێیە کەسکی پڕ کردووە، ئەو سەگبابی بێ شەرمە کێیە؟ کە تۆی وا لێکردووە؟ عەباس هاواری دەکرد و دەیگوت: دایە من خۆم دەکوژم، من ناتوانم برۆمە دەرەوە ناتوانم لە گەڕەک دا سەرم بەرز بکەمەوە. سەرەتا ئەم کچە دەکوژم پاشان ئەو بێ ئەخلاقی بێ

شــەرەفە دەكـوژم و دواتـر خۆیشـم دەكـوژم. خوشـكە بچـووكەكەی زەری كە نـاوی سەكینە بوو، ئەویش هەمان ناوی دایە گەورەی هەبوو، هاو تەمەنی من بوو، دەگریا و هاواری دەكرد توخودا فریامانكەون. ژنانی گەڕەک ویستیان بەهاواریانەوە بچن بەڵام دەرگایـان داخسـتبوو. زەری یـش هـاواری دەكـرد: بەخـودا بێتـاوانم و كـاری خـراپیم نەكـردووە. عەباسـی بـرای بەچەقـۆوە بەدەوری دیـوارەكەدا ڕاویـدەنا و دەیویسـت بیكوژێت. چەند ژنێک لە سەربانەوە چوونە ماڵیان و هەرچۆنێک بوو عەباسیان لە ماڵ كـردە دەرەوە. بەدەنـگە دەنگـی عەبـاس چیرۆكـی دووگیـانی زەری بڵاوبـوەوە. ژنەكـان دەیانویسـت بەقسـەی خـۆش و ئامۆژگـاری قسـە لە زەری دەربێنن و كە پێیانبڵێت ئەو كەسە كێیە وای لێكردووە، تا بانگی بكەن و لە یەكیـان مـارە بكەن، ئەم پڕوپاگەندەیەش كۆتایی پێبێت، بەڵام زەری سوێندی دەخوارد كە هیچ هـاوڕێیەكی كوڕی نییە و كـاری خراپیشـی نەكـردووە. پـاش چەنـد ڕۆژێـک دووبـارە هـاوار هـاواری زەری بەرزبـوەوە. ڕەسوڵی براگەورەی لە گوندەوە هاتبوو بۆ شـار، ڕەسـوڵ ئەوەندەی لە زەری دابـوو كە لە حەوشـەكەدا كەوتبـوو، دەیگـوت: توخیانەتـت كـردووە. سـوڵتانیش سـەری دەكێشـا و دەیگوت: دەزانیت تـۆ چ كارەسـاتێكت بەسـەردا هێنـاوین، ئـاخ خـودایە ئابڕوومـان چـوو. ڕەسـوڵ یـش هـیلاک و مانـدوو بـوو، لەلایەكـی تـرەوە ئـاخی هەڵدەكێشـا. مـن و چەنـد منداڵێكی تر لەسـەر گوێسەبانەكەوە سەیرماندەكرد و ئاگاداری لێدانەكەی زەری بووین. زەری وردە وردە بەهـۆش خـۆی هـاتەوە، ڕەسـوڵ بەدایكـی گـوت: ئەوەتـا كـچەكەت نەمردووە، هۆشی هاتۆتەوە، ئێستا دووبارە دەڕواتەوە، هاوڕێكەی دەدۆزیتەوە. گەر تۆ ئاگـاداری بوویتـایە هەرگیـز وای بەسـەرنەدەهات و منـیش مانگـاكەم بە (٥٥) تـومەن نەدەفرۆشت. من تێنەگەیشتم چ پەیوەندییەک هەیە لە نێوان نرخـی مانگاكەی ڕەسوڵ و سـكی زەری دا، بـۆچی ڕەسـوڵ مانگـاكەی بە (٥٥) تـومەن فرۆشـتووە. سـوڵتان بە ڕەسوڵی گوت: تۆ بگەڕێوە بۆ گوند، من و عەباس و منداڵەكانی تر چاودێری دەكەین و ئەو سەگبابی بێشەرمەش دەدۆزینەوە و كە سكی ئەم خاوەن مەردایەتیەی پڕكردووە. مەعسومەی (١٧) ساڵەی خوشكی زەری، كە (٤) سـاڵ بـوو شـووی كردبوو، (٢) منداڵی هەبـوو، بـۆ جـاری سـێیەمیش دووگیـان بـوو. لە سـەر لێـواری حەوزەكە دانیشـتبوو، خەریكی شیردان بوو بە منداڵەكەی، گوتی نا نا ئەو فەخری ڕازییە كێیە؟ تا ئێستا زەری چەند جارێک پێیگوتوم من فەخری ڕازیم زۆر خۆشـدەوێت. دایكی گـوتی: منیش نـازانم كێیە؟ بەڵام چەنـد جارێـک لای منـیش باسـیكردووە، هۆنراوەیەكیشـی لەبـارەی فەخـری ڕازییەوە بۆ گوتوم. مەعسومە گوتی: نـا نـا، ڕەنگە ئەو فەخـری ڕازییە ئەوە بێت كە لە مەیدانی باری بچووک دوكانی مریشـک فرۆشتنی هەیە، چونكە چەندین جـار زەری كە

نـاوی فەخـری ڕازی دەهێنـا، باسـی مریشکیشـی دەکـرد. لەوکـاتەدا کە مـن لەسـەر گوێسـەوانەی سـەربانەکەوە سـەیری ئەو هەرایەم دەکـرد، عەبـاس هەر وەکـو شـەمەر بەشیشـێکی سـوورکراوەی کەبـابەوە بەرەو لای زەری ڕایکـرد، کە تـازە هـۆش خـۆی هاتبوەوە و لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا دانیشتبوو، عەباس شیشەکەی چەسپاند بەقاچی زەری دا و زەری یـش هـاواری گەیشـتە ئاسـمان، دووبـارە لەهـۆش خـۆی چـووەوە. شیشەکە هێشتا بەقاچییەوە بوو بۆنچڕوکی قاچە سووتاوەکەی گەیشتە لای ئێمە بۆ سەربان. عەباس هاواریدەکرد: دەی خێرا پێمبڵێت، ئەو قەحبەبـابی بێ شـەرەفە کێیە کە سـکی پڕکردوویـت؟ تـا بچـم سـکی هەڵبـدڕم. مـن و ڕەزا و نۆرسـتە کە لە سـەربانەکە بووین ڕامـانکرد بۆ سـەربانی مـاڵی مەلا نەبـاتی و هاوارمـان کرد فریاکەون زەری‌یـان کوشـت. لێـدانی زەری بەلای ژنـانی گەڕەکەوە زۆر ئاسـایی بـوو، ئیتـر وەک ڕۆژانـی پێشـوو نەدەهـاتنە ماڵیـان، تـا زەری لەبـن دەسـتی براکانی دەربهێنن و نەهـێڵن لێیبـدەن. مەلا نەباتی تەمەن (٦٠) ساڵە ڕایکرد بۆ سـەربانەکەیان و هـاواری لێکردن: کچ کوشـتن کارێکی خراپە و وازی لێبهێنن، خوداش ئەم کـارەی پێ خـۆش نییە. عەباس کە لەسـەر لێواری حەوزەکە دانیشتبوو هۆن هۆن دەگریا و دەیگوت: حەیا و ئابڕوومـان چـوو. مەلا نەباتی بە سوڵتانی گوت: دەرگای ماڵەکە بکەرەوە، قاچی کچەکەت سووتاوە دەبێت بیبەیتە لای دکتـۆر. ڕەسـوڵ هـاواریکرد: هەر ئەوە مـابوو، ئەم عیفـریتە بـبەنە لای دکتـۆر، بەدڵنیـاییەوە بەچەنـد هـۆنراوەیەک دکتـۆریش دەربەدەر دەکـات. ڕەسـوڵ دووبـارە هاواریکرد: من دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ گوند، ئەم ئابڕووچوونە بووە هۆی ئەوەی کە هیچ کەسێک لە گوند مامەڵەم لەگەڵ نەکات، چەند ڕۆژێک لەمەوبەر کە ویستم مانگاکەم بفرۆشم (٥٥) تومەنیان دەدامێ، ئەمڕۆ کەس لە (٤٠) تـومەن زیـاتر نەدامێ، مـن دەڕۆم هەرچیم هەیە دەیفرۆشـم و ئەمشـارەش جێدەهێڵم، ئەگەر ئەم کـچە ببەیتە لای دکتـۆر، خـودا دەیزانـێ خـۆم دەکـوژم، دێـم لێـرە خـوێن دەڕژێـم و پاشـان خۆیشـم دەکـوژم. ئەمجارەش ڕووی کردە عەباسی برا بچووکی و پێیگوت: ئاگاداربە ئەم عیفریتە نەبەنە لای دکتۆر کە ئیتر لە هەموو شاردا حەیاو ئابڕوومان دەچێت. دەرگای حەوشە کرایەوە و مەلا نەبـاتی بە جامێـک شـەکراوەوە چـووە ژوورەوە، چـووە ژوورسـەری زەری بەدبەختەوە. مەلا لەو کاتەدا کە شەکراوەکەی دەکرد بەدەم زەرییەوە دەیگوت: خودای گەورە ئەم کـارانەی پێخـۆش نییە، کە ئێـوە ئەم کـچە داماوەتـان بەم دەردە بـردووە. ڕەسـوڵ گـوتی: تـۆ دراوسـێمانی بـۆی مەپـاڕێرەوە. خوشـکی خۆمـانە و دەمانەوێـت بیکوژین، هـیچ پەیوەنـدییەکی بەتـۆوە نییە. مەلا نەبـاتی گـوتی: ئـای.. ئـای ڕەسـوڵی بێ حەیـا، خـۆ تـۆ فێرخـوازی مـن بوویت، مـن فێری قورئـانم کردیت، ئێسـتا چـۆن لەڕووت

هەڵدێت ئاوا لەبەرامبەر مندا قسە بکەیت.. تۆ زۆر کەریت کە دەتەوێت بڕۆیت بەشوێن فەخری ڕازی دا، بەشوێن مریشک فرۆشێکی بێئاگادا، بگەڕێیت، فەخری ڕازی شاعیرێکی گەورە بوو کە چەند سەد ساڵێک لەمەوبەر کۆچی دوایی کردووە. ئەم کچە بێتاوانە، چەند هۆنراوەیەکی ئەوی لەبەرکردووە، کە ئەم هۆنراوانە هەمووی من پێمگوتوە. عەباس کە تازە سەرەداوێکی دۆزیبوەوە، دەویست بڕوات و بەچەقۆ سکی فەخری ڕازی هەڵبدڕێت و بیکوژێت. عەباس گوتی: دە تۆش مەلا خانم سوێندبخۆ کە فەخری ڕازی شاعیر بووە، سەد ساڵێکە مردووە. مەلا خانم گوتی: بەخودا بەپێغەمبەر، بەقورئان سوێند دەخۆم کە فەخری ڕازی شاعیر بووە و هەروەها لێکدانەوەی قورئانیشی کردووە، و چەند سەد ساڵێکە مردووە. عەباس گوتی: تۆ درۆ دەکەیت. مەلا نەباتی گوتی: لەبەر چی درۆدەکەم؟ عەباس گوتی: لەبەر ئەوە تۆ درۆدەکەیت چونکە سوێندت بە حەزرەتی عەباس نەخوارد و سوێندت بەخودا خوارد. ئیتر مەلا نەباتی هەردوو دەستی بەرزکردەوەو سێ جار گوتی: سوێند بە ئەبو فەزڵی عەباسی، ئەو فەخری ڕازییەی کە تۆ دەتەوێت بچیت سکی هەڵبدڕیت و بیکوژیت، ئێستا ئێسقانەکانیشی نەماوە، ئەو فەخری ڕازییە کە تۆ دەتەوێت بیکوژیت، شاعیر بووە، لێکدەرەوەی قورئان بووە و چەندین هۆنراوەیم بە خوشکەکەی تۆ گوتوە و لەبەریکردوون، چەند بەرگێکی کتێب لە ماڵەکەی مندا هەیە، دەتوانی هەر ئێستا بڕۆی بۆ ماڵەکەم و سەیری کتێبەکان بکەیت، تکایە ئێستا هەڵسن تۆ و براکانت بچن بۆ ماڵی ئێمە سەیری کتێبەکان بکەن تا ئەو کاتە من و ژنانی گەڕەک بابەتی خوشکەکەت دیاری دەکەین. ڕەسوڵ گوتی: من ئێستا دەڕۆمەوە بۆ گوندەکەی خۆمان، بەڵام ئەگەر بیستمەوە کە ئەم عیفریتەتان بردووە بۆ نەخۆشخانە، ئەوا ئەویش دەکوژم و خۆیشم دەکوژم. ئێستا تێگەیشتی ئەگەر بیبەیتە لای دکتۆر خۆم دەیکوژم. عەباس گوتی: دەزانیت بۆچی ناوی هاوڕێکەی ناڵێت؟ چونکە ئەمە کاری تەنها کەسێک نییە، بەڵکو کاری چەند کەسێکە. ڕەسول بە عەباسی گوت: بەسە ئیتر تۆ قسە مەکە، عەباس و ڕەسوڵ پەلاماری یەکتریاندا و دەستیانکرد بەلێدانی یەکتری. عەباس بە ڕەسوڵی گوت: تۆ ماڵ و ژنی خۆتت هەیە هیچ پەیوەندیەکت بەئێمەوە نەماوە و تۆ لە گوند دەژیت و مەیەرەوە بۆ شار و فزولیش مەکە. من هەموو ڕۆژێک لەم کۆڵانانەدا نقومی ئارەق دەبم و سەرم شۆڕدەکەم، هەموو خەڵکی گەڕەک کە من دەبینن ڕوویان وەردەگێڕن، هەر دوێنێ ئەسغەر شومال پێیگوتم: کڵاوەکەت زیاتر بەرزبکەرەوە. ئەم بەیانییەش ئاغا محەمەدی دوکاندار گوتی: ئیتر من هیچتان بەقەرز نادەمێ. تۆ ئێستا لە گوندەوە هاتوویت و قسەی نابەجێ بە من دەڵێیت، تۆ هیچ لەبیری سکی ئەم عیفریتەدا نیت،

تەنها خەفەت لەوە دەخۆیت کە مانگاکەت (١٠) تومەن هەرزانتر فرۆشتووە. دووبارە عەباس پەلاماری زەری نیوە گیانی دایەوە و فڕییدایە ناو حەوزە ئاوەکەوە و گوتی: دەبا لەنێوییبەرم و ڕزگارمان بێت. ئیتر مەلا نەباتی هاواریکرد: منداڵینە خێرا ڕاکەن بەدوای چەند کەسێکدا با هاوکاریمان بکەن. ئێمەش بەخێرایی ڕامانکرد و هاوارمان دەکرد هاوکاری... هاوکاری... تکایە فریاکەون. حسێن ئاغای دراوسێ بەڕاکردن هات و خۆی فڕێدایە ناو حەوزەکە و بەخێرایی زەری دارکاریکراو و قاچ سووتاوی لە حەوزەکە هێنایە دەرەوە. عەباس و ڕەسوڵ بەیەکەوە دەستیانکرد بە گریان و هاواریان دەکرد: ئای چۆن حەیا و ئابڕوومان چوو. مەلا نەباتی گوتی: من پێمگوتن وازبهێنن و هاوار و گریان مەکەن. من و ئەم ژنانە کێشەکە چارەسەر دەکەین، بەڵام ئێوە گوێ بۆ کەس ناگرن. حسێن ئاغای دراوسێ دەستی ڕەسوڵی گرت و گوتی: ڕەسوڵ ئاغا تۆ بڕۆرەوە بۆ گوند و بچۆرەوە بۆ سەر کار و پیشەی خۆت. ئێمە و هەموو دراوسێکان ئاگاداری عەباس دەبین. ڕەسول سەری نا بەشانی حسێن ئاغاوە و دەگریا و دەیگوت: حەیامان چوو، ئێستا من چی لەم بێ نامووسە بکەم. حسێن ئاغا گوتی: ڕەسول وازبێنە خۆت ناڕەحەت مەکە، دڵنیابە لەم دنیایەدا لە هەر (١٠) کەسێک یەکێکیان حەرام زادەیە، بەڵام هیچ کەس نازانێت! چونکە کەس بە سۆراخیانەوە نەچووە، ئێوە هەر بۆ خۆتان ئابڕووی خۆتان دەبەن. کە ئەم کچە ناوی هاوڕێکەی ناڵێت بیبەنە شوێنێکی تر تا منداڵەکەی لێدەبێتەوە، ئەوسا منداڵەکە لەسەر ڕێگایەک فڕێبدەن. عەباس هات و دەستی ڕەسوڵی گرت گوتی: براکەم من زۆر خەجاڵەتم.. من شێت بووم، نەدەبوایە شەڕ لەگەڵ تۆ بکەم. ئەملاولای یەکتریان ماچکرد و ڕەسوڵ لە ماڵ ڕۆیشتە دەرەوە.

من پاش (٢) ساڵ ڕەسوڵم بینییەوە. ڕەسوڵ دوای ئەوەی ڕۆیشتەوە بۆ گوند هەرچی شتێک کە هەی بوو، فرۆشتی و یەزدی بەجێهێشت و ڕۆیشت بۆ ئەهواز و لەوێ نیشتەجێ بوو. تا ساڵی (١٣٨٧-٢٠٠٨) هەر لەوێ کۆچیدوایی کرد. هەموو ڕۆژێک کەسێکیان زەری دارکاریی دەکرد، ڕۆژانە خاڵەکانیشی دەهاتن و لێیاندەدا، یان براکانی دەهاتن و فەلاقەیان دەکرد.

زەرییش ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەنگی زەردتر دەبوو، سکی گەورەتر دەبوو، ژنان چەندین جۆر دەرمانیان دروستکرد و دەیاندایە تاکو بیخوات و منداڵەکە لە سکیدا بمرێت. بەڵام بەپێچەوانەوە تا دەهات سکی زیاتر بەرزتر دەبووەوە. ڕۆژێک لە ماڵەوە بووم گوێم لە هاوار هاواری زەری بوو، خێرا ڕامکردە سەربان، سەیرمکرد زەری لە حەوشەکەدا خەریکە دەڕشێتەوە و دەیگوت: دایە جەرگم سووتا، وا سووتام، هەموو گیانم ئاگری تێبەربووە، ئەم دەرمانەی داتان بە من لە شیشە سورەکراوەکەی عەباس خراپتر بوو،

وای دایە گیان وا مردم. دایکیشی دەیگوت: هەر کەسێک ڕوو لە خراپە بکات و بیر لە ئابڕووی کەسوکاری نەکاتەوە دەبێت بسووتێت. جگە لە سوڵتان و زەری کەسێکی تر لەوێ نەبوو. منیش ڕامکرد بۆ لای مەلا نەباتی گوتم: زەری خەریکە دەمرێت. مەلا گوتی: دیسان چی بووە؟ گوتم: نازانم! مەلا بە خێرایی هاتە سەربانەکە و گوتی: سوڵتان دەتەوێت چی بکەیت؟ سوڵتان گوتی: پیرێژنێک دەرمانی داومەتێ و پێیگوتم ئەگەر ئەم دەرمانە بخوات منداڵەکەی لەباردەچێت. منیش دەرمانەکەم دەرخواردا و ئاوای بەسەرهات کە دەیبینیت. مەلا نەباتی گوتی: ئەم منداڵە لانیکەم (٧) مانگە، ئەگەر لەباربچووایە بەم هەموو لێدان و تێهەڵدانە لەباردەچوو. مەلا نەباتی لە پلیکانەکان ڕۆیشتە خوارەوە بۆ حەشەکە و منیش دوابەدوای ئەو ڕۆیشتم. زەری ڕەنگی تەواو زەردببوو. منیش لە تەنیشت زەرییەوە دانیشتم، مەلا نەباتی گوتی: کوا ئەو دەرمانەم پیشانبدە با سەیری بکەم. سوڵتان دەرمانەکەی بۆ هێنا و گوتی: پیرێژنەکە گوتویەتی ئەم دەرمانە سێ ڕۆژ لە پێستی سەری بدەن و هەندێکیشی تێکەڵی ئاو بکەن و بیخواتەوە، ئێستا کە دەرمانەکەم داوەتێ حاڵی زۆر خراپ بووە. مەلا نەباتی گوتی: ئەم دەرمانە خەڵک دەکوژێت. ئێستا دەبێت وابکەین کە بڕشێتەوە. ئنجا پەنجەی بە قورگی زەری دا کرد و زەری دەستیکرد بە ڕشانەوە. دواتر مەلا نەباتی گوتی: وەرە با بیبەینە نەخۆشخانە. سوڵتان گوتی: ئەگەر بیبەین ئەوا خوێن دەڕژێت و عەباس هەموومان دەکوژێت. ئیتر مەلا نەباتی ڕوویکردە من و گوتی: حسێن تۆ زەریت خۆشدەوێت؟ گوتم: زۆر زۆر. گوتی: دە بڕۆ بۆ لای حەمامەکە لەوێ شیرفرۆشی لێیە و هەندێک شیر بکڕە و خێرا وەرەوە. دایکی زەری قاپێکی دامێ و ڕۆیشتم بۆ بەردەمی حەمامەکە. لە ژنێکم پرسی شیرتان هەیە؟ گوتی: ئەمڕۆ مانگاکانمان شیریان کەم بوو، ئەوەی کە هەشە بەشی منداڵەکانە و نایفرۆشین.. گوتم: بیکە بۆ خاتری خودا هەرچی شیرە کە هەتانە بیدە بە من. چونکە پیرێژەنێکی گەڕۆک دەرمانێکی داوە بە زەری سوڵتان و زەری خەریکە دەمرێت، مەلا نەباتی ناردوومی بۆ لای تۆ شیری بۆ بکڕم. ژنەکەش گوتی: ئەی بەستەزمان کچی داماو. پاشان قاپەکەی پڕ کرد لە شیر و منیش (٣) ڕیاڵم پێدا. بەخێرایی گەڕامەوە. ئەو سەردەمە تەنها لە حەمامەکاندا شیر هەبوو، چونکە بەهۆی مانگاکانەوە ئاویان لە بیرەکان دەردەهێنا بۆ حەمامەکە و سوودیان لە شیرەکەشی وەردەگرت. ماستیان لە گوندەکانەوە دەهێنا بەڵام شیر لە گوندەکانەوە نەدەیشتە شار چونکە تێکدەچوو.

مەلا نەباتی بەزۆر شیرەکەی کرد بە قورگی زەری دا، زەری هێڵنجیدا و دووبارە دەستیکرد بە ڕشانەوە، دووبارە شیری کردەوە بە قورگیدا و دیسانەوە پەنجەی

کـردەوە بە قورگیـدا، چەنـد جـارێکی تـریش ئەم کـارەی کـرد، زەری بـێ جـووڵە لە حەوشــەکەدا کەوتبــوو، دەرەلنگــی هەڵــدرابوەوە و هەردوو قــولەپێی دەرکەوتبــوو کە شوێنەواری داخکردنەکەی پێوە دیاربوو. مەلا نەباتی گوتی: بۆچی قاچی وا سووتاوە؟ سوڵتان گوتی: هەموو ڕۆژێک عەباس دەیهێنێتە حەوشـەوە و دەستدەکات بە لێدان و داخکردنی تا ناوی ئەو کەسـەی پێبڵێت کە وای لێکردووە. بەلام ئەم بێناموسـە ناوەکە ناڵێت. مەلا نەباتی گوتی: ئێوە ئەم کچە داماوەتان نەبردوە بۆ نەخۆشخانە. حەوت مانگە هەر لێیدەدەن. سوڵتان گوتی: ڕەسوڵ گوتویەتی ئەگەر بیبەن بۆ نەخۆشـخانە بەدەسـتی خۆی دەیکوژێت و پاشان خۆیشی دەکوژێت. مەلا نەباتی گوتی: ڕەسوڵ بە (٥) منداڵەوە ئەگەر خۆی بکوشتایە تا ئێستا خۆی کوشتبوو. سـوڵتان گوتی: براکانی و خاڵەکانی و مێردی خوشکەکانی هەموویان ڕێگەنادەن بیبەن بۆ نەخۆشـخانە. مەلا گـوتی: ئێوە زۆر هەڵەن، مـن دەچـم دکتـۆر دەهێـنم. سـوڵتان گـوتی: وا نەکەی بەخـودا خـوێن دەڕژێـت. بەخودا ئەم شەمەرانە زەری دەکوژن، پێرێ خاڵی هات تا توانی لە زەری دا و گوتی من (١٥) ساڵە بەردەوام دەچمە پرسە و کەسێکی دیارم، بەڵام بەهۆی تووە ئابڕووم چووە. مەلا نەبـاتی سـەری بە سـکی زەرییەوە نـا و پاشـان گـوتی: حسـێن تـۆ بـڕۆرە دەرەوە. منیش ڕۆیشتم و گوێم لێبوو مەلا نەباتی گوتی: سـوڵتان مـن سـوێند دەخـۆم بە خودای گەورە کە ئەمە منداڵ نییە، ئەگەر منداڵیش بێت مـردووە، ئێسـتاش کەسـێک نییە زەری ببەین بۆ نەخۆشخانە؟ لەم کاتەدا عەلی ڕەزای بـرای زەری، هـاواریکرد: دەتانەوێت ئەم عیفریتە ببەنە نەخۆشخانە؟ ئەوا من سکی هەڵدەدەڕم و ... مەلا نەبـاتی گـوتی: بـڕۆ ئێتـر هەڵە نەکەیت. عەلـی ڕەزا گـوتی: ئەوا دەڕۆم بـانگی عەبـاس دەکەم.. و ڕۆیشـتە دەرەوە. بەهەرحـاڵ کەسـێک نەبوو زەری ببـات بـۆ نەخۆشـخانە. پـاش دوومانـگ هـاوار و دەنـگە دەنـگەکە کەم بـوەوە. عەبـاس زەری لە ژێـرزەمینەکەدا زینـدانی کردبـوو، هەر لەوێـش لێیدەدا. ڕۆژێـک کـاتی خۆرئـاوابوون گوێمـان لە دەنگـی هـاوار هـاواری سـوڵتان بـوو کە دەیگوت: ئەی هاوار کچەکەم مرد. ژنەکان ڕایانکرد و دایکم بە چەند ژنێکی تـری گـوت: ئەو کچە داماوەیان کوشت. عەلی ڕەزا ڕۆیشتبوو عەباسـی ئاگادار کردبـوەوە کە زەری مرد. ژنـانی دراوسـێ هەموویـان چوونە ژێرزمینەکەی مـاڵی سـوڵتان، منـیش چـووم. کە سـەیرمکرد، زەری لەوێ لاواز و بێهێـز کەوتـووە. عەبــاس هــات و هــاواریکرد: ئەو قەرەباڵغییە چییە؟ زەری مرد. هەر لەو کاتەدا بیبی زەینەب دایە گەورەی زەری هـات کە پیرێژنێکی (٨٠) ساڵە و ئازاو زیرەک بوو، بەهەموو هێزی خۆی زللـەیەکی لە عەبـاس دا و گوتی: کەری بێ ئەقڵ چوار مانگ لەمەوبەر بەتۆم گوت ئەم کچە منداڵی لە سکدا نییە، مەلا نەبـاتیش گـوتی لەم سـکەدا منـداڵ نیـیە، بیـبەن بـۆ نەخۆخشـانە، ئێـوەی پیـاوی

حەسوود و بێ عەقڵ، لەبری ئەوەی ئەم کچەتان ببردایە بۆ لای دکتۆرێک کەچی هەموو ڕۆژێک هەر لێیدەدەن. دایە زەینەب بەتووڕەییەوە گوتی: ئەمە چ جۆرە منداڵێکە کە وا ئێستا (١٢) مانگە نەهاتۆتە دنیاوە. ئەی تۆ هەی زڵلەی نالەبار لەگەڵ ئەم خاڵە گەمژەیەت کە لە هەموو کەس گەمژە ترە. ناهێڵن ئەم کچە ببنە نەخۆشخانە یا دکتۆرێکی بۆ بهێنن. بە بڵاوبوونەوەی هەواڵی مردنی زەری پیاوانی گەڕەک و چەند پیاوێکی تر هاتنە ژێر زەمینەکە. نەنە زەینەب عەباکەی لە خۆی ئاڵاند و گوتی: ئەی پیاوانی گەڕەک پێش لەم مێشک کەرە بگرن، تا ئەم کچە ببەنە نەخۆشخانە. عەباس خەریکبوو قسە بکات بەڵام مەعسومەی ژنی قاسم خێرا خێرا تاکە پێڵاوەکەی بەسەریدا دەکێشا و گوتی: هەی کەر، بێدەنگبە. پاشان ژنان زەرییان لە ژێرزەمینەکە هێنایە دەرەوە بۆ حەوشەکە و ئاغا ڕەجەبی شوفێر ئۆتۆمبێلەکەی هێنا و نەنە زەینەب، زەری فڕاند بۆ نەخۆشخانە.

زەری لە نەخۆشخانە بە زوویی نەشتەرگەریی بۆکرا، گرێیەکیان لە سکی دەرهێنا کە کێشەکەی نزیکەی (٩) کیلۆ و نیو بوو. منیش گرێکەم بینی خستبویانە نێو شووشەیەکی گەورەوە. زەری نزیکەی (٤٠) ڕۆژ لە نەخۆشخانە کەوت، من (٧-٨) جار چووم بۆ سەردانی. جارێکیان دەستی گرتم گوتی: تۆ دەزانی لەم ماوە دوور و درێژەدا شەمس تەنها جارێک لە هەواڵی منی نەپرسی؟ زەری گوتی: منداڵی دەوڵەمەندەکان هەموو هەر بەم شێوەیەن، ئەوان هەر خەریکی کەیفی خۆیانن، و ئێمەیان تەنها بۆ خزمەتکاری دەوێت. دواتر زەری گوتی: خەڵکیی لەبارەی منەوە چی دەڵێن؟ گوتم: بیبی سەکینەی دراوسێ کە هاتبوو بۆ خوازبێنی تۆ بۆ ئەو کوڕە کرێکارەکەی، تۆش گوتبووت شووی پێناکەم، لە هەموو کەسێک زیاتر بەخراپە باسی تۆی دەکرد. بەڵام ئێستا دەڵێت خودای گەورە لە گوناحەکانم خۆشببە، من هەڵەم کرد. هەموو ژنانی گەڕەک بۆ بینینی گرێکە و سەردانی زەری چوون بۆ نەخۆشخانە. زەری دوای (٤٠) ڕۆژ گەڕایەوە بۆماڵەوە، حاڵی باشترببوو. وردە وردە من تەمەنم بوو بە (١٢) ساڵ و زەرییش تەمەنی (١٦) ساڵ بوو، هەندێک ڕۆژ سەردانی زەریم دەکرد، زەرییش پێیگوتم: حسێن هەرچیت دەوێت لەبارەی دارشتن و حافز و سەعدی و مەلەوی و فەخری ڕازی و سائیبی تەوریزی پێتدەڵێم، بەڵام تۆش وانەی ژمارەم فێربکە. منیش ئەوسا لە پۆلی پێنج بووم، وانەی ژمارەم فێری زەری دەکرد. زۆر سەیر بوو لە ماوەیەکی کەمی (٢-٣) مانگیدا وایلێهات ئەو ژمارە و ئەندازەی بە من دەگوت. زەری لە ماوەی (٧-٨) مانگدا هەموو کتێبەکانی پۆلەکانی سەرەتایی خوێند. دەیویست ناوی خۆی بنووسێت بۆ تاقیکردنەوەی دەرەکی پۆلی شەشی سەرەتایی. دیسانەوە کێشە و

ئـاڵۆزیی لە ماڵەوەیـان دەسـتیپێکردوە. عەبـاس تـوڕە بـوو هـاواری دەکـرد: ئەم کـچە دەیەوێت حەیا و ئـابڕووی ئێمە بەرێت. عەلی ڕەزای براشـی کە گەورە ببوو دەیگوت: من برای زەریـم و دەبێت مۆڵەت لە من وەربگرێت. عەلـی ڕەزا لە پۆلی پێنج وازی لە قوتابخـانە هێنـا بـوو، ببووە شـاگردی بەرگدروو. دەیگـوت: ئەم کـچە دەیەوێت لە مـن پێشکەوتووتر بێت، بۆیە منیش ناهێڵم.

تەنها مـاوەی دوو ڕۆژ مـابوو بۆ ناونووسـینی تـاقیکردنەوەی دەرەکی. بەڵام هێشتا زەری نـاوی خـۆی نەنووسـی بـوو. مـن چـووم بۆ ماڵیـان تـا چەنـد پرسـیارێکی لێبکەم لەبـارەی وانەکـانمەوە، کە چـووم عەباسـی بـرای لە بەردەرگـاکەدا وەسـتابوو، گـوتی: حسـێن بۆ کوێ دەچیت؟ گـوتم: دەچـم بـۆ لای زەری بـۆ چەنـد پرسـیارێکی وانەکـانم. ئەویش گوتی: ئیتر تۆ گەورەبوویت، نابێت بێیت بۆ مـاڵی ئێمە. هاوکـات زەری لە پشـتی عەباسەوە چاوی لە من بوو، ئاماژەی بۆ کردم کە بچمە سەربان. گوتم: بەسەرچاو ئیتر نـایەم. منـیش بەردەرگـاکەم بەجێهشـت و لەلایەکـی تـرەوە چـووم بـۆ سـەربان، پاشـان زەریـش هـات. زەری گـوتی: حسـێن تـۆ دەزانیـت مـاڵی دایە گەورەم، بیبـی زەینـەب لە کوێیە؟ گوتم: بەڵێ دەزانم. گوتی: بەقوربـانتبم خێرا بـڕۆ بـۆ ماڵیـان بڵـێ زەری کـاری پەلەی پێـت هەیە، هەر ئێسـتا بێـت بـۆ لام، دەبێـت هاوکـاریم بکـات بـۆ ناونووسـینم لە قوتابخـانە، چـونکە کـات درەنگە و تەنهـا دوو ڕۆژی مـاوە. منـیش بەخێرایـی ڕۆیشـتم و خـۆم گەیانـدە مـاڵی بیبـی زەینـەب. کـات ئێـوارەیەکی درەنـگ وەخـتە بـوو، کە چـوومە حەوشەوە، حەوشـەکەیان تـازە شـۆردرابوو، گوڵەکـان ئـاوپڕژێن کرابوون، زۆر جـوان و گەشـاوە بـوون، قەرەوێڵەیەکـی گەورە دانرابـوو، لەسـەر قەرەوێـڵەکەش فەرشـێک ڕاخرابوو، لەسـەر فەرشـەکەش دۆشـەکێک ڕاخـرا بـوو، بیبـی زەینـەب لەسـەر دۆشـەکەکە دانیشـتبوو، شـانی لەسـەر سـەرینەکەدا دادابـوو. کراسـێکی سـپی خـاوێنی گـوڵ سـووری لەبەردا بوو. قژی شـانە کردبوو، کەمێـک ئارایشـتی کردبـوو، هەر لە ژنێکـی (٥٠) سـاڵەی گەڕەکـی ئێمە دەچـوو. سـینییەکی گەورەی لەبەردەمـدا بـوو، کە جۆرەهـا میـوەی لەسـەر بـوو. ژنێکیـش لەولایەوە دانیشـتبوو، بیبـی زەینـەب لێیپرسـیم: حسـێن خێـرە.. چـۆنە بەم ئێوارەیە هاتوویت؟ گوتم: دایکم چێشتی خێری دروستکردووە، هـاتووم بەشـوێنتا، دایکـم گوتی، دەبێت بیبی زەینەب بهێنیت. بیبی زانی کە درۆ دەکەم، بە ژنەکەی تەنیشتی گـوت ئەو منداڵە زۆر هیلاک بووە بڕۆ پەرداخێک شـەربەتی بۆ بهێنە، کە ژنەکە ڕۆیشـت بیبـی زەینەب گـوتی: حسـێن چـی ڕوویـداوە؟ گـوتم: زەری گـوتویەتی دەبێـت هەر ئێسـتا بێـت، گوتی چی بووە؟ دووبارە لێی دەدەنەوە؟ گوتم: نەخێر، دەیەوێـت نـاوی خـۆی بنووسـێت بۆ تاقیکردنەوەی دەرەکی پۆلی شەشی سەرەتایی، بەڵام دایکی و عەبـاس و عەلـی ڕەزا

ڕێگـای پێنـادەن. بیبـی زەیـنەب گـوتی: بە زەری بڵـێ دووسـبەی دێـم. گـوتم: بیبـی، ناونووسـین هەر سـبەینێی مـاوە تەواو دەبێـت، تکـایە هەر ئێسـتا وەرە. بیبـی گـوتی: نەوەکەم لەسەر کۆڵانەکە بوو؟ گوتم: لەوێ بوو. گوتی: برۆ پێیبڵێ با خێرا ئۆتۆمبێلێکم بۆ بهێنێت. گوتم: خۆم دەچم ئۆتۆمبێل دەهێنم. گوتی: هەی ئـافەرین چەنـد منـداڵێکی زیرەکیت. ڕۆیشتم ئۆتۆمبێلم هێنا و بەڕێکەوتین. بیبی لە ڕێگا گوتی: حسێن تۆ گەورە بوویت و هەموو شتێک دەزانیت ئەمە حەسوودیە هەیانە، عەباس نەخوێندەوارە، عەلی ڕەزاش لە پۆلی پێنجەوە وازی لە خوێندن هێناوە و ئێستا شـاگردی بەرگدرووە، ئەمـانە پێیان ناخۆشە کە خوشکەکەیان بچێتە قوتابخانە. بیبی زەینەب گوتی: بۆ هەمـوو کەسـە باشەکان کەسێکی خراپ پەیدا دەبێت، جا چەقۆکێش بێت، یـا بەخیل و حەسـود یـا دز و پیاوکوژ... خودای گەورە تۆ گرفتاری ئەم جۆرە کەسانە نەکات. بیبی زەینەب ئەو شەوە لە مـاڵی سـوڵتان مـایەوە، بەیـانی چـوو بـۆ بەڕێـوەبەرایەتی پەروەردە و نـاوی زەریی نووسی. عەلی ڕەزا و عەباس گوتبویان ئێمە ناهێڵین زەری بچێت بۆ تـاقیکردنەوە. بیبی زەینەبیش گوتبووی، زۆر هەڵەدەکەن، بۆ سبەینێ کە کوڕە خاڵەکەشـیان هـات بەشـوێن دایەگەورەیــدا، ئەویــش پشــتگیری عەلــی ڕەزا و عەباســی دەکــرد. زەری لەگەڵ دایەگەورەیدا ڕۆیشت بۆماڵی ئەوان تا لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا لە مـاڵی ئەوان بێت. بۆ سبەینێ سوڵتانم بینی پێیگوتم: دایەگەورەم زەری بردووە بۆماڵی خۆیان، چەند کتێبێکی بیرچووە لەگەڵ خۆیدا بیانبـات بە عەلی ڕەزام گوتـووە نەیبـرد بـۆی، تـۆ دەتوانیت بـۆی بەریت. منیش کتێبەکانم لێوەرگرت و ڕۆیشتم، کتێبەکانی ماتماتیک، ئەندازە، جوگرافیـا و مێژووی پۆلی پێنج بوون، زەری پێویسـتی بەکتێبەکـان نەبـوو، هەموویـانی خوێندبووەوە، خۆیشم دەمزانی هیچ کاری بەکتێبەکان نییە، بەڵام حەزمدەکرد چاوم بە زەری بکەوێت. کاتێک کتێبەکانم دا بەزەری پێکەنی و گوتی: حەزت دەکرد بێیت و مـن ببینیت؟ گـوتم: بەڵـی.. پاشـان گـوتم: زەری قاچەکانـت چـاک بوونەوە؟ زەری قاچەکـانی باشـتر ببـوون، کاتێـک ئاڵئـاوایيم لێکـرد لەگەڵمـدا هـاتە دەرەوە. لە ڕارەوەکەدا گـوتی: حسـێن دەتەوێـت قاچەکـانم ببینیت؟ بەبێئەوەی مـن وەڵام بـدەمەوە دەرەلنگـی تـا ئەژنـۆی هەڵکـرد، هەمـو بەلەک و قاچی شوێن سووتاوی بوو.

شوێنی داخکردنی شیشـە کەبابەکـان، جـوان دیـاربوون، بەڵام هێشـتا قاچەکـانی زۆر جوان بوون، هەر حەزت دەکرد سەیریان بکەیت. زەری لە تاقیکردنەوەی پۆلی شەشـەم بەیەکەم دەرچـوو. پـاش ئەوەی کە پـۆلی شەشــەمی تەواوکـرد، چەنــدین کەس هــاتن بۆداوای بەڵام ئەو قبـوڵی نەکرد و گـوتی: شـووناکەم. سـاڵ و نیوێـک دوای ئەوە زەری تاقیکردنەوەی دەرەکی تری دا و پۆلی شەشەمی ئامادەیی تەواوکرد، پێش مـن کەوتەوە،

## شازادەی حه مام

من ئەو کاتە لە پۆلی (١٠) بووم، ئەو چووە پۆلی (١٢). کاتێک تەمەنی (١٩) ساڵ بوو، بە بەردەوامی لە ماڵی دایە گەورە بوو، منیش جار جارێک دەچووم بۆ سەردانی. گەورەش ببووم، تەمەنم (١٥) ساڵ بوو، ئیتر تێگەیشتم کە نابێت بڕۆم بۆ سەردانی. چەند جارێک جوابی بۆ دەناردم کە سەردانی بکەم و منیش دەچوومە سەردانی و کتێبم بۆ وەردەگرت و بۆم دەبرد. زەری زیاتر حەزی لە کتێبی پزیشکیی بوو. بیبی زەینەب تەمەنی (٨٦) ساڵ بوو، کە زەری ساڵی (١٣٤٤-١٩٦٥) نامەی پێشکەش بە زانکۆ کرد و لە کۆلێژی پزیشکیی وەرگیرا. ئەو ساڵە لە هەموو شاری یەزددا تەنها دوو یا سێ کەس لە کۆلێژی پزیشکیی وەرگیران. ئێستا عەباس خێزاندارە و دوو منداڵی هەیە، عەلی ڕەزاش لە تەمەنی (١٧) ساڵیدا دەیویست ژن بهێنێت. خوشکە بچکۆلەکەشیان شووی کردووە. دایکی بە زەری گوت: من پارەم نییە تاکو تۆ بچیت لە شیراز بخوێنیت. عەباس یش گوتبووی: تۆ بۆچی دەچیت بۆ شیراز، ئەم کارەی تۆ بێهودەیە. کوڕە خاڵەکەشی گوتبووی: ئەم جارە خۆم پێشی پێدەگرم و ناهێڵم بڕوات. بیبی زینەبیش گوتبووی ئێوەی پیاوانی بێ مێشک (٣) هەزار ساڵە نەتانهێشتووە ئێمەی ژنان بگەینە شوێنێک، ئێستا کە دەوڵەت دەڵێت ژنان دەتوانن بچن بۆ زانکۆ. منیش کە تەمەنم (٨٦) ساڵە دەچم بۆ زانکۆ و لەوێ دەخوێنم. دەتوانم لە هەڵبژاردنەکانیشدا دەنگبدەم، هەمیشە نزای خێریش بۆ کەسێک دەکەم کە زانکۆی بۆ ئێمە بنیاتناوە، مەسرەفی زەریش هەمووی خۆم دەیدەم، تا زانکۆ تەواو دەکات. لەم کات و ساتەدا بیبی زەینەب، چەند ڕۆژێک ون بوو، هەموولایەک بەشوێنیدا دەگەڕان. منیش بە بەهانەی ونبوونی بیبی زینەب، ویستم بڕۆم هەواڵی زەری بپرسم، کە سەیرمکرد زەری بۆ ونبوونی دایە گەورەی هیچ نارەحەت نییە. ئەو زانی من بیر لە چی دەکەمەوە. گوتی: حسێن تۆ هەمیشە نهێنی پارێزی من بوویت، بیبی چووە بۆ (ئەردەکان) بۆئەوەی پارچەیەک زەوی بفرۆشێت و پارەی خوێندنی من بدات. پاش پێنج ڕۆژ بیبی پەیدابوەوە کە هاتەوە گوتی: چووم بۆ سەردانی ئیمام زادەی (بنافت)، لەوێ خێریان کردبوو. بیبی زەینەب بە هێواشی (٨٨) هەزار تومەن پارەی دا بە زەری، ئەم باسە زەری خۆی بۆی باسکردم. بیبی بە زەری گوتبوو تۆ کەسێکی زۆر ژیریت، بەم پارەیە هەم خوێندنەکەت تەواو بکە و هەم کارێکی وابکە پارەکە چەند بەرامبەر زیاد بێت. نرخی (٨٨) هەزار تومەنی ساڵی (١٣٤٤-١٩٦٥) لانیکەم دەیکردە (١٢٠) ملیۆن تومەنی ساڵی (١٣٨٢-٢٠٠٣). زەری ڕۆیشت بۆ شیراز، لە ساڵی یەکەمدا پێنج نامەی بۆمن نارد، کە تاکو ئێستاش ئەو نامانەم لای خۆم پاراستووە. لە نەورۆزیشدا زەری نەهاتەوە بۆ یەزد، بەڵام بیبی زەینەب چوو بۆ شیراز بۆلای. هاوینیش (١٠) ڕۆژ زیاتر لە یەزد نەبوو، کاتێک چاوم پێیکەوت، گوتی: لە شیراز

خانوویه‌کی (٣٥٠) مه‌تری چوار ژووریم کڕیوه به (٤٢) هه‌زار تومه‌ن، دوو ژووریان به‌ده‌ست خۆمه‌وه‌یه و دوو ژووره‌که‌ی تریشم داوه به کرێ به خوێندکارانی پۆله‌که‌ی خۆم، به پاشماوه‌ی پاره‌که‌ش سێ دوکانم کڕیوه و ئه‌وانیشم داوه به‌کرێ. ژیانم زۆر خۆش ده‌گوزه‌رێت و ئه‌مساڵ یه‌که‌م بووم، هه‌ر بۆیه‌ش له زانکۆ پاره‌شم پێده‌ده‌ن، ئه‌گه‌ر حه‌زت کرد بێیته شیراز من ژوورێکت ده‌ده‌مێ. زه‌ری ساڵی سێیه‌می زانکۆی ته‌واو کردبوو که من له زانکۆی مه‌شهه‌د وه‌رگیرام، نه‌نه زه‌ینه‌ب له ته‌مه‌نی (٩٠) ساڵیدا مرد، زه‌ریش هاته‌وه بۆ یه‌زد، ویستم بۆ خوێندن بڕۆم بۆ مه‌شهه‌د، زه‌ری ته‌نها که‌سێک بوو، که ده‌گریا بۆ کۆچی نه‌نه زه‌ینه‌ب. زه‌ری گوتی: دایه گه‌وره‌م مانگێک پێش ئێستا ته‌له‌فۆنی بۆ کردوم گوتویه‌تی جانتایه‌کم بۆ تۆ خستوته ناو (که‌نوو)ه‌که‌وه له پشتی خانووه‌که، له ته‌نیشت باران گیره‌که. زه‌ری گوتی: ده‌توانیت بچیت بۆم بهێنیت؟ منیش چوومه پشتی سه‌ربانه‌که‌ی ماڵی بیبی زینه‌ب که‌نووه‌که‌م دۆزییه‌وه، چوومه ناوکه‌نووه‌که‌وه، جانتایه‌کی تێدابوو هه‌ڵمگرت، زۆر جانتاکه قورس بوو کاتێک ویستم بۆی به‌رم له خانووه‌که‌دا، کوره خاڵه‌که‌ی زه‌ری نه‌وه‌ی بیبی زه‌ینه‌ب که ته‌مه‌نی (١٠-١٢) ساڵان بوو، ئه‌ویش ده‌چووه ژووره‌وه، زه‌ری به ئاماژه تێیگه‌یاندم، که جانتاکه ببمه ماڵی خۆمان. زه‌ری شه‌و هات بۆ ماڵمان و هه‌ر له‌وێ جانتاکه‌م دایه‌ده‌ستی. ئه‌ویش جانتاکه‌ی کرده‌وه، کاتێک سه‌یرمانکرد نزیکه‌ی (٥) کیلۆ ئاڵتوونی تێدابوو، له‌گه‌ڵ نامه‌یه‌کدا که بیبی زه‌ینه‌ب بۆ زه‌ری نووسیبوو، -ده‌قی نامه‌که-: "زه‌ری خۆشه‌ویستم، من (٧٣) منداڵ و نه‌وه‌م هه‌ن، هه‌موویان نه‌خوێنده‌وارن، ته‌نانه‌ت هه‌ندێکیان مه‌یخۆر و تلیاکخۆر و ژنبازن. ئه‌م ئاڵتوونانه‌م پێشکه‌شی تۆ کردووه، به‌و هیوایه‌ی بتوانیت به‌م ئاڵتوونه خوێندنه‌که‌ت ته‌واوبکه‌یت و ئه‌گه‌ر ڕۆژێک ده‌وڵه‌مه‌ند بوویت، تکات لێده‌که‌م ده‌رمانگه‌یه‌ک بۆ هه‌ژاران بکه‌ره‌وه". پاشان زه‌ری گوتی: با ئه‌م جانتایه لای تۆ بێت تا ئه‌و ڕۆژه‌ی ده‌ڕۆمه‌وه بۆ شیراز، ئه‌و کاته دێم لێتوه‌رده‌گرم. پاش سێ ڕۆژ زه‌ری هاته‌وه گوتی: حسێن وه‌ره له‌گه‌ڵم با به‌یه‌که‌وه بڕۆین بۆ شیراز. گوتم: من ده‌بێت بچم بۆ مه‌شهه‌د. گوتی: ئێ باشه له شیرازه‌وه بڕۆ بۆ مه‌شهه‌د، خۆ زانکۆ تا ڕۆژی (١٠ی مهر – ١ی تشرینی یه‌که‌م) ناکرێته‌وه. گوتم: ئاخر پاره‌م نییه. گوتی: تۆ میوانی منیت، من به‌م هه‌موو ئاڵتوونه‌وه چۆن به‌ته‌نیا بڕۆم بۆ شیراز؟ بۆ سبه‌ی به‌یانی، چووینه گه‌راج و سواربووین بۆ شیراز. شوفێره‌که ناوی ئه‌کبه‌ر ئاغا بوو، منی باش ده‌ناسی و له ڕێگا زۆری ڕێز لێگرتین. زه‌ری له ڕێگا پێیڕاگه‌یاندم که یه‌کێک له مامۆستاکانی زانکۆی شیراز خوازبێنی لێکردووه، و پێشی باشه که شووی پێبکات. کاتێک گه‌یشتینه شیراز منی برد بۆ زانکۆی شیراز و ئه‌و مامۆستا ئه‌مریکاییه‌ی پیشاندام. پاش چه‌ند

ڕۆژێک لە شیرازەوە ڕۆیشتم بۆ مەشهەد. کاتێک من لیسانس (بکالۆریۆس)م وەرگرت، زەری دکتۆرای پزیشکیی وەرگرتبوو. لە ساڵی شەشەمی کۆلێژی پزیشکیی شووی بەو مامۆستا ئەمریکییە کرد. جار جار نامەمان بۆ یەکتری دەنارد. لەکاتی خزمەتی سەربازییمدا دوو مانگ لە شیراز بووم هەموو هەفتەیەک چاوم بە زەری و هاوسەرەکەی دەکەوت. پاش دوو مانگ لە مەشقی فێربوونی سەربازیی لە پاریگای باخی تەختی شیرازەوە گەڕامەوە مەشهەد. من سەربازییەکەم لە زانکۆی مەشهەد تەواوکرد. زەری بۆ زیارەت هات بۆ مەشهەد پاشان لەگەڵ هاوسەرەکەی ڕۆیشت بۆ ئەمریکا.

زەری لە ئەمریکا، بڕوانامەی لەسەر شیکاریی خوێن وەرگرت بە پلەی باڵا. من بۆ تەواوکردنی خوێندن لە پاریس بووم کە زەری سەرۆکی بەشی خوێن بوو لە (زانکۆی ماساچوست) ی ئەمریکایی. نامەم بۆ نووسی کە من لە پاریسم، ساڵی دواتر لەگەڵ هاوسەر و دوو منداڵی هاتنە پاریس و چەند ڕۆژێک بەیەکەوە بووین. منیان بۆ ئەمریکا بانگهێشتکرد، بەڵام نەمتوانی بچم. زەری بەپارەکانی دایە گەورەی و تێکۆشانی خۆی دەوڵەمەند ببوو. لە ساڵی (١٣٨١-٢٠٠٢) دا نامەی بۆ ناردم، کە تەمەنی ببووە (٦٠) ساڵ، خەریکی لێکۆڵینەوەیەکی گەورە بوو لەسەر ئایدز و نەخۆشخانەیەکی گەورە بەناوی دایە گەورەیەوە لە بەنگلادیش دروستکرد، کە ڕۆژانە (٥٠٠) کەس سەردانی ئەو نەخۆشخانەیە دەکەن.

ئاخۆ لێرە و لەوێ، چەندین زەری بەتوانا بوونە قوربانیی زوڵم و ستەمی کەسانی نەزان و کۆنەپەرست. ئەگەر بیبی زەینەبی (٨٠) ساڵە نەبووایە، عەلی ڕەزای (١٢) ساڵە و عەباسی (١٨) ساڵە و خەڵکانی گەڕەکی ئێمە چیان بەسەر زەری دا دەهێنا؟

من دەیان کەسی وەک زەری دەناسم کە لەژێر ئەو جەور و ستەمەدا تێکشکان، ئێستا هەموو خوشک و براکانی زەری بەو پارەیە دەژین کە زەری لە ئەمریکاوە بۆیان دەنێرێتەوە.

کەوتوونەتە سەر کار و کاسپییەکی زۆر باش. عەلی ڕەزا دوکانێکی چاکەوت و پانتۆڵ فرۆشی لە یەزد هەیە، عەباس لە تاران لە شەقامی ستارخان دوکانێکی فرۆشتنی کەلوپەلی ناوماڵی هەیە، ڕەسوڵ لە ئەهواز بوو بە خاوەنی باخی گەورە و هەر لەوێش مرد. لە نەورۆزی (١٣٨٣-٢٠٠٥) دا عەلی ڕەزا پێیگوتم خوشکەکەم لە پێش هەموومان‌دا پارەی بۆ ڕەسوڵ نارد لە ئەهواز، نیوەکار بوو بەپارەی زەری زەوی کشتوکاڵی کڕی، خوشکەکەی کە لە تەنیشت حەوزەکەوە دانیشتبوو، دەیگوت من هاوڕێکەی زەری دەزانم کە ناوی فەخری ڕازییە، دووجار سەردانی زەری کردووە بۆ ئەمریکا و

کوڕەکەشی لەسەر مەسرەفی زەری چووە بۆ ئەمریکا و لەوێ خەریکی وەرگرتنی دکتۆرایە. سوڵتانی دایکی زەری بۆ سەردانی زەری سێ جار ڕۆیشتووە بۆ ئەمریکا و جارێکیان نزیکەی ساڵێک لەوێ ماوەتەوە.

سوڵتان لە ساڵی (١٣٧٣-١٩٩٤) کۆچی دوایی کرد، دەیانگوت هەمیشە لە ژوورەکەی سوڵتان دا لە تەنیشت شوێنی خەوتنەکەی یەک (شیش)ی کەباب دانراوە جار جارێک سەیری دەکرد و دەگریا. لە هەمووی خۆشتر کوڕە خاڵەکەی کە لە ساڵی (١٣٧٥-١٩٩٦) دا تەمەنی (٧٠) ساڵ بوو، لە سەرەتای شۆڕشدا بەهاوکاری زەری چووە ئەمریکا و لەوێ نیشتەجێ بوو، بووە خاوەنی چێشتخانەیەکی گەورە. عەلی ڕەزا پێیگوتم لە کوێ (٢٩) کەس لە خزمەکانیان بەهاوکاری زەری لەنێوان ئەمریکا و ئێران دا هاتوچۆیانە و (٢١) کەسیان لە ئەمریکا جێگیربوون. کوڕە خاڵەکەی زەری بە ماڵ و منداڵەوە، برایەکی زەری، برازایەکی زەری ئەمانە هەموویان لە ئەمریکا جێگیربوون و بوونەتە ئەمریکایی. ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤) لە عەلی ڕەزام پرسی کە هاوتەمەنی خۆمەو وەک سەردەمی منداڵی تێکەڵین، گوتم: ئێستا لە نێو بنەماڵەی ئێوەدا ئەگەر کچێک سکی بەرزببێتەوە بەشیشی کەباب داخی دەکەن یان دەیبەنە لای دکتۆر؟ گوتی: ئێمە ئێستا ئاقڵ بووین و دەیبەینە لای دکتۆر. کچەکانی بنەماڵەی ئێمە، ئەقڵیان پێدەشکێت کە سکیان بەرزبوەوە چیبکەن، بەپێکەنینەوە گوتی: ئەم عیفریتانە کاری خۆشیان دەکەن و سکیشیان بەرز نابێتەوە، ئێستاش خوشکانی ئێمە خودانەکات ئەگەر سکیان بەرزببێتەوە، داخیان دەکەین و دەڵێین بۆچی سکت بەرزبۆتەوە! (٤) هەزار ساڵ تەمەن ئەمە ماناکەیەتی واتە هەندێک خەڵکی هەژار بێدەرامەت، نەخوێندەوار، لە گەڕەکدا، بێ ئاو، بێ توالێت، بێ هەموو پێویستیەکی تەندروستی لە سەردەمی دەقیانووسدا ژیان دەگوزەرێنن.

ئەمانە وەکو مشک ماڵی خۆیان بەهەموو جیهان دەزانن، بۆ لای یەکتری دەخزێن و قسەش دەکەن، بەڵام ئامادە نەبوون کچەکەیان ببەنە لای دکتۆر. ئێستا هەر ئەو کەسانە قاچێکیان لە یەزدەو و قاچەکەی تریان لە نیۆریۆرک و ماساچوستی ئەمریکایە، ئەم کەسانە لەسەردەمێکدا نەک زۆر دوور لە ساڵانی (١٣٥٠-١٩٧٠) کان دا هەموو جیهان لای ئەوان گەڕەکی پشتی باخ بوو لە یەزد، ئێستا هەموو دنیا بە وڵاتی خۆیان دەزانن و لە باشترین پێویستییەکان سوود وەردەگرن، هەمان کەسێک کە ویستی کچە پوورەکەی بکوژێت، ئێستا لە تەمەنی (٧٥) ساڵیدا لە ئەمریکا گەورترین ریستورانتی هەیە، دیاریش نییە لە ریستورانتەکەی دا چ کارێک ئەنجامدەدات، پرسیارم لە زەری کرد کە ئایا

دەتوانم ئادرەس و ئیمەیڵی لە کتێبی یادەورەییەکانمدا بنووسـم؟ گوتی: إنشـاء اللـه دوای خانەنشین بوونم، چونکە ئێستا کاتم نییە بۆ وەڵامدانەوە.

## حسێنی (١٢) ساڵ لە گەراج دا

هاوین هات و پۆلی پێنجەمم تەواوکرد. پرسی سەرەتایی ئەوەبوو کە لە درێژەی هاویندا چ کارێک بکەم بە دایکمم گوت ڕۆژانە دەچمە کتێبخانە، دایکم گوتی ڕێگاکە دوورە و نابێت بچیت. پاشان وا ڕێکەوتین کە بچمە شوێنێکی بێ کێشە، ڕۆژێکیان دایکم دەستی گرتم و بردمی بۆ گەراجی ئەتمینان بۆ لای حاجی کازمی کوڕی مامم. دایکم پێیگوت: ئێستا هاوینە و حسێن هیچ کارێکی نییە. پاشان چیرۆکی زەردەچەوەکەی ساڵی پاری بۆ گێڕایەوە. حاجی کازم بەو چیرۆکە زۆر ناڕەحەت بوو، گوتی: وەرە گەراجەکە و بۆلای خۆم. حاجی کازم خاوەن و بەڕێوەبەری گەراجەکە بوو، ئەمە کارێک بوو تا ئەوکاتە دبلۆمم وەرگرت و لە زانکۆ وەرگیرام، پەیوەندی من بەگەراج و کاروبارەکانییەوە نەپچڕا. ئەمە خۆی لە خۆیدا چیرۆکی درێژە و چەندین ڕووداوی تێدایە. کە لە بەرگی دووەمی بیرەوەرییەکانم دا باسی دەکەم، بەڵام لێرەدا تەنها پێشەکییەکی کەمی ئەم کارە دەنووسم.

ئەمە چۆن بوو کە من چووم بۆ گەراج، لەگەڵ دەستپێکردنی هاوین بۆ جاری سێیەم دەستمکرد بە خوێندنەوەی کتێبی ئەمیر ئەرسەلانی ناودار، هۆیەکەشی ئەوەبوو، کە جگە لەو چەند کتێبەی کە پێشتر ناوم بردن، ناوی هیچ کتێبێکی ترم نەدەزانی، ئەو کەسانەی کە لە دەوروبەری من بوون زۆربەیان نەخوێندەوار بوون و کتێبیان نەدەناسی. خۆیشم لەوە دەترسام ئەگەر بچم بۆ کتێبخانە و لەوێ کتێب وەربگرم، وەک کتێبی ئامۆژگارییەکانی ئەفلاتونی لێبێت. بەهەرحاڵ چەند ڕۆژێک بوو دەچوومە گەراج، حاجی کازم ئاغا گوتی: دەمانەوێت بە گەشت بچینە تاران و مەشهەد (حسێن لەگەڵ خۆماندا دەبەین) ڕۆژی گەشت زۆر بەخێرانی هاتە پێش، ماڵی ئاغا بەسێ کە منداڵە گەورەکەیان نۆ ساڵ بوو، بچووکەکەشیان (١٤-١٥) مانگانە بوو، لەگەڵ ماڵی پەهلەوانپور (باوکی ژنەکەی حاجی کازم ئاغا) هەمووومان سواری پاس بووین و

بەرەو تـاران کەوتینـەڕێ. پاسـەکە مارسـیدس بـوو، مەکینـەکەی لە نـاوەوە بـوو. هەر کەسـەو کورسـی خـۆی هەبـوو، تەنهـا مـن نەبێت دەبـوایە لەسـەر مەکینەکە دابنیشـم، جادەکە هەمووی خۆڵ و تاسە بوو، کـاتژمێر (٢) ی دوانیوەڕۆ لە یەزد بەڕێکەوتین، لە ڕێگـای ئەردەکـان، عەقدا - نـائین بەرەو ئەردەسـتان و کاشـان. نزیکی کـاتژمێر (١٠) لە دەوروبەری ئەردەسـتان بـووین، لێرەوە جـادەکەی خـۆڵ و چـاڵی گەورەتـری تێـدابوو، ئۆتـۆمبێلەکە بە جۆرێـک کەوتە چـاڵێکەوە، یەکێـک لە سەرنشـینەکانی دواوە سـەری بەسەقفی ئۆتۆمبێلەکە کەوت و سـەری شـکا، منیش لە جێگەی خـۆم کەوتـمە خـوارەوە. ئەوکات کرێی ئۆتۆمبێل لە تارانەوە بۆ یەزد نزیکەی (٨) تومەن بوو، حاجی کـازم خـۆی خاوەنی گەراج و ئۆتۆمبێل بوو، بەڵام کورسیەکی بۆ مـن نەگرتبوو. داواکـاری لە مـن و شوێنی دانیشتنم لە ئۆتۆمبێلەکەدا لەسەرەتای گەشتەکەوە دیـار بـوو. ئۆتۆمبێلەکەمـان لە باسـکەکانی حەسـەن ئـاوای تـاران خێرایـی لە (٢٠) کـم تێنەدەپەڕی، لە یەزدەوە تـا قـوم هەموو جادەکان هەر خـۆڵ بـوو، تەنهـا لە قـوم تـا تـاران هەندێ شـوێن قیرتـاو کرابـوو، بەهەرحاڵ کاتژمێر (٣) ی دوانیوەڕۆی ڕۆژی دواتر گەیشـتینە تـاران، واتە (٢٥) کـاتژمێر بەڕێگـاوە بـووین، ڕێگـایەک کە ئێسـتا بەپـاس تەنهـا (٧) کـاتژمێرە و بە تاکسـی (٥) کـاتژمێرە، مـن و دایکـم وامانـدەزانی کەئەم گەشـتە تەنهـا (١٠) ڕۆژ دەخایەنێـت. ئەو پێویسـتیانەی کە مـن لەگەڵ خۆمـدا بردبـووم تەنهـا بەشـی (١٠) ڕۆژی دەکـرد، بەڵام گەشتەکە نزیکەی (٤) مانگی پێچوو. لە ناوەڕاستی خورداد تـا دەیەمـی میهـر (سـەرەتای حـوزەیران تـا سـەرەتای تشرینی یەکەم)، لە تـاران لە خانوویەکدا نیشـتەجێ بـووین کە تـایبەت بـوو بە بەڕێـوەبەری گەراجـی ئوتـۆ شـەهر لە باشـووری تـاران لە چوارڕیـانی عەباسی، دیارە هیچ کەس لەو خانووەدا نەبوو، تایبەت بوو بە خۆمان، یەکەمین شت لە تاراندا کە سەرنجی منی ڕاکێشا ئاوی بۆریی - بەلوعە بوو، چونکە ئەو کاتە لە شـاری یەزد ئـاوی بەلـوعە نەبـوو، ئـاوی بەلـوعەکە بە فشـارێکی زۆر دەهـات، بەلامەوە شـتێکی سەیر بوو، زۆر زوو تێگەیشتم کە بۆچی حاجی کازم ئاغا منیـان لەگەڵ خۆیاندا هێنـاوە بۆ گەشـت، جل شـتن، قـاپ شـۆردن هـاتوچۆی ناومـاڵ، ئاگاداری منداڵ، کۆکردنەوەی نوێنی خەو. سورکردنەوەی باینجـان، کڕینـی پێویسـتییەکان، ئەمـانە هەمـووی کـاری مـن بوو. دیارە لە کاتی شت کڕیندا، جەلیلی پاڵەوانپور کە دوو سـاڵ لە مـن گەورەتـر بـوو، هاوکاری دەکردم. کۆڵانەکانی تاران بەپێچەوانەی کۆڵانەکانی یەزدەوە ڕاسـت و قیرتـاو کرابـوون، جـۆگە ئـاوێکیش بەتەنیشـت کۆڵانەکانـدا دەڕۆیشـت بە ژێـر دارە بەرزە سـەر سەوزەکاندا، یەکەمجار لە تاران کە چوومە دەرەوە لە کـۆڵانەکەدا تووشـی پیـاوێکی بـاڵا بەرز و خـاوێن بـووم و سـڵاوم لێکـرد، پیـاوەکە گـوتی: کـوڕم کارێکـت بەمـن هەبـوو،

پرسیارێکت هەیە؟ گوتم: نەخێر. گوتی: ئەی بۆچی سڵاوت کرد؟ گوتم: ئاغا گیان ئێمە لە یەزد تووشی هەر کەسێک دەبین کە لە خۆمان گەورەتر بێت، سڵاوی لێدەکەین، ئەوەتا لێرەش سڵاوم لە تۆکرد. پیاوەکە بەمیهرەبانییەوە گوتی: سڵاو لە تۆش. بەڵام ئاغای بچکۆلانە ئێرە تارانە، تەنها ناسیاوەکان، سڵاو لە یەکتری دەکەن، یان کەسێک کە کارێکی هەبێت یا پرسیارێکی هەبێت، سڵاو دەکات. من بۆ یەکەمین جار جیاوازیی فەرهەنگی و تێکەڵاوبوونی ژمارەی دانیشتووان فێربووم.

دیارە لەو سەردەمەدا (هاوینی ١٣٣٩-١٩٦٠) قەرەباڵغی و گەورەیی تاران بە بەراورد لەگەڵ ساڵی (١٣٨٢-٢٠٠٣) زۆر کەم بوو، هەمان ڕۆژ چوومە دوکانێک ویستم هێلکە بکڕم، لە دوکاندارەکەم پرسی هێلکە دانەی بەچەندە؟ دوکاندارەکە گوتی: دانەی بە دوو ڕیاڵە، منیش (٤) تومەنم پێدا و گوتم: (٢٠) هێلکەم بدەرێ. کابرای دوکانداریش گوتی: دەکاتە پێنج تومەن. گوتم: کاکە (٢٠) دوو ڕیاڵی دەکاتە (٤) تومەن. دوکاندارەکە گوتی: دەکاتە پێنج تومەن. من تێنەگەیشتم کە چۆن (٢٠) دوو ڕیاڵی دەکاتە (٥٠) ڕیاڵ، من لە ژمارەدا زۆر باش بووم لە کۆتاییدا ئەو پیاوە منی تێگەیاند کە لە تاراندا بە دوو دانە یەک ڕیاڵی دەڵێن دوو هەزار، بەڵام دوو ڕیاڵ، واتە دوو ڕیاڵ و (١٠) شاهی کەواتە (٢٠) دانە دوو ڕیاڵی دەکاتە (٥) تومەن. ئیتر تێگەیشتم کە هەموو جارێک (٢٠) دانە دوو ڕیاڵی ناکاتە (٤٠) ڕیاڵ. هەمیشە (٢×٢) ناکاتە چوار، واتە ژمێرەیەک کە مرۆڤ لە قوتابخانە دەیخوێند هەندێک جار لە کۆمەڵگەدا قبوڵ نییە.

ئەوکات لە هەموو وڵاتدا سەردەمی خراپە و خراپەکاری بوو، بەتایبەت دوای جەنگی جیهانی دووەم، ڕۆژنامەکان هەر ڕۆژە هەواڵێکیان لەسەر شەڕ و کێشمەکێش و چەقۆوەشاندن و پیاوکوشتن، بڵاودەکردەوە. جگە لەو ڕۆژنامانەی کە بۆ ماڵەوەم دەکڕی هەموو ڕۆژێک ڕۆژنامەیەکم بۆ خوێندنەوەی خۆیشم دەکڕی و لاپەڕەی ڕووداوەکانم بەتەواوی دەخوێندەوە. دیارە ئەوکاتە ڕووداوی ئۆتۆمبێل زۆر کەم بوو، ستوونی چیرۆکەکانم دەخوێندەوە کە زۆربەیان زەبیحوڵڵای مەنسووری دەینووسین، ئاغای ماڵەوە، خشتەی ڕۆژنامەکەی حەل دەکرد و باقییەکەی بۆ چاککردنی سەوزە بەکاردەهات، ئەوە یەکەمین جار بوو، کە من بەتەواوی ڕۆژنامە بخوێنمەوە بەتایبەت چیرۆکەکانی.

# مەحمود پڵنگ و لێدانی من و جەلیل

ڕۆژێک مـن و جەلیـل بـۆ کڕینـی هەنـدێک پێویسـتی مـاڵ چـووینە دەرەوە. چـووینە دوکانی سـەوزە فرۆشـی و هەنـدێک باینجانمـان جیـاکردەوە، دوکاندارەکە باینجانەکـانی کێشا و منیش پارەکەم دایە. ئەوکاتە کیسەی نایلۆن نەبوو شتی تێبکرێت، هەر کەسـە و لەگەڵ خۆیـدا زەمیلەیەکـی دەبـرد بـۆ بـازاڕ تـا شـتەکانی تێبکـات. کاتێـک ویسـتمان باینجانەکە بکەینە کیسەکەمانەوە. پیاوێکی زلەی بەخۆوە، هـات و باینجـانەکەی هەڵگرت بـۆ خـۆی، مـن و جەلیـل پێمـانگوت: ئـاخر ئەو باینجـانە هـی ئـێمەیە و کێشـراوە و پارەکەشمان داوە. پیاوەکە گوتی: قەیدی نییە، دووبـارە باینجـان بـۆ خۆتـان جیـابکەنەوە، من تاقەتم نییە دابنەومەوە، باینجان جیابکەمەوە. وەک بینیم خاوەن دووکانەکە شـەرمی دەکـرد، پیـاوە زلەکە باینجـانەکەی بـرد و ڕۆی. جەلیـل گـوتی: ئاغـا لەگەڵ تـۆمە ئەو باینجـانە هـی ئـێمەیە و پارەشـمان داوە، خەریـک بـوو بیکەیـنە کیسـەکەمانەوە وا تـۆ پەلامارتدا و بردت بۆ خۆت. پیاوەکە زلـلـەیەکی بەهێزی لە جەلیل دا، منیش گـوتم: ئەوە بـۆ لێیـدەدەیت. زلـلـەیەکی بەهێـزی لە منـیش دا. ئـێمە دوو منـداڵی (١١-١٤) سـاڵ، ناڕەزاییمـان دەربڕی ئەم پیاوەش دەسـتیکرد بە لێدانمان. ئەوکاتە شـەقامەکانی تـاران چۆڵ بوون وەک ئێستا نەبوو، ئۆتۆمبێل زۆر کەم بوو، ئێمە لەبەر دەستیدا ڕامـانکرد بـۆ ئەوبەری شەقامەکە، ئەویش ڕایدەکرد بەدوامانـدا، ناچار گەڕاینەوە، ئەوبەری شـەقامەکە و چووینەوە بەردەم دوکانی سـەوزەفرۆشـەکە، هەرچەنـد هاوارمـانکرد، بەڵام هـیچ کەس گوێی پێنەداین. هەموو جلەکانمان لە بەرماندا دڕابوون، دەموچاومان خوێنی پێدا دەهـاتە خوارەوە. ئەم پیاوە پێیگوتین ئێستا پێمبڵێن ئەو باینجانە هـی کـێ بـوو؟ ئێمەش گوتمـان وەڵڵا هی ئێمەبوو. دووبـارە دەسـتیکردەوە بە لێدانمان، چەنـد کەسـێکیش لەونـاوە بـوون تەنها سـەیریان دەکردین. من و جەلیل خۆمـان گەیانـدە سـەر جۆگە ئـاوەکەی تەنیشت شەقامەکە و نزیکەی مەترێک بوو، پڕ بوو لە پیسـی. بە هەردووکمـان لێی هەڵگەڕاینەوە

و خستمانە ناو جۆگە ئاوەکەوە و سەروچاوی هەموو بوو بەپیسیی. ویستی لە ئاوەکە بێتە دەرەوە، تا کەمەری هاتبوو، جەلیل پێلەقەیەکی بە دەموچاویدا کێشا و خستیەوە ناو ئاوەکەوە، سندوقێکی بەتاڵ لەوێ بوو منیش هەڵمگرت و دام بەسەریدا و هەموو دەموچاوی بوو بە خوێن. جەلیل دەرفەتی نەدا لە جۆگەکەوە سەرکەوێتەوە. دووبارە شەقێکی تری لە دەموچاوی هەڵداو لە جۆگەکەدا نقوم بوو، هەستایە سەرپێ و چەقۆیەکی ئەڵقەداری لە گیرفانی دەرهێنا. دیسانەوە هەوڵیدا لە جۆگەکە بێتە دەرەوە، بەهۆی شلەژان و پەلەپەلەوە قاچی لە پیساییەکە خزی و کەوتەوە ناو جۆگەکە. لەم کاتەدا دوو پۆلیس هاتن، پۆلیسێکیان گوتی: مەحمود ئاغای پڵنگ، بەدەستی دوو منداڵ تێهەڵدانی باشت خوارد، هەموو دەموچاوتیان کردووە بە خوێن، تۆ چەقۆ لە دوو منداڵ دەردەهێنیت.. تازە ئەم دوو منداڵە هەموو گیانیان لە پیسایی هەڵکێشاویت و سەر و دەموچاوتیان هەموو کردووە بە خوێن. مەحمود پڵنگیش گوتی: بەخودا دەبێت ئەم دووانە هەر بکوژم. بەڵام پۆلیسەکان گوتیان ئادەی چەقۆکەتمان بدەرێ. ئیتر فشە فش و خۆهەڵکێشان مەکە، ئیتر تۆ لەم شەقامەدا ئابڕووت چووە، دوو منداڵ تێیانهەڵداویت. خەڵکەکەش هاواریان دەکرد و دەیانگوت: دوو منداڵ لە مەحمود پڵنگیان داوە. یەکێک بە گاڵتەپێکردنەوە هاواریکرد: مەحمود پڵنگ عەیبە بەم جۆرە بڕۆیت بۆ بنکەی پۆلیس، نافەکی پانتۆڵەکەت پیس کردووە، پانتۆڵەکەت داکەنە و نافەکەکەی بشۆ. زللەیەکی بەهێز بەر بناگوێی مەحمود پڵنگ کەوت و گوتی: چەقۆکەت بدە دەستم. خێرا پۆلیسەکان چەقۆکەیان لە دەست وەرگرت و گوتیان دەی پێشمانکەوە بۆ بنکەی پۆلیس. ئەوکاتە پۆلیس ئۆتۆمبێلی نەبوو، مەحمود پڵنگ هاواریکرد و بە پۆلیسەکانی دەگوت: ئێوە دەتانەوێت بمبەنە بنکەی پۆلیس، ئێوە زۆر هەڵەن، خۆم دەزانم چی دەکەم. یەکێک لە پۆلیسەکان گوتی: مەحمود قسەی بەرز و نزم نەکەیت، تۆ بەو جلوبەرگە پیسەتەوە و بە دەم و لوتی خوێناویتەوە بەدەستی دوو منداڵ تێهەڵدانت خواردوە، ئیتر لە گەڕەکدا حەیا و ئابڕووت نەماوە، بڕۆ ئێستا ماڵ و منداڵیشت لە ترساندا هەڵاتوون، ئیتر تۆ ئەو ڕۆڵەی کە هەتبوو کۆتایی هات. لەو لاشەوە چەند کەسێک هوهایان لێدەکرد لە کۆتاییدا پۆلیسەکان مەحمود پڵنگیان پێش خۆیان داو بە ئێمەشیان گوت ئێوەش وەرن بۆ بنکەی پۆلیس. ئێمەش هەردووکمان کە زیاتر لە پۆلیسەکان دەترساین تا لە مەحمود پڵنگ، گوتمان ئاغا خۆ ئێمە هیچ کارێکمان نەکردووە، بۆچی بێین بۆ بنکەی پۆلیس؟ پۆلیسەکان گوتیان مەحمود پڵنگ لە ئێوەی داوە، ئێوەش کارێکی باشتان کردووە، باشتان لێداوە و هەموو لەشیتان لە پیسی هەڵکێشاوە، ئەم گەڕەکەتان لە کۆڵ شەڕی مەحمود پڵنگ کردەوە، ئێمەش گوتمان تکایە واز لە ئێمە بهێنن و مەمانبەن بۆ بنکەی

پۆلیس. پۆلیسەکان گوتیان ئەی ئێوە شکاتتان نییە، گوتمان نەخێر. پاشان پۆلیسەکان گوتیان کەواتە ئێوە بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆتان. چەند کەسێک ئێمەیان برد بۆ باڵەخانەیەکی ئیداریی لەوێ لە حەوشەکەیدا حەوزێک هەبوو لەسەر حەوزەکە دانیشتین و سەر و دەموچاومان شۆرد. کراسەکانمان هەمووی دڕابوو لە بەرماندا، بەتایبەت کراسەکەی من. پاشان هاتینەوە سەرشەقامەکە و چووینەوە دوکانەکە باینجانەکانمان کۆکردەوە و کردمانە کیسەیەکەوە و گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. لە ماڵەوە لە زمانی حاجی ئاغاوە تێگەیشتم، کە تائێستا لە ناو شاری تاراندا باجگر و شەقاوە و چەقووەشێن هەیە و ئەمانە تەواوی شاریان لە نێوان خۆیاندا دابەشکردووە. هەر کۆڵان و شەقامێک بەدەست چەند کەسێکەوەیە، یەکێکیان دەبووە سەرۆکیان، پۆلیسەکانیش لەگەڵیاندا شەریک بوون و دژایەتیان نەدەکرن. ماوەیەکی زۆر ئەم ڕێگر و چەتانە کۆڵان و گەڕەکەکانیان قۆرخ کردبوو، بەئارەزووی خۆیان خەڵکیان ئازاردەدا و سەرانەیان لێوەردەگرتن. ئەگەر کەسێک کڕنوشی بۆ نەبردنایە ئەوا لێدانی دەخوارد. مەحمود پڵنگ یەکێک بوو لەوانە. باینجانەکەی کردبوو بە بەهانە خۆ ئەگەر بیزانیایە دوو منداڵ بەوجۆرەی بەسەر دێنن، هەرگیز ئەو کارەی نەدەکرد.

لە یەزدیش کەسانێک هەبوون وەک مەحمود پڵنگ کە هەمیشە خەڵکیان ئازاردەدا و چەتەییان دەکرد، بەزۆر پارە و پولیان لە خەڵک دەسەند. حەسەن خاوەر و ڕەزا مۆرتین و چەندانی تر، هاوشێوەی ئەوان بوون. لە دەوروبەری ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) دا کە حکومەت گۆڕانکارییەکی لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسدا کرد و هەندێکیانی خانەنشین کرد و هەندێک لە تلیاکییەکانیان دوورخستەوە و بۆ شوێنی تر. لە یەزددا ئاسایش بەرەو پێشەوە دەچوو، لە دەیەی (١٣٣٠-١٩٥٠) کان دا هەندێک گەڕەک شەو تا بەیانی ژن و منداڵ نەیاندەتوانی هاتوچۆ بکەن. زۆربەی دوکاندارەکان دەبوو پارەیان بدایە بە چەقۆکێشەکانی وەک حسێن دوو ئەمیر توستادان و محەمەد ئەلەنیکە لە بنەماڵەی ناسراوی شاریش بوون، یەکەمیان لە بنەماڵەیەکی بازرگانی ناسراو بوو، دووەمیان باوکی جێگر حاکم بوو، و خاوەن گەراجێکی گەورەبوو، ئەمانە سواری ماتۆڕ دەبوون و لە شەقامی پەهلەوی شاری یەزد لە ناوەڕاستی جادەکەدا بەخێرایی ماتۆڕیان لێدەخوڕی و خۆیان بەخەڵکیدا دەدا و چەقۆیان لە خەڵک دەدا و لە خەڵکیان دەدا. بەڵام پۆلیس هیچی پێنەدەگوتن. لە دەوروبەری ساڵی (١٣٤٣-١٩٦٤) دوو کەسی ئاژاوەگێڕ و چەقۆکێش هەبوون کاتێک پۆلیس دەیوست دەستگیریان بکات بە چەقۆ ڕووبەڕوویان دەبوونەوە، بەڵام جارانی پێشوو پۆلیس کاری بەسەریانەوە نەبوو یا بەرتلیان دەدا بە پۆلیسەکان یان پاکەتە تلیاکی (٥-١٠) تومەنییان دەدانێ، ئەوانیش ئازادیان دەکردن، یان

ئەگەر بیانویستایە لە کەسێک بدەن یا پارەی لێبسەنن، پێشتر لەگەڵ پۆلیسەکان ڕێکدەکەوتن و هەندێک پارەیان دەدانێ، پۆلیسەکانیش ئەو ناوچانەیان چۆڵدەکرد، دواتر ئەمانە کێشەیان دروستدەکرد. بەڵام ئەمجارە کە ئەمانە کێشەیان دروستکرد سەرۆکی پۆلیسی حکومەت و بەڕێوەبەری پۆلیسی یەزد گۆڕدرا بوو.

ئەفسەرێک بەناوی میر گلو، سەرۆکی شارەوانی یەزد بوو، ئەویش وەک هاوکارانی تری لە سەرتاسەری وڵاتدا، زۆر بەڕێکوپێکی کارەکانی ئەنجامدەدا و بڕیاریدا کە ئەم دوو گەنجە دەستگیربکرێن، دواجار گرتیانن و زۆریان لێدان و تەنانەت چەند ڕۆژێک لە نەخۆشخانەش کەوتن. پاشان لە شارەوانی سەری هەردووکیانیان تاشی، چەند ڕۆژێک زیندانیان کردن و چوار پێنج مانگ دووریانخستنەوە بۆ دەورەبەری شیراز. کاتێک کە گەڕانەوە ببوون بە دوو کەسی کاسب. حەسەنخاوەر پیاوێکی باڵا مامناوەندی و بەهێز بوو، چەندین ساڵ لە گەڕەکە کۆنەکەی لای قەسابخانەی یەزد خەریکی چەتەیی و ڕێگریی و باجوەرگرتن بوو، لەو ژن و پیاوانەی کە لەو شوێنەدا کارو کاسپیەکیان هەبوو، ژیانی خۆی و ماڵ و منداڵی بەم کارە بەڕێدەکرد، بەڵام لە کۆتاییدا لە هەمان گەڕەک گرتیان و تا توانیان تێیانهەڵدا و نافەکی پانتۆڵەکەیان بڕی. لەنێو گەڕەکدا بەرەڵایان کرد تاکو ژنانی گەڕەک پێی پێبکەنن. ئیتر حەسەنیش دوای ئەم کارەساتە بەدوای کار و کاسپی کەوت. ئەگەرچی کار و کاسپییەکەشی هەر دەچووەوە سەر هەمان پیشەی پێشووی، بەڵام ئیتر وازی لە شەڕە چەقۆ و بێ ناموسی و باجوەرگرتن هێنا. لە هەموو شارەکاندا ئەم کارەی نافەک بڕینە ئەنجامدراوە.

دیارە ئەم کارە هەندێک لە خەڵکانی پێیان باش نەبوو، بەڵام ئەمە کورترین ڕێگەچارە بوو بۆ ڕزگاربوون لەو ڕەوشە نالەبارە، چونکە کاتێک کە ئەمان دەستگیر دەکران، و دەیانبردن بۆ دادگا، بەفشاری خزم و کەسوکارەکانیان لێبوردنیان لە دادگا بۆ وەردەگیرا و بەزووترین کات لە زیندان ئازاد دەکران. ڕەنگە بەشێک لەم دزیی و شەڕو ئاژاوەیە، بەهۆی ناسەقامگیریی ئاسایشەوە بووبێت لە سەردەمی جەنگی جیهانیی دووەمدا و پەیدابوونی چەندین پارت و ڕێکخراوی چەپ و ڕاستڕەو لە دوای جەنگەوە. بەتایبەت ئەو چین و توێژەی کە خۆیان بەئەندامی (حزبی تودە) دەزانی لە نائارامی وڵاتدا بەشداربوون. دیارە ڕژێمی شا لە ساڵەکانی (١٣٣٠-١٣٣٢-١٩٥١-١٩٥٣) باشترین سوودی لەم چینە وەرگرتووە، بەڵام لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦٠) کاندا، مێژووی بەکارهێنانی ئەم جۆرە خەڵکە کۆتایی پێهات. سەرۆکی ئەم توێژە وەک شەعباب بێمۆخ تا ساڵەکانی (١٣٥٠-١٩٧١) هاوکاری شای دەکرد. من و جەلیل تێهەڵدانی باشمان خواردبوو، دەمووچاومان ئاوسابوو، جلەکانیشمان کەمێک دڕابوون، بەڵام هەلێکمان بۆ

هەڵکەوت و یەکێک لە لاتبازەکانی تارانمان خستە نێو جۆگەی پیساییەوە، خۆشحاڵ بووین کە زیاتر لێدانمان نەخوارد و نەیانبردین بۆ بنکەی پۆلیس و لە کۆتاییدا چەندین کەس هاواریان دەکرد بڕۆن ئێوە کە مەحمود پڵنگتان ڕووشکێن کرد. دیارە من وا هەستدەکەم یەکێک لەو هۆکارانەی کە کەسانی وەک مەحمود پڵنگ دەبنە چەتە و باجگر ئەوە بووە کە کەسێک نەبووە ڕووبەڕوویان بووەستێتەوە، ئەگەر نا ئەمە چ پڵنگێک بوو، کە دوو منداڵی یەزدی تێیانهەڵدا و پۆرتیان شکاند. لەگەڵ جەلیل دا بە باینجان و تەواوی شتەکانی ترەوە کە کڕیبوومان گەڕاینەوە ماڵەوە. من بەهۆی ئەو لێدانەوە کە لێمدرا بوو، هەستم دەکرد سەرم ئازاری هەیە، تام لێهات، لەگەڵ ئەوەش دەبوو باینجانەکان پاکبکەم و سوریان بکەمەوە و تەواوی کارەکانی تری ماڵەوە ئەنجامبدەم. بەڵام جەلیل خەوت، کارەکانی ماڵەکەش لەسەر شانی من بوو، قاپ شۆردن، گسکدان، چاودێری شانازی تەمەن یەک ساڵ و نیو و هەموو کارەکانی تر.

## گه‌شت بۆ که‌ره‌ج و ئاغا غولامی میزه‌ڵدان فرۆش

ڕۆژێک وا بڕیار بوو که هه‌موومان پێکه‌وه بچین بۆ که‌ره‌ج. حاجی ئاغا ئۆتۆمبێلی یه‌کێک له ناسیاوه‌کانی هێنا و له‌سه‌ر ڕێگاکه‌ماندا سه‌ردانێکی کارگه‌ی بیبسیی کولامان کرد، (کۆمپانیای زمزمی ئێستا) له شه‌قامی ئازادی ته‌نیشت شه‌قامی (جه‌یحون) ئه‌وکاته کارگه‌ی زمزم له ده‌ره‌وه‌ی شار بوو. جاده‌که‌شی قیرتاو نه‌رکرابوو، واته ته‌نیشتی شه‌قامی جه‌یحون شه‌قامی ئازادی ئێستا به‌ده‌ره‌وه‌ی شاری تاران ده‌ژمێردرا، کۆتایی لای ڕۆژئاوای له ساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠) دا ده‌وربه‌ری مه‌یدانی ئینقلاب و شه‌قامی ئه‌سکه‌نده‌ری ئێستا بوو. هه‌تا شه‌قامی جه‌یحون هه‌موو تاکه، تاکه ماڵی لێبوو. له کارگه‌ی بیبسی کولاوه واته شه‌قامی جه‌یحون هه‌موو چۆڵه‌وانی بوو. له که‌ره‌ج زۆر خۆشمان به‌سه‌ربرد، که‌ره‌ج شارێکی بچکۆلانه و هاوینه هه‌وارێکی خۆش بوو، له سه‌ری مه‌یدانه‌که‌ی که‌ره‌ج چه‌ند که‌سێکی گه‌ڕه‌کی خۆمانم بینی، که میزه‌ڵدانیان ده‌فرۆشت. هه‌ر له‌وێ سلاوم له ئاغا غولام کرد که کوڕه‌که‌ی هاوپۆلی خۆم بوو له یه‌زد، له‌وێ میزه‌ڵدانی ده‌فرۆشت، ئاغا غولام که منی بینی سه‌ری سوڕما گوتی: ئه‌وه چی ده‌که‌یت لێره؟ گوتم: له‌گه‌ڵ ماڵی کوڕه مامم به گه‌شت هاتوین. پاشان گوتی: لای هیچ که‌سێک باسی نه‌که‌یت که من میزه‌ڵدان ده‌فرۆشم. منیش لای که‌س باسم نه‌کرد تا ئه‌مڕۆ که ئه‌م یاده‌وه‌رییه ده‌نووسم له پاش (٤٤) ساڵ. ئه‌م ئاغا غولامه له که‌ره‌ج بوو به خاوه‌نی چه‌ندین موڵک و تائێستاش له ژیاندا ماوه، دوایین جار له (فه‌روه‌ردینی ١٣٨١- ئازاری ٢٠٠٢) دا بینیم. که ئۆتۆمبێلێکی مارسیدسی (٦٠) ملیۆن تومه‌نی پێبوو، نزیکه‌ی (١٥) ساڵ بوو، که ئه‌وم نه‌دیبوو، ئێستا یه‌کێکه له ملیۆنێره گه‌وره‌کان و له تاران و که‌ره‌ج و سه‌ن تروپه‌ی فه‌ره‌نسا و لۆس ئه‌نجلۆس خاوه‌نی ملک و بینا و کارگه و شوێنی په‌روه‌رده‌کردنی مریشکه. ئه‌و کوڕه‌که‌ی هاوپۆلی من بوو، که (٦) ساڵ زیاتری نه‌خوێند، (٣) کوڕی دانیشتووی ولاتی که‌نه‌دان، له‌وێ کارگه‌ی بڕینی ته‌خته‌یان

هەیە، عەباسی کوڕی ئاغا غولام کە هاوپۆلی من بوو تەنها (٦) ساڵ خوێندی، ئێستا بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکە و خاوەنی دوو کارگەیە کە زیاتر لە (٨٥٠) کرێکاری هەیە، من کاتێک مامۆستای پلەی (١٨) ی زانکۆ بووم و براوەی خەلاتی کتێبی ساڵ و لێکۆڵەری نموونەیی ساڵ و خاوەنی (٦٠) وتاری زانستی و خاوەنی ئیمتیازی وەرزنامەی زانستی و توێژەر و لێکۆڵەری جوگرافیایی و ئەندامی ناوەندی لێکۆڵینەوەی زانستی فەرەنسا و مامۆستای بانگهێشتکراو بۆ زانکۆی سۆربۆن بووم. هەوڵمدا لە ساڵی (١٣٨١-٢٠٠٢) دا لە تاران خانوویەکی (٦٠) مەتری بکڕم. ویستم عەباس ئاغا هاوکاریم بکات پاش چەند ساڵێک بە تەلەفۆن بە عەباس ئاغای کوڕی غولامم گوت کە دەمەوێت خانوویەک بکڕم، تەنها هەندێک بەرچاوڕوونیم لە تۆ دەوێت، ئەویش زۆر خۆشحاڵ بوو کە پاش (٢٠) ساڵ دابڕان لە یەکتری قسەی لەگەڵدا دەکەم وبانگهێشتیکردم بۆ ماڵی خۆیان، بۆ نانخواردنی ئێوارە لە شەمیران. گوتی: ئۆتۆمبێلت پێیە یا بنێرم بەشوێنتا؟ دیارە من لە مەشهەد پەیکانم هەیە، گوتم: ئۆتۆمبێلەکەم لە مەشهەدە و خۆم دێم. گوتی: ناونیشانتم پێبڵێ کەسێک بنێرم بەشوێنتا. منیش ناونیشانم پێدا و گوتم: پردی گیشا بەردەرگای تەربیەتی مودەریس. کاتژمێر (٨) ی شەو، ئۆتۆمبێلێکی سورمەیی مۆدێل بەرز لەبەردەمم وەستا، کەسێک لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی و بەناوی خۆمەوە بانگیکردم. گوتی: من شوفێری عەباس ئاغام و بەشوێن تۆدا هاتووم. من کە نەمدەزانی عەباس ناوی بنەماڵەی گۆڕیووە و شوفێری هەیە. کەمێک گومانم هەبوو بەلام زوو تێگەیشتم کە شوفێرەکە هەڵەی نەکردووە، دەمزانی کە عەباسی کوڕی ئاغا غولام باری ئابووریی باشە. بەلام منی مامۆستای زانکۆ زۆر نەمدەزانی وەزعی باش مانای چیە؟ شوفێرەکە بردمی بۆ شەمیران بۆ نێو باخێک. کۆشکێک لە باخێکی (٥٨٠٠) مەتریدا، بە دیوارێکی گڵکاری زۆر جوان، ژن و منداڵەکانی عەباس چاوەڕوانی هاتنی هاوڕێی باوکیان بوون کە مامۆستای زانکۆیە. خواردنێکی زۆر جوان و بەلەزەتیان دروستکردبوو. قسەو وتوویژی زۆرمان کرد لەبارەی بیرەوەرییەکانمان لە سەردەمی منداڵی و قوتابخانەی هیدایەتی و یەزد و قامچی لێدانەکانی ئاغای جەلیلی و گەوری نێوان پۆلەکان. باسی کۆشکەکەی عەباس لە سەن ترۆپەی فەرەنسا و کۆشکەکەی لە کەنار دەریا لە ژنێڤ و ئەو خانووەی لە ساڵی (١٣٧٠-١٩٩١) دا بۆ کورەکەی کڕی بوو بە ملیۆنێک و (٧٥٠) هەزار دۆلار لە دەوروبەری لۆس ئەنجلۆس.

لە کۆتاییدا گوتی: حسێن گیان چ خانوویەکی دەوێت؟ من هاوڕێیەکم تازە بینایەکی (٢٢) نهۆمی دروستکردووە لە دەوروبەری نیاوەران، بینایەکی تریشی هەیە، کە

بەرهەیوانەکەی (٢٩٠) مەترە، لەگەڵ ساڵۆنێکی (٢٧٠) مەتری بەبێ پایە، بەهەموو حەمام و موشتەمەلاتەوە، تۆ کامیانت دەوێت تا بۆت بکڕم؟ گوتم: نرخی ئەو بینایە چەندە؟ گوتی: وەڵڵا داوای (٢٤٠٠) دەکات، بەڵام من بە (٢٢٥٠) بۆ تۆی دەکڕم. کە دەکاتە (٢٤٠،٠٠٠،٠٠٠) تومەن، ئیتر من بەپێویستم نەزانی کە بڵێم من ئامادەم بینایەکی (٦٠) مەتری بکڕم بە پارەیەکی (٦) ملیۆن تومەنی، کە حکومەت بەقەرز دەیدات بە مامۆستای زانکۆ. گوتم: با کەمێک بیری لێبکەمەوە، پاشان ئاگادارت دەکەمەوە. وا بزانم ئێستا لەگەڵ هاوڕێکەی قوتابخانەی هیدایەتی شاری یەزد، پەیوەندییەکانمان تەنها سڵاوکردن و هەواڵپرسینێک بێت باشترە. چونکە ئەگەر دڵیشمان لە یەکتری نزیک بێت خۆ گیرفانەکانمان زۆر لەیەکتریەوە دوورن. ئاغا غوڵام باوکی عەباس، کە ڕۆژێکارێک بوو لە گەڕەکی پشتی باخ کرێکاری ڕۆژانە بوو، هەر ڕۆژێک جۆرە کارێکی دەکرد، ڕۆژێک بە بێڵ باخچەی دەکێڵایەوە، ڕۆژێکی تر لە ماڵێک شووشەی پەنجەرەی پاک دەکردەوە. پاشان بۆ بەردەوامی ژیان لە کەرج میزەڵدانی دەفرۆشت.

کاتژمێر (١٠) ی شەو بە دوایین مۆدێلی ئۆتۆمبێل هات بۆ ماڵی کوڕەکەی بۆ بینینی من، پیاوێکی تەمەن (٧٥) ساڵەی بەهۆش و چالاک، بەبێئەوەی لە خۆی گۆڕابێت، قسەی لە مامەڵەی ملیاردی دەکرد، تەنها کێشەیەک کە هەی بوو نەخوێندەواریی بوو. چەندین جار نزای بۆ مەلا نەباتی دەکرد کە فێری خوێندنی کردووە، دەیگوت بەبەرەکەتی قورئان و مەلا نەباتی دەتوانم نووسراوەکان بخوێنمەوە. بەڵام چونکە هیچ کات شتێکم نەنووسیوە ناتوانم بنووسم. هەمان کات بەخۆم گوت یەکێک لە کێشەکانی من ئەویە چونکە زۆر دەنووسم، مەچەکی دەستی ڕاستم ئازاری هەیە. دکتۆریش پێیگوتم پێویستە بە زوویی نەشتەرگەرییت بۆ بکرێت، بەڵام بەداخەوە بۆ نەبوونی مەسرەفی نەخۆشخانە و کرێی دکتۆر دەبێت ئەو چەند کتێبەی کە کۆمکردووتەوە، بیانفرۆشم و نەشتەرگەرییەکە ئەنجامبدەم. حاجی غوڵام لە بەردەم نەوەکانیدا چیرۆکی میزەڵدان فرۆشییەکەی بۆدەگێڕاینەوە. نەوەکانیشی دەیانگوت بابە حاجی ئەوە تۆ سەدجار ئەم چیرۆکەت بۆ باسکردوین. حاجی گوتی: یەکەم شت ئەوەیە ئاغا حسێنی پاپۆلی منی نەبینیوە کە میزەڵدانم فرۆشتووە. دووەمیان ئەوەیە بۆیە ئەمە دەگێڕمەوە کە من لە خۆم نەگۆڕاوم، من خەڵکی یەزدم سەرکەوتنەکەم لەلای خودای گەورەیە و دووەم هیلاکی و ماندووبوونی خۆم، سێیەم بەرەکەتی کڕین و فرۆشتنی زەوی. چوارەم بێ یاسایی وڵات بۆیە ئەم میزەڵدان فرۆشییە دووبارە دەکەمەوە کە ئێوە بزانن چەندە ڕەنجم کێشاوە، کاتێک کە من بە پێنج تومەن سەرمایەی میزەڵدانەوە توانیم (٤٢٠) ملیارد تومەن بەدەستبهێنم، پێویستە هەوڵبدەن بەم سەرمایەیە نیوەی لۆس ئەنجلۆس

بکرێن. من نەوەکەم کە تەمەنی (١٠) ساڵە داوای لێکردم، کە چیرۆکی لێدانەکەی باوکی لەلایەن ڕێکخەری قوتابخانەی هیدایەتییەوە بۆ باسبکەم، ئەویش دەبێت بەڵێن بدات، کە نیوەی لۆس ئەنجلوس بکڕێت.

ئەم منداڵە لە ئێستاوە دەیگوت بابە حاجی من حەزم لە سەن ترۆپە و دەریاچەی جنێڤە، بڕیار دەدەم هەرکاتێک گەورەبووم هەموو سەن ترۆپە بکڕم.

هەر بژی حەز و ئارەزووەکانی مرۆڤ، ئێستا ئێمەی مامۆستایان دەڵێین کۆچی گوندەکان بۆ شارەکان و شارە بچووکەکان بۆ تاران، کارێکی خراپە، ئەگەر ئاغا غولام هەر لە گەڕەکی پشتی باخ بمایەتەوە. ئێستا یا مردبوو یا لەگەڵ برسێتی ململانێی دەکرد. ئەوەتا عەباسی چاودێری هاوپۆلەکەمان کە وازی لە قوتابخانە هێنا، بەڵام شاری یەزد و گەڕەکی پشتی باخی بەجێنەهێشت چیرۆکی ئەوم پێشتر باس کرد.

## نیگەرانی بێ پارەیی

لەبیرەوەریی گەنجییەوە گەڕامەوە بۆ بیرەوەریی منداڵی، کاتێک ویستم بێم بۆ گەشت دیار نەبوو کە چەند ڕۆژ لە تاران و مەشهەد دەمێنینەوە، دایکم (١٢) تومەنی پێدام، منیش بە بۆچوونی خۆم پارەی باشم پێیە، ڕۆژێک حاجی ئاغا و خێزانەکەی منداڵەکانی بەمیوانی ڕۆشتن بۆ ماڵی ناوسیاوێکیان، ئێمەیان لەگەڵ خۆیان نەبرد. جەلیل گوتی: وەرە با بەیەکەوە نێو تاران بگەڕێین و بچینە سینەما و پیاسەیەکی تەواوی نێوشار بکەین، هیچ کەسێک لە منی نەپرسی پارەت پێیە یان نا. سواری پاسەکانی نێوشار بووین کە بەلامەوە زۆر خۆش بوو. چونکە لە یەزد پاسی نێوشار نەبوو، ئەوە یەکەمجار بوو من سواری پاسی ناو شاربیم، بەبێ بەرنامە و بەبێئەوەی بزانین دەچین بۆ کوێ، تا کۆتایی شوێنەکە ڕۆیشتین، کە شوێنێکی نیمچە چۆڵەوانیی بوو، شوفێرەکە گوتی: فەرموون دابەزن ئێرە کۆتاییە. لەو شوێنە پردێک هەبوو کە بەدار و تەختە دروستکرابوو، واتا لە ساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠) دا، پردێکی تەختە لە دوا پێچەکانی شەمیران و پێش مەیدانی ئیمام حسێن لە کۆتایی شاری تاران هەبوو، لە خۆرهەڵاتەوە و شەقامی ئەسکەندەری ئێستا و پێش کارگەی بیبسی کۆتایی شار بوو. لەلای خۆرئاواوە، لە پردە تەختەکەوە کەمێک بەرەو ڕووی شەقامی ئینقلابی ئێستا بە پێ گەڕاینەوە. گەیشتینە سینەمایەک دوو بلیتمان کڕی هەریەکەی بە هەشت ڕیاڵ، چووینە ناو سینەماکەوە، بەشێک لە دیواری سینەماکە بە حەسیر دروستکرابوو، کەمێک ڕووناکی لە حەسیرەکەوە دەهاتە ناو سینەماکەوە. حەسیرەکەیان بە دووتوێ دانابوو ئەو ڕووناکییەی کە دەهاتە ناوەوە زۆر کەم بوو، دیارە کە دەڵێم حەسیر مەبەستم لەو حەسیرەیە کە لە قامیش دروستدەکرێت. پاش چەند چرکەیەک کەسێک هات کە شتی دەفرۆشت دووقاپی پێداین گوتی: هەرکەسەتان پێنج ڕیاڵم بدەنێ. گوتم: ئەوە چییە؟ گوتی: گیپەیە. گوتم: ئێمە گیپەمان ناوێت. گوتی: بتانەوێت و نەتاوێت دەبێت هەریەکەی پێنج ڕیاڵ بدەن. جەلیل کە لە من گەورەتر بوو، گوتی: ئێمە گیپەمان ناوێت، کەسێک کە لەلای ئێمەوە دانیشتبوو، گوتی: کاکە گیان بتانەوێت و نەتانەوێت دەرخواردتان دەدەن.

تا لێیان نەداون هەریەکەو پێنج ڕیاڵ بدەن و گیپەکەش وەربگرن، گەر نەشیخۆن فڕێی بدەنە ژێر کورسییەکانتانەوە. ئینجا تێگەیشتین کە ئەم ڕووداوەش وەک ڕووداوەکەی چوار ڕیانی عەباسی وایە. ناچار پارەکەماندا و خواردنەکەمان وەرگرت و ڕشتمانە ژێر کورسییەکانمان.

فیلمەکە فیلمێکی بێ سەرەو بەرەی ئیتالی بوو، چەند جارێک فیلمەکە بچڕاو سالۆنی سینەماکە ڕووناک دەکرایەوە و فیلمەکە دەستیپێدەکردەوە.

فیلمەکە پیاوێکی زل و بەهێزی پیشاندەدا، کە بەردی گەورە گەورەی لە شاخەکە دەکردەوە بەهەرحاڵ هەریەکەمان بە(١٣) ڕیاڵ چووینە سینەما هەشت ڕیاڵی بۆ بینین فیلم و پێنج ڕیاڵیش بۆ نەخواردنی گیپە. لەو سەردەمە دا بیبسی بەم شێوەیە ئێستا برەوی نەبوو کە لە سینەما دا بفرۆشرێت، بەڵکو گیپەیان بەزۆر بەسەرخەڵکدا دەدا. لە گەڕانەوەماندا بەپاسی هێڵی تۆپخانە هاتین ئەوکاتە مەیدانی تۆپخانە زۆر لە ئێستا بچووکتر بوو، لەوێوە تا چوار ڕیانی عەباسی بەپێ ڕۆیشتین نزیکەی کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ گەیشتینەوە ماڵەوە، کە لە هەشتی بەیانییەوە ڕۆیشتبووین، زۆر ماندوو و برسی و تینوو بووین. حاجی ئاغا و خێزانی و منداڵەکان شەوانە دەچوون بۆ سینەما و ڕێستۆرانت و ماڵە ناسیوەکانیان. جاری وا هەبوو دوو ماڵ بەیەکەوە دەچوونە دەرەوە، بۆ پارک و سەیرانگەکان. من بەتەنیا لە ماڵەوە دەمامەوە، شانازی تەمەن یەک ساڵ و نیویشیان دەخەواند و جێیان دەهێشت، دەبوو من ئاگاداری بم. نزیکەی (٢٥) ڕۆژ لە خانووەکەی چوار ڕیانی عەباسی بووین، بۆ من تاقیکردنەوەیەکی باش بوو، ئاوی بەلوعە، کۆلانی قیرتاو، خەڵکی پاکوخاوێن و جوانپۆش، زانینی ئەوەی کە نابێت هەر کەسێکت ببینیت لەخۆتەوە سڵاوی لێ بکەیت، زانینی ئەوەی کە دوو ڕیاڵ واتە دوو ڕیاڵ و نیو، لێدان لەلایەن گەندە پیاوانی گەڕەکەوە.

چوونە سینەما، بەزۆر گیپە بەسەردادان، پاسی نێوشار، کارگەی بیبسی کەرەج، ئاغای غولامی میزەڵدان فرۆش، باینجان سوورکردنەوە، قاپ و قاچاخ شۆردن، ئاگاداربوونی منداڵ، مانەوەی هەندێک شەو لە خانوویەکدا بەتەنیا، ترس و خۆفی شەوانە و نەڕۆیشتن بۆ حەمام، لەبەرکردنی جلی پیس و چڵکن. ئەمانە هەمووی بۆ من خۆش بوو، بڕیار وابوو هەفتەیەک بڕۆین بۆ دەربەند، حاجی ئاغا باخێکی لە دەربەند بەکرێگرتبوو، هەفتەیەک لە دەربەند ماینەوە. هەموو کارەکانی چوارڕیانی عەباسی دەبوو هەر من ئەنجامیان بدەم، بەڵام هەوا زۆر فێنکتر بوو، گەرما کەمتر ئازاری دەداین، بۆ گەیشتین بەدەربەند هەروەک ئەوەی لە شارێکەوە بچیت بۆ شارێکی تر. لە دەوروبەری پێچەکانی شەمیران زۆربەی شوێنەکان چۆڵەوانیی بوون، زەوی نەرمەڵانی

زۆر بوو لە نزیک شەمیران ماڵ و باخی زۆری لێبوو. ڕۆژێکیش چووین بۆ ماڵی نازم ئاغای خاڵی حاجی کازم ئاغا، حاجی نازم بازرگان بوو ماڵی لە باخێک بوو نزیک شەمیران، لەوێ هەندێک شتی ناوماڵم بینی، کە یەکەمجارم بوو بیانبینم، نیوەڕۆیەکیش چووینە ماڵی مەحمود ئاغا، ئەویش ماڵی لە شەمیران بوو، حاجی مەحمود ئاغا زاوای ئاغا سەید عەلی نانەوای سەرۆکی گەڕەکی ئێمە بوو.

ئەو دوای کوشتنی ئاغای سەید عەلی سەرۆکی حسێینەی گەڕەک کە باوکی خێزانەکەی بوو، هەمووساڵێک بۆ مەراسیم دەهاتە یەزد. ئەو سەرپەرشتی حسێینەی پشتی باخی دەکرد، هاوکات (بەننا)ش بوو، خانوویەکی زۆر جوانی هەبوو لە شەمێران، کە لە شێوەی باخێکی گەورەدا بوو. من لە ماڵی ئەوان بۆ یەکەمجار زەڵاتەم خوارد، زۆر بەلامەوە خۆش بوو، چونکە تا ئەو کاتە زەڵاتەم نەبینیبوو، و نەشمخواردبوو، لە قاپێکی بچووکدا خەیاری سەوز و تەماتە و پیاز قاش قاش کرابوو، لەگەڵ خواردنەکەدا دانرابوو، دەزانم منداڵانی ئەم سەردەمە سەریان سووڕدەمێنێت کە دەڵێم من لە تەمەنی (١٠-١١) ساڵیدا زەڵاتەم نەدیبوو. ئەوکاتە زۆر بەکەمی زەڵاتە دروستدەکرا یان من نەمبینیبوو، چونکە دایکم زەڵاتەی دروست نەدەکرد و ئاگاداری ماڵەکانی تریش بووم، ئێمە لە یەزد کاهوومان بەسرکەوە و بە بێ سرکەش دەخوارد. لە گەشتی مەشهەدا بۆ یەکەمجار ماکەرۆنیم بینی، کە لە دەوری قاپی گۆشتدا لەشێوەی گوێی فیل دانرابوو، ئەوکات ماکەرۆنی هەر نەبوو، لە دەوروبەری ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) دا کەم کەم بڵاوبووەوە و هەموو کەس بینیان، من کە لە ساڵانی (١٣٤٦-١٣٥٠-١٩٦٧-١٩٧١) لە مەشهەد خوێندکار بووم، هەرگیز بیرم نییە کە لەم ساڵانەدا ماکەرۆنیم خواردبێت. چونکە نە لە حانوتی زانکۆ نە لە بازاڕ نەمدیووە، لە ماڵەوەش دروستمان نەدەکرد.

لە دەربەند دواین پارەکەی پێمبوو خەرجمکرد، کە (٣) ڕیاڵ بوو، بیبسییەکم کڕی بە (٣) ڕیاڵ و خواردمەوە، ئیتر تەواو بێ پارەبووم، لەو (١٢) تومەنە (١١) ڕیاڵم دا بەسینەما و (١٢) ڕیاڵ بۆ کرێ پاس و بە (٣٨) ڕیاڵ کراسێکم کڕی چونکە کراسەکەم لە شەڕی مەحمود پڵنگدا دڕابوو، بە (٢) ڕیاڵیش پێڵاوەکانم بۆیاخکرد، و (٣) ڕیاڵ بۆ کڕنی دەفتەرێکی (٢٠٠) پەڕەیی تا یادەوەرییەکانم بنووسمەوە، ئێستاش زۆر جار سەیری ئەو دەفتەرە دەکەمەوە. چەند دانە دۆندرمە و بیبسیم کڕی بەدواین پارەم بیبسیم کڕی و تەواو بێ پارەم بووم. ئیتر دڵم زۆر شکا کە چۆن لە وڵاتی غەریبیدا بەوجۆرە بێ پارە بووم، هەمان ڕۆژ شتێک بەمێشکمدا هات بەو منداڵیەوە بیرم لەوە کردەوە کە مرۆڤ هەر چەندێک پارەی هەبێت باشترە.

## چاره‌نووسی خانه‌نشینێک

ڕۆژێک له ده‌ربه‌ند چووم بۆ نانکڕین، ئێستاش شوێنی نانه‌واکه‌م له‌یاد ماوه، هه‌ر کاتێک ده‌چمه ده‌ربه‌ند ئه‌م یاده‌وه‌رییه‌م بیرده‌که‌وێته‌وه، ماڵێک له نزیک نانه‌واکه‌وه بوو، بینیم دوو پۆلیس له ده‌رگای ماڵه‌که‌دا وه‌ستابوون، هه‌ندێک که‌لوپه‌لی ناوماڵ له به‌رده‌گای ماڵه‌که فڕێدرابوون. چه‌ند که‌سێک له‌و ناوه وه‌ستابوون و سه‌یری ئه‌و شتومه‌کانه‌یان ده‌کرد، که له قه‌راخ شه‌قامه‌که‌دا فڕێدرابوون. ئه‌و کاته ساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠) بوو، دانیشتووانی تاران زۆر که‌م بوو. هه‌موو دانیشتووانی وڵات نزیکه‌ی (٢٠) ملیۆن که‌س ده‌بوو. پاشان بینیم پیاوێک پیره‌مێردێکی ئیفلیجی له‌کۆڵ کردوه و له خانووه‌که هێنایه ده‌ره‌وه و له‌سه‌ر شه‌قامه‌که له ته‌نیشت شتومه‌که‌کانه‌وه داینا. پۆلیسه‌کان ده‌رگای ماڵه‌که‌یان داخست و له‌گه‌ڵ دووکه‌سدا ڕۆیشتن، ته‌نانه‌ت ته‌واو خه‌ڵکه‌که‌ی تر، سه‌ریان سوڕمابوو، له کارکردن وه‌ستا بوون. منیش پرسیم ئه‌وه چی بووه؟ گوتیان ئه‌م پیره‌مێرده کارمه‌ندی ده‌وڵه‌ته و خانه‌نشینه نزیکه‌ی (١٥) ساڵه به‌کرێ له‌م خانووه‌دایه و ماوه‌یه‌که سه‌کته لێیداوه و ئیفلیج بووه، چه‌ند مانگێکه کرێی خانووی نه‌داوه، ئێستا ئه‌و پۆلیسانه له‌لایه‌ن دادگاوه هاتوون و فڕێیانداوه‌ته سه‌رشه‌قام و خانووه‌که‌یان پێ چۆڵکردووه. منیش گوتم: ئێستا ئه‌م پیرمێرده چی ده‌کات؟ نانه‌واکه گوتی: هه‌واڵم ناردووه بۆ کوڕه بێ ویژدانه‌که‌ی که بێت و باوکی به‌رێت بۆ لای خۆی، ئه‌وه‌تا تاکو ئێستا نه‌هاتووه. نانه‌واکه گوتی: ئه‌م پیاوه کارمه‌ندی دارایی بوو ئێستاش ئیفلیج بووه، ژنه‌که‌شی هه‌ر له‌م ماڵه دا مرد، ته‌نها کوڕێکی هه‌یه، که ئه‌ندازیاره و له شاری هه‌مه‌دانه، له باوکی توڕه‌یه و نایه‌ت به‌لایدا. ئه‌م پیاوه هه‌موو مووچه‌که‌ی به‌شی دکتۆر و ده‌رمانه‌که‌ی ناکات و پاره‌یه‌کی بۆ نامێنێته‌وه تا بیدات به کرێی خانووه‌که‌ی. خه‌ڵکه‌که بڵاوه‌یان لێکرد و منیش چووم بۆ لای پیرمێرده‌که و سڵاوم لێکرد. به‌ڵام

بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە باش نەیتوانی وەلامم بداتەوە. هێواش هێواش فرمێسک بە چاوەکانیدا دەهاتنە خوارەوە. ژمارەیەکی تەلەفۆنی دامێ و تێیگەیاندم کە پەیوەندی بکەم بە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگاوبانی هەمەدانەوە و بەکوڕەکەی بڵێم بەزوویی بێت بۆ تاران. چووم بۆ لای نانەواکە و باسی تەلەفۆنەکەم بۆ کرد، گوتی: کاکە ئەوە تۆ دەڵێیت چی؟ بەخودا دە جار زیاتر من تەلەفۆنم بۆ کوڕەکەی کردووە، دواجار پێیگوتم کاکە تۆ وازبهێنە و ئیتر تەلەفۆن مەکە و زەحمەت مەکێشە. گوتم: باشە ئێستا ئەم پیرەمێردە دەبێت چی بکات؟ گوتی: شاگردەکەم خانوویەکی بەکرێگرتووە و ژوورێکی چۆڵیشی هەیە، بڕیارە پاش تەواوبوونی کارەکەمان بیباتەوە بۆ ماڵی خۆیان. نانەواکە لێی پرسیم گوتی: تۆ خەڵکی کوێیت؟ گوتم: خەڵکی یەزدم و چەند ڕۆژێکە هاتووین بۆ ئێرە بۆ گەشت. نانەواکە گوتی: ئەوە بۆیە ئەوەندە لە خەمی ئەم پیرەمێردەدایت، خەڵکی ئەم ناوە دڵیان بووەتە بەرد و لە خەمی کەسدا نین. خاوەنی ئەم خانووە یەکێک لە دەسەلاتدارانی وڵاتە. هەر لەم شەمێران و دەربەندە زیاتر لە (٥٠) موڵکی هەیە، ئێستا نوێنەرەکەی هاتووە ئەم بێچارەیەی فڕێداوەتە سەرجادە، ئەوەش سەرەنجامی کارمەندی و خانەنشینی. من نیگەرانی دایگرتم کە بۆچی هەموو پارەکانم خەرجکرد، دەبوایە لانیکەم ئەوەندە پارەم پێبمایە تا پێی بگەمەوە یەزد. ئەگەر لێرە ون بووم، ئەگەر تووشی شەڕێک هاتم، ئەگەر بمەوێت بەزوویی بگەڕێمەوە، ئەوکات بێ پارە چیبکەم. هەڵبەت هەموو ڕۆژێک پارەیان دەدامێ بۆ شت کڕین، بەڵام ئەوە پارەی من نەبوو، مافی ئەوەشم نەبوو کە ڕیاڵێکی لێ خەج بکەم. چونکە هەمیشە مەلای مزگەوتی پشتی باخ دەیگوت ئەگەر کەسێک بە بێ مۆڵەت دەست بۆ پارەی خەڵک ببات یان خەرجی بکات، ئەوا لەودنیا، دەچێتە دۆزەخ، من لە سەردەمی منداڵیمدا هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە دەبێت کارێک بکەم کە نەچمە دۆزەخ، چونکە مەلای مزگەوت دەیگوت لە جەهەنەم بە شیشی سورەکراو قورگتان هەڵدەدڕن، ئەو قسانەی کە مەلای مزگەوت باسی دەکرد، هەموو کەس دەیانگوت ئەو مەلایە هەرگیز درۆی نەکردووە، هەمان قسەکانی ئەم مەلایە ئاغا شێخ عەلی کوڕی ئاغا شێخ غولام ڕەزازی خۆراسانی کە کاتێک بە شەقامەکاندا دەڕۆیشت ئەو دوکانانەی کە ڕادیۆیان هەبوو لە ترسی ئەو ڕادیۆکانیان دەکوژاندەوە.

ئەو خراپتریشی گوتبوو، کە ئەگەر کەسێک مسقاڵێک ماڵی خەڵک بخوات بەبێ ئیزنی خاوەنەکەی، دەبێت لەودنیا ئەوەندی کوپێک ئاو ئەو شتەی کە خواردوویەتی بیداتەوە. بەڵام چونکە لەودنیا پارە نییە و هیچ شتێکی تر نییە، دەبێت لەسەر ئەوە سزای خۆی وەربگرێت، ئەو سزایەش کە ئاغای شێخ عەلی باسی دەکرد زۆر قورستر بوو لەوەی

کە مەلای مزگەوتی پشتی باخی یەزد باسی دەکرد. کەواتە ئێستا من چۆن دەتوانم کە ڕۆژانە بایی (٤-٥) تومەن شت بکڕم بچم دوو ڕیاڵ لەو پارەیە بۆخۆم هەڵبگرم، یا بڵێم شتەکان گرانتر بوون. بەهیچ جۆرێک نەمدەتوانی ئەم کارە بکەم. پێویستیە گرانبەهاکانی تر حاجی ئاغای خۆی دەیکڕین، کڕینی نان، ماست، پیاز، هەندێک جار بتڵی ئاوی لیمۆ و ئەو وردە شتانە لە ئەستۆی مندا بوون. ئەو سەردەمە مەسرەفی ماڵێکی شەش کەسی ڕۆژانە (٤-٥) تومەن زیاتر نەبوو. جەلیل یش شتی دەکڕی بۆ خۆیان، دیارە ئێمە لە دەربەند بە تەنها بووین، ماڵی پاڵەوانپوور لە هەمان خانووی چوار ڕای عەباسیدا بوون، ترس لە دۆزەخ، چ ڕێخۆشکەرێکی باشە بۆ چەوساندنەوەی خەڵکی هەژار لەلایەن خەڵکانی چاوچنۆکەوە. منداڵێک کە لە ماڵی خۆیان نان و ئاوی هەیە، دایکی جلەکانی بۆ دەشوات، لانیکەم هەفتەی جارێک دەچێت بۆ حەمام کەسێک ناتوانێت پێیبڵێت پێت خوار داناوە، لە ترسی ئەوەی نەوەک بەرەڵڵای کۆڵان بێت و لەگەڵ منداڵانی تردا شەڕ نەکات بۆ کارکردن بنێرێتە دوکانی خەڵکی و سوودی لێوەربگرن و کاری قاچاخچێتی پێبکەن، ڕیاڵێک کرێی نەدەنێ، یاخود بچێت بۆ پاسکیلخانە و لە هاوینی گەرمدا بە نەوت زنجیر و بۆڵبرینگی پاسکیل بشوات دیسانەوە پارەی نەدەنێ یان بچێت بۆ لای مەلا و پارەش بدات و داری سووتاندن بۆ سۆپاکە ئامادە بکات. بزنەکان بدۆشێت، ئێستا بێتە لای کوڕە مامەکەی بە خزمەتکاری و نەچێتە حەمام و لە کاتژمێری (٥) ی بەیانی تا (١٢)ی شەو دەبێت کار بکات بەڵام لە ترسی قسەکانی مەلای مزگەوت و ئاغا شێخ عەلی و ئاغای ناسر و ئاغای شێخ جەواد نەتوانێت بەم هاوینە گەرمەی تاران و مەشهەد دۆندرمەیەک بکڕێت بە دوو ڕیاڵی خاوەنی ماڵ، کە کوڕە مامیشی بێت. نەوەک ئەم دۆندرمەیە لەودنیا بگۆڕێت بەشیشێکی سورەوەکراو بچەقێتە قوڕگییەوە و تا جگەرو ڕیخۆڵەشی بسووتێت. بەهەرحاڵ حسێن بێ پارە بوو، بەبینینی دیمەنی دەرکردنی پیرەمێردێکی ئیفلیج لە خانووەکەدا دڵی کەوتە لەرزین. حسێن وابیری دەکردەوە کە خودای گەورە لەودنیا حیسابێک لەگەڵ ئەم خاوەن خانووەدا دەکات، لە سەرئەوەی لەم دنیادا پیرەمێردێکی خستە دۆزەخەوە کە دڵی دایک بۆی دەبوو بە کەباب. ئەوکات کە لە تاران بووین ڕۆژێک چووین بۆ ماڵی ئاغا محەمەد کە مامۆستای زانکۆ بوو، ماڵەکەی پڕ بوو لە کتێب، پێنج ژووری هەبوو، هەموو لایەکی هەر کتێب بوو، کاتێک حسێن چوو بۆ توالێت سەیری کرد ژوورێکی بچووک لەوێش هەیە کە ئەویش پڕە لە کتێب. حسێن هەرلەوێ بڕیاریدا کە ببێت بە مامۆستای زانکۆ. لە ئاغای محەمەدی پرسی: چۆن کەسێک دەتوانێت ببێت بە مامۆستای زانکۆ؟ ئاغا محەمەد بە شێوازێکی لەسەرخۆ و باوکانە گوتی: لە پۆلی چەندیت؟ گوتی: ئاغا پۆلی پێنجەمم تەواو کردووە. گوتی: زۆر

باشــه کـوڕی خـۆم، تـۆ دەبێـت بخوێنیـت، دبلـۆم وەربگریـت، پاشــان فـۆرمی زانکـۆ پـڕ بکەیتەوە و بکالۆریۆس و ماستەر وەربگریت، ئەوکات دەتوانیت لە زانکۆ دابمەزرێیت، پاشان دووبارە بخوێنیت، دکتۆرا وەربگریت، پاشـان (١٥-٢٠) سـاڵ هەندێک جـار (٣٠) ساڵ دەبیتە ئوستاز و دەبێت چەندین کتێب و بابەت بنووسیت.

## گەشت بۆ مەشهەد

لە تارانەوە ڕێگای مەشهەدمان گرتەبەر، ئەمجارەش هەر بە پاس کە مەکینەکەی لە پشتەوە بوو جێگای منیش هەر لەسەر مەکینەکە بوو. هاوین بوو هەوا گەرم بوو سەرمەکینەکە سوو ببوەوە، حەزم دەکرد لە ئۆتۆمبێلەکەوە دەرەوە ببینم. ئەوکات جادەی (تاران – مەشهەد) لە ڕێگای سەبزەوارەوە گڵ بوو، لە تارانەوە بۆ مەشهەد نزیکەی (٤٠) کاتژمێر دەبوو. لە نزیک سەبزەوار ئۆتۆمبێلەکەمان خراپ بوو، ماوەی (٦-٧) کاتژمێری ویست تا چاککرایەوە. ئەو کاتە خراپبوونی ئۆتۆمبێل زۆر ئاسایی بوو، بیرمدێت یەکەمجار کە ئۆتۆمبێلی باش لە مەشهەدەوە هات بۆ یەزد بە (٢٤) کاتژمێر گەیشت. ئەویش پاسی محەمەد مورغابی بوو، بەهاوکاری شوفێری هەردوو کوڕە خوشکەکەی ئاغایان ئەحمەد ڕەجەب زادە و خودا لێخۆشبوو حسێن ڕەجەب زادە. بۆ ئەم ئۆتۆمبێلە کە پێشەنگ بوو لە گەراجی ئەتمینانی یەزدا مەڕێکیان کرد بە قوربانی جادەی خۆڵ و بیابان و نێوان مەشهەد و یەزد پێچەکانی عەباس قوزی و ملەی حوشتر گەردن و ئەسەدئاوا، ئەم پاسە بۆ یەکەمین جار بە شەو و ڕۆژێک بە سەلامەتی گەیشت، کە دەبوایە بۆ سەلامەتی پاس و شوفێر و سەرنیشینەکانی حوشتریان بکردایە بە قوربانی.

لەو سەردەمەدا شوفێر و هاوکاری شوفێر هەر خۆیان باشترین وەستا و میکانیکی بوون، لەو بیابانە هەر خۆیان بەشە گرنگەکانی مەکینەکەیان چاکدەکردەوە. لە سەبزەوارەوە گەیشتنە نەیشاپوور، زۆرم حەزدەکرد ئارامگەی (خەیام) ببینم، بەڵام پاسەکە لە نەیشاپوور نەوەستا ڕاستەوخۆ بەرەو مەشهەد ڕۆیشت. چەند ڕۆژێک میوانی خوداڵێخۆشبوو حاجی مەحمودی ئەردەکانی بووین. ماڵی حاجی مەحمود لە دەرەوەی شار بوو، هەندێک کەس دەیانگوت مەحمود ئاغا ڕۆیشتووە لە ناوەندی بیابان خانووی کڕیوە، خانووەکە لەنێو باخدا بوو، هەمان خانوو کە ئێستا لە شەقامی ئەحمەد

ئاوای مەشھەدە بەلای شەقامی پەرستار واتە ناوەڕاستی شار لە ئێستادا، لە ساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠) دا، قەراخ شار بوو لە مەیدانی تەقی ئاواوە، تا ئەم شوێنە هیچ خانوویەکی لێنەبوو. بەرامبەری ماڵەکەیان گۆڕەپانێک بوو کە ئەسپەکانی هێزی سەربازییان دەهێنایە ئەو شوێنە بۆ مەشقکردن. من زۆر حەز بە سواری ئەسپ و ئەسپسواری دەکەم، هەر دەرفەتێکم بۆ هەڵکەوتبێت لەگەڵ منداڵانی کوڕی مامم دەچووین بۆ سەیرکردنی ئەسپسواری و غارغارێنی ئەسپ. ئەو زەوییانەی کە ئەسپسواری تێدا دەکرا لە ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤) دا لانیکەم بە نیو ملیۆن تومەن فرۆشرا.

کچە گەورەکەی کوڕە مامەکەم واتا مینا خانم کە سێ ساڵ لە من بچووکتر بوو، هەمیشە لەگەڵ مندا شەڕی دەکرد چەندین جار لێیدەدام و من بێدەنگ دەبووم یا دەترسام لێدانەکانیم قبوڵ دەکرد. بەڵام من ئەوم خۆشدەویست، ئێستاش هەر خۆشمدەوێت، ڕۆژێکیان لە مەشهەد لێیدام، منیش بۆکسێکی بەهێزم سرەواندە لاتەنیشتی، ئەویش بورایەوە و کەوتە سەر زەوی، ئەو بۆکسە بووە هۆی ئەوەی کە هۆشی هاتەوە ئیتر ئاگاداردەبێتەوە کە جارێکی تر لێم نەدات، ئەم بۆکسە منی تێگەیاند کە دەبێت لە ژیاندا یەکسانی هێزت هەبێت، ئەگەر یەکسانی هێزت نەبێت هەمیشە شەڕت پێدەفرۆشن. مەهناز کچی دووەمی کوڕە مامەکەم (٥-٦) ساڵ بوو، ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤) خاوەنی چەندین نەوە بوو، کچە بچووکی کوڕەمامەکەم (شاناز) کە (١٨) ساڵ دوواتر بوو بەبووکی ماڵی حاجی مەحمود ئاغا کە لە مەشهەد لە ماڵیان بووین، واتە ژنی حاجی جەواد ئاغا لەو کاتەدا تەمەنی ساڵ و نیوێک بووە، دەبوایە من هەمیشە ئاگاداری بوومایە، ئەم کچانە چونکە برایان نەبوو، بەگشتی پەیوەندییان لەگەڵ مندا باش بوو، تا نزیکەی (١٠) ی میهر لە مەشهەدماینەوە. لەوێش وەک تاران پاسی نێوشار هەبوو، دوو ڕیاڵ کرێیان وەردەگرت، بەڵام من پارەم پێنەمابوو، بەتەنها سواری ئەو پاسانە ببم و بەنێوشاری مەشهەدا بگەڕێم.

چەند ڕۆژێک لە ماڵی خودالێخۆشبوو حسێن ئاغای میر جەلیلی لە ڕۆژهەڵاتی مەشهەد ماینەوە، ماڵی ئاغای میر جەلیلی لە پێش شەقامی گەراج بوو لە هەفتەی یەکەمدا ئاغای پاڵەوانپوور لەگەڵ خێزانی و جەلیل لە مەشهەد بوون لە خانوویەکی سەربەخۆدا لە نزیک مەرقەد جێگیر بووین، مەرقەدی ئیمام ڕەزا بەلای منەوە زۆر خۆشبوو، هاواری دەروێشەکان، قاپی ئاڵتوونی، پەنجەرەی پۆڵا و ئەو نەخۆشانەی کە بەپەت خۆیان بەپەنجەرەکانەوە بەستبووەوە. ئەو هەموو مۆمە کە خەڵکی پێشکەشیان کردبوو، چەند حەزمدەکرد کە دوو ڕیاڵم پێبوایە چەند مۆمێکم بکڕیایە و پێشکەشی ئیمام ڕەزام بکردایە. دیارە ئەگەر بە کوڕە مامەکەم یا بە حاجیم بگوتایە پارەم بدەنێ

خۆ ئەوان پارەیان دەدامێ، بەڵام لە تەواوی سێ مانگ بەیەکەوە بوونماندا هیچ یەکێک لەوان تەنها جارێک نەیانگوت پارەت پێویستە یان نا. لە تەواوی ئەو سێ مانگ و چەند ڕۆژەدا تەنها یەک جار لە مەشهەد چوومە حەمام. بەڵام چونکە منداڵێکی تەنها بووم هیچ کەسێک منی نەشۆرد، خۆم هەندێک ئاو و سابوونم لەسەرم هەڵسوو و هاتمە دەرەوە. ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە لەو هاوینە گەرمە و لەو گەشتە دووردرێژ و جادەی خۆڵ و ئەرەقکردنەوەدا و لەو بێ حەمامییەدا، دەبێت من چ بۆنێکی ناخۆشم لێهاتبێت؟ یان چۆن خەڵکی توانیویانە لەلامەوە دابنیشن. دیارە خۆم چەند جارێک سەرم لە ژێر بۆریی ئاوەکەدا شۆردووە، بەڵام بەئاوی سارد، چونکە ئەوکات ئاوی گەرم لە ماڵاندا نەبوو. لە مەشهەد نزیک لە ماڵی ئاغای میر جەلیلی لەلای فولکەی کارەبا کارگەیەکی کاشی دروستکردن هەبوو، هەندێک جار دەستی منداڵەکانم دەگرت و دەمبردن بۆ تەماشاکردنی کاشییەکان. ئەو سەردەمە کاشی تازە لە بیناسازیدا بەکاردەهات. ئەوکات لە یەزد لە نێو ژوورەکاندا خشتیان ڕادەخست، دیوارەکانیشیان بە گڵ و قسڵ سواخ دەدا. وابزانم لە ساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠) دا لە یەزد کاشی دروست نەدەکرا. ئەگەر هەشبووبێت زۆر کەم بووە. نزیکەی مانگ و نیوێک لە ماڵی خوداڵێخۆشبوو حسێن میر جەلیل بووین، چونکە ژوورەکان کەم بوون، من لە حەوشە دەنووستم. لەکۆتایی مانگی شەهریوەر (ناوەڕاستی ئەیلول) وردە وردە هەوا ساردی کرد و بەشەو سەرمام دەبوو، هەمان ئەو فەرشەی کە لەسەری دەنووستم، لەسەرمادا دەمدا بەخۆمدا. فەرش بەو هەموو تۆز و خۆڵەوە دەبێت سەروگوێلاکی من چی بەسەرهاتبێت! هەرچۆنێک بێت ڕۆژێک گەیشتینەوە یەزد. حاجی خانم جووتێک پێڵاوی (٣٢) ڕیاڵی و جزدانێکی بچووکیش کە نازانم بایی چەند بوو، بۆی کڕیبووم، ئەمە کرێی هاوینی من بوو. بڕیار وابوو بە لۆرییەکی مارسیدس بڕۆینەوە بۆ یەزد کە شوفێرەکەی حاجی عەلی بوو، جێگەی من لەسەرەوە بوو لە ئاستی شوفێرەکە باری ئۆتۆمبێلەکەش پەموو بوو لە مەشهەدەوە بۆ یەزد. بە حەوت ڕۆژ گەیشتین، ئۆتۆمبێلەکە لە ڕێگا زۆر خراپ دەڕۆیی. لە نێوان هەموو شارەکاندا دەوەستا، لە تەرپەت حەیدەریە ڕۆژێک ماینەوە، لە بجستان میوان بووین و ڕۆژ و تاقێک ماینەوە، لە تەبەس شەوو ڕۆژێک میوانی حاجی ئاغای مودەتپور بووین، کە خاوەنی گەراج بوو. لە تەبەس بینینی دارخورما بەلامەوە زۆر جوان بوو، یەکەمجار بوو کە دارخورما بە بەرەوە ببینم لە یەزد لە حەوشەی ماڵی مامدا دارخورما هەبوو بەڵام خورمای نەدەگرت، لە یەزد لە روبات خان و روباتی بادام پێشوازییان لە حاجی ئاغا کرد، ئەم روباتانە ئەم بیابانە چۆڵەیان وەک بەهەشت لێکردبوو، بەتایبەت بۆ منداڵێک کە لە گەرمادا لەبەر خۆر و

هەتاوی کەوێردا بەسەر ئۆتۆمبێلی بارەیەوە بێت، کەوێرێک کە تاچاو بڕکات هەمووی لم و زیخەلانە، پێچەوانەبوونەوەی تیشکی هەتاو سەرابێک لە بیابانی چۆڵ مرۆڤ دەخاتە بیرێکی قوڵەوە، چەندین کاتژمێر بەسەر باری ئۆتۆمبێلەکەوە کەوتبوومە بیرکردنەوە. لە بیری قوتابخانەدا بووم، قوتابخانە کرابووەوە بەڵام من لە باربەندی سەرەوەی ئۆتۆمبێل بووم، لەو بیابانی چۆڵ و دەشتی کەوێری لوت دا خوێندنەوەم دەکرد، کە چ بیبانێکە دەبێت زۆر بەهێواشی لێرەوە گوزەر بکەین، تا گەورەیی ئەوت بۆ ڕوون بێتەوە، ئێستا بەجادەی قیرتاو و ئۆتۆمبێلی خێرای بە سێ کاتژمێر و نیو لە تەبەسەوە دەگەیتە یەزد.

بەهەرحاڵ دوای نزیکەی سەد ڕۆژ لەم گەشتە و وەرگرتنی کۆلێک وانە لەم تەمەنەدا و بینینی تاران و مەشهەد کە زۆربەی هاوپۆلەکانم تا تەمەنی (٢٠) ساڵی نەیانبینی بوو، خواردنی زەلاتە و ماکەرۆنی و فێربوونی زۆرکاری وەکو شۆرین و منداڵ ژێرکردنەوە، لێدانخواردن بەدەستی مینا خانم و بە جلوبەرگی پیس و چڵکنەوە و بەسەروچاوی سووتاوەوە بەهۆی لێدانی خۆر لەسەر باری ئۆتۆمبێل و بەجووتێک پێڵاوی کەتانی (٣٢) ڕیاڵی و بەجزدانێکەوە (کە تا ساڵی ١٣٧٥-١٩٩٦ هەر مابووم)، گەیشتمەوە ماڵەوە. لە درێژەی ئەم گەشتەدا دایکم هیچ هەواڵێکی لە من نەبوو، ئەو کاتە تەلەفۆن لە گەڕەکەکەماندا نەبوو، تا تەلەفۆنی بۆ بکەم و نە هۆشی ئەوەشم هەبوو نامەیەکی بۆ بنووسم، بەڵام ئەو لە گەراجەکە هەواڵی پرسی بوو دەیزانی کە من لە تاران یا لە مەشهەدم، دایکم منی لەباوەشگرت و ڕای گوشیم کە هەرگیز ئەو ڕاگوشینەم لەیاد ناچێت. گوتی: پێم بڵێ بۆ کوێ چوویت و چیتکرد، بۆچی بەم شێوەیە هەتاو سووتاندویتی؟ هەموو گیانت تەپوتۆزە. بۆ ئەوەندە بۆنت دێت، نەچوویتە حەمام؟ کاتێک کەمێک باسی کارەکانم کرد و باسی نەچوونم بۆ حەمام کرد. گوتی: ئێمە ئەوەندە نەبوو نەبووین کە تۆ بە دیلی ببەن. هەرگیز لەوانە خۆشنابم و دایکیشم هەرگیز لێیان خۆش نابێت. هەتاکو ئێستاش واتە ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤) کە ئێستا دایکم تەمەنی (٨٠) ساڵە، هەر کاتێک بۆ مەراسیمی قورئان خوێندن، دەچین بۆ ماڵی حاجی کازم ئاغا، دایکم دەڵێت جووتە پێڵاوەکە و جزدانەکەیان بۆدەبەمەوە و لەبەر دەمیاندا دایدەنێم. بەڵام دوای ئەوەی چووم بۆ حەمام و لەبەرکردنی جلی پاک و هاتنی چەند دراوسێیەک بۆ لام، بەبۆنەی سەردانم بۆ مەرقەدی ئیمام ڕەزا، کەمێک هاتمەوە سەرخۆم. هەمان شەو لە حسێنیەی کۆلانی خەتیب مەراسیمی قورئان خوێندن بوو، ئاغای شێخ عەلی کە لە پلیکانەی یەکەم دنیشتبوو باسی حەرام و حەلاڵی بۆ دەکردن، دەیگوت: دەبێت کرێکار کارەکەی بەڕاستی بکات تا ئەو کرێیەی وەریدەگرێت حەلاڵ

بێت. یەک پاروو نانی حەڵاڵ کە بەرەنجی شان و هیلاکی دەستەکان و ئارەقی ناوچاوان پەیدا دەکرێت باشترە لە سەد مەن ڕۆنی زەردی ئاژەڵ کە لە ڕێگای حەرامەوە پەیدا کرا بێت. بەلام زۆربەی کرێکارانی چنین و ڕستن و هەلاجی و کە مافی ئەوەیان نەبوو لە حسێنیەکەدا بەپاڵ دیوارەکەوە دانیشتن و پشتبدەنەوە، کە دەبوایە لە ناوەڕاستدا دابنیشتنایە تا هیلاکی ڕۆژانەیان لە پشتیاندا دەرنەچێت، بەچاوێکی کراوە و گوێیەکی کراوە گوێیان لە وتەکانی ئاغای شێخ عەلی دەگرت، بەو پاروە نانە حەڵاڵەی کە بە پەموو پاککردن بەدەستیان دەهێنا و نەیاندەتوانی بەتەواوی سکی منداڵە برسییەکانیانی پێ تێربکەن، لە کەیف و خۆشیدا بوون، پارووە نانەکەی خۆیان زۆر پێباشتر بوو لە ڕۆنە زەردەکەی لێپرسراوانی کارگەی یەزد.

## پانتۆڵی کورت و چواری ئابان و شیری وشکی کافرەکان

ئەو ساڵە بۆ (٤) ی ئابان، ساڵرۆژی لەدایکبوونی محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی، دەبوو قوتابییەکان بە پانتۆڵی کورتەوە بۆ مەشق و ڕاهێنان بێنە قوتابخانە. ئێمەش دەبوو ئەو ڕۆژە لە ماڵەوە بەپانتۆڵی کورتەوە بڕۆین بۆ قوتابخانە، کاتێک بەدایکمم گوت کە دەبێت پانتۆڵی کورت بکڕم، دایکم گوتی: من ڕێگەنادەم کوڕەکەم بەپانتۆڵی کورتەوە بڕوات بۆ قوتابخانە.. لەگەڵ دایکی قوتابییەکانی تریش قسە دەکەم. سبەی نزیکەی (٣٠) کەس لە دایکی قوتابییەکان هاتن بۆ قوتابخانە و گوتیان ئێمە نامانەوێت منداڵەکانمان بە پانتۆڵی کورتەوە بێنە قوتابخانە. تەنانەت هەندێکیان دەیانگوت ئێمە پارەمان نییە تا پانتۆڵی کورت بۆ منداڵەکانمان بکڕین. لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو چەند قوتابییەک کە باوکیان کرێکاری کارگە بوو، تەنها یەک پانتۆڵیان هەبوو، ئەویشیان لەبەر دڕاوی و بێکەڵکی لە ئەژنۆوە بڕی بوو، واتا هەر زوو پانتۆڵی کورتیان دروستکردبوو پێوەی دەهاتن بۆ قوتابخانە، بەقاچی بچووک و باریک و لاتەوە، بەدەموچاوێکی چڵکن و ڕەشەوە بە برسێتی تەواوەوە بە کراسێکەوە کە هەندێکیان کراسە کۆنەی باوکیان بوو، چووک کرابووەوە و لەبەریان کردبوو. چەند شێوەیان جوان بوو، چەندە سەربازێکی ئابڕوومەندی ڕژێمی شاهەنشایی بوون. ڕژێم کە تازە دەیویست ناوی خوداڵێخۆش بوو دکتۆر محەمەد موسەدیق لە مێشکی ئەوانەدا دەربکات و بە جەژنی (٤) ی ئابان هەموو شوێنێک پڕ بکات لە شادی و شادمانی. دایکان چوونە لای ئاغا شێخ عەلی کوڕی ئایەتوڵڵا حاجی غولام ڕەزا خۆراسانی و باسی پانتۆڵی کورتیان بۆ کرد، هەمان کات بڕیار وابوو هەموو ڕۆژێک لە کاتی چێشتەنگاودا یەک پەرداخ شیر بدەن بە قوتانبیان، هەڵبەت ئەو شیرەش کە دەیاندا شیری وشک بوو، بەئاوی گەرم دەیانگرتەوە، شیرەکەش بۆ خۆی بوو بە کێشەیەک، ئاغا شێخ عەلی لەسەر مینبەری مزگەوت گوتی: ئەگەر ڕێکخەری قوتابخانە و بەڕێوەبەر داوا لە قوتابیان بکەن کە

پانتۆڵی کورت لەپێبکەن و شیری وشکی کافرەکان بخۆن، ئەوا خۆیان لە شەمەر و یەزدا خراپترن، لەسەر مینبەری مزگەوت گوتی: ئێستا با چوار قوتابی بڕۆن بۆ جەژنی چوارەمی ئابان، بەڵام قاچی ڕووت و سکی پڕ لە شیری کافر ڕاست نییە. لە کۆتاییدا بەهۆی فشاری دایکان و باوکانەوە بەڕێوەبەری پەروەردە گوتی: لەبەرکردنی پانتۆڵی کورت و خواردنی شیری وشک لە قوتابخانەکان بەپێی ئارەزووی قوتابییەکانە. لە قوتابخانەکەی ئێمە حەوت قوتابی پانتۆڵی کورتیان لەبەرکرد و چوون بۆ قوتابخانەی ماکار بۆ مەشق و ڕاهێنان. هەر هەمان حەوت قوتابی هەموو ڕۆژێک یەکی سێ پەرداخ شیریان دەخواردەوە. لە پۆلەکەی ئێمە ژمارەیەکی زۆر کەم شیرەکەیان دەخواردەوە. چەند کەسێک دەترسان بە خواردنی شیر کافرببن و بچنە دۆزەخ. شیرەکەیان لەلای باخچەکەوە دەڕشت یان دەیانکردە توالێتەکەوە. لە دواییدا ئاغای جەلیل قوتابییەکانی ڕیزکرد و پێیگوتین: هەرکەسێک شیر ناخوات با وەرینەگرێت، بەڵام ئەگەر کەسێک وەریبگرێت و بیڕێژێت ئەو کات بەقامچی هەموو گیانی شین دەکەمەوە. پەیدابوونی شیری وشک و فێربوونی قوتابییەکان بە خواردنی بووە هۆی ئەوەی کە ئاغا سەید عەلی ناچار بکات ئەو مەڕانەی لە قوتابخانە ڕایگرتبوون و لە گەوڕی نێوان دوو پۆلەکەی کردبوون، بفرۆشێت، چونکە بەشیری وشک ماستی دروستدەکرد بۆ هەندێک لە مامۆستاکان، بەڵام گامێشەکان کە ماست و پەنیری مامۆستاکانی دابیندەکرد هەرمانەوە. ئاغا محەمەدی دوکانداری سەرکۆڵانەکەش، بەشیری وشکی کافرەکان کە لە کارگوزاری قوتابخانەی دەکڕییەوە ماستی دروستدەکرد. بەمشێوەیە شیری وشکی کافرەکان دەچووە سکی هەموو کەسێکەوە. ڕۆژێک بینیم مامۆستایەک زۆر بە بەلەزەتی شیری دەخواردەوە، منیش زۆر بە وردی سەرنجمدەدا، ئەویش کە زانی من بەوشێوەیە سەرنجی دەدەم پەرداخێک شیری کوڵاوی بۆهێنام، منیش لێموەرگرت و خواردمەوە. گرنگ ئەوەیە بەهیچ شێوەیەک بیرم لەوە نەدەکردەوە کە بە خواردنەوەی ئەو شیرە دەچمە دۆزەخ. لەوەبەدوا منیش جارجار پەرداخە شیری کافرەکانم دەخواردەوە و ئومێدەوارم و دڵنیاشم کە خودای گەورە و بەخشندە دەمبەخشێت لە خواردنەوەی شیری وشکی کافرەکان. ئیتر من تەمبێ بووم و تێگەیشتم کە دەبێت من و هەموو هاووڵاتیەکی ئێرانی ئیتر گەنم، گۆشت، کەرە، پەنیر، ماکەرۆنی، نۆک، لۆبیا ڕۆن و تەواوی شتەکانی تر کە ئەو کافرانە بەرهەمی دەهێنن و خواردومانن و دەبێت بیانخۆین.

چەندین منداڵ بە شیری وشکی کافرەکان گەورە بوون و تەنانەت بوون بە کاربەدەست و خزمەتی وڵاتیشیان کرد، خودا لە ئێمە ببورێت کە بەپێی پێویستی

خۆمان شیر بەرهەم ناهێنین و پێویستمان بە شیری وشکی کافرەکان دەبێت. تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی نووسینەوەمان بەپێنووسی فەرەنسی و مەرەکەب دەنووسییەوە، کەئەمەش چیرۆکێکە بۆ خۆی، هەمیشە هەموو دەستمان دەبوو بە مەرەکەب و جلەکانمان تێوەدەچوو. زۆربەی قوتابییەکان جانتایان نەبوو، مەرەکەبەکەیان دەخستە گیرفانی چاکەتەکانیانەوە، مەرەکەبەکە لە گیرفانیادا دەرژا و هەموو چاکەتەکەیان دەبوو بە مەرەکەب. چەند ساڵێک بوو قەڵەمجاف پەیداببوو، بەڵام مامۆستاکان رێگەیان نەدەدا کە ئێمە بە قەڵەمجاف بنووسین، دواتر لە پۆلی شەشەمەوە رێگەیان پێدابن کە بە قەڵەمجاف بنووسین، ئەوەش گۆرانکارییەکی گەورەبوو، خواردن و نووسین لە قوتابخانەدا چیرۆکێکی درێژە. کە پێویستە بەجیا بنووسرێت.

## نامە نووسین بۆ ژنان

ماوەیەک بوو بە قەڵەمجاف نامەم بۆ دراوسێکان دەنووسی، من لە تەمەنی (١٠) ساڵیدا یەکەم نامەم نووسی، ژمارەیەکی زۆر لە گەنجەکان بۆ کارکردن چووبوون بۆ تاران، دایک و باوکیان خوێندەوارییان نەبوو، دەبوایە کەسێکیتر نامەی بۆ بنووسینایە. بیبی هەلی قسەکانی دەکرد و منیش لە نامەکەدا دەمنووسی بۆ حسێنی کوڕی و ملوکەی کچی کە ڕۆیشتبوون بۆ تاران. نامەم بۆ حاجیکیش دەنووسی، حاجیک ژنێک بوو هاوسەرەکەی ڕۆیشتبوو بۆ ئەهواز بۆکارکردن. (بۆیە پێیان دەگوت حاجیک چونکە لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قورباندا لەدایکببوو)، چونکە پارەی نەبوو و نەچووبوو بۆ حەج. نامەم بۆ پیرێژنێکی یەهودیش دەنووسی کە کوڕەکەی ڕۆیشتبوو بۆ ئیسرائیل. نامەی کوڕەکەشی کە لە ئیسرائیلەوە دەینارد هەر من بۆم دەخوێندەوە. ئەم ژنە کوڕێکی تریشی هەبوو هەر لە یەزد دەژیا و ناوی یەعقوب بوو، لەو ساڵانەدا نزیکەی (٢٠٠٠) یەهودیی لە یەزد هەبوون، بەڵام بەپێی ئاماری ساڵی (١٣٧٥-١٩٩٦) تەنها (١٠٠) کەس یەهودی لە شاری یەزد مابوون. یەهودییەکان وردە وردە دەڕۆیشتن بۆ ئەمریکا و ئیسرائیل. یەهودییەکانی یەزد زۆربەیان کاسبکاربوون و لە بازاڕدا دوکانی قوماشفرۆشی و وردەفرۆشیان هەبوو، هەندێکشیان عەرەقیان دروستدەکرد و عەرەقیان دەفرۆشت. ئەوان قوتابخانەی تایبەتیان هەبوو بۆ منداڵەکانیان. ئێمە هاوپۆلی زەردەشتیمان زۆر هەبوو، (دیارە ئەمانیش زیاتر دەچوونە قوتابخانەکانی مارکار و کەیخوسرەوی) بەڵام تەنها یەک هاوپۆلی یەهودییمان هەبوو، ئەویش لە پۆلی (١٠). ئەو ژنە یەهودییەی کە من نامەم بۆ دەنووسی، وردەفرۆشی گەڕۆک بوو، دەرزیی و سنجاق و تەوقەی سەر و دوگمە و دەرمانی گیایی و شتی لەو بابەتانەی دەفرۆشت. ئەو کاتە زنجیر نەبوو و ئەگەر هەشبووبێت پێشتر، من نەمدی بوو. زنجیر داهێنانێکی گرنگە کە لە ساڵانی چلەکاندا لە یەزد بڵاوبووەوە و لە هەموو شوێنێک هەبوو، بۆ

# شازاده‌ی حه مام

یه‌كه‌مجـار مـن له سـالّی (١٣٤٣-١٩٦٤) یـان (١٣٤٤-١٩٦٥) بـوو كه زنجیـرم له‌و ژنه یه‌هودییه كڕی. ئه‌و ژنه له یه‌كێک له نامه‌كانیدا پرسیاری له كوڕه‌كه‌ی كرد -كه نـاوی هـاروون بـوو، له ئیسـرائیل ده‌ژیـا- ئایـا كـارێكی باشـه ئه‌گه‌ر ئێمه هه‌موومـان بێین بۆ ئیسرائیل؟ پاش مانگێک هاروون نامه‌یه‌كی هات و وه‌ڵامی دابوه‌وه كه ئیسرائیل ولاتێكی زۆر باشه و لێره هه‌موو شتێک زۆره و زۆر خۆشـه، بۆیه ده‌بێت ئێوه هه‌مووتـان بێن بۆ ئیسرائیل، به‌ڵام دڵنیای كردبوونه‌وه كه ده‌بێت ژن بۆ ئه‌لیاس بهێنێت ئه‌وكاته بچن بۆ ئیسـرائیل. ئه‌لیـاس ئه‌وكـات ته‌مه‌نـی سـێ سـاڵ بـوو، به‌م شـێوه‌یه هـاروون یه‌عقـوبی تێگه‌یانـدبوو، كه ئیسـرائیل ئێسـتا زۆر بـاش نییه، لانـیكه‌م (٢٠) سـاڵی تـر بـڕۆن بـۆ ئیسرائیل. یه‌هوودیه‌كانی یه‌زد زۆربه‌یان نه‌خوێنده‌وار بوون، ژیانی ئیسرائیلیان له ژیانی یه‌زد خراپ تربوو، كه هاروون پێیگوتبوون ئه‌لیاسی سێ ساڵه ژنبهێنێت و ئه‌وكات بچن بۆ ئیسـرائیل، مـن له‌م نـامه‌یه‌وه تێگه‌یشـتم كه هه‌میشـه قسـه‌ی ڕاسـت نابێت به هـاوار بگوترێت، به‌ڵكـو ده‌بێـت زۆر به‌نهێنـی باسـی لێبكرێـت. نـامه‌م بـۆ چه‌نـد ژنێكـی تـریش ده‌نووسی كه هاوسه‌ره‌كانیان له بۆمبای و پونـای هیند كاریـان ده‌كرد، ئه‌وپیـاوانه‌ی كه بـۆ كـاركردن ده‌چـوون بـۆ هینـد، لانـیكه‌م دوو سـاڵ له‌وێ ده‌مـانه‌وه، پاره‌یه‌كیـان كـۆده‌كرده‌وه و ده‌هـاتنه‌وه، له یه‌زد خه‌رجیـان ده‌كـردو پـاش (٦) مـانگی تـر ده‌گه‌ڕانه‌وه بۆهیند. حاجی محه‌مه‌د له بۆمبای سینه‌مای هه‌بوو، گوزه‌رانی باش بوو، حاجی مه‌حمود علی له پونای ڕێستۆرانتی هه‌بوو، حاجی قاسم ئاغـای له پونـای ئوتێلێكی به‌ڕێوه‌ده‌برد، به‌گشتی من مه‌حره‌می نه‌هێنییه‌كانی ئه‌م ژنانه بووم. داواكارییه‌كانیان ده‌گوت و من بۆم ده‌نووسـین، ته‌نهـا ده‌یانویسـت هاوسـه‌ره‌كانیان بزانن و ئاگاداریـان ده‌كردمه‌وه كه مـن نـاوه‌ڕۆكی نامه‌كانیـان به‌هـیچ كه‌سـێک نه‌ڵـێم، ته‌نـانه‌ت به دایكیشـم. منـیش هه‌رگیـز نه‌مدركاندووه، له نامه‌كانیاندا باسـی خه‌رجی پـاره و نه‌خۆشـی و دووریـی و دڵته‌نگیـان ده‌كرد. یه‌كێک له ژنه‌كان كه پیاوه‌كه‌ی (٣٠) ساڵ له خۆی گه‌وره‌تربـوو، سـێ سـاڵ بـوو چووبوو بۆ بۆمبای، داوای له پیـاوه‌كه‌ی كردبـوو كه ته‌ڵاقـی بـدات، به‌ڵام پیـاوه‌كه‌ی هه‌ر وه‌ڵامـی نامه‌كانیشـی نه‌ده‌دایه‌وه، ئه‌گه‌رچـی جـار جارێـک پـاره‌ی بۆده‌نـارده‌وه... ئـای له به‌دبه‌ختی ئه‌و ژنانه.

نه‌ورۆزی سـاڵی (١٣٨٢-٢٠٠٣) له‌گه‌ڵ دایكم چووین بـۆ سـه‌ردانی یه‌كێک له‌و ژنـانه كه ته‌مه‌نـی نـزیكه‌ی (٨٠) سـاڵ ده‌بـوو، ئه‌و ژنه له سـاڵی (١٣٥٨-١٩٧٩) دا پیـاوه‌كه‌ی مردبـوو، یـادی بیره‌وه‌رییه كۆنه‌كـانی ده‌كـرد و گـوتی: منیـان له‌به‌ر خـاتری پـاره دا به حـاجی، به‌ڵام بنه‌مـاڵه‌كه‌م ده‌سـتیان به‌سـه‌ر پاره‌كـانی حاجیـدا گـرت و منـیش بێچـاره مـامه‌وه. هه‌مـوو ته‌مه‌نـی گه‌نجیم، بێ پیـاو بـووم، كاتێـک حـاجی له بۆمبـای گه‌ڕایه‌وه و

هاتەوە پیر و پەکەوتە بوو، دەبوایە خۆم لە تەشتدا بمشۆردایە، کاتێک تازە گەیشتمە هەرەتی گەنجی بوومە بێوەژن و بێ هاودەم. بەهەر شێوەیەک بێت کۆچی پیاوان بۆ وڵاتان و کارکردن و نەهاتنەوەیان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ و بوونی ژنی گەنج و جوان، شێوە بێوەژنییەک بوو کە گەڕەکەکەی ئێمە پڕ بوو لەم جۆرە بێوەژنانە. لەلایەکی ترەوە بوونی ژمارەیەکی زۆر لە بێوەژنی بەتەمەن و کەم دەرامەت و برسی، ئەمەش کێشەیەکی تر بوو، کچە بچووکەکان دەدران بە پیاوی (٣٠-٤٠) ساڵە، کاتێک ئەم کچانە دەگەیشتنە تەمەنی (٣٠) ساڵی پیاوەکانیان مردبوون. بیبی مەرزیەی نۆ ساڵە درابوو بە ئاغای (ڕ)، ئاغای (ڕ) دەیگوت من چەند ساڵێک منداڵم بەخێوکردووە، ئینجا لەگەڵ بیبی مەرزیە هاوسەرگیریم کردووە، مەبەستی ئەوە بوو کە ژنەکەی ئەوەندە تەمەنی کەم بووە وەک منداڵ بەخێوی کردووە. کۆچی دوورو درێژی هاوسەران و نەبوونی هۆکارەکانی گواستنەوەی خێرا و جادەی خۆڵ، یەکێک بوون لە هۆکارەکانی زۆر مانەوەی پیاوان لە شوێنی کارەکانیاندا، هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەو ژنە جوان و گەنجانەی کە پیاوەکانیان بۆ ماوەیەکی زۆر دەڕۆیشتن، وەک بێوەژنیان لێدەهات و منداڵە وردەکانیان وەک هەتیوی بێ باوک وابوون. من لانیکەم سێ منداڵ دەناسم کە تا چوار ساڵی باوکی خۆیان نەبینی بوو، کاتێک باوکیان چووبوون بۆ هیندستان، ئەوان لە سکی دایکیاندا بوون، کاتێک باوکیان چووە بۆ هیند بۆ کارکردن و تا دوای چوار ساڵ نەگەڕاونەتەوە، دیارە هەندێک لەم پیاوانە لە هیندستان یش ژنیان هەبووە، هەر بۆیە درەنگتر دەگەڕانەوە.

قسەمان لەسەر نووسین بوو بە قەڵەمجاف، کە چۆن قوتابیان نووسینەوەیان بە قەڵەمجاف دەنووسیەوە. لێدان بەدەستی مامۆستاکان و نمرە داشکاندن. قەڵەمجاف لە دەیەی (١٣٣٠-١٩٥٠) دا لە یەزد وەکو کۆمپیوتەری ساڵەکانی (١٣٧٠-١٣٨٠-١٩٩٠-٢٠٠٠) وابوو. قوتابیان لە پێش مامۆستاکانیان و پەروەردەوە بوون بەهەمان شێوەی ئێستا کە لە زۆبەی شارە گەورەکاندا بەتایبەت شاری تاران، گەنجەکان لە ناسین و بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و سوود وەگرتن لە ئینتەرنێت زۆر لە پێش مامۆستا و پەروەردەوەن، فێرکار و پەروەردەکار هەمیشە لە دوای خوێندکارانەوە بوون. لە پێداویستیەک کە پەروەردە و فێرکردن خۆی تاکە لایەنی دابینکردنی هەندێک لە ئامانجەکانی وڵات بووە، وەک پێشکەشکردنی شیری وشک یان بە نەوتکردنی سۆپاکان، بە هەر شێوەیک بێت پەروەردە و فێرکردن کە خۆی هۆکاری نوێ سازییە لە وڵاتی ئێمەدا، لە زۆربەی پێویستییەکانی خۆی لە کۆمەڵگەدا لەدواترە. من باش لە بیرمە کاتێک بڵندگۆ پەیدابوو خەڵکی ویستیان لە مەراسیمی قورئان خوێندندا سوودی لێ وەربگرن،

لە هەنـدێک لە مینبەرەکانـدا بە حەرام و شـتێکی خراپیـان دەزانـی و دەیـانگوت نابێـت بەکاربهێنرێـت. لەبیـرمە لە سـاڵانی (١٣٢٣-١٣٣٥- ١٩٥٤-١٩٥٧) دا، تـازە ویسـتیان لە حسـێنیەی پشـتی بـاخ بڵنـدگۆ بەکـاربهێنن، یەکێک لە وتاربێژەکـانی مینبەرەکـان زۆر بە خراپی دژایەتی دەکرد، چونکە حسـێنییەکە گەورەبـوو نزیکەی (٢٥٠٠) کەس بەشداریان تێداکردبوو، دەنگی وتاربێژەکە نەدەگەیشتە هەموو لایەک، ناچار کەسێک لە ناوەڕاستی حسێینەدا وتەکانی وتـاربێژەکەی دووبـارە دەکردەوە، بەڵام هەمـان وتـاربێژ کە چەندین سـاڵ بڵنـدگۆی بەحەرام دەزانـی، دیـارە یەکەم وتـاربێژ بەئاسـانی سـوودی لە بڵنـدگۆ وەرگرت خودالێیخۆشـبوو فەلسەفی بوو، کە وتـاربێژێکی بەناوبانگ بـوو، کاتێک ڕادیۆ بوو بە شتێکی گشتی ئاغا شێخ عەلی کوڕی حاجی شێخ غولام ڕەزا خۆراسانی ڕادیۆی بە حەرام دەزانـی. ئەوەی کە قسـەی ڕادیـۆی بە حەرام دەزانـی تەنـانەت هەنـدێک لە شـوێنکەوتووانی لەوبـاوەڕەدابوون کە ئەگەر ڕادیـۆی دوکانەکـان بشـکێنن، ئەوا دەچـنە بەهەشـتەوە. تەنهـا پـۆلیس و دادگـا توانیـان پێش بەو جـۆرە کەسـانە بگرن. هەمـان ئەو کەسـانە کاتێـک تەلەڤزیـۆن پەیـدابوو، ئەویشـیان بەحەرام نـاوبرد، چەنـدین سـاڵ دوای تەلەڤزیۆن سوودوەرگرتن لە ڤیدیۆ و بینینی سەتەلایت و ئینتەرنێت ڕووبەڕووی هەمـان بەلا بـووەوە. لەکاتێکـدا کە خەڵکـی بەسـەبر و تێکۆشـانی خۆیـان سـوودی ئەمانەیـان بەگشتی کرد، خودا دەزانێت چەندین هەزار کەس بەهۆی ڤیـدیۆوە فایلیـان بـۆکراوەتەوە. بانگکراون بۆ دادگا و چەندین کەسی تر بەهۆی سەتەلایتەوە فایلیان بۆکراوەتەوە.

## ترس لە دێو و جنۆکە

لەو ساڵانەدا ڕادیۆ کەم بوو، تەلەڤزیۆنی هەر نەبوو، تەنانەت لە شارێکی گەورەی وەکو تارانیش تەلەڤزیۆن نەبوو. گەورەترین فێرگەی خەڵکی کۆڕ و کۆبوونەوەی قورئان خوێندن بوو. من و منداڵانی هاوتەمەنی خۆم، زۆر شت لەو کۆڕانەوە فێربووین، زۆر باوەڕمان بەم کۆڕ و کۆبوونەوانە هەبوو. کێشەی سەرەکی ئەوەبوو، ئەو سەردەمە لە شارەکاندا مامۆستای شارەزا زۆر بەکەمی دەهاتن بۆ ئەو کۆڕانە. خەڵکی دەستی بە ئەوان نەدەگەیشت، زۆربەی مەراسیمەکان خەڵکی زۆر شارەزاییان تێدا نەبوو، تەنانەت نەیاندەزانی وەڵامی پرسیارێکی سادەش بدەنەوە. وتاربێژێک لە گەڕەکی ئێمە هەبوو، خوێندەوارییەکی زۆر کەمی هەبوو، چەند شەو لەسەر مینبەر دەربارەی جنۆکە و دێوی بیابان قسەی دەکرد، لەبارەی شوێنی ژیانی جنۆکە و دێو (لە نێو کانی و جۆگە ئاوەکان، حەمام و بیری ئاو تانکی ناو گۆلە ئاوەکان) نینۆکی جنۆکە. جل و بەرگی جنۆکە، شێوە و قسەکردنی جنۆکە، یەک شەویش تەنها باسی تێکەڵاوبوونی مرۆڤ و جنۆکە بوو، پیاوێکی زۆر بەڕێز هەبووە لە گەڕەکەکەمان کە کرێکاری دروستکردنی شیرینی بوو لای حاجی خەلیفەی ڕەهبەر، ئەم پیاوە زۆر پیاوێکی پاک و ڕێکوپێک بوو، بەجۆرێک کە لە هەر (١٠-١٢) مانگ نزیکەی (٢٠) ڕۆژێک شێت دەبوو، ئەم وتاربێژە لەسەر مینەر دەیگوت ئاغا محەمەد عەلی نموونەیەکە لەو کەسانەی کە جنۆکە چووەتە لەشیانەوە، پێویستە ئەم نزایانە بکەین تا جنۆکەکان لە گیانی ئەو بچنە دەرەوە. ئینجا نزاکەی دەخوێند، شەوێکیان لەسەر مینەبەر دەنگێکی دەربڕی لە شێوەی دەنگی جنۆکەی ناو گیانی مرۆڤ، دواتر گوتی ئەگەر شەوێک لە کۆڵانێکی تاریکدا (دیارە ئەوکات بەشەو هەموو کۆڵانەکانی یەزد تاریک بوون) کەسێکی نەناسراو یان ناسراوت بینی و داوای شتێکی لێدەکرێت ئەو کاتە گومانت هەبوو، چونکە لەوەیە جنۆکە بەشێوەی دراوسێکەت یا براکەت خۆی نیشان دابێت. بەو قسانەی ئاغا شێخ و نەبوونی

کارەبا و ڕووناکی لە کۆڵانەکانی گەڕەکدا ترس و خۆف لە مێشکی منداڵاندا پەرەی دەسەند. ئەگەر بەشەو نینۆکەکانت بکەیت یا ئاو بە پشیلەی ڕەشدا بکەیت ئەوا ئەگەری چوونی جنۆکە بۆ ناو گیانت زیاترە. بەیانیان زوو پێش مەلا بانگدان کە بۆ وسڵ دەرکردن چوویتە سەر کانی ئاو یا حەوز و جۆگەی ئاو، ئەگەر کەسێک لە ئاوەکەدا بوو سڵاو بکەن، وریابن بەسەریدا نەکەون، چونکە ئەوە جنۆکەیە، جێگەی دێوەکان لە بیابانەکانە، دێویش جۆرێکە لە جنۆکەی بیابان. لە بیابانەکانی نێوان یەزد و تەبەسیش دێوێکی زۆر هەیە، من لە زۆرێک لە کاروانچییەکانی وەک سەید ئاغا تەرزجانی و ئاغا یوسفم بیستووە کە لە بیابانەکانی نێوان تەبەس و یەزد دێویان بینیوە. هەر لەوانم بیستووە کە دێوەکان کاروانچییەکان دەدزن و بۆ هەمیشە ونیان دەکەن. هەربۆیە من و منداڵانی هاوتەمەنی من ترسێکی زۆر چووە مێشکمانەوە. شەوانە لە کۆڵانە تەنگ و تاریکەکان و ژێرزەمینە تاریک و بێ کارەباکان خۆفمان دەکرد و تەواو دەترساین. ڕۆژێک قوتابیانی پۆلی پێنجەم داوامان لە ئاغای فەرەحناکی مامۆستای پۆلی پێنجەم کرد، کە دەربارەی جنۆکە و دێو هەندێک قسەمان بۆ بکات، ئەم مامۆستا بەڕێزە کە ویستی وانەی خۆی تەواو بکات و زانیبووی ئێمەی منداڵان بەم قسانەی ئاغا شێخ ترساوین، گوتی: هەر کەسێک دەیەوێت شتێک تێبگات لەبارەی جنۆکەوە با دوو سبەی لای عەسر بێتەوە بۆ پۆلەکەی خۆی، دایک و باوکیشتان ئەگەر دەیانەوێت لەبارەی جنۆکەوە شتێک بزانن دەتوانن لەگەڵ ئێوەدا بێن بۆ قوتابخانە، هەموو قوتابیانی پۆلی پێنجەم بڕیاربوو لە قوتابخانە بمێننەوە، ژمارەیەک لە قوتابیانی پۆلەکانی تریش هەر مانەوە، دوو سبەی کاتژمێر چوار و نیوی دوانیوەڕۆ بەشێکی زۆری دایکان وباوکان هاتن بۆ قوتابخانە.

مەلایەک هات کە من ئەوم نەدەناسی، دوایی تێگەیشتم کە یەکێکە لە مەلا باش و بەناوبانگەکانی یەزد بەناوی حاجی ئاغای سەعیدی ناسراو بە (ڕێمان)، هاتە قوتابخانە و باسی جنۆکەی کرد، لەسەر بنەماکانی حەدیس و قورئان، قسەکانی ئەومەلایە بووە هۆی ئەوەی کە ترسی جنۆکە و دێو لە مێشکی منداڵان و تەنانەت لە مێشکی هەندێک لە دایک و باوکانیش دەربچێت. بەڵام خۆزگە ئەم جۆرە کۆڕانە چەندین جار دووبارە بکرایەتەوە، من تا ئێستاش کە تەمەنم (٥٥) ساڵە، لە تاریکی شەو بەتایبەت کە بەتەنها لە نێوان یەزد و تەبەس ئۆتۆمبێل لێدەخورم، هەندێک جار کە ئەم قسانەم بیردێتەوە کە لە بارەی جنۆکە و دێوەوە دەکران، خۆف دامدەگرێت. جارێکیان لە ساڵی (١٣٧٩-٢٠٠٠) دا، بەتەنها لە مەشهەدەوە دەهاتم بۆ یەزد لە نزیک گۆڕەپانی خان، نزیکەی کاتژمێر یەکی دوای نیوەشەو لەو بیابانە چۆڵەدا بیرم لە قسەکانی حاجی ئاغای مینبەری و

سەید ئاغا تەرزجانی دەکردەوە، کە کاروانچی بوو چەندین جار بە حوشتر لە یەزدەوە چووە بۆ مەشهەد، سەیرمکرد یەک لەشکر جنۆکە و دێو هاتە بەرچاوم، منیش دەستمکرد بە سەڵاوات لێدان لە گیانی پاکی حەزرەتی محەمەد و زیادکردنی دەنگی رادیۆی ناو ئۆتۆمبێلەکەم و بەخێرایی پێم لە بەنزیندا و ڕۆیشتم، پاشان لە ئۆتۆمبێلەکەم دابەزیم و سەیری ئاسمانم کرد، جوانترین ئاسمانی ساف و پڕ ئەستێرە، وەک ئەوەی لەژێر سەربانێکدابم و هەزاران ئەستێرە لە پشتسەرمەوە بن، هەر لەوێ کڕنوشم برد بۆ خودای گەورە، لە هەمان شوێن و بیابانی چۆڵ و ترسناکدا دوو ڕکات نوێژم کرد وەک ڕێزێکی زۆر زۆرم بۆ پەروەردگاری مەزن، بەمشێوەیە منیش لەو بیابانە چۆڵەدا ترسێکم لێنیشت.

بیروباوەڕێک کە لە منداڵییەوە دەچێتە مێشکی خەڵکەوە کاتی گەورە بوونیش وا بەئاسانی لەبیریان ناچێتەوە. خودا مرادی ئەو مامۆستا بەڕێزە ئاغای قەرەحناک بدات، کە قسەکانی وتاربێژێکی نەزانی بە وتاری مەلایەکی دانا هەڵوشاندەوە. دەنا خۆ دیار نەبوو ئێمەی منداڵان تا چ ڕادەیەک لە ترس و خۆفی جنۆکەدا دەمباینەوە، دەبینم کە ژنان و پیاوانی (٧٥-٨٠) ساڵەی یەزدی کە وتاری کەسانی وەکو حاجی غولام ڕەزای خۆراسانی، حاجی ئاغای سەعیدی، حاجی ئاغای وەزیرت، حاجی ئاغای مودەڕیس کەسانی وەک ئەمانە هەست پێناکەن، هەمیشە ئەسیری وتەکانی کەسانی وەک ئەم وتاربێژەی گەڕەکی خۆمانن. لە دەستی جنۆکە و دێو ڕزگاریان نابێت. دیارە ئەم باوەڕ و ترسە بە جنۆکە و دێو تەنها تایبەت نییە بە خەڵکی ئێران و یەزد، بەڵکو لە هەموو جیهاندا ئەم جۆرە بیروباوەڕ و خورافیاتە هەیە. زۆرێک لە چیرۆکە کۆنەکانی ئەمریکایی، ئەوروپایی، ژاپۆنی ئەفریقایی دەبنە هۆی ئەوەی منداڵەکانیان لە جنۆکە بترسن. هەرچەندە کە ئێستا ئەم بیروباوەڕە کاڵبووەتەوە، بەڵام هەمان ئەم چیرۆک و ئەفسانەیە ناڕاست و ترسناکە گۆڕاون بە جۆرەها فیلمی کارتۆنی شاد یاخود ترسناک کە ملیۆنەها منداڵ لە جیهاندا دەترسێنن. ئەفسانە و چیرۆکی شادی ئیرلەندی شاد، لەم سەردەمەدا لە هەمووان زیاتر دەبێتە هۆی باوەڕی ئیرلەندییەکان بە جنۆکە ئێستاش فەرموون لەگەڵ ئەم چیرۆکە کورتە لەسەر جنۆکە.

(کاتلین هەموو شەوێک بەهۆی ترسی لە جنۆکە قاپێک شیرو هەندێک نانی لە بەردەگا دادەنا، ئیسکارلیت بەو کارەی کاتلین پێدەکەنی. سبەی کە هەڵدەسان سەیریاندەکرد شیرەکە خوراوە و نانەکەش نەماوە، کاتلین باوەڕی وابوو کە جنۆکەکان خواردوویانە، بەڵام ئیسکالیت بە گاڵتە و پێکەنینەوە دەیگوت ئەوە پشیلەکە خواردوویەتی).

## بەشێک لە یادەوەریی مەراسیم

ئێستا کە قسەمان لەسەر هەندێک لە مەراسیمەکانە، خراپ نییە کە چەند یادەوەریی لە مراسیم خوێنەکان باس بکەین. لەبیرمدێت لە یەزد مەراسیم خوێنێک هەبوو کە هەردوو قاچی ئیفلیج بوو، دوو داری دەخستە ژێر باڵی و ئەوسا دەیتوانی بڕوات و خۆی دەگایاندە یەکەم پلیکانەی مەراسیم خوێندنکە، لەوێ دادەنیشت و مەراسیمی گەرمی بەڕێوەدەبرد. بەڵام جاروبار هەندێک قسەی دەکرد کە لە یادی منداڵانی وەکو مندا دەمایەوە ساڵی (١٤٤١-١٩٦٢) بوو، . بیرمە لە ماڵێک مەراسیم هەبوو، شێخ لە پلیکانەی یەکەمدا دانیشتبوو، جگە لە بەجێهێنانی مەراسیم هەندێک قسەی کرد. گوتی: من ئەم منداڵەی خۆمم بردە لای دکتۆر سینا (دکتۆر سینا یەکێک بوو لە دکتۆرە باشەکانی ئەو سەردەمەی یەزد)، سەرەتا دوو تومەنی لێوەرگرتم، پاشان بردیانە ژوورەوە، ئەوکاتە نرخی بلیتی دکتۆرێکی شارەزا لە کلینکی خۆی دوو تومەن بوو. شێخ بەردەوامبوو لە قسەکردن و گوتی: بەحیساب پشکنین و تاقیکردنەوەی خوێنی بۆ منداڵەکە کرد و پاشان گوتی ئەم منداڵە ئاسن لە گیانیدا کەمە. ئەها خەڵکینە، سەیرکەن خەڵکینە بۆچی گیانی مرۆڤ ئاسنی هەیە، ئاخر خەڵکینە ئەم دکتورانە مەخسەرەن. ئاخر ئەمە چ قسەیەکە ئەوان دەیکەن، لاشەی مرۆڤ ئاسنی تێدایە، جا دکتۆر دەیگوت ئەم منداڵە ئاسنی کەمە. جا بزانن کاکی دکتۆر چی دەگوت، دەیگوت دەبێت زەردێنەی هێلکە بخوات و سپیناخ بخوات. ئاخر بەندەی خودا، ئەگەر منداڵەکە ئاسنی کەمە دەبێت پاچ و بێڵ و خاکەناز بخوات، ئاخر خەڵکینە تکایە ئەگەر نەخۆشتان هەبوو، مەیانبەنە لای ئەم دکتۆرانە کە هیچ شتێک نازانن، بیانبەن بۆ لای ئەو حەکیمانەی خۆمان، ئەم هەموو منداڵەم گەورە کرد و ئەم هەموو منداڵەم بردنە لای حەکیمەکانی خۆمان دوو ڕیاڵ پارەم نەداوە، هیچ قسەیەکی مەخسەرەشم لێ نەبیستوون، بڕۆم دوو تومەنیش بدەم و پێمبڵێن لەشی منداڵەکەت ئاسنی کەمە. بەڕاستی ئەمە نیشانەی ئاخر زەمانە...

خۆ هه‌موو مه‌راسیم خوێنه‌کان به‌و جۆره نه‌بوون، ئێستا که ئه‌م قسانه‌م له‌م ئاغا شێخه بیست، با ئه‌مه‌ش له‌باره‌ی خودالێخۆشبوو شێخی زار چییه وه بڵێم، زارچ و ئه‌شکه‌زه‌ر، دوو گوندی نزیک به‌یه‌ک بوون نێوانیان ته‌نها (١٠٠٠–١٥٠٠) مه‌تر ده‌بوو. له نێوان هه‌ردوو گونده‌که‌دا کێڵگه‌ی حه‌کیم ئاوایه، ئێمه‌ش له‌وێ هه‌ندێک موڵک و ئاومان هه‌بوو، هه‌میشه له نێوان ئه‌م دوو گونده‌دا –که ئێستا به‌شێکن له‌شاری یه‌زد– کێشه هه‌بوو له ساڵه‌کانی (١٣٣٠–١٣٤٠_١٩٥٠–١٩٦٠) ئه‌شکه‌زه‌رییه‌کان له زارچییکان زیاتر که‌سانی خوێنده‌واریان هه‌بوو، چونکه قوتابخانه زووتر له ئه‌شکه‌زه‌ر کرابووه‌وه. بڕیاربوو قوتابخانه‌یه‌کی ناوه‌ندیی له یه‌کێک له‌م دوو گونده دروستبکرێت. هه‌ر دوو گوند کێشه‌که‌یان به‌هۆی دروستکردنی ئه‌و قوتابخانه‌یه‌وه گه‌وره‌تر بوو. به‌ڕێوه‌به‌ریتی په‌روه‌رده‌ش نه‌یتوانیبوو بڕیاری پێشنیاری خۆی بدات که قوتابخانه‌که له کام گونده‌یان دروستبکات. بۆیه بڕیاری دروستکردنه‌که‌یان به قائیمقام سپارد. ڕۆژێک بڕیار بوو قائیمقام گوێ له قسه‌ی هه‌ردوو گوند بگرێت و بڕیاری خۆی بدات، ئه‌کبه‌ر ئاغای ئه‌شکه‌زه‌ری ژماره‌یه‌ک قوتابی سه‌ره‌تایی و ناوه‌ندی بانگهێشتکردبوو که له به‌رده‌رگای قائیمقامدا کۆببنه‌وه و له‌باره‌ی دروستکردنی قوتابخانه‌وه به‌رگری له گوندی ئه‌شکه‌زه‌ر بکه‌ن، منیش بانگهێشتکرابووم، هه‌رچه‌نده که ئه‌شکه‌زه‌ری نه‌بووم، به‌ڵام له ئه‌شکه‌زه‌ر و حه‌کیمئاوا موڵکمان هه‌بوو. ئه‌م ڕووداوه له ساڵی (١٣٤٦–١٩٦٧) دا بوو. ئه‌کبه‌ر ئاغای عه‌له‌وی ناسیاویی و دۆستایه‌تی کۆنی له‌گه‌ڵ قائیمقامدا هه‌بوو، بۆیه بانگهێشتیکرد بۆ ئه‌شکه‌زه‌ر بۆ باخه‌که‌ی خۆی، ئه‌م ئه‌کبه‌ر ئاغای عه‌له‌ویه له هه‌مان کاتدا پارێزه‌ر بوو له دادگا و کاری جوتیاریشی ده‌کرد، ده‌موپلێکی باشی هه‌بوو له قسه‌کرندا، به‌ڵام زۆر زوو تووڕه ده‌بوو، له دانیشتنێکدا که ته‌نها شێخی زار چیی به‌چه‌ند که‌سێکه‌وه وه‌ک نوێنه‌ری زارچ ئاماده‌بوون، به‌ڵام ئه‌کبه‌ر ئاغای عه‌له‌وی ئه‌شکه‌زه‌ری لانیکه‌م (٣٠) که‌سی له‌گه‌ڵ خۆی هێنابوو، وتووێژ له‌سه‌ر دروستکردنی قوتابخانه‌که ده‌ستییکرد. ئه‌کبه‌ر ئاغا به‌ڵگه‌کانی خۆی ده‌رهێنا و ئه‌و گه‌نجانه‌ی که ئاماده‌ی کردبوون له دانیشتنه‌که‌دا وه‌ک نموونه‌ی قوتابی ئه‌شکه‌زه‌ریی ناساندنی. شێخی زارچ یش به‌ڵگه‌کانی خۆی ده‌رهێنا، ئه‌کبه‌ر ئاغای ئه‌شکه‌زه‌ری توڕه بوو، گوتی: ئاغای فه‌رماندار ئه‌م زارچییانه له هه‌موو یه‌زدا به ناکه‌س ناسراون، کاری ئه‌مانه ناکه‌سییه و خه‌ڵکانی نا تێگه‌یشتوون، له هه‌مان کاتدا ئه‌شکه‌زه‌ریی خوێنده‌وار و زیره‌کن، قوتابخانه به‌که‌ڵکی زارچییه‌کان نایه‌ت، قوتابخانه‌که بده‌ره ئه‌شکه‌زه‌رییه‌کان. شێخی زارچی گوتی: جه‌نابی قائیمقام ئاغای ئه‌شکه‌زه‌ری زۆر زۆر ڕاستده‌کات به‌ڵام بۆ ڕێزی ئه‌م دانیشتنه که‌می قسه‌کرد، خه‌ڵکی زارچی ناتێگه‌یشتوون هه‌ژار و بێکه‌سن،

بەلام خەڵکی ئەشکەزەر هەموو خوێندەوار و زیرەک و بلیمەتن، بۆیە لەبەر ئەوەی کە خەڵکی ئەشکەزەری خوێندەوار و بلیمەت و تێگەیشتوون و بەئەدەب و بەڕێزن، کەواتە پێویستیان بە قوتابخانە نییە. تکایە ئەو قوتابخانەیە بدەرە گوندی زارچ کە ناحاڵی و نەزانن، بەڵکو ئەمانیش دانا و بەئەدەب بن و بەکەڵکی وڵات بێن، کەمێک پێکەنین و قائیمقام قوتابخانەکەی دا بە گوندی زارچ. مەلایەکی خۆشەویست و باڵا بەرز لە یەزد هەبوو بەناوی ئاغای سەمسام. ئەسپێکی سپی بەرزی هەبوو بەسواری ئەسپ لە ماڵەوە بۆ مەراسیم دەهات، ڕەنگ و ڕوویەکی جوان و ڕیشێکی درێژی هەبوو، قەد و باڵای هەروەک قەد و باڵای ئایەتوڵلا جوادی ئامولی بوو، من هەر کاتێک ئایەتوڵلا جەوادی ئامولی لە تەلەفزیۆن دەبینم یادی ئاغای سەمسار دەکەمەوە، یادی بەخێربێت، هەمیشە لەسەر مینبەر چیرۆکەکانی قورئانی باسدەکرد، دەیگوت من زۆر حەز بە چیرۆکەکانی قورئان دەکەم، لە هەر شوێنێک ئەو مەراسیمی بخوێندایە من دەچووم تا گوێ لە قسەکانی بگرم، چیرۆکەکانی (ئادەم و حەوا، چیرۆکی نوح، چیرۆکی ئیبراهیم خەلیل، چیرۆکی نەمروود، چیرۆکی سارا هاجەر، ئیسماعیل، قوربانیکردنی حەزرەتی ئیسماعیل لەلایەن باوکییەوە -حەزرەتی ئیبراهیم- چیرۆکی یەعقوب و منداڵەکانی و یوسف، چیرۆکی کەنعان و میسر) و دەیەها چیرۆکی تر لەم مەلا بەڕێزەوە فێربووم، خودا لێیخۆش بێت. وانەی ئەخلاقی زۆر قوڵم لەم چیرۆکانە وەردەگرت و زۆرێک لە کێشە ئەخلاقی و دینییەکان و بیروباوەڕێک کە ئەمڕۆ لە دڵی مندا چەسپیوە، بەهۆیی وتەکانە ئەم مەلا بەڕێزەوەیە. ئەم جۆرە کەسانە زۆر کەم بوون، ئەگەر ئەمانەش نەبوونایە خەڵکی بەجۆرێکی تر دەبوون، لەسەردەمانێکدا کە ٩٠%ی خەڵکی نەخوێندەوار بوون، و هیچ هۆیەکی فێرکردن نەبوو، تازە ڕادیۆ پەیدابببوو، لە هەر گوندێکدا ڕادیۆیەک نەبوو، لە هەموو گەڕەکی ئێمەدا ڕەنگە تەنها کەسێک یا دوو کەس هەبووبن کە ڕۆژنامە بخوێننەوە. هەربۆیە تەنها مزگەوت و حسێنیەکان چەقی بڵاوبوونەوەی هەواڵ وزانیارییەکان بوون، لە حسێنیەی پشتی باخ، ساڵی یەک جار مەراسیمی تێدا سازدەکرا، بەلام حسێنیە بچووکەکانی تر، حسێنیەی کۆلانی خەتیب و حسێنیەی نەخشین، حسێنیەی هاشم خان، حسێنیەی کۆلانی میرقوتب و جار جار لە ماڵەکانیشدا مەراسیمیان ڕێکدەخست. هەندێکیان مەراسیمی هەفتانەیان سازدەکرد. دیارە ئەوکات ئەم مەراسیمانە وەک ئێستا نەبوون، بە تایبەت مەراسیمی پرسە، ئەوکاتە تا پێش شۆڕشی (١٣٥٧-١٩٧٨) یش یەزدییەکان بۆ پیاوانیش ئەو گریە و ناڵەیان نەدەکرد. ئەوکات بۆ پرسەکان نووسینی لافیتە و ئاگاداری بەکاغەزی نووسین هەر نەدەرکرا. بەو شێوەیەی ئێستا پارە سەرف نەدەکرا. ئێستا زۆرترین پارە لە مەراسیمی

پرسەدا سەرفدەکرێت. هەر بۆ نموونە کاتێک کەسێک دەمرێت دەبێت لەسەر قەبرانیش بە ڤیدیۆ تۆماربکرێت. تەنها فیلمەکە نزیکەی (٧٥٠) هەزار تومەنی دەوێت، لەم ماوەیەی دواییدا لە شاری مەشهەد بەراوردێک لە نێوانی مەسرەفی بووک گواستنەوە و مەراسیمی پرسە دا کرا، لە ئەنجامدا دەرکەوت کە مەراسیمی پرسە (١,٩٣) مەسرەفی زیاتر بووە لە مەراسیمی بووک گواستنەوە. هەندێک لە مەلاکان وەک ئاغای پێشنماز لە مزگەوتەکەی گەڕەکی ئێمە هەمیشە باسی کێشە شەرعییەکانی دەکرد، بەڵام من دەمزانی کە زۆربەی خەڵکی گوند بۆ گوێ لەو وتارانە ناگرن، ژنەکان کە لە سەربانەکان دادەنیشتن، خۆیان بە بەردەوامی قسەیان دەکرد، بەجۆرێک کە مەلا ناچار دەبوو چەند جارێک ئاگاداریان بکاتەوە، کە ئەوەندە قسە نەکەن، بەڵام کاتێک وتەکانی مەلا دەهاتە سەرباسی حەزرەتی زەینەب هەموو ژنەکان بەیادی گرفتاری خۆیان و کوێرەوەریی و کێشەکانیانەوە دەستیان دەکرد بە گریان و لەخۆدان و فرمێسک بە چاوانیاندا دەهاتە خوارەوە. من زۆربەی ئەو ژنانەم دەناسی کە لەخۆیان دەدا و دەگریان. یەکێک لەوانە خاوەنی پێنج کچی بەدبەخت و مێردێکی ئیفلج بوو. زۆربەیان پیاوکانیان کرێکاری کارگە بوون یان شاگرد مسگەر بوون، هیچ کام لەو ژنانەی کە لەخۆیان دەدا و دەگریان لە چینی مامناوەند و دەوڵەمەندەکان نەبوون. بەڵکو هەموویان لە چینی هەژار و بەدبەختەکان بوون. ئەمانە لە کاتی مەراسیمەکاندا قسەیان بۆ یەکتر دەکرد و باسی کێشەکانی خۆیان دەکرد و زۆرجار هەرلەوێش چارەسەری کێشەکانیان دەکرد.

لە دەیەی (١٣٣٠-١٩٥٠) دا، مەراسیمەکان زیاتر لە قوتابخانەکان بە ڕووی منداڵان ئاشنا دەبوون، زیاتر کاری تێدەکردن، من لە ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) وە دەستمکردووە بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە بەهۆی ئەوەی شاگردی گەراج بووم و بە بەردەوامی یش ڕۆژنامەی ئیتڵاعات و ڕۆژنامەی کەیهان دەهاتنە گەراجەکەوە، ڕۆژنامەی تۆفان و ملک یشم هەر دەخوێندنەوە، کازم ئیسلامیە سەرپەرشتی ڕۆژنامەی تۆفان بوو، ئەم ڕۆژنامەیە فەخری یەزدی دامەزرێنەری بوو، بۆ یەکەمین جار نووسینی سەرپەرشتیاری ڕۆژنامەکە بەشێکی لێ بڵاوکردەوە لە ڕۆژنامەی تۆفان دا، منداڵانی یەزد لە دەیەی (١٣٣٠-١٩٥٠) دا فێری هیچ شێتک نەدەکران و بە کۆڵاندا ڕایاندەکرد و بە دیواری بەرزدا سەردەکەوتن، دیواریش هەمووی هەر خشت بوو، بەبێ ئەوەی گەچکاریی کرابێت و هەمووشی کون و کەلەبەری پڕلە دووپشک بوون.

## چیرۆکی مەعسومەی فاتمە جان و تێکۆشان بۆ عیشق و ئازادی

ئەم چیرۆکە لە دەوروبەری سالّی (١٣٣٧-١٣٣٨_١٩٥٨-١٩٥٩) دا، ڕوویداوە ئەوکاتە من (١١-١٢) سالّ دەبووم، مەعسومەی فاتمە جان مالّیان لە کۆلانی ئێمەدا بوو، ئەوان چوار مالّ لەملاوەتر بوون. بەناوی دایکیەوە بانگ دەکرا. ئەمەش ئەوە دەگەیاند کە هەر لە منداڵییەوە باوکی مرد بوو. مەعسومەی فاتمە جان و محەمەد عەلی فاتمە جان خوشک و برا بوون. فاتمە جان مەعسومە و محەمەدی لە مێردی یەکەمی هەبوو، بە بێوەژنی شووی کردبوەوە بە ژنی حاجی حەسەن سیراج، کە ئەویش پێشتر ژنەکەی مردبوو، چوار منداڵیشی هەبوو. منداڵەکانی حەسەن ئاغا لە منداڵەکانی فاتمە جان گەورەتر بوون و لە مالّی خۆیاندا دەژیان. مالّی فاتمە جان و حەسەن ئاغا لە دوولای یەک کۆلاندا بوون، بەلام دەرگای مالّی حەسەن ئاغا لەسەر کۆلانی پشتەوە بوو، واتە دیواری پشتی مالّی حەسەن ئاغا بەتەنیشت ئەو کۆلانەوە بوو کە دەرگاکەی مالّی فاتمە جانی لێبوو. ئەو کەسانەی کە کۆلانەکانی یەزد شارەزابن، دەزانن کە دیواری خانووە کۆنەکان چەند گەورەن، چەندین جار دوو دراوسێ کە دیواری مالّەکانیان بە تەنیشت یەکەوە بوون، بەلام ئەگەر بیانویستایە بچن بۆ مالّی یەکتری، دەبوو بڕۆن و لە گەڕەکێکی ترەوە بسوڕێنەوە تا بچنە مالّە دراوسێکەیان. یەکێک لە هۆکارەکانی سەردانکردنی مالّەکان بۆ لای یەکتری لە ڕێگەی سەربانەوە ئەو دوورییە بوو، لەبری ئەوەی کە لە کۆلانەوە بچن. بۆ نموونە ئەگەر مەلا نەباتی بیویستایە لە کۆلانەوە بچێت بۆ مالّی زەری سولّتان دەبوو (١٠) خولەک ڕێگا ببڕێت، بەلام لە سەربانەوە تەنها نیو خولەکی بەس بوو. هەر بۆیە هاتوچۆی دراوسێکان زۆرتر لە سەربانەوە بوو. منداڵەکانی حەسەن ئاغا یا لە سەربانی خۆیانەوە دەچوونە سەربانی مالّی فاتمە جانی باوەژنیان کە نێوانیان تەنها کۆلانێکی مەتر و نیوی بوو، پاشان بە پلیکانەکاندا

دەڕۆیشتنە خوارەوە، یاخود بە دیوارێکی سێ مەتریدا سەردەکەوتن و لە کۆڵانەوە دەچوون بۆ ماڵی باوەژنیان. بەڵام ئەوەندی من بیرم مابێت تەنها ئەسغەری کوڕی حەسەن ئاغا دەچوو بۆ ماڵی باوەژنەکەی. من هەرگیز نەمدیبوو دوو کوڕەکەی تری و کچەکەی هاتوچۆی ماڵی باوەژنیان کردبێت. بەتێپەڕبوونی کات منداڵەکانیش گەورە بوون و فاتمە جان دوو کچیشی لە حەسەن ئاغا بوو، خانم و سەکینە. فاتمە جان ژیانێکی زۆر سەخت و گرانی هەبوو، حەسەن ئاغا زۆر ڕەزیل و چرووک بوو، تەنانەت ئەگەر خۆی لەماڵ نەبوایە هیچ شتێکی بۆ ماڵەوە نەدەکڕی، شەکر، چا، نۆک، نیسک، ماش و نەوت هیچ شتێک لەو ماڵەدا نەبوو. فاتمە جان دەبوایە چاوەڕوان بێت تا حەسەن ئاغا دێتەوە. حەسەن ئاغاش نیوەڕوان نەدەهاتەوە لە دوکان دەمایەوە و لە بازاڕ نانی دەخوارد. تەنها شەوانە کە دەگەڕایەوە نان و خواردنی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە، دەبەیەکی چارەکە لیتری دەدا بە دوکاندارەکەی سەرکۆڵانەکە تا نەوتی بۆ تێبکات و یەک مسقاڵ چا و یەک سیر شەکری دەکڕی و دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە. دیارە لەو سەردەمەدا زۆر کەس بەو جۆرە ژیانیان دەگوزەراند، وەک کرێکارانی ڕۆژانە کە تەنها شەوانە نان و پێخۆریان دەکڕی و دەیانبردەوە بۆ ماڵەوە. بەگشتی کاتێک ئەمانە لە ماڵەوە نەبوون هیچ شتێک لە ماڵەکانیاندا نەبوو. بەڵام حەسەن ئاغا ژیانی باش بوو دەوڵەمەند بوو دوکانی هەبوو سەراجی دەکرد. حەسەن ئاغا چرووک بوو نەک بێ پارە، نەیدەویست شتێک لە ماڵەکەیاندا هەبێت نەوەک منداڵەکانی ژنەکەی بیخۆن. فاتمە جان خۆی کاری ڕستنی دەکرد و مەسرەفی منداڵەکانی خۆی دەکرد، منداڵەکانی بە نانی خۆی گەورە کردبوو نەک بە نانی مێردەکەی. فاتمە جان سێ برای هەبوو، حاجی مەهدی و حسین و ئەحمەد، ئەوانیش کاسپی باشیان نەبوو، زۆر هەژار بوون، نازانم هیچ هاوکارییەکی خوشکەکەیان دەکرد یان نا. مەعسومە هێواش هێواش گەورەبوو، بووە خانمێکی تەواوی (١٧-١٨) ساڵ، ناشرین نەبوو، بەڵام لە دەموچاویدا کەمێک شوێنەواری ئاوڵە هەبوو. نەچوو بووە قوتابخانە، بەڵام قورئان و هۆنراوەی دەزانی. ئەو ژنە دراوسێیانەی کە تا درەنگانێکی شەو لە سەری کۆڵان و بەردەرگا دادەنیشتن هاتوچۆکانی ئەسغەریان دەبینی کە لە سەربانی ماڵی خۆیانەوە دەچووە سەربانی ماڵی مەسعومە و دەچووە ماڵیان، ئەو ژنانە قسەیان لەبارەی ئەسغەر و مەعسومەوە دەکرد، دیارە قسەی خراپیان نەدەکرد، تەنها دەیانگوت واباشە ئەم دووانە بەیەکەوە هاوسەرگیری بکەن. ئەسغەر تەمەنی (٢٢) ساڵ بوو، مەعسومەش تەمەنی ببووە (١٨) ساڵ، ئەسغەر گەنجێکی بالابەرزی تاڕادەیەک جوان بوو، یەکێک بوو لە یاریزانەکانی گەڕەک و یاری دوو گۆڵی دەکرد. منداڵانی هاوتەمەنی من عاشقی یارییە جوانەکانی

ئەسغەر بووین، ئەوکاتە یاریی تۆپی پێ، تازە برەوی پەیدا دەکرد، هێشتا نەببووە یارییەکی گرنگ و چارەنووسساز. نزیکەی زۆربەی خزمان دژایەتی هاوسەرگیری ئەو دووانەیان دەکرد، فاتمە جان یش و حەسەن ئاغاش پێیان ناخۆش بوو. خاڵەکانی مەعسومەو خوشک و براکانی ئەسغەر هەموو پێیان ناخۆش بوو. لەم ئاڵۆزییەدا پیاوێک هات بۆ خوازبێنی مەعسومە، هەموولایەک بەم خوازبێنییە ڕازی بوون، تەنها مەعسومە خۆی ناڕازیی بوو. گوتبووی من شوو بەم پیاوە ناکەم، ئەو پیاوە کە ناوی حسێن بوو لەبیر ناکەم باڵابەرزی بەخۆوە بوو، گەنجێکی زۆر جوان بوو، کرێکار بوو، هەموو ئەو ژنانەی کە لە کۆڵان دادەنیشتن و من شەوانە چیرۆکم بۆ دەخوێندنەوە، دەیانگوت مەعسومە کارێکی خراپ دەکات کە گوتویەتی شوو بەو پیاوە ناکات. هەندێک لە ژنەکانی تر دەیانگوت ئەوە نیشانەی ئاخر زەمانە، کچانی ئێستا فێری قسەکردن بوون و دەڵێن شوو بە ئەو کەسە دەکەین، بەئارەزووی خۆیان بڕیار دەدەن کە شوو بە کێ دەکەن و بەکێی ناکەن. تادەهات خوازبێنی حسێن ئاغا بۆ مەعسومە زیاتر دەبوو، فشار لەسەر مەعسومەش بۆ قبوڵکردنی ئەو خوازبێنییە زیاتر دەبوو، مەعسومە هەر دەیگوت شووی پێناکەم و جوێنی دەدا و دەیگوت بەهیچ شێوەیەک حسێن ئاغا قبوڵ ناکات و شووی پێناکات. لە کۆتاییدا حەسەن ئاغا و فاتمە جان و یەکێک لە خاڵەکانی مەعسومە مەراسیمی هاوسەرگیریی زۆرە ملێیان ڕێکخست. ژنانی گەڕەک دەیانگوت مەعسومە دەیەوێت شوو بە ئەسغەر بکات، بەڵام زووتر ژنانی دراوسێ دەیانگوت مەعسومە هەڵەی کردووە، کچ دەبێت لە قسەی گەورەکان دەرنەچێت و هەرچی ئەوان گوتیان دەبێت بڵێت بەسەرچاو. بۆچی دایکی و حسێن ئاغا خراپی ئەویان دەوێت؟ دیارە جارێکیان کە من لەسەری کۆڵانەکە چیرۆکی ئەمیر ئەرسەلانم بۆ ژنان دەخوێندەوە، هەندێک لە ژنە گەنجەکان دەیانگوت چۆن فەروخ لەقا دەیەوێت شوو بە ئەمیر ئەرسەلان بکات و لە هەمان کاتدا ڕووبەڕووی قسەکانیش دەبێتەوە، بەڵام مەعسومە دەیەوێت شوو بە ئەسغەر بکات، باس و خواسی شووکردنی مەعسومە لە نێوان ژنانی دراوسێدا بڵاوبووەوە.

لەو ساڵانەدا لە یەزد و لە بنەماڵە هەژارەکاندا کچان بە هیچ شێوەیەک نەیاندەتوانی بڵێن شوو بەکێ دەکەن و شوو بەکێ ناکەن، ئەگەر ئەوکات کچان بیانتوانیبایە بڕیاری خۆیان بدەن، پێدەچوو هەموو ئەو بێوەژنانەی کە من دەیانناسم نەدەبوونە بێوەژن. هەموو ژنەکانی کۆڵانەکانی ئێمە و کۆڵانەکانی تریش ببوونە ژنی پیاوانێک کە (٢٠-٣٠) ساڵ لە خۆیان گەورەتر بوون. دیارە حسێن ئاغای داواکاری مەعسومەش تەمەنی لە (٢٥) ساڵ زیاتر نەبوو پیریش نەبوو، بەڵام مەعسومە دەیگوت من ئەوم خۆشناوێت و

نامەوێــت شــووی پێــبکەم، عیشــقەکەم بنچیــنەی بەخــتەوەری و شــادییە. ئەگەر هاوسەرگیریی بە عیشق نەبێت ئەوا لەماڵەوە هەمیشە شەڕ و ئاژاوەیە و ئارامی نییە و بەبێ ئارامیش بەختەوەر نابیت، بەبێ بەختەوەریی بنەماڵەیی، وڵاتیش فراوانی بەخۆەوە نابینێت. ئەگەر هەڵبژاردنی کار بە عیشق وخۆشیەوە نەبێت، سەرکەوتن کەم دەبێت، ئەگەر عیشق بۆ نووسین نەبێت من تا کاتژمێر چواری بەیانی دانانیشم یادەوەریی (٤٤) ساڵ پێشتر بنووسمەوە. من تەواو دڵنیام کە یەکێک لە هۆکارەکانی دواکەوتویی جیهانی سێیەم ئەوەیە، کە ئێمە عیشقمان فەرامۆش کردووە، هیچ کارێکمان بە بنەمای عیشق و پەیوەندییەوە نییە. بەتایبەت ژیانی هاوسەریمان یەکێک لە هۆکارەکانی زیادبوونی جیابوونەوەی هاوسەرەکان لەم ساڵانەی دواییدا، هاوسەرگیری بێ بنەما و بێ خۆشەویستیە. ژنانی دراوسێ ئامۆژگاری مەعسومەیان کرد کە بەو هاوسەرگیرییە ڕازی بێت، ژنەکان بە مەعسومەیان دەگوت کوڕەم خۆشناوێت یا حەزم لێی نییە مانای چی؟ ئێمە کامەمان هاوسەری خۆمانمان خۆشویستووە؟ هیچ کاممان. ئەمە ژیانە، سەرەتا شووی پێدەکەیت و پاشان وردە وردە خۆشتدەوێت. مەعسومە گوتی: من وەکو ئێوە نیم، نامەوێت تەمەنێک سەرم لەسەر سەرینی پیاوێک بێت کە خۆشمناوێت و وەک ئێوە شەوانە لە کوڵانەکان بم و بە دەست هاوسەرەکەمەوە بگریم. ژنەکان بە مەعسومەیان گوت: تۆ ئەسغەرت خۆشدەوێت بەڵام هەموو تایەفەکەتان ناڕازیین کە شووی پێبکەیت، چونکە خزمەکانت زۆریان پێناخۆش بوو کە دایکت شووی بە باوکی ئەسغەر کرد، هەموو کەسوکاری تۆش و ئەسغەریش بەم هاوسەرگیرییە ناڕازین.

بەڵام مەعسومە بەبێئەوەی بڵێت کە ئەسغەری خۆشدەوێت، دەیگوت حسێن ئاغام خۆشناوێت. بەهەرحاڵ ڕێوڕەسمی مارەبڕینیان ئامادەکرد و مەعسومەیان بەزۆر بردە بەردەمی نووسەری بەڵێننامە و بە زنجیری کەر بەستنەوە دەستیانکرد بە لێدانی تا لەبەردەم بەڵێنامەنووسەکەدا دانیشێت. ژنان دەیانگوت ئەو مەعسومەیە کە ئێمە دەیناسین باوەڕناکەین وا بەئاسانی لە بەردەم بەڵێنامەنووسەکەدا وشەی بەڵێ بە زاریدا بێت. خاڵی گوتبووی تا ئێستا چەند پارچە گۆشتی لەشی بەزنجیرەکەی دەستمەوە هەڵگیراوە، ئەگەر لە بەردەم بەڵێنامەنووسەکەدا دانەنیشێت، بەهەمان زنجیری کەر بەستنەوە هەموو گیانی هەلاهەلا دەکەم. ژنێکی خزمی خۆی لە تەنیشت مەعسومەوە دانیشت بۆئەوەی ئەگەر گوێی لێبوو، مەعسومە گوتی (بەڵێ) ئەو بەدەنگی بەرز بەڵێ کە بڵێتەوە. بەڵام مەعسومە بەڵێی نەگوت، ئەو ژنەی کە لەلایەوە دانیشتبوو لەبری ئەو گوتی بەڵێ. هەموو ژنەکان دەستیانکرد بە هەلهەلەکێشان. هەرچەندە هەموویان دەیانزانی کە ئەوە دەنگی مەعسومە نییە، تەنانەت بەڵێنامەنووسەکەش دەیزانی کە ئەوە

دەنگی بووکەکە نییە. ئەو کاری خۆی کرد و بەڵێننامەکەی نووسی. پاشان مەعسومە هەستایە سەرپێ و گوتی: من ئەم پیاوەم ناوێت و شووی پێناکەم. یەکێک لە خاڵەکانی هەستا و دەستیکرد بە لێدانی. دواتر بووکی لێدراو خۆی کرد بە کەڕولاڵ و کەوت بە زەویدا. هەر هەمان شەو بووکیان بردە ژووری تایبەتی بووک و زاوا. ژنانیش لە پشتی دەرگاکەوە چاوەڕوان بوون.

لە یەزد بەگشتی و لە نێوان بنەماڵە هەژار و مامناوەندەکاندا بەتایبەتی، مارەبڕین لە کاتی خۆرئاوابووندا دەکرا و هەر هەمان شەو بووک دەگوازرایەوە و لەگەڵ زاوا دەچوونە ژووری تایبەتی خۆیان. واتە هەموو کارەکانی مارەبڕین و بووک گواستنەوە لە ماوەی (٢-٣) کاتژمێردا تەواو دەبوو. بەڵام مەعسومەی کەڕولاڵ لەو شەوەدا وەک شێری مێینە بەچنگ و ددان پەلاماری زاوای دابوو، هەموو گیانی کرد بوو بەخوێن، زاوای بەدبەخت لە تەپڵی سەرییەوە تاکو قولەپێی هەموو شوێنی گاز و چنگ و نینۆک بوو، تەواوی لەشی لە خوێندا سوور ببوو، بەبێ جل و بەرگ لە دەرگاوە بەناو ژنەکاندا رایکردە دەرەوە. خزمەکانی بووک سەریان سوڕما لەم زاوا ترسنۆک و بێدەسەڵاتە کە بەم شێوەیە بەنێو ژناندا ڕایکردە حەوشەوە، بەبێئەوەی بگەڕێتەوە لانیکەم جلەکانی لەبەربکاتەوە. چەند ژنێک چوونە ژوورەوە بەڵام مەعسومە بەچنگ و ددان پەلاماری ئەوانیشی دا، ئەوانیش ناچار گەڕانەوە. پاشان داوایان لە مەعسومە کرد کە چاکەت و پانتۆڵی زاواکەیان بداتێ، مەعسومە سەرەتا چاکەتەکەی فڕێدایە دەرەوە و دواتر پانتۆڵەکەشی کە لە نافەکەکەوە هەڵیدڕیبوو و کردبووی بەدوو پارچەوە، فڕێیدایە حەوشە. پاشان پانتۆڵێکی دیکەیان بۆ زاوا هێنا و بەرەو ماڵی خۆیان ڕۆیشتەوە. مەعسومەی پاکیزە، بوو بە کەڕولاڵ و هەرچییەکیان پێدەگوت وەک ئەوەی گوێی لێ نەبێت یەک وشەی لە دەم نەدەهاتە دەرەوە. ژنان زۆریان قسە بۆکرد، زۆر ئامۆژگارییان کرد، هیچ سوودی نەبوو. خاڵیشی کە زۆر توڕە ببوو ڕۆژێک تا توانی لێیدا، تەنانەت بەهۆی ئەو لێدانەوە مەعسومە دەستەکانی ئیفلیج بوو. هەڵبەت دایکم و مەعسومە نێوانیان زۆر باش بوو. ڕۆژێک دایکم ڕۆیشت بۆ ماڵی مەعسومە چەند بەچەند قسەی بۆ کردبوو، کەچی مەعسومە نە وەڵامی دابوەوە و نە سەریشی بۆ لەقاندبوو. بەجۆرێک دایکم دەیگوت ڕەنگە بەهۆی ئەو هەموو لێدانەوە گێژ و ئیفلیج بووبێت. زاوا هاتوچۆی ماڵی بووکێی دەکرد و دیاریشی بۆ دەکڕی و بۆی دەبرد، بەڵام بووک هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەدەهات. بڕیار بوو کە مەعسومە ببەنە لای دکتۆر، بەڵام دکتۆریش نەیتوانی تێبگات کە مەعسومە کەڕولاڵە یا خۆی نەخۆش خستووە.

هه‌ڵبه‌ت له ساڵه‌کانی (١٣٣٧-١٣٣٨_١٩٥٨-١٩٥٩) دا، له شاری یه‌زد دکتۆری تایبه‌ت به قورگ و گوێ و لوت نه‌بوو، پێداویستیه زانستییه‌کانی ئه‌وکاته‌ش وه‌کو تاقیگه که به‌ئاسانی جۆری نه‌خۆشییه‌که دیاری بکات، هه‌ر نه‌بوو تابزانرێت ئه‌و که‌سه نه‌خۆشه یاخود خۆی نه‌خۆش خستووه. به‌هۆی ئه‌وه‌ی که مه‌عسومه بێ باوک بوو، که‌سێکی واشی نه‌بوو که بیباته لای دکتۆرێکی باش و مه‌سره‌فی بۆ بکات تا هۆکاری نه‌خۆشییه‌که‌ی ده‌ربکه‌وێت، نزیکه‌ی ساڵێک که‌ڕولاڵ و بێده‌نگ بوو، دایکیشی ته‌نها خه‌فه‌تی لێده‌خوارد. زاواش له هه‌وڵه‌کانی دڵی ساردبووه‌وه. ژنانی گه‌ڕه‌کیش هه‌ریه‌که و قسه‌یه‌کی ده‌کرد، سه‌ره‌تا هه‌موویان ده‌یانگوت چه‌ند کچێکی چاوکراوه‌یه، به‌رامبه‌ر به گه‌وره‌کان قسه ده‌کات. که‌م که‌م چه‌ند که‌سێک له ژنانی گه‌ڕه‌ک لێکدانه‌وه‌یان بۆ ده‌کرد که ئه‌م کچه له‌گه‌ڵ ئه‌سغه‌ردا کارێکی کردووه، ئێستا بۆئه‌وه‌ی ڕیسوا نه‌بێت نایه‌وێت له‌گه‌ڵ هاوسه‌ره‌که‌ی بژێت. شه‌وانه کاتێک ژنان له به‌رده‌رگا داده‌نیشتن و ده‌یانویست کات تێپه‌ڕێنن، بازاڕی لێکدانه‌وه و غه‌یبه‌تکردن و تۆمه‌تهه‌ڵبه‌ستن گه‌رم بوو.

هه‌ر به‌ڕاستی کاره‌با و ڕادیۆ و ته‌له‌ڤزیۆن خزمه‌تێکی گه‌وره‌یان به خه‌ڵکی کرد، خودا دایک و باوکی ئه‌و داهێنه‌رانه به به‌هه‌شت شاد بکات، کاره‌با گۆڕانکارییه‌کی گه‌وره‌ی له ژیانی چه‌ند هه‌زار ساڵه‌ی دانیشتووانی به‌رده‌رگا و سه‌رکۆلانه‌کاندا ئه‌نجامدا. هه‌رچه‌نده ئێستاش له هه‌ندێک گوند و شارۆچکه و گه‌ڕه‌کی شاره گه‌وره‌کان ئه‌م دانیشتنی سه‌رکۆلانانه هه‌ر به‌رده‌وامه. خۆ ته‌له‌فۆنیش باس و خواسی غه‌یبه‌ت و تۆمه‌ت دروستکردنی زیادکردووه و بێهۆ نییه که شێوازی قسه‌کردن به ته‌له‌فۆن له چاو وڵاتانی ئه‌ورووپاییدا چه‌ند به‌رامبه‌ره.

ژنانی سه‌رکۆلانه‌کان به بۆچوونی خۆیان مه‌عسومه‌یان له ئه‌سغه‌ر سکپڕ کردبوو، منداڵه‌که‌شیان له‌نێوبرد، هه‌ندێکیان بوختانیان دروستده‌کرد بۆ مه‌عسومه که گوایه ئه‌سغه‌ر له ڕێگه‌ی پشته‌وه‌ی سه‌ربانه‌که‌وه هاتوچۆی مه‌عسومه ده‌کات و په‌یوه‌ندییان هه‌یه. هه‌ندێکیان ده‌یانگوت ئه‌وه زۆر ڕاسته بۆیه مه‌عسومه وا گێژ و حۆڵ بووه. پێویسته زۆر ئاگاداری مه‌عسومه و ئه‌سغه‌ر بین. ژنانی سه‌رکۆلان بۆ چاره‌سه‌ری کێشه‌ی مه‌عسومه، هه‌ر شه‌وه باسێکی نوێیان پێبوو، کێشه‌ی مه‌عسومه شانۆگه‌رییه‌کی خۆش و به‌رده‌وام بوو که هه‌موو شه‌وێک ژنانی سه‌ر کۆلان دووباره‌یان ده‌کرده‌وه. هه‌تا کاتێک من چیرۆکی ئه‌میر ئه‌رسه‌لان و فه‌روخ له‌قام بۆ ژنان ده‌خوێنده‌وه، ژنه‌کان ده‌یانگوت که‌سێکی وه‌ک دایکی فولادزه‌ر مه‌عسومه‌ی ته‌لیسم کردووه.

هه‌روه‌ها ده‌یانگوت له‌وانه‌یه حه‌سه‌ن ئاغا له‌به‌ر چاوی مه‌عسومه بوبێته گورگ و به‌راز، بۆیه ده‌بێت ئه‌و ته‌لیسمه بشکێنین. ژنان چیرۆکی ئه‌میر ئه‌رسه‌لان و فه‌روخ

لەقایان بە چیرۆکی مەعسومەوە. گرێدەدا، وردە وردە چەند ژنێک پەیدابوون کە بەرگرییان لە مەعسومە دەکرد، یەکەم کەس کە وێرای بەرگری لە مەعسومە بکات سەکینەی بیبی بوو، سەکینە (٣٨) ساڵ لە پیاوەکەی بچووکتر بوو، خۆی تەمەنی (٣٥) ساڵ بوو، پیاوە تلیاکیەکەشی تەمەنی (٧٣) ساڵ بوو، سەکینە لە تەمەنی (٩) ساڵیدا درابوو بە ئەبولقاسمی (٤٧) ساڵە. سەکینە شەوێک بە ژنانی سەرکۆڵانی ڕاگەیاند بۆچی هەموومان بەجارێک بەرگری لە مەعسومەی بەدبەخت نەکەین، ئەو کە نایەوێت شوو بە حسێن بکات و هەر لە سەرەتاشەوە بەئاشکرا هاواریکرد کە نابێتە ژنی حسێن ئاغا. ئەی بۆچی بەزنجیر ئەوەندەیان لەو داماوە دا. خۆزگە منیش کاتی شووکردنم منداڵ نەدەبووم و هۆش و فکرم پێگەیشتوو دەبوو، بەخودا هەموو مەراسمی مارەبڕینم تێکدەدا و هەرگیز شووم بە ئەبولقاسم نەدەکرد. ئاخر ئەمە چ بەدبەختییەکە من کە تەمەنم (٣٥) و دەبێت پیاوێکی تلیاکخۆری (٧٣) ساڵە بەخێو بکەم. سەکینە هاواریکرد کە ئێمە دەبێت خۆمان ئاگاداری خۆمان بین، ئەوەتا ئێستا (١٢) ژن لەم سەرکۆڵانە دانیشتووین، هەشتمان بێ پیاوین، سیانمان لانیکەم بە (٣٠) ساڵ لە پیاوەکانمان منداڵترین، تەنها یەک کەس لەگەڵ پیاوەکەی هاوتەمەنە ئەویش ئەوەتا بۆ کارکردن ڕۆیشتووە بۆ بۆمبای ئاخر ئەمە ژیانە؟ لەو شەوەوە کە سەکینە ئەو هەرایەی لای ژنەکان بەرپاکرد، ئیتر شەوانی سەرکۆڵان بووە باسی شووکردنی مەعسومە و شووکردنی زۆرەملێ. ژمارەیەک دەیانگوت کچ دەبێت گوێڕایەڵی دایک وباوک وبراکانی بێت. هەندێکی تریشیان دەیانگوت نا ئەمە چ ڕێوڕەسمێکە کە کچانی (٩-١٠) ساڵە دەدەن بەشوو وەک دەشیاندەن بەشوو دەیاندەن بە پیاوی گێل و بەتەمەنی (٣٥-٤٠) ساڵە.

ئەوانە تەنها بیر لە خۆیان دەکەنەوە و بیر لە هیچ شتێکی تر ناکەنەوە، دیارە ئەسەدوڵڵا کچە (١٢) ساڵییەکەی خۆی دابوو بە سەید خوڕەم شاهی تەمەن (٧٢) ساڵە، گوتبووی کچەکەم لە قەبەڵی سەید کردووە. گوتبووشی هیچ کەسێک لە ئاغای خوڕەم شاهی باشتر نییە، بۆیە کچەکەم داوە بە ئەو. ئەم کچە لە تەمەنی (١٨) ساڵیدا بە منداڵێکەوە بێوەژن بوو. ئەویش لایەنی مەعسومەی دەگرت لە دەست ئەو کارەی بەسەریدا هاتبوو. سەغەری ڕۆژێک کردی بە دەنگە دەنگ لەگەڵ باوکیدا گوتی: ئەمە چ کارێک بوو کە من تەمەنم (١٤) ساڵ بوو داتم بە سەیدێکی (٧٧) ساڵە، دەبوایە خۆت کە مسقاڵێک بیر و هۆشت نییە، ببویتایە بەژنی سەید خوڕەمشاهی. ئەو زۆر جەسوورانە بەرگری لە مەعسومە دەکرد.

نـزیکه‌ی (١٨) مانـگ بـو مه‌عسـومه گێـژ و وڕ ببـوو، له‌گه‌ڵ هـیچ که‌سـێکدا قسـه‌ی نه‌ده‌کـرد، هـیچ کارێکیشـی نه‌ده‌کـرد چـونکه ده‌سـته‌کانی ئیفلـیج ببـوون، ده‌بـوو دایکـی خـواردن بکـات به‌ده‌مه‌وه، له گۆشـه‌یه‌کی مـاڵه‌که‌دا دانیشـتبوو وه‌ک ئه‌وه‌ی چـاوه‌ڕوانی فریشـته‌یه‌ک بکـات. هه‌نـدێک که‌س ده‌یـانگوت چـاوه‌ڕوانی ئه‌وه ده‌کـات که ئه‌سـغه‌ر له‌سه‌ربانه‌که‌وه بێته لای. مه‌عسومه نه‌ده‌هاته کۆڵانیش، نه‌ده‌چووه حه‌مـامیش . جارێک چه‌نـد ژنێک کۆبـوونه‌وه و گوتیـان ده‌بێـت مه‌عسـومه ته‌ڵاق وه‌ربگرێـت، چـونکه ئه‌گه‌ر شێتیش نه‌بووبێت وا خه‌ریکه شێت ده‌بێت. سه‌کینه و سه‌غه‌ری پێشه‌وای ژنه‌کـان بـوون که باسی ته‌ڵاقیان وروژاند. پاشان چه‌ند ژنێک چـوونه لای مه‌عسـومه و پێیـانگوت ئێمه ده‌زانین که تۆ نه که‌ڕیت و نه‌لاڵیت، شێتیش نیت، ئیفلیجـیش نیت، ته‌نهـا ده‌ته‌وێت شـوو به ئه‌سغه‌ر بکه‌یت. ئه‌گه‌ر ئێمه کۆببینه‌وه ته‌ڵاقت بۆ وه‌ربگرین چـاک ده‌بیته‌وه و شـوو به‌ئه‌سـغه‌ر ده‌که‌یـت؟ مه‌عسـومه هـیچ وه‌ڵامێکـی نه‌دایه‌وه، ته‌نهـا له گۆشـه‌ی چـاوییه‌وه فرمێسـک ده‌هـاتنه خـواره‌وه. هه‌نـدێک له خـزم و که‌سـوکاری مه‌عسـومه و خـاڵی هـاتنه سـه‌ری کـۆڵان و کردیـان به‌ده‌نـگه ده‌نـگ له‌گه‌ڵ ژنه‌کانـدا، گوتیـان ئێـوه بـۆچی خۆتـان له‌کاری ئێمه هه‌ڵده‌قورتێنن و خه‌ریکی قسـه و کـاری خـراپن. ئه‌م کـچه ئه‌گه‌ر تـادوایی ته‌مه‌نیشی به‌م شێوه بێت، ته‌نها ژنی حسێن ئاغا ده‌بێت. ڕۆژێک سـه‌کینه و سـه‌غه‌ری و چه‌ند ژنێکی تـر له کـۆڵان پێشیان به خـاڵی مه‌عسـومه گـرت و کردیـانه هه‌را له‌گه‌ڵیدا و گوتیـان به‌و جـۆره نابێـت که تـۆ هـه‌ر هه‌ڵه‌یه‌ک که بته‌وێت بیکه‌یت، به زنجیر له‌و کـچه دامـاوه بـده‌یت، به‌زۆر مـاره‌ی ببڕیـت، به‌بێـئه‌وه‌ی قوربه‌سـه‌ره وشـه‌ی به‌ڵێـی له ده‌م هاتبێته‌ده‌ر، ئێسـتاش بێیـته ئێره جوێن به ئێمه بده‌یت، بۆیه له‌ئێسـتا به‌دواوه تـۆ خـاڵی مه‌عسـومه نیت، خـۆت له کاروبـاری مه‌عسـومه نزیـک بکه‌یـته‌وه ئیتـر ئێمه له‌م کـۆڵانه‌دا دارکاریت ده‌که‌ین.

ده‌بوایه خانم سیمۆن دێ بۆڤوار نووسه‌ری کتێبی لایه‌نـی دووه‌م بهاتـایه و به‌رگـری له ژنه نه‌خوێنده‌وار و هه‌ژاره‌کانی گه‌ڕه‌کی ئێمه بکردایه. به‌پێچه‌وانه‌ی ئه‌م کۆمه‌ڵه‌ی که به‌رگرییان له مه‌عسومه ده‌کرد چه‌ند ژنێکی تـر دووباره حسێن ئاغایان هانده‌دا که تـۆ پیاوێکی بێده‌سه‌ڵاتی برۆ له‌گه‌ڵ ژنه‌که‌ت دروستبه. حسێن ئاغا بووه شێر چوو بۆ مـاڵی مه‌عسـومه، ئه‌وانیش ماڵیـان بـۆ چـۆڵ کـرد، به‌ڵام حسـێن ئاغـا دوای (٢٢) مانـگ هه‌مـان ڕووداوی شـه‌وی یه‌که‌مـی بـووک گواسـتنه‌وه‌ی دووبـاره کـرده‌وه، به‌ڵام ئه‌مجاره‌یـان هه‌نـدێک جلـی له‌به‌ردا مـابوو، ئه‌گه‌رچـی هه‌مـوو له‌شـی خـوێن بـوو، شـوێن گـازی مه‌عسومه‌ی پێوه دیاربوو، به‌خێرایی به کۆڵانه‌کاندا به‌ره‌و مـاڵی خۆیـان ڕایده‌کرد. ئیتـر ئه‌م کاره بووه هۆی ئه‌وه‌ی که مه‌عسومه ته‌ڵاق بدات. هه‌ڵبه‌ت به‌م ڕووداوه دڵنیـابوون

کە مەعسومە ئیفلیج نییە بەڵکو دەستەکانی زۆر باش کاردەکەن. هەر بۆیە مەعسومە لەلایەن خاڵیەوە دارکارییەکی باش کرا. ئەو ژنانەی کە لایەنگیری مەعسومە بوون لە ڕاستیدا ناڕازی بوون لە حاڵ و ژیانی خۆیان، هەڕەشەیەکی زۆریان لە خاڵی مەعسومە کرد و گوتیان یەک جاری تر دەستبەریت بۆ مەعسومە، ئەوا ئێمە لێت قبوڵناکەین و تێتهەڵدەدەین. سەغەری ژنی سەید خوڕەم شاهی خودالێخۆشبوو، بەهەموو هێزی خۆی زللەیەکی لە بناگوێی خاڵی مەعسومە دا بوو، تەنانەت ژنەکەی خۆیشی پێیگوتبوو باشە تۆ چیت، کێشە بۆ کچی خوشکەکەت دروستدەکەیت. باس و بەسەرهاتی مەعسومە کۆلان بە کۆلان و گەڕەک بە گەڕەک بڵاوبوەوە، ژنانی چوار گەڕەک لەولاتر هاتن بۆ هەواڵپرسینی مەعسومە کە چۆن لە ماوەی دوو ساڵدا بەبێئەوەی هیچ قسەیەک بکات ناڕازی بوونی بەهەموولایەکدا بڵاوکردەوە. سەکینە، سەغەری، روقیە، بومان جان، بەسە، بیبی روقی و ژنانی گەڕەک کە لە تەواوی تەمەنیاندا بە بەدبەختی ژیابوون، لەگەڵ پیاوەکانیاندا هەموویان بۆ پێشوازی مەعسومە ڕۆیشتن، زەری لەبەر پێیدا کەڵەشێرێکی سەربڕی و گوتی سوێند بەخودا دەبوایە حوشترێکم سەرببڕیایە، بەڵام چیبکەم کە نیمە.

هەر باشە چیرۆکی ئەم زەری فاتمەش بزانن، زەری زۆر منداڵ بوو کە باوکی مرد بوو، چوار خوشک و برا بوون، دایکیان بە هەژاریی و کرێکاری و جلشۆردنی ماڵان گەورەی کردن. زەری لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا درا بە پیاوێکی (٧٥) ساڵەی ژن مردووی خاوەن (٦) منداڵ، پیاوەکەی بەدفەڕ بوو، چوار لە منداڵانی مێردەکەی لە زەری گەورەتر بوون و هەمیشە لە زەرییان دەدا. لە کاتی ڕووداوەکەی مەعسومەدا تەمەنی (٢٢) ساڵ بوو، تازە بێوەژن ببوو، دوو منداڵی بچووکیشی هەبوو، کە دەبوایە ئەو دوو منداڵەش گەورە بکات. ئەو هەرگیز شووی نەکردەوە، لە نەورۆزی ساڵی (١٣٨٢-٢٠٠٣) دا، کە چاوم پێیکەوت گوتی (٣٢) ساڵە پیاوەکەی مردووە، نەعلەت لەو کەسەی کە منی واڵێکرد. ئەویان لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا دابوو بە پیاوێکی (٧٥) ساڵە. خوشکەکەی زەریش هەر بەهەمان دەردەوە گرفتار بوو، چونکە ئەویش مێردەکەی (٣٠) ساڵ لە خۆی گەورەتربوو، هەر بۆیە زەری و هاوشێوەکانی کەڵەشێر لەبەر پێی مەعسومەدا سەردەبڕن، خۆ ئەگەر حوشتریان هەبوایە ئەویشیان سەردەبڕی.

ئێستا قۆناغێک لە کارەکە بەئەنجام گەیشتووە، مەعسومە لەو پیاوەی کە خۆشی نەدەویشت تەڵاقی وەرگرتووە، بەڵام چۆن دەتوانێت شووبکات بە پیاوێک کە خۆشیدەوێت، بەڵام هەموو خزمانی ناڕازیین بە شووکردنی بەو پیاوە.

نزیکەی سێ مانگ، هیچ کەس قسەیەکی نەکرد و باسی هیچ شتێک نەکرا، بەڵام هەواڵەکانی سەر کۆڵان وایان ڕاگەیاند، کە فلان ڕۆژ فلان کاتژمێر فلان خولەک ئەسغەر ئاغا لە سەربانەکەی خۆیانەوە خۆی هەڵداوەتە سەربانی ماڵی باوەژنەکەی، مەعسومە چی خواردووە و چی کردووە، مەعسومە کە دوای دوو ساڵ بۆ دووەمین جار چووەتە نووسینگە، ئێستا هەموو ڕۆژێک دەچێت بۆ بازاڕ، کوڕی خاڵە گەورەکەی کە قوماشفرۆش بوو، چەند پارچە قوماشێکی بە دیاری بۆ هێنابوو، هەواڵەکە وابڵاوبوەوە کە کوڕی خاڵی هاتۆتە خوازبێنی، هەر بۆیە مەعسومە کارەکانی لەژێر وردبینیدا بوو. ڕۆژێکیان خوشکەکەی ئەسعەر ئاغا کە تەمەنی (٤٠) ساڵ بوو، کاتی خۆی بەهاوسەرگیری نێوان باوکی و دایکی مەعسومە زۆر ناڕەحەت بوو. ڕۆژێکیان هاتە بەردەرگای ماڵی مەعسومە و دەرگاکەی کردەوە، گوتی: ئەگەر ئەم کچەتان شوو بە براکەم بکات، ئەوا خۆم دەکوژم یا هەردووکیان دەرمانخوارد دەکەم.

ئیتر سێ خوازبێنیکەری تازە پەیدابوون، خزم و کەسەکانیش دەنگیان هەڵبڕی کە دژایەتی هاوسەرگیری مەسعومە و ئەسغەر دەکەن، بەڵام ئەسغەر هەرگیز خوازبێنی مەعسومەی نەکردبوو، خۆی بێدەنگ کردبوو، لێرەدا پرسیارێک دروستدەبوو ئایا ئەسغەر مەعسومەی دەوێت یان نا.

هەڵبەت کاتێک مەعسومە مارەبڕاوی حەسەن ئاغا بوو و خۆی کردبوو بەکەڕولاڵ. خوشکەکەی ئەسغەر ئاغا چەندین جار چووبووە خوازبێنی کچانی تر، بەڵام هەموو جارێک ئەسغەر ئاغا دژایەتی کردبوو. لە هەموو ئەو کاتانەدا کە مەعسومە مارەبڕاوی حسێن ئاغا بوو، هەرگیز کەسێک ئەسغەر ئاغای نەدی بوو کە لە پشتی سەربانەکەی خۆیانەوە بچێت بۆماڵی باوەژنەکەی. بەهەرحاڵ کۆمەڵی ژنانی سەرکۆڵان بەسەرۆکایەتی سەکینە و ڕەزامەندیی هەموو لایەک بڕیاریاندا کە بەهەر شێوەیەک بێت لە یەکەم هەنگاودا ڕێوڕەسمی مارەبڕین پێکبهێنێت، ژنەکان چوونە سەردانی حەسەن ئاغای باوکی ئەسغەر و باوەپیارەی مەعسومە. هەرچۆنێک بێت ڕازییانکرد بەو هاوسەرگیریە و براکانی ئەسغەریشیان هەر ڕازیکرد، بەڵام خوشکەکەی ئەسغەر ئاغا ڕازی نەدەبوو. دواجار مەراسیمی بوکێنییان پێکهێنا و هەموو دراوسێکانیان بانگهێشتکرد. ئەو خەڵکانەی بانگکرابوون و ئەوانەشی کە بانگ نەکرابوون هەموو بەشدارییان کرد. بەشێوەیەک قەرەباڵغی دروستبوو تەنانەت لە کۆڵانیش جێگا نەدەبوەوە، ژنان هەموو چووبوونە سەربان. منیش ئەوکاتە کە تەمەنم (١٢-١٣) ساڵ بوو، بەشداری خزمەتکردنم کرد. دیارە مەراسیمی بووک گواستنەوەی ئەوکات وەک ئێستا نەبوو، نە دەهۆڵ و زوڕنا هەبوو نە کامێرای وێنەگرتن، نە ڤیدیۆ، نە شیرینی

دەبەخشرایەوە، نە سەرفکردنی پارەیەکی زۆر هەبوو، ژنانی گەڕەک بوکیان ڕازاندەوە کەمێک سوراووسپیاویان لەدەم وچاوی هەڵسوو، هەندێک لە ژنان دەستیانکرد بە شایی و هەڵپەڕکێ. سوڕدان وپێکەنین و کوڕی پیاوان بێدەنگ بوو، پیاوانی یەزدی هیچ هونەرێک نازانن نە سەماکردن و نە ئاواز و گۆرانیوتن.

دواجار مەعسومە شوویکرد بە ئەسغەر. خانم کە خوشکی مەعسومە بوو تەمەنی (٧-٨) ساڵ بوو، لێمپرسی: ئەو بووکە کێیە؟ گوتی: دادەی منە. گوتم: شوو بەکێ دەکات؟ گوتی: شوو بە کاکەم دەکات. خوشک و برای کچێک بوون بە هاوسەری یەکتری ئەو کچە لە باوکەوە خوشکی ئەسغەر ئاغا بوو، لە دایکیەوە خوشکی مەعسومە بوو، واتە دووجار دەبوو بە پووری منداڵی ئەسغەر و مەعسومە. شەوی زاوایی کاتێک مەعسومە و ئەسغەر چوونە ژووی بوکێنییەوە سەکینە و زەری و هەموو ژنانی لایەنگری مەعسومە لە پشتی دەرگاکەوە وەستابوون.

منیش چوومە سەربان سەیرم دەکرد، زۆری پێنەچوو کە دەنگی خۆشی و شادی ژنەکان بەرزبووەوە، ئەو دەنگی شادییە ئەو ژنانەی هێنایە سەر سفر کە بوختان و تۆمەتیان بۆ مەعسومە دروستدەکرد. لە ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤) دا، ئەوە (٤٣) ساڵە کە مەعسومە و ئەسغەر بەخۆشییەوە بەیەکەوە دەژین. چەندین منداڵیشیان هەیە و هەرووکیشیان بوون بە داپیرە و باپیرە. دوای ئەم ڕووداوە مەعسومە زۆری پێنەچوو کە گوتیان سبەینێ هەڵبژاردنە، ژنانیش بۆ یەکەمین جار لە مێژووی وڵاتدا دەتوانن دەنگبدەن زۆربەی ژنانی گەڕەک دەیانگوت ئەم (شا)یە شێتبووە، دەنگدانی ئێمە بەکاری چی دێت. هەزار ساڵە لە چوارچێوەی ماڵەوە دانیشتووین، هیچ کەسێک بە قسەی ئێمە ڕازی نەبووە. مەعسومە و سەکینە و زەری و دایکم کە لە تەمەنیی (٢٤) ساڵیەوە بێوەژن بوو، لە کۆڵان دەستیانکرد بە بانگهێشتی خەڵک بۆ دەنگدان و هەموو ژنانی گەڕەک و کۆڵانیان کۆکردەوە بردیانن بۆ سەر سندوقی دەنگدان، لەوێ دەنگیاندا، کە دەیانوویست بەم دەنگدانە مافی خوراووی چەند هەزار ساڵەیان وەربگرنەوە.

بەڵام ئەوەتا ئەمڕۆ (١٣٨٢/١١/٢٠_٩-٢-٢٠٠٤) کە دەمەوێت ئەم یادوەرییانە بنووسمەوە، بەدوای فایلی خۆمەوە بووم لە بەڕێوەبەرایەتی لێکۆڵینەوەی زانستی کە خۆی چیرۆکێکە، ڕۆژێک لە لای بەڕێوەبەری کارناسی لێکۆڵینەوەی زانستی بووم کە کاندیدی حەوتەمین خولی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئیسلامی بوو، ئەم مافناسە بەڕێزە گرووپێکی لە هاوبیرانی خۆی دروستکردبوو و کۆمەڵێک خەڵکی لە خۆی کۆکردبوەوە و پروپاگەندەی بۆخۆی دەکرد و دەیگوت لە گرووپەکەی ئێمەدا هیچ ژنێک نییە، من دڵنیام جێگای ژن ژووری چێشتلێنانە، ژن دەبێت لە ماڵەوە بێت و تەنها خەریکی کاری

چێشتلێنان بێت. لە دڵی خۆمدا گوتم: مەعسومە و سەکینە و زەری کە ئێستا تەمەنیان لە نێوان (٦٤-٨٠)ساڵیدایە، بنێرم بە شوێنیاندا تا لە یەزدەوە بێن بۆ تاران، داواکانیان بدەنە دەست ئەم کاندیدە دژە ژنە کە دڵنیام ئەگەر ئەوانە بێنە تاران بە تاکە پێڵاوەکانیان دەمی ئەم کاندیدە بەڕێزەی ئەنجومەنی حەوتەم پڕ دەکەن لە خوێن. پاشان بەخۆم پێکەنیم و گوتم لێدان کاری دیموکراسیخواز و ئازادیخواز نییە، ئەگەرچی دیموکراتخواز و ئازادیخواز زۆر ئەملاو ئەولا دەکەن، بەڵام هەمیشە مەعسومەکان و سەکینەکان و زەرییەکان لەسەر هەقن و دەیانەوێت مافی خۆیان وەربگرن. ئێستاش ئەو ژنە نەخوێندەوار و هەژارانەی کۆڵان بە کۆڵان (٤٥) ساڵ پێش ئێستا کەمتریان نەکردووە لە ستارخان و باقر خان و سەردار و سالاری میلی خودا لێی خۆشبێت، ئەم کاندیدە دژ بە ژنە دەنگی نەهێنا و نەڕۆیشتە ئەنجومەن.

## ماڵی حاجی مەندەلی بوون بە خاوەنی ئاو و کارەبا

حاجی مەندەلی بازرگانێکی دەوڵەمەندبوو، نازانم بڵێم زۆر ماڵداری کەربوو یا زۆر چرووک بوو، لانیکەم دە دوکانی لە بازاڕدا هەبوو کە هەر خۆی سەرپەرشتی دەکردن. چەندین دوکانیشی دابوو بەکرێ چەند دوکانێکی لەلای فولکەی پەهلەوی (موجاهدینی ئێستا) ی یەزد هەبوو، چەند پارچە زەویشی لە ئەردەکان هەبوو کە لەوێوە ئاردو بستەیان بۆدەهێنا و هاوکات لەگەڵ شارەکانی تەبەس، ئەسفەهان و شیراز، کڕین و فرۆشتنی هەبوو. حاجی سەرۆکی تایەفەکەی خۆیان بوو کاتێک من تەمەنم (١٠) ساڵ بوو حاجی تەمەنی (٦٠) ساڵ زیاتر بوو، کڵاوی لەسەر دەکرد و عەبای بەخۆیدا دەدا، خانوویەکی گەورەی هەبوو کە لە سێ لاوە هەمووی ژووور بوون. حەوشەیەکی گەورەی هەبوو لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا حەوزێک هەبوو کە هەمیشە پڕ بوو لە ئاو، دەوروبەری حەوزەکە هەمووی گوڵ و دار هەنار بوو. حاجی پێنج کوڕی هەبوو، دوو کچیشی لەکاتی منداڵبووندا مرد بوون. یەکێک لە کچەکانی کوڕێکی هەبوو کە دوو ساڵ لە من گەورەتر بوو. کچەکەی تری کچ و کوڕێکی هەبوو، کە هەریەکەیان دوو ساڵ لە من بچووک تربوون. باوکی منداڵەکان لە یەزد نەبوون دوای مردنی ژنەکانیان منداڵەکانیان هێناوەتەوە ماڵی حاجی و خۆیان ڕۆیشتبوون، ژنی حاجی منداڵەکانی بەخێو دەکرد.

کاتێک من تەمەنم نۆ ساڵ بوو، یەکێک لە کچەکانی حاجی بەسەرمنداڵەوە مرد. کێشەکە لەودابوو کە دەبوایە ئەو منداڵە شیری بدرێتێ، ئەوکات شیری وشک نەبوو، یان لانیکەم شیری وشک لە یەزد هیچ نرخێکی نەبوو، دەبوایە ژنێک شیربدا بەو منداڵە. ژنێک هەبوو ناوی مەعسومە بوو کە مێردەکەی کرێکاری کارگەی ئیقبال بوو، ئەو ژنە بڕیاریدابوو شیر بداتە منداڵەکە، بەڵام ماڵیان لە ماڵی حاجیەوە دوور بوو. دەبوایە شووشەیان ببردایە و مەعسومە، شیری خۆی بکردایەتە ناو شووشەکەوە، منیش

چەندین جار لانیکەم (١٥) جار بۆ وەرگرتنی شیر ڕۆیشتومەتە بەردەرگای ماڵی مەعسومە. ئەم ژنە هەر لە دالانی ماڵی خۆیاندا لە ماوەی چەند خولەکێکدا شووشەکە، کە نزیکەی لیترێکی دەگرت پڕ دەکرد لە شیر، هەر ئەو ژنە شیری دەدا بەمنداڵێکی تریش بەڵام ئایا شیر بەشی منداڵەکەی خۆی دەکرد یان نا. ئەم ژنە هەموو ڕۆژێک شولی دەخوارد، شولی جۆرێکە لە چێشتی بێ گۆشت، کە لە سەوزەوات بەتایبەت گەڵای چەوەندەر و سپیناخ و ئارد دروستدەکرا، دیارە شولی بەگشتی نۆک و لۆبیا و نیسکیشی تێدەکرا، ئەم ژنە شیر فرۆش بوو لەبری شیرەکەی پارەی وەردەگرت. لەڕاستیدا ئەم ژنە کاری مانگایەکی دەکرد، دایک و باوکی منداڵەکان بۆ ئەوەی شیرەکە باش بێت هەمیشە خواردنی باشیان بۆ ئەو ژنەکە دەنارد، ئەویش جگە لەو خواردنەش خۆشی خواردنی دروستی دەکرد و دەیخوارد تا شیرەکەی زیاد بێت و بیفرۆشێت.

داهاتەکەی جۆرێک هاوکاری بوو بۆ مەسرەفی ڕۆژانەیان، پیاوەکەی کرێکاری کارگەی ئیقبال بوو ئەو کاتە مووچەی کرێکارێک لە ساڵەکانی (١٣٣٥-١٣٣٨_١٩٥٦-١٩٥٩) دا، ڕۆژی سێ ڕیاڵ بوو، واتە مانگی (٩٠) ڕیاڵ.

ماڵی حاجی مەندەلی سەرچاوەی ئاویان نەبوو، واتە حاجی نەیدەویست بیر هەڵکەنێت و ئاو بۆ ماڵەکەی دابین بکات. دەبوایە منداڵەکان بچن لە تانکی ئاوەکەوە ئاو بهێنن، کە ئاوی تانکی مزگەوتی پشتی باخ دەبوایە بە (٤٥) پلیکانە بێچتە خوارەوە و (٣٠٠) مەتریش لە ماڵی حاجییەوە دوور بوو. نەبوونی سەرچاوەی ئاو لە هەر ماڵێکدا و لەو سەردەمەدا لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە لە ڕیزی ماڵە هەژارەکان دەژمێردرا. منداڵەکانی لەو سەردەمە دا تەمەنیان لە نێوان (١٤-٣٥) ساڵیدا بوون، ئەمانە فشارێکی زۆریان خستە سەر حاجی، تا بیرێک لێبدات و ببنە خاوەنی ئاوی خۆیان. حاجیش دەیگوت ئەگەر من لە ماڵەوە ئاوتان بۆ دابین بکەم ئێوە تەمبەڵ دەبن. کێشەی بیرلێدان و بیر لێنەدان لە ماڵی حاجیدا چەند ساڵێک بەردەوام بوو، دووان لە منداڵەکانی حاجی کە تەمەنیان لە نێوان (١٤-١٦) ساڵیدا بوو، زۆر سەرکێشیان دەکرد. هەموو ڕۆژێک لەگەڵ حاجیدا لە شەڕدابوون کە دەیانگوت ئێمە ناتوانین بچین ئاو بهێنین. حاجیش دەیگوت ئەگەر ئاو نەهێنن نابێت ئاویش بخۆنەوە. بەهەرحاڵ ژنی حاجی کە خۆی دەوڵەمەند بوو، لە ئەردەکان باخی بستەی هەبوو، کاتێک کە حاجی ماوەی مانگێک بۆ گەشت ڕۆیشتبوو، حاجیژن ویستی بە پارەی داهاتی باخەکەی لە ئاوی جۆگەکەوە ئاو ڕابکێشێت. دەیویست لە ماوەی ئەو مانگەدا هەموو کارەکانی ڕاکیشانی ئاو جێبەجێ بکات. هەر بۆیە بەپەلەپەل کەوتنە کارکردن و لایەکی حەوشەکەیان هەڵکەند و قسڵ و گەچیان ئامادەکرد و بەزوویی کارەکەیان جێبەجێکرد. کاتێک حاجی هاتەوە هەموو

شتێک تەواو ببوو، بەڵام لە ماڵەوە بوو بە هەراو کێشە، حاجی دەیگوت: کێ بەئێوەی گوتوە ئاو ڕابکێشن، ئەم ئاو ڕاکێشانە هەمووتان تەمبەڵ دەکات، من خۆم (٣٠) ساڵ زیاتر ئاوم کێشاوە بۆ ماڵەوە، ئێستاش تا زیندووم ئامادەم ئاو بهێنم بەڵام ئێوە ئەو هەموو پارەیەتان بەهەدەر داوە. ئیتر ئەوە بوو ئاوە ڕاکێشرا بۆ ماڵی حاجی و منداڵانیش لە ئاوهێنان ڕزگاریان بوو. پاش چوار ساڵ ئاوی بۆریی گەیشتە کۆڵانەکەیان و پاش شەش ساڵ ئاوی بۆریی گەیشتە ماڵان. کارەباش هات و هەموو ماڵەکانی ئەملاولای ماڵی حاجی کارەبایان ڕاکێشا، بەڵام حاجی بەمنداڵەکانی دەگوت کارەبا بۆچی باشە بەڕۆژ وانەکانتان بنووسنەوە و بەشەو بچنە ژێر بەتانییەکانتانەوە و بەزوویی بخەون. کوڕی دووەمی حاجیش تەمەنی (٣٠) ساڵ بوو، هێشتا ژنی نەهێنابوو، لە ژوورێکدا دەخەوت کە شەوانە بەهیچ جۆرێک ڕووناکی تێدا نەبوو. بەیانیان زوو دەچوو بۆ بازاڕی مسگەریی، شەو کە دەگەڕایەوە ماڵەوە، دەچووە ژوورێکی تاریکەوە و بەزووی دەخەوت. یەکێک لە دوکانەکانی حاجی کە دابووی بەکرێ، دوکانی سەروپێ بوو. حاجی هەموو بەیانییەک دەچووە دوکانی سەروپێکەوە، سێ شایی دەدا بە ڕیاڵ و نیوێک ئاوی گۆشتی دەخوارد، ڕەمەزانی سەروپێچی، یەک کەوچک ئاوی سەروپێی بۆ حاجی دەکردە قاپێکەوە و ئەو گۆشتە زیادەی کە لەبەرماوەی خەڵکی دەمایەوە کۆیدەکردەوە و دەیکردە قاپێکەوە و دایدەنا بۆ حاجی، هەموو ئەو پارچە نانە زیادانەی بەرماوەی خەڵکی بوون دەدران بە حاجی. حاجی ئەو نانە بەرماوەیەی لەئاوی سەروپێکە دەگوشی و دەستیدەکرد بە خواردنی. ڕۆژێک حاجی محەمەدی پاڵەوانپور ناسراو بە پاڵەوان ترشی بەوەستای سەروپێی گوت: ڕەمەزان ئەم حاجیە پارە خەرج ناکات و زۆر چرووکە بەڵام خاوەنی دوکانی تۆیە، بۆیە پێویستە ڕێزی لێ بگریت و خواردنی باشی بدەیتێ، نەک بەرماوەی خەڵکی. ڕەمەزانیش بەدەنگی بەرز وەڵامیدایەوە و گوتی: ئەگەر حاجی مانگی جارێک بێتە دوکانەکەم ئەوا هەموو جارێک یەک کەللە و باشترین خواردنی پێشکەش دەکەم، بەڵام من ناتوانم هەموو ڕۆژێک بە بەلاش خواردنی بدەمێ. حاجی کە گوێی لەم قسانەبوو بەپاڵەوانی گوت: من پارە خەرج ناکەم من پێش بەزیادە مەسرەفی دەگرم و ڕیاڵ و نیوێک دەدەمە ڕەمەزان، ئەو ڕازی و من ڕازی و خودا ڕازی، ئیتر تۆ بۆ قسە دەکەیت لە نێوانماندا. کۆڵانەکانی یەزد هێشتا بێ ڕووناکی بوون حاجیش پیر ببوو، کێشەی سنگ و سییەکانی هەبوو، دەیتوانی لەبازاڕەوە ڕاستەوخۆ بەپێ بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. جارجارێک لە قەراخی شەقامەکە دادەنیشت، شەوێکیان کە لە قەراخ کۆڵانێکدا دانیشتبوو عەباکەی بەسەر ڕووی خۆیدا دا بوو، ئاغا سەید عەلی عاشقە مەدینەی خودالێخۆشبوو. کە

ئەویش لە بازاڕ بوو، بینیبووی کە هەژارێک لەسەری کۆڵان دانیشتووە لە پاسکیلەکەی دادەبەزێت و دەڵێت ئەم دوو ڕیاڵە بگرە، لەو سەردەمەدا دوو ڕیاڵ زۆر بوو، هەنجیری وشک کە لە ساڵی (١٣٨٢-٢٠٠٣) دا کیلۆی بە (٥-٦) هەزار تومەن بوو، ئەو کاتە کیلۆی بە (٤) ڕیاڵ بوو، حاجی دەست درێژ دەکات، پارەکە وەردەگرێت و دەڵێ خودا نەیبڕێت و بەزیاد بێت، ئاغا سەید عەلی حاجی دەناسێتەوەو داوای لێبوردنی لێدەکات و دەستی درێژ دەکات تا (٢) ڕیاڵەکەی لێوەربگرێتەوە. حاجی دەڵێت ئاغا سەید تۆ پارەت دا و منیش لێم وەرگرتی و نزاشم بۆکردی، تازە پارەکە لای تۆ نەماو چووە گیرفانی منەوە، ئیتر پارەی چیت بدەمەوە. من بزانم حاجی هیچ کاتێک لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا خواردنی نەخواردووە. ژوورێکی تایبەتی خۆی هەبوو، بەیانیان و نیوەڕوان لە دەرەوەی نانی دەخوارد و ئێورانیش یان نانی نەدەخوارد یاخود کەمێک نان و پەنیرییان دەدایە. هەرگیز شەوانە چرای بەکارنەدەهێنا، خانووەکەشی کارەبای تێدا نەبوو، دەیگوت زیادە مەسرەفیە، منداڵە تەمەن (١٤-١٥) ساڵەکانی حاجی هەمیشە جلی دڕاو و پینەکراویان لەبەردابوو، حاجی، جلە کۆنەکانی خۆی کە زیاتر لە (١٥) ساڵ لەبەریدەکردن دەیبرد بۆ لای بەرگدوور تا بچووکیان بکاتەوە بۆ منداڵەکانی، دوکانی بەرگدرووەکەش هەر هی خۆی بوو بەکرێی دابوو، هەقدەستی دروونەکەشی نەدەدا، چونکە خۆی خاوەنی دووکانەکە بوو، شەوی نەورۆز لە قوتابخانە پارچە قوماشیان دابەش دەکرد بەسەر خوێندکارە پەککەوتە و هەژارەکاندا تا خۆیان بیکەن بە چاکەت و پانتۆڵ. ڕێکخەری قوتابخانە بانگی کوڕە شازدە ساڵیەکەی حاجی کردبوو کە لە پۆلی (١١) بوو پارچەیەک قوماشی بەئەویش دابوو، ڕێکخەر پێیگوتبوو دەزانم ئێوە حاڵتان زۆر باشەو دەوڵەمەندن، بەڵام ئەم پارچە قوماشە نابێت پینەی لێبدەن. کوڕەکەی حاجیش توورە دەبێت و قوماشەکە وەرناگرێت. دێتەوە بۆ ماڵەوە دەستدەکات بە گریان و دەڵێت: بۆچی باوکم جلمان بۆناکڕێت؟ دایکیشی دەڵێت: جا من نازانم چیبکەم، وەک خۆی جلتان بۆ ناکڕێت ڕێگەنادات منیش بەپارەی خۆم جلتان بۆ بکڕم. ئیتر شەو منداڵەکان و دایکیان لەگەڵ حاجیدا کردبوویان بەشەڕ، کە بۆچی جلیان بۆ ناکڕێت و ئەمڕۆ لە قوتابخانە هەر وەک منداڵە هەژارەکان پارچە قوماشیان داوەتە عەلی .حاجی گوتبووی زۆر باشە ئەو قوماشە بهێنن با من بۆخۆمی بدوورم. پاش چەند ساڵێکی تر ئینجا تۆ بچووکی بکەرەوە و خۆت لەبەریبکە، حاجی کاتێک بۆیدەرکەوت کە عەلی قوماشەکەی وەرنەگرتووە، زۆر توڕە ببوو بە دارەکەی دەستی زۆری لەعەلی دابوو، کە بۆچی قوماشەکەی وەرنەگرتووە. عەلیش بەسەری شکاوەوە پەلاماری حاجی دابوو دارەکەی لەدەست وەرگرتبوو، بەهەموو هێزی خۆی دارەکەی کێشابوو بەسەری

حاجیدا، حاجی سەری شکابوو و خوێن بەنێوچاوانیدا هاتبووە خوارەوە. ئەو شەوە حاجی ناچێت بۆ نەخۆشخانە و بە پارچە پەرۆیەکی کۆن برینەکەی سەری دەبەستێت. بەیانی زوو هەڵسابوو، زانیبووی کە دەبێت برینەکەی سەری پاکبکرێتەوە و دەرمان بکرێت. حاجی دەچێت بۆ نەخۆشخانەی پەهلەوی تا برینەکەی تیمار بکات، دکتۆر دوای تیمارکردن، دەرمانی پەنسلینی بۆ دەنووسێت و بە حاجی دەڵێت: تیماری سەرت بەبەلاش بووە، بەڵام دەبێت بچیتە دەرمانخانەکە سێ ریاڵ بدەیت تا ئەم دەرمانە وەربگریت و لەماڵەوە بیکە بەسەر برینەکەدا. حاجی دەڵێت: پارە بدەم و دەرمان بکڕم. پێویستم نییە و نایکرم. ئیتر ئەوە بوو دواتر سەری حاجی ئاوسا و تای لێهات، نەڕۆیشتەوە بۆ لای دکتۆر، پاشان هەر بەهۆی ئەو سەرشکانەوە، حاجی دوای سێ مانگ مرد. منداڵەکان هەر بەزوویی کارەبایان بۆ ماڵەوە ڕاکێشا. جلی تازەیان کڕی و خۆیان تازەکردەوە، هەموو منداڵەکان پاسکیلیان کڕی و هەموو خەڵکی گەڕەکیان بانگهێشتکرد و شەربەت و شیرینییان بەسەر خەڵکدا دابەشدەکرد، خواردنێکی زۆریان دروستکرد. لەم شارە وشکانییەی ئێمەدا هەمیشە ژیان ئەوا گوزەراوە، تەنانەت منداڵی دەوڵەمەندەکانیش بەهۆی چرووکی و ڕەزیلی باوکیانەوە دووچاری گرفتاری بوون. ئەمانە دەبوایە هەموو ڕۆژێک چەند کاتژمێرێک کاتی خۆیان بۆ هێنانی ئاو تەرخان بکەن و جلوبەرگی کۆنە لەبەر بکەن و لەتاریکدا بخەون.

## یەزد شاری پاڵەوانان

یانە پاڵەوانبازییەکان لە ڕابردوودا لە تەواوی شارەکاندا ڕۆڵێکی باشیان هەبووە بۆ پەروەدەکردنی پاڵەوانەکان. ئەم یانانە لەسەر بنەمای خۆشەویستی و جوانمەردی و هاوکاری و لەخۆبووردەیی کەسەکانیان پەروەردە دەکرد، یانەکان تەنها ئەو کەسانەیان لای خۆیان وەردەگرت کە نموونەی کەسە باشەکان بوون، خەڵکانی لاتباز و چەقۆکێش و هەرچی و پەرچی و خوێڕیی بەهیچ شێوەیەک لەو شوێنانە جێگەیان نەدەبووەوە. ئەوپەڕی هەوڵیاندەدا کە خەڵک لە هەموو ئەو کار و کردەوانە دووربخەنەوە کە زیانی هەبوو بۆ کۆمەڵگە.

دیارە لەو سەردەمەدا لە هەر دە کەسێک چواریان تلیاکخۆر ببوون، بار بوون بەسەر کۆمەڵگەوە، نەیاندەتوانی ژن و منداڵەکانیان خزمەت بکەن و بیانژێنن. بەڵام کەسانی وەرزشیی نموونەی خەڵکی باشی کۆمەڵگە بوون، ئەوکات کە من منداڵبووم، لانیکەم ٣٠% پیاوان و ١٠% ی ژنان تلیاکخۆر بوون.

باوکم، مامەکانم، یەکێک لە ژنەکانی باوکم تلیاکخۆر بوو، یەکێک لە مامەکانم کە کوڕی نەبوو، منداڵێکی کچەکەی لە تەمەنی (١٣-١٤)ساڵیدا لەلای مقەڵی تلیاکەوە دادەنیشاند تا ئالودەی کرد، ئێستاش ئەو کە تەمەنی (٦٠) ساڵە گرفتاری تلیاکی نەعلەتییە.

من ئێستاکەش کاتێک بە کۆڵانەکانی گەڕەکی خۆماندا دەڕۆم، لانیکەم دە کەسی تلیاکخۆر دەبینم لە خەڵکە هەژارو دەوڵەندەکان. لە دەیەی (١٣٣١-١٩٥٢) دا، هەندێک لەم هەژار و داماوانە پێویستیان بە یەک مسقاڵ تلیاک هەبووە، بەڵام نەیانتوانیوە دابینی بکەن، هەندێکیش هەبوون، بەپاکەت تلیاکی نمرە یەکیان بۆ دەچووە ماڵەوە، تەنانەت هەندێکی تریان بە کیلۆ بۆیان دابیندەکرا، یادی بەخێر حاجی ئەخلاس دەیگوت، کێ دەڵێت تلیاک خەڵکی ئالودە دەکات من ئەوە (٣٥) ساڵە هەموو ڕۆژێک دوو مسقاڵ تلیاک

دەکێشم، ئالوودەش نەبووم. ژنانیش هەندێکیان ئالوودە ببوون، بەڵام ئەمان بەگشتی تلیاکیان دەکێشا. ئەو ژنانە چونکە پیاوەکانیان تلیاکخۆر بوون بەگشتی ئەوانیش هەر دەبوون بە تلیاکخۆر، یا لەکاتی منداڵبوون لەکاتی هەر ئازارێکی تر کەمێک تلیاکیان دەدانێ، ئیتر فێری تلیاک کێشان دەبوون. نیوەی پاسەوانەکانی نێوشاریش تلیاککێش بوون، لە سالانی (١٣٣٠-١٣٤٠_١٩٥١-١٩٦١) لانیکەم دە پاسەوانی تلیاکخۆر دەناسم. ئێستا حکومەت چۆن دەتوانێت بەپاسەوانی تلیاکخۆر رێگری بکات لە بڵاوبوونەوەی تلیاک و دژی قاچاچییەکان بووەستێتەوە. ئەم تلیاکخۆرانەی پۆلیس و پاسەوانەکان هەر تایبەت نەبووە بە شاری یەزد، بەڵکو هەموو وڵاتی گرتبووەوە. ئێستاش یەزد بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تر زۆر باشترە. دژایەتیکردنی تلیاک زیاتر لە (٥٠) ساڵە بەردەوامە، بەڵام تائێستا نەتوانراوە بنەبڕ بکرێت. لە ساڵی (١٣٤٥-١٩٦٦) دا، تاقیکردنەوەی خوێنیان بۆ تەواوی هێزە سەربازیی و پاسەوانان کرد و هەر کەسێک ئالودەبووایە، خانەنشینیان دەکرد. داماوانە سێ رۆژ تلیاکیان نەدەکێشا و ئاوی شووتییان دەخواردەوە. دەبوایە بنباڵیان بپشکنینایە و بیانبردنایە بۆ تاقیگەکان، لەم کات و ساتانەدا چوار کەس دەچوون بۆ یانە وەرزشییەکانی یەزد کە شوێنی پێگەیاندنی پاڵەوانە بەناوبانگەکان بوو، لە سەردەمی نەسردین شادا، پاڵەوان ئیبراهیم حەلاج تەفتی ناسراو بە پاڵەوانی گەورەی یەزد، ماوەیەک پاڵەوانی پایتەخت بوو، دوای ئەو پاڵەوان محەمەد عەبدول، ماوەیەکی زۆر پاڵەوانی پایتەخت بوو، خاوەنی بازوبەندی پاڵەوانی بوو، کوڕی پاڵەوان محەمەد عەبدول میرزا حەسەنی پاڵەوان زادە لە ساڵی (١٣١٨-١٩٣٩) دا، تاکە پاڵەوانی وڵات بوو، کە بووە خاوەنی بازوبەندی پاڵەوانی. هەر کەسێک لە سێ هەڵبژاردندا ببوایە بە پاڵەوانی پایتەخت ئەوا بازوبەندی پاڵەوانی پێدەدرا.

هەروەها چەندین پاڵەوانی تر لە یەزد هەبوون وەک پاڵەوان محەمەد سەباخ پاڵەوان محەمەد ماوار، پاڵەوان ئەحمەد خانی مەجدی.

لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١) دا، ئاغای سەید حسەن داستانی، ناسراو بە سەید حەسەن سەبیل پیاوێکی زل و بەخۆوە بوو کێشی (١٢٠) کیلۆ دەبوو، زۆر بەهێز و ئازا بوو، یەکێک بوو لە پاڵەوانە باشەکان خەڵکی گوندی مەرداوا بوو کە (٥ کم) لە یەزدەوە دووربوو. ئێستا گەڕەکێکە لە یەزد، ئەم سەیدە بەڕێزە شاگردی گەراج بوو، ئەوکات بەکرێی مانگانەی (٢٤٠) تومەن کاریدەکرد، کە رۆژانە (١٢-١٤) کاتژمێر کاری دەکرد، خاوەنی هیچ شتێک نەبوو تەنها و تەنها ئەو (٢٤٠) تومەنە نەبێت کە مانگانە وەریدەگرت، لە خانوویەکدا دەژیا کە دەرگای پێوەنەبوو، ژوورەکەی پەنجەرەی تیا نەبوو، تەنها یەک پارچە شووشە لە دیوارەکەی گیرابوو، تا لەوێوەوە رووناکی بێتە

ژووره‌وه، هه‌موو ماڵه‌كه‌ی وه‌ک پێویست ڕاخه‌ری تێدا نه‌بوو، ته‌نها دوو منداڵی هه‌بوو، خۆی و ژن و دوو منداڵه‌كه‌ی له‌یه‌ک ژووردا ده‌ژیان. سه‌ید له‌و سه‌رده‌مه‌دا واته ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) ته‌مه‌نی (٣٥-٤٠) ساڵ ده‌بوو، ژیانێكی زۆر هه‌ژارانه‌ی هه‌بوو، به‌ڵام پاڵه‌وان بوو، ڕه‌وشتیشی هه‌ر پاڵه‌وانانه بوو، نوێنه‌ری خه‌ڵكی گونده‌كه‌ی خۆیان بوو، ئه‌و كوێخا نه‌بوو به‌ڵام به‌كرده‌وه كوێخا بوو. هه‌موو ئیش و كاره‌كانی گونده‌كه ئه‌و ڕایده‌په‌ڕاند. له‌ نێوان خه‌ڵكی گوند و مه‌رداوا كه‌ سه‌ید حه‌سه‌ن نوێنه‌ریان بوو، له‌گه‌ڵ بنه‌ماڵه‌یه‌كی ده‌وڵه‌مه‌ندی یه‌زدی كێشه‌یه‌ک له‌سه‌ر موڵكێكی زۆری چه‌ند سه‌د هیكتاری هه‌بوو، خان مه‌لیک یه‌زدی كه‌ سه‌ر به‌ ڕژێمی شا بوو له‌ ئیستگه‌ی ڕادیۆ به‌رنامه‌ی هه‌بوو له‌ خزمه‌تی ڕژێمی شادا بوو. هه‌میشه پۆلیس و فه‌رمانگه‌كانی ڕژێم پشتیوانیان لێده‌كردو له‌ یه‌زددا ده‌سه‌ڵاتدار بوون. ده‌ستیان به‌سه‌ر هه‌موو زه‌وییه‌كانی ده‌وروبه‌ری یه‌زدا گرتبوو. به‌تایبه‌ت موڵكه‌كانی گوندی مه‌رداوا و زۆر هه‌وڵیده‌دا هه‌ر چۆنێک بێت ئه‌و موڵكانه‌ له‌ ده‌ستی خه‌ڵكی گونده‌كه‌ ده‌ربهێنێت. به‌ڵام ئاغا حه‌سه‌ن داستانی كه‌ خۆی هیچ پارچه‌ زه‌وییه‌كی نه‌بوو، ته‌نها نوێنه‌ری خه‌ڵكی هه‌ژاری گونده‌كه‌ بوو، ئاغا خان مه‌لیک یه‌زدی نوێنه‌ری بنه‌ماڵه‌ ده‌وڵه‌مه‌نده‌كانی یه‌زد بوو، چه‌ندین كۆڕ و كۆبوونه‌وه‌ به‌سترا تا ئاغا سه‌ید حه‌سه‌ن داستانی ڕازی بكه‌ن كه‌ واز له‌ مافی گونده‌كه‌ بهێنێت، تا كار گه‌یشته‌ ئه‌وه‌ی كه‌ قائیمیقامیه‌تی یه‌زد و فه‌رمانگه‌ حكومیه‌كان كۆبوونه‌وه‌ی خۆیان ئه‌نجامدا و له‌ به‌رژه‌وه‌ندی خان مه‌لیک بڕیاریاندا كه‌ سه‌ید حه‌سه‌ن له‌ یه‌زده‌وه‌ دووربخرێته‌وه‌ بۆ كرمان، به‌ڵام ترسیان هه‌بوو له‌ خه‌ڵكی گوندی مه‌رداوا ئه‌گه‌ر سه‌ید دووربخرێته‌وه‌. شه‌وێک له‌ ماڵی خزمێكی من كۆبوونه‌وه‌یه‌كیان ئه‌نجامدا، كه‌ ته‌گبیرێک له‌ ئاغا سه‌ید حه‌سه‌ن بكه‌ن، ئه‌وه‌بوو ئاغای خان مه‌لیک پێشنیاری كرد قسه‌ له‌گه‌ڵ ئاغا سه‌ید حه‌سه‌ن داستانی بكه‌ن و ڕازی بكه‌ن بڕوات بۆ تاران، له‌وێش ئه‌م دیارییانه‌ی پێشكه‌شبكرێت، خانوویه‌كی (٣٠٠) مه‌تری له‌ باشترین شوێنی تاراندا، ئۆتۆمبێلێک، دوكانێک له‌گه‌ڵ (١٥٠) هه‌زار تومه‌ندا كه‌ ده‌یكرده‌ (٣٠) ملیۆن تومه‌نی ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤)، به‌ڵام ده‌بێت سه‌ید هیچ كارێک نه‌كات و واز له‌ نوێنه‌رایه‌تی خه‌ڵكی گونده‌كه‌ بهێنێت و بڕوات بۆ تاران، خۆ ئه‌گه‌ر سه‌ید پێشنیاره‌كه‌ی قبوڵكرد ئه‌وا له‌ گونده‌كه‌یاندا كه‌سێكی تری تێدا نییه‌ كه‌ وه‌ک سه‌ید حه‌سه‌ن خه‌ڵكی به‌پێشته‌وه‌بێت. ئه‌وكات خان مه‌لیک ده‌توانێت به‌ئاسانی كاره‌كانی خۆی ئه‌نجامبدات، له‌به‌رامبه‌ر پێشنیاره‌كه‌ی خان مه‌لیک یه‌زدی دا سه‌ید حه‌سه‌ن گوتبووی تۆ هه‌موو خه‌ڵک وه‌ک خۆت سه‌یرده‌كه‌یت، واده‌زانیت هه‌موو كه‌سێک بۆ پاره‌ سه‌ری خۆی شۆڕده‌كات، ئه‌گه‌ر سه‌د ئه‌وه‌نده‌ی تر كه‌ بۆتان دیاری كردوم بمده‌نێ ئینجا من

خیانەتی یەک ڕیاڵ لەم خەڵکە ناکەم، ئامادەم بۆ هەر شوێنێک دوورم بخەنەوە ئەگەر لەسێدارشم بدەن، ئینجا ئامادەی خیانەت کردن نیم، من لە یانەی وەرزشی فێری خیانەت و دەستپیسی نەکراوم، من دەبێت گیانم ببەخشم لەپێناوی هەژاراندا، ئەوان ویستیان سەید دووربخەنەوە بۆ کرمان بەلام چونکە خەڵکی گوندی مەرداوا لە بەردەم بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس گردبوونەوەیان ئەنجامدا، نەیانتوانی دووری بخەنەوە، بەڵام لە یەزد زیندانیان کرد. پاش ماوەیەک بەهۆی فشاری خەڵکی گوندەکەوە ئازادکرا. ئاغا سەید حەسەن داستانی چەندین ساڵ بەرگری لە خەڵکی هەژاری گوندەکەی کرد، بەڵام لە هەمان خانووە کۆن و خراپەکەی خۆیدا ژیانی دەگوزەراند، بەمانگانەی (٢٤٠) تومەن دەژیا تا لە دواییدا مانگانەکەی بۆکرا بە (٣٠٠) تومەن. ئاغاسەید حەسەن زۆر بەهەژارانە دەژیا بە ڕەوشتێکی بەرزی پاڵەوانانەوە.

## شێتەکان داماوترین کەسانی کۆمەڵگە

کچێکی قەڵەوی خڕپنەی سوور و سپی، بەبیجامەیەک و کراسێکی گوڵگوڵی و سەروقژێکی ئاڵۆزکاوەوە بەرەڵای کۆڵانە و کۆڵان ببوو. کچێکی حۆل و مەنگۆل بوو، دایک و باوکی ئامۆزای یەکتری بوون، باپیرە و نەنکیشی دووبارە هەر ئامۆزای یەکتربوون. لە دەیەی ساڵەکانی (١٣٣٠-١٩٥١) دا، کەسێک بیویستایە هاوسەرگیریی بکات، داوای ئازمایشی خوێنی لێنەدەکرا. لە ڕوانگەی خەڵکیەوە وا لێکدەدرایەوە کە شێتەکان جنۆکە چووەتە گیانیانەوە و هیچ پەیوەندییەکی بە خوێنەوە نییە، خەڵکیش و تەنانەت دکتورەکانی ئەوسەردەمەش نەخۆشییەی بۆماوەییەکانیان نەدەزانی و هیچ تاقیکردنەوەکیش نەبوو. لە گەڕەکی ئێمەدا لانیکەم دە کەس لە کوڕان و کچانی مەنگۆل هەبوون، ئەمانە دابەش ببوون بەسەر دوو دەستەدا مەنگۆل و حۆلەکانی ماڵە دەوڵەمەندەکان و مەنگۆلی ماڵە هەژارەکان. ئەو کچەی ئێمە لێرە باسی دەکەین لە دەستەی دووەم بوو، واتە سەربە چینی هەژاران بوو، لە تەمەنی (١٥-١٦) ساڵیدا بوو، بەو هەموو مەنگۆلیەوە کچێکی ناشیرین نەبوو. منداڵان جارجار سەریان دەکردە سەری، بەڵام ئازاریان نەدەدا، نەک لەبەر ئەوەی منداڵەکان بەئەدەب بوون بەڵکو لەبەر ئەوەی لێی دەترسان.

یەکێک دەیگوت جن چووەتە لەشییەوە، ئەگەر ئازاری بدەیت ئەوا جنۆکەکان تۆڵەتان لێدەکەنەوە و جن دێتە لەشی ئێوەش، ئەوکات یان نیوەی لەشتان دەبێتە لەشی سەگ یان لەبری قسەکردن وەک سەگ دەوەڕن. پاشان دەبێت شیشی سورەکراو بەقاچتاندا بکرێت تا جنەکان لە لەشتان دەردەچن. کچێک کە وێڵی کۆڵانە و کۆڵان بوو، هیچ یاسایەک نەبوو کە بەرگری لێبکات و یاسای جنۆکە ئەویان پەنا دابوو. ڕۆژێک دایکی بەسەری خۆی دەکێشا و دەگریا و هاواری دەکرد، و دەیگوت چ نامەرد و بێشەرەفێک لاقەی ئەم کچە بێتاوان و شێت و داماوەی کردووە، ئەو کەسە خۆی زۆڵ و بێڕەوشتە

و جنۆکەیە، دیارە هەرکەسێک بێت شیری حەرامی خواردووە و حەرامزادەیە، ئەگەر نا چۆن سکی ئەم کچە داماوەی پڕ دەکرد. دایکی داماویش درەنگ زانیبووی کە چوار مانگە کچەیان سکی پڕ کراوە، ژنان دەیانگوت لەسەردەم ڕایکێشن و بیکێشن بەکەمەر و پشتیدا، یاخود بیبەنە لای حەسەنی عەتار دەرمانی بۆ وەربگرن، دایکی دەیگوت باوکی ئەوەندەی بەپشت و سکی دا کێشاوە، داماوە خوێن دەرشێتەوە، بەڵام منداڵەکە لەسکیدا هەر جێگیرە. دوعا و شێخ نەما بۆی نەکەین و ئەم هەموو دەرمانانەمان بەدەمیدا کرد، کەچی هیچ سوودێکی نەبوو. لەولاوە خەڵکی دەیانگوت ئەوەندە لەو داماوە مەدەن لێیگەڕێن با منداڵەکەی ببێت و لەسەر ڕێگایەک فڕێیبدەن، ئەوکات خەڵکی هەڵیدەگرنەوە و بەخێوی دەکەن. پاشان منداڵێکی حەرامزادەی هەژار لە گەڕەکەکەماندا زیادی کرد. منداڵەکە کە لەدایکبوو منداڵێکی تەواو سوورسپی و بەخۆوە بوو، بەڵام چ سوودێکی هەبوو، منداڵەکە حەرامزادە بوو، منداڵەکە گەورە بوو لە کۆڵاندا لەنێو خاک و خۆڵدا یاری دەکرد، بەڵام دایکیان لە ژوورەوە زیندانی کرد بوو، چونکە نەدەکرا بەرەڵای کۆڵان بێت و ناکەسبەچەیەکی تر منداڵێکی تری پێ فڕێبدات.

شێتێکی تر کە ئەسغەر سوغری یان پێدەگوت، شێتێکی بەهۆش و گۆش بوو، کاتێک من لە پۆلی (١١) بووم ئەو کات دەبوو بچیت بۆ قوتابخانە، پێش قوتابخانە چووبووە لای مەلا و قورئانی لەبەربوو. لەسەر کۆڵانەکان سەدان شیعری حافز و سەعدی دەخوێندەوە، هەرچەند ئەسغەر سوغری شێت بوو بەڵام وردە وردە هۆشی دەهاتەوە. کاتێک منداڵان پێیاندەگوت ئەسغەر سوغری شێت، ئەویش تورە دەبوو، جوێنیدەدا، پەلاماری بەردی دەدا و دەیکێشا بەشووشەی ماڵاندا و دەیشکاند. ئەوە بوو لە دواییدا ئەسغەر سوغری شێت بە بەدرێک سەری کازم بەچەلوس، یەکێک لە دەوڵەمەندەکانی گەڕەکی شکاند، حاجی ڕەزای باوکی کازم بەخۆی و هەشت لە برا و خوشکەکانی کازم هەڵیانکوتایە سەر ماڵی ئەسغەر سوغرای و سەدان جوێنیان بەهەموو کەسوکاری دا. گوتیان دەبێت ئەم شێتە لە ماڵەوە زیندانی بکرێت، لە کۆتاییدا ئەسغەر لە تەمەنی حەوت ساڵیدا ون بوو، هەر ون بوو، بۆ کوێ ڕۆیشت چی بەسەرهات ئەگەر ئێوە دەزانن چی لێهات ئەوا منیش دەزانم....

ئاغای جەمالی، ئاغا یوک، ئاغا قەلەموون و خێزانەکەی، چواردانە شێت کە هەموویان خزم و کەسوکاری یەکتری بوون و لە بنەماڵە دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتووەکان و سیاسیەکان بوون، یەکێک لە خزمەکانی ئەمانە دووجار بووەتە نوێنەری شوراو دوایی بووەتە نوێنەری پارێزگای ئەسفەهان و یەزد، ئاغای جەمالی شێتێکی مەترسیداربوو، لە هەموو تەمەنیدا لە ماڵەوە بەزنجیر بەسترابووەوە، پیاوێکی زل

و کەتە بوو، پەلاماری خەڵکی دەدا، من تەنها دووجار ئەو شێتەم بینیوە. بەڵام ئاغای بووک کە شێتێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو، هەزاران هۆنراوەی لەبەربوو، زۆر ئارەزووی لە گەشتکردن بوو، سوار ئۆتۆمبێل دەبوو دەڕۆیشت بۆ دەشتودەر، لەگەڵ جەماڵە شێتدا کوڕە خاڵی یەکتری بوون.

بەڵام ئاغای قەلەموون، پیاوێکی بەهۆش بوو بە کوڵ شتفرۆشی دەکرد، بەتایبەت گیادەرمانی عەمامەی لەسەر دەکرد و کەوای لەبەردەکرد. خوێندەوارێکی زۆر باش بوو، زۆربەی هۆنراوەکانی شانامەی فیردەوسی و دیوانی حافز و سەعدی و نیزامی و سائیبی تەورێزی و مەولانا و وەحشی بافقی و کەلیم کاشانی خوێندبووەوە و زۆری لەبەربوو، بەڵام لە دەوروبەری (٥٥) ساڵیدا وردە وردە خۆی لە گێلی و حۆلی دەدا، ئەو پارە و شتەی کە هەیبوو هەمووی دابەشکرد بەسەر خەڵکیدا.

## خێرێک بۆ ئیمام عەباس لەلایەن بیبی سەغەرییەوە

هەر کەسێک هاتە ئەم ماڵەوە نانی بدەرێ و لە ئیمانی مەپرسە. بیبی سەغەری ژنێکی تەمەن (٦٠) ساڵ بوو، لە کۆڵانی بێوەژنان، هەژار بوو نان لەماڵیدا نەبوو، چەند ساڵێک بوو پیاوەکەی مردبوو. لە خانووەکەی نەنە قەمەردا ژوورێکی بەکرێ گرتبوو، واتە لە خانوویەکدا دەژیا کە پێکهاتبوو لە هەشت ژوور، بەڵام شەش ماڵی تێدا دەژیا، بە تەشیرێسی ژیانی دەگوزەراند. ژوورەکەی گەچکاری نەکرا بوو بەرد و خشتی دیواری ژوورەکەی بەدەرەوە بوو. بنمیچی ژوورەکەی بە دووکەڵ ڕەش ببوو، بنمیچی ڕەشی ژوورەکە و تیشکی خۆر لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورەوە دیمەنکی تایبەتی بە مرۆڤ دەبەخشی. کاتێک تەمەنم (١٠-١١) ساڵ بوو، دوو سێ جار چوومەتە ژوورەکەی، بۆ هەواڵبردن، هەموو جارێک زۆر بە میهرەبانییەوە چەند دانە هەڵوژەیەکی دەدامێ. نیوەی ژوورەکەی زیاتر ڕاخەری تێدا نەبوو، بەشێکی تری ژوورەکەی چەند پارچە بەڕەی بێکەڵکی لێ ڕاخرابوو. هەر لەو شوێنەدا پارچە تەختەیەک هەبوو، تەواوی شتومەکی ناو ماڵەکەی لەسەر دانرابوو. لەبەر دەرگای ژوورەکەشدا ئاگردانێک هەبوو. خوشک وبرایەکی لە خۆی گەورەتریشی هەبوو، هەریەکەیان ماڵیان لە کۆڵانێک بوو، لە ڕووی ماڵییەوە ژیانیان لەو باشتر نەبوو. بیبی سەغەری لەگەڵ هەموو خەڵکدا بەتایبەت لەگەڵ منداڵاندا زۆر میهرەبان بوو، سێ منداڵی هەبوو کە گەورە ببوون، ژیانێکی هەژارانەیان هەبوو، لە ماڵی خۆیاندا دەژیان، منداڵێکیشی ساڵی پێشووتر مردبوو، هەمیشە دەیگوت ئەو منداڵەی کە مردووە لە هەموو منداڵەکانی تری جوانتر و خۆشەویستتر بووە، کچەکەی کە تەمەنی (١٤) ساڵ بوو، دەیویست بیدات بەشوو، بەڵام کتوپڕ تووشی نەخۆشی دڵەشە ببوو، هەرچەندە گیای شینە شاتەرە و گوڵی زمانە مانگا و بەرزنجۆشی دابویە، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، کچە دوای سێ ڕۆژ لە دڵەشە و ڕەشانەوە بە بێهۆشی بردبوویان بۆ لای دکتۆر، بەڵام دکتۆر گوتبووی ئەم

منداڵەتان درەنگ هێناوە، تازە درەنگە بۆ چارەسەرکردن، دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ کچە گیانی سپارد. بیبی سەغەری تەمەنی (٣٥) ساڵ بوو کە کچەکەی مرد بوو، پیاوەکەشی ساڵی دواتر مرد بوو، بیبی سەغەری ئیتر شووی نەکردەوە. بیبی سەغەری سەید بوو، بەڵام هچ کات هیچ شتێکی لە کەس وەرنەدەگرت و دەیگوت من کاردەکەم و سوپاس بۆ خودا حاڵم باشە، خێرەکانتان بدەنە کەسێک کە پێویستی پێی هەبێت. بیبی لە مەراسیمەکاندا دەفی لێدەدا و شادی و خۆشی دەخستە دڵی خەڵکەوە. لە پیاهەڵدانەکانی بە ئیمامی عەلی و هۆنراوە خوێندنەوە و لە بووک گواستنەوە و شایی و هەڵپەڕکێدا هەر دەفی لێدەدا، بەڵام هەرگیز ئامادە نەبوو پارە لە هیچ کەسێک وەربگرێت.

ساڵەکانی (١٣٣٧-١٣٣٨_١٩٥٨-١٩٥٩) لە شاری یەزددا تەنها چەند شەقامێک هەبوون، ئەم شەقامانەش هەموویان هەر گڵ بوون و قیرتاو نەکرابوون، تەنها بەشێک لە شەقامەکانی شا و پەهلەوی و کرمان قیرتاو کرابوون. لە پاش کودەتای (٢٨ ی موورداد ١٣٣٢_١٩-٨-١٩٥٣) دەوڵەت ویستی بە داهاتی پارەی نەوت هەندێک گۆڕانکاری لە نێوشاردا بکات، ئەندازیارەکانی شارەوانی شەقامەکانیان دیاری کرد و ئەو شوێنانەیان دەستنیشانکرد کە دەبێت کاری تێدابکرێت. ڕۆژانە سەداها کرێکار لە نێو شاردا دەستبەکاربوون، بە پاچ و قوڵنگ دەستیانکرد بە تێکدانی خانووە کۆنەکان. ئەوکات وەک ئێستا هیچ ئامێرێکی ئەوتۆ نەبوو، کە سوودی لێوەربگیردرێت، هەرچیەک هەبوو تەنها بازووی کرێکاران بوو. کرێکارەکان هەموو خانوو و بیناکانیان لەگەڵ زەویدا تەختکرد، تێکدانی خانوو و بینا کۆنەکان چەندین کێشەیان بۆ کرێکاران دروستدەکرد، تەنانەت زۆر جار ئەگەری گیانلەدەستدانی کرێکارەکانیش هەبوو. کرێکاران بۆ ئەوەی ژێرزەمینەکان باش تێکبدەن و بەئاسانی کارەکان ئەنجامبدەن، دەچوون ڕێرەوی ئاوی قەناتیان دەگۆڕی بۆ سەر خانووەکان، خانووەکانیش چونکە بەخشتی قوڕ دروستکرابوون، پاش سێ ڕۆژ کە ئاوەکە خشتەکانی دەخوساندەوە دیوارەکان وەک موقەبا بەسەریەکدا دەتلیسانەوە. خەڵکیی هەموو منداڵەکانیان ئاگادارکردبوەوە کە نەچن بۆ سەیری تێکدان و ڕووخاندنی دیوارکان، ئەگەر چووشن نەچنە نزیک ئەو شوێنانەی کە ئاویان خراوەتە سەر، بەڵام چونکە منداڵان قسەی کەسیان بەگوێدا نەدەچوو، چەند ڕووداوێکی نەخوازراو ڕوویاندا. منداڵێک مار پێوەیدا، جۆری ژەهری مارەکە ترسناک بوو، عەلی مورادی ڕۆیشتبووە ناو کەلاوەکانەوە، دەستیکرد بوو بە ناو کونە دیواردا تا شتێک بدۆزێتەوە، بەڵام لەبری ئەوەی شتێکی بەنرخ بەدەستیەوە بێت مارێک بەدەستییەوە هاتبوو، بەپەلە فریای نەخۆشخانەیان خست، پاش مانەوەی دوو ڕۆژ لە نەخۆشخانە، بەدەستی ئیفلیجەوە هاتەوە بۆ ماڵەوە،

ئیتر دەستی بەتەواوی ئیفلیج بوو. هەروەها (٧-٨) کەسی تر دووپشک پێوەیدان. لە کونە دیواری کەلاوەکاندا دووپشک زۆرتر بوو سیسرک و کوللەو مێروولەیان دەخوارد، تەنانەت هەندێک کەس بینیبویان کە دووپشک مارمێلکەی خواردووە، بەڵام خراپترین ڕووداو ئەوەبوو جەوادی سەرجانی کوڕی محەمەد عەلی سیراج کە کوڕێکی زیرەک و هاوپۆلی من بوو، هەمیشە لە قوتابخانە یەکەم و دووەم دەبوو، ئەویش چووبوو بۆ سەیری تێکدانانی خانووەکان، چووبووە سەر جێگایەک کە لە خوارەوە وەک حەوزێکی گەورەی لێهاتبوو، هەرچەندە کرێکارەکان گوتوبویان مەچنە ئەو شوێنە مەترسیدارە، پێدەچێت بڕوخێت. بەڵام جەوادی سەراجی گوێی پێنەدابوون، گڵەکە لەناکاو هەرەسی هێنا، جەواد کەوتە خوارەوە و کەوتە ناو چاڵە ئاوەقوڵەکەوە، کرێکارەکان بەخێرایی پەلاماریاندا و پاش چەند خولەکێک هێنایانە دەرەوە، هەموو ئیسقانی لەشی تێکشکابوو، بەپەلە بردیان بۆ نەخۆشخانە، (٤٠) ڕۆژ لە نەخۆشخانە مایەوە، کە تائێستاش شوێنەواری شکاوی بەڕوویەوە دیارە. بەڵام لە خوێندن بەردەوام بوو، ئێستا دکتۆرای هەیە لە بواری فیزیادا. ڕووداوەکەی جەوادی سەراجی تا ڕادەیەک منداڵانی ترساند، بەڵام نەک بەوشێوەیەی کە هیچ کەسێک بۆ سەیرکردنی خانووە ڕووخاوەکان نەچێت، ڕۆژێکیان (١٠-١٢) منداڵ دەڕۆن بۆ لای حەوزە ئاوێک کە لە ئەنجامی ئاوتێکردنی گەڕەکەکانەوە دروستببوو، هاوین بوو هەوا زۆر ڕگەرم بوو، ئەم منداڵانەش خۆیان فڕیدرابووە ناو حەوزەکەوە، کاتی نانی نیوەڕۆ بوو، کرێکارەکان لەوێ نەبوون، منداڵەکان کە زانیبویان کرێکارەکان لەوێ نین بەدەرفەتیان زانی بوو، هەر بەجلەوە خۆیان فڕێدابووە ناو حەوزە گڵییەکەوە کە پڕ بوو لە ئاو، بیبی سەغەری لەوکاتەدا بەوێدا ڕەتدەبێت، کە دەبینێت منداڵەکان بەجلەوە خۆیان خستوتە ناو حەوزە ئاوەکەوە بانگیان لێدەکات و دەڵێت: وەرنە دەرەوە ئەوە زۆر ترسناکە، بۆ چوونەتە ئەو حەوزی ئاوەوە. بەڵام ئەوان هیچ گوێیان بە قسەکانی نەدا. وردە وردە چەند کەسێکی تر هاتن و لەوناوە کۆبوونەوە هەموو بانگیان دەکردن کە منداڵینە لەو حەوزە وەرنە دەرەوە، دوو منداڵ لە ئاوەکە هاتنە دەرەوە، بەڵام هێشتا (١٠) منداڵی تر لە نێو ئاوەکەدا بوون، لە ناکاو هەندێک گڵ هەرەسی هێنا و ڕووخایە ناو ئاوەکەوە و حەوزەکە تەقی، بیبی سەغەری هاواریکرد یا ئەبوفەزڵ ئاگات لە منداڵی خەڵکی بێت، یەک خوان، خواردنم بەگۆشتی (٥) مەڕەوە خێربێت ئەم منداڵانە هیچیان لێنەیەت. خەڵێکی زۆر کۆبوونەوەوە و خێرا منداڵەکانیان ڕزگارکرد. خۆشبەختانە ئاوی حەوزەکە تەواو بە تاڵ نەبوو، منیش بە خێرایی چووم سەردانی شوێنەکەم کرد، بەڵام خۆشبەختانە ناو حەوزەکە لە (٣-٤) مەتر زیاتر قوڵ نەبوو، بەڵام ئەو گڵ و خۆڵەی کە ڕووخا بوو زۆر

نەبوو، منداڵەکان هەموویان بەکەمی برینداربوون، تەنها حسێنی ڕیایی دەستی شکابوو، لەگەڵ عەباسی قەلەندەری کە ئەویش قاچی شکابوو، هەموو خەڵکی دەیانگوت ئیمامی عەباس ئەم منداڵانەی پاراستووە. بۆ سبەینێ بیبی سەغەری لە بیرۆی ئەو خێرە گەورەیەدا بوو کە بەڵێنیدابوو خواردنێکی زۆر دروستبکات و بیکات بە خێری ئیمام عەباس، بە گۆشتی (٥) مەڕەوە، بەڵام بیبی سەغەری هەژار خاوەنی هیچ شتێک نەبوو، بەنیازیش بوو ئەو داوەتە گەورەیە ڕێکبخات کە بۆ ئیمامی عەباسی نەزر کردبوو، بەڵام کێشەکەشی لەوەدابوو کە دایک و باوکی ئەو منداڵانەی لە حەوزی ئاوەکەدا بوون، باری ئابوورییان هەر وەک ژیانی بیبی سەغەری وابوو، یا کەمێک باشتر بوون یا کەمێک خراپتر، بۆیە نەیاندەتوانی هاوکاری بیبی سەغەری بکەن. خۆ ئەگەر ژیانیان باش بوایە هەرگیز منداڵەکانیان نەدەچوونە سەر ئەو ئاوە پیسەی کە لە حەوزەکەدا بوو. بیبی سەغەری (١٠) ڕۆژ، هەر خەم و خەفەتی دەخوارد کە چۆن ئەم خێرەی ناوی لێهێناوە ئەنجامی بدات. ڕۆژێک ئەو ژنانەی لە سەر کۆڵان کۆدەبوونەوە، گوتبویان ئێستا بیبی سەغەری قسەیەکی کردووە، بەڵام ئیمامی عەباس خۆی دەزانێت بیبی سەغەری هیچ شتێکی نییە، هەر بۆیە یەکێک لەو ژنانە بە بیبی سەغەری گوتبوو ئەوانە کە منداڵی تۆ نەبوون و تۆش بەبێ بیرلێکردنەوە قسەیەکت لەدەم دەرچووە، بۆیە هیچ بیری لێمەکەرەوە و ئیمامی عەباس خێرەکەی قبوڵکردووە. بیبی گوتبووی منداڵەکان هەموو هی منن و قسەکەشم لە ناخی دڵمەوە کردووە و ئێوە هیچ پێی ناڕەحەت مەبن، ئیمامی عەباس خۆی هاوکاری دەکات، ئەگەر خێر خێری ئیمام عەباس بێت، خۆی جێبەجێی دەکات و پێنج مەڕەکەش پەیدا دەکات. ڕۆژێکی تر ژنەکان دەڵێن با هەر کەسێک چی دەتوانێت، هاوکاری بکات و با بیبی نیو (مەن) خورما بکڕێت و داوەتەکەی پێبکات. بیبی گوتبووی ئەوەی کە ناوم هێناوە دەبێت ببێت، واباشترە کە ئێوە خەمی لێنەخۆن. دە ڕۆژ پاش ئەوەی کە خێرەکەی بیبی سەغەری کەوتە سەر زمانی خەڵک و لە کۆڵان و گەڕەکەکاندا بڵاوبووەوە، شیرین خانم ژنی ئەردەشێری کەی نەژاد کە زەردەشتی بوون،ماڵیان لە گەڕەکی خورەم شا بوو، واتە گەڕەکەکەی دراوسێمان، چووە ماڵی بیبی سەغەری و پێیگوتبوو کە بیستومە بۆ سەلامەتی منداڵەکان خێرت کردووە، بیبی گوتبووی بەڵی خێرم کردووە، شیرین خان یش گوتبووی وەرە خێرەکە لە ماڵی ئێمە بکە و خۆیشم دوو مەڕت بۆ دابین دەکەم، بیبی قبوڵی کردبوو بڕیاریاندا کە پاش دە ڕۆژی تر خێرەکە لە ماڵی شیرین خان بکەن، ماڵی ئەردەشیری کەی نەژاد زۆر گەورە بوو، حەشەوکەیان باخێکی تیا بوو کە نزیکەی (٥-٦) هەزار مەتر دەبوو، پڕ بوو لە درەختی هەنار و حەوزی گەورەی ئاو. شوێنێکی زۆر دڵگیر و خۆش بوو،

حاجی خان وەزیری کە کوردێکی سنەیی بوو لە برایانی سوننە بوو، نازانم چی کردبوو ئەوەندە دەزانم لە شاری سنەوە دوورخرابوەوە بۆ شاری یەزد و هەر لە یەزدیش ژنی هێنابوو، ئێستا منداڵەکانی هەموو گەورەبوون و هەندێکیشیان بوونەتە باپیرە و هەموویان لە دەوروبەری خزمەکانی دایکیانن و حاجی خان بۆخۆی سوننە بوو، زۆریش دڵسۆز بوو بۆ مەزهەبەکەی خۆی، بەڵام منداڵەکانی هەموویان لە مەزهەبی شیعە بوون و پەیوەندییان باش بوو بە خزم و کەسەکانیانەوە لە شاری سنە و هاتوچۆشیان زۆر بوو. حاجی خان یش چووبووە ماڵی بیبی سەغەری و پێیگوتبوو ئەوا منیش لەم خێرەی ئیمام عەباس بەشداریدەکەم و مەڕێک پێشکەش دەکەم، ئیتر ئەوا بوو بە سێ مەڕ، کاتێک حاجی خان دەڕوات و دووردەکەوێتەوە، بیبی سەغەری دەفەکەی دەهێنێ و دەست بەدەفلێدان دەکات و دەڵێ ئیمامی عەباس خۆی خوانەکە ڕادەخات، ئیتر من چیبکەم. شیرین خانم قسە لەگەڵ ژنانی گوندی ئەڵڵا ئاوادا دەکات کە ئەو گوندە هەموویان زەردەشتی بوون و گوندەکە کە (٢٠ کم) لە یەزدەوە دوور بوو، دەربارەی خێرەکەی بیبی سەغەری خەڵکی ئەم گوندەش بەڵێنی دوو مەڕی تریان دابوو، ڕۆژی دواتر بیبی بڕیاریدا کە هەموو لایەک ئاگادار بکاتەوە کە پێنج مەڕەکە ئامادەیە چوار مەڕیان زەردەشتییەکان دەیدەن مەڕێکیش حاجی خانی سوننە مەزهەبی سنەیی دابینی دەکات.

پیرێژنێکی یەهودی هەبوو کە پێیاندەگوت نومو ئولیاس کە بەقاڵی گەڕۆک بوو، بەکرە و دەرزی و تەوقەو موستیلەی دەفرۆشت، دێتە لای بیبی سەغەری و دەڵێت زانیومانە خێر دەکەیت بۆ ئیمام عەباس، ئایا ئێمە دەتوانین بەشداری بکەین، بیبی سەغەری گوتبووی دەرگای ماڵی ئیمام عەباس بەڕووی هەموو لایەکدا کراوەیە، هەمووتان وەرن ئیمام عەباس بۆ هەمووان میهرەبانە زەردەشتی، یەهودی، سونی-شیعە، بەبێ جیاوازی ئەمە ئێرانە و ماڵی هەموومانە و ئیمام عەباسیش هاوکاری هەموو لایەکە، ئینجا پیرێژنی یەهودی گوتبووی ئێمەش (١٠-١٢) ژنی یەهودی دەمانەوێت بەشداری بکەین، بیبی سەغەری گوتبووی ئەگەر هەموو جووەکانی یەزد بێن ئێمە خۆشحاڵ دەبین. نەنە ئەلیاس گوتبووی ئێمە (٢٠) مەن برنج (هەر مەنێک یەکسانە بە ٦ کیلۆ) و یەک تەنەکە ڕۆن پێشکەش دەکەین.

چیرۆکی خێرەکەی بیبی سەغەری بۆ ئیمام عەباس بە هەموو لایەکدا بڵاوبوەوە و بەشداریکردنی زەردەشتی و یەهودی و حاجییەکی سوننە هەموو ژنانی گەڕەکی خۆشحاڵ کرد و هەر کەسێک بەپێی توانای خۆی هاوکاری پێشکەش دەکرد. یەکێک شەکر و یەکێک خورما و یەکێکی تر چا، بە هەموویان دەیانبرد بۆ لای بیبی سەغەری

و لەوێ کۆدەکرایەوە، پاشان دەیانبردن بۆ ماڵی شیرین خانم، دایکی منیش (١٥٠) نانی پێشکەشکرد و خاوەنی نانەوانەکە (١٥٠) نانی پێشکەشکرد. مامۆستای مزگەوتیش دوای نوێژکردن لە مینبەرەکەوە هاواریکرد ئەی دەوڵەمەندەکانی گەڕەک بیبی سەعەری خێری کردووە. یەهودی و زەردەشتی و کەلیمی و سوننە بەشداریان تێداکردووە، هەروەها ژنە هەژارەکانی گەڕەک بەشداریان کردووە، ئێوە کە شیعەن و خۆتان بە پەیرەوانی ئیمام عەلی و ئیمام عەباس دەزانن چیتان کردووە؟ ئێوە بۆ بەشداری ناکەن، وەستا غەزنەفەر کە ژنەکەی پێشتر زەردەشتی ببوو، ببووە موسڵمان، گوتبووی حاجی ئاغا هەرچی تۆ بڵێیت ئێمە وا دەکەین، ئاغای مامۆستاش فەرمووبووی هەر کەسەتان بەپێی توانای خۆتان بەشداری بکەن، ئیتر دەوڵەمەندەکانی گەڕەک بڕیاریاندا کە بەشداری بکەن. ئیتر وردە وردە لە گەڕەکە دوورەکانیشەوە کۆمەک کۆکرایەوە و هێنایان بۆ ماڵی بیبی سەغەری، دوو ڕۆژ پێش مەراسیمی خێرەکە ئەم شتانە ئامادەکرابوون (٢٤ مەڕ، ١٣٠ مەن برنج، ١٢ تەنەکە ڕۆن ٢٤ مەن خورما ٨ مەن هەڵووژە، ٢,٥ مەن لیمۆی وشک، ٢٠٨ مریشک، ١٢مەن پاقلەی وشک، ١٤ مەن نیسک، ١٧ مەن لەتکەی نۆک، ٩,٥ مەن فاسۆلیای سوور، ٢١ مەن خوێ، ٣ شووشەی گەورە بیبەر، ٢ شووشە زەردەچەوە، ٨٣ مەن پیاز، ١٤٢ مەن پەتاتە)، ئاغا فەرزوڵلای دوکانداریش گوتبووی هەرچی سەوزەتان ویست من دەیهێنم. محەمەدی قەساب گوتبووی منیش خۆم و شاگردەکانم هەموو مەڕەکان سەر دەبڕین و گۆشتەکەشی ورد دەکەین و لەبری پێست و ورگ و ڕیخۆڵە کانیش گۆشتی تریان بۆدابین دەکەین. ڕۆژی پێش داوەتەکە چوار لاک گۆشتی نارد و گوتبووی ئەوە لەبری پێست و ڕیخۆڵەی مەڕەکان. حاجی شەبەخش کە بلوجێکی سوننە بوو لەگەڵ چەند بلوجێکی تر لە یەزد دەژیان و خاوەنی ئۆتۆمبێل و گەلابەی گەورەبوون، ئەوکاتە لە یەزد کارگەی سەهۆڵ نەبوو، بڕیاریدا کە یەک گەلابە سەهۆڵ بهێنێت. بۆ ئەوەی بزاندرێت ئەو هەموو خۆراک و پێویستیانەی کە کۆکراونەتەوە چەندە، بیبی سەغەری داوای لە حەسەن وارستە کردبوو کە لیستێکی تەواو بۆ هەموو شتەکان بکات. ئەویش هەموو شتەکانی کێشانە کردبوو لای خۆی هەمووی نووسی بوو، من پاش پێنج ساڵ ئەو کاغەزەم لە حەسەن وارستە وەرگرت، ئەم ئامارەی کە بۆم نووسیون هەموویم لەو پارچە کاغەزی حەسەن وارستە وەرگرتووە. ڕۆژێک پێش داوەتەکە لە ماڵی ئاغا ئەردەشێر قەرەباڵغییەکی زۆر دروستبوو، لەلایەکەوە مەڕ سەردەبڕدرا، لەلایەکی ترەوە چەند ژنێک خەریکی سەوزە پاککردن بوون، هەندێک خەریکی شەکر شکاندن بوون و مسگەرەکان خەریکی چا ئامادەکردن بوون.

چەند کەسێک فەرشیان ڕادەخست، ژنە یەهوودیەکانیش هاتبوون لەگەڵ خۆیاندا باشترین جۆری عەرەقی کشمیش و عەرەقی بیدمشکیان هێنابوو هەروەها شەکر و لیمۆ و ئاولیمویان هێنابوو.

ڕۆژی داوەتەکە (١٥ی شەهریوەرەری ١٣٣٧ _٦-٩-١٩٥٨) بوو کە بەبەشداری خەڵکی چەند گەڕەکێکی یەزد و حاجی خانی سنەیی و یەهودییەکان و زەردەشتییەکان لە ماڵی ئەردەشێری کەی نەژاد بەڕێوەچوو. من هەرگیز داوەت و مەراسیمی وا جوانم لە ژیانمدا نەدیبوو، دیارە من لەو سەردەمەدا چونکە تەمەنم کەم بوو دەمتوانی لە نێوان ژنان و پیاواندا هاتوچۆ بکەم.

کچانی یەهودی و کچانی زەردەشتی هەموویان بەجل وبەرگی تایبەتی خۆیانەوە هەڵدەسوڕان و خەریکی خواردن دروستکردن بوون، وابزانم نزیکەی (٦) هەزار کەس لەم داوەتە بەشدارییان کردووە، هەندێ کەس لە گەڕەکەکانی خۆیانەوە دەهاتن و هەموویان بەمەنجەڵ خواردنی ئامادەکراویان دەهێنا. سەیدەکانی گەڕەک سەرپەرشتی چا و نێرگەلەیان دەکرد، مامۆستای ئایینی بەبەردەوامی نزای دەکرد بۆ خەڵکی، یەهوودییەکان و مسڵمانەکان یەکترین ماچدەکرد و نزایان بۆ یەکتری دەکرد و سوپاسی بیبیبی سەغەریان دەکرد، هەروەها زەردەشتییەکان یش دەستبەدوعا بوون بۆ هەموو خەڵکی گەڕەکەکان، نزیکی کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆ، زۆربەی ژنەکان ڕۆیشتن، بەڵام هێشتا نزیکەی (٣٠٠-٣٥٠) ژن لەوێ مابوونەوە، هەموو مەنجەڵ و قاپ و کەوچکەکانیان بردنە سەر ئاوەکە و خەریکی شۆردنیان بوون. چونکە خواردن و میوە زۆر مابوو، وا بڕیاردرا کە ئێوارەش هەر لەوێ نانبخورێت. ئێوارە دوای نانخواردن ژنان و کچان دەستیانکرد بەشایی و هەڵپەڕکێ. کچانی یەهوودی بەجیا هەڵدەپەڕین کە جوانترین هەڵپەرکێیان ئەنجامدەدا. هەروەها کچانی زەردەشتی یش بەجلوبەرگی تایبەتی خۆیانەوە شاییەکی جوانیان دەکرد کاتژمێر (٩) ی شەو هەموو ژنانی شیعی و یەهودیی و زەردەشتی و خزم و کەسوکارەکانی حاجی خانی سوننە کە لە سنەوە بۆ دیدەنی هاتبوون، لەنێو باخەکەی ئاغا ئەردەشێردا لە نییەتی نزای خێر بۆ ئیمامی عەباس هەموو بەیەکەوە جوانترین هەڵپەڕکێیان ئەنجامدا. ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە کە چۆن مەولەوی بەڕێز دەبوایە ئەم هۆنراوە جوانەی بۆ ئەو مەراسیمە بنووسیایە بەڵام خۆ مەولەوی نەمر زۆرپێشتر ئەم هۆنراوەیەی نووسیووە:

**(چە تدبیر ای مسلمانان کە من خود را نمیدانم**

**نە ترسا نە یهودیم من نە گبرم نە مسلمانم**

**مکانم لا مکان باشد نشانم بی نشان باشد**

**نە تن باشد نە جان باشد کە من از جان جانانم)**

واتا:

**(تەگبیر چییە موسڵمانان، کە من خۆیشم نایزانم**
**نە عیساییم نە موساییم نە گاور نە موسڵمانم**
**شوێنم بێ شوێنە و ناونیشانم بێ ناونیشان**
**نە لەش هەیە و نە گیان هەیە، کە من لە گیانی گیانم)**

دەوربەری کـاتژمێر (١٠) ی شــەو خـوان ڕاخـرایەوە و کچـانی حـاجی شــەبەخش سەری کوپەی عەرەقی کشمیشی یەهودییەکانیان هەڵپچڕی و دەیانکردە پەرداخەوە و دەدرایە دەستی کچان، ئەوانیش لەسـەر خوانی نانخواردن دایاندەنا. ئەم خـوانەش زۆر لە خـوانەکەی نیـوەڕۆ بچـووکتر نەبـوو نـزیکەی (٤٠٠) کەس لە ژن و منـداڵ لە سـەری دانیشـتبوون، مـن و دایکـم زۆر بەخۆشـی و شـادییەوە کـاتژمێر (١٢) ی شــەو بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتینەوە، ئیتر دوای ئەم داوەتە ژنـانی موسـلمان و یەهـودی و زەردەشتی و سـوننی هەمـوو بەیەکەوە تێکەڵاوییەکـی باشـیان پەیـدا کـرد و بەبەردەوامـی هـاتوچۆی یەکتریان دەکرد.

# شازادەی حه مام

## حسێن له گەراج

هەرکەسێک بڕوات بۆ کاروانسەرا یان گەراج یا تێرمینال دیارە دەیەوێت، لەم شوێنەوە بڕوات بۆ شوێنێکی تر، وەک ئەوە وایە کە هەر کەس دێتە دنیاوە و پاشان دەڕوات بۆ جێگایەکی تر. ئەو جێگایەی تر کوێیەکە بۆی دەچێت تەنها خودا دەیزانێت. بەڵام مرۆڤ و جیهان هەمیشە لە جوڵەدان، کاروانسەرا، گەراج، تێرمینال، و دوا شوێنی گەیشتن نیشاندانی تەمەن و کاتە. جوانی دنیای ناجێگیر ئەوەیە، جێگایەک کە بۆی دەچیت بەڵام لەوێ نامێنیت. جێگایەکی تر کە لە شوێنێکی ترەوە بۆی دێیت و دیسان لەوێش نامێنیت.

لە پشووی هاوینی پۆلی پێنجەمەوە تا تەواوکردنی ئامادەیی واتە ساڵی (١٣٣٩-١٣٤٦_١٩٦٠-١٩٦٧) لە گەراجی گواستنەوە کارم دەکرد، لەو ساڵانەدا هەموو ڕۆژێک دەچووم بۆ گەراج، خاوەن و بەڕێوەبەری گەراج کوڕی مامم بوو، هەمان کەس کە دایکم منی بە ئەو سپارد لە ساڵەکانی منداڵیمدا، تەلەڤزیۆن و یاریی منداڵان بەهیچ شێوەیەک نەبوو، خۆ ئەگەر هەشبووایە ئێمە توانای کڕینیمان نەبوو، نەدەکرا لە ماڵەوە بەکاریان بهێنم، چونکە لە خانوویەکی بچووک و لە ژوورێکی زۆر بچووکدا کرێچی بووین، بۆیە یا دەبوو بەرەڵڵای کۆڵانان بم و لەگەڵ منداڵاندا یاریی بکەم، دیارە یاریکردنیش کێشە دروستدەکات، یا دەبوایە بچوومایە لای خەڵکی نەناسراو کار بکەم، کە ئەویش لە کۆتایی دا هەر دەبووە کێشە وەک ئەوەی، کە لە بەرگی یەکەمدا باسمکرد، کە پاکەتی تلیاکم بە ئەملاو ئەولادا دەبرد. یا دەبوایە بدرێمە دەست خزم و کەسەکانم کە ئەوان هەرچەند هیلاکیان بکردمایە و کاریان پێبکردمایە بەڵام نەیاندەهێشت تووشی کاری خراپ ببم و یا کاری نابەجێم پێبکەن.

گەشتی سێ مانگەی یەزد بۆ تاران و مەشهەد لە ساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠) دا وانەیەکی باش بوو بۆ من، تێگەیشتم کە ئێران زۆر گەورەیە، هەموو شوێنەکانی ئێران وەک

شاری یەزد و بیابانەکانی وشک و بێ دار و درەخت نییە، ئێران جگە لە بیابانی بەرین و کێوی وشک، دارستان و دەریاشی هەیە بۆ منداڵێکی (١٠-١٢) ساڵ، بینین و زانینی ئەم شتانە کارێکی باش بوو، لە یەزدەوە تا کاشان و گەردەنەی حەسەنئاوا و نێوان قوم و تاران جادەکە هەمووی خۆڵ بوو، بەهیچ جۆرێک جادەی قیرتاو نەبوو، کاتێک پاس و لۆرییەکان بەجادە و شۆستەکاندا تێدەپەڕین هەورێکی لە خۆڵ و تەپوتۆز دروستدەکرد، کە پاسەکان لە شوێنێک ڕادەوەستان و خەڵکەکە دادەبەزین وەک ئەوەی لە ئاش هاتبنە دەرەوە، هەموو سەروچاویان بە خۆڵ سپی دەبوو. ئەوەندەی لەبیرم بێت جادەی گورگان تا مەشهەد هەموو خۆڵ بوو، بەڵام جادەی گورگان تاکو تاران یادم نەماوە کە چۆن بوو.

لەڕاستیدا تا ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) هەموو ئەو جادانەی کە بە یەزدەوە بەسترابوونەوە، هیچی قیرتاو نەکرابوون، چونکە بەگشتی جادەکان هەمووی خۆڵ بوون نەمدەزانی کە دەشێ جادە قیرتاو بکرێت، کاتێک لە قومەوە ڕۆیشتین بۆ تاران کە جادەکە لەوێ قیرتاو بوو، زۆر بەلامەوە خۆش بوو، من کورسیم نەبوو لەسەر مەکینەی پاسەکە سوار ببووم، پاسەکە کەمتر هەڵدەبەزودابەزی دەکرد و منیش کەمتر هیلاک دەبووم، تەپوتۆزیش کەمتر دەهاتە ناو پاسەکەوە. ئەوکات تێگەیشتم کە جادەی قیرتاو باشترە لە جادەی خۆڵ. کاتێک شتێک نەبینی و نەیبیستی و نەخوێنێتەوە ئەوا هیچ شتێک لە بارەیەوە نازانیت. زۆربەی پاسەکان جێگای (٢٤) نەفەریان هەبوو، کەم پاس هەبوو لە مەشهەدەوە بێت بۆ یەزد و لە ڕێگە چەند جارێک تێکنەچێت یا کەم جاری وا هەبوو، کە چەند کەسێک سەر و کەللەیان نەشکێت. بۆیە لە هەموو گەراجی شارەکان فیتەر و ئاسنگەر هەبوون تا بەزوویی پاسەکان چاکبکەنەوە کە لەڕێگادا دەشکان. هەر گەشتێک لە مەشهەدەوە بۆ یەزد، لانیکەم (٦٠) کاتژمێری پێدەچوو. کە ئێستا هەمان ڕێگە لە (١٢) کاتژمێر زیاتر نابێت. هەر لەبەر خراپی پاسەکان و جادەکە بوو کە هەموو خەڵکی دەیانویست لە کورسی پێشەوە دابنیشن، نەک تەنیا لەبەرئەوەی کە شوێنێکی خۆشتربوو بەڵکو زیاتر لەبەر ئەوەی کە شوێنێک بوو بۆ خەڵکە دیار و ناسراوەکان. بۆیە ئەو کەسەی لەو شوێنەدا دابنیشتایە واتای ئەوە بوو کەسێتیەکی گەورەیە. ئەوکاتە هەر کەسێک بهاتایە بۆ گەراج بۆ وەرگرتنی بلیت داوای بلیتی کورسی پێشەوەی دەکرد، ئەگەر کورسی یەکەم و دووەمی دەستنەکەوتایە ئەوا بلیتی وەرنەدەگرت و دەچوو بۆ گەراجێکی تر. لەو ساڵانەدا شاگردی گەراجەکان بلیتی کورسی یەکەم و دووەمیان بە خەڵکەکان دەفرۆشت و کاتێک کە سواردەبوون، هەموویان بلیتی کورسی یەکەم و دووەمیان بەدەستەوە بوو، هەر بۆیەش شەڕ و

شاری یەزد و بیابانەکانی وشک و بێ دار و درەخت نییە، ئێران جگە لە بیابانی بەرین و کێوی وشک، دارستان و دەریاشی هەیە بۆ منداڵێکی (١٠-١٢) ساڵ، بینین و زانینی ئەم شتانە کارێکی باش بوو، لە یەزدەوە تا کاشان و گەردەنەی حەسەنئاوا و نێوان قوم و تاران جادەکە هەمووی خۆڵ بوو، بەهیچ جۆرێک جادەی قیرتاو نەبوو، کاتێک پاس و لۆرییەکان بەجادە و شۆستەکاندا تێدەپەڕین هەورێکی لە خۆڵ و تەپوتۆز دروستدەکرد، کە پاسەکان لە شوێنێک ڕادەوەستان و خەڵکەکە دادەبەزین وەک ئەوەی لە ئاش هاتبنە دەرەوە، هەموو سەروچاویان بە خۆڵ سپی دەبوو. ئەوەندەی لەبیرم بێت جادەی گورگان تا مەشهەد هەموو خۆڵ بوو، بەڵام جادەی گورگان تاکو تاران یادم نەماوە کە چۆن بوو.

لەڕاستیدا تا ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) هەموو ئەو جادانەی کە بە یەزدەوە بەسترابوونەوە، هیچی قیرتاو نەکرابوون، چونکە بەگشتی جادەکان هەمووی خۆڵ بوون نەمدەزانی کە دەشێ جادە قیرتاو بکرێت، کاتێک لە قومەوە ڕۆیشتین بۆ تاران کە جادەکە لەوێ قیرتاو بوو، زۆر بەلامەوە خۆش بوو، من کورسیم نەبوو لەسەر مەکینەی پاسەکە سوار ببووم، پاسەکە کەمتر هەڵدەبەزودابەزی دەکرد و منیش کەمتر هیلاک دەبووم، تەپوتۆزیش کەمتر دەهاتە ناو پاسەکەوە. ئەوکات تێگەیشتم کە جادەی قیرتاو باشترە لە جادەی خۆڵ. کاتێک شتێک نەبینی و نەیبیستی و نەخوێنیتەوە ئەوا هیچ شتێک لە بارەیەوە نازانیت. زۆربەی پاسەکان جێگای (٢٤) نەفەریان هەبوو، کەم پاس هەبوو لە مەشهەدەوە بێت بۆ یەزد و لە ڕێگە چەند جارێک تێکنەچێت یا کەم جاری وا هەبوو، کە چەند کەسێک سەر و کەللەیان نەشکێت. بۆیە لە هەموو گەراجی شارەکان فیتەر و ئاسنگەر هەبوون تا بەزوویی پاسەکان چاکبکەنەوە کە لەڕێگادا دەشکان. هەر گەشتێک لە مەشهەدەوە بۆ یەزد، لانیکەم (٦٠) کاتژمێری پێدەچوو. کە ئێستا هەمان ڕێگە لە (١٢) کاتژمێر زیاتر نابێت. هەر لەبەر خراپی پاسەکان و جادەکە بوو کە هەموو خەڵکی دەیانویست لە کورسی پێشەوە دابنیشن، نەک تەنیا لەبەرئەوەی کە شوێنێکی خۆشتربوو بەڵکو زیاتر لەبەر ئەوەی کە شوێنێک بوو بۆ خەڵکە دیار و ناسراوەکان. بۆیە ئەو کەسەی لەو شوێنەدا دابنیشتایە واتای ئەوە بوو کەسێتیەکی گەورەیە. ئەوکاتە هەر کەسێک بهاتایە بۆ گەراج بۆ وەرگرتنی بلیت داوای بلیتی کورسی پێشەوەی دەکرد، ئەگەر کورسی یەکەم و دووەمی دەستنەکەوتایە ئەوا بلیتی وەرنەدەگرت و دەچوو بۆ گەراجێکی تر. لەو ساڵانەدا شاگردی گەراجەکان بلیتی کورسی یەکەم و دووەمیان بە خەڵکەکان دەفرۆشت و کاتێک کە سواردەبوون، هەموویان بلیتی کورسی یەکەم و دووەمیان بەدەستەوە بوو، هەر بۆیەش شەڕ و

ئاژاوە دروستدەبوو، جاری وا هەبوو تەنها بۆ سواربوونی پاسێکی (٢٤) کەسی، (٤٠) کەس دەهاتن کە هەموویان بلیتی کورسی یەکەم و دووەمیان پێ بوو. ئەوکات بەو جۆرە بوو، کەسێک کە دەهاتە گەراج تا بڕوات بۆ گەشت، نزیکەی (٧-٨) کەس لە خزم و کەسەکانی دەهاتن بۆ بەڕێکردنی. بۆ بەڕێکردنی (٢٤) کەس نزیکەی (٣٠٠) کەسی زیاتر دەهاتنە گەراج. هەڵبەت ئەم جۆرە بەڕێکردن و نەریتە ئێستا تەنها لە فڕۆکەخانەکان بەدیدەکرێت. جگە لەوەش هەر گەشتیارێک یەک بوخچە جلوبەرگ و بەتانی و گۆزەیەک ئاوی پێ بوو، ئەوکاتە جانتا نەبوو، گەشتیارەکان جلوبەرگیان دەخستە بوخچەیەکەوە و پاشان هەموو شتەکانیان دەکردە کیسەیەکی گەورەوە. هەر بۆیەش ناو گەراجەکە قەرەباڵغییەکی زۆر دروستدەبوو، کە ڕێگەی هاتوچۆ نەبوو. هەموو گەشتیارەکان وایاندەزانی کە بلیتەکانیان بۆ کورسی یەکەم و دووەمە، بەڵام بەم شێوەیە دیارە جێگەی ئەو هەموو خەڵکە نەدەبوو، هەر بۆیە هەمیشە شەڕ و ئاژاوە دروست دەبوو، بەڵام جاری وا هەبوو خەڵکی گەڕەکێک یا گوندێک هەموویان پێکەوە پاسێکی تایبەتیان دەگرت، ئەوکاتانە باشتر بوو شەڕ و ئاژاوە دروست نەدەبوو، خۆیان لەنێوان خۆیاندا ڕێکەدەکەوتن لە سەرشوێنی دانیشتن. بەگشتی کاتی دەرچوونی پاس لە یەزدەوە بۆ مەشهەد کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ بوو. ئەویش ئەگەر هەموو گەشتیارەکان لەکاتی دیاریکراودا ئامادەبوونایە، دیارە لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦٠) کاندا گەشتیار زۆر کەم بوو بۆ مەشهەد کە هەموو ڕۆژێک پاسێک دەربچێت. پاشان کە گەشتیار زۆرتر بوو ئیتر ڕۆژانە پاسێک دەردەچوو. ڕاستییەکەشی ئەوەبوو کە ئەو سەردەمە خەڵک زۆر هەژار بوون، لە تەمەنیاندا نەیانتوانیووە لە یەزدەوە بچن بۆ مەشهەد کە زۆریش مەبەستیان بووە بچن. چوون بۆ مەشهەد زۆر گرنگ بوو، ئەوانەی کە دەچوون تەنها بۆ زیارەتی مەرقەدی ئیمام ڕەزا دەچوون، هەرکەسێک سەردانی مەشهەدی بکردایە پێشناوی (مەشهەدی) بۆ ناوەکەی دادەنرا، وەک (مەشهەدی حەسەن). سوارکردنی گەشتیاران کارێکی زۆر ناڕەحەت بوو، بڕیار وابوو کە کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆ پاس بەڕێبکەوێت، بەڵام جاری واهەبوو نۆی شەو بەڕێدەکەوت. واتە بۆ ئامادەبوونی (٣٠-٤٠) سەرنشین نزیکەی حەوت کاتژمێری پێدەچوو، هەرچەندە پاسەکە (٢٤) کەسیی بوو، بەڵام لە نێوانی ڕیزە کورسییەکاندا ڕاخەریان بۆ گەشتیارە زیادەکان ڕادەخست تا لەسەری دابنیشن. هەمیشە شەڕ و هەرا لەسەر شوێن دروست دەبوو. چونکە هەموو داوای پێشەوەیان دەکرد، یەکێک دەیگوت من لە فلان بەرەبابم چۆن دەبێت لە دواوە بم! یەکێکی تر دەیگوت من لە فلان گەڕەکم. هەموو خەڵکی گەڕەکەکەمان نارازین من لەدواوەوە دابنیشم، بۆیە هەر دەبێت لە پێشەوەبم. چەندین

# شازادەی حه مام

جار بینیومە کەسێک شوێنەکەی بەدڵ نەبووە، خێرا هەواڵی ناردووە کەسوکاری بێن و بیکەن بەشەڕ، چونکە جێگەکەی خراپە، هەر بۆیەش جاری وا هەبوو (١٠-١٥) کەس لە خزم و کەسوکاری سەرنشینێک هاتوون و کێشە لە گەراجدا دروست بووە. تا دواتر ئاغای محەمەد عەلی و عەباسی تاج بەقسەی خۆش و ئامۆژگاری هێواشیان دەکردنەوە و دەیانگوت ئێوە بۆ سەردانی ئیمام ڕەزا دەچن چۆن دەبێت بیکەن بە شەڕو ئاژاوە. ئەی نازانن ئیمام ڕەزا حەزی بە شەڕ نییە و قبوڵی ناکات. خۆ ئیمام ڕەزا کەسانێکی خۆشدەوێت کە هێمن و لەسەرخۆبن، کێ زیاتر هیلاک و ماندوو بێت ئیمام ڕەزا ئەو کەسەی زیاتر خۆشدەوێت، بەو شێوەیە هێواشی دەکردنەوە. هەندێک جاریش لە نێوان خۆیاندا واڕێکدەکەوتن کە تا نیوەی ڕێگا یەکێک لە پێشەوە بێت و لە نیوەکەی تردا ئەو بچێتە دواوە و کەسێکی دواوە بێتە پێشەوە. یاجاری واهەبووە ئەوەندە لە گەراج دەمانەوە کە ئەو کەسانەی دەهاتن بۆ بەڕێکردنیان تەواو بێتاقەت دەبوون و بەناچاری گەراجیان جێدەهێشت و دەگەڕانەوە. هەندێک جاریش ڕووداوی سەیر و پێکەنیناوی ڕوویدەدا. جاروبار ئەو کەسانەی بۆ یەکەم جار سواری ئۆتۆمبێل دەبوون و هەرگیز لەسەر کورسی دانەنیشتبوون بەپێچەوانەوە دادەنیشتن، لەسەر ئەژنۆ دەوەستان لەسەر کورسیەکە و ڕوویاندەکردە پشتی کورسیەکە، دەبوایە بچین دەستیان بگرین و ڕوویان بکەینەوە پێشەوە و پێیان بڵێین کە بەو شێوەیە دابنیشن. جارێکیان چەند کەسێک هاتن بۆ گەراج هەریەکەیان دارێکی نیو مەتریی بەدەستەوە بوو، سەری دارەکانیش یەکی دەرزییەکی پێوەکرابووە، منیش لە مامە مەنسوورم پرسی گوتم: ئەم دارانەیان بۆچییە؟ ئەویش گوتی: ئەمانە دەمێکە سواری ئۆتۆمبێل نەبوون، جاران لە نێو پاسەکاندا کورسی نەبوو خەڵکی چوار مشقی دادەنیشتن و زۆر بەسەر یەکەوە دادەنیشتن ئەگەر کەسێک ئەوەی تەنیشتی فشاری بۆ بهێنایە ئەو دەرزییەی دەکرد بە ڕانیدا، ئەویش بەخێرایی بەرز دەبووەوە، بەڵام ئێستا ئەوە نەماوە کورسی جێگیرکراوە، دیارە لەساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠) دا کە من لە گەراج بووم ئەوەم نەبینی بوو کە پاسەکان کورسی تیا نەبێت و ئەم داربەدەستانە دارەکانیان بەکارهێنابێت.

ئەوکات شەکر و چا بە لۆریی لە شیرازەوە دەهات بۆ یەزد، ناو بۆدیی لۆرییەکەیان پڕ دەکرد لە شەکر و چا و پێداویستی تر، پاشان چادرێکیان بەسەردا دەدا تا باران تەڕی نەکات، لەسەر بارەکەشەوە خەڵکیان سواردەکرد، خەڵکی لەبری پاس زیاتر بە ئۆتۆمبێلی باری هاتوچۆیان دەکرد.

تەمەنم (١١-١٢) ساڵان بوو، کاتی هاوین بوون بەیانییەکی زوو هاتم بۆ گەراج (٨٠-٩٠) کەسی زل و بەخۆوە کە ژن و منداڵیان لەگەڵدابوون، لەنێو حەوشەی گەراجەکەدا

بوون، ژنەکان باڵابەرز و بەخۆوە بوون، ژنەکانیان کراسی درێژ و گوڵداریان لەبەردا بوو، سەرپۆشەکانیان هەمووی گوڵگوڵی بوو، کچە بچووکەکانیان ڕەنگیان سوور و سپی چاویان شین بوون، دامێنی کراسەکانیان هەموو گوڵگوڵی جوان بوو، پیاوەکانیش بە لەشولارێکی کەتەوە کڵاوی درێژیان لەسەرنابوو و پارچە قوماشێکیان لە کەمەریان بەست بوو.

لە گۆشەیەکی گەراجەکەدا جێگایان ڕاخستبوو لەسەری دانیشتبوون و شانیان دادابوو، خەریکی نێرگەلە کێشان بوون، چەند مەڕێکیان لە نزیک خۆیانەوە بەستبووەوە، هەرگیز دیمەنی وا جوانم نەدیبوو. دیمەنێکی زۆر جوانیان هەبوو بەلامەوە، لە جەوادم پرسی ئەمانە کێن؟ گوتی: ئەمانە لە هۆزەکانی دەرەوەی شارن و دەیانەوێت بڕۆن بۆ مەشهەد بۆ زیارەت، ئەمانە نیوەشەو گەیشتوونەتە ئێرە، بە دوو ئۆتۆمبێلی گواستنەوەی شەکر و چا هاتوون. ویستم لەگەڵ چەند منداڵێکیان قسە بکەم، بەڵام ئەوان زمانی فارسییان نەدەزانی بەڵکو بە تورکی قەشقایی قسەیان دەکرد. لە نێو ئەواندا تەنها دوو کەس زمانی فارسیان دەزانی و قسەکانیان بۆ وەردەگێڕانە سەر زمانی فارسی و لەگەڵ چەند منداڵێک دا هەندێک قسەم کرد. یەکێک لە پیاوەکان هەر لە حەوشەکەدا مەڕێکی سەربڕی و هەر زۆر بەخێرایی پێستەکەی لێکردەوە و گۆشتەکەی ئامادەکرد، ژنانیش خوانی نانخواردنیان ڕازاندنەوە، لە نێو گەراجەکەدا باسیان لەوە دەکرد کە ئەم قشقاییانە دەیانەوێت بە ئۆتۆمبێلی باری بچن بۆ مەشهەد و سواری پاس نابن، بەڵام پۆلیسی یەزد ڕێگەی نەدەدا بەئۆتومبیلی باری بڕۆن، بەپێچەوانەوە خاوەن ئۆتۆمبێلەکانی باریش، خەڵکیان سواردەکرد. پیاوە قەشقاییەکان دەیانگوت ئێمە ژن و منداڵ سواری پاس ناکەین چونکە پاس سەری گیراوە و ئەوان تێکدەچن و دەڕشێنەوە، هەربۆیە چەند پیاوێکیان سەردانی شارەوانیان کرد تاکو ڕێگەیان بدەن بە ئۆتۆمبێلی باری گەشتیەکەیان بکەن. سێ ڕۆژ کێشمەکێشمیان بوو لەگەڵ شارەوانی، بەڵام هەر ڕێگەیان پێنەدان، پاش سێ ڕۆژەکە قەشقاییەکان بڕیاریاندا، ژنەکانیان بڕۆن بۆ شارەوانی تا مۆڵەت وەربگرن، بۆیە نزیکەی (٣٠-٤٠) ژن و کچ بەرەو شارەوانی کەوتنەڕێ، پاش دوو کاتژمێر ئەفسەرێک هات بۆ گەراج و گوتی: ئەمانە نیوەشەو سواری ئۆتومبێل یا هەر شتێک کە خۆیان پێیان خۆشە، بکەن و بیانبەن بۆ مەشهەد و ئێمەش سزاناتان نادەین. دیارە ئەفسەرەکە ویستی کێشەکە چارەسەر بکات و شەڕو پشێوی ڕوونەدات، ئەو کاتە شارەوانی کاری پۆلیسی هاتوچۆشی ئەنجامدەدا. دوو لۆری گەورەیان هێنا تانیوەی قوماشیان تێکرد و بەچادر دایانپۆشی. پاشان شتومەکی قەشقاییەکانیان بارکردن و بۆخۆشیان سواربوون و نیوەشەو بەسڵاوات لێدانەوە بەرەو

مەشهەد بەڕێکەوتن. جەواد گوتی: بەداخەوە خۆزگە دوو ڕۆژی تریش لێرە بمانایەتەوە، چونکە جەواد هەموو ڕۆژێک دڵ و جگەری مەڕی دەخوارد و پێست و ڕیخۆڵەی مەڕەکەش هەر بۆ ئەو دەبوو. ژنەکانیش کاتێک نانیان دروستدەکرد چەند نانێکیان دەدایە و چایشی هەر لای ئەوان دەخواردەوە، هەموو ڕۆژێکیش پێنج تومەنی لێوەردەگرتن بۆ پاککردنەوەی حەوشی گەراجەکە.

## ڕێگەی یەزد و تەبەس (یادەوەریی کاروانچییەک)

سالانی زوو کە خەڵکیی لەنێوان شارەکاندا بە حوشتر گەشتیان دەکرد، چەند کەسێکی دیار هەبوون کە سەرقافڵەچی بوون وەکو سەید ئاغای تەرزجانی و حاجی نەجمیە. من تەمەنم (١٠-١٢) ساڵ بوو، کاتێک ئاغای تەرز جانی تەمەن (٨٠) ساڵەم ناسی، کە خۆی و یوسفی کوڕی ئۆتۆمبێلیان هەبوو جاروبار ئەم سەرقافڵەچیانە لە گەراجەکەدا یادەوەرییەکانی خۆیان دەگێڕایەوە، لەبارەی هیلاکی ڕێگە و ئەو کێشانەی تووشی کاروانەکەیان دەهات و دز و ڕێگر و جنۆکە و دێو و برسێتی و تینوێتی و گەرمای زۆری بیابانی کەوێر، گرنگ ئەوەبوو کە ئەم پیرە پیاوانە کە ببوونە خاوەنی ئۆتۆمبێل گەشتی ئێستایان چەند بەلاوە ئاسانە، کە بە ئوتومبیل لە ماوەی سێ ڕۆژدا (٩٠٠) کیلۆمەتر ڕێگە دەبڕن لەنێوان شارەکانی یەزد و مەشهەددا. لەکاتێکدا کە بە کاروانی حوشتر ئەو ڕێگەیەیان بە (٤٠) ڕۆژ بڕیوە، ئەوان باسی نائارامی ڕێگەیان دەکرد.

ڕۆژێک سەیدێکی بالابەرزی تەمەن (٧٠) ساڵە کە ناوی ئاغا سەید هەمزە بوو، بەپێش گەراجەکەدا تێپەڕی، یەکێک لەپیاوە پیرەکان بانگی لێکرد و گوتی: ئاغای سەید، فەرموو وەرە تاوێک دانیشە، ئەویش هات و چایان بۆ تێکرد و پێکەوەکەوتنە قسەکردن. دەستیانکرد گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ئەو سەردەمەی کە ڕێگەی مەشهەد بۆ یەزد نا ئارام بووە، لە ساڵەکانی (١٢٨٠-١٩٠٠) دا کە بەقافڵەی حوشتر هاتوچۆیان کردووە. کاروانەکە بەسەرپەرشتی ئاغا سەید تەرزجانی و بەڕێبەری سەید همزە. لە مەشهەدەوە هاتوون بۆ یەزد کە قافڵەیەکی زۆر گەورە بووە، کە لەسەدان سوار و پیادە پێکهاتبوون، کاروانەکە دەبوو بچێتە سەرکانی خواجە حەسەن بەوێدا گوزەریان بکردایە، بەڵام پیاوانی پێش کاروان بەزوویی گەڕابوونەوە بەرەو لای کاروانەکە و پێیان گوتبوون کە چەند چەتە و ڕێگرێک لەسەر کانییەکە بۆسەیان بۆ کاروانەکە داناوە، تا

ڕووتیان بکەنەوە، پیاوانی نێو کاروانەکە لە نێوان خۆیاندا کەوتبوونە گفتوگۆ چی بکەن، خۆ ئەگەر بڕۆن بەرەو کانییەکە ئەوا دز و چەتە ڕێگریان لێدەکەن و تالانیان دەکەن، ئەگەر بشووەستن و نەڕۆن بەو گەرمای هاوین و کاتی نیوەڕۆیە لەو بیابانە گەرمەدا هەموویان لەنێودەچن. ئەی چی بکەن دەبێت تەکبیرێک بکەن تا خۆیان ڕزگار بکەن، بۆیە بڕیاریاندا کە ئاغا سەید هەمزە خۆی بکات بە ئیمام عەباس و دەوری ئەو ببینێت. بەڵکو بەم فێڵە خۆیان لە چەتە و ڕێگرەکان ڕزگار بکەن.

ئاغا سەید هەمزە جلوبەرگی سەوزی لەبەرکرد و ئالایەکی سەوزی بەدەستەوەگرت و بەدەستەکەی تری شمشێرێکی بەدەستەوە گرت و بەتەنها کاروانی جێهێشت و سەرەو ژوور کەوتەڕێ. بڕیاریان وا دا کە کاروان نەوەستێ و بەرەو سەرکانییەکە بڕوات، کاتێک چەتەکان پەلاماریاندان ژن و منداڵ هەموو بەیەکەوە پڕ بەدەم هاوار بکەن بڵێن ئیمامی عەباس فریامانکەوە، سەید هەمزەش لەو کاتەدا بەخۆی و ئاڵا سەوزەکەی و شمشێرەکەیەوە بەخێرایی بەرەو لایان بێت و پاشان خەڵکەکە هاوار بکەن، ئەوا ئیمامی عەباس هات بەهانامانەوە. ئیتر بەڕێکوپێکی بەرنامەکەیان جێبەجێکرد کاتێک کاروانەکە کەوتە بۆ سەی چەتەکانەوە، ژن و منداڵ تێکڕا هاواریانکرد و لەولاشەوە ئاغا سەید هەمزە هاواری کرد ئەوا من هاتم بەهاناتانەوە، کە چەتەکان ئەوەیان بینی هەموو ترسان و ئەژنۆیان کەوتبووە لەرزین، یەکێک لە دزەکان کە تفەنگی پێ بوو لوولەی تفەنگەکەی کردبووە ئاغا سەید هەمزە، بەڵام دزێکی تر گوتبووی نەفام ئەوەچی دەکەی، دەتەوێ لوولەی تفەنگەکەت بکەیتە حەزرەتی ئیمام عەباس؟!

ئیتر ئەوە بوو دز و چەتەکان لە ترسانا بە پەلەپەل ڕایانکرد بوو، پاشان ئاغا سەید هەمزە جلەکانی گۆڕی بوو، هەموو چوونە سەرکانییەکە و چەتەکانیش هاتنە لایان و بەیکەوە نانی نیوەڕیان خواردبوو، بەڵام چەتەکان باسی ئەوەیان نەکردبوو، کە ئەمان بوون ویستویانە ڕووتیانبکەنەوە، ئیتر ئەم هەواڵە لە ناوچەکەدا بڵاوبوەوە کە حەزرەتی عەباس فریای ئەم کاروانە کەوتووە، بۆیە لە هەموو گوندەکانەوە پێشوازییەکی زۆر لە کاروانەکە دەکرا تا گەیشتبوونەوە شاری یەزد. لە گوندەکانی سەر ڕێگای کاروانەکە حوشتریان سەردەبڕی و دەیانگوت خێری ئیمام عەباس، ئیتر لەو کاتەوە تا ماوەیەکی زۆر ڕێگە ئارامی بەخۆیەوە بینی.

سەید هەمزەو سەید ئاغای تەرزجانی بەگێڕانەوەی ئەم یادەوەرییە قاقا پێدەکەنین.

# شازادەی حه مام

## گەڕان بۆ پەیداکردنی گەشتیار

دوای کۆکردنەوەی بەروبوومی جوتیاران و فرۆشتنی و کاتی بێکاری گوندنشینان لە سەرەتای مانگی مورداد و مانگی شەهریوەر (ئاب و ئەیلول) دا خەڵکی دەڕۆیشتن بۆ زیارەت بۆ شاری مەشهەد. دەبوو پاسەکان بۆ کۆکردنەوەی گەشتیاران بڕۆنە گوندەکان. دەبوو کەسێک بەدەنگی بەرز هاواری بکردایە و خەڵکەکەی ئاگادار بکردایەتەوە کە کێ ئامادەیە بڕوات بۆ مەشهەد بۆ زیارەت. ئامادەبێت. من کە زۆر ئارەزووم لە گەشتکردن بوو لەگەڵ پاسەکاندا دەڕۆیشتم بۆ گوندەکان. هەندێک لە خەڵکی گوندەکان ئارەزوویان وابوو کە لەگەڵ گەراجی (ئۆتو یەزد) بڕۆن و هەندێکیان حەزیان لە (گەراجی ئەتمینان) بوو، بەڵام من نەمدەزانی بۆچی ئەو خەڵکە وا بیریان دەکردەوە. ئایا هەڵبژاردنی گەراجەکان لەلایەن خەڵکەوە لایەنی سیاسی هەبوو یان لایەنی ئابووریی یا هاوڕێیەتی یان خزمایەتی!

هەندێک لە گوندەکانی ناوچەی ڕەفسنجان بەگشتی گەشتیاری گەراجی ئۆتۆ یەزد بوون، بەهیچ جۆرێک لەگەڵ گەراجی ئەتمینان گەشتیان نەدەکرد. لە مانگی (موردادی١٣٤٠- ئابی١٩٦١) دا چەند کەسێکی گەراجی ئەتمینان گوتبوویان ئێمە دەبێت بۆ کۆکردنەوەی گەشتیارانی گوندەکان هەوڵی زۆر بدەین. هەربۆیە دوو پاس بەڕێکەوتین کە شوفێرەکانیان ئاغا ماشائەڵلا و ئاغا محەمەد بوون، منیش کە تەمەنم (١٣) ساڵ بوو، لەگەڵیاندا ڕۆیشتم، چووینە گوندەکانی دەوروبەری ڕەفسنجان. ئەوکات لە گوندەکاندا ئاو و کارەبا نەبوو، جادەیان خۆڵ بوو، ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشینان هێشتا ڕادیۆیان نەبینیبوو. هەندێک خەڵکی گوندە دوورەکان تەنانەت ئۆتۆمبێلیان نەدیبوو. نیوەی دووەمی مانگی مورداد (ئاب) بوو هەوا زۆر گەرم بوو، گەنم و جۆ درەو کرابوو، خەڵکی خەریکی خەرمان هەڵگرتن بوون، ئێمە بەلایاندا تێپەڕین و هۆڕینمان بۆ لێدان و بانگمانکردن کە سبەی دەگەڕێینەوە و کێ حەز دەکات بۆ گەشتنی

مەشهەد، باخۆی ئامادە بکات. نزیکی نیوەڕۆ بوو گەیشتینە گوندێک وامان هەستکرد گەشتیاریان هەبێت، بەڵام کوێخای گوند هاواری لێکردین و گوتی: خەڵکی گوندی ئێمە لەگەڵ گەراجی ئۆتۆ یەزددا گەشت دەکەین و لەگەڵ گەراجی ئەتمینان گەشت ناکەین، چووینە چەند گوندێکی تر ئەوانیش هەمان قسەیان کرد، نزیک خۆرئاوا بوون بوو گەیشتینە گوندێکی گەورە، چووینە چایخانەی گوندەکە، چایچیەکە گوتی: لەم گوندانەدا بەدوای گەشتیاردا مەگەڕێن و خەڵکی ئێرە لەگەڵ گەراجی ئەتمیناندا گەشت ناکەن، تەنانەت چایچیەکە ئامادە نەبوو بەپارەش چایەکەمان بداتێ، لە تەنیشت چایخانەکەوە کۆزێک هەبوو کە هەندێک بزن و مەڕ و چەند مانگا و گوێرەکەیەکی تێدا بوو کە هی خاوەنی چایخانەکە بوو، کات بەرەو تاریکی دەڕۆیشت لە کاتژمێر شەشی بەیانییەوە ئێمە بەڕێگاوە بووین و چەندین گوند گەڕابووین، بەجادەی خۆڵ هەموو گیانمان ئارەقە و تەپوتۆز بوو، لەگەڵ هەر کەسێک قسەمان دەکرد ئامادە نەبوو لەگەڵ ئێمە دا گەشت بکات، ئێمەش نەماندەویست کە بەبێ گەشتیار بگەڕێینەوە و نەدەکرا بەرەو ئەولاتریش بڕۆین. ئاغا ماشائەڵلای شوفێر کە پیاوێکی (٥٠) ساڵە بوو، سێ ژن و (١٠) منداڵی هەبوو، بەچایچیەکەی گوت: تکات لێدەکەم مۆڵەتمان بدە با ئەمشەو لە سەربانی چایخانەکەت بخەوین و خواردنمان بۆ دروست بکە، چەندیش پارە دەڵێیت دەتدەینێ. بەڵام چایچییەکە گوتی: من خواردن و چاتان نادەمێ و ڕێگەشتان نادەم لە سەربانی چایخانەکەم بخەون. چەند کەسێکی خەڵکی گوندەکەش بەلامانەوە وەستابوون و ئاگاداری ئەم وتووێژەی ئاغا ماشائەڵلا و چایچیەکە بوون. پاشان ئاغا ماشائەڵلا بە چایچیەکەی گوت: باشبزانە من سەیدم، لە نەوەی پێغەمبەرم نزات لێدەکەم و خۆت و ماڵ و منداڵت تووشی بەڵا دەکەم. چایچییەکە گوتی: بڕۆ سەید هەر کارێکت لەدەستدێت بیکە و بێمنەتبە، ئەگەر من چا و خواردن بەئێوە بفرۆشم دەبێت لەم گوندە باربکەم، ئاغا ماشائەڵلا گوتی: تۆ لە باوک و باپیرانی من هیچ ناترسیت لە خەڵکی گوند دەترسیت، بەڵام قەیدی نییە وا ئێمە بە سکی برسی دەڕۆین لەسەر ئۆتۆمبێلەکەمان دەخەوین بەڵام دڵنیابە نزات لێدەکەم.

چایچیەکە دەرگای چایخانەکەی داخست و ڕۆیشت، ئەو خەڵکانەی کە لەوێ بوون بڵاوەیان لێکرد و ئێمەش چووینە سەر پاسەکە. ئەو چەند کەسەی گەراج هەر لە نێوان خۆیاندا خەریکی وتووێژ بوون کە چی بکەن و چی نەکەن. بانگی ئێوارەی دا و ئاغا ماشائەڵلا چوو دەستنوێژی گرت و لەسەر سەکۆی بەردەمی چایخانەکە نوێژی دابەست، نوێژەکەی دووروودرێژ بوو لە نێوان دوو نوێژدا نزای دەکرد. پاش نیو کاتژمێر، هێواش هێواش دەنگێکی سەیر دەهات مانگاکان دەستیانکرد بە بۆرەبۆڕ لە

جێگەی خۆیان هەڵبەز و دابەزیان دەکرد و هەڵدەپەڕین و بزن و مەڕەکانیش دەستیان کردبە باعەباع و ناڵە ناڵ. چایچی بە فانۆسێکی دەستییەوە هاتە دەرەوە و دەرگای کۆزی ئاژەڵەکانی کردەوە، ئیتر مانگا و گوێرەکە و مەڕ و بزن بە خێرایی هاتنە دەرەوە و کەوتنە غاردان، چایچییەکەش کەوتە ژێر دەست و پێیانەوە، هەموو رایانکردە کۆڵانەکانەوە و بەبارەبار و بە قارە قار هەموو خەڵکی گوندیان بەئاگاهێنا و خەڵکی هەموو بەچرای دەستیەوە هاتنە دەرەوە.

هەموو لایەک هەوڵی ئەوەیان دەدا کە بزن و مەڕەکان بگرنەوە، هەندێکی تریش خەریکی گرتنەوەی مانگاکان بوون، بەڵام هیچیان پێنەکرا، هەموو هەوڵەکانیان بێهودە بوو. پاشان ئاغا ماشائەڵڵا بەچایچییەکەی گوت سوپاسی خودای گەورە بکە، کە نزاکانی من لە بزن و مەڕ و مانگاکانت گیرابوو ئەوانی شێت کرد، ئەگەر خۆت و ژن ومنداڵەکانت شێت ببوونایە چیت دەکرد.

خەڵکی گوندیش کە زانیبوویان ئێوارە ئاغا ماشائەڵڵا نزای لە چایچییەکە کردووە، دەیانگوت ئەمە موعجیزەیە، ئیتر کۆڵان پڕ بوو لە خەڵک و چرای دەستی، ئەو ناوە تەواو ڕووناک ببوەوە. ئاژەڵەکان دەیاننالاند و خۆیان بە دیوارەکاندا دەکێشا. خەڵکەکە بزنەکانیان گرتبوو بەڵام هەر ناڵە ناڵیان بوو، ئیتر چایچییەکە کەوت بەسەر دەست و پێی ئاغا ماشائەڵڵا دا و گوتی: سەید، باوکم بەقوربانت بێت لێم ببورە، توخودا نزابکە لەم بەڵایە ڕزگارم بێت. تکایە نزابکە ئەم بەڵایە تووشی ژن و منداڵەکانم نەبێت. بەخودا چیم پێبڵێیت لە قسەت دەرناچم. ئیتر خەڵک لێمان کۆبووە و هەرکەسێک دەیویست سەید و هاوڕێکانی بباتەوە بۆ ماڵی خۆی. چایچییەکە زۆر بەخێرایی مەڕێکی سەربڕی و سەماوەری ئاگردا و چای ئامادەکرد و خوانی ڕازاندەوە. خەڵکی گوندیش بە گشتی هەرکەسە و لە ماڵی خۆیەوە شتێکی دەهێنا. یەکێک هێلکە، یەکێک ماست، چەند کەسێکی تر میوەیان دەهێنا، شوفێر و شاگردەکانی گەراجی ئەتمینان بوون بە کەسانی پیرۆز. دیارە ئاغا ماشائەڵڵا جێگای خۆی کردەوە و بووە پیاوێکی پیرۆز لەلای تێکرای گوندنشینان، چەند کەسێک بەناوی ئاغا ماشائەڵڵاوە خێریان دەکرد، چەندە کەسانێک قوماشیان بۆدەهێنا، کەسێک قاتێک چاکەت و پانتۆڵی جوانی بۆ هێنابوو، ژنان ئاڵتون و مستیلەیان بۆدەهێنا، پیاوێک کە چەندین ساڵ بوو ژنی هێنا بوو، بەڵام منداڵیان نەدەبوو بڕیاریدا خۆی و ژنەکەی لەگەڵ ئاغا ماشائەڵڵادا بڕۆن بۆ مەشهەد و ئەگەر منداڵێکیان بوو ئەوا یەک پارچە زەوی باش پێشکەشی بەئاغا ماشائەڵڵا بکات. خەڵکەکە وایاندەزانی کە من کوڕی ئاغا ماشائەڵڵام دەیانگوت ئەم سەیدە بچکۆلەیە چەند منداڵێکی جوانە. چەند دیاریەکیشیان دا بە منیش. دەمویست پێیان بڵێم کە من سەید نیم، بەڵام شاگردی

پاسەکان گوتیان ئێستا کاتی ئەو قسەیە نییە، باشتر وایە کە دوو سەید لێرەبن. خەڵکەکە ئەوەندەیان خواردن هێنابوو کە بەشی چەند مانگێکی ئێمەی دەکرد. ئاغا ماشائەڵڵا خێرا خێرا خواردنی دە خوارد و نزای خێری بۆ هەموو خەڵکی گوند دەکرد و دەیگوت خودای گەورە خەڵکی ئەم گوندە شاد و سەرفراز بکەیت، ئیتر لە نیوەشەودا تێکرا نیوەی ئاژەڵەکان هێور بوونەوە، بەیانی خەڵکیی ئاوایی کۆبوونەوە و دەیانویست بە ئۆتۆمبێلی گەراجی ئەتمنیان گەشت بکەن بۆ مەشهەد. شەو لە یەکێک لەماڵە دەوڵەمەندەکان بە نوێن و لێفەی تازە خەوتم، لە سەربان ڕاکشابووم سەیری ئەستێرەکانم دەکرد و لە خۆم دەپرسی باشە ئەم ئاژەڵە بێ زمانانە بۆچی وا شێت و هاربوون. بەیانی زوو لە خەو هەڵیانساندم و نانی بەیانیمان خوارد و زیاتر لە (٣٠) کەس لە ژن ومنداڵ و پیاو هاتبوون تا بەپاسەکەی ئاغا ماشائەڵڵا گەشت بکەن بۆ مەشهەد. تەنانەت هەموو پاسەکان پڕبوون و وا بڕیاردرا، کە ئاغا ماشائەڵڵا هەر جارەی بەنۆرە پاسێکیان لێ بخوڕێت. ئێمە گەیشتینە یەزد و بەپەلە چوار پاسی تر ڕەوانە کرا تا گەشتیارەکانی تر بهێنن. موعجیزەکەی ئاغا ماشائەڵڵا وایکرد کە هەموو خەڵکی خۆیان ئامادەبکەن بۆ گەشتی مەشهەد. گەراجی ئۆتۆ یەزدیش چەند پاسێکیان نارد بۆ گوندەکان، بەڵام هیچ کەس ئامادە نەبوو لەگەڵ ئەواندا گەشت بکات، ئیتر گەراجی ئەتمنیان بەجۆرێک پیرۆز بوو کە هەموو خەڵکی ڕوویان تێدەکرد. ئاغا ماشائەڵڵا ڕۆیشت بۆ مەشهەد و بەڵام من ئەم پرسیارە هەر لە مێشکمدابوو کە ئەو ئاژەڵە بێزمانانە، بۆچی ئاوا شێت بوون؟ من زۆر دڵنیا بووم کە ئەمە موعجیزە نییە، چونکە ئاغا ماشائەڵڵا نەیدەتوانی موعجیزە بکات، دیارە فێڵێک لەئارادابوو، بەڵام چ فێڵێک نازانم. ئەم بەسەرهاتەم بۆ ئاغا سەید حەسەنی داستانی باسکرد، ئەویش هەر نەیزانی چییە؟ بەڵام ئەویش دڵنیای کردمەوە کە فێڵێک هەیە، هەرچیەکیش بێت لە ژێر سەری ئاغا ماشائەڵڵادایە. پاش چەند ڕۆژێک ئاغا ماشائەڵڵا لە مەشهەدەوە گەڕایەوە، بەڵام پێشئەوەی بێتەوە گەشتیاران لە گەراج چاوەڕێی بوون تا لەگەڵ ئەودا بڕۆن. لەوێ لێم پرسیەوە گوتم: توخودا پێمبڵێ ئەوە چۆن نزایەک بوو کردت، کە ئاوا ئەو ئاژەڵە بێزمانانەت شێت کرد. گوتی: حسێن خۆ تۆ منداڵێکی ژیر و وریایت، بۆ نازانی من هەمیشە عەرەقی باشم لایە، ئەوشەوە چوار شووشە عارەقم بردە ناو کۆزی ئاژەڵەکانەوە، بەزۆر دەمی ئاژەڵەکانم کردەوە و عەرەقەکەم کرد بە قوڕگیاندا بۆ ئەوی نزاکانم قبوڵ بن.

ئاغا ماشائەڵڵا هەرگیز نوێژی نەدەکرد و سەیدیش نەبوو بەڵام عەرەقخۆرێکی زۆر کارامە بوو، هەموو شەوێک دەبوو عەرەق بخواتەوە، دەنا خەوی لێنەدەکەوت. هەمیشە

لە نێو ئۆتۆمبێلەکەیدا چەندین بوتڵ عەرەقی تێدا بوو. چوار ساڵ دوای ئەم ڕووداوە ئاغا ماشائەڵلا و چەند هاوڕێیەکی بەپاسەکان بۆ عەرەقخواردنەوە دەڕۆن بۆ مەهریز، درەنگانی شەو بەسەرخۆشی و لە گەڕانەوەیاندا لە جادە باریک و خۆڵەکەی مەهریز بۆ یەزد، محەمەد ئاغایی پاسەکەی لێخوڕی بوو ڕاستەوڕاست خۆی کێشا بوو بە تانکەرێکی سووتەمەنیدا و ئاغا ماشائەڵلا و شوفێری تانکەرەکە هەر لەوێ گیانیان لەدەستدابوو. محەمەد ئاغاش چونکە مۆڵەتی شوفێری نەبوو خرایە زیندانەوە کە دەبوو چەندین ساڵ لە زینداندا بمێنێتەوە، بەڵام خاوەنی گەراج داوای لە سەرنشینەکانی تر کرد شاهیدی بدەن کە ئاغای ماشائەڵلا پاسەکەی لێخوڕیوە.

## بەسەرهاتی ئەسغەری کۆڵبەر

ئێمە (١٤-١٥) لاوی یەزدی بووین، ویستمان داواکاری پێشکەش بکەین تا لە زانکۆی مەشهەد وەربگیرێن، بڕیارماندا بەیەکەوە بڕۆین بۆ مەشهەد، ڕۆیشتین و داواکاریمان پێشبکەشکرد و شەو هەموو پێکەوە چووین بۆ کوهسنگی. کە شوێنێکی زۆر دڵگیر و خۆش بوو لە مەشهەد، تاکو ئێستاکەش ئەو شوێنە هەر ماوە، لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) دا چەند چایخانە و چێشتاخانەیەکی لێبوو، خواردنی وەک کەباب و گۆشتاویان هەبوو. ئێمە هەمووومان لەسەر دوو مێز دانیشتین و داوای کەبابمان کرد. سواڵکەرێک لێمان نزیک بوەوە، من جوان سەیرمکرد و ناسیمەوە کە ئەو سواڵکەرە ئەسغەری کۆڵبەری گەراجی ئۆتۆتاجی یەزدە، بەڵام (٤-٥) ساڵ بوو من نەمدیبوو، سواڵکەرێکی خاوێن بوو، شێوە زمانی یەزدی هەبوو، کاتێک هاوڕێکانم لێیان پرسی تۆ خەڵکی یەزدیت، گوتی: نەخێر. هاوڕێکانم فەرموویان لێکرد و ئەویش هات لامان دانیشت، لەگەڵ ئێمەدا دەستیکرد بەنانخواردن، ئەو شەوە تێپەڕی و من و چەند هاوڕێیەکم لە زانکۆ وەرگیراین. پاش چەند مانگێک لەبەردەم زانکۆی ئەدەبیاتدا دوبارە ئەسغەرم بینییەوە کە سواڵی دەکرد، سڵاوم لێکرد و چاکوچۆنیم لەگەڵدا کرد، گوتم: خەڵکی یەزد سواڵ ناکەن، تۆ بۆ سواڵ دەکەیت؟، ئەویش گوتی: من خەڵکی یەزد نیم. منیش گوتم: تۆ ناوت ئەسغەرە و ئێوە سێ بران و تۆ لە گەراجی ئۆتۆتاج کۆڵبەر یت دەکرد و دوو براکەی ترت لە گەراجی حاجی عەبدولوەهاب کۆڵبەر ی دەکەن. گوتی: تۆ کێیت؟ منیش خۆم پێناساند و گوتی: دەکەواتە دوو تومەنم بدەرێ، ئەوکات یەک ڕیاڵ یا دوو ڕیاڵیان دەدا بە سواڵکەر، منیش دوو تومەنم پێدا و پێمگوت: ڕۆژێک وەرە بۆ لام تا بەیەکەوە هەندێک قسەبکەین. پاش (٤-٥) مانگ جارێکی تر لە بەردەم نەخۆشخانەی ڕەزاشا - ئیمام ڕەزای دوای شۆڕش- چاوم پێیکەوتەوە، کە دیسانەوە سواڵی دەکرد، سڵاوم لێکرد و کاتی نیوەڕۆ بوو، پێمگوت: نانی نیوەڕۆت خواردووە؟ گوتی: نەخێر، منیش داوام لێکرد کە بچین بەیەکەوە نانبخۆین. ڕۆیشتین بۆ فولکەی شا ڕەزا، بەیەکەوە

گۆشتاومان خوارد. وردە وردە بووین بەهاورێی یەکتری و پاش (٤-٥) جار یەکتری بینین، ئەسغەر دەستیکرد بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی خۆی گوتی: من لە گەراجی ئۆتۆتاجی یەزد کۆڵبەر بووم، هەموو ساڵێک لە مانگی شەهریوەر (ئەیلول) دا دەستی ژن و منداڵەکانم دەگرت و دەمهێنان بۆ مەشهەد، بۆ زیارەتی ئیمام ڕەزا.

هەر جارێک کە دەهاتم هەندێک گسک و باوەشێنم دەکڕی و لەگەڵ خۆم دەمهێنا و لێرە دەمفرۆشتنەوە. ڕۆژانە خێزان و منداڵەکانم دەبرد بۆ سەر مەرقەدی ئیمام ڕەزا، ئەوکات شەش منداڵمان هەبوو، کە کچێکمان شووی کردبوو، کوڕە گەورەکەشم کە تەمەنی (١٨) ساڵ بوو کۆڵبەری گەراج بوو. خۆم لە دەوری فولکەی ئیمام ڕەزا، گسک و باوەشێنم دەفرۆشت، شەوێکیان گسک و وباوەشێنەکانم تەواو کرد بوو، بەڵام هێشتا ژن و منداڵەکانم لە مەرقەد نەگەڕابوونەوە تا بەیەکەوە بچینەوە بۆ ئوتێل.

منیش زۆر ماندووبووم لە شوێنێکدا دانیشتم و سەرم خستە نێوان هەردوو ئەژنۆم تا سەرخەوێک بشکێنم، ئەوەندەم زانی کەسێک هات و پێنج ڕیاڵی فرێدایە بەردەمم، منیش هیچم نەوت. پاش چەند چرکەیەکی تر کەسێکی تر دوو ڕیاڵی خستە سەر پارەکە. لە ماوەی نیو کاتژمێردا هەتا ژن و منداڵەکانم هاتن (٤-٥) تومەنیان لەبەردەمم دانابوو. کاتێک لە ژێرەوە سەیرمکرد وا ژن ومنداڵەکانم دێن. خێرا پارەکانم کۆکردەوە و هەڵسامە سەرپێ، بەخێزانەکەمم گوت ئێوە بڕۆن بۆ ئوتێل من کەمێک کارم هەیە، پاش دوو کاتژمێری تر دێمەوە بۆ لاتان. ئەوان ڕۆیشتن و منیش سەد مەتر لەولاتر لە شوێنێکی باشدا دانیشتمەوە، ئیتر نازانم کە ئەمە کارێکی زۆر باش و بێمایەو بێ هیلاک بوونە، لە ماوەی دووکاتژمێردا دە تومەنم دەستکەوت، کە ئەگەر باری لۆرییەکی دە تەنیم دابگرتایە و بەچەندین پلیکانەدا سەرم بخستیایە، ئەو بڕە پارەیەم دەست نەدەکەوت. ئێمە کە هاتبووین بۆ مەشهەد بۆ بەنیازی (١٥) ڕۆژهاتبووین، (١٥) ڕۆژەکە تەواو بوو، بە خێزانەکەمم گوت، من کارێکی باشم لێرە پەیداکردووە، بۆیە نامەوێت بگەڕێینەوە یەزد، خێزانەکەم زۆری پێخۆش بوو کە نەگەڕێینەوە و لە مەشهەد بمێنینەوە و لە نزیک مەرقەدی ئیمام ڕەزا بین. دواتر دوو ژوورم بەکرێگرت و لە مەشهەد نیشتەجێ بووین، ڕۆژانە دەڕۆیشتم لە شوێنێکدا دادەنیشتم و سەرم دەخستە نێوان ئەژنۆکانم و ڕۆژانە (٤٠-٥٠) تومەنم دەستدەکەوت. پاشان زستان هات و دنیا ساردیکرد و گەشتیاری مەشهەدیش کەمیکرد و بەو سەرمایە دانیشتن و لەسەر ئەو زەویە سارده نەدەکرا، بۆیە بڕیارمدا کە بە گەڕەکەکاندا بگەڕێم و داوای پارەیان لێ بکەم. هێواش هێواش هەموو گەڕەک و شوێنە باشەکانی مەشهەد شارەزا بووم،

بۆمـدەرکەوت کە گەڕەکەکـانی سـەعد ئابـاد، ئەحـمەد ئابـاد، گەڕەکـی دکتۆرەکـان، دەوروبەری زانکۆ و بەردەمی نەخۆشخانەکان، پارەی باش دەدەن.

ئێسـتا وا نـزیکەی پێـنج سـاڵە لە مەشـهەدم و گوزەرانمـان زۆر زۆر باشـە، لەم ماوەیەدا باشترین خانووم لە مەشهەد کڕیوە، کاتێک کە کۆڵبەر ی گەراج بووم کچێکم بە (١٥) ساڵی دابەشوو، بەهەموو توانای خۆمانەوە توانیمان بایی (١٤٠) تومەن جیازیی بۆ بکڕین. بەڵام ئێستاکە خەریکە کچەکەی ترمان دەدەین بە شوو بایی (٣٠٠) هەزار تومەن جیازییمان بۆ کڕیوە. خێزانەکەشم ئێستا کاری کڕین و فرۆشتن دەکات دەڕوات شتومەک دەکڕێت و بە دراوسێکانی دەفرۆشێتەوە، بەوەش قازانجێکی باش دەکات.

ئەو ماوەیەی کە لە مەشهەد بووم زوو زوو ئەسغەرم دەبینی. پاش (٤-٥) ساڵ کە زانکۆم تەواوکرد بـووم بە سـەرباز لە هەمـان زانکـۆی ئەدەبیـاتی مەشـهەد، ڕۆژێـک ڕۆیشـتم بـۆ گەراجی یەزدییەکـان، سـەیرمکرد ئەسـغەر لەوێیە و شـاڵێکی سـەوزی لە سـەری ئاڵاندووە و لەگەڵ کەسـێکدا قسـە دەکـات. لێم پرسـی ئەسـغەر کەی بوویت بە سەید، گوتی: من هەر سەید بووم. گوتم: خۆ براکانت سەید نین. گوتی: هەر کەسێک بچێت بۆ مەشهەد ئەوا دەبێتە سەید. گوتم: کار و کاسپیت چۆنە؟ لەو کاتەدا ئەوکەسەی کە لەگەڵیدا وەستابوو گوتی: من لە هەر هەزار تومەنێک (٣٠) تومەن زیاتر نادەم، بەڵام ئەسـغەر دەیگـوت: دەبێـت بـۆ هەر هەزار تومەنێـک (٣٥) تـومەنم بـدەیتێ. ئەوەبـوو لە کۆتاییدا لەسەر (٣٢) تومەن ڕێککەوتن. ئیتر تێگەیشتم کە ئەم خاوەن ئۆتۆمبێلە پارە بە سوود لە ئەسـغەر وەردەگرێت. پێدەچێت ئەسـغەر جگە لە سـواڵکردن پارەش بەسـوو بـدات. سـاڵی (١٣٥٤-١٩٧٥) ئەسـغەرم بینییەوە، گـوتم: هەواڵت چۆنە؟ گـوتی: هەفتەی ئایندە زەماوەند دەکەیـن بـۆ کوڕەکەمـان. ناونیشـانی پێدام و گـوتی: دەبێت تـۆش بێیت. منیش لەکاتی خۆیدا ڕۆیشتم بۆ زەماوەندەکەیان. ئەسغەر بەپێوە وەسـتا بـوو، چاکەوت و پانتۆڵێکی کەشخەی لەبەردابوو، پێشـوازی لە میوانەکان دەکرد، خـانوویەکی گەورەی جـوانی هەبـوو، کە ڕووبەرەکەی (٥٠٠) مەتـر بـوو. کەمێـک لەولا مـاڵەکەیەوە خـانوویەک هەبوو کە ڕازاندبوویانەوە، بۆ کـوڕەکەی. سـاڵی (١٣٥٥-١٩٧٦) بـۆ خوێنـدن ڕۆیشـتم بـۆ پـاریس مـاوەی (١٠) سـاڵ ئەسـغەرم نەبینی، وابزانم سـاڵی (١٣٦٥-١٩٨٦) بـوو ڕۆژێـک چووم بۆ گەراجی یەزدییەکان کە چووم خودا لێی خۆشبێت حسین ئاغای جەلیلی لەوێ بوو. لێم پرسی هەواڵی ئەسغەر دەزانی؟ گوتی: ئەوەندە دەزانم حاڵی زۆر باشە، چـونکە پـارە دەدا بە سـوو، لە سـەرەتای شۆڕشـدا هەنـدێک کەس دەیانویسـت ئـازاری بـدەن، ئەویش ناچار ماڵی بارکرد چوو بۆ تاران. بەڵام نەمزانی لە چ شوێنێکی تارانە.

سـالّی (١٣٦٩-١٩٩٠) ویسـتم بـڕۆم بـۆ دەرەوەی وڵات، دەبـوایە هەزار دۆلار لە بازاڕی ئازاد دا بکڕم، چووم بۆ شەقامی فیردەوسی بۆئەوەی دۆلار بکڕم، کە بینیم لە دوکانێکی ئاڵوگۆڕی پارەدا ئەسغەر دانیشتووە. چوومە ژوورەوە و چاکوچۆنیم لەگەڵ کرد و ئەو کوڕەی کە لە مەشهەد بووکی بۆ گواستەوە. لە پشتی مێزەکەوە دانیشتبوو. تێگەیشتم کە حاجی سەید ئەسغەر دوکانی پارەگۆڕینەوەی هەیە، بەهۆی هاوڕێیەتی کۆنەوە (١٢) ڕیاڵ هەرزانتر دۆلارەکەی بۆ گۆڕیمەوە و گوتی: نیوەڕۆ میوانی منبە، بەلام مـن گـوتم: کـارم هەیە و دەبێت بـڕۆم، چەنـد کارێکیـان پـێ سـپاردووم، دەبێت ئەنجامیان بدەم. چەند جارێک لە تاران ئەسغەر و ئاغای ڕەزایی کوڕیم بینی، سالّی (١٣٧٣-١٩٩٤) شەوێک بانگهێشتیان کردم بۆ مالّی خۆیان، کوڕی سێیەمی تازە ژنی گواستبوەوە. ئەسغەر گوتی: وریابە هیچ قسەیەک نەکەیت، سەبارەت بە ڕابردووی من. چونکە بووکەکەمان ئاگارداری ڕابردووی ئێمە نییە. لە گەڕەکی عەباس ئاباد، ماڵێکی خۆش و گەورە و چوار نهۆمیان هەبوو. خۆی لە نهۆمی دووەمدا دەژیا. ڕۆژێک لە حاجی سەید ئەسغەرم پرسی لە ژیانتا خۆت بەقەرزاری کێ دەزانیت؟ گوتی: خۆم بە قەرزاری ئەو کەسە دەزانم کە یەکەم جار لە مەشهەد پێنج ڕیاڵەکەی فڕێدایە بەردەمم و منی لە کۆڵبەری ڕزگارکرد.

سالّی (١٣٨٣-٢٠٠٤) بۆ کڕینی هەندێک پارەی بیانی سەردانی دوکانی حاجی سەید ئەسغەرم کرد، ڕەزای کوڕی لە دوکانەکە بوو، گوتی: لە دەرەوەی وڵات چەند لقێکی پـارە گۆڕینەوەمـان هەیە، لە هەر یەکێـک لەو وڵاتـانە کارێکـت هەبـوو، سـەردانی نووسینگەکانی ئێمە بکە. لە دوبەی، لەندەن، میونخ، هامبۆرگ، پاریس، لۆس ئەنجلۆس و شیکاگۆ.

لە ڕەزام پرسی حاجی لە کوێیە؟ گوتی: کەمێک نەخۆشـە ڕۆیشتووە بۆ لەندەن و سـەردانی منداڵەکان دەکـات و سـەرێکی نووسـینگەکانمان دەدات. سـالّی (١٣٨٨-٢٠٠٩) سەردانێکی دوکانەکەیم کردەوە، کەسێک لەسەر دوکانەکەی بوو، گوتم: دەمەوێت چاوم بە حاجی ئەسغەر بکەوێت. گوتی: پێشتر ئاگادارت کردووە کە سەردانی دەکەیت؟ گوتم: پێی بڵێ دکتۆر پاپولی هاتووە. لەو کاتەدا حاجی سەید ئەسـغەر گوێی لە دەنگمـان بـوو، خۆی هاتە لام و چووینە ژوورەوە و هەندێک قسـەمان کرد. لێم پرسـی هەواڵی هـاوڕێ یەزدییەکـان دەزانیت؟ گـوتی: وابزانم هەموویـان مـردوون، بەئەوانەشـەوە کە (١٥-١٦) ساڵ لە من بچووکتر بوون. گوتم: تۆ تەمەنت چەندە؟ گوتی: (٧٦) ساڵ. گوتی: براکەشم: مردووە... بەڵام جەواد ماوە کە (٢٠) ساڵ لە من بچووکترە. گوتم: جەواد چی دەکات؟ گوتی: چەند ساڵێکە وازی لە کۆڵبەری هێناوە، لەگەڵ کەسێکی تردا نووسینگەی کڕین و

فرۆشتنی زەوی و خانووی هەیە، گوزەرانی زۆر باشە. بەڕاستی ئەگەر حاجی سەید ئەسغەر سوالّی نەکردایە نەیدەتوانی لە تەمەنی (٧٦) سالّیدا بەو جۆرە بەهۆشوگۆش بێت و نەیدەتوانی کڕین و فرۆشتنی پارە بکات، لە ولاتان نووسینگەی پارە گۆڕینەوەی نەدەبوو. ئەگەر لەسەر پیشەی کۆلّبەری بەردەوام بووایە، بێگومان ئەویش وەکو حەسەنی موقەدەس، عەباسی کۆلّبەر، ڕەجەب و مەحمودی کۆلّبەر لە تەمەنی (٥٠-٦٠) سالّیدا دەمرد.

## ئۆتۆمبێل شۆرەکانی گەراج

ئەم توێژە زەحمەتکێشە چەوساوەترین کەسانی گەراجەکان بوون، لە هەر گەراجێکدا یەک دوو کەس هەبوون کە پیشەیان شۆردنی ئۆتۆمبێلەکان بوو. بەگشتی ئەمانە دژایەتی یەکتریان دەکرد، دەبێت داهاتی ئەم ئۆتۆمبێل شۆرانە چەند بێت، کە هەمیشە لە نێو خۆیاندا کێشەیان هەبوو. ئەویش خودا دەیزانێت. ئەم داماوانە هەرگیز گەشەیان نەدەکرد، بەپێچەوانەی کۆڵبەر ەکانەوە، لە نێوان ئەماندا هەمیشە شەڕ و ئاژاوە و شەڕە جوێن هەبوو. من وامدەزانی کۆڵبەر ەکان چونکە لە تەمەنی گەورەدا دەستیان بەکارکردن کردبوو و لەوەش گرنگ تر ئەوانە کەسانی بەهێزبوون و زۆربەیان خزم و کەسو کاری یەکتری بوون، یاخود خەڵکی یەک گەڕەک یان یەک گوند بوون. بۆیە لەنێوان ئەمانەدا کێشە دروست نەدەبوو. ئۆتۆمبێل شۆرەکان بەگشتی لە تەمەنی (١٢-١٣)ساڵیدا دەستیاندەکرد بەم پیشەیە. تەواوی سەرمایەی ئەمانە یەک سەتڵ و قاپێک بوو، ئەگەر تەنها دەرەوەی ئۆتۆمبێلەکەیان بشۆردایە ئەوا هەر لە گەراجەکەدا بەدوو سەتڵ ئاو دەیانشۆرد. بەڵام ئەگەر ئۆتۆمبێلەکەیان بەتەواوی بشۆردایە، دەبوو ئۆتۆمبێلەکە ببەنە قەراخ شار و لە نزیک جۆگە ئاوێک ڕایانبگرتایە و لەوێ بەتەواویی دەیانشۆرد.

زۆربەی ئۆتۆمبێل شۆرەکان کەسانی زەحمەتکێش و ڕەنجدەر بوون، بەڵام چەند کەسانێکیش هەبوون، کە هەموو کارێکیان دەکرد لەگەڵ ئۆتۆمبێل شۆرییەکەدا. زۆربەیان پاش چەند ساڵێک یا ئالودە (معتاد) دەبوون یا تووشی جۆرەها نەخۆشی دەبوون. لە نێوان (٢٥-٣٠) ئۆتۆمبێل شۆر کە لە گەراجەکانی یەزد و مەشهەد و تاران کاریان دەکرد و من دەمناسین (٧-٨) کەسیان گرفتاری تلیاک بوون و لە تەمەنێکی کورتدا مردن. (٣-٤) کەسیشان بوون بە شوفێر، کەسێکیش لەوانە کە وریابوو بەهۆی کاری ترەوە پارەی کۆکردەوە و بوو بەخاوەنی ئۆتۆمبێل. کەسێکی تر لەوانە خۆی لە

کەسێکی دەوڵەمەند نزیککردەوە کە خاوەنی چەند دوکانێک بوو، ئەویش لەوێ کاری دەکرد و خەریکی فرۆشتنی پارچەی ئۆتۆمبێل بوو. بەڵام چەند ساڵێک لەم کەسە بێئاگا بووم، دەیانگوت لە تاران شوێنی ئۆتۆمبێل شۆردنی هەیە.

کاتێک ویستم یادەوەرییەکانم بنووسم، ناونیشانیم لە تاران پەیداکرد و گوتیان لە باکووری تاران کاری ئۆتۆمبێل شۆریی دەکات و شوێنەکەی زیاتر لە (٨٠٠) مەتر دەبێت و موڵکی خۆیەتی. ڕۆیشتم بۆلای و شوێنەکەیم دۆزیەوە و چوومە لای و سڵاوم لێکرد، پاش (٤٠) ساڵ کە یەکتریمان بینیەوە زۆرباش منی ناسییەوە.

بەرگی یەکەمی کتێبی (شازادەی حەمام)م پێشکەشکرد، لەگەڵ کتێبی شاعەباس و چینەچی. بەیەکەوە چامان خواردەوە و گوتم: بەرگی یەکەمی یادەوریەکانم تەواو بووە، کاتت هەیە بیخوێنیتەوە، گوتی: ئاغای پاپولی خۆ من خوێندەوارییەکی ئەوتۆم نییە تا بیخوێنمەوە. هەموو نووسین و پێویستییەکانی شوێنی کارەکەشم کوڕی خوشکەکەم بۆم جێبەجێ دەکات. گوتم: ئەوە یادەوەریی یەزدە، خراپ نییە ئەگەر کەسێک بۆت بخوێنێتەوە. چونکە دەمەوێت بەرگی دووەمیش بنووسم لەبارەی ژیانی تۆیشەوە شتێک بنووسم. کە وام گوت ڕەنگی تێکچوو، قوڕگی گیرا. پێمگوت: جارێکیتر دیمەوە بۆلات و لەبارەی یادەوەریی ڕابردووەوە قسەدەکەین. پاش (٣-٤) مانگ دووبارە سەردانم کردەوە و کە چووم حاجی لەوێ نەبوو، نزیکەی (٢٠) خولەک چاوەڕوانم کرد تا هاتەوە.

پێمگوت: کتێبەکەت خوێندەوە؟ گوتی: نەوەکەم بۆی خوێندمەوە، کتێبێکی باشە. گوتم: ئێستا بۆ بەردەوامی یادەوەرییەکان دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم و یادەوەرییەکانی تۆش تۆماربکەم. چونکە تۆ لە ژیاندا کەسێکی سەرکەوتوو بوویت. گوتی: ئاغا پاپولی تکات لێدەکەم واز لە من بهێنە، چونکە بەهیچ جۆرێک حەزناکەم یادی منداڵیم بکەمەوە. من هەرگیز لە ژیانمدا خۆشیم نەدیووە، هەر چەوساومەتەوە. هیچ خۆشییەکم نەدی لە بەدبەختی زیاتر، بۆیە حەزناکەم یادی ئەو ڕۆژانە بکەمەوە، ئێستا بەم تەمەنەوە کەوتوومەتە سەر کاری خۆم و دەمەوێت ژیانێکی خۆش بژیم. بۆیە حەزدەکەم دەربارەی من هیچ نەنووسیت. خەڵک دەتوانێت باسی دەوڵەمەندبوونی خۆی بکات لە ڕێگای میزڵدان فرۆشتنەوە بێت یا سواڵکردن بێت یا سووخواردن بێت، بەڵام ئەو ڕێگەیەی ئەم حاجییەی پێدەوڵەمەند بووە بۆ باسکردن نابێت.

عەبدالّی ئۆتۆمبێل شۆریش لەو کەسانە بوو کە تووشی هەمان کێشە ببوو، شوفێرەکان حەزیاندەکرد بیبەنە دەرەوەی شار بۆ ئەوەی لەوێ ئۆتۆمبێلیان بۆ بشوات. عەبدالّ پێی ناخۆش نەبوو هەم پارەی ئۆتۆمبێل شۆردنی وەردەگرت، هەم پارەی

کارەکەشی. جارێک لەسەر عەبداڵ شەڕێک دروستبوو کە سێ شوفێر دەیانویست بیبەنە دەرەوەی شار بۆ ئەوەی ئۆتۆمبێلەکەیان بۆ بشوات، عەبداڵ لە منداڵییەوە هەر ڕۆژەی لە گەراجێک کاری دەکرد، (١٧-١٨) ساڵ بوو کە خەریکی تلیاکخۆران بوو. کاتێک من بۆتەواوکردنی خوێندن هاتمە مەشهەد، هیچ هەواڵێکم لە عەبداڵ نەما، هێشتا دەوروبەری مەرقەدیان تێک نەدابوو.

وابزانم ساڵی (١٣٥٢-١٩٧٣) بوو کە عەبداڵم لە گەراجی سەعادەتی مەشهەد بینی، خەریکی موستیلە فرۆشتن بوو، هەر لە ڕوویدا دیاربوو کە کەسێکی ئالوودەیە. سڵاوم لێکرد و خەریکی مامەڵەکردنی فرۆشتنی مستیلەبوو لەگەڵ زیارەتکارێکدا، پاشان پێنج موستیلەی فرۆشت بە زیارەتکارەکە، هەمووی بەبڕی (٤٠٠) تومەن، گوتم: بەڕاست عەبداڵ لەم مستیلانە چەندت خێرکرد؟

گوتی: ئاغای پاپولی ئەگەر بەستەیەک تلیاکم بۆ بکڕێت ڕاستییەکەت پێدەڵێم، گوتم: بەستەی بەچەندە؟ گوتی: (١٥) تومەن. منیش (١٥) تومەنم پێدا، و ئەویش گوتی: نرخی هەر موستیلەیەک لەسەر خۆم هەشت تومەنە، هەر موستیلەیەک لە هەشت تومەن زیاتری کرد، ئەوە دەبێتە قازانج. جاری وا هەیە موستیلەیەک بە (٢٥٠) تومەن دەفرۆشم. چونم بۆ دەرەوەی وڵات بووە هۆی ئەوەی کە چەندین ساڵ عەبداڵ نەبینم، لە دەوروبەری ساڵی (١٣٦٧-١٩٨٨) لەلای فولکەی تەقی ئابادی مەشهەد لە بەردەم سینەما ئەفریقا عەبداڵم بینی، تلیاک وا ڕەنگوڕووی تێکدابوو کە من ئەوم نەناسیەوە، ئەو بەمنی گوت: چۆنیت ئاغای پاپولی من عەبداڵم. کە سەیرم کرد وەزعی زۆرخراپ بوو گوتی: هیچم نییە، خێرت دەگا پارچەیەک تلیاکم بۆ بکڕە. گوتم: پارچەیەک نرخی چەندە؟ گوتی: هەزار تومەن. گوتم: ئەگەر (١٥٠٠) تومەنت بدەمێ پێمدەڵێیت چۆن تلیاک دەکڕیت؟ گوتی: نۆکەرتم بەڵێ، پێتدەڵێم.

گوتم: وەرە فرشیارەکەم پیشانبدە، من خۆم بۆتدەکڕم و دەتدەمێ. بردمی تا ئەولا سینەماکەوە، کەسێکی وەرزشکاری تەمەن (٣٠) ساڵ خەریکی فرۆشتنی جلوبەرگی منداڵان بوو، عەبداڵ چووە لایەوە و گوتی: ئەم ئاغایە دەیەوێت تلیاکم بۆ بکڕێت، کابرای تلیاکفرۆش دەستیکرد بە جنێوپێدانی عەبداڵ و توڕەبوو گوتی: کوا من تلیاکفرۆشم؟! عەبداڵ گوتی: توڕەمەبە ئەم ئاغایە لە خۆمانە. کابرا گوتی: ئاخر من لە خۆتان نیم و وازم لێبهێنن. من کاسبم، لێمگەڕێن کاسپییەکەم بکەم. منیش لە کابرا چوومە پێش و پێمگوت: ئەم عەبداڵە هاوڕێی (٢٥) ساڵ لەمەو پێشمە، من دەمەوێت تلیاکی بۆ بکڕم. بەتوڕەییەوە گوتی: ئاغا من ژن و منداڵم هەیە، هەموو ڕۆژێک کارمەندانی شارەوانی گێچەڵم پێدەکەن ناهێڵن لێرە شت بفرۆشم، تۆش داوای تلیاکم

لێدەکەیت، من ئەو کارانە ناکەم. پێمگوت کاکە گیان باش بزانە من مامۆستای زانکۆم، پۆلیس و شارەوانی نیم، گوتی: هەرچیەک هەیت کەیفی خۆتە و من تلیاک و دوکەڵیی نیم. پاشان عەبداڵ گوتی: تۆ هەزار تومەنم بدەرێ و لە دوورەوە سەیرم بکە، منیش پارەکەم پێدا و عەبداڵ کەمێک ڕۆیشتە ئەو لاتر و پارەکەی دا بەکەسێک و چاوم لێبوو تلیاکەکەی لێوەرگرت، نزیکەی مەترێک چووە پاڵ دیوارەکە و بەدەست بانگی کردم کە پاکەتەکەی دەرکرد و هەڵیپچڕی نایلۆنێکی زۆر بچووکی تێدابوو. کەمێک تۆزی سپی لە نێو نایلۆنەکەدا بوو، ئەوە یەکەمجار و دوواجارم بوو ئەو تۆزە نەعلەتیە ببینم. گوتم: عەبداڵ ڕاستم پێبڵێ ئەوە بایی چەندبوو، چەندت پارەدا بەکابرا؟ گوتی: حسێن گیان نۆ کەرتم (٨٠٠) تومەنم داوەتێ و (٢٠٠) تومەنی ترم هەڵگرتووە بۆ خۆم. ئەوە دواجار بوو کە عەبدالم بینی (٨-٩) مانگ لەوەدوا یەکێک لە کارمەندانی گەراجی ئیتفاقی یەزدییەکان گوتی: عەبداڵی ئۆتۆمبێل شۆر لە یەکێک لە پارکەکانی شاردا مردووە. عەبداڵ کاتێک کە مرد تەمەنی لە (٤٠) ساڵ زیاتر نەبوو.

## مردنی زەهرا

سێ چوار ژنی بەتەمەن، لە کۆڵانەوە ڕایاندەکرد. دایکم گوتی: ئەشرەف خانم ئەوە خێرە وا ڕادەکەن؟ ئەشرەف خانم وەڵامیدایەوە و گوتی: زەهرای کچی حاجی حەسەن بەمنداڵەوەیە، زۆر هیلاکە خەریکە دەمرێت. تا ئێستا سێ چوار جار بووراوەتەوە، ئەوە سێ ڕۆژە منداڵەکەی لێنابێتەوە، دایکیشم لەگەڵ ئەواندا ڕۆیشت. منیش کە تەمەنم (١٢-١٣) ساڵ بوو، تا بەردەرگای ماڵی حاجی حەسەن دوایانکەوتم. ژنەکان چوونە ژوورەوە و حاجی حەسەن لەگەڵ چەن پیاوێکی تر لە حەوشەکە دانیشتبوون، یەکێک گوتی: حاجی بڕۆین دکتۆر بهێنین؟ حاجی یش گوتی: پێویست ناکات، خودا چی ئارەزوو بکات هەر ئەوەیە. ئێمە هەموومان هەروا لەدایکبووین. عەباس ئاغای برای مێردی زەهرا، گوتی: حاجی ئێستا وەک ئەوکات نییە، ئێستا دنیا گۆڕاوە. حاجی گوتی: منداڵبوون لە سەردەمی ئادەمەوە هەر ئەوها بووە، ئەگەر زەهرا ڕۆژی تەواو نەبووبێت ئەوا هیچی لێنایەت، خۆ ئەگەر خودا ڕۆژی تەواوکردبێت ئەوا دەمرێت. من مۆڵەتنادەم دەستی دکتۆری بێگانە بەر لەشی کچەکەم بکەوێت. هاوسەرەکەی زەهراش لە پەنادیوارەکەدا ڕاوەستابوو فرمێسک بەچاوانیدا دەهاتنە خوارەوە و لەبەردەم حاجی خەزووریدا هیچ قسەیەکی نەدەکرد. محەمەد عەلی کە کوڕی کچێکی تری حاجی حەسەن بوو، دایکی نەمابوو، بێ دایک گەورە ببوو، ئەویش دایکی هەر بەسەر منداڵەوە چوو بوو، هاواریدەکرد بەندەی خودا مەهێڵن پووریشم بە دەردەکەی دایکم بمرێت. وا من دەڕۆم دکتۆر دەهێنم. حاجی داردەستەکەی دەستی توندکرد لە ملی و گوتی: تۆ چۆن لەڕووی مندا قسەدەکەیت.. هەی کەری نەفام؟ پوورت بمرێت باشترە یا ڕاستەوڕاست بچێتە دۆزەخ. محەمەد عەلی بەدەست سەری داردەستەکەی حاجی لەسەر ملی خۆی لادا و گوتی: نەعلەت لە گۆڕی باوکی هەموو کەسێکی کۆنەپەرست. محەمەد عەلی تەمەنی (١٦) ساڵ بوو، پووری جێگەی دایکی بۆگرتبووەوە. زەهرا خەریک

بوو ده‌مرد. حاجی ئاغا توڕه بیوو، قسه‌ی به‌محه‌مه‌د عه‌لی ده‌گوت. محه‌مه‌د عه‌لی یش پێیگوت: تۆ ئه‌وه‌نده له دۆزه‌خ ده‌ترسیت ئه‌ی بۆچی پاره ده‌ده‌یت به سوو، ئه‌و سووه‌ش ده‌خۆیت؟ حاجی گوتی: تۆ به‌نانی حه‌رام په‌روه‌رده‌كراویت، باوكت نانی حه‌رامی ده‌رخواردی كچی من داوه تۆ له سكی دایكتدا بوویت كه خواردنی حه‌رامت خواردووه. ئه‌گه‌ر له‌سكی دایكتدا خواردنی حه‌رامت نه‌خواردایه ئێستا له‌به‌رده‌م كه‌سانی له خۆت گه‌وره‌تر ئه‌م چه‌نه‌بازییه‌ت نه‌ده‌كرد. محه‌مه‌د عه‌لی گوتی: كه‌سێك پاره‌ی حه‌رامی ده‌رخواردی پوورم داوه بۆیه ده‌بێت وه‌ك دایكم بمرێت. تۆ ده‌ڵێیت نابێت ده‌ستی دكتۆری نامه‌حره‌م به‌ر له‌شی بكه‌وێت. چه‌ند كه‌سێك كه له‌وێ بوون هه‌وڵیاندا كه محه‌مه‌د عه‌لی ئارام بكه‌نه‌وه. حاجی عه‌لی ئاغای برای حاجی حه‌سه‌ن ئاغا، گوتی: سه‌یره كه‌وتوینه‌ته چ ڕۆژگار و زه‌مانێكه‌وه. هاتوون دكتۆری پیاویان پێگه‌یاندووه و پیاوان ژنه‌كانی خۆیان ده‌به‌نه لای دكتۆری پیاو، خۆشیان له ده‌ره‌وه چاوه‌ڕوان ده‌كه‌ن، تا دكتۆر له ژووره‌وه چاره‌سه‌ری ژنه‌كانیان ده‌كات. ئه‌گه‌ر ئاخر زه‌مان نه‌بێت چۆن منداڵێكی ئاوه‌ها له‌به‌رده‌م باپیره‌یدا كه ته‌مه‌نی (٧٥) ساڵه ڕاده‌وه‌ستێت و قسه‌ی زل ده‌كات. من كه برا بچووكی حاجی حه‌سه‌نم و ته‌مه‌نم (٧٠) ساڵه پێم شه‌رمه قسه له ڕوویدا بكه‌م و ئاوها له‌به‌رده‌میدا ڕابووه‌ستم.

محه‌مه‌د عه‌لی دایه پرمه‌ی گریان و گوتی: دوو پیاوی كۆنه‌په‌رستی سووخۆر ده‌یانه‌وێت پووریشم وه‌ك دایكم بكوژن. ئاغا مسته‌فا گوتی: كاكه گیان مه‌گری حاجی عه‌لی ئاغا و حاجی حه‌سه‌ن ئاغا سوو خۆرنین، ئه‌وه (٦٠) ساڵه من هیچ كارێكی خراپم له‌م پیاوانه نه‌دیوه. محه‌مه‌د عه‌لی هاواریكرد گوتی: ئه‌وه تۆ چی ده‌ڵێیت خۆ تۆ پێرێ سووی پاره‌كه‌یت بۆ هێنا و داته‌ده‌ستی و له گه‌ڕانه‌وه‌تدا له كۆڵان هاوارتده‌كرد و جوێنت به‌هه‌موو سووخۆره‌كان ده‌دا. ئاغا مسته‌فا گوتی: به‌ڵێ ڕاسته من جوێنم به‌هه‌موو سووخۆره‌كان داوه، به‌ڵام حاجی كه ده‌ستی منی گرت و پاره‌ی پێدام هه‌مووكاره‌كانی ڕاست وشه‌رعی بوو نه من سووم پێداوه و نه ئه‌و سووی لێوه‌رگرتووم. ته‌نانه‌ت چوومه لای ئاغا سه‌ید جه‌واد ئه‌و وای بۆ لێكدامه‌وه و كه ئه‌و مامه‌ڵه‌یه‌ی نێوان و من حاجی حه‌سه‌ن ڕاسته و حه‌رام نییه. ئاغا میرزا عه‌لی ئه‌كبه‌ر كه حیساب ڕاگری حاجی حه‌سه‌ن بوو گوتی: باشه ناكرێت ڕێگایه‌كی شه‌رعی بۆ بدۆزینه‌وه بیبه‌ینه لای دكتۆر.

ژنان ده‌هاتن و ده‌چوون كچه‌كه‌ی تری حاجی حه‌سه‌ن كه عه‌بای به‌سه‌ره‌وه بوو هاته به‌رده‌رگا و هاواریكرد باوكه گیان به‌خودا داده‌م وا گیانده‌دات. حاجی حه‌سه‌ن گوتی: ئاخ ئه‌مانه تێناگه‌ن ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌وا خه‌ریكه منداڵی ببێت كچی منه، به‌شێكه له

گیانی من، له خۆمم خۆشتردەوێت، بەڵام لەبەرامبەر قەزاوقەدەر و ویست و ئارەزووی خودادا من دەتوانم چیبکەم.

حاجی حەسەن ڕوویکردە براکەی تری حاجی مەحمود ئاغا و لێپرسی ئەرێ براکەم تۆ بەرەوای دەزانی کە من تەمەنم (٧٥) ساڵە مۆڵەتبدەم دکتۆری نامەحرەم بێتە ماڵەکەم و بچێتە ژێر سەری کچەکەم؟ ئاخر نوێژ و ڕۆژو و حەج و هەمووی خێر و چاکەی کە لەماوەی (٧٠) ساڵدا کردوومە هەمووی بە با دەڕوات. لەودنیا بەبێ هیچ وەڵام و پرسیارێک دەچمە دۆزەخ. میرزا عەلی ئەکبەر ئانی کە تەمەنی (٦٥) ساڵ بوو دەستی بۆ ڕیشە سپییەکەی برد و گوتی: حاجی لێپرسراوی یەکەم لەبەر دەرگای خودا مێردەکەیەتی، با لە عەباس ئاغا بپرسین ئەگەر ئەو مۆڵەتبدات کە دکتۆری پیاو بهێنێت بۆ ژنەکەی ئەوا ئەو لەودنیا وەڵامی خودا دەداتەوە. هەر کەسێکیش دەچێتە گۆڕی خۆیەوە. حاجی گوتی: ئاغا میرزا هەڵسە بڕۆ بۆ ژووری ژێرمێریاری خەرکی ڕێکخستنی حیساباتی خەڵکبە، ژنێک منداڵی دەبێت خۆ ناکرێت ئیشوکاری خەڵک پەکی بکەوێت. ئاغا میرزا لە کاتی هەڵساندا، گوتی: حاجی مەڵێ خەریکە منداڵی دەبێت، بڵێ خەریکە دەمرێت. ئاخر منداڵبوون کاتێکی کەمی دەوێت بەڵام ئەم داماوە ئەوە چوار ڕۆژە بەگیانەوەیە. حاجی بەتووڕەییەوە گوتی: هیچ پەیوەندی بەتۆوە نییە، هەڵسە خێرا بڕۆ سەر کارەکەت. میرزا عەلی ئەکبەر پیاوێکی دیندار بوو ڕیشی دەهێشتەوە و دەچووە لای شێخ و دەچووە خانەقا و هەمیشە لە مزگەوت نوێژی دەکرد. شەوانی سێشەممە چەند کەسێکی لە ماڵەکەی خویدا کۆدەکردەوە و هۆنراوەیان دەخوێندەوە و لێکدانەوەیان بۆهۆنراوەکان دەکرد، هەمیشە لەگەڵ حاجیدا دەنگە دەنگ و هەرایان بوو.

میرزا دەیویست لە حوجرەی حاجیدا هۆنراوەکانی مەولەوی بخوێنێتەوە و حاجیش پێیدەیگوت تۆ بە هۆنراوەکانی ئەم شاعیرە سوونەیە حوجرەکەی منیش پیس دەکەیت. میرزاش پێیدەگوت ئەگەر تۆ ئەوەندەی چۆلەکەیەک هۆش و بیرت هەبووایە، بوختانت بۆ دیوانی شەمس و دیوانی مەولانا نەدەکرد. هەرکاتێک کە دەمەقاڵەیان دەبوو ئاغا میرزا یەک هەفتە نەدەچووە دوکانەکەی. پاشان حاجی حەسەن ناچار دەچووە ماڵیان و دەیگوت پوورزا گیان خۆ من قسەیەکی خراپم نەکردووە خێرا وەرەوە، ئێستا من ئەم حیساباتانە بە کێ بسپێرم. میرزا دەیگوت: بەندەی خودا بیربکەرەوە خۆ من مردم. حاجی حەسەن ئاغا دەیگوت: ئێستا کە نەمردووی. بڕیاریاندەدا کە ئاغا میرزا لە دوکانەکە هۆنراوەکانی مەولانا نەخوێنێتەوە و حاجیش قسەی ناشیرین بە دیوان شەمسی تەورێزی نەڵێت. دواتر میرزا دەچووەوە بۆ دوکانەکە. بەڵام دووبارە هۆنراوەکانی مەولانای دەخوێندەوە، حەسەن ئاغاش هەرچی قسەی بەدەمدا بهاتایە لە

قسەی ناشرین پێیدەگوت. ئەم دووکەسە کە خزمی یەکتریش بوون لە کاتی سەرمەرگ و منداڵبوونی زەهراش دا هەر دەنگە دەنگیان بوو.

ئاغا میرزا چەند هەنگاوێک ڕۆیشت و گەڕایەوە، گوتی: حاجی حەسەن ئاغا، من ڕێگەیەکی شەرعیم بەخەیاڵدا هاتووە، ئەگەر تۆ پەسەندی بکەیت دەتوانی پزیشکێکی پیاو بهێنیت بۆ زەهرا و ناشچیتە دۆزەخ. ئاخر هەرچەندە حاجی ئاغا و حاجی مەحمودی ئاغای سووی پارەیان دەخوارد و ئەم ئاغا میرزایە ڕێگەیەکی شەرعی بۆ دەدۆزیتەوە، ئاغا میرزا جەواد هەموو دەلالیەکی ناوبازڕی بۆ دەکردن و باخ و زەوی جوتیارانی بەتالان فرۆش دەدا و دەیکردنە دەستی حاجی حەسەن و ڕێگەیەکی حیلەشەرعی بۆ دەدۆزیەوە. ئاغا میرزا کە نەیدەویست زەهرا بمرێت و ئەگەر ڕێگەیەکی شەرعی بدۆزێتەوە ئەوا حاجی حەسەن مۆڵەتدەدات کە پزیشکی پیاو چارەسەری کچەکەی بکات، ڕێگەچارەیەکی پێشنیارکرد. زهرا یەکەمجاری نەبوو منداڵی ببێت و کچێکی سێ ساڵانی تریشی هەبوو. جاری یەکەم زۆر بەئاسانی و بێ کێشە منداڵی ببوو. ئاغا میرزا گوتی: کچە سێ ساڵانەکەی زەهرا لە پزیشک مارە دەبڕین. ئیتر پزیشک دەبێتە زاوای زەهرا و دەبێتە مەحرەم!. ئەوکات دەتوانێت چارەسەری زەهرا بکات. حاجی عەلی ئاغا کە تا ئەو کاتە بێدەنگ دانیشتبوو، گوتی: ئەمە ڕێگە چارەیەکی دەروێشییە. ڕوویکردە ئاغا میرزا و پێیگوت: پوورزا بەڕاستی دەروێشیت. چونکە زاوا لەگەڵ دایکی ژن دەبنە مەحرەم و دەتوانن بەیەکەوە قسە بکەن. بەڵام لە گەشتێکدا یاخود لە هەر شوێنێک ڕووی یەکتری ببینن تاوان نییە. بەڵام لە کوێی شەرعدا هاتووە کە زاوا دەست لە لەشولاری خەسووی بدات؟ بەبێ هۆ نییە کە گوتویانە ئێوەی دەروێش دین و ئیمانێکی ڕاستیتان نییە. ئاغا میرزا گوتی: من لەهەموو تەمەنمدا دژایەتی ئەم سێ برایەم نەکردووە. هەمیشە باشەی هەرسێکتانم ویستووە. ئەوا من دەڕۆم بۆ دوکانەکە و هیوادارم خودای گەورە تەمەنی زهرا درێژ بکات.

ئیتر هەموو پیاوەکان هەڵسان وماڵئاواییان کردو ڕۆیشتن. پاشان هاوسەری زەهرا ڕوویکردە لایەنگرانی حاجی حەسەن و گوتی: مامە گیان، چەندین ساڵە دکتۆر نەجیبیان لە یەزد باشترین کاری کردووە، بەهیچ شێوەیەک دەست لە ژنان نادات بەمقاشێکی ئاسن منداڵەکە دەگرێت و دەریدەکات. حاجی حەسەن گوتی: تەمەن بەدەست خودایە. ژنەکەت منداڵی دەبێت و هیچ شتێکیش ڕوونادات. عەباس ئاغا گوتی: مامە حاجی هەر ئەم هەفتەیەش ژنی عەلی ئەسغەری دراوسێمان بەسەر منداڵەوە چوو. سێ هەفتە پێشتر ژنی حەسەن مەندە ڕەسوڵی کرێکاری کارگەی ئیقبال یش هەر بەسەر منداڵەوە چوو. دیارە ژنان بەسەر منداڵەوە دەمرن. حاجی گوتی: ئاخر ئەوان ڕۆنی زەرد و بستە

و پاقلاوەیان نەخواردبوو، بێهێز بوون بۆیە بەسەر منداڵەوە چوون و مردن. عەباس ئاغا گوتی: دایکی محەمەد عەلی کە کچی تۆ بوو (١٥) ساڵ لەمەوبەر مرد، خۆ بستە و ڕۆنی زەرد و پاقلاوەی خواردبوو، ئەی بۆچی مرد. حاجی گوتی: تەمەنی تەواو ببوو بۆیە مرد. کاتێک کە ئەجەل هات سەدان دکتۆر نەجیبیان ناتوانن ڕێگری لێبکەن. حاجی گوتی: من چاکەی تۆ و کچەکەی خۆمم دەوێت. چونکە ئەگەر دکتۆری پیاو بهێنیت بۆ چارەسەری ژنەکەت ئەوا سبەی خەڵک لە بازاڕ و کۆلاندا بەچاوی سووک سەیرت دەکەن و توانجت تێدەگرن و پێتدەڵێن کرێن و فرۆشتن بەم پیاوە بێ غیرەتە حەرامە، خۆ ئەگەر هەموو دەروازەی شار ببەستی ناتوانیت دەمی خەڵک ببەستیت. ئینجا مێردی زەهرا گوتی: هەرچی مامم بیڵێت من دەیخەمە سەرچاوم.

من و چەند منداڵێکی تر چاوەڕوانی دایکمان بووین. محەمەد عەلیش بەگریانەوە ڕۆیشتبوو، حاجی یش تەزبیحی بەدەستەوە گرتبوو، لا هی لا الا اللەی دەکرد، سەغەری لە ژوورەوە هاتە دەرەوە و گوتی: چوار ڕۆژە ئەم داماوە بە منداڵەوەیە، هیچ کەسێک نییە کەمێک ئەسفەندی بۆ بسووتێنێت و کەسێک هێلکەیەکی بۆ نەشکاندووە. سەغەری ڕۆیشت بەرەو ماڵەوە پاش چەند خولەکێک گەڕایەوە. هەندێ ئەسفەندی هێنابوو لە حەوشەکەدا ئاگری تێبەردا و ئەو ناوەی هەموو کرد بە دوکەڵ و گوتی: حاجی ئایەتەلکورسی بخوێنە و خێرا نزا بکە. بەئەکبەری هاوتەمەنی منیشی گوت: خێرا بڕۆ لە دوکانی ئاغا محەمەد دوو هێلکە بهێنە. ئەمە چاوەزار کاری تێکردووە، دەنا تائێستا منداڵەکەی هەر دەبوو. حاجی گوتی: تۆ سەیری ئەم ژنە ناکەیت، لەسەر حیسابی من چ پارەیەک سەرفدەکات. ئاخر هێلکە بخرێتە ناو ئاگرەوە هێزی کەمەر زیاد دەکات؟ ڕوویکردە ئەکبەر و گوتی: پێویست ناکات بچیت هێلکە بهێنیت، ئەسغەریش ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە. پاشان منداڵان بە سەغەریان گوت: بەدایکمان بڵێ بێنە دەرەوە تا بڕۆینەوە. حاجی حەسەن گوتی: داخی ئەم ژنانەی گەڕەک، چۆن ماڵیان قەرەباڵغ کردووین. نزیکی نیوەڕۆ بوو، دایکم و چەند ژنێکی تر هاتنە دەرەوە و هەرکەس ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆی و گوتیان: زەهرا کچێکی بووە. سەغەری گوتبووی: سووتانی ئەسفەندەکەی ئەو و نزاکانی بوونە هۆی ئەوەی زەهرا ڕزگاری ببێت. کاتی خۆئاوابوون بوو لە ماڵی حاجی بوو بەشیوەن و گریان و گوتیان زەهرا مرد. لە مزگەوتی گەڕەک پرسەیان بۆ دانا و سەرەخۆشیان لە حاجی دەکرد. ئیتر هەموو ڕۆژێک لە ماڵی حاجی حەسەن ئاغا دەبووە دەنگە دەنگ و هەرا و محەمەد عەلی جوێنی دەدا بە باپیری و هەموو مامانەکان. حاجی حەسەنیش بەنزا خوێندن لە داخا لە ماڵەوە دەڕۆیشتە دەرەوە. لە کۆلاندا سەلاواتی لێدەدا. جار جاریش دەیگوت: خودای گەورە، من چ کارێکم کردووە وا

تووشـم بـوو بە تووشـی ئەم بەچـکە سـەگەوە. بـاوکی مـحەمەد عەلـی یـش هەر دوای مردنـی ژنەکەی لەگەڵ حـاجی حەسـەنی خەزوریـدا کردبـووی بەشـەڕ و پێیگوتبـوو: تـۆ نەتهێشت ژنەکەم ببەم بۆ نەخۆشخانە، دەنا نەدەمرد. پاش چەند مانگێک ژنی هێنابووەوە. سـاڵی جـارێکیش هەواڵـی کـوڕەکەی نەدەپرسـی. بـۆیە مـحەمەد عەلـی هەمـوو ڕۆژێـک هـاواری دەکـرد و جـوێنی دەداو دەیگـوت: ئێـوە مێشـکی کەرتـان هەیە. ئێـوە دایکـم و پوورمتـان کوشـت. ئەوەتـا نەخۆشـخانە و دەرمـان و پزیشـک هەیە. بـۆچی نەتـانبردن بۆلای پزیشک و نەخۆشخانە... چلەی زەهرا کۆتاییهات. بەڵام نەمزانی ڕۆژی چلەکەی چ ڕۆژێک بوو، ئەوەندە دەزانم کە زستان بوو، ڕۆژێک بـوو کە دەیـانگوت ژنـان بۆیـانهەیە بچنە سەر سندوق و دەنگبدەن. حـاجی حەسـەن و براکانی بەژنەکانیـان گوتبـوو، ئەگەر بچن دەنگبدەن، ئەوە حەرامە و تەڵاقتان نامێنێت. ژنـی دامـاویش لەناچاریدا لە ژوورەوە مـابوونەوە. مەلـوک خـانم سەردەسـتەی ژنە هەژارەکـانی کـۆڵانی ئـێمە. هەمـوو ژنـانی کۆکردبووەوە و بردبوونی بـۆ دەنگدان. دوای دەنگدان تێکڕا چووبـوونە چـلەی زەهـرا. لێرەدا ژنـان ببـوون بە دوو بەش، لەسـەر دەنگدان و نەهێنـانی پزیشـک بـۆلای نەخـۆش. ژنی حاجی حەسەن گوتبووی ئێوە کارێکی خراپتان کردووە کە ڕۆیشتوون بۆ دەنگدان. ئەوانیش پێیان گوتبوو تۆ و پیاوە سووخۆرەکەت کـارێکی خراپتـان کرد کە پزیشکتان نەهێنـا و هێشـتتان زەهـرا بمرێت. ژنـی حـاجی پێـی گوتبـوون، ئێـوە هەڵەدەکەن کاتێـک خەریکە منداڵتان دەبێت خۆتان دەخەنە ژێر دەستی پزیشکی پیاو و دیسـان هەڵەشـتان کردووە کە هاتوون بۆ چلەی کچی من. بەتول کە بڕیاریـدابوو شـیر بـدات بە منداڵەکەی زەهـرا، گوتبـووی حـاجی فەرەنگیـز خـانم جـوێنی بەمـن داوە، ئیتـر مـن شـیر نـادەم بە منداڵەکەیان. پووریشـم پێـی گوتبـوو ئەم منداڵە بەستەزمانە تـاوانی چییە؟ خـودا قبـوڵ ناکات شیرەکەی لێببڕیت. ئەوەبوو بەتولیان ڕازییکرد کە لەکاتی خۆیدا بچێت شیر بـدات بە منداڵەکە. تاچەند مانگێک دوای مردنی زەهـرا لەبەردەم دوکـانی ئاغـا مـحەمەد کە من ماوەیەک چیرۆکم لی دەخوێندوە و لەبەردەم دەرگای ماڵی بیبی هاجەر بـاس باسـی ئەو ژنانە بوو کە بەسەر منداڵەوە مردبوون و باسی پزیشکی پیاو و دەنگدانی ژنان دەکرا.

چـوار مانـگ دوای مردنـی زەهـرا، ژنـی ئاغـا مەسـنور وادەی منـداڵبوونی بـوو، ئاغـا مەنسـور کە خـۆی لە هیندسـتان کـاری دەکـرد، لەبەر خـاتری ژنەکەی بەزوویـی هـاتبووەوە. ئەو ڕۆژە کە ژنەکەی خەیک بـوو منداڵی ببێت بە خێرایی تاکسـی گـرت و بردی بۆ نەخۆشخانە. دووبارە لە ماڵی حاجی حەسەن ئاغا دا دەنگە دەنگ پەیدابووەوە. محەمەد عەلـی جوێنی دەدا بەباپیرەی و دیگوت لە ئاغـا مەنسـورەوە فێرببن کە چـۆن ژنەکەی گەیاندە نەخۆشـخانە و بەبێ کێشـە منداڵەکە لەدایکبـوو، ئاغـا مەنسـور خزمـی

حاجی حەسەن بوو، زۆر هاوکاری محەمەدیان دەکرد. محەمەد عەلی پاش جوێندانی بە باپیرەی سواری پاسکیلەکەی بوو ڕۆیشت بۆ بەردەمی نەخۆشخانە و پاشان بەپاسکیلەکەی لە کۆلانەکاندا دەگەڕا و هاواریدەکرد و دەیگوت ئەوەتا ژنی ئاغا مەنسور لە نەخۆشخانە لە ژێر دەستی دکتۆر نەجیبیان زۆر بە بێ کێشە دوو منداڵی بەیەکەوە بووە.

کاتی خەتەنە سوران، حاجی حەسەن بە ئاغا مەنسوری گوتبوو، خۆ ئەگەر ژنەکەت بۆ نەخۆشخانە نەبردایە هەر بەبێ کێشە لە ماڵەوە منداڵەکان لەدایکدەبوون ئاغا مەنسوریش پێی گوتبوو، وانییە ئەوەتا کچەکەی تۆ بەیەک منداڵەوە لە ماڵەوە مرد، چۆن ژنەکەی من بە دوو منداڵەوە نەدەمرد. باسی مەحرەم و نامەحرەمی پزیشکی پیاو هاتبووە پێشەوە. ئاغا مەنسور گوتبووی من چەند ڕۆژێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ هیندستان بۆ کارکردن. بە ژنەکەی خۆمم گوتووە دەستی پزیشکی پیاو بۆ هەموو شوێنێکی تۆ مەحرەمە. حاجی حەسەن و براکانی بەم قسانە تووڕە دەبن و کۆڕەکە جێدەهێڵن. ئێستا کە من تەمەنم (٦١) ساڵە و (٤٨) ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕیوە، محەمەد عەلی کە دوو ساڵ لە من گەورەترە لە تاران بازرگانە و زوو زوو یەکتری دەبینین؛ دەیگوت بەردەوام ئەم پیاوە کۆنانە بوونەتە هۆی مردنی سەدان ژنی وەک دایکم و پوورم.

## وازهێنان لە بەشی زانستی و چوون بۆ بەشی وێژەیی

من هەمیشە خولیای بەشی زانستی بووم بەتایبەت ئەندازە، بۆیە ویستم بچمە بەشی زانستی. لە سەرتاسەری شاری یەزددا تەنها ئامادەیی ئێرانشەهر زانستی بوو. بۆیە دەبوو بچمە ئەو قوتابخانەیە، ئاغای ناسری مەهریزی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بوو. پیاوێکی زۆر بەڕێز و جددی بوو بۆ ناونووسکردن و وەرگرتنی خوێندکاران. هەمیشە هەوڵیدەدا باشترین خوێندکار وەربگرێت. لەو سەردەمەدا بڕی (١٣٦) تومەن لە هەر خوێندکارێک وەردەگیرا بۆ ناونووسکردنی. حاجی ناسری مەهریزی پێیگوتم: بۆ ناونووسکردن دەبێت سەرەتا پارەکە بەتەواوی بدەیت. نەمدەزانی کە ئەو پارەیە لە هەموو کەس وەردەگرن یا تەنها داوا لە من دەکات. چونکە ئەم بڕە پارەیە زۆر بوو، لە توانای دایکمدا نەبوو. لەو بەشە پارە میراتییەی لای کوڕی مامم هەمبوو کەمێک پارەم مابووەوە. بۆیە سەردانم کرد و پێمگوت: بۆ ناونووسکردنم لە قوتابخانە، دەبێت (١٣٦) تومەن بدەم.

حاجی جەواد ئاغا وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی چەند ڕۆژێک پێدانی پارەکەمی دواخست، بەڵام لە کۆتاییدا پارەکەم لێوەرگرت و چووم بۆ ئامادەیی ئێرانشەهر و لە بەشی زانستی لە پۆلی یەکەمی زانستی خۆم ناونووس کرد. پۆلەکانی قوتابخانەی ئێرانشەهر وەک پۆلەکانی ئەم سەردەمە نەبوون، کە پەنجەرەی گەورەیان تێدابێت، ئەوکات پۆلەکان دەرگای تەسک و بڵندیان هەبوو، کە پانی دەرگاکە (٨٠سم) بوو و بەرزیەکەیشی (٢,٥مەتر) بوو. دەرگاکان موشەبەک بوون و شووشەیان تێدابوو. خوێندکارانی پۆلی زانستی لە تەواوی سنووری قەزای یەزدەوە هاتبوون، ئەوکات یەزد قەزا بوو، نەکرابوو بە پارێزگا. چەند کەسێک لە بافق و بەهاباد، چەند کەسێک لە خۆر و بیابانەک و جەنقەد، دوو کەس لە تەفت، دوو کەس لە مەهریز، سێ چوار کەس لە ئەردەکان و موبید و نزیکەی (١٠) کەسیش لە یەزدەوە هاتبوون. تێکڕا ژمارەی

خوێندکارانی پۆلەکەمان (٣٠) خوێنکار دەبووین. من خوێندکارێکی زۆر بزێو بووم، لە پۆلدا لەگەڵ هەموو خوێندکارەکاندا شەڕەشەق و یارییم دەکرد. هەندێک جار بەسەر مێزی خوێندکارەکاندا دەڕۆیشتم. لە ماوەی هەفتەیەکدا تەواوی خوێندکارانی پۆلەکەم ناسی و لەگەڵ هەموویان بووم بە هاوڕێ. ئەوانیش هەموویان منیان دەناسی چونکە زۆر بزێو بووم، بەڵام شەڕانی نەبووم.

جەوادی سەراجان، کە یەکێک بوو لە هاوڕێیان و هاوپۆلی ساڵانی رابردووم، ئەویش ئەوکات لە هەمان پۆلدا بوو. ئێمە هەمیشە دژایەتی یەکترمان دەکرد و یەکترمان خۆشنەدەویست، چەندجارێکیش بەیەکەوە شەڕمان کرد. بەهۆی بەشداریکردنی خزمێکی ئەو لە شەڕەکەماندا کێشەکە گەورەبوو. من و جەواد ماوەیەکی زۆر دژایەتی یەکترمان دەکرد. ئەو لە ناوەندی چوو بووە قوتابخانەیەک و من لە قوتابخانەیەکی تربووم، پاش سێ ساڵ دوبارە بووینەوە هاوپۆل، بەڵام هێشتا وەک ئەو زیرەک نەبووم بەتایبەت لە تاقیکردنەوەی کۆتایی شەشەمی سەرەتاییدا، تێکڕای نمرەی من لە نمرەکانی ئەو نزمتر بوو. ڕەنگە ئەوە هۆیەک بووبێت بۆ ئەوی دژایەتی بکەم. لە تاقیکردنەوەی پۆلی شەشەم لە من لە ڕێنووسدا (هەژدە)م وەرگرتبوو، هەر ئەم دوو نمرەیە بوو کە بووە هۆی ئەوەی سەراجان و نەجاریان و تەرمەلاف. لە پێش منەوەبن. من هەمیشە لە قوتابخانە یان یەکەم بووم، یان دووەم، بەڵام لە تاقیکردنەوەی کۆتایی پۆلی شەشەمدا بووم بەچوارەم . هەمیشە پیتی (ص) م سەرەوخوار دەنووسی. ئاغای فەرەحناک باشترین مامۆستای سەرەتایی من بوو (ص) ی سەرەوخواری بەهەڵە بۆ هەژماردەکردم، باوەڕ بکەن ئێستاش ڕۆژی چەند جارێک ڕووی خۆشەویستی ئاغای فەرەحناک دێتەوە بەرچاوم.

هەرکاتێک وشەیەک دەنووسم کە پیتی (ص) ی تیا بێت، ڕاستەوخۆ ئەو بیرەوەرییەم دێتەوە یاد، کێشەکەم لەگەڵ جەوادی سەراجان دا پێش تاقیکردنەوەی پۆلی شەشەمی سەرەتایی بوو. لە بەردەم مزگەوتی گەڕەکەکەماندا ڕوویدا، قوتابخانە داخرابوو، ئێمەی منداڵان هەموو لە کۆڵان بووین نازانم چی ڕوویدا کە بوو بە شەڕمان و پەلاماری یەکتریماندا. کۆبوونەوەی منداڵان ڕێگەی کۆڵانە تەسکەکەی بەتەواوی گرتبوو. ئەوەندم زانی لە پشتەوە بۆکسێکی بەهێزیان لە پشتی ملم سرەواند، کە ئاوڕمدایەوە، سەیرمکرد ڕەزای سەراجی بوو کە پێیاندەگوت ڕەزا ڕەش، تەمەنی (٤٥) ساڵ بوو، خزمی سەراجان بوو. منیش لەبری ئەوەی کە بترسم، کردم بە هەرا و یەخەیم گرت و گوتم: تۆ چۆن لە من دەدەیت؟ ئێمە دوو منداڵ شەڕدەکەین، تۆ دەبوایە ناوبژیت بکردینایە، نەک لە من بدەیت! توند یەخەیم گرتبوو، بەرمنەدەدا. ئەویش داماوە جەسارەتی

نەدەکرد، کە دووبارە لێم بداتەوە، تا من بترسێنێت. نەشیدەتوانی خۆی لە من ڕزگار بکات. نزیکەی (١٠٠) خوێندکار لەوێ لایەنگری منیان دەکرد، کاتێک کە تەنها من و سەراجان شەڕمان بوو خوێندکارەکان تەنها تەماشاکەر بوون. هیچ کەسێک لایەنگیریی کەسمانی نەدەکرد. بەڵام کاتێک کەسێکی گەورەتر لە منیدا ڕووداوەکە گۆڕا، پاشان ڕێکخەری قوتابخانە هات و منیش یەخەی ڕەزا ڕەشم بەردا و گوتم: مامۆستا ئەم پیاوە لێیدام. ڕەزا ڕەش لە شەقامی ئێرانشەهر لە سەر کۆڵانی ئاب تفت دوکانی وردە فرۆشی هەبوو. خەڵکی گەڕەک بوو هەموو کەس ئەویان دەناسی، خۆی دانی پێدانا کە هەڵەی کردووە، دەبوو لێکی بکردنایەوە و نەهێشتایە شەڕ بکەین. نەوەک لە من بدات. دیارە ڕووداوەکەی ڕەزا ڕەش کۆتایی نەهات، خزمێکی من کە ناوی حاجی محەمەد عەلی (مەندەلی) پاپولی بوو، ماڵیان لە هەمان کۆڵان بوو، دراوسێی دوکانی ڕەزا ڕەش بوو. حاجی محەمەد عەلی پیاوێکی باڵابەرز بوو، ئەو بەهۆی نەخۆشییەوە لە تەمەنی (٧٠) ساڵیدا کوێربببوو، عەسران لە شەقامەکان پیاسەیەکی کورتی دەکرد و لەبەردەم دوکانی ڕەزا ڕەش ماوەیەک دادەنیشت و لەگەڵ چەند پیاوێکی هاوتەمەنی خۆی کورسییان دادەنا و دادەنیشتن و دەستیاندەکرد بەقسەی خۆش و نوکتە گێڕانەوە. ڕۆژی دواتر هەواڵی شەڕەکەی من و سەراجانی بیستبوو. زانیبووی کە ڕەزا ڕەش لە منی داوە. بۆیە چووبووە دوکانی ڕەزا ڕەش و پێیگوتبوو وەکو زانیومە لە حسێنی کوڕی میرزا ئەحمەدت داوە. ڕەزا ڕەش یش گوتبووی بەخودا من ڕووبەڕوو ئەوم نەبینی بوو، نەمزانی کە حسێنە هەتا لێم نەدا، پاشان کە زانیم ئەوە دەستبەجێ پەشیمان بوومەوە. حاجیش بەڕەزای گوتبوو مادام وایە وەرە پێش، ڕەزاش لێی نزیک ببووەوە. دواتر گوتبووی پشتم تێبکە، ڕەزا پشتی تێکردبوو. حاجی بە دارەکەی دەستی چەند دارێکی لێ دابوو. ئنجا گوتبووی ئەوا من کوێرم و ڕووی تۆم نەدیوە و ناتناسم چەند دارێکم لێداویت. ئیتر جارێکی تر هەڵەی وا نەکەیت لە خزم و کەسی من بدەیت. کێشەی من و سەراجان تێیگەیاندم کە لە نێوان خەڵکی عەشایەردا خزمایەتی و کەسایەتی لە هەموو شتێک لەپێشترە. حاجی عەلی کە هەمیشە لەبەردەم دوکانی ڕەزا ڕەشدا دادەنیشێت دۆستایەتی و برادەری وەلا نابوو، لەپێناوی خزمایەتی و کەسایەتیدا لە ڕەزا ڕەشی دابوو. واتە یەکەمجار خزم و کەس پاشان هاوڕێیەتی. با بگەڕێینەوە بۆ بنچینەی بابەتەکە، لە پۆلەکەدا بەسەر مێزەکاندا ڕامدەکرد. ئاغای ناسری مەهرزی کە بەڕێوەبەری قوتابخانە بوو لە پشتەوە چاوی لێم بوو. جەوادی سەراجان هاوڕێ و ناحەزی کۆنم گوتی: ناسیر مەهریزیی لەپشت سەرتەوەیە تکایە دانیشە. منیش بەهۆی کێشەی کۆنمانەوە وامزانی دەیەوێت بمترسێنێت بۆیە گوتم: نەعلەت لە کەللەسەری

باوكی تۆش و ناسری مەهریزی كە ئێستا پاش (٤٥) ساڵ ڕاست و ڕەوان ئەو ڕستەیەم لەبیرنەماوە كە گوتم. بەڵام هەمان مانای ئەو ڕستەیەی هەیە، ئاغای ناسری مەهریزی هاتبووە پۆلەوە لە پشت سەرمەوە ڕاوەستابوو كە دارەكەی دەستی كێشا بەسەرشانمدا، كە ئاوڕمدایەوە ئیتر زانیم كە ئاغای ناسری مەهریزییە. بەڕێوەبەر پێیگوتم: وادەزانی ئێرەش گەراجی ئەتمینانە؟ من دەمتدەگرم و وەك مشك لە قوتابخانە دەتكەمە دەرەوە. منیش بێئەوەی بیر بكەمەوە گوتم: ئاغا گیان پێشئەوەی تۆ دەرم بكەیت من خۆم دەڕۆم. بەڕێوەبەر گوتی: بۆكوێ دەچیت؟ گوتم: دەچم بۆ بەشی وێژەیی. ئەوكاتە لە هەموو شاری یەزدا جگە لەو قوتابخانەیە هیچ قوتابخانە و پۆلێكی تری زانستی نەبوو. منیش بچوومایە كوێ بۆ بەشی زانستی، یاخود دەبوایە بمگوتایە دەچمە تاران یا ئەسفەهان وەیا كرمان، چونكە هیچ شوێنێكی تر نەبوو. هەڵبەت ئەوەش بۆ من نەدەگونجا، بۆیە دەبوایە هەر بچمە بەشی وێژەیی. هاوكات ئاغا هەمەدانیان كە باشترین مامۆستای زانستیی بوو هاتە پۆلەوە و ڕێزێكی بۆ بەڕێوەبەر نواند و بەڕێوەبەیش لە پۆل ڕۆیشتە دەرەوە. هەمان كات وانەی جەبرمان هەبوو. من باشترین خوێندكاری زانستیی بووم. نیو كاتژمێر تێپەڕی نەكردبوو، كە ئاغای ناسری مەهریز ئەو پیاوە باڵابەرز و جوانپۆشە، بەخۆی و دارەكەی كە هەمیشە بەدەستیەوە بوو چەند دارێكی بەهێواشی لە دەرگاكەدا و مامۆستاش بەڕێزەوە فەرمووی لێكرد و هاتە ژوورەوە . فایلێكی بەدەستەوە بوو، گوتی: ئەوە ئاغای پاپولی دەیەوێت لێرە تەشریفی بڕوات و دەیەوێت بچێتە بەشی وێژەیی، ئەوەش فایلی گواستنەوەكەیەتی. منیش لە جێگەی خۆم هەڵسام و ڕۆیشتمە بەردەمی. پاشان ئاغای هەمەدانیان بە بەڕێوەبەری گوت: چۆن ئاغای پاپولی دەیەوێت بڕوات بۆ بەشی وێژەیی؟ لە كاتێكدا ئەو یەكێكە لە باشترین خوێندكارانی زانستیی. بەڕێوەبەر گوتی: هەرچۆنێك بێت ئەو خۆی حەز دەكات بڕوات بۆ بەشی وێژەیی و ئێستا با بڕوات و فەرموو ئەوەش فایلەكەی. منیش فایلەكەم لێوەرگرت و بێئەوەی یەك قسەبكەم لە پۆل ڕۆیشتمە دەرەوە. لەو كاتەوە تا ئێستا هیچ پەشیمان نیم.

لە تەواوی شاردا تەنها یەك قوتابخانەی وێژەیی هەبوو. هەر وەكو بەشی زنستی واتە قوتابخانەی ڕوكنییە لە گەڕەكی قەڵای كۆن. قوتابخانەكە لە ماڵی ئێمەوە دوور بوو، ماڵی ئێمە لەمسەری شار و قوتابخانەكەش لەوسەری شار بوو. لانیكەم دووریی نێوان ماڵی ئێمە و قوتابخانە پێنج كیلۆمەتر دەبوو، نزیكەی مانگێك دەبوو قوتابخانە كرابووەوە. پارەشم نەبوو، چۆن باسی بكەم بڵێم لە قوتابخانە دەركراوم بەم بیرو خەیاڵەوە ڕۆیشتم بۆ قوتابخانەی ڕوكنییە. خوداڵێخۆشبوو شێخ عەلی ئەتوڵڵاهی

بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بوو. من ئەوم باش دەناسی کە مەلا و وتاربێژێکی وریابوو. بەڵام ئەو منی نەدەناسی، چوومە ژوورەوە بۆلای و گوتم: هاتوم ناوم لێرە تۆماربکەم، لێپرسیم ئەی تائێستا لە کوێ بوویت؟ فایلەکەمم دایەدەستی و گوتم: من لە بەشی زانستیی بوم، ئێستا دەمەوێت بێمە بەشی وێژەیی. گوتی: باشە (١٣٦) تومەن بهێنە با ناوت بنووسم. گوتم: پارەم نییە! گوتی: چۆن پارەت نییە، ئەی بۆ لە بەشی زانستیی (١٣٦) تومەنت داوە؟ گوتم: تەنها ئەوەندەم پارە هەبوو، ئەویشم دا بە بەشی زانستیی ئێستا هیچ پارەیەکی ترم نییە. پاشان گوتی: بەبێ پارە ناوی کەس تومارناکەین، بڕۆ پارەکە بهێنە. ناچار هاتمە دەرەوە و دڵنیابووم کە دایکم پارەی نییە و ناشتوانێت پارەم بۆ پەیدا بکات. پوورێشم هەر پارەی نەبوو. حاجی جەوادی کوڕی مامم پارەی بۆ دابووم و ئیتر پارەی تری نەدەدا، خۆ حاجی جەواد لەپارەی خۆم پارەکەی دابوو. خۆم پارەم هەبوو لای حاجی جەواد، بەڵام کەمکەم پارەکەی دەدامی. ڕەنگە ئەو (١٣٦) تومەنەی کە پێیدابووم زۆر ترین بڕە پارە بووبێت، نەمدەویست بە کوڕی مامم بڵێم کە وازم لە بەشی زانستیی هێناوە و چوومەتە بەشی وێژەیی، ئیتر نەمدەزانی چیبکەم. هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە بچمەوە قوتابخانەی زانستیی و داوای لێبوردن لە بەڕێوەبەر بکەم. مێردی کچی مامم خوداڵێخۆشبوو فەرزوڵڵای بەشارەتی بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی تربوو. وام بەباش زانی کە سەردانێکی بکەم و نامەیەکی لێوەربگرم تا ئاغا شێخ عەلی بە شەش تومەن ناوم تۆماربکات، چونکە شەش تومەن پەیدا دەبوو. بۆیە چووم بۆلا و پێمگوت: حەز لە بەشی زانستیی ناکەم بۆیە دەمەوێت بچمە بەشی وێژەیی. ئاغا فەرزوڵڵا فەرمووی (٣٥) ڕۆژە قوتابخانە کراوەتەوە کوا تازە ناودەنووسن. باسی پارەم نەکرد و تکام لێکرد نامەیەک بۆ ئاغا شێخ عەلی بنووسێت. ئەویش گوتی: حسێن تۆ لە بەشی زانستییدا زۆر زیرەک بوویت بۆ دەچیتە وێژەیی؟ گوتم: زۆر حەز لە وێژەیی دەکەم، بەهەرحاڵ قەناعەتم پێکرد، نامەیەکی بۆ ئاغا شێخ عەلی نووسی و منیش چووم بۆ ماڵەوە شەش تومەنم لە دایکم وەرگرت و ڕۆیشتمەوە بۆلای ئاغا شێخ عەلی، ئەویش گوتی: پارەت هێناوە؟ منیش نامەکەم دایەدەستی و ئاغا شێخ عەلی گوتی: تۆ چ پەیوەندییەکت بە ئاغا فەرزوڵڵاوە هەیە؟ گوتم: خێزانەکەی ئامۆزامە، ئیتر ئاغا شێخ عەلی گوتی: ئەگەر نامەی تەواوی ئەم شارەت بهێنایە و نامەی بەڕێوەبەری پەروەردەشت بهێنایە ناوم نەدەنووسیت، بەڵام لەبەرخاتری ئاغا فەرزوڵڵا جگە لە ناونووسین هەر کارێکی دیکەت هەبێت من بۆت ئەنجام دەدەم. کاتێک ئاغا شێخ عەلی فایلەکەی کردەوە سێ دانە دوو تومەنی تێدابوو، ئاغا شێخ عەلی گوتی: وەرە ئەو پارەیەش بەرەوە بۆ خۆت ئیتر ئەو بەبێ پارە ناوی نووسیم.

تەنهــا ســوعبەت و خۆبەزلزانینێـک بەتەواوی چارەنووســی منــی گــۆڕی، هەر لە سـەرەتاییەوە تەنهـا بیـرم لای بەشـی زانسـتیی بـوو، هەرگیـز بیـرم لە بەشـی وێژەیـی نەکردبـووەوە، چـونکە زۆرم حەز لە ئەنـدازە بـوو کە دەمویسـت بـبم بە فیسـاگۆرس. کاتێک (١٣٦) تومەنم دا و ناوم لە بەشی زانستیی تۆمارکرد وا بیرم دەکردەوە ڕۆژێک دێت دەبمە ئانیشتاین. ئێسـتاش بەم هەڵانەی کە کردم دەبێت ماڵئایی لە فیساگۆرس و ئانیشتاین بکەم، ڕۆژی (٦) ی ئابـان (٢٨-١٠) لە قوتابخـانەی ڕوکنییە لە پۆلی وێژەیـی دانیشـتم بەخـۆمم گـوت کە ئیتـر نـاتوانم بـبمە فیسـاگۆرس و ئانشـتاین، پێویسـتە بـبمە شـاعیرێکی گەورە. لە سـەردەمی نەوجەوانیدا وام بیردەکردەوە بۆ ئەوەی بـبمە شـاعیر پێویسـتە عاشـق بـبم. بەڵام دەبێـت عاشـقی کـێ بـبم خۆیشـم نەمـدەزانی! دەسـتمکرد بە لەبەرکردنی گوڵستان و بوستان و دیوانی حافز و لە ماوەی مانگێکدا هەمـوو کتێبەکانی ساڵی یەکەمی وێژەییم خوێندەوە جگە لە عەرەبی و ئینگلیزی. توانـایەکی باشـم هەبـوو، هەرشـتێکم بویسـتایە زوو لەبەرم دەکـرد. کتێبەکـانی بەشـی وێژەیـی زۆر پێویسـتی بە مامۆسـتا نەدەکـرد هەنـدێک وشــە نەبێـت کە واتاکەیـانم نەدەزانـی. ئاغـای کەیـانی کە مامۆستای ئەدەبیاتی فارسی بوو مامۆستایەکی زۆر زرنگ و هۆشیار و بەڕێز بوو، لە دەرەوەی قوتابخـانەش ڕێنمـایی باشــی دەکــردم و وانەی پێـدەگوتمەوە، بەرامـبەر بە وانەوتــنەوەی دەرەوەی قوتابخـــانەش هەرگیـــز ڕیـــاڵێکی لە مـــن و لە هـــیچ کەس وەرنەدەگـرت. زۆربـاش وانەکـانم دەخوێند لە مـاوەی (٦-٧) مانـگ تەواوی گوڵسـتان و بوستان و دیوانی حافزم لەبەرکرد. بەڵام هێشـتا هەر نەبووم بە شـاعیر، ئیتـر چیبکەم؟ دیســانەوە عاشـق بـوون ئێسـتا تەمەنـم گەیشـتوتە ١٥-١٦ سـاڵان و چـوومە ڕیـزی پیاوانەوە. پێویستە عاشقی کێ ببم تـاببمە شـاعیر، خۆیشـم نەمـدەزانی تەنهـا هەرکچێکم دەبینی بەچاوێکی کراوەووە سەیرم دەکرد، مەبەستم ئەوەبوو کە بەباشی سەیری بکەم تا عاشقی ببم و ببمە شاعیر دەبێت جێگرەوەی ئەنیشـتاین و فیسـاگۆرس دیـاری بکەم. بیـرم دەکـردەوە کە ئەگەر بەچـاوی کـراوەوە سـەیری کچـان بکەم عاشـق دەبـم. بەڵام سـەیری کـام کـچ بکەم؟ عاشـقی کـام کـچ بـبم؟ عاشـقی ئەو کـچەی دراوسـێمان کە لە منـداڵییەوە ئەوم بینیـوە و هەمـوو شـتێکی یەکتـری دەزانـین. کە ئەمە عاشـقبوون نییە. ئەگەر سەیری کچی خزمەکانم بکەم و عاشـقیان بـبم ئەوەش خیـانەتە بەبنەمـاڵەی خـۆم. نەمدەزانی بۆچی لە تەمەنی (١٥-١٦) ساڵیدا ئەگەر عاشـقی کچە خزمەکـانم بـبم دەبێتە خیــانەت ئەو کچــانەی کە لە دەوروبەرم بــوون (١٠-١٥) کەس دەبــوون. کە نەمتــوانی عاشقی هیچ کامێکیان ببم. پاشـان وردە وردە هـاتمە سـەر ئەو بـاوەڕەی کە نابێت ببمە شاعیر هۆیەکەشی ئەوە بوو کە لە بەشـی وێژەیـی ڕووبەڕووی مامۆسـتایەک بوومەوە

كه وانه‌كانی به‌لامه‌وه زۆر شیرین بوون و خۆشی هانده‌رێكی زۆر باش بوو بۆ زیاتر فێرووون. مامۆستایه‌ک بوو كه له‌شولاریشی دا وه‌ک ڕه‌وشتی جوان بوو، ئه‌ویش ئاغای جه‌لیلی ته‌ریبات، مامۆستای جوگرافیا بوو. هه‌ر ئه‌وه‌ش بوو هه‌ستمكرد كه وانه‌ی جوگرافیا له ته‌واوی وانه‌كانی به‌شی ویژه‌یی نزیكتره له به‌شی زانستییه‌وه، چونكه ئه‌ویش خالّی درێژی و پانی و به‌رزی هه‌یه، لۆژیكی زانستی جوگرافیا به لۆژیكی به‌لّگه‌هێنانه‌وه‌ی ژمێره‌یی نزیكتره تا به لۆژیكی هۆنراوه و شاعیریی، له‌وانه‌یه جوگرافیا زانستیترین وانه‌ی به‌شی ویژه‌یی بێت. هه‌رچیه‌ک بێت نازانم ئایا وانه‌كه بوو یا هه‌لّسوكه‌وتی مامۆستا بوو كه نزیكی جوگرافیا بوومه‌وه و جوگرافیا بوو به حه‌زی من، دیاره ڕه‌فتاری ئاغای جه‌لیلی ته‌یبات به‌جۆرێک بوو كه هه‌ر ساڵێک ژماره‌یه‌ک خوێندكاری ویژه‌یی ده‌چوونه به‌شی جوگرافیا. كاتێک چاوم كرده‌وه بینیم له پۆلی ویژه‌یی قوتابخانه‌ی ڕوكنیه دانیشتووم، پۆله‌كه نزیكه‌ی (٣٠) خوێندكاری تێدابوو، له‌وانه ته‌نها یه‌ک كه‌سم پێشتر ده‌ناسی، ئه‌ویش ئاغای حه‌سه‌ن حوسنی بوو، كوڕی حاجی بومان عه‌لی حوسنی كه باوكی پارێزه‌ربوو، ئه‌و پارێزه‌ری من بوو كاتێک له دادگا كێشه‌ی مولّكم هه‌بوو، من و حه‌سه‌ن حوسنی تا ته‌واوكردنی زانكۆ له مه‌شهه‌د هه‌ر پێكه‌وه بووین. له‌دوای نه‌ورۆزی ئه‌و ساڵه دایكم زانی كه من قوتابخانه‌كه‌م گۆڕیوه. نازانم كێ پێی گوتبوو، كاتێک زانی ئه‌و ڕێگه دووره ده‌بڕم، به‌دوای ڕێگه‌چاره‌یه‌كدا ده‌گه‌ڕا بۆئه‌وه‌ی زۆر هیلاک نه‌بم، خاڵم كه شاگردی مسگه‌ر بوو پاسكیلی هه‌بوو له نزیک مه‌یدانی میر چه‌قماق كاری ده‌كرد، به‌یانیان به‌پاسكیله‌كه‌ی ده‌ڕۆیشت بۆ سه‌ركار، بڕیاردرا منیش به‌پێ بچم بۆلای خاڵم و پاسكیله‌كه‌ی ئه‌و به‌رم بۆ قوتابخانه و نیوه‌ڕۆ پاسكیله‌كه‌ی بۆ بهێنمه‌وه‌وه دوكان و له‌وێوه به‌پێی بێمه‌وه. ئه‌م بیرۆكه‌یه پیاده‌ڕه‌وی منی نیواونیو كه‌مكرده‌وه.

## مریشکێکی باش و بێ ئاگایی من

کە لە پۆلی یەکەمی ویژەیی بووم مریشکێکی باشم هەبوو، هەموو ڕۆژێک هێلکەیەکی بۆدەکردم. لە هەمان کاتدا دراوسێیەکی نەخوێندەوارمان هەبوو کە کچەکەیان و زاواکەیان لە تاران دەژیان. ئەو ماڵە هەمیشە داوایان لە من دەکرد کە نامە بۆ کچ و زاواکەیان بنووسم. ئەو نامانەش کە لە تارانەوە بۆ ئەمان دەهات من بۆم دەخوێندنەوە، ئەوانیش لەبری نامەنووسین هەمیشە مرەبای ئالوباڵوییان دەدامێ. منیش هەموو ڕۆژێک هێلکەی مریشکەکەم دەکرد بە هێلکەوڕۆن و مرەبام بەسەردا دەکرد و دەمخوارد. نیوەڕۆوان کاتێک دایکم لەسەر کار دەهاتەوە خواردنی بۆ دروستدەکردم. زستان هەتاو نەدەکەوتە ژوورەکەی ئێمەوە، من و دایکم دەچووینە پەنا دیوارەکە ڕووبەڕووی خۆرەکە دادەنیشتین نانی نیوەڕۆمان دەخوارد. چەندین جار سەیری دەست و پەنجەکانی دایکمم دەکرد و دەمبینی پەنجەکانی سپی ببوون. منیش لێم پرسی دایکە بۆچی پەنجەکانت سپی بوون؟ ئەویش دەیگوت منیش نازانم بۆچی وا سپی دەبن و هەمیشە سەرمایانە. ڕۆژێکیان فاتمە جان لەبەر هەتاوەکە لەلای ئێمە دانیشتبوو. منیش هەمان پرسیارم لە دایکم کردەوە، فاتمە جان گوتی: دایکت برسیی و کەمخوێنە بۆیە وای لێهاتووە، کوڕی میرزا ئەحمەد پاپولی گەر دەتەوێت پەنجەی دایکت سپی نەبێت. گۆشتی بۆ بکڕە با بیخوات، ئەگەر گۆشت بخوات پەنجەی سپی نابێت. خۆ ئەگەر گۆشتیش نەبێت هەر هیچ نەبێت لەو هێلکەیەی کە خۆت ڕۆژانە دەیخۆیت بەشی ئەویشی لێبدە. ئەو کات دایکم تەمەنی لە (٣٨) ساڵ زیاتر نەبوو. بەو هەموو کارەی کە ئەو دەیکرد نەیدەتوانی گۆشت بکڕێت، بۆیە کەمخوێن بوو. دایکم (١٢) کاتژمێر لە کارگەیەکی چنینی ماڵان کاری دەکرد. کرێیەکەی ئەوەندە نەبوو کە بتوانێت هەفتەی یەک جار گۆشت بکڕێت. ئەم شارانە بەجۆرێک بوونە شاری پیشەسازیی کە کرێکارەکانیان نیوەمردوو دەکرد تا خۆیان دەوڵەمەندترین، دروشمیان ئەوەبوو کە

## شازادەی حە مام

دەیانگوت هەرکەسێک کاربکات زیندەگی باش دەبێت. بەڵام گۆڕستانەکان شاهیدی ئەوەن کە چەندین کەس بەهۆی کارەکانیانەوە گیانیان لەدەستداوە، کرێکارەکان هەوڵیاندەدا و ماندوو دەبوون، بەڵام کەسانێکی تر دەوڵەمەند دەبوون.

من لەو سەردەمەدا خۆم پێی گەورە بوو، ئازایەتی ئەوەم تێدانەبوو، کە بەهاوپۆلەکانم بڵێم من لە خانوویەکی ویرانەدا ژیان بەسەردەبەم. ئازایەتی ئەوەم تێدانەبوو کە لەبەرامبەر ئەو کارەی لە گەراجەکە دەیکەم پارەیەک وەربگرم. ئەو ئازایەتیەم نەبوو کە هاوینان بچمە شوێنێکی تر کاربکەم و کەمێک پارە وەربگرم. نازانم ئازایەتیم تێدا نەبوو یان دەمویست ئابڕووم بپارێزم! یا غروری سەردەمی هەرزەکاری بوو، یاخود نەمدەزانی کە چیبکەم!. زۆرێک لە خزم و ناسیاوەکانمان وایاندەزانی کە گوزەرانی ئێمە زۆر باشە، هەندێک دەیانگوت ئاغای میرزا ئەحمەد پارەی زۆری بۆ بەجێهێشتوون. ئێستا وا بیردەکەمەوە کە من هەرگیز ژیرییەکی ئابووریم نەبووە. عەقڵم پێی نەدەشکا کە لە بەرامبەر ئەو کارەی کە دەیکەم پارە وەربگرم. باوکم نەبوو تا لە ماڵەوە باسی ئابووریی بکات، خوشکێک، برایەکم نەبوو کە پێمبڵێت نابێت بەبەلاش کار بکەیت و پێویستە پارە وەربگریت. لە ماڵی ئێمەدا بەهیچ شێوەیەک باسی کڕین و فرۆشتن و ئابووریی و قوڵبڕین و دەستبڕین نەکراوە، تا من شتێک فێرببم. لە گەراج ئاگاداری هەندێک مامەڵە بووم بەڵام هیچ فێرنەبووم. لە قوتابخانەش باسی هەموو شتێک دەکرا جگە لە پارە و ئابووریی، لەو سەردەمەدا لە قوتابخانە منداڵانیان فێری ئابووریی نەدەکرد. بەڵام ئێستا بەشێک لە مامۆستایان وانەی تایبەتیان لەسەر پارە بردوەتە پۆلەکانیانەوە. ئێستا من شتێک دەنووسم کە دەزانم دایکم پێی ناخۆشە. دایکم تەمەنی (٨٤) ساڵە قاچی ئازارێکی زۆری هەیە. لە شاری یەزد بەتەنها دەژێت. لەم کۆتایی تەمەنەیدا تازە بەتازە بوەتە خاوەنی خانوویەکی بچووک... من و دایکم چەند ڕۆژێک باسی خواردنی هێلکەمان دەکرد من پێمگوت تۆ هێلکەکە بخۆ، ئەویش دەیگوت تۆ هێلکەکە بخۆ. کەسمان نەمانخوارد هێلکەکە کۆبۆوە و بوون بە چەند هێلکەیەک پاشان دایکم هێلکەوڕۆنی دروستکرد و گوتی: وەرە با بەیەکەوە بیخۆین، دیارە زۆرترینی هێلکەوڕۆنەکەی دەدا بەمن. دواتر بڕیاماندا هەر دوو ڕۆژ جارێک دوو هێلکە بکەینە ڕۆنەوە و پێکەوە بیخۆین. بەڵام وابزانم سێ بەشی دەدا بەمن، کەمێکی بۆ خۆی دەخوارد، چونکە دایک بوو، ئێستاش هەرکاتێک کە دەچمەوە بۆ یەزد بۆ سەردانی دایکم، ئەو هێشتا نیگەرانی خەو وخواردنی منە، بۆ کەمت خوارد؟ بۆچی وا خراپ دەخۆیت؟ ئەوەتان بۆ نانووسم کە ئێوە بزانن من لە تەمەنی (١٥-١٦) ساڵیدا چیم کردووە، ئەوانە دەنووسم کە بیر و هۆشتان کۆبکاتەوە، ئاگاداری دایکتانبن بەتایبەت

ئەگەر لە بنەماڵەیەکی هەژاربن یا مامناوەند، پێویستە زیاتر ئاگاداری دایک وباوک و خزم و کەسەکانتان بن. پارەکانتان بەفیڕۆمەدەن و لەپێناوی ئەواندا خەرجی بکەن لە بنەماڵە هەژار و مامناوەندەکاندا دەبێت هەمووان ئاگاداری یەکتربین.

## میوانی ئەشکەزەر

هەنـدێک خوێنـدکاری پـۆلی یـانزە بـووین. کە چەنـد کەسـێک لەو خوێنـدکارانە لە گونـدەکانی دەرەوەی شـارەوە هـاتبوون. پۆلەکەمـان کە سـاڵی پێشـوو (٢٥) خوێنـدکار بووین، ئەو ساڵە ببووینە (٤٥) خوێندکار. لە سەرەتای ساڵی خوێندندا چەند هاوڕێیەک بڕیارمانـدا کە هەر دوو سـێ ڕۆژ جارێـک لە ماڵێـک کـۆببینەوە، ئەم کۆبـوونەوەیەش نـاوبنێین وانە خوێنـدن. یەکێـک لەو هاوڕێیانەمـان خەڵکـی یەزد نەبـوو، لە گونـدەکانی دەوروبەرەوە هـاتبوو، ژوورێکـی بەکرێگرتبـوو، بەتەنیـا لەو ژوورەدا دەژیـا. هاوڕێکـانم چەنـد جـار بە بەهـانەی وانە خوێنـدنەوە چووبـوون بـۆ مـاڵەکەی. مـن چـونکە مـاڵ و خانوومان خراپ بوو، نەمدەویست تێکەڵاوی ئەوان ببم. بەڵام ئەوان بەزۆر منیان ناچار دەکرد کە منیش ببمە ئەندامێکی ئەو گرووپە. گرووپەکەمان پێکهـاتبوو لە (٧) کەس. هەر جارەی لە ماڵی کەسێک کۆدەبووینەوە. دوو جار سەرە گەیشـتە سـەر مـن، هەر جـارەی بەبەهانەیەک دوامدەخست. چونکە ماڵەکەم خراپ بوو، حەزم نەدەکرد بیانبەم بۆ ماڵەوە. بۆجاری سێیەم سەرە گەیشتەوە سەر من، ئێمەش باخێکمان هەبوو لە ئەشکەزەر، کە کەمتر لە نیوەی بەشـی ئێمە بـوو لە دابەشـکردنی میراتدا بەر ئێمە کەوتبوو. بـاخەکە کەمێـک گەورە بـوو ڕووبەرەکەی یەک هێکتـار دەبـوو. نیـوەی زیـاتری بەشـی حـاجی ئەحمەد ناوێک بوو کە ماڵەکەشیان هەر لە نێو بـاخەکەدا بـوو. بـاخەکە هەنـار و ترێـی تێدابوو. چۆگە ئاوی حەکیمئاوا بە ناوەڕاستی بـاخەکەدا دەڕۆیشـت. منیش پێشـنیارمکرد کە کۆبوونەوەی هاوڕێکان لە باخەکەدا بێت، هاوڕێکانیشم زۆر پێیان بـاش بـوو. لەسـەر ئەوە ڕێکەوتـین، کە هەرکەسـە و کرێـی ئۆتـۆمبێلی خـۆی بـدات و مەسـرەفی خـواردنی نیـوەڕۆش لەسـەر مـن بێـت، بڕیارمانـدا کە ڕۆژی هەینـی بـڕۆین. بەڵام دووان لە هاوڕێکانمـان گوتیـان ئـێمە نـایەین بـۆ دەرەوەی شـار. ئەو هاوڕێیەمـان کە خەڵکـی دەرەوەی شـار بـوو گـوتی: ئێسـتا ئـێمە کە کەمبـووینەوە مەسـرەفەکە کەمتـر دەبێت،

پێویستە لەگەڵ خواردنی نیوەڕۆدا خواردنەوەشمان بۆ دابین بکەیت. ئەو پێشتر لەگەڵ هاوڕێکانی تردا بەرنامەی دانابوو، کە من دەبێت خواردنەوەیان بۆ دابین بکەم. منیش بەهۆی خۆبەزلزانینەوە کە گوایە ئێمە باخمان هەیە، پێشنیارەکەیانم قبوڵکرد و گوتم: بەسەرچاو، خواردنەوەش دابینەدەکەم. ئەوکات لە یەزد چەند دوکانێکی مەیفرۆشی هەبوو. مەی فرۆشتن ئازاد بوو. مەی فرۆشەکان زۆربەیان خۆیان مەییان دروستدەکرد و دەیانخواردەوە. مەی کارگەکانیان نەدەخواردەوە. ئەو کات لە چەند ڕێستورانتێک مەی پێشکەش دەکرا و دەخواریەوە.

دوکانی مەی فرۆشەکان و ڕێستورانتەکان هەموویان مۆڵەتیان هەبوو بەئازادی دەیانفرۆشت. تەنها هەندێک لە جولەکەکان نەبێت کە لە ماڵەوە بەقاچاخ عەرەقیان دروستدەکرد و دەیانفرۆشت. تەنانەت هەندێک لە موسوڵمانەکانیش هەر لە ماڵەوە عەرەقیان دروستدەکرد، بەلام تەنها بۆ خۆیان نەک بۆ فرۆشتن. هەندێک جار نوێژەکەیان دەکرد و پاشان دەچوون مەییان دەخواردەوە. من لە دوای ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) وە لە یەزد نەمام، ڕەنگە ئەوە پێکهاتەیەک بووبێت لە موسوڵمان و زەردەشتی و یەهودی. نوێژی موسڵمانان و شەرابی زەردەشتی و عەرەقی یەهودی. لە شارێکدا کە موسوڵمانان و یەهودیی و زەرشتی چەندین سەدە بەیەکەوە ژیاون و دیواری ماڵەکانیان بەیکەوە بووە، ئەم تێکەڵاوی و ڕێورەسمە دەبوایە هەر ببێت، خۆ هەزاران کەسی بەباوەڕی یەزدی دەناسم کە بەدرێژایی تەمەنیان هەرگیز مەییان نەدیوە. جا چ جای ئەوەی بیخۆنەوە. دابونەریتی موسوڵمانان بەگشتی نوێژکردن و خوداپەرشتی و سنگ کوتان بووە، بەلام عەرەقخۆر و شەرابخۆریش هەبووە. هەر کەسێکیش بڵێت عەرەقخۆر و شەرابخۆر لە یەزددا نەبووە ئەو گومانی کردووە. لە شارەکانی تری ئێران کە دانیشتووانیان هەموو شیعە بوون، عەرەقخواردن کەم بوو، بەلام تلیاکخۆران زۆر بوو. من نامەوێت پڕوپاگەندە بۆ شارە جوانەکەی خۆم بکەم کە نموونەی پێشکەوتنی وڵاتی ئێرانە یاخود بۆ خزم و کەسوکارم کە خەڵکی شاری یەزدن. بەڵکو من لەسەر بنەمای وتە بەنرخەکەی پێغەمبەر دەڕۆم کە دەفەرموێت: "قولوا الحق ولو علی انفسكم"، ڕاستییەکان بڵێن ئەگەر لە قازانجی خۆشتان نەبێت. بەهۆی ئەوەی کە لە گەراج کارمەدەکرد کەسانێکی زۆرم دەناسی و زۆر کەسم دەبینی. لە نێو ئەواندا عەرەقخۆر زۆر بوون، بەلام خەڵکە هەژارەکان کرێکار و کارمەندانی کارخانە و هەژارانی تری ناوبازاڕ بەگشتی مەیخۆر نەبوون، بەڵکو ئەو چینە زیاتر تلیاکیان دەکێشا، باوکی خۆم سێ ژنی هەبوو، بەردەوام تلیاکی دەکێشا، هەندێک جاریش کۆنیاکی دەخواردەوە، ئەمە تێکەڵاوییەک بوو لە موسڵمانان لەگەڵ زەردەشتی دا.

هەندێک خەڵکی دەوڵەمەند بەرنامەیان هەبوو بۆ خواردنەوە هیچ کەسێک بۆنی دەمی نەدەکردن و هەستیان پێ نەدەکرا. هەندێک کەسی بەبۆنەی هاتنی میوانی خۆشەویستەوە مێزی مەیخواردنەوەیان دەڕازاندەوە، تەنانەت خۆیشم دووجار لەو جۆرە میوانداریيەدا بەشداریم کردووە. باسکردنیشی بۆ پەند وەرگرتن خراپ نییە، ڕۆژێک حاجی مەحمود کەمێک غەمی هەبوو بڕیاردا بچێت بۆ سەردانی کەسێک لە یەکێک لە گوندەکانی دەوروبەری یەزد. گوندەکە ئێستا بووەتە بەشێک لە شار. منیش لە گەڵیدا چووم بۆ ماڵی ئاغا ڕەزا، کە گەورە پیاوی گوندەکە بوو. هەڵبەت من دەمێک بوو ئاغای سەید ڕەزام دەناسی، خانوویەکی بچکۆلە و جوانی هەبوو کە هەمیشە دەرگاکەی بەڕووی هەموو کەسدا کراوە بوو، دەرگای هەموو ماڵەکانی گوندەکەش هەمیشە بەڕووی ئەودا کراوە بوون. سەید بە کەسێکدا هەواڵی نارد بۆ گوند کە کەسێکی خۆشەویست دەبێتە میوان و ئامادەکاریی بکەن. هەروەها سەید پێی گوتبوون کە هەموو خەڵکی گوندیش میوانی ئەو دەبن. کاتێک میوانەکان هاتن نزیکەی (٢٠) کەس دەبوون، بەگشتی تەمەنیان لە نێوان (٢٥-٧٥) ساڵیدا بوو. مێزی خواردنەوەیان ڕازاندەوە. هەندێک شەکردان و چەند قەرابە شەرابێک لەسەر مێزەکە ئامادەکرابوون. شەراب لە قەرابەکانەوە دەکرانە سوراحییەوە و پاشان دەکرایە پەرداخەوە. کڵۆ شەکریان دەکردە ناو پەرداخە شەرابەکەوە و دەیانخواردەوە. لەو دانیشتنەدا تەنها من تەمەنم (١٧) ساڵان بوو، ئەوانی تر هەموو لە من گەورەتربوون، کاتێک نۆرە هاتە سەر من بۆ وەرگرتنی پەرداخێک شەراب، ئاغا سەید ڕەزا گوتی: پاپولی ناسراوە، ئەو مافی هەیە لامان دانیشێت بەڵام ئەو مافەی نییە شەراب بخواتەوە. دەمە و ئێوارە بوو کە دەستکرا بە خواردنەوەی شەراب و تا دوای نیوەشەو بەردەوام بوون. هەر لەوێ کەباب دروستدەکرا و بەبەردەوامی لەگەڵ گۆشتی برژاودا دەهاتە سەر خوان. پیاوەکان خۆیان کاریان دەکرد و خواردنیان ئامادە دەکرد، هیچ ژنێک لەوێ نەبوو. شەو درەنگێک هەرکەسە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆی. وەرزی هاوین بوو، من لەگەڵ (١٠-١٢) کەسێک لە سەربانەکە خەوتم. مەلا بانگدان هەموو هەڵسان لە خەو و دەستنوێژیان گرت و نوێژیان کرد، جگە لە مەحمود ئاغا ئەو نوێژی نەدەکرد. کاتژمێری (١٠) ی پێشنیوەڕۆ هەموویان دووبارە دەستیانکردەوە بە شەرابخواردنەوە. لە ساڵەکانی پێش (١٣٤٦-١٩٦٧) دا لە هەندێک ڕێوەسمی بووک گواستنەوەدا بەشداریمکردووە. لە بەشێک لەو ئاهەنگانەدا شەرابیان پێشکەشی میوانەکان دەکرد و لە هەندێک ئاهەنگیشدا تەنها شەرابیان دەدا بەچەند کەسێکی دیاریکراو کە لە ژوورێکی تایبەتیدا میوانداریی دەکران و جۆرەها خواردنەوەیان بۆ ئامادە دەکردن. دیارە ئەوانە کەسانی خۆشەویستی ماڵی

زاوا بوون. ئیتر تا سەردەمی شۆڕش لە زۆربەی شارەکانی ئێراندا مەیخواردنەوە ئازاد بوو. هەمیشە کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرا، بەڵام لە شاری یەزد بنچینەی کۆنی هەبوو، بەو هۆکارەی یەزد پەیڕەوکەرانی چەند دینێکی تێدابوو کە خۆیان شەرابیان دروستدەکرد و دەیانفرۆشت و بەئازادی یش دەیانخواردەوە.

بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، بڕیار وابوو کە میوانەکانم ببەمە باخی ئەشکەزەر، باخێک کە لە نیوەی کەمتری بەشی من بوو. باخێک کە ماڵێکی زۆر بەڕێزی گوندەکە تێیدا دەژیان. ویستم بەبێئەوەی ئاگاداریان بکەمەوە لەگەڵ چوار گەنجی تەمەن (١٦-١٧) ساڵیدا بڕۆین بۆ ئەوێ بۆ مەیخواردنەوە. تەواوی ئەم کارەش لەبەر ئەوە بوو کە من چووبوومە نێو گروپێکی هاوڕێیانەوە و هەفتەی جارێک دەچووینە ماڵی یەکێک لەو هاوڕێیانە و لەژێر چاودێری دایک و باوکیاندا میوانداریەک بەڕێدەکرا. بەڵام من ماڵ و حاڵێکی ئەوتۆم نەبوو، تا لە ماڵەوە پێشوازییان لێبکەم.

گەنجیەکەم ڕێگەی پێنەدەدام تا بڵێم هاوڕێ بەڕێزەکانم من جێگە و ڕێگەی باشم نییە و لەگەڵ دایکمدا لە تەنها ژوورێکدا دەژین و ناتوانم میوانداریتان بکەم. ئیتر من پێنجشەممە شەوەکەی چوار شووشە شەرابم کڕی، خۆیشم نازانم بۆچی شەو کڕیم. ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە ئێمە بەیانی زووەکەی دەردەچووین بۆ ئەشکەزەر، ڕەنگە ئەوکات دوکانەکە نەکرابێتەوە. ئەوکات کارتۆن و مقەبا کەم بوو کیسی نایلۆن هەر نەبوو، چوار شووشە شەرابەکەم کردە پارچە قوماشێکەوە کە پێشتر لە ماڵەوە بردبووم. نەشمدەزانی ئەم چوار شووشە شەرابە تا بەیانی لە کوێ دابنێم، شووشەکانم بردنەوە بۆماڵەوە، چونکە دایکم لەماڵەوە نەبوو. ئەی خودایە ئەم شووشانە لە کوێی ژوورەکەدا بشارمەوە! دواجار گەیشتمە ئەو بڕیارەی کە شووشەکان لەژێر ئەو مێزە بچکۆلەیەدا بشارمەوە کە سەماوەرەکەی لەسەر بوو. بەجۆرێک خستمە ژێر مێزەکەوە کە هیچی قوماش و شووشەکان دەرنەکەون. ئەو شەوە تابەیانی لە دڵەڕاوکێدا بووم کە ڕەنگە هەرگیز تووشی دڵەڕاوکێی وا نەهاتبم. کاتێک کە دایکم هاتەوە دڵەڕاوکێکەم زیادی کرد. ئەگەر دایکم شووشەکان ببینێت، من چ وەڵامێکی بدەمەوە. ئەوکاتەی کە دایکم هاتەوە من تازە پەشیمان بوومەوە کە من بۆچی چووم شەرابم کڕی، باشە کە کڕیم بۆچی لە ژوورەوە حەشارمدا، کە دەبوایە لە قادرمەکەی پشتی سەربانەکەوە حەشارم بدایە، لەوکاتەدا دە جێگای تر بەبیرمدا هات کە زۆر لەژێر مێزەکە باشتربوون. دایکم بە هیلاکی لە کار هاتبووەوە. یەکڕاست لەلای سەماوەرەکەوە لێی دانیشت. دەبوو نانی ئێوارە بخۆین و خواردنەکەش هەر لەو ژوورەدا دروستبکرێت. لەوە دەترسام دایکم شتێکی لەژێر مێزەکەدا دانابێت و دەستی بۆ بەرێت و شووشەکان ببینێت. لە دڵی

خۆمدا گوتم: ئەگەر دایکم شووشەکانی بینی ئەوا حاشادەکەم کە هی من نییە و دەڵێم نازانم ئەمانە چین. پاشان گوتم. بەندەی خودا درۆش مەودایەکی هەیە، خۆ ئەگەر دایکم شووشەکانی بینی ئەوا دەزانێت کە من مەی دەخۆمەوە، ئیتر تازە وەک باوکمم لێدێت. یا وەک مامەکانم لێدێت خۆ من باوکم لەمێژە مردووە. مامەکانم تەمەنیان لە (٦٥) ساڵ زیاترە، من تازە تەمەنم (١٦-١٧) ساڵە دووبارە بەخۆمم گوت ئای من چەندە بێویژدانم، دایکم بەم هەموو ئەرک و زەحمەتە پارە پەیدا دەکات و منیش پارەکانی بۆ میوانداریی شەرابخواردنەوە خەرج دەکەم. بۆ کڕینی شەراب و نانی نیوەڕۆ سێ تومەنم لە دایکم وەرگرتبوو پێنج تومەنم لە خاڵم وەرگرتبوو کە زۆر هەژار و دەستکورت بوو. دوو تومەنم لە پوورە فاتمە وەرگرتبوو کە بەهەزار زەحمەت دەیتوانی پارە پەیدا بکات. سێ تومەنم لە نەنە سەکینە وەرگرتبوو. سێ تومەنیشم لە دوکانێک قەرز کردبوو. خۆیشم چەند تومەنێکم پێبوو. بەخۆمم گوت ئای لە منی بێویژدان کە بەدوای ئارەزووەکانی خۆم دەکەوم و ڕەوشتی خۆم تێکداوە. سبەینێ لە باخێکدا کە حاجی ئەحمەد و ژن و منداڵەکانی تێیدا دەژین، چۆن شەراب دەدەیت بە هاوڕێکانت؟ بەیانی زوو شووشە شەرابەکان دەبەمەوە بۆ دوکانەکە و پارەکەی لێوەردەگرمەوەو ڕاست و دروست بەهاوڕێکانم دەڵێم من پارەم نییە و ماڵم نییە، باخەکەش کە نیوەی موڵکی منە ماڵی خەڵکی تێدایە. ئێستا من چۆن شەراب بدەم بە ئێوە لە کاتێکدا ئێوە لە ماڵی خۆتان شەرابتان نەداوە بە من. خواردنێکی سادەتان داومەتێ کە دایکتان خۆی دروستی کردووە. ئەی لەودنیا چۆن وەڵامی خودا و پێغەمبەر بدەمەوە. ئەگەر لە خەوندا ئیزرائیل ببینم چۆن وەڵامی بدەمەوە. سەدان بیر بەمێشکمدا هات، دایکم گوتی: خواردن ئامادەیە.. خواردنەکەی لە پێشم دانا و گوتی: بۆناخۆیت؟ منیش بیرم لای خواردن نەبوو بەڵکو بیرم لە شوێنێکی تر بوو، دایکم گوتی: ئەوە بیر لە چی دەکەیتەوە، لەگەڵ کەسێکدا شەڕتکردووە، یا مامۆستاکانت قسەیان پێگوتویت؟ گوتم: نەخێر، هیچ نەبووە.. گوتی: ئەی لە گەراجەکە شتێک ڕوویداوە. گوتم: نەخێر.. گوتی: دە کەواتە خێرا نانەکەت بخۆ. گوتم: بەچاوان. نانەکەم خوارد و دوای نانخواردن چوومە سەر جێگاکەم بۆخەوتن، بەڵام تا بەیانی خەوم لێنەکەوت بە بەردەوامی بەئاگا بووم. دایکم هەر جوڵەکی دەکرد دەمگوت ئێستا بەخەبەردێت و دەچێت بۆلای مێزەکە و شووشەکان دەبینێت. ئاخر بەندەی خودا بەیانی کە ڕۆژی هەینییە خۆ دایکت ناچێتە سەرکار و هەر لە ماڵەوەیە، چۆن ئەو شووشە شەرابانە لە ژێر مێزەکەوە دەردەکەیت و دەیانبەیت؟ هەی داد و بێداد. خۆ من بیرم لەوە هەر نەکردبوەوە. ئیتر ڕۆژبوەوە منیش هەڵسام. چەند پاروەە نانێکم خوارد. هەموو بیر و هۆشم لای ئەوە بوو کە چۆن خێرا خۆم

بگۆڕم و شووشە شەرابەکان هەڵبگرم و بەخێرایی لە ماڵ بچمەدەر. باش بوو دایکم چووە تواڵێتەکە و منیش بەخێرایی جلەکانم لەبەرکرد و شووشەکانم هەڵگرتن و بەخێرایی ڕۆیشتم. تا بە هاوڕێکانم گەیشتم. گوتیان کوا شەرابت کڕیووە؟ منیش پارچە قوماشەکەم کردەوە شووشەکانم نیشاندان و گوتم: بەڵێ کڕیومە. یەکێک لە هاوڕێکانم دەستی لە شووشەکان دا و گوتی: من تائێستا هیچ جۆرە مەیەکم نەخواردوەتەوە، دەترسم نەخۆش بکەوم و هۆشمان لەدەستبدەین، هاوڕێیەکی تر گوتی: نانا مەترسە، هیچ شتێک ڕوونادات.

پاشان ئۆتۆمبێلێکی تایبەتمان گرت بە پێنج تومەن بۆ ئەشکەزەر، هەر کەسە و یەک تومەن کرێی خۆی دا. ئەوجا دڵەڕاوکێیەکی ترم بۆ دروستبوو کە ئایا حاجی ئەحمەد چیمان پێدەڵێت، دڵنیام کە مۆڵەتمان نادات لە خانوویەکەیدا کە ژن و منداڵی ئەوی تێدایە، ئێمە شەراب بخۆینەوە. دەبوو من پێشتر هەواڵم بۆ بناردایە، کە بەنیازی کارێکی لەو جۆرەم. ئێستا من چی پێبڵێم!. تا ئێستا هەرگیز میوانم نەبردووە بۆ باخەکە چ جای ئەوەی میوانی مەیخۆرەوە ببەم. زوو گەیشتینە ئەشکەزەر ئۆتۆمبێلەکە لەبەردەم باخەکەدا وەستا. ویستم بە شوفێرەکە بڵێم دەگەڕێینەوە بۆ شار، لەوە بوو پێشنیاربکەم بۆ هاوڕێکانم کە بچینە دەشتێک یا ژێر دارێک دابنشین. بەڵام ئەم پێشنیارە هەر لە مێشکمدا بوو بە زمانمدا نەهات. دابەزین و چووینە ناو باخەکەوە. نێوان دەرگای باخەکە بۆ ماڵی حاجی ئەحمەد (٨٠) مەترێک دەبوو. بەڵام ئەو (٨٠) مەترە هێندەی چەند کیلۆمەترێک دوور بوو بۆ من، هەرگیز لە تەمەنمدا ڕێگەیەک بەو کورتیە ئەوەندە هیلاکی نەکردووم.

ئەوەندەم زانی ژنی حاجی بە یائەڵڵا.. یائەڵڵا لە ژوورەوە هاتە دەرەوەو دواتر حاجی یش هاتە دەرەوە و گوتیان فەرموون.. فەرموون حسێن ئاغا، فەرموو (ئەرباب) ئەوە چۆن بوو وا هاتیت.. یاخودا بەخێربێن. خۆشیتان هێناوە، بەخێرهاتن سەرچاوامان، لە دڵی خۆمدا گوتم: خۆشی دەردەکەوێت، کاتێک حاجی بزانێت بەچوار هاوڕێوە و بەچوار شووشە شەرابەوە هاتووم. دەبێت ئەوکات چی بڵێت!، حاجی پێشمانکەوت و گوتی: وەرن بڕۆین بۆ ئەولای خانووەکە، ئێتر بردینی بۆ ئەولای خانووەکە بۆ سەرجۆگە ئاوەکە. وا هەستمکرد کە حاجی شووشە شەرابە کانی بینیبێت، پاشان حسێنی کوڕی حاجی فەرشی هێنا و بۆی ڕاخستین و ئێمەش دانیشتین. سەماوەریان هێنا و خوانیان ڕازاندەوە بۆنانخواردنی بەیانی، ژنی حاجی گوتی: پەلەمەکەن، با بچم مانگاکە بدۆشم و شیری تازەتان بۆ بهێنم. هەمووومان گوتمان زەحمەت مەکێشن... حاجی گوتی: زەحمەتی چی ئەمە یەکەمجارە ئەربابی ئێمە هاتووە و سەردانی کردووین، ئێمە لە خزمەتتاندایین.

شـیری کـولاو، کەرە، مرەبـا و قەیماغیـان بۆهێنـاین.. ئیتـر مـن زۆر خۆشـحاڵ بـووم، پێویسـتە بڵێم بەدرێژایـی تەمەنـم هـیچ کـات ئەوەنـدە هەسـتم بە خۆشـحاڵی نەکردبـوو، وشـەی ئەربـاب زۆر خۆشبوو بەلامەوە. کە لەبەرچـاوی هاورێکانم پێیدەگوتم: ئەربـاب. هاوکـات لە دڵـی خۆمـدا دەمگـوت: ئەوا نـانی بەیانیمـان خـوارد ئەی چـۆن شـەرابەکە بخۆینەوە. خۆ ئەگەر ژنی حـاجی بزانێت لە کۆڵەکەماندا شووشـەی شـەراب هەیە دنیا سەروژێر دەکات. دواتر حـاجی گوتی: بـاخی خوشـکەکەم چۆڵە و کەسـی لێ نییە، ئەوا حسـینی کـوڕمم نـاردووە لەوێ جێگە ڕابخـات و چـا ئامـادە بکـات. دوایـی هەموومـان دەچینە ئەوێ. زۆرم پێخۆش بوو، گوێم لە دەنگی مریشـک و کەڵەشێر بـوو، مـحەمەدی کوڕی حاجی دوو مریشکی سەربڕی و حاجی گوتی: بۆ نیوەڕۆ برنج و مریشـک ئامـادە دەکەین. گوتم: حـاجی شـەرمەندەم مـن ماستی قوتـووم هێنـاوە، نیوەڕۆ ئەوە دەخـۆین، ژنی حاجی گوتی: تۆ ساڵی جارێک نایەت، ئێستا دەتەوێ نانی خۆتان بخۆن؟ بۆ زووتـر ئاگـادارت نەکـردین، کە باشـتر خزمەتتـان بکەیـن و ئامادەکـاری بکەیـن. پاشـان گـوتی: هەنـدێ میـوە و نـاوکەم نـاردووە. نیـوەڕۆش خواردنتـان بـۆ دەهێـنم. حـاجی ویسـتی شـتەکانمان لەگەڵ هەڵبگرێت، ئەو قوماشـەی هەڵگـرت کە شووشـەکانی تێدابوو. گـوتم: ئێستا حاجی دەپرسێت ئەمانە چین، منیش نەمتوانی بڵێم حـاجی زەحمەت مەکێشـە بیدە بە خـۆم هەڵیبگـرم. حـاجی بە شووشـەکانەوە گەڕایەوە نـاو خـانووەکەی خۆیـان، پـاش چەنـد خولەکێـک شووشـــەکان بەدەســتێکیەوە و دەبەیەک بەدەســتەکەی تــریەوە لە ژوورەوە هـاتە دەرەوە و گـوتی: بـابڕۆین... نێـوان هەردوو بـاخەکە (٢٠٠) مەتـر زیـاتر نەبوو، کە گەیشتین حسینی کوڕی حاجی فەرشـی ڕاخسـتبوو، سـەماوەری هەڵکردبـوو، حـاجی لە تەنیشـت سـەماوەرەکەوە دانیشـت و بە حسـێنی کـوڕی گـوت: بـڕۆرەوە بـۆ ماڵەوە و نیوەڕۆ خواردنمـان بـۆ بهێنە، یەکێک لە هاورێکـان کە خەڵکی دەرەوەی یەزد بوو قوماشـەکەی کردەوە کە سـەیرم کرد لەبری چوارشووشـە شـەرابی سـوور، چـوار شووشە ئاوی ڕوونی تێدایە، ئێمە سەرمان سوڕما، حاجی ئەحمەد گوتی: ئەمە عەرەقـی بیدمشکە کە خۆمان دروستیدەکەین ئەمە زۆر باشە و سەلامەتە. تومەس حـاجی کاتێک چووبووە ژوورەوە چوار شووشە شەرابەکەی گۆڕی بوو بە شووشە عەرەق. ئیتر بۆ ئێمە زۆر خـۆش بـوو. ئەوکـات حـاجی تەمەنـی (٦٥) سـاڵ دەبـوو. ئەم پیـاوە سـاردی و گەرمی ڕۆژگاری زۆر چەشتبوو، خۆی لای سەماوەرەکەوە دانیشت بوو، چـای تێدەکرد و دەیخـواردەوە. تـا بـاوکم لە ژیانـدابوو، چەنـدین جـار هـاتووە بـۆ مـاڵی ئێمە، هەمـوو جارێک ترێ یان هەناری دەهێنا و ئاردی بۆ دەهێنـاین. نیوەڕۆ خواردنیـان بـۆ هێنـاین و حـاجی نەیهێشـت ئێمە لە خـواردنەکەی خۆمـان بخـۆین. گـوتی: چۆنتـان هێنـاوە ئـاواش

بیبەنەوە بۆماڵەوە، لێرە هەموو شتێک زۆرە، نیوەڕۆ گۆشت و برنجمان خوارد، ئنجا حاجی دوو شووشە عەرەقی بۆ هەڵپچڕین و دەستمان کرد بە خواردنەوە. من کەمێک چاوم گەرم کرد و کە خەبەرم بوەوە حاجی چا و شەربەتی لیمۆی بۆ ئامادە دەکردین، حسێنی ناردبوو بۆ ئەشکەزەر و ئۆتۆمبێلی هێنابوو و کرێکەشی دابوو بە شوفێرەکە و ئێمەش خوداحافیزیمان کرد و گەڕاینەوە بۆ شار. ئیتر باری شانم تەواو سووک بوو. دواتریش حاجی ئەحمەد هەرگیز لای هیچ کەسێک باسی عەرەقخواردنەوەی ئێمەی نەکردبوو، تەنانەت بەڕووی خۆشیدا نەهێنا کە ئێمە مەی دەخۆینەوە، منیش ئیتر چیتر ئەو جۆرە کارانەم نەکرد.

ناوەڕاستی مانگی ئابان (تشرینی دووەم) بوو، کە باوکی ئەو هاوڕێیەمان هات و کوڕەکەی بردەوە بۆ گوند کە ئەو گەڕایەوە گوند ئیتر ئێمەش وازمان لەو بەزمە هێنا. خۆ ئەگەر ئەو لە یەزد بمایە دیار نەبوو کە چارەنووسی من و هاوڕێکانم بەچی دەگات. من ئێستاش زۆر پەشیمانم لەو کارەی کە (٢٥) تومەنم لەپێناوی هیچدا خەرجکرد، دەمتوانی ئەو پارەیە بدەمە دایکم، ئاخ لە تەمەنی هەرزەکاری و هاوڕێی خراپ. هەرزەکار هیچ شتێک نازانێت، حاجی ئەحمەد چەند پیاوێکی گەورە بوو، مەبەستی من شەراب خواردنەوە نەبوو، بەڵکو مەبەستی من ئەوەبوو کە هاوپۆلەکانم بزانن من باخم هەیە، موڵکم هەیە، من لە شوێنێک ئەربابم لەوانەیە حاجی ئەحمەد بەهەڵسوکەوت و بەگوتنی وشەی ئەرباب باشتر لە هەر دەروونناسێک، دەروونی منی خوێندبێتەوە و لەلای هاوڕێکانم گەورەی کردبێتم. لای هاوڕێکانم تەواو سەربەرزی کردم. ئەگەر ئێستا بشزانن من لە ژوورێکی کرێدا ژیان دەگوزەرێنم. هیچ کێشە نییە، چونکە بینیبوویان کە من لە شوێنێک ئەربابم و خاوەنی باخم.

## چارەنووسی هاورێی قوتابخانە

ئەو هاورێ گوندنشینەی ئێمە رۆیشت بۆ ئەسفەهان، هیچ هەواڵێکمان لەیەکتری نەبوو، کاتێک من لە پاریس بووم، ئەو بۆ وەرگرتنی دکتۆرا لە مانجستەری بریتانیا بوو، منی بانگهێشتی بریتانیا کرد، بەیەکەوە دانیشتبووین باسی بیرەوەرییەکانی خۆمانمان دەکرد.ئەو گوتی: دەزانی من لەدوای ئەو رۆژەی باخەکەوە ئیتر مەیم نەخواردۆتەوە، گەورەیی و رێزی حاجی ئەحمەد وای خەجاڵەتکردم بڕیارمدا کە هەرگیز بەلای مەی دا نەچمەوە.

گوتم: بەسەرهاتەکانی خۆتم لەدوای یەزد بۆ باس بکە، ئەویش بەم جۆرە بۆی باسکردم. لە دوای میوانی باخەکەی ئەشکەزەر کە هاوین بوو، منیش گەڕامەوە بۆ گوندەکەی خۆمان، ساڵی دواتر بۆ خوێندن هاتمەوە بۆ یەزد، بڕیارمدابوو کە ئیتر مەی نەخۆمەوە، کاتێکدا باوکم هات بۆ سەردانم لە ژوورەکەمدا گەڕا و هیچ مەیەکی نەدۆزییەوە، بەڵام خاوەن خانووەکە سوێندی بۆ خواردبوو کە کوڕەکەت مەی دەخواتەوە، باوکیشم منی بردەوە بۆ گوند و گوتی: ئەگەر لە گوند خەریکی کاری جوتیاری و هەژاری بیت باشترە لەوەی لە شاردا عەرەق بخۆیتەوە. من لە گوند شەش مانگ خەریکی کاری جوتیاری بووم. پاشان لە گوند رامکرد و بەرەو ئەسفەهان رۆیشتم، لە گوندەکەمانەوە تا نائین دە کیلۆمەترە، ئەوکات تەنها یەک ئۆتۆمبێل لە نێوان گوندەکەی ئێمە و نائین دا هاتوچۆی دەکرد، هیچ هۆکارێکی تری گواستنەوە نەبوو، تەنانەت ماتۆڕیش هەر نەبوو، بیرمکردەوە، ئەگەر بە ئۆتۆمبێل بڕۆم باوکم زوو دەمدۆزێتەوە، بۆیە بەیانی بەپیادە و بەیەک گۆزە ئاوەوە رێگای کەوێرم گرتەبەر. ئەو رۆژە بە بەردەوامی رۆیشتم زۆر هیلاک و ماندوو بووم، رۆژی دواتر لە کەوێر خەریکبوو لە تینواندا بخنکێم. کاتی خۆرئاوابوون بوو، ئەوەندە هیلاک و ماندوو بووم خەریکبوو دەمردم، مەرگی خۆمم دەبینی. ئیتر شەوم بەسەرداهات و بەتەنها لەو بیابانە

ترسناکەدا مامەوە، بەڵام لەدەمی بەیانیدا بەهەوای فێنکی کەوێر کەمێک باشتر بووم، هەرچۆنێک بوو خۆم گەیاندە نائین و پاشان چوومە ئەسفەهان دوای چەند ڕۆژێک لە ئەسفەهان تەواو بێ پارەبووم، چەندین شوێن ڕۆیشتم بۆ پەیداکردنی کارێک، بەڵام دەچوومە هەر شوێنێک دەیانگوت کرێکارمان ناوێت. خەریکبوو بگەڕێمەوە بۆگوندەکەی خۆمان، ڕۆژێکیان دوا نیوەڕۆ بوو، برسێتی هێزی لەبەر بڕی بووم، چوومە دوکانێکی گەس فرۆش، بەخاوەنی دوکانەکەم گوت: شاگردت ناوێت؟ ئەویش سەیرێکی کردم و گوتی: من شاگردی گێژم ناوێت! گوتم: بەخودا من زۆر وریام، من بۆ کار هاتووم، هەرکارێک بتەوێت بۆت ئەنجامدەدەم. لێی پرسیم خەڵکی کوێیت؟ گوتم: خەڵکی گوندەکانی نزیکی یەزدم، ئادرێسی خۆمم بەراستی پێنەگوت. گەسێکی دایە دەستم، منیش بەخێرایی خواردم. گوتی: ماڵت لەکوێیە؟ گوتم: لە گوندەوە هاتووم بۆ ئەسفەهان و هیچ جێگایەکم نییە، گوتی: بۆچی لە گوندەوە هاتوویت بۆ شار، گوتم: ئاوی گوندەکە وشکی کردووە و گوندەکەمان وێران بووە، دایک وباوکم هیچ داهاتێکیان نییە، بۆیە هاتوومەتە شار تا کارێک بکەم و پارەیان بۆ بنێرمەوە. گوتی: نانی نیوەڕۆت خواردووە؟ گوتم: نەخێر، نانی بەیانیشم نەخواردووە، ئێوارەش هیچم نەخواردووە. حاجی بەشارگردەکەی گوت خواردنم بۆ بهێنێت. پاش کەمێک شاگردەکە سینییەک ئاوی گۆشت و نانی بۆ هێنام. چوومە پشت دوکانەکەوە بەخێرایی خواردم. کەمێک هاتمەوە سەرخۆم. حاجی گوتی: شەو لە کوێ دەخەویت؟ گوتم: نازانم.. پاشان گوتی: وەرە لای من کاربکە و شەویش هەر لێرە بخەوە. ئیتر من بووم بەشاگردی حاجی و ئێوارانیش دەچوومە خوێندگە، سەرەتای مانگی میهر (کۆتایی ئەیلول) خۆم نانووسکرد لە بەشی ئەزموونی، پاش دووساڵ نامەیەکم بۆ دایکم نووسی کە من ساغ و سەلامەتم و خەریکی خوێندنم، بەڵام هیچ ناونیشانێکم بۆ نەنووسین، باوکم بە پولی پۆستی پشتی نامەکەدا زانیبووی کە من لە ئەسفەهانم. ئەویش هاتبوو بۆ ئەسفەهان و لە ڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەوە منی دۆزیبوەوە. کاتێک باوکم منی بینی، گوتی: مەجید هیوادارم کە خاوەنی ناوەکەت هاوکارت بێت. ئەو بەڵایە چی بوو، کە بەسەر من و دایکتدا هێنا. من دەیان جار چووم بۆ شارەکانی یەزد، نائین، تاران، مەشهەد و ئەسفەهان تا تۆ بدۆزمەوە، من بێچارە بووم، وازم لە هەموو کار و کاسپیەک هێنا، بەڵام تۆم هەر نەدۆزیەوە، ئێستا دەتەوێت چی بکەیت؟ گوتم: دەمەوێت بخوێنم.. گوتی: وەکو یەزد دەخوێنی؟ گوتم: نەخێر. باوکمم بردە لای وەستاکەم و ئەو پیاوە ئەسفەهانییە ڕازیبوونی خۆی لە من بۆ باوکم دەربڕی و باوکم ژوورێکی بۆ بەکرێگرتم و گوتی: مەسرەفی خوێندنەکەشت بۆ دەکێشم. وەستاکەشم گوتی: ئێستا کە کە باوکت

خانووی بۆ بەکرێگرتوویت و مەسرەفت دەکێشێت، ئەگەر حەزدەکەی دوانیوەڕوان وەرە بۆ دوکان و گەس بفرۆشە. پاشان باوکم گوتی: حاجی ئاغا ئەوا کوڕەکەم بەتۆ سپارد، وەک کوڕی خۆت سەیری بکە و با لە ژێر سەرپەرشتی تۆدا بێت. حاجی دوکانداریش گوتی: من چوار کوڕم هەیە ئەوە بە کوڕەکەی تۆوەوە بوو بە پێنج، کە بەراستی وەکو کوڕی خۆی سەیری دەکردم، پاشان نامەم پێشکەشی زانکۆ کرد و لەهەمان زانکۆی ئەسفەهان لە بەشی پزیشکیی وەرگیرام. چەند مانگێک بوو چووبوومە زانکۆ کە باوکم بەهۆی نەخۆشی دڵەوە کۆچی دوایی کرد. ئێمە چوار برا و سێ خوشک بووین، من برا گەورە بووم، ئاوی ڕووباری گوندەکەمان کەمیکرد و هەموو دارخورکانمان وشک بوون و کشتوکاڵ بەتەواوی بێ ئاو بوون. پاش مردنی باوکم نەمدەزانی کە دەبێت چیبکەم؟ دەبێت بگەڕێمەوە بۆ گوند، تا سەرپەرشتی ماڵ و موڵک بکەم یاخود لەسەر خوێندنەکەم بەردەوام بم! بەڵام دایکم گوتی: مەجید تۆ لە ئەسفەهان لەسەر خوێندنەکەت بەردەوامبە. گوتم: باشە دایکە گیان، بەڵام بەهیچ جۆرێک پارە بۆ من نەنێرن. ئەگەر من لە توانامدا هەبوو ئەوا خۆم پارەتان بۆ دەنێرم. دایکم گوتی: ئیمامی عەلی دەست بەباڵتەوە بگرێت.. گەڕامەوە بۆ ئەسفەهان و حاجی گەس فرۆش بەخۆی و خێزانییەوە بۆ سەرەخۆشی هاتنە لام و لە کاتی قسەکردنمدا حاجی تێگەیشت کە ئێمە لە ماڵەوە کێشەمان هەیە، گوتی: مەسرەفی خوێندنی تۆ، من لە ئەستۆی دەگرم و تۆ بەبێ دودڵی لەسەر خوێندنەکەت بەردەوامبە. بەڵام من گوتم: قبوڵی ناکەم. حاجی گوتی: من ئەو پارانەی دەیدەم بە تۆ هەموو دەنووسم لای خۆم، هەرکاتێک خوێندت تەواوکرد و بوویت بە پزیشک و خاوەن پارە، ئەوکات بمدەرەوە. بەم شێوەیە حاجی سێ ساڵی تەواو مەسرەفی منی کێشا. لە کۆتایی ساڵی چوارەمی کۆلێژی پزیشکیی دا لە دەرمانخانەیەکدا کارم پەیدا کرد و هەندێک پارەم دەستکەوت، بەشێکیم ناردەوە بۆدایکم و دوو براشم هێنایە ئەسفەهان بۆ تەواو کردنی خوێندن، خەرجیانم گرتە ئەستۆی خۆم، لە کۆتایی ساڵی چوارەمدا ڕۆژێک حاجی و ماڵەیانم بانگهێشتکرد بۆ گوندەکەمان و چەند ڕۆژێک لەوێ مانەوە. لە گوندەکە دوو بیری ئاو لێدرابوو، دارخورماکان تەواو گەشابوونەوە، دایکیشم پارەی لە بانک وەرگرتبوو لەگەڵ چەند کەسێکی تردا بەهاوبەشی بیرێکی قوڵیان لێدابوو، لە (١٢) شەو و ڕۆژدا چوار شەو و ڕۆژ ئاوی بیرەکە بۆ ئێمە بوو. دوبارە کشتوکاڵ گەشایەوە و خانوو و ماڵێکی باشمان هەبوو، چەند شەو و ڕۆژێک ماڵی حاجی لە گوندەکەمان مانەوە و... پاشان مەجید گوتی: ئاغای پاپولی تۆ کە ئێستا جوگرافیاناسیت ئایا دەزانیت کە گوندەکەی ئێمە لەڕووی هێڵی پانی جوگرافیاوە، بەرزترین گوندی جیهانە. کە خاوەنی چەندین باخی

گەورەی خورمـایە. پـاش چەنـد مانگێـک لە هـاتنی مـاڵی حـاجی بـۆ مـاڵی ئـێمە ڕۆژێـک خێزانی حاجی داوای لێکردم کە دایکم و منداڵەکان بێن بۆ ئەسفەهان و میوانی ماڵی ئەوانبن و دایکم و دوان لە خوشکەکانم هاتن. خوشکە گەورەکەم تازە لە زانکۆی تاران وەرگیرابـوو، لەم سـەردانەدا خێزانـی حـاجی خـوازبێنی خوشـکە گەورەکەمـی کـرد بـۆ کوڕەکەیـان کە خوێندکاری زانکۆ بـوو لە بەشـی ئەنـدازیاری، ئیتر بەو شـێوەیە لەگەڵ ماڵی حاجی بووین بەخزم و هاتوچۆمان بۆماڵی یەکتری زیادی کرد. سـەرەتای سـاڵی شەشەمی پزیشکیم بوو دایکم لە گوندەوە هـات بۆ ئەسفەهان، پێشنیاری بۆ کردم کە ژنبهێـنم.. گـوتم: دایە جـاریٚ کـاتی نیـیە و زووە. دایکـم گـوتی: تەمەنـت (٢٥) سـاڵە، خوێنـدکاری سـاڵی شەشـەمی پزیشـکییت، ئێسـتا باشـترین کـاتە کە زەماوەنـد بکەیـت. خوشک و براکانم هەر یەکە و لە شارێک خەریکی خوێندن بوون. دایکم گوتی: تۆ بەس بڕیاربدە من هەرچی هەمانە دەیفرۆشم و دێینە ئەسفەهان یا دەچینە تـاران.. بە تەواوی هیلاکبـووم و واز لە کـاری کشـتوکاڵی دەهێنم. دایکـم گـوتی: ئێسـتا کشـتوکاڵ سـوودی نەمـاوە، مەڕدارییش ناکرێت.. چونکە ئێسـتا هـیچ کەس شـوانی ناکـات. شـوانە کۆنەکـان پیربوون و گەنجەکانیش شوانیی ناکەن، ڕانـی بیٚ شـوانیش وەک ئۆتـۆمبێلی بیٚ شـوفێر وایە. دایکم پێشنیاری کرد کە بچێت خوازبێنی کچی حـاجیم بـۆ بکـات، گـوتی: حـاجی بـۆ تۆ وەک بـاوک وا بـووە، ئێسـتاش لەگەڵ خوشـکەکەت وەک بـاوک ڕەفتـار دەکـات، ناچـار من قبوڵم کرد. ڕۆژی دواتر دایکم پێیگوتم: لەگەڵ ژنی حاجی قسەی کردووە و ئەویش گوتویەتی هـیچ کەسـێک لە مەجید باشـتر نییە، بەڵام کەمێـک چاوەڕوان بکەن تـا لەگەڵ کچەکەمدا قسەدەکەم. بۆسبەی شەو خێزانی حاجی من ودایکم و براکانمی بانگهێشـتکرد بۆ نانخواردن بچینە ماڵی ئەوان، کاتێک کە چووین حـاجی ڕاسـتەوخۆ گـوتی: ئینشـائەڵڵا بەیەکەوە پیردەبن. ئیتـر خـوازبێنی کـرا و حـاجی نەیهێشـت مـن تەنهـا ڕیـاڵێکیش خەرج بکەم. دایکم پارەیەکی هەبوو هەرچەندە ویستی مەسرەفی بووک بکـات، بەڵام حـاجی نەیهێشـت و گـوتی: مەجیـد کـوڕی خـۆمە و ئـێمە بەیەکەوە حیسـابمان هەیە و هەمـوو مەسـرەفەکەی لەسـەر دەنووسـم. مـنش لە بەشـی نـاوخۆیی زانکـۆوە کەلوپەلەکـانم گواستەوە بۆ ماڵی حاجی. پاش پێنج مانگ حاجی لە ئەسفەهان خـانوویەکی بـۆ کـڕین و مـن و خێـزانم بەشـادی و خۆشـی، لەو خـانووەدا دەژیـاین. دوایـی حـاجی تـاپۆی خانووەکەی خستە سەر من. منیش پێمگوت: لانیکەم با خانووەکە بەناوی خێزانەکەمەوە بێت، کە کچی خۆتە... بەڵام حاجی گوتی: پێویستە پیـاو خـانووی هەبێت! گوتم: حـاجی من ئێستا پارەی خانووم نییە تا پارەکەت بدەمەوە. حاجی گوتی: لەسەرت دەنووسم.

مەجید بەردەوام بوو لە قسەکردن و گوتی: برای هاوسەرەکەم کە هاوسەری خوشکەکەشمە لە زانکۆی ئاریامهر دەیخوێند، پاشان بۆ تەواو کردنی خوێندن هاتە بریتانیا، من لەسەر داوای برای هاوسەرەکەم بۆ بەردەوامی خوێندن هاتمە بریتانیا، دیارە لەڕووی پارەوە زۆر هاوکاری منی کردبوو. من و خێزانم ساڵی (١٣٥٥-١٩٧٦) هاتینە بریتانیا (٤-٥) ساڵە لێرە نیشتەجێ بووین، پاشان بڕیارماندا بگەڕێینەوە بۆ ئێران.

دکتۆر مەجید گوتی: ئاغای پاپولی ئەو حاجییە خودا لێی خۆشبێت، هیچ شتێکی لەسەر من نەنووسی بوو کاتێک لە ساڵی (١٣٧٤-١٩٩٥) دا کۆچی دوایی کرد، بۆ پرسەکەی چوومەوە بۆ ئەسفەهان لە دەفتەرەکەیدا گەڕام تا ئەو پارەیەی بۆی خەرج کردووم بیدۆزمەوە. لە دەفتەرەکەیدا تەنها لەو شوێنە دا ناوی من نووسرابوو کە ببووم بە شارگردی و ڕۆژانەکەی پێدابووم، بەڵام کاتێک چووبوومەوە بۆ خوێندن ناوی من لە دەفتەرەکەیدا تۆمار نەکرابوو، حاجی مەسرەفی سێ ساڵ خوێندنی زانکۆی منی کێشا بوو، لەگەڵ تەواوی مەسرەفی ژنگواستنەوە و خانووشی بۆکڕی بووم، بەڵام ئەو هەموو مەسرەفە لە هیچ شوێنێکدا نەنووسرابوو. من لە دکتۆر مەجیدم پرسی کە حاجی خەڵکی ئەسفەهان بوو، گوتی:، حەوت پشتیان خەڵکی ئەسفەهانن، تەنانەت باپیرە گەورەیان زۆر پێش سەفەوییەکان لە ئەسفەهان ژیاون. چەند ساڵێک لە ئێران کاری پزیشکیم دەکرد، کاتی جەنگی عێراق - ئێران بوو، زۆر بەدڵسۆزیی کارم دەکرد ئەو هەموو گەنجە خۆیان بەکوشت دەدا، یا بریندار دەبوون، خۆ نەدەکرا من هیچ ڕۆڵێکم نەبێت، چوار ساڵ زیاتر لە بەرەکانی شەڕ بووم، ئێستا دووبارە هاتومەتەوە بۆ وەرگرتنی دکتۆرا. دەزانیت من ئێستا ئەندامی ڕێکخراوی زانستیی زانکۆی پزیشکی تارانم و کۆشکێکی جوانیشم لە شاری لەندەن هەیە کە ساڵی یەک دوو مانگ تێیدا دەمێنمەوە.

ئێستا کە لەگەڵ تۆدا قسەدەکەم ساڵی (١٣٧٨-١٩٩٩) یە و لەدوای میوانداریيەکەی باخەکەی تۆ لە ئەشکەزەر دەمم لەمەی نەداوە، دەزانی بۆچی ئاغا پاپولی؟ مرۆڤ کاتێک کە گەنجە دیارنییە ژیرییەکەی لە کوێیە. دیارە هەر لەبەر ئەوەشە کە دەڵێن کەسانی خوار پانزە ساڵ نابێت لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگبدەن. ئاخر چۆن دەبێت پێنج گەمژە بە چوار شووشە شەرابەوە بچنە ماڵی حاجی ئەحمەد، ئەو پیاوە فریشتە بوو.. گوتی: بیرت دێت؟ کە لەگەڵ خۆیدا ڕادیۆی هێنابوو، کاتێک لە ڕادیۆیەکەوە گوێی لە بانگی نیوەڕۆ بوو ڕاست لەو کاتەدا کە ئێمە مەست ببووین و خەرکی خواردنەوە بووین، حاجی ئەحمەد بەخێرایی هەڵساو چووە سەر جۆگە ئاوەکە دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد. ئەو نوێژەی ئەو لای ئێمەی مەست ئاگاکەرەوەیەک بوو بۆ من، کە چۆن

ئەم حاجییە بە ئیمانە لە کاتی خۆیدا نوێژەکەی دەکات و میوانداربیەکی زۆربەڕێزانەش لە ئێمەی مەست دەکات. ئایا لە فەرهەنگی ئێمەدا میوان ئەوەندە بەڕێز و خۆشەویستە! بەڕاستی حاجی ئەحمەدی ئەشکەزەری لە ژیانی مندا گۆڕانکاریی دروستکرد، من هەر ئەو شەوە کە گەڕاینەوە شار، دوو شووشە عەرەقم هەبوو، چووم هەردووکیانم کردە توالێتەکەوە، کاتێک باوکم هات بۆ یەزد من ماوەیەک بوو عەرەقم نەخواردبووەوە، خاوەن خانووەکە کە ئاشنای باوکم بوو دڵنیاییدایە باوکم کە من عەرەق دەخۆم، بەرگدرووەکەش کە دراوسێمان بوو گوتبووی کە مەجید عەرەق دەخواتەوە، چونکە ئەو چەند جارێک بۆخواردنەوەی عەرەق هاتبووە ژوورەکەی من. ئیتر قسەی ئەو بەرگدرووە بووە هۆی ئەوەی کە باوکم دەستم بگرێت و بمباتەوە بۆ گوندەکەمان و دواتر چارەنووسی من گۆڕدرا.

دکتۆر مەجید بەردەوامبوو، گوتی:گوایە چارەنووسی مرۆڤ بەدەست قەدەرە، ئایا بەدژایەتی کردنە، یا بەهاندانی دەوروبەرە، وا دەردەکەوێت کە هەرسێکیان لە چارەنووسی مرۆڤدا ڕۆڵیان هەیە، من کاتێک هاتم بۆ یەزد ویستم بچمە بەشی وێژەیی، بەهۆی عەرەقخواردنەوە گەڕامەوە گوندەکەمان و هەڵاتم و چوومە ئەسفەهان و چوومە بەشی زانستیی و بووم بە پزیشک، ئەگەر ئەو حاجیەی ئەسفەهان نەبووایە، چارەنووسم بەچی دەگەیشت؟ ئەگەر لە شارێکی گەورەی وەک ئەسفەهاندا تووشم بە تووشی کەسانی خراپەوە ببووایە چی ڕوویدەدا! ئەم پیاوە ئەسفەهانییە چ هێز و ورەیەکی بەمن بەخشی. ئەگەر تەمبەڵ بومایە و نەمخوێندایە و زانکۆ وەرینەگرتمایە چارەنووسم چۆن دەبوو؟.

هاوکات دکتۆر مەجید گوتی: لە هەمان کاتدا خودای گەورە هێزێکی بەخشیبوو بە من و بە تۆ و بەسەرجەم مرۆڤەکان کە پێویستە هەمووان سوودی لێوەربگرین. دکتۆر مەجید گوتی: تۆ سەیری ژیانی خۆت بکە، تۆ شەیدای بەشی زانستیی بوویت، بەرپێوەبەر دەریکردیت و چوویتە بەشی وێژەیی، هەوڵتدا ببیت بە شاعیر بەڵام مامۆستایەکی زانا و بەڕێز بەناوی تەیبات کاری تێکردیت و چوویتە بەشی جوگرافیا، ئەگەر ئەو ڕۆژە دکتۆر ناسری مەهریزی تۆی لە قوتابخانە دەرنەکردایە بێگومان ئەمڕۆ تۆ کارێکی دیکەت دەبوو. دکتۆر مەجید گوتی: ژیانی هەردوکمان پەیوندی هەیە بە قەدەر و هەوڵ و تێکۆشان و هاندانی خەڵکی ترەوە.

دکتۆر مەجید دوای وەرگرتنی دکتۆرا گەڕایەوە بۆ تاران و ئێستا هاوڕێی خۆشەویستی منە و مامۆستای زانکۆی پزیشکیی تارانە، زوو زووش لە تاران یەکتری دەبینین. دایکی دکتۆر مەجید ساڵی (١٣٧٤-١٩٩٥) لە تاران کۆچی دوایی کرد، منیش

## شازادەی حە مام

چووم بۆ پرسەکەی هەر حەوت منداڵەکەی کە هەموویان خوێندنیان تەواوکردووە، لە پرسەکەیدا ئامادەبوون. ئێستا چواریان لە دەرەوەی وڵات دەژین، دووانیان لە بریتانیا و یەکێکیان لە هۆڵندا و یەکێکیان لە ئەمریکایە. من ئەو ژنە ئازایەم چەند جارێک لە تاران و ئەسفەهان بینیوە، ئەو یەکێک بووە لە شێرە ژنانی ئێرانی و ئەو بەدرێژایی (٣-٤) ساڵ وشکە ساڵی و وشکبوونی سەرچاوەی ئاوی بنەماڵەکەیان، تووشی هەژاریی و نەبوونی ببوو، لەهەمان کاتدا هاوسەرەکەشی بەهۆی نەخۆشیی دڵەوە کۆچی کردبوو، بۆ بەخێوکردنی حەوت منداڵی بێ باوکی تەمەن (٦بۆ٢٠) ساڵی، شەش منداڵ لە گوند و یەک منداڵ لە زانکۆی پزیشکیی، ورەی بەرنەدا و ئەژنۆی خەمی لە ئامێز نەگرت و دووبارە ژیانی دروستکردەوە و هەموو منداڵەکانی نارده زانکۆ.

## ڕەزای بۆیاخچی

نیوەڕۆیەکی هاوین لەبەردەم گەراجەکەدا وەستابووم، زۆر زۆر گەرمابوو، کەسێک بەهێواشــی چــاکەتەکەی بەرمــی ڕاکیشــا، کە ئاوڕمــدایەوە منــداڵێکی لات و بێهێــز و ڕەشکەلانە بوو، چاوی تێبڕی بووم و سەیری دەکردم. سندوقێکی بۆیاخی بەدەستەوە بوو، گوتی: ئاغا پێڵاوەکانت بۆیاخ بکەم، منیش زانیم زۆری تینووە، گوتم:ئاوی سارد دەخۆیتەوە؟ گوتی: بەڵێ.. منیش چووم لە بەفردانی گەراجەکە یەک پەرداخ ئاوی ساردم بۆهێنا و دامەدەستی، بەخێرایی ئاوەکەی خواردەوە. ئەوسا بەفرگر (سەلاجە) نەبوو بەڵکو بەفردان هەبوو، پاشان گوتی: پێڵاوەکانت بەخێرایی بۆ بۆیاخ دەکەم. منیش پێڵاوەکــانم دانــا و دەســتیکرد بە بۆیاخکردنیــان. لێمپرســی خەڵکــی کوێیــت؟ گــوتی: گوندەکانی خەرانق.. گوتم: چەند خوشک و برات هەیە؟ گوتی: بەخۆمەوە هەشت، من لە هەموویــان گەورەتــرم، گوتم:تەمەنت چەنــدە؟ گــوتی: (١٠) ســاڵ، خوشــکە بچووکەکەم تەمەنی (٢٠) ڕۆژە و شەش خوشک و دوو براین. گوتم: ئەی لە کوێ دەژیت؟ گوتی: لە کۆتایی کۆڵانی حەنا، لای چۆڵەوانییەکەوە. گوتم: لەگەڵ کێ دەژیت؟ گوتی: بەتەنهــام و لەگەڵ کەســـدا نــیم. لەوێ کەلاوەیەک هەیە لەو کەلاوەیە دەژیــم. گــوتم: ئەی بەتەنهــا ناترسیت؟ گوتی: چۆن نــا ترسم. گوتم: لە چی دەترسیت؟ گوتی: لە کەسانی خراپ و بەدڕەوشت، چونکە بەزۆر ئەوان پارەکەم لێدەسەنن و لێمدەدەن. شەوێک کەسێک هــات ویســتی ئــازارم بــدات، زۆر ترســام، منــیش هــاوارمکرد، ئەو خەڵکــانەی لەســەربانەکە خەوتنبوون بەئاگاهاتن و کەسەکەش ڕایکرد. گوتم: ئەی پارەکانت چی لێدەکەیت؟ گوتی: دەیدەم بە دوکاندارێک لە ژێر بــازاڕی میر چەقمــاق بــۆم هەڵدەگرێت. ئێستا وا بڕیــارە بچمە دوکــانەکەی ئەو بــخەوم. چــونکە لە کەلاوەکەدا ســەگەکان دێن و لەگەڵ پشــیلەکان شــەڕ دەکەن. مــن لە گۆشــەیەکدا دەخەوم کە پــڕە لە مشــک... بۆیــاخی پێڵاوەکــانم تەواو بوو، بەڵام ئەو هەر دەیویست بۆیاخەکەی جوان بێت. گوتم: ئەمڕۆ چیت خواردووە؟

گوتی: نان. گوتم: بەچییەوە؟ گوتی: بەوشکی، چونکە پێویستە پارەکەم کۆبکەمەوە. گوتم: باوکت چی دەکات؟ گوتی: کۆکە. گوتم: چ کارێک دەکات؟ گوتی: کۆکە کۆک، ئەوندە دەکۆکێت تا خوێن لە دەمیەوە دێتە دەرەوە. چووەتە لای پزیشک پێیان گوتووە کە نەخۆشی سیلی هەیە و پێویستە شیر و گۆشت بخوات، منیش پارەکانم کۆدەمەوە بۆمەسرەفی ماڵەوە. بۆیاخەکەی تەواوکرد، کرێی بۆیاخکردن دوو ڕیاڵ بوو من پێنج ریاڵم پێدا، بەڵام هەرچەندە لەگەڵم گوت ئەو قبوڵی نەکرد، تەنها دوو ڕیاڵی وەرگرت. گوتی: بۆیاخ بەدوو ریاڵە، خۆ بە پێنج ڕیاڵ نییە. گوتم: ناوت چییە؟ گوتی: ناوم ڕەزایە. ئیتر لەوەدوا هەموو ڕۆژێک لە دەوروبەری گەراج دەمبینی کە پێڵاوی شوفێر و سەرنشینانی بۆیاخ دەکرد و هەموو ڕۆژێک پەرداخێک ئاوم دەدایە. ڕۆژێکیان شووشەیەک بیبسیم بۆ کڕی کە نرخەکەی چوار ڕیاڵ بوو، کە نای بەسەریەوە هەمووی بەیەک جار خواردەوە. گوتی: زۆرم حەز لە بیبسی یە. گوتم: مادام پارەت هەیە بیکڕە و بیخۆرەوە. گوتی: ئەی چی لە باوکم بکەم.. من دەبێت پارەکانم بۆ پزیشک و دەرمانی ئەو کۆبکەمەوە. ڕۆژێکیان چووم بۆ مەیدانی خان و بازاڕی مسگەرەکان خاڵم مسگەر بوو. قورسترین مەنجەڵ وەستا غولام دروستی دەکرد. سەیرمکرد ڕەزای بۆیاخچی لەبەردەمی دوکانی حاجی حەڵوایی وەستاوە و سندوقی بۆیاخەکەی بەدەستەوەیە، سڵاوم لێکرد و وەڵامی دامەوە. گوتم: ئەوە بۆ لێرە وەستاویت؟ گوتی: بەدوای کەسێکدا دەگەڕێم تا پێڵاوەکانی بۆ بۆیاخ بکەم. حاجی حەڵوایی کە پیاوێکی باڵابەرز و بەخۆوە بوو، سەیری دەکردین. فالودەی حاجی حەڵوایی لە یەزدا بێ نموونە بوو، دوا جار کە حاجی حەڵواییم بینی ساڵی (١٣٨١-٢٠٠١) بوو، پیرببوو بەڵام هێشتا هەروەک شێر وابوو، حاجی ڕوویکردە ڕەزا و پێیگوت: ئەوە نیو کاتژمێرە لە بەردەرگاکەدا وەستاویت چیت دەوێت؟ ڕەزا گوتی: بەچاوان ئێستا دەڕۆم. حاجی گوتی: نا نا، مەڕۆ وەرە ژوورەوە.. ڕەزا ڕۆیشتە ژوورەوە و ئیتر حاجی ڕووی کردە من و گوتی: تۆ خوشکەزای وەستا غولامی مسگەر نیت؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: کوڕی میرزا ئەحمەدی پاپولی یت گوتم: بەڵێ. گوتی: فالودە ناخۆیت؟ گوتم: بۆ ناخۆم.. منیش چوومە دوکانەکەوە و لەگەڵ ڕەزادا دانیشتین. یەکی یەک قاپ فالودەی بۆهێناین. ڕەزا غەمبار بوو. گوتم: بۆ وا ناڕەحەت بوویت؟ گوتی: دەبێت پارە بدەم. گوتم: قەیدی چییە پارە دەدەین. گوتی: ئەی باوکم؟ گوتم: من پارەکە دەدەم. تۆ ئێستا فالودەکەت بخۆ. فالودەکەمان خوارد و پارەم لە گیرفانم دەرکرد تا بیدەم بە حاجی حەڵوایی، بەڵام ئەو گوتی:فالودەی تۆ لەسەر خاڵت دەنووسم و دەفتەرکەی هێنا و چەند پەڕەیەکی هەڵادایەوە و تا ئەو پەڕەیەی دۆزییەوە کە بەناوی وەستا غولامەوە نووسرابوو،

بەختەتی گەورە لەسەری نووسی و روویکردە ڕەزا و پێیگوت ئەو گسکە هەڵبگرە و ناو دوکانەکەم جوان بۆ گسکبدە. ڕەزا دووکانەکەی باش بۆ پاککردەوە و حاجی پێیگوت پارەی گسدانەکەی تۆش ئەو فالودەیە بوو کە خواردت. ڕەزا زۆر خۆشحاڵ بوو بەیەکەوە لە دوکانەکە هاتینە دەرەوە. پێمگوت بینیت خۆ فالودە خواردن خەمی ناوێت. گوتی: چەند ڕۆژ بوو حەزم لە فالودەبوو، دەهاتمە ئێرە و سەیری فالودەم دەکرد و پاشان دەڕۆیشتم، ئەو ڕۆژە نیو کاتژمێر لێرە وەستام، برسی و تینوو بووم بەڵام نەمویست چوار تومەن بدەم بە فالودە و بیخۆم. چونکە کۆکەکەی باوکم لەبەر چاوبوو. بەڵام ویستی خودا وابوو کە فالودە بخۆم. گوتم: ئیستا کە هاوینە و دنیا گەرمە جار جار فالودە یا ئاوی شووتی بکڕە و بیخۆ. گوتی: ئەی باوکم و خوشک و براکانم؟ تۆ گوندەکەی ئێمەت نەدیوە خۆئەگەر بێیتە گوندەکەمان و دایک وباوک و خوشک وبرام ببینی هەرگیز دڵت نایەت فالودە بخۆیت.

گوتم: ڕۆژێک دێم بۆ گوندەکەتان، گوتی: گوندەکەی ئێمە لە کێوەکانی ناوەڕاستی کەوێرە. ئەو ڕۆژە لەیەکتر جیابووینەوە. (٤-٥) ڕۆژی مابوو بۆ (١) ی مهر (کۆتایی ئەیلول) دووبارە یەکترمان بینییەوە. پێمگوت: مهر نزیکە و چی دەکەیت، گوتی: ئەمساڵ تیپی فێرخوازیی پێیان گوتم:کە هەر دەبێت بچمە قوتابخانە و دەبێت ئەمساڵ بچمە پۆلی چوارەم، بەڵام ڕەنگە نەچم. گوتم: وەرە ئاوی شووتیت بۆ بکڕم. گوتی: باشە.. بەیەکەوە چووینە دوکانی ئاغای ڕەزا و دوکانەکەی زۆر قەرەباڵغ بوو، دوو پەرداخ ئاوی شووتیمان خواردەوە. ڕەزا گوتی: دەبێت پێڵاوەکانت بۆ بۆیاخ بکەم، گوتم: ئاوی شووتی لەسەر من بوو. گوتی: منیش دەبێت پێڵاوەکانت بۆ بۆیاخ بکەم. گوێم لێبوو دەنگی شڵپە شڵپی دۆندرمەی ئاغای سەید دەهات. دوکانی دۆندرمە فرۆشی سەید بەتەنیشت شەربەتی شووتییەکەوە بوو. وابزانم ئێستا بووەتە دوکانی کتێبفرۆشی. دۆندرەمەی زۆر باشی دروستدەکرد. شیر و شەکر و قەیماغی تێکەڵدەکرد و دەیکردنە بەرمیلێکی ئاسنەوە. بەرمیلە ئاسنەکەشی دەکردە بەرمیلێکی تەختەوەو لە نێوانیاندا سەهۆڵ هەبوو. بەرمیلە ئاسنەکەی لە نێو بەرمیلە تەختەکەدا دەسووڕاندەوە. سەهۆڵەکەش لە نێوان هەردوو بەرمیلەدا گیری خواردبوو. دۆندرمەیەکی دروستدەکرد کە مرۆڤ پەنجەی خۆی پێوە دەخوارد. دۆندرمەی نانی دانەی بە دوو ڕیاڵ بوو، دوو دۆندرەمەشم کڕی پارەی ئەویشم دا و سەرجەم (١٢) ڕیاڵم خەرج کرد. لەگەڵ ڕەزا ماڵئاواییمان کرد و لەیەکتر جیابووینەوە. چەند مانگێک ڕەزام نەبینی، ڕۆژێکی مانگی ئازار بوو کە چاوم لێبوو ڕەزا لە مەیدانی میرچەقاق سوار پاسکیل بوو ڕۆیشت، منیش چەند جارێک بانگم کرد ڕەزای بۆیاخچی. ڕەزای بۆیاخچی کە گوێی لە دەنگم بوو،

گەڕایەوە بەرەو لای من، پاش چاکوچۆنی و هەواڵپرسین.. گوتم: چی دەکەیت لێرە.. ئەی نەچوویت بۆ قوتابخانە؟ گوتی: نەخێر نەچووم. چونکە باوکم مرد.. گوتم: چۆن باوکت مرد؟ گوتی: بەڵێ مرد، هەر کۆکی هەر کۆکی هەتا مرد. بۆیە دەبێت ئێستا کاربکەم و پارە بۆ دایکم و خوشک و براکانم بنێرمەوە، واز لە قوتابخانە بهێنم. ئێستا هاتومەتەوە بۆ یەزد و بەرۆژ پێڵاو بۆیاخ دەکەم و شەوانە لە دوکانی نقوڵ فرۆشتن کاردەکەم و هەر لەوێش دەخەوم. پاشان ڕەزا گوتی: وەرە بابچین پێڵاوەکانت بۆ بۆیاخ بکەم. منیش پێمگوت: سوپاست دەکەم درەنگە بۆ قوتابخانە و دەبێت بە خێرایی بڕۆم. ڕەزا گوتی: من هەمیشە لە مەیدانی میر چەقماق و جادەی پەهلەوی دەبم. پاش چەند مانگێک کە ڕۆژێک دەمویست بچم بۆ قوتابخانە چاوم بەڕەزا کەوت لە تەنیشت پارکی جادەی پەهلەوی دانیشتبوو دەگریا. چووم بۆلای گوتم: ڕەزا ئەوە بۆچی دەگریت؟ گوتی: کارمەندێکی شارەوانی هات وسندوقی بۆیاخکردنەکەی لێسەندم و بردی، پێیگوتم: نابێت لەسەر جادەکان کاربکەم. وانەی عەرەبیم هەبوو، مامۆستاکەم ئاغای تەهماسبی بوو. تەهماسبیەکان دوو برا بوون یەکێکیان مامۆستای عەرەبی بوو ئەوی تریان مامۆستای ئینگلیزی بوو. هەردووکیان زۆر بەڕێز و خۆشەویست بوون و بەجوانترین شێوە وانەیان دەگوتەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم: بۆ قوتابخانە درەنگ دەبێت. پاشان گوتم: با درەنگ بێت و دوایی داوای لێبوردن لە مامۆستاکەم دەکەم و وانەکەم لای هاوڕێیەکم دەنووسمەوە و پاشان چەند پرسیاریک لە مامۆستا دەکەم. بەڕەزام گوت هەڵسە بابڕۆین کارمەندەکە بدۆزینەوە، ڕەزا گوتی: شتەکانمی برد و ڕۆیی، خۆ هەر شتی منی نەبرد، هەموو ئەو دەستگێرانەی لەسەر جادەکە شتیان دەفرۆشت هی هەموویانی پێچایەوە. ئێمەش بەرەو شارەوانی ڕۆیشتین ئەوکاتە شارەوانی لەسەر جادەی پەهلەوی (ئیمامی ئێستا) بوو. بەرامبەر گەراجی ئۆتۆتاج کە بینایەکی سێ قات بوو لە مانگی ئەسفەندی (١٣٨٦)، (شوبات و ئازاری ٢٠٠٧) دا بەوێرانەیی چۆڵیانکرد. ئەو بینایە کە سومبۆلی شاری یەزد بوو لەدەیەی (١٣٣٠-١٩٥٠) دروستکرابوو، کە دەتوانرا بکرێتە مۆزەخانەیەکی بچکۆلانە. گەیشتینە بەردەم بینای شارەوانی، بەڵام کارمەندەکەمان نەبینی پاسیلەکەم لە تەنیشت باخچەکەوە دانا و بە ڕەزام گوت: لێرە دانیشە تا دەگەڕێمەوە. چووم بۆ نووسینگەی سەرۆکی شارەوانی و گوتم: دەمەوێت سەرۆکی شارەوانی ببینم. سکرتێرەکە گوتی: تۆ کێیت؟ گوتم: من هەواڵنێری بەشی لاوانی ڕۆژنامەی تۆفانم. سکرتێرەکە چووە ژوورەوە بۆلا سەرۆکی شارەوانی و پاش چەند خولەکێک هاتە دەرەوە و گوتی: فەرموو بچۆ ژوورەوە. چوومە ژوورەوە و سڵاوم لە سەرۆکی شارەوانی کرد و پێمگوت: بەڕێز من هەواڵنێری ڕۆژنامەی تۆفان

نیم و بەهیچ شێوەیەک هەواڵنێریش نیم. سەرۆکی شارەوانی گوتی: باشە بەڵام بۆچی گوتوتە من هەواڵنێرم. گوتم:تەنها لە بەرئەوە بوو کە ڕێگام بدەن بێمە ژوورەوە بۆ لای تۆ. ئاغای سەرۆکی شارەوانی بە مهیربانییەوە گوتی: ئێستا کە هاتوویتە ژوورەوە بفەرموو دانیشە. گوتم: بەڕێز من محەمەد حسێن پاپولی یەزدیم. کەمێک بیری کردەوە و گوتی: تۆ کوڕی کامیانی؟ گوتم: کوڕی خودالێخۆشبوو میرزا ئەحمەد. گوتی: تۆ ئامۆزای محەمەد ئاغای! گوتم: بەڵێ. سەرۆکی شارەوانی گوتی: بفەرموو، بزانم کاری چیتان هەیە. منیش پێمگوت: کوڕێکی تەمەن (١١-١٢) ساڵ هەیە، ناوی ڕەزایە و پێڵاو بۆیاخ دەکات خەڵکی گوندێکی نزیک خەرانقە و باوکی مردووە و (٧) خوشک وبرای هەیە و دەیەوێت بە بۆیاخچێتی بەخێویان بکات. بەڵام کارمەندێکی شارەوانیتان هەموو شتەکانی لێسەندووە. سەرۆکی شاروانی بە میهربانییەوە پرسی، تۆ چۆن ئەو دەناسیت؟، گوتم: ساڵێکە دەیناسم و ئەو ڕاست دەکات باوکی مردووە. سەرۆکی شارەوانی گوتی: باشە، تۆ دڵنیایت کە باوکی تلیاکخۆر نییە، ڕەنگە باوکی تلیاکخۆر بێت و ئەم منداڵەی ناردبێت بۆ کارکردن و پارە پەیدا کردن، تاوەکو پارەکەی لێبسەنێت و تلیاکی پێبکڕێت. گوتم: بەڵێ قوربان، زۆر دڵنیام کە ئەو دەبێت مەسرەفی هەموو ماڵەوەیان بکێشێت. پاشان سەرۆکی شارەوانی گوتی: ئێستا ئەو ڕەزایە لە کوێیە؟ گوتم: وا لە دەرەوە وەستاوە. پاشان سکرتێرەکەی بانگکرد و پێیگوت هەر ئێستا ئەو منداڵەی وا لە دەرەوە دانیشتووە ناوی ڕەزایە بانگی بکە و بابێتە لام. پاش چەند خولەکێک ڕەزا بەچاوی گریاناوییەوە هاتەژوورەوە و لە ڕەزای پرسی مەگەر ناچیتە قوتابخانە، ئەویش گوتی: نەخێر ناچم چونکە باوکم مردووە و منیش وازم لە قوتابخانە هێناوە، پێویستە کار بکەم و بژێوی دایک و خوشک و براکانم دابین بکەم.

پاشان لێی پرسی ئاغا پاپولی چۆن دەناسیت؟، ڕەزا گوتی: قوربان نایناسم. گوتی: تۆ ئەم ئاغایە ناناسیت؟ ڕەزا گوتی: چۆن نایناسم ئەمە حسێن ئاغایە ساڵێکە دەیناسم.. پاشان سەرۆکی شارەوانی بانگی سکرتێرەکەی کرد و پێیگوت بزانە کێ شتومەکی ئەم منداڵەی بردووە، پێیان بڵێ هەر ئێستا بۆی بهێننەوە و دوکانێکی بچکۆلەی لە جێگایەکی گونجاوی جادەی پەهلەوی بۆ دروست بکەن و مەسرەفی تەواوی دووکانەکەشی لەئەستۆی خۆم. زۆر زۆر سوپاسی سەرۆکی شارەوانیم کرد و داوای مۆڵەتم لێکرد کە من دەبێت بڕۆم. بەڵام گوتی: جارێ بمێننەوە.. بەڕەزای گوت: فەرموو تۆ برۆ دەرەوە و هەر ئێستا هەموو شتەکانت وەربگرەوە. دوکانێکشت بۆ دروست دەکەین، ڕەزا ڕۆیشت سەرۆک لێی پرسیم تۆ ناونیشانی دایکی ئەم منداڵە دەزانیت. گوتم: بەتەواوی نازانم بەڵام لە گوندی کەلاتەی دەوروبەری خەرانق دادەنیشن. پاش (٢٠) ڕۆژ ڕەزا بووە

خـاوەنی دوكـانێكی بچكـۆلانە لە جـادەی پەهـلەوی یەزد، دوكـانەكە بچكـولانە بـوو، نەیدەتوانی بەپێوە تێیدا ڕابووەستێت بەڵام دەیتوانی لە نێویدا دانیشێت و پێڵاو بۆیـاخ بكات. هەركاتێك كە دەچووم بۆ قوتابخانە بەبەردەمی دوكانەكەی ڕەزادا دەڕۆیشتم و بەپاسكیەلەكەم زەنگێكم بۆ لێدەدا و ئەویش دەستی بۆ بەرزدەكردمەوە. خۆ ئەگەر بێكاریش بوایە ئەوا لە دوكانەكەی دەهاتە دەرەوە و تەوقەیەكی گەرمی لەگەڵ دەكردم. ڕەزا پـێڵاوی بۆیـاخ دەكـرد و پینەچێتیشـی دەكـرد. دەیگـوت ئەگەر دوكـانەكەم كەمێك گەورەتر بووایە دەمتوانی هەر لێرەش بخەوم. كاتێك من چوومە زانكۆ ڕەزا تەمەنی (٢٠) سـاڵ بـوو، هەر لەو شـوێنەش پـێڵاوی بۆیـاخ دەكـرد، ئەو هەمیشـە نـانی وشـكی و ئاوی دەخواردەوە، تەنانەت چایشی نەدەخواردەوە چونكە دەبوو نان بۆ (٨) كەس پەیدا بكات. دراوسێكانی جار جار خواردنیان پێدەدا، منیش لەو ماوەیەدا چەند جارێك داوەتی سەروپێم كرد. هـاوینی سـاڵی سـێیەمی زانكۆم بـوو هـاتمەوە بۆ یەزد ڕەزام بینی پـاش چاكوچۆنی گوتی:خوشكەكەم كە تەمەنی (١٧-١٨) سـاڵە داومـانە بە شـوو، پێویسـتە نـاو ماڵی بۆ بكڕم هەندێك ئەشیام بەقەرز وەرگرتووە و هەندێك پارەشم قەرزكردووە، پاش چەند ڕۆژێكی تر دەگەڕێمەوە بۆ گوند بـۆ زەماوەنـدەكەی ئەگەر پێتخۆشـە تـۆش وەرە لەگەڵمدا لە دوو ڕۆژ زیاترمان پێناچێت.. منیش گوتم: دێم. بڕیاربوو پاش چەند ڕۆژێكی تر بـڕۆین، سـەرەتای شـەهویوەری (١٣٤٩)، (كۆتـایی ئـابی١٩٧٠) بـوو. چـوومە دوكـانی حـاجی خەلـیفەی ڕەهـبەر چەنـد پاكەتێـك پـاقلاوە و هەنـدێك بسـتە و نـاوكە كولەكەشـم كـڕی. بەیـانییەكی زوو لەگەڵ ڕەزادا بەرەو خەرانـق بەڕێكەوتـین. جـادەكەی لە سـاڵانی پێشوو باشتر بوو، بەڵام هێشتا قیرتاو نەكرابوو، پاش چوار كاتژمێر گەیشـتینە خەرانق. لەوێشەوە بە پیكاپێك چووینە كەلاتە دایكی ڕەزا پێشـوازیی لێكـردین و بـووكێ تەمەنـی (١٧-١٨) ساڵ بوو، بەڵام جوانیی ئەم بووكە لە كوێ و جوانیی ئەو كچانەی كە هەمیشە گۆشت دەخۆن لە كوێ؟! ئەم بـووكە زۆر لات بـوو، ڕەنگـی سـپی بـوو زۆر بێهـێز بـوو چاوەكـانی گەش نەبـوون. ڕەزا هەنـدێك شـتومەكی لە یەزدەوە لەگەڵ خـۆی هێنـابوو، منیش سێ پاكەت پاقلاوە و چوار كیلۆ بادەم و بستە و نـاوكە كولەكەم هێنـابوو. زاوا تەمەن (٢٢) ساڵ بوو، كوڕە پووری بوكێ بـوو، لە كانەكاندا كرێكـاری دەكـرد. زاوا دوو بـرای تـری هەبـوو كە یەكێكیـان لەگەڵ خۆیدا لە كـانەكەدا كـاری دەكـرد و ئەوی تریـان شـوفێر بـوو، زاوا سـێ ڕۆژ مۆڵەتی وەرگرتبـوو. دیـاربوو گوزەرانیـان لە مـاڵی بـووك باشـتربوو، تـازە بە خشـتی قـوڕ خـانووی دروسـتكردبوو، لە ژێـر پێـی بووكێدا مەڕێكـی سـەربڕی. پـووری بـووكێ كە دایكـی زاوا بـوو هەمـوو كارەكـانی زەماوەنـدی ئەنجامدابوو. تێكڕای خەڵكی گوندەكە هاتبوون بۆ زەماوەندەكە. هەر كەسە و دیارییەكی

هێنـابوو، لانـیکەم هەرکەسـە بـایی ئەو خـواردنەی هێنـابوو کە ئەو ڕۆژە دەیخـوارد. زەماوەندێکی زۆر زۆر خۆش بوو، یەکێک بوو لەو زەماوەندە خۆشـانەی کە لە ژیانمدا تامەزۆری بینینی بووم. ژنان هەلهەلەیان لێدەدا و سووریان دەدا. من تەنها گوێم دەدایە هەلـهەلەی ژنـان و سـەیری شـتی تـرم نەدەکرد. پیـاوانی پیـر زۆر بەڕێزەوە و بەڕێـز دانیشتبوون، هەندێک جار لەنێو خۆیاندا دەیانگوت: ئەم گەنجـانەی ئێمە خەرکە خۆیـان کافردەکەن، وا تەکانی خۆیان دەدەن بەلای ژناندا. لە پیرە پیاوێکم پرسـی: لە زماوەندی تۆدا کەس سووڕی دەدا؟ ئەویش بەپێکەنینەوە گوتی: خۆیشـم سـووڕم دەدا و خەڵکیش سـووڕیان دەدا. هەرکەس بەویسـتی خـۆی بـوو لە ڕێگـای گەڕانەوەماندا بـۆ یەزد، ڕەزا گوتی: نانخۆرێک کەمیکرد، بەلام ئەوەندەی پێنج سـاڵ قەرزدار بووم. گوتم: خەمـی بۆ مەخۆ، خـودا گەورەیە. ڕەزا گوتی: بەلام مـن دوکـانەکەم بچـووکە، گوتم: هەرچـی بێت خـودا گەورەیە. گـوتی: بەلام لە هەمـووی خراپتـر هەزار تـومەنی حـاجی ئەشـرەفی سووخۆر قەرزدارم کە بۆ ئەو هەزار تـومەنە دەبێت هەمـوو مانگێک (٤٠) تومەن سـوو بدەم، نازانم پـارەی ئەم سـەگبابانە چۆن بدەمەوە، ڕەزا ئـاهێکی هەڵکێشـا و گوتی:خودا گەورەیە. دوو کـوڕە پـووری واتە دوو بـرای زاوا ڕۆژی پێشـتر چووبـوون بـۆ بـافق کە یەکێکیان لە کانەکان کاری دەکرد ئەوتریان شوفێر بوو. بڕیاروابوو، پاش چەند ڕۆژێکی تر بووک ببەن بۆ بـافق. ڕەزا گوتی: شـەوی هەینـی بـووک دەبەن بۆ بـافق ئەگەر حەز دەکەیت با بەیەکەوە بچین. گوتم: دێم شەش سـاڵ بـوو بـافقم نەدی بـوو. لە مـاوەی ئەم شـەش سـاڵەدا لە بـافق (٦٠٠) سـاڵ پێشـکەوتنی بەخـۆوە بینـی بـوو. جادەکـانی قیرتـاوکرابوون، هێڵـی شـەمەندەفەر بەتەنیشت جادەکانـدا دەڕۆیشـت. شـاری بـافق لە ڕووی بینا و جادە و دوکـان و بـازاڕەوە بەتەواوی گۆڕدرابـوو، چەندین هەزار کەس لە سەرتاسـەری ئێرانەوە بـۆ کـارکردن هـاتبوونە بـافق. کـانە ئاسـنەکانی بـافق بەتەواوی کەوتبـوونە کـار. خەڵـکە هەژار و بێکـارەکەی بـافق و بەهابـاد بەتەواوی کەوتبـوونە سـەرکار، سـاڵی (١٣٤٣-١٩٦٤) کە چـووم بـۆ بـافق لەسـەدا (٣٠-٤٠) ی خەڵـکەکەی بەتـایبەت منـداڵان، پێڵاویـان لەپێدا نەبـوو، بەلام سـاڵی (١٣٤٩-١٩٧٠) هـیچ کەسـێکت نەدەبینی کە بێ پێڵاو بێت. لە سـاڵی (١٣٤٣-١٩٦٤) دا ڕێگـای نێوان یەزد و بـافق (١٠) کـاتژمێر بـوو، بەلام لە سـاڵی (١٣٤٩-١٩٧٠) دا بە دوو کـاتژمێر ئەو ڕێگایەمـان بڕی. لە ڕێگـای نێوان یەزد و بـافق و بەهابـاد تاکسـی و پـاس و ئۆتـۆمبێلی بـارهەڵگر بە زۆری هاتوچۆیـان دەکرد، کـار بـۆ بێکارەکـان پەیدا ببوو، خەڵکیـی زۆر بەکەمـی دەچـوون بـۆ کەتیرە کـردن. بەگشـتی ئەو نـاوچەیە کە نـاوچەیەکی هەژارنشـین بـوو لە سـایەی کـانە ئاسنەکانەوە جوڵەیەکی باشی کارکردنی تێدا پەیدابوو. ئەکبەری کـوڕە پـووری ڕەزا کە

لە بافق لەسەر کۆمپرێسەر کاری دەکرد. (٥٠٠) تومەنی دابوو بەڕەزا پێیگوتبوو پوورزا ئەوەش بەشی من بۆ مەسرەفی مەراسمی بووک. ڕەزا گوتبووی: لێت وەرناگرم بەڵام بەزۆر پێی دابوو. ئیتر دەبوو هەر کەس لە خزم و کەسوکار بەشی خۆی پارەی بدایە. ڕەزا کە (٥٠٠) تومەنی وەرگرت، گوتی: خودا نەیبڕێت، ئەوە نیوەی پارەکەی ئەحمەد ئەشرەفی سووخۆرە. من لە یەزدەوە چووم بۆ مەشهەد پاش (٣) ساڵ کە گەڕامەوە. ڕەزا هەر لە دوکانەکەی خۆیدا بوو خەریکی بۆیاخکردن و پینەچێتی بوو. تەمەنی (٢٠) ساڵ بوو، بەڵام مووەکانی ماش و برنجی ببوون. ئەمجارەش کە یەکتریمان بەجێهێشت پاش (٤) مانگی تر چوومەوە بۆلای لە دوکانەکەی خۆیدا لە ماوەی ئەم (٤) مانگەدا وادەردەکەوت کە (١٠) ساڵە نەمدیوە، چونکە بە تەواوی پیرببوو، کە چاوم پێیکەوت و لە هەواڵیم پرسی یەکسەر دەستیکرد بە گریان، گوتم: بۆچی دەگریت؟ گوتی:کوڕە پوورەکەم، مێردی خوشکە گەورەکەم لە پێکدادانی ئۆتۆمبێلدا مرد و خوشکەکەم و (٣) منداڵی (١بۆ٥) ساڵ لە پاش بەجێماوە ئەرکی ئەوانیش کەوتوتە سەرشانی من و دەبێت بەخێویان بکەم. گوتم: ئەی براکانی هیچ هاوکاری خوشکت و منداڵەکان ناکەن؟ گوتی: نەوەڵلا چونکە براکەی تریشی کە لەسەر کۆمپرێسەر بوو، ئەویشان لەگەڵدا بوو پێکەوە مردن. ئەویش پێنج منداڵی لەدوا خۆی بەجێهێشتووە. ئیتر لەیەک کارەساتدا دوو کەس مردن و (٨) منداڵ و (٢) ژن سەرگەردان مانەوە. گوتم: سوپاسگوزاری خودای گەورە بکە، کارەساتێکە و ڕوویداوە هیچ دەسەڵات نییە. بە هەموو هێزی خۆی مشتێکی لە دوکانەکەدا و گوتی: بەڕاستی من چوومەتە ژێر بەدبەختی و نەهامەتییەوە. گوتم: کاکە ڕەزا تۆ تەمەنت لە (٢٠) ساڵ تێپەڕیوە، بۆ لە خەمی خۆتدا نیت و ژنێک ناهێنیت؟ گوتی: حسین ئاغا بەم هەموو گرفتارییەوە، ئەو هەموو کەسانەی کە بەسکی برسییەوە چاویان لەدەستی من و ئەم دوکانە بچووکە داخراوەیە، بەخەمی خوشکێکی بێوەژن و سێ منداڵیەوە، بە خەمی دوو کوڕی گەنج کە مردن و بەخەمی خوشکەکانم کە چاوەڕوانن من بەشوویان بدەم، ژن هێنانی چی؟! چ بەدبەختێک ئامادەیە شوو بەمن بکات. ئەو داماوانە چی لێبکەم. منیش زۆرم خەمخوارد، چونکە نەمدەتوانی هیچ کارێک بۆ ڕەزا بکەم. لە دڵی خۆمدا خۆم سەرزەنشت کرد ئەگەر من ئەو ڕۆژە نەچوومایە بۆ لای سەرۆکی شارەوانی و ئەو دوکانەم بۆ ڕەزا وەرنەگرتایە لەوەیە ڕەزا کارێکی باشتری بۆ هەڵبکەوتایە و ژیان و گوزەرانی لە ئێستا باشتر بوایە. ئێستا خۆی ئەسیری ئەم دوکانە کردووە. گەر وانەبوایە لەوانەیە بڕۆیشتایە بۆ شارێکی وەک تاران یا کەرەج یا شوێنێکی تر، لەوەیە ببوایە بە دەڵاڵی خانوو و زەوی، ئەم داماوە تەواوی تەمەنی خۆی لەم دوکانە بچکۆلانەدا بەسەربرد. لە ساڵی (١٣٥٢ تا ١٣٦٤-١٩٧٣ تا ١٩٨٥) واتە

(١٢) ساڵ ڕه‌زام نه‌بینی .چه‌ند ساڵێک که‌ دایکم له‌ مه‌شهه‌د لای من بوو هیچ کارێکیشم به‌یه‌زد نه‌بوو تا بچم، (٧) ساڵیش له‌ فه‌ڕه‌نسسا بووم. له‌ کۆتایی ساڵی ١٣٦٤، (سه‌ره‌تای ساڵی ١٩٨٦) چووم بۆ یه‌زد سه‌ردانی دوکانه‌که‌ی ڕه‌زام کرد، پیره‌مێردێک که‌ ته‌واوی سه‌ری سپی ببوو، لات و بێهێز سه‌ری شۆڕکردبووه‌وه‌، خه‌رکی بۆیاخکردنی پێڵاو بوو، سڵاوم لێکرد، به‌بێئه‌وه‌ی سه‌ری به‌رزبکاته‌وه‌ سڵاوی سه‌ندمه‌وه‌، لێم پرسی ئاغا ڕه‌زا له‌ کۆیه‌؟ سه‌ری به‌رزکرده‌وه‌ و سه‌یرێکی کردم و که‌مێک له‌ جێگه‌ی خۆی بڵند بوو، گوتی: حسێن ئاغا ئه‌وه‌ نامناسیته‌وه‌؟ من ڕه‌زام.! ئه‌ملاولای یه‌کتریمان ماچکرد و له‌سه‌ر کورسیه‌کی بچکولانه‌ له‌ ته‌نیشتییه‌وه‌ دانیشتم. گوتی: ده‌زانم که‌ پیربووم ته‌مه‌نم بووه‌ته‌ (٣٢) ساڵ، یه‌ک مووی ڕه‌ش له‌ سه‌رمدا نه‌ماوه‌، یه‌ک ددانیشم نه‌ماوه‌. ددانیشم دروست نه‌کردوه‌ته‌وه‌، پشتم چه‌ماوه‌ته‌وه‌. دواتر ده‌ستی کرد به‌ گریان، ئاغای جه‌واد کوڕی ئاغا سه‌ید ئه‌سه‌دوڵلای مسگه‌ر که‌ دوکانه‌که‌ی به‌رامبه‌ر به‌ ڕه‌زا بوو ئاگای لێبوو که‌ ڕه‌زا ده‌گری خێرا هات و گوتی: ئاغا ڕه‌زا شتێک ڕوویداوه‌ وا ده‌گریت؟. گوتی: نا ئاغا سه‌ید هیچ نه‌بووه‌، ئه‌مه‌ هاوڕێی کۆنمه‌ و به‌بینینی خۆشحاڵ بووم بۆیه‌ ده‌گریم. پاشان سه‌ید منی ناسییه‌وه‌ که‌ له‌ گه‌ڕه‌کی پشتی باخ دراوسێی یه‌کتری بووین. باوکی مسفرۆش بوو به‌ ولاخێکه‌وه‌ ده‌گه‌ڕا و مه‌نجه‌ڵی مسی ده‌فرۆشت، کاتێک منداڵ بووم هه‌ندێک جارێک سواری ولاخه‌که‌ی ده‌کردم. له‌گه‌ڵ سه‌ید جه‌واد به‌ منداڵی یارییمان به‌یه‌که‌وه‌ کردبوو. ئه‌گه‌رچی سه‌ید جه‌واد دوو سێ ساڵ له‌ من گه‌وره‌تر بوو. سه‌ید جه‌واد گوتی: ئای خۆ ئه‌مه‌ ئاغای پاپولییه‌! ئه‌ها دراوسێ به‌ڕێزکه‌م، بۆخۆت ته‌واوی جیهان گه‌ڕایت. پاریس یش خۆشبوو، ئه‌ی دایکت چۆنه‌؟ ڕه‌زا بێده‌نگ بوو له‌ دڵی خۆمدا گوتم: ئه‌م داماوه‌ چه‌ند به‌ئابڕووه‌ له‌ داخ و خه‌فه‌تی خۆیدا ده‌گریا که‌ ده‌ڵێت له‌ خۆشیانا ده‌گریم. پاشان به‌ خۆمم گوت، به‌نده‌ی خودا له‌ پاش (١٢) ساڵ دووریی و (٧) ساڵ له‌ فه‌ڕه‌نسا. لانیکه‌م دیارییه‌کی بچکۆلانه‌ی نایابت بۆ ڕه‌زا بهێنایه‌، ڕه‌زا گوتی:کارت هه‌یه‌ گوتم: نه‌خێر. گوتی: وه‌ره‌ بڕۆین له‌ شوێنێک دانشین و ده‌رده‌ دڵی خۆمت بۆ بکه‌م. دوکانه‌که‌ی داخست و ڕۆیشتین بۆ چایخانه‌یه‌ک. کاتژمێر نۆی به‌یانی بوو، تا کاتژمێر دووی دوای نیوه‌ڕۆ به‌یه‌که‌وه‌ بووین و هه‌ر به‌یه‌کیشه‌وه‌ نانی نیوه‌ڕۆمان خوارد. ڕه‌زا هه‌ر قسه‌ی ده‌کرد و ده‌گریا، پیاوێکی (٣٢) ساڵی وه‌ک بارانی به‌هار ئاو به‌چاویدا ده‌هاته‌ خواره‌وه‌. گوتم: چییه‌ ده‌ته‌وێت زیاتریش بگریت، گوتی: زۆر له‌مێژه‌ نه‌گریاوم، چه‌ند جارێک چووم بۆ مه‌راسیمی عاشوار تا تێر تێر بگریم. هه‌رچه‌ند به‌ڕواڵه‌ت بۆ ئیمام حسێن ده‌گریام به‌ڵام له‌ ڕاستیدا بۆ به‌دبه‌ختی خۆم ده‌گریام. به‌هه‌زار به‌دبه‌ختیی خوشکه‌کانم دان به‌شوو. منداڵه‌کانی ئه‌و خوشکه‌شم

که مێردەکەی به ڕووداوی ئۆتۆمبێل مرد، وا خەریکە گەورە دەبن. دایکە داماوەکەشـم لە سەرەتای شۆڕشدا لە تەمەنی (٤٥) ساڵیدا بەبرسێتی و هەژاریی مرد. ئێستا کۆمیتەی فریاکەوتن کەمێک هاوکاری ئەو مندالانە دەکات. بەڵام برا خوێڕییەکەم لە پاش خۆی دوو منداڵی بۆ جێهێشتووین. گوتم: بۆچی پێی دەڵێیت خوێڕی؟ گوتی: لەبەر ئەوەی ئەو ناپیاوە ئالوودە بوو، ژنەکەی کچی مامی خۆمـانە، مێردی خوشکەکەشـم هەر ئالوودە بووە و چوار منداڵی هەیە. ئاخر ئەم خوێڕییـانە بۆ خۆیـان ئالوودە کرد هەردووکیـان هیرۆیینیـان دەکێشـا. چەنـد جارێـک گیـران بێئـابڕووانە لە بیـری ژن و منداڵەکانیانـدا نەبوون. پاشـان گوتی: پار ئەوەنـدەم لێدا کە وامزانـی مـردووە و پێمگوت مافت نییە بێیتەوە بـۆئەم مـاڵە و بە ژنەکەشـیم گـوت، ئەگەر هـاتەوە بـۆ مـاڵەوە بەداریـک هەمـوو گیـانی بشـکێنە. پـار کـچە مـامەکەم واتە ژنـی بـراکەم بەگریـانەوە هـات بـۆلام و ژێـر نەدەبوەوە، پێمگوت چییە بۆ وا دەگریت؟ گوتی: برا بێشـەرەفەکەت، بۆ پارەی هیـرۆین پیاوێکی هێناوەتە ماڵەوە و پێی گوتم: دەبێت لەگەڵیدا بـخەوم، منیش ڕامکرد و هـاتووم بۆلای تۆ. منـیش خێرا ڕۆیشـتم بۆماڵیـان کە چووم سـەیرمکرد بێهۆش کەوتووە، هەتـا توانیم لێمـدا. کاتێـک لە ماڵیـان هـاتمە دەرەوە نـازانم لە خەفەتـا بـوو چـی بـوو، هەمـوو ددانەکانم کەوتنە ئـازار و لە مـاوە سێ مانگدا ددانەکـانم کەوتـن و پشـم چەمـایەوە. ئەو ناپیـاوە لەیەزد ڕۆیشـت و چـوو بـۆ بەنـدەر عەبـاس پـاش چەنـد مانێـگ لاشـەکەیان لە جۆگەیەکـدا دۆزیبـوەوە. گوتم: ئەی تـۆ ژنـت نەهێنـا؟ سـەیرێکی کـردم و گـوتی: بەکـام ژیانەوە ژن بهێنم! پاشان گوتی: چەند جارێک ویسـتومە، خۆم بکوژم بەلام مەلاکان لە مزگەوت دەیانگوت هەرکەسێک خۆی بکوژێت، خـودا لەودنیـا دەیخـاتە دۆزەخەوە. بەڵام من لەم دنیادا لە دۆزەخدا ژیام ئیتر تاقەتی دۆزەخی ئەو دنیام نییە. گوتی: ئەی تۆ چیت کرد؟ منیش کەمێک باسی پاریسم بۆ کرد و گوتی: تۆ دەزانی هەر کەسێک گوند و شـار و وڵاتـی خـۆی بەجێبهێڵێت و کـۆچ بکـات بـۆ شـوێنی دوور لە خەم و خەفەت ڕزگـاری دەبێت. ئەوەتا هەرکەسێک لە گوندەوە چووە تاران ژیانی زۆر باشتر بوو چەند کەسێک لە گونـدەوە چـون بـۆ کوێـت. بەپـارەی ئەوێ بـۆ خۆیـان پێگەیشـتن، بەڵام ئەم دوکـانە نەعلەتییە چوارپەلی منی بەست.

ساڵی (١٣٧٣-١٩٩٤) جارێکی تر چوومەوە بۆ یەزد، گوتم: با بڕۆم چاوێکم بە ڕەزا بکەوێت، ئەمجارەیـان لە مەشـهدەوە کەمێک دیـاریم بۆهێنـا بـوو، چـووم بـۆ جـادەی پەهلەوی، بینیم ئاغـای جەواد لە دوکـانەکەی خـۆی دانیشـتبوو، سـڵاوم لێکرد و وەڵامـی دامەوە و گوتی: هاوڕێی خۆشەویست ئەوە چییە هەر (١٠) سـاڵ جارێک پەیدا دەبیت؟ منیش هەواڵی ڕەزام لێپرسی. گوتی: خودالێی خۆشبێت (٤) سـاڵە مـردووە! گوتم: بەچی

مرد؟ گوتی: پیر بوو بۆیە مرد. گوتم: بۆچی ئاغا سەید جەواد مەگەر ڕەزا تەمەنی چەند ساڵ بوو؟ گوتی: من بزانم (٧٥-٨٠) ساڵ دەبوو! گوتم: پێویستە یادت بێتەوە، کاتێک کە ئەو لێرە دوکانی دانا تەمەنی (١٢) ساڵ بوو. گوتی: بەڵام دەزانیت کاتێک من هاتمە ئەم دوکانە ئەو پیر بوو. ئەو زۆر لە من و تۆ گەورەتر بوو. گوتم: ئەو لە دایکبووی (١٣٣٢-١٩٥٣) بوو، ئاغا سەید جەواد بەسەر سوڕمانەوە گوتی: نا، نا، بابە گیان تۆ گاڵتە دەکەیت، کەواتە کاتێک ئاغا ڕەزا مردووە تەمەنی (٣٦) ساڵ بووە. گوتم: هیچ هەواڵێکی کەسوکاری دەزانیت؟ گوتی: نەوەڵڵا. لە دوکانەکەی خۆیدا دانیشتبوو خەریکی بۆیاخکردن بوو، سەکتە لێیدا و تا ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن هات ئەو گیانی لەدەستدابوو. بردیان و ڕۆیشتن هەر نەمانزانی کە پرسەکەشی لە کوێ بوو! شارەوانی هات و دوکانەکەیان کۆکردەوە. ئیتر منیش زۆر خەمبار بووم، ویژدانم ئازاری دەدام، ئەگەر ڕەزا دوکانی نەبوایە چی دەبوو.. لەوانەیە ئێستا لە سویدەوە نامەی بۆمن بناردایە. لەوانەیە یەکێک بوایە لە ملیۆنێرەکانی شاری تاران، خۆ ئەم دوکانەش زیندانێک بوو بۆ ئەو.

## یەهودییەکانی یەزد

کە من منداڵ بووم ژمارەی یەهودییەکانی یەزد کەم نەبوون، بەڵام من یادەوریی کەمم لەگەڵیاندا هەیە، ئەوەی کە بیرم بێتەوە زۆربەکورتی دەینووسم، کاتێک منداڵ بووم، ئێمەیان بە یەهودییەکان دەترساند.

چیرۆکی ترسناکیان بۆ دەگێڕاینەوە، چیرۆکێک کە ئامانج لێی چاندنی تۆوی دووبەرەکی و بەدبینی بوو لە مێشکی ئێمەی منداڵاندا. کاتێک سارای یەهودیی کە بەکۆڵ شتی دەگێڕا بۆ فرشتن و کەلوپەلەکانی بڵاودەکردنەوە، ژنان لە دەوری کۆدەبوونەوە و بەقەرز شتیان لێدەکڕی. هەندێک جاریش دایکم یا ژنە دراوسێکان خواردنیان دەبرد بۆ مریەم، بەڵام ئەو نەیدەخوارد و ئەگەر برسی بوایە تەنها نان و ماست یان نانی وشکی دەخوارد. هەرچەندە پێیان دەیگوت خواردنێک کە گۆشتی تیابووایە نەیدەخوارد و هەرگیز دەستی بۆ خواردنێک نەدەبرد، کە گۆشتی تێدابووایە، فاتمە جان دەیگوت یەهودییەکان گۆشتێک ناخۆن کە کەسانی تر سەریان بڕی بێت، تەنیا گۆشتی ئاژەڵێک دەخۆن کە یەهودیی سەریان بڕی بێت. ژنان لەگەڵ مریەم دا زۆر میهربان بوون، هەروەها ئەویش لەگەڵ ژنان و منداڵان زۆر میهرەبان بوو، من تەمەنم (٧-٨) ساڵ بوو کە سارا هاتبوو کەلوپەلەکانی بڵاوکردبوەوە، ژنان شتیان لێدەکڕی. کاتێک ڕۆیشت، حسێن بیبی هەلی کە چەند ساڵێک لە من گەورەتربوو لە دایکی پرسی کە ڕاستە یەهودییەکان منداڵان دەرزیی ئاژن دەکەن؟ دایکی گوتی: ئەم قسانە درۆیە، منداڵەکان هەموویان گوتیان ئەگەر ئەم قسانە درۆیە ئەی بۆچی چیرۆکی لەو جۆرەمان بۆ دەگێڕنەوە؟ خەدیجە ژنی حەبیب ئەحمەد دایکی حسێن نیکۆکار گوتی: ئەو چیرۆکانە هەمووی درۆیە، کێشەکە جیاوازی ئایینە. من دەیان یەهودیی دەناسم کە هەمیشە شتیان لێدەکڕم بەتایبەت قوماش لە شەمعون و هارون دەکڕم. ئاغا حەبیب یش لەگەڵ ئەواندا کڕین و فرۆشتن دەکات، جگە لە ڕاستی شتێکی ترمان لەوان نەدیوە.

ژنێکی تر گوتی: یەهودییەکان هیچ جۆرە خۆراکێک بە موسوڵمان نافرۆشن، تەنها ئەمانە دەرزیی و بەکرە و پێویستییەکانی چنین و ئالتون و ئەو شتانە دەفرۆشن. هەمووشیان بەقەرز و قیست دەفرۆشن، فاتمە جان ژنی یەدوڵلا گوتی: من زیاتر لە (٥٠) جار چوومەتە ماڵی یەهودییەکان جگە لە ڕێز و بەخشندەیی هیچی ترم لێ نەدیون، ئەو چیرۆکانەش هەمووی لەپێناوی دووبەرەکییدایە، ئەگەر ئەوان منداڵان دەرزیی ئاژەن دەکەن لە ماوەی (٦٥) ساڵ تەمەندا لانیکەم دەبوایە من یەکێک لەو منداڵانەم بناسیایە. ئەگەر یەهودییەکان خەڵکیان ئازار بدایە نەیاندەهێشت ئەوان لە بازاڕی خان، بازاڕی زەڕەنگەری، بازاڕی قەیسەری، بازاڕی پەنجە عەلی و شوێنەکانی تر کارو کاسپی بکەن. لەوکاتەدا یەهودییەکان لەبازڕدا خاوەنی دەیان دوکان بوون، ڕەنگە لەسەدا پانزەی دوکانەکانی بازاڕی خان موڵکی یەهودییەکان بووبێت. من لە سەردەمی منداڵیمدا دەمگوت: بۆچی لەبارەی ئەم میللەتەوە، ئەم هەموو درۆیە دەگوترێت؟ کاتێک کە باوکم مرد تەمەنم (٦) ساڵ بوو، دایکم هەموو شەوێکی هەینی منی دەبرد بۆ سەر گۆڕی باوکم بۆ گۆڕستانی جەوهەر. ڕۆژێک باوکی ناسیاوێکی یەهودییمان مردبوو، ئەوانیش لە گۆڕستانی خۆیاندا ڕێورەسمیان هەبوو، دایکم منیشی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ گۆڕستانی یەهودییەکان کە لە بەتەنیشت گۆڕستانی موسوڵمانەکانەوە بوو، تەنها دیوارێکی بڵند لە نێوانیان دا بوو، کە تائێستاش هەر بەوجۆرەیە واتا نێوانی گۆڕی باوکم لەگەڵ گۆڕستانی یەهودییەکان (٣٠) مەتر زیاتر نابێت. لەو مەراسیمەدا دەربارەی کفن و دفن کە هیچ شتێکم بیرنایەت، بەڵام دەزانم کە ژمارەیەک موسوڵمان لەو مەراسیمەدا ئامادە ببوون، کاتێک تەمەنم (٧-٨) ساڵ بوو، بووکی یەکێک لە یەهودییەکانی بازاڕ منداڵی ببوو، سێ چوار ژن لەگەڕەکی ئێمە سەردانیان کرد و پیرۆزباییان لێکرد، ئەوانیش شیرینیان پێشکەش کردبوون، لە کاتی چوونیان بۆ ماڵیان من و حسێنی بیبی هەلی و محەمەد عەلی ئەکبەر گوتمان ئێمەش لەگەڵتان دێین. یەکێک لە ژنەکان گوتی: مەیەن یەهودییەکان منداڵ دەرزیی ئاژەن دەکەن. منداڵەکان گوتیان درۆ دەکەن، ئەی خۆتان پێشتر نەتانگوت ئەم قسان درۆن. ئێستا چونکە ناتانەوێت ئێمە لەگەڵ خۆتاندا ببەن بۆماڵە یەهودییەکان، دەڵێن منداڵ دەرزیی ئاژەن دەکەن. ئیتر دایکەکانمان ناچار بوون کە ئێمەش ببەن. ئەوە یەکەم جار بوو کە چوومە ماڵە یەهودییەک و نوقڵ و پاقلاوەم خوارد و کەسێکیش دەرزیی ئاژنی نەکردم.

لەوەپێش هەرگیز نەچووبوومە ماڵی یەهودیی، چونکە هیچ بۆنەیەک نەهاتبووە پێش تا بچم. کاتێک تەمەنم (١٠-١٢) ساڵ بوو جارێک چوومە سەر جۆگە ئاوەکەی عەلی مەندەلی و هەندێک ماسیم گرت، ماسیەکانم برد بۆ بازاڕ و بەشەمعونی یەهودییم

فرۆشت، ئەویش بەتەواوی پارەکەی پێدام، جارێکیان منداڵێک گوتی: شەمعون کاتێک ماسیمان لێ دەکڕێت نایانژمێرێت. ئەمجارەیان کە ماسیم بۆبرد لەبری ئەوەی بڵێم (٨) ماسییە دەڵێم (١٠) ماسییە، هەندێک لە منداڵەکان گوتیان ئەم کارە خراپە و ڕاست نییە، محەمەد عەلی گوتی: پارەی یەهودییەکان حەڵاڵە، بەم شێوەیە هەمووانی خستە سەر ئەو باوەڕەی کە درۆ بکەین، ئەوکات کیسەی نایلۆن نەبوو ماسیەکانمان دەخستە ناوکسیەی پەڕۆوە. شەمعونی دوکاندار بوو کاتێک کە ماسییەکانمان بۆ برد ئەویش نەیژماردن و پارەی (٨) ماسی پێدایین. ئێمەش گوتمان (١٠) ماسی بوون، شەمعون گوتی: ئێوە کە موسوڵمانن هەرگیز درۆناکەن، دیارە دوو ماسی لە کیسەکە دا لە ڕێگا لێتان کەوتووە. من داوای لێبوردن دەکەم، لەم سەودایەدا لە یەک شت تێگەیشتم و لە شتێکی تریش تێنەگەیشتم. لەوە تێگەیشتم کە منداڵی موسوڵمان نابێت درۆ بکات، بەڵام لەوە تێنەگەیشتم و ئێستاش لەلای من پرسیارە کە چۆن شەمعونی قوماش فرۆش بەبێ ئەوەی ماسیەکان بژمێرێت یاخود سەیری کیسەکە بکات زوو زانی کە ماسیەکان (١٠) ماسیی نین بەڵکو (٨) ماسییە.

کاتێک تەمەنم (١٣-١٤) ساڵ بوو، بەسواری پاسکیل دەچووم بۆ قوتابخانەی ڕووکنییە و ڕۆژێکیان بڕیارمدا کە لەبری ئەوەی لە جادەکانەوە بڕۆم بۆ قوتابخانە لە ڕێگای کۆڵانەکانەوە بڕۆم باشترە. کاتێک کە گەیشتمە گەڕەکی یەهودییەکان ترسێک لە دڵم نیشت کە نەبا چیرۆکی دەرزیی ئاژنەکە ڕاست بێت، لە گەڕەکی یەهودییەکاندا گیربخۆم بەدەستیانەوە، منیش بەخێرایی لە گەڕەکەکەیانەوە ڕۆیشتم پاش چەند جارێک هاتن و ڕۆیشتن ترسم شکا، چونکە ئەم ڕێگایە کورت بوو. ڕێگای بازاڕ جەنجاڵ و دوورتر بوو، لە ڕێگادا چاومدەکەوت بە ژن و پیاو و منداڵانی یەهودیی و سڵاوم لێدەکردن، لە ڕۆژێکی هاوینی گەرمدا لە گەڕەکی یەهودییەکاندا بەخێرایی پایدەرم لێدەدا و نەمزانی چۆن بوو، کە بەزەویدا کەوتم و دەستم بریندار بوو. دوو سێ ژنی یەهودیی کە لە کۆڵانەکەدا بوون هاتن بەلامەوە وچوون ئاو و پارچە قوماشیان بۆ هێنام و دەستیان بۆ شۆردم و بەپارچە قوماشێکی سپی بۆیان بەستم، یەک پەرداخ شەکراوین بۆهێنام، ئەوەندەی من بزانم یەهودییەکانی یەزد کەسانێکی ئارام و بێدەنگ و میهرەبان بوون. زۆربەی یەهودییەکانی یەزد لە نێو بازاڕدا دوکانیان هەبوو یاخود بەکۆڵ کەلوپەلیان بەکۆڵانەکاندا دەگێڕا و دەیانفرۆشت، نزیکەی لە زۆربەی زۆری ماڵەکانیشدا دەزگای چنینیان هەبوو، کە بەڕە و جاجم و شتیان دروستدەکرد، جگە لەوەش کاری تەشی ڕێسی و چینینی دەستیان ئەنجام دەدا، کە باشترین لفکەیان دروستدەکرد. ئەگەر ئێستا لەو لفەکەیە هەبووایە و نرخی یەک لفکە (١٠) هەزار تومەن بووایە هێشتا زۆر

هه‌رزان بـوو. له ســاڵی (١٣٤٠-١٩٦١) نـزیکه‌ی (٨٠٠- ٩٠٠) مـاڵه یه‌هــوودیی له یه‌زد هه‌بـوون که له گه‌ڕه‌کـی یه‌هودییه‌کـان له ناوه‌ڕاسـتی شـاردا نیشـته‌جێ بـوون. حاخـام یوسـف کـۆنه هه‌مه‌دانـی ده‌یگـوت: له سـاڵی (١٣٣٥تـا١٣٤٠-١٩٥٦ تـا ١٩٦١) ژمـاره‌ی یه‌هودییه‌کانی یه‌زد (٥) هه‌زار که‌س بووه، ئه‌گه‌ر ئه‌م ژماره‌یه زیـاد بێت ئه‌وا ئۆبـاڵی به‌ ئه‌ستۆی ئه‌م حاخـامه یه‌هـودییه که له سـاڵی (١٣٨٧-٢٠٠٨) وه دانیشـتووی تـارانه. ئه‌و، ئه‌و ئاماره‌ی داوه به من. که دڵنیام قسه زۆر ده‌کرێت له‌سـه‌ر ئه‌م ڕێژه‌یه که له سـاڵانی (١٣٣٥تـا١٣٤٠-١٩٥٦ تـا ١٩٦١) ئه‌م ژمـاره یه‌هـودییه له یه‌زددا نه‌بووه، ئه‌م نووسـینه‌ی من ده‌ینووسـم بیره‌وه‌رییه نه‌ک لێکۆڵینه‌وه، بۆیه پێویسـته لێکۆڵه‌رێکی شـاره‌زا بێت و لێکۆڵینه‌وه له‌و باره‌یه‌وه بکات. ئاماره ڕاسته‌که بنووسێت که گوایا یه‌که‌مین جار ئامـاری یه‌هودییه‌کـانی شـاری یه‌زد له ڕۆژ ژمێـری سـاڵی (١٣٠٥- ١٩٢٦) دا بـڵاو کـراوه‌ته‌وه، گه‌ڕه‌کی یه‌هودییه‌کان که گه‌ڕه‌کێکی تایبه‌ت به خۆیان بوو هیچ یه‌هـودیه‌ک له ده‌ره‌وه‌ی ئه‌م گه‌ڕه‌که نه‌ده‌ژیا، به‌ڵام زۆربه‌ی یه‌هودییه‌کان کاروکاسپیان له ده‌ره‌وه‌ی ئه‌م گه‌ڕه‌که بوو، ژماره‌یه‌کیشیان به‌کۆڵ شتیان ده‌برد بۆ لادێکـان و له‌وێ ده‌یانفرۆشت، یه‌کێک له‌و فرۆشیاره گه‌ڕۆکانه (ئه‌برەقۆ) بوو، که تـا ئێسـتاش ناوبـانگی هه‌رمـاوه، زۆربه‌یـان زۆر ده‌وڵه‌مه‌نـد بـوون، له گونـده کوێسـتانییه‌کاندا ڕه‌ز و باخیـان هه‌بوو، هاوینـان ده‌چـوون له‌وێ داده‌نیشـتن، به‌ڵام ئێسـتا یه‌هودییه‌کـان نـاتوانن له کلیسـاکانیان دووربـکه‌ونه‌وه، ئه‌وه‌ی که له مێشـــکی منـــدا مـــاوه له‌بـــاره‌ی یه‌هودییه‌کـــانه‌وه هه‌ر ئه‌وه‌یه که ئه‌وان خه‌ڵکانێکی کاسبکار و زه‌حمه‌تکێش بوون، ئه‌وان ته‌نهـا خه‌ریکی کار و کاسپی خۆیـان بوون و زیانیان بۆ هیچ که‌سێک نه‌بوو. یه‌هودییه‌کان جگه له‌وه‌ی که ئێرانییه‌کی ڕه‌سـه‌ن بوون و ڕه‌نگه یه‌کێکبن له کۆنترین گه‌لانی ئێران، هه‌ر بۆیه‌ش کۆنترین و ڕه‌سه‌نترین خه‌ڵکـانی شـاری یه‌زدن، هه‌رگیـز هـیچ کێشـه‌یه‌کیان بـۆ موسـوڵمانانه‌کان دروسـت نه‌کـردووه. به‌ڵام هه‌نـدێک جـار که‌سـانێکی موسـوڵمان بوختـان و چیرۆکـی درۆیـان بـۆ یه‌هودییه‌کان هه‌ڵده‌به‌ست و هه‌ندێک جاریش له کوچه و کۆڵانه‌کاندا منداڵان ئه‌زیه‌تـی یه‌هودییه‌کانیـان ده‌دا، به‌ڵام ئه‌وان بێده‌نگ ده‌بوون. مـن مه‌به‌ستم نییه لێره‌دا مێژووی یه‌هودییه‌کـانی شـاری یه‌زد بنووسـمه‌وه، به‌ڵام وه‌ک بیره‌وه‌رییه‌ک ده‌بێت بـاس بکرێت، به‌گشـتی ئه‌و چـوار، پێنج هه‌زار یه‌هـودییه‌ی که زیـاتر له (٢) هه‌زار سـاڵه له شـارێکدا له‌گه‌ڵ موسـوڵمان و زه‌رده‌شـتی دا به‌یه‌که‌وه ده‌ژیـان، خـۆی به‌ڵـگه‌ی لێبـورده‌یی و ئاشتیانه‌ی ئاشتیخوازیی شـاری یه‌زد و ئێران و موسوڵمان و زه‌رده‌شتی و یه‌هودییه. گه‌وره‌ترین میراتی فه‌رهه‌نگییه، که ئێمه به‌هه‌مـوو جیهـانی ڕابگه‌یه‌نین که له ڕابردوودا چه‌ند گه‌ل و مه‌زهه‌بێک به‌بێ توندوتیژیی ژیـانێکی ئاشـتیانه‌مان به‌یه‌که‌وه بردۆته سـه‌ر،

کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هیچ لایەنێکیان نەبوونەتە هۆی کێشە و نارەحەتی بۆ ئەوانی تر. کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر قسەکەی پرۆفیسۆر (گزاویە دوپلانول) مامۆستای پێشکەوتووی زانکۆی سۆربۆنی فەرەنسا کە لە کتێبەکەیدا بەناوی کەمینەکان لە ئیسلامدا، موسوڵمانەکان سەد ئەوەندەی مەسیحییەکانی ئەوروپا لەگەڵ کەمینە مەزهەبییەکان باشتر و زیاتر گونجاون.

کاتێک لە مانگی دەی ساڵی (١٣٨٧- کۆتایی ٢٠٠٨) بۆ ئامادەکردنی یادەوەرییەکانم سەردانی گەڕەکی یەهودییەکانی یەزدم کرد، ئەو جوڵە و جەنجاڵییەی جاران نەمابوو. بازاڕی چواربازاڕ کە ڕۆژگارێک بە جۆشوخرۆش بوو زۆر کپ و بێ جوڵەبوو. دوکانەکان داخرابوون تەنها کتێبخانەی وەزیری مابوو کە چەند کەسێک هاتوچۆیان دەکرد و کەمێک ڕەونەقی بەبازاڕە خامۆشەکە دا بوو، بەرامبەر دەرگای پشتەوەی کتێبخانەکە ماڵی هارونی یەهودیی بوو،کە کارمەندێکی خانەنشین بوو، هارون هەندێک جار نزای دەنووسی هەر بەو هۆیەشەوە ژمارەیەک لە موسوڵمانان سەردانیان دەکرد بە تایبەت ژنان، بۆ وەرگرتنی نزا دەچوونە ماڵیان. بۆ وەگرتنی زانیاری زیاتر لەسەر ژمارەی یەهودییەکانی شاری یەزد چووم بۆ ماڵی ئاغا خوداداد گەوهەریان ماڵەکەی لە پشتی مزگەوتی جامیعەوە بوو، کاتی نوێژی نیوەڕۆی هەینی بوو، کە لە دەرگاکەیانمدا دەرگایان کردەوە و فەرموویان لێکردم، داوام لێکردن کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەنجامبدەم، بەڵام گوتیان سبەی ڕۆژی شەممەیە و دەبێت وتار ئامادەبکەین و شەممە ڕۆژی پشووە و ڕۆژی عیبادەتی یەهودییەکانە بۆیە ڕۆژی یەکشەممەمان دیاریکرد لە دوکانەکەی خۆیاندا. دوکانی خوداداد گەوهەریان لە جادەی قیام بوو بەرامبەر بازاڕی خان، خۆی و دوو کوڕی بەناوەکانی ئیسحاق و یەعقوب زۆر بەمهیرەبانییەوە پێشوازییان لێکردم و باسی ژیانی یەهودییەکانیان بۆکردم و لەو ژمارە زۆرەی (٨٠٠-٩٠٠) ماڵی یەهودییە لە ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) دا ئێستا تەنها (١٢) ماڵ ماوە کە سەرجەمیان ناچێنە (٦٠) کەس زۆربەی یەهودییەکان کۆچیان کردووە بۆ دەرەوەی وڵات، بەتایبەت وڵاتی ئەمریکا، هەندێکیشیان چوونە شارەکانی تاران و ئەسفەهان و شیراز. ئاغا خوداداد گەوهەریان و کوڕەکانی سوپاسی حکووت و میهربانی خەڵکی شاری یەزدیان کرد، نزیکەی سێ کاتژمێر لە دوکانەکەیاندا مامەوە و وەڵامی سەرجەم پرسیارەکانیان دامەوە. گوتیان کێشەی گەورەی یەهودییەکانی یەزد کەمی ژمارەیانە لەم شارەدا، چونکە ئەگەر گەنجەکانیان بیانەوێت ژیانی هاوسەرگیریی پێکبهێنن ئەوا کچی هاوتەمەنی خۆیان لێرە دەستناکەوێت، چونکە یەهودییەکانی شارەکانی تر نایەن بۆ یەزد، لە بازاڕی زەرەنگەرەکانیش سەردانی دوکانی سلێمان جەرمان مقەدەمم کرد

کورەکانی ئەویش لە زانکۆی دەرەوەی یەزد وەرگیرابوون و خەریکی خوێندبوون، ئەویش گوتی: ڕەنگە کورەکانم هەرگیز نەگەڕێنەوە بۆ یەزد، لە مانگی دەی ساڵی (١٣٨٧- کۆتایی ٢٠٠٨) دا لە کۆی (١٢) ماڵ یەهودیی چوار سەرۆک خێزان بازرگان بوون یەکێکیان کارمەندی خانەنشین بوو، ئەوانی تریان دوکاندار بوون.

سەردەمێک لە گەڕەکی یەهودییەکان ژمارەیەکی زۆر دوکان و دامەزراوە هەبوون، کە دوو نانەوا و دوو گۆشتفرۆش و یەک گەرماو و دوانزە کەنیسە بوون، کە هەموویان لەلایەن خودی یەهودییەکانەوە بەڕێوەدەچوون و خزمەتیان دەکرا، بەڵام ئێستا گەرماو و گۆشتفرۆش و نانەوا داخراون، هەر بەدوومانگ جارێک پیاوێکی ئاییني یەهودیی لە شیراز یان ئەسفەهان یان تارانەوە دێت بۆ سەربڕینی مەڕو گوێلکە و باڵندە، چونکە سەربڕینی ئاژەڵ لە دینی یەهودییدا زۆر سەخت و پڕ کێشەیە و کاری هەموو کەسێک نییە بەپێی ئەو دینە سەربڕینی هەموو گیانلەبەرێک کاری پیاوی ئایینییە. لەکۆی (١٢) کڵێسا تەنها سێ کڵێسا مابوون، کڵێسای مەلا ئاغا بابا، کڵێسای هاداش و کڵێسای یەخود، کە ئەمانەش بە نۆرە هەرهەفتەی یەکێکیان دەکرانەوە. گەڕەکە جوان و ڕازاوەکەی یەهودییان ئێستا وێرانەیە، زۆربەی ماڵەکان لەلایەن موسوڵمانانی یەزدەوە کڕدراون و دووبارە دروستکراونەتەوە. گۆڕستانی یەهودییەکانی یەزد یەکێکە لەو شوێنانەی کە ساڵانە ژمارەیەکی زۆری یەهودیی سەردانی دەکەن، چونکە یەهودییەکان خزم و کەس و خۆشەویستەکانیان لێرە بەخاک سپاردووە و دێنە سەرگۆڕەکانیان.

هاراب ئورشەرگا بن هاراب شەمۆئیل، پیاوی ئایینی گەورەی یەهودیی یەزدی کە جێگای ڕێزی هەموو یەهودییەکانی ئێرانە و لە (٢٨) مانگی حەشوانی ساڵی (٥٥٥٤)ی عیبری بەرامبەر ساڵی (١١٧٢) ی هیجری شەمسی کۆچی دوایی کردووە، لەم گۆڕستانە بەخاکیان سپاردووە، لە ساڵ و ڕۆژی کۆچی ئەم پیاوە ئایینییە گەورەیەدا هەموو ساڵێک ژمارەیەکی زۆری یەهودییەکان لە سەرتاسەری ئێرانەوە دێنە یەزد. ئێستا ڕەنگە ئێوە بەخۆتان بڵێن بڕیاربوو نووسەر یادەوەرییەکانی سەردەمی لاوی خۆی بنووسێتەوە، بەڵام باسی یەهودیی و ساڵی (١٣٨٧-٢٠٠٨) دەنووسێت، بەڕاستی کاتێک بیرم لێکردەوە ئەگەر ئەم چەند وشەیە لێرەدا نەنووسم لەوەیە لەهیچ شوێنێکی تر بۆم نەنووسرێت.

لە ڕابردوودا ژمارەی یەهودییەکانی یەزد زۆر زۆر بوون، پیاوە ئاینییەکانیان پەیوەندییەکی باشیان هەبوو لەگەڵ پیاوانی موسوڵمانی یەزد، خاخام یوسف کۆنە هەمەدانی هەمیشە لە پەیوەندیدا بووە لەگەڵ ئایەتوڵڵا فەقێ خوراسانی پیاوی گەورەی ئایینی یەزدی، ئایەتوڵڵا فەقێ خۆراسانی، جێگای ڕێزی موسوڵمانان و هەموو کەمینە

دینییەکانی تر بوو، کاتێک کۆچی دوایی کرد یەهودییەکانی یەزد لە مزگەوتی حەزیرە پرسەیان بۆ دانا. کاتێک منداڵ بووم یەهودییەکانم دەبینی بەرِیشی درێژ و جلوبەرگی تایبەتی خۆیانەوە کە بەشدارییان لە مەراسیمی پرسەی حاجی شێخ غولام رەزادا دەکرد، واهەستم دەکرد کە ئەمانە هەموو یەک بیروباوەرِیان هەیە بە موسوڵمان و یەهودیی و زەردەشتییەوە، من لەم پرسەیەدا بۆ یەکەمجار خاخامی یەهودییەکانم بە رِیشی درێژەوە بینی، خاخام یوسف کۆنە هەمەدانی کە ئەوکات تەمەنی (٤٠) ساڵ دەبوو.

## کەتیرەکەران

بەسەرهاتی کەتیرەکەران بەشێکی گرنگی ئەم یادەوەرییانە پێکدەهێنێت، لەبەر چەند هۆکارێک، یەکەم بەشێکی گرنگی یادەوەرییەکانی سەردەمی لاویمە کە دووجار لە سەردەمی لاویم دا تەنها بۆ کێوەکانی کوردستان گەشتم کردووە و لەگەڵ خەڵکانی ئەوێدا تێکەڵاو بووم، دووەم وابزانم کە تا ئێستا هیچ کەسێک دەربارەی ژیانی ئەوان هیچی نەنووسیوە. سێیەم ئەو کەتیرەکەرانە دۆستی سەردەمی لاویم بوون. ئەو کەتیرەکەرانە بە هەوڵ و ماندووبوونی خۆیان سەرجەم خێزانەکانی خۆیان لە برسێتی و هەژاریی ڕزگارکرد. لەوانەیە وانەیەک بێت بۆ ئەوکەسانەی کە لە سەردەمی لاوێتیاندا نانەکەیان بەئامادەکراوی هاتبێتە بەردەمیان و خۆیان کەسانێکی تەمبەڵ و گەلۆرن. مانگی (ئوردی بەهەشتی ساڵی ١٣٤١- نیسان و ئایاری ساڵی ١٩٦٢) بوو، هێشتا تاقیکردنەوەکانی سەری ساڵ دەستی پێنەکردبوو من ئەوکات تەمەنم لە (١٤) ساڵ زیاتر نەدەبوو. دوو پاس لە گەراجدا ئامادکرابوون کە بڕۆن بۆ بافق و کرێکارانی کەتیرە بهێنن. بڕیاربوو منیش لەگەڵ ئەواندا بچم بۆ بافق. پێشتر باسی جادی خوڵی یەزدم کردووە، پاش (٥-٦) کاتژمێر پاسەکان گەیشتنە بافق. لەلای مزگەوتەکە خەڵکێکی زۆر کۆبوونەوە کە هەموویان ڕەنگوڕوویان ڕەشهەڵگەڕا بوو، هەر لەپیاوی (٥٠-٦٠) ساڵەوە تاکو منداڵی(٨-٩) ساڵ. کە ئەمانە هەموویان بە ئۆتۆمبێلی باریی لە گوندەکانی بەهاباد و بافقەوە هاتبوون. هەر(١٠-١٥) کەسێک لێپرسراوێکیان هەبوو، کە پێیان دەگوت ئابا، وەکو ئابا حەسەن، ئابا حەیدەر، هەر (٤٠-٥٠) کەس کەسێکی تر لێپرسراویان بوو، کرێکارانی گەراج تێکڕا کەتیرەکەرانیان سواری پاسەکان کرد، هەندێکیان لەسەر پاسەکان سواردەکردن. چەند کەسێکیان بوخچەیان پێبوو کە کەمێک نانی وشک و ژێرشەرواڵێک و کراسێکی تێدابوو. بەڵام هەندێکیان هیچ شتێکیان پێ نەبوو. ئەمانە بۆ ماوەی (٤-٥) مانگ بەکرێ گیرابوون، بەشێوەیەک کە هەموو مەسرەفیان لەسەر

خاوەنکـار بـوو. ئەوانـیش دەبـوو لە بەیـانی زووەوە تـا ئێـوارە کاریـان بکـردایە. ئەم بەکرێگـرتنە جۆرێـک بـوو لە دیلێتـی. ئەم هەژارانە، خۆیـان بۆمـاوەی (٤-٥) مانـگ دەفرۆشـت .لەبەرامـبەردا تەنهـا ئەوەنـدە نانیـان دەخـوارد تـا نەمـرن. دەبوایە تاهێزیـان تێدابووایە کاریـان بکـردایە، لەوێـدا وشـەی کرێکـار بەکارنەدەهـات، بەڵکـو دەیـانگوت بەکرێگیراو. نیوەشـەو لە بافقەوە بەڕێکەوتین و بەرەبەیانی زوو گەیشتینە یەزد، گەراج پڕ ببوو لە کرێکاری کەتیرە، جەواد دالاندار بە ئاغـای وەتەنخوای بەڕێوەبەری گەراجی گوت، کە بەزوویی ئەمـانە بەرەو قەزوێن بەڕێبکەن. چونکە هەمـوو گەراجەکەیـان پیس کـردووە، لەبەرئەوەی زۆربەیـان یەکەمجاریـان بـوو هـاتبوونە شـار و لە گونـدەکانی خۆیانـدا توالێـت نەبـوو لەهەر شـوێنێک بگەیشـتنایە لەو چۆڵەوانیـانە خۆیـان خـاڵی دەکـردەوە، لە گەراجەکەدا تەنهـا (٤-٥) توالێـت هەبـوو، ئەمـانیش هەر لە حەوشـی گەراجەکەدا کوێیـان بویسـتایە، خۆیـان لـێ خـاڵی دەکـردەوە. سەردەسـتەکانیان نـانی وشـکیان بەسـەردا دابەشـکردن و بڕیـاردرا هەموویـان بە دوو پـاس بەڕێبکـرێن بەرەو قەزوێن، هەر پاسێک نزیکەی (١٠٠) کەسیان تێدەکرد، سەردەستەکانیان کرێی پاسـیان نەدا کە بڕیـاربوو پاشـان کرێـی پاسـەکان بـدەن. بەڵام بەرلەوەی بەڕێـبکەون بـۆ هەر کرێکارێک (٥٠-١٠٠) تومەن پارەیان بەسـەردا دابەشکرا. ئەوانیش بەو پارەیە شـەکر و چا و ئاردیان کڕی و ناردیانەوە بۆ گوندەکانیان بۆ ژن و منداڵ و باوک و دایکیان. هەر لێرەدا هەژاریـی و بەدبەختـی ئەم کرێکـارانە دەرکەوت. کرێکارەکـان کاتێک کە سـواری پاسەکان بوون، دەبوو ڕاستەخۆ بڕۆن بۆ قەزوێن. ئەگەر لە ڕێگادا بووەستانایە ئەوا هەموویان دادەبەزین، ئیتر خۆیان نەیاندەتوانی وا بەئاسـانی سـواربببنەوە و هەرکەس لە شوێنیی خۆی دابنیشێتەوە. چونکە نزیکەی (١٠٠) کەس سـواری پاسـێکی (٣٨) نەفەریـی ببوون. هەر لەوێ نانی وشکی و گۆزە ئاویان پێدان و پاشان پاسەکان کەوتنەڕێ.

مـن ئەو سـاڵە دوو سـێ جـار بەسـواری پـاس چـووم بـۆ بـافق و کەتیـرە کەرانمـان دەهێنـان بۆ یەزد، زۆرم حەزدەکرد بچم بۆ قەزوێـن و کوردسـتان و کـارکردنی ئەوان ببیـنم. کاتێـک ئەم کەتیـرەکەرانە دەگەیشـتنە گەراجـی قەزوێـن، نـوێنەری بازرگانـانی کەتیرەکەران لەوێ ئامادەبوون، پـارەی کـرێ پـاس و پـارەی هاوکـاری، کە لە گەراجـی یەزد وەرگیرابـوو بەزوویـی دەیانـدانەوە. گەراجـی یەزد دەبـوو نـوێنەرێکی لە قەزوێـن هەبووایە بۆئەوەی پارەکە وەربگرێت و بەزوویی بینێرێتەوە بۆ یەزد، تا ئەو پـارەیە بۆ گروپی کەتیرەکەرانی دواتر سوودی لێوەربگیرایە. سـاڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) وا بڕیـاربوو کە من وەک نوێنەری گەراجی یەزد بڕۆم بۆ قەزێن. دوایـن تـاقیکردنەوەی قوقابخـانە تەواو بوو، منیش ڕۆیشتم بۆ قەزوێن (٤) ساڵ هەر ساڵەی یەک مانگ لە قەزوێن دەبووم کە

کـاری پـارەوەرگرتن و نـاردنەوەیم بـۆ یەزد لە ئەسـتۆ بـوو، ئەم کـارە بەشـێکە لە یادەوەریی سـەردەمی لاویـم کە ئەگەر بمەوێت هەمووی بنووسـم وا بەئاسـانی کۆتـایی نایەت. هەرچۆنێک بێت ڕۆیشتم بۆ قەوزێن منی چاونەکراوەی گیرفان بەتاڵ سـواری ئۆتۆمبێلی کەتیرەکەران بووم و چووم بۆ قەزوێن. نە تاکە ڕیاڵێک لە گیرفانمدا بوو و نە بەڕێوەبەر و سەرپەرشـتیارانی گەراج گوتیـان تـۆ دەچیت بـۆ قەزوێـن بـۆ ئەنجامـدانی کاری ئێمە پارەت پێیە یان نا؟ ئۆتۆمبێلەکە هی ئاغای حیشمەت ئەردەکانی بوو، لەڕێگا خواردنم لەسەر شوفێرەکە بوو، کە گەیشتمە قەزوێن نوێنەری بازرگانەکان پارەکەیـان ڕادەستکردم، منیش پێنج تومەنم بۆ خۆم هەڵگرت و ئەوی ترم بەخێرایی برد بۆ بانک و حەواڵەی یەزدم کـرد. لەو سـاڵانەدا جـادەی یەزد تـا شـاری قـوم هەمـووی خـۆڵ بـوو، تەنانەت لە شارەکانی ئەردەکان ونائین کە بەوێدا گوزەرمان دەکرد نێوشار و کۆڵانەکان هەمووی گڵ بوون. هیچ چایخانەیەک ڕێگای نەدەدا کە ئۆتـۆمبێلی کەتیرەکەران لەلایەن بووەسـتێت چـونکە کرێکـارانی کەتیرەکەران نە نانیـان دەخـوارد و نە چایـان دەخـوارد، تەنهـا توالێتەکانیـان پیس دەکرد، پاسـەکان لە چۆڵەوانییەکدا ڕاوەسـتان بـۆ نـوێژکردن، هەمـوو سەرنشـینان دابەزیـن، بەڵام چـۆن دەتـوانن سـواربینەوە! هەر چۆنێـک سـوار دەبـوون ئۆتـۆمبێلەکە پـڕ دەبـوو، بەڵام (١٠-١٥) کەس لە دەرەوە دەمـانەوە، پاشـان بە یارمەتی شوفێر و هاوکارەکەی هەموویانیان سوارکردەوە. لەسەر هەر کورسییەک سێ کەسی گەورە و لە ناوەڕاستی کورسییەکانیشدا چەند کەسێکی بچووک بەسـەریەکەوە دادەنیشـتن. لەو سـەردەمەدا بەهـیچ شـێوەیەک پۆلیسـی هـاتوچۆ نەبـوو، کەتیرەکەرانـی داماو هەموویان نـانی وشکیان بە ئـاوەوە خواردبوو، لەنێو پاسـەکەدا هەموویـان بایـان کردبوو، دەرشانەوە حیشمەت ئاغاش شووشەکەی کردبۆوەو دەستی هێنـابووە دەرەوە، بە دەسـتەکە تـری سـوکانی گرتبوو، کـاتژمێر (١٠) ی بەیـانی لە یەزد بەڕێکەوتبووین و بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر گەیشتینە کەرەچ. ئاغا حشمەت دەیویست وابگەینە قەزوێن کە کەتیرەکەران لەوێ نوێژی بەیانی بکەن، کەرەج شارێکی بچکۆلانەبوو لە دەروازەی شار ئەفسەرێکی سەربازیی وەستابوو دەستی هەڵبڕی ویستی تا قەزێن لەگەڵمانـدا بێت ئاغـا حیشمەت پێیگوت: پاسەکە پڕە لە کرێکاری کەتیرەکەر وجێگا نییە بەڵام ئەو گوتی: هەر چۆنێک بێت سـەردەکەوم و لەگەڵ ئێوە دێم، ئاغـای حیشـمەت گوتی: ئاخر ئەمە پاسـی کەتیرەکەرانە، ئەفسـەرەکە گوتی: کەتیرە مانـای چییە؟ دەرگـای پاسـەکەی کـردەوە کە سـواربێت بەڵام لە بەردەمـی دا دوو منـداڵ خەوتبـوون کە دەرگـای پاسـەکە کـرایەوە، دوومنـداڵەکە کەوتـنە خـوارەوە، بـۆن و بەرامەی ناخۆشـی نـاو پاسـەکە هـات بەسـەر ئەفسەرەکەدا و ئەویش لوتی خۆی گرت و گوتی: تێگەیشتم کە کرێکاری کەتیرە چییە؟

هاوکاری منداڵەکانی کرد تا سواربوونەوە و دەرگای پاسەکەی داخستەوە و نەیتوانی لەگەڵ ئێمەدا بێت، هەرچۆنێک بێت گەیشتینە قەزوێن و چووینە گەراجی تەهماسپی لە نزیک سەوزە مەیدانی قەزوێن، بەیانی نوێنەرەکان بەخۆیان و پارەوە هاتن، منیش لەگەڵ چەند کەسێکی تر ئاشنابووم و ئوتێلێک لە پشت گەراجەکەوە بوو چوومە ئەوێ و شەوی (١٥) ڕیاڵم دەدا، کرێکەی خۆی شەوی بە (٢٥) ڕیاڵ بوو، بەڵام چونکە من یەک مانگ دەمامەوە و نوێنەری گەراجیش بووم، ڕێکەوتین شەوی بە (١٥) ڕیاڵ. من گەواهیدەری سەدەها کرێکاری کەتیرەم، کە لە یەزدەوە دەهاتن بۆ قەزوێن و لەوێوە دەچوون بۆ دوورترین شوێنی کوردستان، یاخود بۆ ئازەربایجان و زنجان. بازرگانانی کەتیرە، شاخ و کێوەکانیان لە خاوەنەکانیان بەکرێ دەگرت و کرێکاریان بۆ دەناردن تا کەتیرەکان کۆبکەنەوە.

کاری کەتیرەکەریی وەک کارێکی ڕێکخراوەیی وابوو، کە هەزاران کەسی هەژار و دەستکورت لە کێوەکانی بافق و بەهابادی یەزدەوە بۆماوەی (٤-٥) مانگ دەڕۆیشتن بۆ دوورترین شوێنی ئێران، لە قوچان و بەجنەوەردی خۆراسانەوە تا هەندێک لە کێوە بەرزەکانی کرمان و تفتان و بەتایبەت خۆرئاواو باکووری خۆرئاوای وڵات. (٤-٥) مانگ خواردن و پێویستییەکانیان بۆ ئەم هەژارانە دەنارد و ئەوانیش بەرهەمی کەتیرەیان کۆدەکردەوە، نمرەبەندی دەکراو نمرەی یەکەمی دەنێردرایە دەرەوەی وڵات بەتایبەت وڵاتی روسیا نمرە دووو سێکەیشی هەر لەنێو وڵاتدا دەفرۆشرا. کەتیرە بۆ داوودەرمان و پیشەسازیی بەکاردەهات.

## دواین گروپی کەتیرەکەران
## مانگی تیری ١٣٤٢(حوزەیرانی ١٩٦٣)

دووایِن گروپی کەتیرەکەران بەیانییەکی زوو گەیشتینە گەراجی تەهماسپی لە نزیک سەوزە مەیدانی قەزوین، پاسێک کە پڕ پڕ ببوو لە کەسانی بەتەمەن و گەنج وهەرەزەکار و مێردمندال، کاتێک دەرگای پاسەکە کرایەوە بۆنێکی زۆر ناخۆش و پیس هات. وەک ئەوەی پاسەکە لەسەر جۆگەیەکی ئاڕۆ وەستابێت.

ئەو هەڵمەی لە نێو پاسەکەوە دەهاتە دەرەوە چاوی مرۆڤی دەکزاندەوە، بەپەلە چاو و لوتی خۆمم گرت و لە پاسەکە دوورکەوتمەوە، لەتەنیشت دیوارێکەوە وەستام و سەیری دابەزینی خەڵکەکەم دەکرد لە پاسەکە، بڕیارمدا کە بیانژمێرم و بزانم چەند کەسی تێدایە، تەزبیحێکی (١٠١) دەنکیم پێبوو، لەگەڵ دابەزینی هەر کەسێکدا دەنکێکم لە تەزبیحەکەم بەردەدایەوە. پاسەکە خۆی جێگای (٣٨) کەس بوو بەڵام زیاتر لە (١٢٠) کەسی گەورە و بچووکی لێ دابەزین. بێ خەویی و هەوای پیسی نێو پاسەکە و جەنجاڵی و بێ جێگەیی و هیلاکیی ببووە هۆی ئەوەی خەڵکەکە دوای ئەوەی کە دادەبەزین گێژ و حۆل ببوون و دەکەوتنە سەر زەوی. لە ماوەی چەند خولەکێکدا بەردەمی توالێتەکانی گەراجەکە زۆر زۆر جەنجاڵ بوو، هەندێکیان بەجۆرێک تەنگەتاوبوون کە هەر لەبەردەمی توالێتەکاندا خۆیان خاڵی دەکردەوە. لەو کاتەدا هاوار هاواری سەرپەرشتیاری گەراج بەرزبوەوە، دەیگوت سوێند بەخودا لێتان قبوڵناکەم، ئەو ناوە پیس بکەن، بەڵام خەڵکەکە فشاری زۆریان لەسەر بوو، بۆیە سوێندخواردنی سەرپەرشتیاری گەراج هیچ سوودێکی نەبوو، پاشان هاواریدەکرد خۆتان ڕاگرن گەراجەکەتان بەجارێک بۆگەن کردووە! بەڵام هیچ چار نەبوو، دواجار عەباس ئاغای گەراج دەستیدایە دارێک و دەستیکرد بە لێدانیان. منداڵێکی (٨-٩) ساڵان کە لێدانی خواردبوو خۆی پیسکردبوو. هیچ کەسێک وەڵامی عەباس ئاغای نەدەدایەوە، کەس

نەیدەپرسی بۆچی وا لەو داماوانە دەکەیت؟ هەموویان ڕازیبوون بە چارەنووسی خۆیان، پیاوێک منداڵەکەی بردە لای بۆریی ئاوەکە و دەیشۆرد، ئەگەرچی عەباس ئاغا جوێنی پێدەدا و دەیگوت دووری بخەرەوە لێرە. بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە و کاری خۆی کرد. ئاغای دانشی، سەردەستەی کرێکارەکان، خەڵکی بەهاباد بوو، کرێی پاسەکە (١١٤٠) تومەن بوو (١٤٨٠٠) تومەنیشی بەقەرز لە گەراجی یەزد وەرگرتبوو بۆیە دەبوو (١٥٩٤٠) تومەن بدات و منیش پارەکە ببمە بانک بۆئەوەی بگاتەوە یەزد. بەیانی زوو بەنانەواکەم گوتبوو کە ئەمڕۆ تەنها یەک پاسی کەتیرەکەران دێت و ئەمە دوایین پاس دەبێت، ئاغای دانشی لەگەڵ چەند کرێکارێکدا چوون بۆ نانەواکە و نزیکەی (١٥٠) نانیان هێنا بۆ گەراجەکە، هەموویان زۆریان برسیی بوو، منداڵان لەدەوری نانەکە کۆبوونەوە، منداڵان لە ژێر کراسەکانیانەوە نانیان حەشاردەدا. هەندێک نان کەوتبووە سەر زەوی و پیس ببوو، بەڵام کەس گوێی بە پیسیی نەدەدا و گەورەکانیش وەک منداڵەکان هەڵیاندەگرتەوە و دەیانخوارد. ئاغای دانشی بەمن و حاجی حەسەن و شوفێرەکەی گوت، کە دەچێت بۆ بازاڕ و پارە دەهێنێت. ڕۆژەکانی تر بەگشتی نوێنەری بازرگانەکان بەپارەوە دەهاتنە گەراج و هەرلەوێ لەگەڵ من کە نوێنەری گەراج بووم و شوفێرەکە پاکتاوی حیسابیان دەکرد. بەڵام چەند ڕۆژێک بوو بەهۆی زۆری کرێکارەوە نوێنەرانی بازرگانەکان نەدەهاتن بۆ گەراج، جاران سەرکرێکارەکان دەچوون بۆ بازاڕ و بەخێرایی بەپارەوە دەگەڕانەوە، بەڵام ئەو ڕۆژە تا نیوەڕۆ ئاغای دانشی نەگەڕایەوە. حاجی حەسەنی ئەردەکانی شوفێری پاسەکە ویستی بچێت بۆ تاران و لەوێوە بگەڕێتەوە بۆ یەزد، منیش دەمزانی کە ئەمە دوایین پاسی کرێکارانی کەتیرەیە و دەبێت بەهەمان پاس بگەڕێمەوە بۆ یەزد و نزیکەی کاتژمێر (١) ی دوانیوەڕۆ بوو، کە ئاغای دانشی بە مرومۆچی و بێتاقەتی گەڕایەوە و زۆر نیگەران بوو، بەدەنگێکی گریاناوی گوتی: بازرگانی کەتیرە گوتویانە ئیتر کرێکارمان ناوێت، ئێستا نازانم چیبکەم.. هیچ بازرگانێک بەڵێننامەی لەگەڵ نەنووسیم. حاجی حەسەن ئەردەکانی گوتی: بەڵام من کرێی خۆمم دەوێت.ئاغای دانشی گوتی: من تەنها (٣٠) تومەنم پێیە و دەبێت لە خەمی ئەم هەموو خەڵکەدابم کە من هێناومن، سەرپەرشتیاری گەراج هاتە بەردەمی ئاغای دانشی و سەردەستەی کرێکارەکان و گوتی: کرێی گەراج بدەن و بەزوویی ئێرە چۆڵبکەن و بڕۆن بەرە و کوردستان. ئێوە گەراجەکەتان بۆگەن کردووە! ئاغای دانشی گوتی: تکایە ئەوەندە سەر مەخەنە سەرم کە کوفربکەم، تائێستا هیچ بازرگانێک ئامادە نەبووە بەڵێنامەم لەگەڵ بنووسێت. سەرپەرشتیاری گەراج چەند جوێنێکی ناشرینی دا. کرێکارەکان هەموویان لە دەوری ئاغا دانشی کۆبوونەوە، ئاغای دانشی نانی بەیانیشی

نەخواردبوو، پارچەیەک نانی بەدەستەوە بوو بەوشکی دەیخوارد. دانشی، پیاوێکی (٤٥) ساڵەی باڵابەرزی لات بوو، سکی بەپشتیەوە نووسابوو، قاتێک چاکەت و پانتۆڵی سورمەیی لەبەردابوو، کڵاوێکیشی لەسەردا بوو. دەموچاوێکی ڕەشی هەبوو، لوتی کەمێک درێژ بوو، هەر لە دەنوکی باڵندە دەچوو، چاوی بزبوون و وەک چاوی هەڵۆ دەهاتە بەرچاوم. پیاوێکی زۆر لەش سووک و وریا بوو، یەکجار هەر کەسێکی دیبووبێت بەناوی خۆیەوە دەیناسییەوە. (٢٥) تومەنی دا بە دوو کرێکار کە بچن نان بکڕن و خۆی و سێ چوار کەسی تر ڕێگای بازاڕیان گرتەبەر. حاجی حەسەن ئەردەکانی بانگی لێکرد و گوتی: ئاغای دانشی من دەبێت کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ لە گەراجی تاران ئامادەبم سەرنشینم هەیە بیانبەم بۆ یەزد. ئەوان هەموویان چاوەڕوانی منن، هەر چۆنێک بێت پارە پەیدابکە و کرێکەی من بدە، لە کاتێکدا دانشی و چەند کەسێک دەڕۆیشتن بەرەو بازاڕ؛ سەرپەرشتیاری گەراج دەستیکرد بە بۆڵە بۆڵ. هەتاوی قەزێن گەرم بوو منداڵانیش برسی و ماندوو لەو بەرهەتاوە لێیکەوتبوون ناڵە ناڵیان بوو. سەرجەم کرێکاران بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانی ئاغای دانشییان دەکرد. هەندێک لە کرێکارەکان نارەزایەتیان دەردەبڕی و دەیانگوت ڕەنگە کاتەکەی درەنگ بێت بۆ کەتیرەکردن و ئاغای دانشی بە ئەمڕۆ نا سبەی خستینییە درەنگ و لە بەهابادەوە درەنگ بە ڕێکەوتووین. ئەگەر کار نەبێت چۆن بگەڕێینەوە بۆ بەهاباد و ئەمساڵ لەبرساندا دەمرین. کاتژمێر لە سێی دوانیوەڕۆ لایدابوو، حەسەن ئەردەکان هەر بۆڵە بۆڵی بوو، جوێنی بە کرێکار و گەراج و ئاغای دانشی و هەموو لایەک دەدا، پاشان تەلەفۆنی کرد بۆ گەراجی تاران ڕوویکردە من و گوتی: تۆ کرێکەم بۆ وەربگرە و لەگەڵ خۆتدا بۆم بهێنەوە بۆ یەزد. ئیتر من بەتەنها مامەوە و تەنها (٤٥) ڕیاڵ پارەم پێبوو. دەبوایە (١٥٩٤٠) تومەن لە ئاغای دانشی وەربگرم. کاتی خۆرئاوابوون ئاغای دانشی و چەند کەسێک لە بازاڕەوە گەڕانەوە و زۆر خەمبار و بێتاقەت بوون، دیسانەوە هیچ بازرگانێک ئامادە نەبوو بوو بەڵێننامەیان لەگەڵ بنووسێت، چونکە نرخی هەقدەستیان زۆر دابەزاندبوو. دانشی داوای لێکردبوون کە بڕێک پارەی بەقەرزی بدەنێ تا خۆی ڕێگای کوردستان بگرێتەبەر و بڕوات، بەڵام تەنها یەک بازرگان (٥٠) تومەنی پێدابوو، کاتێک ئاغای دانشی هاتەوە سەرپەرشتیاری گەراج لەوێ نەبوو، کاتی خۆرئاوابوون بوو، دانشی دەستنوێژی گرت و هەر لەسەر خۆڵی نێو گەراجەکە نوێژی دابەست. چاوی منداڵان و پیاوانی برسی وەک هەتاوی خۆرئاوابوون بێهێز و بێ ڕووناکی بوو. لە دووەم ڕکاتی نوێژەکەیدا بوو، کە سەرپەرشتیاری گەراجەکە هاتەوە و دەستیکرد بە هاوارکردن و گوتی: پاش (٣-٤) سەعاتی تر دەبێت ئەم کرێکارانە هەموو بڕۆن و

گەراجەکەم بـۆ چـۆڵبکەن، ئێـوە چەنـد ڕۆژێـکە لێـرەن، ئیتـر بـڕۆن.. دەبێـت بـۆ هەر کەسێکیش پێنج ڕیاڵ کرێم بدەنێ. ئاغای دانشی بەسەرپەرشتیاری گەراجەکەی گوت: سەیرکە ئێمە ئەم شەویش هەرلێرەین و بۆ هەر کەسێک دوو ڕیاڵ زیاتر نادەین و زۆر لەسـەری مەڕۆ، خـۆم بەم منـداڵانە دەڵـێم نـاو گەراجەکە بەتەواوی خـاوێن بـکەنەوە. ئێسـتاش دوو ڕیـاڵەکەت نـادەمێ هەرکاتێـک بەرەو کوردسـتان بەڕێکەوتـین ئەوکـات پارەکەت دەدەینێ. دانشی بەکرێکارەکانی گوت خۆتان ڕێکبخەن و ئەمشەویش هەر لێرە دەخەون، (٢٠) تومەنیشی پێدان تا نانی ئێوارە بکڕن.

چوومە ژووری نووستنەکەوە کە لەسـەر بینای گەراجەکە بـوو، لەسـەر باڵکۆنەکەوە هەمـوو حەوشـی گەراجەکەم لـێ دیـاربوو، خۆشـبەختانە تەنهـا بەیانیـان زوو چەنـد ئۆتۆمبێلێک دەهاتنە ئەم گەراجە ئەوانیش لەلادێکانەوە دەهـاتن و دوانیوەڕۆیان هەمـوو ئۆتۆمبێلەکان دەگەڕانەوە بۆ گوندەکان. شـەوانە هـیچ ئۆتۆمبێلێک لە گەراجەکەدا نەبوو. ئاغـای دانشـی گـوتی: نـاو گەراجەکە بەتەواوی پاکبکەنەوە و شـەو هەر لەوێدا بـخەون. زۆربەی منـداڵان و پیـاوان ڕایەخیـان پێنەبـوو، لەسـەر ئەو خـۆڵە لێـی درێـژ بـوون و خەوتـن. بەیـانییەکەی لەگەڵ چەنـد منـداڵێکی کەتیـرەکەری هـاوتەمەنی خـۆم بـووم بەهاوڕێ. هیچ کام لەوانە نەچووبوونە قوتابخانە، یاخود بێکاربوون، یاخود لە کارکردندا هاوکاریی باوکیان دەکرد. ئەوان دەیانگوت لە گوندەکانیاندا نانی وشکیان دەستناکەوێت، ئێستا کە واخەریکە دەبێتە نیوەشـەو ژمـارەیەکی زۆریـان خەوتبوون، بەڵام سێ منداڵی (٨-٩) ساڵان لە گۆشەیەکدا کزۆڵە دانیشتبوون و دەگریـان. لە بـاڵکۆنی گەراجەکە هـاتمە خـوارەوەو چـووم بۆلایـان و لەنزیکیـانەوە دانیشـتم. دووانیـان بـرای یەکتـری بـوون وئەویتریـان کـوڕە پووریـان بـوو، بـاوکی دوو بـراکە لە مـاڵەوە ئیفلـیج بـوو لە جێگـادا کەوتبـوو. کـوڕە پوورەکەشـیان بـاوکی نەمـابوو. بڕیـاربوو کە ئاغـای دانشـی بۆمـاوەی چـوار مانـگ بـۆ هەر یەکێکیـان بـڕی (٩٥) تومەنیـان بداتێ و خواردنیشـیان هەرلەسـەر ئاغای دانشی بوو. چوار ڕۆژ بوو لە بەهابادەوە هـاتبوون جگە لە نـانی وشـکی هیچـی تریـان نەخواردبـوو، جگە لە پـانتۆڵێکی دڕاو و کراسـێکی کـۆن کە لەبەریانـدا بـوو هـیچ جلـوبەرگێکی دیکەیـان پێنەبـوو، هەرسـێکیان پێپەتـی بـوون و پێڵاویـان لەپێدا نەبـوو، لەبرسان و لە ماندوویەتی و لە دووریی دایکیان دەگریان. منیش پێمگوتن مەگرین وەرن بچیــنە دەرەوە و کەمێــک بەیەکەوە بگەڕێــین، گوتیــان ئــاخر دەبێــت مــۆڵەت لە سەرپەرشـتیارەکەمان وەربگـرین، منـیش چـووم مـۆڵەتم بـۆ وەرگـرتن و ڕۆیشـتین بـۆ مەیدانی قەزوێن. لەوێ دوکانێکی گەورەی دۆندرمە فرۆشی هەبوو کە یەک دۆندرمەی گەورەی دەدا بە دوو ڕیاڵ و منیش چـوار دۆنـدرمەم کـڕی، ئەوان هەرگیـز دۆندرمەیان

نەدیبوو، جا چ لەوەی کە خواردبێتیان، نەیاندەزانی دۆندرمە چیە! ناویشیان نەبەزانی. دۆندرمەکەیان خوارد، نەیاندەزانی ئیتر چی بەمن بڵێن.. کەمێک لەسەر شۆستەی دەوری مەیدانەکە دانیشتن و کەوتنە قسەکردن لەبارەی گوندەکەیانەوە، محەمەد ساڵێک لەوانی تر گەورەتر بوو تەمەنی نۆ ساڵ بوو، لەوانی تریش زیرەکتر بوو. ئەو گوتی کە لە گوندەکەیاندا وشکە ساڵییە و بزنەکان لەبرساندا دەمرن و خەڵکیی گۆشتی ئەو بزنە مردارەوەبووانە دەخۆن. ئەوان یەکەم جاریان بوو کە بچن بۆ کەتیرەکردن و یەکەم جاریشیان بوو کە سواری ئۆتۆمبێل ببن و یەکەم جاریشان بوو شار ببینن. پێمگوتن ئێوە کە لەسەر ئەو زەویە ڕەقە دەنوون هیچ ناڕەحەت نابن؟ ئەوان لە پرسیارەکەی من سەریان سوڕما، محەمەد گوتی: بۆ دەبێت لەسەر چی بخەوین. دیاربوو لە گوندەکەی خۆشیان هەر لەسەر زەویی نووستتوون. من مەبەستم ئەوە نییە کە قەرەوێڵەیان نییە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە ڕاخەرێکیان نییە لەسەر زەویی و لەنێو خۆڵدا دەنوون. هاوینان هەرکەسێک سەربانەکەی خۆی بەقوڕ سواخ دەدا و لەسەربان دەنوون، بەڵام زستانان لە نێو ژوورەکانیاندا پارچە بەڕەیەک ڕادەخەن وهەموویان لەسەری دەنوون و بەهەموشیان یەک پارچە بەڕە بەخۆیاندا دەدەن. ئەوان نەچووبوونە قوتابخانە، خوێندنی زۆرەملێ گەیشتبووە گوندەکانیان و پێیان گوتبوون پێویستە منداڵان بچنە قوتابخانە و بەزۆر چەند منداڵێکیان بردبووە قوتابخانە. بەڵام زۆربەی منداڵان بەدوای لەوەڕاندنی چەند بزنێکەوە بوون و وێڵی دەشتودەر بوون. لە ناوەڕاستی مانگی ئوردی بەهەشت (سەرەتای ئایار) دا قوتابخانەکان دادەخران و ژمارەیەکی زۆری منداڵان بۆ کەتیرەکردن دەڕۆیشتن بۆ دەوروبەری کوردستان. شەو درەنگ گەڕاینەوە گەراجەکە و سەرپەرشتیاری گەراج خەریکی داخستنی دەرگای گەراجەکە بوو، منداڵەکان چوونەوە ناو گەراج و منیش چووم بۆ جێگەکەی خۆم، لە بالکۆنی بەردەمی ژوورەکەمەوە ناو گەراجەکەم لێ دیار بوو. ماوەیەک سەیری ئەو هەموو خەڵکە هەژارو بێ پارەیەم کرد، کە لە گەراجەکەدا بەسەر یەکدا لاڵوپاڵ لێی خەوتبوون. مانگ، وردە وردە بەزر دەبوەوە، من تەمەنم (١٥) ساڵ بوو، وەک منداڵێکی کەتیرەکەر وا بووم و بەتەنها هاتبووم بۆ قەزوێن، ڕۆژانە چەندین هەزار تومەن پارەی کرێ و هاوکاریم وەردەگرت و دەمناردەوە بۆ یەزد، منیش لە تەواوی هاویندا بەکرێگیرابووم و کرێکەشم یەک قات چاکەت و پانتۆڵ بوو. بەڵام من عاشقی گەشتکردن بووم، عیشقی گەشت منی گەیاندبووە قەزوێن. لەناکاو یەکێک لە کرێکارەکان دەستیکرد بە چڕینی ئاوازێکی دڵهەژێن، کە دەنگێکی زۆر کاریگەربوو، وردە وردە دەنگی بەرزکردەوە. شەو لە نیوە تێپەڕی بوو بەڵام من هێشتا نقومی تەماشای ئەم خەڵکە هەژار و ماندووە بووم. کە

## شازاده‌ی حه مام

له‌سه‌ر زه‌ویی ڕه‌ق له‌ نێو ئه‌و گه‌راجه‌دا لێی خه‌وتبوون، ڕووناکی زیوینی مانگ به‌سه‌ریاندا په‌خش ببوو. هه‌زاری ئه‌وانی باشتر ده‌رده‌خست، به‌هه‌رحاڵ منیش له‌سه‌ر قه‌ره‌وێڵه‌که‌م خه‌وم لێکه‌وت. به‌یانی له‌گه‌ڵ مه‌لا بانگدان دا هه‌موو خه‌ڵکه‌که له‌ شوێنی خۆیان بڵند بوون و ده‌ستنوێژیان گرت و نوێژی به‌یانییان کرد. له‌گه‌ڵ هه‌تاوکه‌وتندا سه‌رپه‌رشتیاری گه‌راج هات و هاواری لێکردن بۆگه‌نه‌کان هه‌ستن ئێستا ئۆتۆمبێلی گونده‌کان دێن و ئێوه هێشتا خه‌وتوون، پاش که‌مێک یه‌که‌م ئۆتۆمبێل له‌ گونده‌کانی ئالمۆته‌وه هاته‌ نێو گه‌راجه‌وه دیهاتیه‌کان له‌ ئۆتۆمبێله‌که دابه‌زین و ئاغای دانشی شه‌و له‌ گۆشه‌یه‌کی گه‌راجه‌که‌دا له‌سه‌ر چه‌ند فه‌رده گوێنییه‌ک خه‌وتبوو، ئێستا که‌ بیری لێده‌که‌مه‌وه شێوه‌ی وه‌ک پڵنگ بوو. منیش هه‌ستام و ڕۆیشتمه‌ خواره‌وه، له‌ ئاغای دانشی‌م پرسی من ئێستا چیبکه‌م؟ خۆ له‌ قه‌زوێن هیچ کارێکم نییه‌ جگه‌ له‌وه‌ی که‌ پاره‌ له‌ تۆ وه‌ربگرم و بگه‌ڕێمه‌وه بۆ یه‌زد! دانشی گوتی: حسین ئاغا نزابکه‌ ئه‌مرۆ بتوانم بەڵێننامه بنووسم. خۆئه‌گه‌ر بازرگانێک نه‌یه‌ته‌ پێشه‌وه، ئه‌وا پاره‌ی تۆش ده‌ستناکه‌وێت و ئێمه‌ش بێ پاره‌و پوڵ، ماڵ وێران ده‌بین، کرێی گه‌ڕانه‌وه‌شمان پێنابێت تا بچینه‌وه بۆ یه‌زد. ئه‌و ڕۆیشت بۆ بازاڕ و ئۆتۆمبێلێکی تری گوندییه‌کان هاته‌ نێو گه‌راجه‌وه، سه‌رنشینه‌کانی دابه‌زین، ئۆتۆمبێله‌که پڕ بوو له‌ خه‌ڵک و له‌ باری مریشک و که‌ڵه‌شێر و مه‌ڕ و بزن. هاوکاری شوفێره‌که چووه‌ سه‌ر ئۆتۆمبێله‌که تا باره‌کان دابگرێت. له‌کاتی داگرتنی باره‌کاندا، یه‌ک هێزه ڕۆنی له‌ ده‌ست که‌وته‌خواره‌وه و شوفێره‌که که‌وته جوێنپێدانی و خاوه‌نی هێزه ڕۆنه‌که‌ش ده‌ستیکرد به‌هاوار هاوار و گوتی: ئه‌ی هاوار چیبکه‌م به‌رهه‌می ئه‌مساڵی خۆم و ماڵ و منداڵم هه‌مووی به‌باچوو! هاوکاری گه‌راجه‌که به‌خێرایی چوو مه‌نجه‌ڵێکی هێناو گوتی: به‌خێرایی چه‌ند ده‌توانن ڕۆنه‌که به‌ده‌ست کۆبکه‌نه‌وه و بیخه‌نه‌ ناو مه‌نجه‌ڵه‌که‌وه، هه‌مووان به‌خێرایی ده‌ستیانکرد به‌کۆکردنه‌وه‌ی ڕۆن و کردیانه‌ ناو مه‌نجه‌ڵه‌که‌وه، دوایی هاوکاری شوفێره‌که و خاوه‌نی ڕۆنه‌که‌ش هه‌ندێک ڕۆنیان کۆکرده‌وه، پاش ئه‌وه‌ی ئه‌وان له‌ شوێنه‌که دوور که‌وتنه‌وه منداڵانی که‌تیره‌که‌ر خێرا به‌خۆیان و پارچه نانه‌وه هاتنه‌وه سه‌ر شوێنی ڕۆنه ڕژاوه‌که‌و نانه‌که‌یان له‌ ڕۆنه‌که ده‌ژه‌نی و به‌خاک و خۆڵه‌وه ده‌یانخوارد. هه‌رگیز ئه‌و دیمه‌نه گریاناوی و پێکه‌نیناوییه‌م له‌یاد ناچێت. منداڵانی (١٠-١١) ساڵه له‌ ژێرپێی گه‌وره‌کاندا ده‌یانویست خۆیان بگه‌یه‌ننه‌ ڕۆنه‌که. ئه‌وانه‌ی که‌ ده‌ستیان نه‌ده‌گه‌یشته‌ ڕۆنه هه‌وڵیانده‌دا نانه‌که‌ی خۆیان به‌ پێڵاوی ئه‌وانه‌ چه‌وربکه‌ن که‌ قاچیان چووبووه ڕۆنه‌که‌وه. ئه‌وان به‌و تۆزه چه‌ورییه فه‌رامۆشییان هات و و زۆر به‌له‌زته‌وه نانه‌که‌یان ده‌خوارد، دیاره ئه‌وان زۆر برسیی بوون بۆیه ئه‌وه‌نده به‌تامه‌زرۆییه‌وه ئه‌و نان و ڕۆنه خۆڵاوییه‌یان ده‌خوارد.

دۆزینەوەی کانی ئاسن و دروستکردنی کارگەی تواندنەوەی ئاسن لە بافق و بەرزبوونەوەی نرخی نەوت، بەرێژەیەکی زۆر خەڵکی لە هەژاریی و برسێتی ڕزگار کرد. تا دوای نیوەڕۆ ئاغای دانشی نەگەڕایەوە، ئەو ڕۆژەش نەیتوانیبوو بەڵێننامە بنووسێت، فایلی کەتیرەکردن لەو ساڵەدا داخرابوو. بازرگانەکان گوتبویان، کە پۆلیسی دارستان مۆڵەت نادات، خەڵکی زیاتر بنێرین بۆ شاخەکانی کوردستان و ئەو شوێنانەی گوێنی- ئەو ڕووەکەی کەتیرەی لێ دەردەهێنرێت- کەتیرەی لێ هەیە. تەنانەت هەندێک لە بازرگانەکان لەسەر ئەوەی خەڵکی زۆریان بردووە بۆ کەتیرەکردن سزا دراون. ئاغای دانشی (٢٢) تومەنی تری دا بە کرێکارەکان بۆ کڕینی نانی ئێوارە و (١٨) تومەنیشی دا بەسەرپەرشتیاری گەراج لە بری مانەوەی کرێکارەکان. پاشان گیرفانەکانی پیشانی هەمووان دا و گوتی: ئەوەتا یەک ڕیاڵم لە گیرفاندا نەماوە. تەنانەت پارەی پێنەمابوو کە نانی سبەی بەیانی بۆ کرێکارەکانیش بکڕێت، بۆیە هاواری لێبەرزبوەوە و گوتی: تکایە هەوڵبدەن نان کەم بخۆن، چونکە تەنها ڕیاڵێکم پێنەماوە، پاشان چووە سەر بەرمیلێکی بەتاڵ و بانگی لێکردن کە نەیتوانیوە کار پەیدا بکات، هەر کەسێک پارەی پێیە بیداتێ بە قەرز و لەبری هەر ڕیاڵێک لە کۆتایی هاویندا سێ شایی دەدەمەوە. دانشی ناوی هەموو ئەوانەی دەنووسی کە پارەیان دەدایە بەقەرز، لە تێکڕای ئەو هەموو خەڵکە تەنها (٢٤) تومەن و یەک ڕیاڵی دەستکەوت، ئەم پارەیە تەنها پارەی نانی وشکی سبەی بەیانی بوو. پارەکەی منیشی دا، خۆ ئەگەر ڕۆژی (١٥) ڕیاڵ کرێی ژووری خەوتنەکەم بدەم ئەوا من هێشتا پێنج ڕیاڵ قەرزداردەمامەوە. ئیتر خۆم کەوتمە بیرکردنەوە خۆ ئەگەر ئاغای دانشی سبەی نیوەڕۆ نەتوانێ پارەیەک بەدەستبهێنێت لانیکەم دەبێت شەو بچمە تاران و لەوێوە بە زوویی بگەڕێمەوە بۆ یەزد. شەو سەرپەرشتیاری گەراج دەستیکردەوە بەهاوارکردن کە نێو گەراجەکەیان هەمووی پیس کردووە، توالێتەکان هەموو پڕ بوون و کرێتان نەداوە، بەڵام هیچ کەسێک گوێی نەدایە قسەکانی. بەیانی زوو هاواری لێهەڵسایەوە و هەمووانی لە خەو هەڵسان و گوتی: چونکە ئێوە دوێنێ ئەو جەنجاڵیەتان دروستکرد هێزە ڕۆنی ئەو پیاوە هەژارە کەوتە خوارەوە و هێزەکەی تەقی و هەموو ڕۆنەکەی خەساربوو، ئێستا هەرچی زووە پێشئەوەی ئۆتۆمبێلی دیهاتەکان بێن خێرا بڕۆنە دەرەوە. دانشی پێیگوت عەباس ئاغا من چەندین ساڵە دیمە ئێرە و هەمیشە کرێی ئێوەم داوە. ئیستا کرێکەت دەدەمێ ئەوەندەش هیلاکمان مەکە. عەباس ئاغا گوتی: ساڵانی تریش کرێت نەداوە. ئێستاش بەم هەموو خەڵکەوە بۆ دوو شەو ڕۆژ تەنها (٢٧) تومەنت داوە. پارەی بەتاڵکردنی بیری توالێتەکان زۆر لەو پارەیە زیاترە کە تۆ داوتە بە من. ئاغای دانشی گوتی: خۆ من

هێشتا پاکتاوی حیسابم بەتەواوی لەگەڵدا نەکردوویت، عەباس ئاغا گوتی: بەندەی خودا، تۆ زەوادی خودا لە ماڵتدا نییە دوێنێ شەو ویستت لەم هەژارانە پارە قەرز بکەیت، من زانیم شەوە، دەنا لە گەراجەکە دەرمدەکردیت، من هاوکاریی تۆم کرد ئێستا کە ڕۆژ بوەتەوە. بفەرموون لە گەراجەکە بڕۆنە دەرەوە، عەباسی گەراج ملی منداڵێکی گرت و پەلکێشی کرد تا لە گەراج بڕواتە دەرەوە. ئاغای دانشی پێیگوت بەندەی خودا، حەیا و ئابڕووت هەبێت. ئێمە خەڵکی یەزدین پارەکەت بەتەواوی دەدەینێ، عەباس ئاغای گوتی: ئەگەر بڕیارە خودا پارەت بۆ بنێرێت ئەوا دەمێک بوو دەینارد. پاشان ئاغای دانشی کوڕە گەنجەکەی لە دەست عەباس ئاغا سەندەوە و ڕوویکردە هەموو کرێکارەکان و پێیگوتن ئێوە لەم گەراجە مەڕۆنە دەرەوە. تا من سەرێکی بازاڕ دەدەمەوە. کەسێک بەڵێنی پێداوم هیوادارم ئەمڕۆ کارەکەمان چارەسەرببێت. پاشان پێیگوتن لەپاڵ دیواری گەراجەکەدا دانیشتن و مەبنە هۆی نارەحەتی بۆ ئۆتۆمبێل و سەرنشینەکانیان کە لە دیهاتەکانەوە دێن.

ئاغای دانشی کە لەگەڵ چەند کەسێکدا لە گەراج ڕۆیشتنە دەرەوە و بەرەو بازاڕ ڕۆیشتن، بەڵام ئەمڕۆش هەروەک ڕۆژانی تر بوو. نیوەڕۆش دانشی نەهاتەوە، منداڵانیش برسی و بێ نان بوون ئەو پاروە نانەی کە لە ژێرکراسەکانیانەوە شاردوبوویانەوە ئەویشیان خوارد، بەڵام هەر برسیی و چاو لە ڕێگای ئاغای دانشی لە ژێر هەتاوی مانگی تیر(حوزەیران) ی قەزوێن دا دانیشتبوون. خۆرئاوابوون ئاغای دانشی و هاوڕێکانی لە ڕۆژانی پێشوو پەست و خەمبارتر گەڕانەوە گەراج. عەباسی سەرپەرشتیاری گەراج کە زانی ئاغای دانشی بێ پارە گەڕاوەتەوە. ڕۆیشت سێ کەسی مل ئەستوری لەگەڵ خۆیدا هێنا و بەدار کەوتنە سەر ئەو خەڵکە هەژار و برسییە و دەستیانکرد بە لێدانیان و پێیان دەگوتن دەی خێرا بڕۆنە دەرەوە. دواجار هەندێکیان بە لێدان کردە دەرەوە. منیش لە بالکۆنەکەوە سەیری ئەو کێشمە کێش و هەرایەم دەکرد و زیاتر بەوە نارەحەت بووم کە بۆچی ئەم دوانیوەڕۆیە نەڕۆیشتم بۆ تاران. بینم ئاغای دانشی هاتە لای ژوورەکەی من و گوتی: حسێن ئاغا هیچ پارەیەکت پێیە. پێمگوت بەهەمووی شەش ڕیاڵم پێیە و دوو ڕۆژیشە کرێی خەوتنم نەداوە، من وامزانی ئەمڕۆ پارەیەک وەردەگریت، پاشان دانشی هاتە ژوورەکەمەوە و لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشت و گوتی: من ئەمساڵ هەڵەم کرد، دە ڕۆژ درەنگتر هاتم و ئەم هەموو خەڵکەشم لەگەڵ خۆمدا هێناوە، ئەم عەباس ئاغایەش دەیەوێت دەرمان بکات و تەنانەت پارەی نان کرێنیشم پێنەماوە. نامەوێت شەڕبکەم، دەنا بەیەک ئاماژەی من ئەم هەموو کرێکارە گەراجەکە بەسەر عەباس دا دەڕوخێنن. پاشان گوتی: حسێن ئاغا من حەیا و ئابڕووم

هەیە. ئەم هەموو خەڵکە لەبرساندا هاتوون بۆ قەوزێن تا بچن بۆ کێوکانی کوردستان، ئەم بازرگانانە بە ڕەنج و ماندووبوونی ئێمە دەوڵەمەند بوون، ئەمڕۆ هیچ کام لەم بازرگانانە ئامادە نەبوون (١٠٠) تومەن پارەم بەقەرز بدەنێ.خۆ ئەگەر ئەمانە بگەڕێنمەوە بۆ یەزد، ناتوانم پارەی گەراجی یەزد بدەم. ئەم خەڵکەش لە گوندەکانیاندا هیچ کارێکیان نییە و خۆیان و ژن و منداڵیان لە برساندا دەمرن. ئەرگە سبەی کەسێکم دەستنەکەوت گرێبەستم لەگەڵ دابکات ئەوا خۆم زیندەبەچاڵ دەکەم و خۆم دەکوژم. با لەم ژیانە سەرسەختە ڕزگارم ببێت، لەناکاو هاوار و دەنگە دەنگ لە گەراجەکەدا پەیدا بوو، کە سەیرم کرد چەند کەسێک لەگەڵ عەباس ئاغادا لەیەک ئاڵابوون، ئاغای دانشی ویستی بچێتە دەرەوە منیش پێمگوت تۆ هیلاکیت لێرە دانیشە من لەو بنکەی پۆلیسە ناسیاوێکم هەیە و وادەچم بۆلای بەڵکو تەکبیرێکمان بۆ بکات. من کە تەمەنم (١٥) ساڵ بوو، دەمتوانی چیبکەم؟. چووم بۆ بنکەی پۆلیس کە لە جادەی عوبێد زاکانی بوو، دەمزانی کە لێپرسراوی بنکەی پۆلیس زاوای سەرۆکی شارەوانی یەزدە، کە چووم خۆی لە بنکەکە نەبوو نەقیبێکی لێ بوو لێی پرسیم چیتدەوێت؟ گوتم: کارم بە بەڕێز سەرۆکی بنکەکەتان هەیە، زیاتر لە (١٢٠) کەس لە کرێکارانی کەتیرە لە شاری یەزدەوە هاتوون و کاریان دەست نەکەوتووە و پارەشیان پێ نییە. حاجی عەباس سەرپەرشتیاری گەراج دەیەوێت دەریان بکات. خۆئەگەر دەریان بکات و بچنە سەرجادەکان بۆ ئێوە باش نییە، ئەویش تەلەفۆنی بۆ سەرۆکی بنکە کرد و کێشەکەی تێگەیاند. ئەویش هەندێک قسەی بۆ کرد، دوای تەلەفۆنەکەیان، نەقیبەکە دوو پاسەوانی لەگەڵ مندا نارد و ڕۆیشتین بۆ گەراجەکە، (٣٠-٤٠) کەسێک لە کرێکارەکان لە بەردەمی گەراجەکەدا وەستابوون. پاسەوانەکان بە عەباس ئاغایان گوت سەرۆکی بنکەی پۆلیس گوتویەتی ئەم کرێکارانە تا ئەو کاتە لە قەزێن بن دەبێت لەم گەراجەدا بمێننەوە نەچنە سەرجادەکان . نابێت بەهیچ شێوەیەک لە گەراجەکە دەربکرێن. عەباس ئاغا گوتی: ئەمانە کرێی گەراجیان نەداوە. پاسەوانەکان گوتیان ئێمە کارمان بەدان و نەدانی کرێوە نییە، کرێ دەدەن یا نایدەن ئەوە کێشەی خۆتانە. عەباس ئاغا ویستی قسە بکات، پاسەوانێکیان گوتی: سەرۆکی بنکە گوتوویەتی ئەگەر زۆر لەسەری بڕوات خۆم دێم هەمووو ژوورەکانی گەراجەکە دەگەڕێم. ئەم سەرپەرشتیارەش وەک تێکڕای سەرپەرشتیارەکانی تر تلیاکخۆر بوو. بەبیستنی ئەم قسانە عەباس ئاغا ترسا و گوتی: هەرشتێک بەڕێزتان بفەرموون من جێبەجێی دەکەم. منیش گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم کە سەیرم کرد ئاغا دانشی سەری لە نێوان هەردوو ئەژنۆی ناوە، دەگریا و فرمێسک بەچاوانیدا دێتە خوارەوە. گوتم: ئاغای دانشی کێشەی گەراجم چارەسەرکرد، بنکەی

پۆلیس گوتوویانە تا ئەوکاتەی کە لە قەزوین دەمێننەوە، دەبێت لە گەراجەکەدابن و نەیەنە سەر جادەکان، عباس ئاغاش قبوڵی کردووە.

پاشان دانشی گوتی: چۆن نانی ئەمشەو پەیدا بکەین؟ گوتم: خودا گەورەیە! گوتی: من دەستم بەدامانی حەزرەتی عەباس گرتووە... تا ئەو قسەیەی کرد، من شتێک بەدڵمدا هات دەمزانی کە لەماڵێکی گەورەدا لە کۆڵانی پشتی گەراجەکەدا مەراسیمی قورئان خوێندن سازکراوە، خۆم چەند شەوێک چووم بۆ ئەوێ. بەبێ ئەوەی قسەیەک لەگەڵ ئاغای دانشی بکەم لە ژوورەکە ڕۆشتمە دەرەوە و ڕاستەوخۆ چووەمە ئەوخانووە، کە چووم چەند کەسێک بەپێوە وەستابوون، پرسیم لێرە کێ خاوەن ماڵە پیاوێکی ڕیش سپی (٧٥) ساڵەیان پیشاندام، منیش چووم بۆلای وکیشەی هاتنی ئەو هەموو خەڵکەی یەزد و کێشەی بێکاری و بێ خواردنی خەڵکەکەم تێگەیاند. ئەو پیاو بەڕێزە پێیگوتم:برۆ پیان بڵێ با هەموویان بێن بۆ ئەم مەراسیمە، منیش بەخێرایی گەڕامەوە. کە چووم هێشتا ئاغای دانشی لە ژوورەکەی مندا بوو. ڕووداوەکەم بۆ ئاغای دانشی گێڕایەوە. ئاغا دانشی گوتی: ئەمانە برسین مەراسیم چ کەڵکێکی بۆ ئەمانە هەیە. گوتم: ئاغای دانشی خۆ خاوەن ماڵ کە ئێوە بانگهێشت دەکات بۆ مەراسیم، دیارە بۆ نانخواردنیشە، دانشی گوتی: یا سەیدی شوهەدا و لە جێگای خۆی هەڵسا لە بالکۆنەکەوە هاواریکرد کە هەمووان ئامادەبن و هەموو بەیەکەوە دەچین بۆ مەراسیمی سنگ کوتان بۆ ئیمامی حسێن. کەتیرەکەران هەموویان بەخێرایی لە گەراج هاتنە دەرەوە و چوونە سەری کۆڵانەکە و دەستیانکرد بە سنگ کوتان و دەیانگوت یا حسێن و بەڕێکەوتن بەرەو ماڵەکە، پیاوێکی ئایینی لە سەرمیبنەر بوو بەخۆشحاڵیەوە بەخێراهاتنی کردین و دوای تەواوبوونی مەراسیمەکە، خوانیان ڕاخست و ئەم خەڵکە برسی و هەژارە تا توانیان خواردنیان خوارد. کاتی هاتنە دەرەوە و ماڵئاوایی ئەو حاجیە بەڕێزە بانگی منی کرد و گوتی: کێ لێپرسراوی ئەمانەیە منیش ئاغای دانشم پێناساند. پاشان حاجی پێی گوت: لێرە سێ شەوی تر مەراسیم هەیە بە نان خواردنەوە. ئێوە ئەگەر لە قەزوین مانەوە هەر سێ شەوەکە میوانی منن. بۆ نانخواردنی بەنیانیش نانەواکەی تەنیشت گەراجەکە ئاگاداردەکەمەوە هەرچەندە نانتان دەوێت لێی وەربگرن. دوکانی لای گەراجەکەش ئاگادار دەکەمەوە کە هەموو ڕۆژێک یەک مەن پەنیرتان بداتێ. من و ئاغای دانشی زۆر سوپاسی حاجیمان کرد و لە ماڵەکە هاتینە دەرەوە. ئەم خەڵکە کە هەرگیز خواردنی گەرم و چەوریان نەخواردبوو، شەو لە نێو گەراجەکەدا بەجۆرێک خەویان لێکەوت مەگەر (هاوڕێیانی ئەشکەوت - أصحاب الكهف) وا خەویان لێکەوتبێت. تەنانەت یەک کەسیش جوڵەی لێوە نەهات، من زۆر خۆشحاڵ بووم کە توانیم کارێک بۆ ئەم خەڵکە

برسییە بکەم و زیاتر ئیمام حسێن و ئەبولفەزەڵ خۆشەویستربوون لەلام، چونکە ئەوان بوونە هۆی ئەوەی کە لەم شارە نامۆیەدا ئەم هەموو خەڵکە برسیە تێرکران. تابەیانی لە بیرکردنەوەی ئەوەدا بووم کە بۆدابینکردنی پارەی گەراج و کرێی پاسەکە چیبکەم؟ ئایا بەیانی زوو بڕۆم بۆ تاران؟ حەزم دەکرد لە قەزوێن بم و لەلای هاوشارییەکانم بم بەڵکو بتوانم کارێکیان بۆ بکەم. بڕیارمدا بەیانی زوو بچمەوە بۆ ماڵی ئەو حاجییەی کە مەراسیمەکەی ڕێکخستبوو. بەڵکو ئەو بتوانێت لە ڕێگای بازرگانە ناسیاوەکانییەوە لەبازاڕ کارێک بۆ ئەم خەڵکە بکات. بەیانی زوو هەڵسام ئاغای دانشی چووبوو بۆنانەواکە و منیش ڕۆیشتم بۆ ماڵی حاجی و لە دەرگاکەمدا پیاوێک دەرگاکەی کردەوە و منی ناسییەوە و گوتی: چیت دەوێت؟. ئایا نانەواکە نانی پێنەداون؟ گوتم: نەخێر نانەواکە نانی پێداوین. بەڵام من کارێکم بەحاجی ئاغا هەیە. گوتی: کەمێک بوەستە. پاش چەند خولەکێک هاتەوە و فەرمووی ژوورەوەی لێکردم. حاجی ئاغا لەگەڵ ژن و منداڵەکانی دانیشتبوون و خەریکی خواردنەوەی چا بوون. سڵاوم لێکردن و حاجی ئاغا گوتی: فەرموو نانبخۆ. دانیشتم و منیش دەستمکرد بە نانخواردن لەگەڵیاندا. جێگای شەرمکردن نەبوو چونکە هەم خۆم پارەم پێ نەبوو و هەم کەتیرەکەرەکان لە بارێکی زۆر خراپ دابوون. هەموو ڕووداوەکانم بەحاجی گوت. لێی پرسیم تۆ چ کارەیت؟ منیش بەدووررودرێژی چیرۆکی خۆمم بۆ باسکرد. گوتی: مەگەر تۆ بازرگانانی کەتیرە ناناسیت؟ گوتم: من تەنها نوێنەرەکەیان دەناسم. پاشان حاجی نامەیەکی نووسی و خستیە زەرفێکەوە و گوتی: ئەم نامەیە بەرە بۆ کاروانسەرای سەعد سەڵتەنە لەوێ ژوورەکەی ئەبو توراب بدۆزەوە و نامەکە بدەرەوە دەست خۆی، ئەو یەکێک لە بازرگانە گەورەکانی کەتیرەیە، من ناوی ئەبوتورابم بیستبوو، نوێنەرەکەیم دەناسی بەڵام حاجیم نەدی بوو. پاش یەک کاتژمێر چوومە ژوورەکەی ئەبو توراب بەڵام حاجی لەوێ نەبوو، نووسەرەکەی گوتی: حاجی کەمێک نەخۆشە ئەمڕۆ نایەت. منیش ناونیشانی ماڵی حاجیم لێوەرگرت و گەڕامەوە بۆ گەراجەکە. ئەو ڕۆژەی کە لە یەزدەوە هاتبووم دوو پاکەت پاقلاوەی حاجی خەلیفە ڕاهبەرم لەگەڵ خۆم هێنابوو. لە ژێر قەرەوێڵەکەمدا شاردبوومەوە، هەردوو پاکەتەکەم هەڵگرت و ڕۆیشتم بۆ ماڵی حاجی ئەبوتوراب، لە دەرگامدا، پیاوێک دەرگای لێکردمەوە. نامە و دوو پاکەت پاقلاوەکەم دایەدەستی و ئەویش منی بردە ژوورەوە و دامنیشاندم گوتی: کەمێک لێرە پشووبدە تا هەواڵت بۆ دەهێنمەوە. پاش کەمێک هاتەوە گوتی: حاجی نەخۆشە بەڵام گوتوویەتی با بێتە ژوورەوە. چوومە حەوشەکەوە کە حەوشەیەکی گەورەبوو نزیکەی هەزار مەتر چوار گۆشە دەبوو، حەوزێکی بە بەرد دروستکراو لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا بوو.

## شازادەی حه مام

لە فارسییەوە: بەها سکاسانی

باخچەیەی زۆر جوان بەدەوری حەوزەکەدا هەبوو، کە پڕ بوو لە جۆرەها گوڵی ڕەنگاوڕەنگ، لە سێ لای حەوشەکەوە سێ دەرگا هەبوو کە لە تەختە دروستکرابوون و لای سەرەوەیان بەتەبەقی شووشەی بچووک ڕازابووەوە. لە ڕاڕەوەکەوە بەردمیە ژوورێکی پێنج دەرگایی کە ژوورێکی زۆر جوان بوو هەموو بنمیچەکەی ئاوێنەبەندبوو، دیوارەکەی بەگەچ نەخشی جوانی تێدا دروستکرابوو. بەشێوەیەک ڕازابووەوە ڕەنگە لەم سەردەمەدا نەتوانرێت، ماڵ و ژوور بەوشێوەیە برازێندرێتەوە. من سەرسامی دیمەنی ژوورەکە بووم، بیرم لای ئەوە نەبوو کە پیاوێک لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا لەسەر دۆشەکێکی مەخمەڵی ڕاکشاوە و بەتانییەکی ناسکی بەخۆیدا داوە.

کتوپڕ چاوم بەو پیاوەکەوت و بەدەنگێکی بەرز سڵاوم لێکرد و ئەویش وەڵامی سڵاوەکەمی دایەوە و داوای کرد کە چام بۆ بهێنن. بەڕاستی تا ئەو ڕۆژە من فەرشی ئاوریشیمم نەدیبوو، هەستمکرد کە فەرشەکەی ژێر پێم لەگەڵ ئەو فەرشانەی کە پێشتر بینیبوومن زۆرجیاوازە. ئەو ڕۆژە نەمزانی کە ئەو فەرشە ئاوریشمە، دوایی کە فەرشی ئاوریشمیم لە شوێنی تر بینی ئەوسا زانیم کە ئەو فەرشە جوانە ئاوریشم بووە، تەنها لەلای خوارەوەی فەرشەکە نووسراوبوو تەورێز، ناوی کارگەکەشی لەسەر نووسرابوو، بەڵام ئێستا لەیادم نەماوە. لەلایەکی ژوورەکە دۆشەک ڕاخرابوو، سەرینی لەسەر دانرابوو. حاجی گوتی: فەرموو دانیشە. منیش لەلایەوە دانیشتم. حاجی تەمەنی (٦٥) ساڵ دەبوو، ڕیشی ماشوبرنجی ببوو، قژی سەری کورت کردبووەوە. دەموچاوێکی جوانی هەبوو، دانیشتم و لە هەواڵیم پرسی.. گوتی: هیچی وانییە کەمێک سەرمام بووە و سنگم کەمێک ئازاری هەیە، دوێنێش نەچووم بۆ دوکانەکەم. هەمان پیاو کە منی هێنایە ژوورەوە بە سینییەکی زیوییەوە هات کە چای لەسەر بوو لەگەڵ شەکردانێکدا کە شەکری تێدا بوو. لەبەردەمی مندا داینا و خۆیشی دانیشت. حاجی پێیگوتم: ئەو بابەتە چۆنە، منیش کێشەی کەتیرەکەرانم بۆ باسکرد و گوتم: ئاغای دانشی (١٤٨٠٠) تومەنی لە گەراجی یەزد قەرزکردووە و دابەشی کردووە بەسەر کرێکارەکاندا. ئەوانیش پارەکەیان داوە بەشەکر و چا و ئارد و ناردویانەتەوە بۆ ماڵ و منداڵەکانیان. ئەگەر دانشی کارێکی دەستنەکەوێت بۆ هەتاهەتایە ئەو پارەی لەدەستدەچێت و جگە لەوەش (١١٤٠) تومەن پارەی کرێی پاسی یەزد تا قەزوێن قەرزدارە. پارەی گەڕانەوەشی نییە تا کرێکارەکان بگێڕێتەوە بۆ گوندەکانیان لە یەزد. حاجی گوتی: ئێستا چایەکەت بخۆ. دواتر بەو پیاوەی ڕاسپارد کە لەوێ بوو گوتی: بڕۆ تەلەفۆن بکە بۆ دوکان و بڵێ هەر ئێستا حاجی عەباس بێت بۆ ئێرە.

حاجی ئەو نامەیەی کە من هێنابووم خوێندیەوە و لەپشتی سەری خۆی داینا. لە نامەکەدا نووسراوبوو "زۆر بەڕێز حاجی ئەبوتوراب سڵاوت لێبێت. بەپێی ئەو زانیارییە ڕاستەی کە پێمان گەیشتووە ژمارەیەک کەسانی کەتیرەکەر لە یەزدەوە هاتوون بۆ قەزوین، هیچ کەسێک کاری پێنەداون، تۆ بیانێرە بۆ کوردستان و منیش لەم کارەدا هاوبەشتان دەبم، ئەگەر لەم کارەدا هەموو پارەکەمان بوو بەزیان، ئەوا من هەموو زیانەکە لە ئەستۆی خۆم دەگرم، ئەم هەژارانە ناکرێت بگەڕێنەوە بۆ یەزد". ژێر نامەکەش مۆرکرابوو. حاجی هەواڵی شاری یەزدی لێپرسیم و لە کەسوکاریشیمی پرسی و گوتی: (٤٠) ساڵە دەمەوێت بچم بۆ یەزد، حاجی جگە لە کارەکانی خۆی خەنەشی دەنارد بۆ ناوچەکانی قەزوین و کوردستان و بەشێک لە ئازەربایجان و زنجان، گوتی کە ساڵانە (٥٠-٦٠) تۆن خەنەی لە یەزدەوە بۆ دێت. گوتی: ئاغای ئەتابەگی حاجی یەدوڵڵای پاڵەوان ساڵانە یەکی دووجار شیرینی یەزدی بۆ دەنێرن. حاجی زۆر باسی شیرینی حاجی خەلیفەی ڕەهبەری کرد و گوتی: مرۆڤ دەبێت وەک ئەو یەزدیانە پاک و ڕاستگۆ بێت، شیرینی حاجی خەلیفەی ڕەهبەر نیشانەی ڕاستی و دڵسۆزیی یەزدییەکانە، منیش پێمگوت ئەوە گەورەیی خۆتە. ئەگەر شیرینی یەزدت دەوێت ئەوا من بۆتدەنێرم. حاجی لێی پرسیم کە ئەو گوندی باڵایە لە کوێیە؟ ئاغای ئەتابەگی چەند ساڵە پێمدەڵێت کە بچم بۆ یەزد و بمبات بۆ گوندی باڵا. منیش گوتم: گوندی باڵا وەکو گوندەکانی ئالمەوتی ئێوە شوێنێکی خۆش و فێنکە کە پڕە لە باخ و باخات. لەم قسانەدا بووین کە حاجی عەباس هاتە ژوورەوە و ئەو تەمەنی (٦٠) ساڵ بوو، حاجی پێیگوت: تۆ حیسابی کەتیرەت داخستووە، ئەویش گوتی: دوایین گرووپم (١٠) ڕۆژ لەمەوپێش ناردووە. حاجی گوتی: ژمارەیەک کەتیرەکەر لە یەزدەوە هاتوون و هیچ کەسێک بەڵێننامەی لەگەڵ نەنووسیوون، گوتی: بەڵێ وایە ئەوە ئاغای دانشییە وسێ ڕۆژە دێتە دوکان، تەنانەت دوێنێ دەگریا، بەڵام ئێمە لەلای پۆلیسی دارستان مۆڵەتمان نەماوە. حاجی گوتی: چەند کەسن؟ گوتی: نزیکەی (١٢٠) کەسن، زۆر زۆرن! پاشان حاجی گوتی: حاجی موحسین ئاغا گوتویەتی هاوبەشی کارمان دەبێت. وەک خێرێک لە ڕێگای ئیمام حسێن و عەباسدا کە ئەم داماوانە لە یەزدەوە هاتوون و کاتیش بەبەریەوە نەماوە بۆیە پێویستە ئەمانە بەزوویی بنێرین بۆ کوردستان، حاجی عەباس گوتی: ئاخر حاجی مۆڵەتمان نەماوە و کاتی کەتیرە کردنیش وابەسەر دەچێت. ئەمانە زۆر درەنگ هاتوون. حاجی ئەبوتوراب گوتی: پێویست بەم قسانە ناکات، کاتێک حاجی موحسین ئاغا دەڵێ ئەوانە بنێرن بۆ کوردستان، دەبێت بیاننێرین. بەتایبەتی کە دەڵێت هاوبەشیتان دەکەم و ئەگەر زیانمان کرد لە ئەستۆی خۆی دەگرێت. ئێستا بڕۆ کرێکەیان بدەرێ و

کۆمەکیشیان پێشکەش بکە و هەر ئەمڕۆش بەڕێیانبکە بۆ سەردەشت و بروسکەش بکە بۆ مەقسودخان پێی بڵێ کە بە مۆڵەت بێت یا بێ مۆڵەت ئەمانە لە شوێنێکی باش دابنێت. حاجی عەباس گوتی: بەسەرچاو.. پاشان بەمنی گوت: بەخێرایی بڕۆ بۆلای ئاغای دانشی، پێیبڵێ هەر ئێستا بێتە لام بۆ دوکانەکە و بەڵێننامە واژۆ بکات. منیش وەک باڵم گرتبێت، لە حاجی ئەبوتوراب ماڵئاواییم کرد و بەرەو گەراجی قەزوێن ڕامکرد و خۆم گەیاندە گەراج بینیم ئاغای دانشی لە ژووری گەراجەکە دانیشتووە و قسەدەکات و سەرپەشتیاری گەراج پێیدەڵێت: نابێت نابێت... منیش گوتم: ئاغای دانشی هەموو شتێک جێبەجێ بووە هەڵسە بابڕۆین بۆ بازاڕ. دانشی گوتی: چی جێبەجێ بووە؟ گوتم: هەڵسە، بابڕۆین حاجی ئەبوتوراب دەڵێت، بابێت بەڵێننامە بنووسێت. گوتی: چی؟! گوتم: هەرئەوەی کە پێمگوتی. گوتی: من دوێنێ لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ لای حاجی عەباس بووم، پێیگوتم کە نابێت! گوتم: ئاخر من چووم بۆلای حاجی ئەبوتوراب و ئەویش بانگی حاجی عەباسی کرد و پێگوت کە بەڵێننامەت لەگەڵ بنووسێت، بەنیوە باوەڕەوە گوتی: تۆ چوویت بۆ ماڵی حاجی توراب؟ گوتم: بەڵێ بۆ ئەوێ چووم.. بەخێرایی هەڵساو بانگی دووکەسی تری کرد و چوارقوڵیی ڕێگەمان گرتەبەر، ئاغای دانشی زۆر بەخێرایی دەڕۆیشت و ئێمەش بەدوای ئەودا ڕامانەدەکرد. گەیشتینە کاروانسەرا و چووینە ژوورەکەی حاجی توراب، کاتی بانگی نیوەڕۆ بوو. حاجی عەباس گوتی: ئاغای دانشی وەرە دانیشە خودا هاوکاری تۆی کرد. ئەم کوڕە گەنجە کێیە؟ ئەم کوڕە چووەتە ماڵی حاجی ئەبوتوراب و نازانم چی پێگوتوە. کە حاجی دەیەوێت خۆی هاوکاریتان بکات خۆ بەخێوکردنی (١٢٠) کەس بۆماوەی چوار مانگ هەروا کارێکی ئاسان نییە. ئاغای دانشی گوتی: حاجی تکایە پێمبڵێ بەڵێننامەکە دەنووسیت یان نا؟ حاجی عەباس گوتی: پارە و بەڵێننامە ئامادەیە خێرا واژۆی بکەو پارەکەت وەربگرە، با منیش فریای نوێژی مزگەوت بکەوم. فەرموو ئەوە (١٥٩٤٠) تومەن کرێی یەزد بۆ قەزوێن و هاوکاری گەراجی یەزد. ئەوەش (٤٠٦٠) تومەن کرێی قەزوێن بۆ سەردەشت لەگەڵ هاوکارییەکان کە هەمووی دەکاتە (٢٠) هەزار تومەن. لە سەردەشت دەچیتە لای مەقسودخان، دانشی گوتی: بەڵام پێویستم بە (٧٠٠) تومەنی تر هەیە. حاجی عەباس دەرگای قاسەکەی کردەوە و گوتی: فەرموو ئەوەش (٧٠٠) تومەنی تر لە ژێر بەڵێننامەکەدا ئەوەشم بۆ واژۆ بکە. لە کاتی واژۆکردنەکەدا ئاغای دانشی و محەمەد و ئەکبەر لە خۆشیاندا ئاو بەچاویاندا دەهاتە خوارەوە.

ئاغای دانشی پارەکەی ژمارد و هەر لەوێدا (١٥٩٤٠) تومەنەکەی دا بە من و سەری منی گرت و ماچی کرد، حاجی عەباس گوتی: بابڕۆین درەنگە بۆ نوێژ، ئێمە لە دوکانەکە

هاتینە دەرەوە و ئاغای دانشی گوتی(٧٠٠) تومەنی زیادەم وەرگرتووە (٢٠٠) تومەن بۆ مەسرەفی ئەم چەند ڕۆژەی گەراج و (٤٠٠) تومەنیش وەک دیاری دەدەم بە تۆ. زۆری لێکردم، بەڵام من پارەکەم لێ وەرنەگرت، پێمگوت: من ئەگەر کارێکم کردبێت بۆ ئێوەم کردووە، بەپارە کارم بۆ نەکردوویت. گەیشتینە بەردەرگای گەراج و ئاغای دانشی هاواری کرد خەڵکینە خۆتان ئامادە بکەن، بەڵێنامەمان نووسیوە. پاش یەک کاتژمێری تر بەرەو سەردەشت بەڕێدەکەوین. باوەڕ بکەن من بەدرێژایی تەمەنم ئەوەندە هەستم بەخۆشحاڵی نەکردووە. ئەمڕۆ کە ئەم یادەوەرییە دەنووسمەوە (٤٥) ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕیوە. لە ژیانمدا خۆشیم زۆر دیوە، بەڵام ئەم خۆشحاڵییەم جۆرێکی تر بوو، چونکە هەوڵەکەی من لەپێناو کەسانێکی برسی و هەژار و نەخوێندەواری زەحمەتکێشدا بوو. هەموویان نزای خێریان بۆمن دەکرد. بەئاشکرا ڕەنگوڕوویان گەشانەوەی پێوە دیار بوو. هەندێکیان لە دەوری ئاغا دانشی کۆبوونەوە وەک ئەوەی باوەڕ بەقسەکانی نەکەن و دەیانگوت چۆن بوو ئاوا بەڵێننامەنووسرا. ئاغای دانشی پێیگوتن منیش نازانم چۆن ئەنجامدرا هەرچیەک کرابێت، ئەم حسین ئاغایە کردوویەتی، ئەوانیش پەلاماریاندام و بەرزیان کردمەوە خستیانمە سەر دەستیان و بەناو گەراجەکەدا دەیانگێڕام. هەموویان لە خۆشیاندا هەر ئەوەبوو شێت نەدەبوون، منیش بەخۆشییەکەی ئەوان زیاتر خۆشحاڵ دەبووم. ئاغای دانشی پارەیدا بە چەند کەسێک و گوتی: بڕۆن نان بکڕن. هەر ئەو ڕۆژە (٢٠) شووتی گەورەشی کڕی و خودا حافیزیم لە ئاغای دانشی کرد و ڕۆیشتم نانی نیوەڕۆ بخۆم و بەرەو تاران بەڕێبکەوم. خەریکی نانخواردن بووم کە ئاغای دانشی هات و گوتی: ئاغای پاپولی تکات لێدەکەم ئەم (٢٠٠) تومەنەم لێوەربگرە. گوتم: خۆت هیلاک مەکە باوەڕ بکە لێت وەرناگرم. گوتی: ئەی من چ کارێک بۆ تۆ بکەم؟ گوتم: دەگەڕێمەوە بۆ یەزد ئەوە یەک مانگە لە قەزوێنم، ئێستا دایکم زۆر لە خەمی مندایە. پاش چەند ڕۆژێکی تر منیش دێم بۆ سەردەشت و لەوێ ئێوە دەدۆزمەوە و چەند ڕۆژێک لاتان دەمێنمەوە، تا بزانم چۆن کەتیرە دەکەن. گوتی: بەسەرچاو بەڵام دەبێت هەر بێیت. گوتی: سەردەشت گەورە نییە، لەوێ کەسێک هەیە ناوی مەقسودخانە پیاوێکە وەک حاجی ئەبوتوراب هەموو کەس دەیناسێت ئەو دەتهێنێت بۆ لای ئێمە. فەرمووی نانخواردنم لێکرد گوتی: نان ناخۆم ئەمڕۆ لەگەڵ کرێکارەکاندا نان و شووتی دەخۆم. هەر لەوێ ماڵئاواییمان لەیەکترکرد و ئەو ڕۆیشت. منیش گەڕامەوە بۆ ئوتێلەکە و پارەکەم دانی و بەرەو تاران بەرێکەوتم. دوانیوەڕۆ گەیشتمە تاران و لەوێش دوای نیو کاتژمێر بە ئۆتۆمبێلی حسین ڕۆحانی قومی ڕێگای یەزدم گرتەبەر، ڕۆژی دواتر بەیانی زوو گەیشتمە یەزد. ئەوکات جادەکان هەموو خۆڵ

بوون، هیچ جادەیەک قیرتاو نەکرابوو. لە قوم تا کاشان، ئوردستان تا یەزد، لە یەزدەوە تا کرمان و زاهیدان و بەندەرعەباس هەمووی خۆڵ بوو. کاتێک لە گەراجی یەزد لە ئۆتۆمبێل دابەزیم هەموو گیانم تەپوتۆز بوو. بۆیە ڕاستەوخۆ چووم بۆ گەرماوی پارس کە ئەوکات باشترین و چاکترین گەرماوی شاری یەزد بوو، پاش خۆشۆرین، ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە. دایکم کە ماوەی یەک مانگ بوو منی نەدیبوو لە باوەشی گرتم و نیو کاتژمێر پشوومدا و پاشان بەرەو گەراج بەڕێکەوتم. گرنگ ئەوە بوو کە دایکم هیچ کات لە منی نەدەپرسی کە تۆ منداڵێکی (١٥-١٦) ساڵیت و مانگێکە ڕۆیشتوویت بۆ قەزوێن بۆ کاری گەراج چەندت پارە وەرگرتووە. یا بڵێت کرێی ڕۆژانەت چەندە. یاخود بڵێت ئایا کرێکەت بەتەواوی دەدەنێ؟. بەیانی تەواوی پارەکەم دایەدەست ئاغای محەمەدی عەلی وەتەنخوا. جگە لەو پارەیەی کە خەرجم کردبوو، کە بەم شێوەیە بوو، هەموو ڕۆژێک (٤٢) ڕیاڵم خەرجکردبوو، (١٥) ڕیاڵ کرێی ئوتێلم دابوو، (٢٧) ڕیاڵیش بۆ نانخواردن. کرێی هاتوچۆش بەبەلاش بوو. ساڵی پێشووتر کە سەید محەمەد مسباح چووبوو بۆ قەزوێن لە ماوەی مانگێکدا (٢٧١٠) تومەنی خەرج کردبوو، لەسەر گەراج نووسی بووی بەڵام من ئەم کارەم ئەنجامدا بەبڕی (١٢٦) تومەن. کە هەموو کرێ و پاداشتی من ساڵی یەک قات چاکەت و پانتۆڵ بوو. تەنانەت گەراج تەنها یەک ڕیاڵی وەک پاداشت نەدامێ. منیش بیرم لەوە نەکردەوە کە بۆ ئەنجامدانی کارەکانم پارە وەربگرم. تەنانەت کوڕە مامەکەشم جارێک پێینەگوتم: دەستتخۆش بێت، بۆ ئەو ئەرکەی کە کێشاوتە. تەنها کارێک کە بۆمنیان کرد ئەو قاتە چاکەت و پانتۆڵە بوو، کە لە کۆتایی هاویندا بۆیان کردم و پارەی دروونەکەیان بۆماوەیەکی زۆر نەدا. منیش یەکێک بووم لە منداڵانی کەتیرەکەر لە ڕوانگەی کارکردنەوە. چونکە شەوو ڕۆژ کارم دەکرد لەپێناو پارەی کەسانی تردا. هەمیشە هیلاک و ماندوو بووم، کەسێکی هەژار بووم، زۆریش پێویستم بە پارە هەبوو، کرێیان هەر نەدەدامێ و سوپاسیشیان نەکردم. هەرگیز بیریان لەوە نەدەکردەوە کە کەمێک پارەم بدەنێ. لە دەیەی ساڵانی (١٣٥٠-١٩٧٠) کان دا، بەناونیشانی لێکۆڵەر چووم بۆ ناوخێڵەکانی گوندەکان لەوێ خەڵکی هەژارم دەبینی کە بێگارییان بۆ سەرۆک خێڵەکان دەکرد و زۆر بەشادمانییەوە کارەکانیان بۆ ئەنجامدەدا، بگرە بەخۆشحاڵیشەوە. ئەوان بەشێوەیەک کاریان دەکرد کە چەندین ساڵ لەمەوپێش من خۆم هەمان کارم دەکرد. ئێستاش کە دەبینم هەندێک لە هاوپیشەکانی خۆم بەناوی مامۆستاوە زۆرێک لە خوێندکارانیان دەنێرن بۆ لێکۆڵینەوە. بەکەسانی گێل و نەزان سەیریان دەکەن و بەرهەم و ماندووبوونی ئەوان بەناوی خۆیانەوە چاپ و بڵاودەکەنەوە. یاخود بەناوی خوازراوەوە بڵاوی دەکەنەوە، پارەی ماندووبوونی ئەوان

دەخەنە گیرفانیانەوە. بێگارییەکانی (٥٠) ساڵی پێشووتری خۆمم بیردێتەوە. من ئێستا زۆربەی شەو نووسینی ئەم و ئەو چاو لێدەکەم و هەڵەیان بۆ ڕاستدەکەمەوە تا ئەوان ببنە مامۆستا و بۆهەر نووسینێک بڕی (٢٠٠-٣٠٠) هەزار تومەن لە زانکۆکەیان وەربگرن. تازەبەتازە هەندێکیان پێمدەڵێن. ئەوە بۆ نووسینەکەم درەنگ چاپکرا، هەندێک لەوانە تانەم لێدەدەن و دەڵێن نووسینەکەمان بێ نرخ کرا. خەڵکی ئەم وڵاتە لەپێش هەموو شتێکدا پێویستی بە هۆشیارکردنەوە هەیە. لەلایەک هۆشیارکردنەوە کە خەڵکی پێداگرێت لەسەر تەواوی مافەکانی خۆی. لەلایەکی ترەوە نەخواردنی بەرهەمی خەڵکانی تر و پێشێل نەکردنی مافەکانیان بەتایبەت ژنان و منداڵان. زۆر کار و زۆر شت هەبووە کە دەبوایە من لە تەمەنی (١٥) ساڵی دا فێریان ببوومایە. بەڵام تازە وا لە تەمەنی (٦٠) ساڵیدا خەریکە وردە وردە شت فێردەبم. هۆیەکەشی ئەوەیە کە من لە بنەماڵەیەکی هەژاری داخراودا گەورەبووم، لە منداڵیدا باوکم لە دەستدا، دایکم ژنێکی سادەی نەخوێندەوار بوو، کە ئەویش زۆرکاری بەبەلاش بۆ خەڵکی ئەنجامداوە، لە ماڵی ئێمەدا هیچ کاتێک باسی ئابووریی و بەرهەمهێنان و پارەکۆکردنەوە و مافەکانی تاکەکەسی نەکراوە، لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو من میکانزیمی کۆمەڵایەتیم نەدەزانی، بۆیە پێویستە منداڵان لە سەرەتای ژیانیاندا فێری ژیانی دارستانیان بکەن. کارێک کە من لە گەراج دا دەمکرد هیچ کەمتر نەبوو لەکاری منداڵانی کەتیرەکەر، لە کۆکردنەوە و بەرهەمهێنان و ناردنە دەرەوەی کەتیرە چ کەسانێک دەوریان هەبوو. کەتیرە بەرهەمێکی ناوخۆیی بوو. کەتیرە بەرهەمێکی سادە بووکە ئێران ڕەوانەی دەرەوەی وڵاتی دەکرد. پایەی ئەم بەرهەمە لەسەر شانی هەرە هەژارترین خەڵک بوو .لەلایەکەوە ژمارەیەک کرێکار بەرهەمیان دەهێنا کە دەبوایە ماوەی (٤-٥) مانگ ڕەنجیان بدایە. بەشێوەیەک کاربکە و نانبخۆن، واتە مەمرەومەژی بوو، لەلایەکی ترەوە چەند کەسێک بەهۆی کەتیرەوە لە خانووی گەورەدا نیشتەجێبوون و لە ژووری ئاوێنەبەند و لەسەر فەرشی ئاوریشمی دەژیان. خۆئەگەر کرێکاری داماو کەمێک لە کاتی خۆی دواکەوتایە ئەوا ئەبوو بە خێرپێکردن و هەزار ئەملاوئەولا بنێردرایەتەوە سەر کار، هەموو ڕەنج و ماندوبوونی ئەمانە دەبووە ژەمە خۆراکی چەند کەسێکی تر.

خۆ کرێکارانی گەراج و تەنانەت شوفێرەکانیش هەر وەک کرێکارێکی کەتیرەکەر وابوون، هەندێک لە خاوەن گەراجەکان ئەوەندەی داهاتی ساڵێکی کرێکارێکیان تەنها بەیەک شەو لە تاراندا سەرف دەکرد. خودا ئەم گیا پڕ سوودەی بەرهەمهێناوە، بەڵام شەیتانەکان ئەم گیایەیان گۆڕیوە بۆ هەندێک کەس خێر و بەرەکەتە و بۆهەندێکی تریش تەنها چەوسانەوە، گیای کەتیرە سونبولی هەژاری و دەوڵەمەندیی بوو.

## شازاده‌ی حه مام

له مانگی ئوردی بەهەشتی ساڵی ١٣٨٧، (نیسان و ئایاری ٢٠٠٨) دا بۆ بیرهاتنەوەی یادەوەرییەکانم چووم بۆ مەهاباد و سەردەشت، کەتیرەی نمرە دوو کیلۆی (١٠٥) هەزار تومەن بوو، کەتیرەی نمرە یەک کیلۆی (١٧٠) هەزار تومەن کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرا. بازرگانانی کەتیرە دەیانگوت کرێکارێک کە کەتیرە کۆدەکاتەوە ڕۆژی (١٢) هەزار تومەن ناکەوێت، ئێستا کاتی کارکردنی بخۆ و مەمرە، تەواو بووە و سەردەمی کەتیرەکردنیش کۆتایی هاتووە.

## گەشتێکی پڕ ڕووداو

نزیکەی (٢٠) ڕۆژ لە یەزد مامەوە، هاوین بوو لە گەراجەکەدا کارم دەکرد، دەمویست بڕۆم بۆ سەردەشت بەڵام پارەم نەبوو، کە لێکمدایەوە دەبوایە لانیکەم (٥٠) تومەنم پێبێت، پاشان ڕێگا بگرمەبەر لە یەزدەوە تا تاران و گەڕانەوەش لە یەزدەوە بۆ تاران کرێم نەدەدا. کرێی تاران بۆ قەزوێن (٢٠) ڕیاڵ بوو واتە ڕۆیشتن و گەڕانەوە دەیکردە چوار تومەن، بەڵام نەمدەزانی کرێی قەزوێن بۆ سەردەشت چەندە. بەڵام دەمزانی لە پێنج تومەن زیاتر نییە. کەواتە ڕۆیشتن و گەڕانەوە دەیکردە (١٠) تومەن. کەواتە ئەگەر (٥٠) تومەنم دەستبکەوتایە زۆر بەباشی دەمتوانی بچم بۆ سەردەشت، بەهەر حاڵ دوای (٢٠) ڕۆژ کە لە قەزوێنەوە هاتمەوە پارەکەم پەیداکرد. دایکم (٨) تومەنی پێدام. یەک باری حوشتر شووتی، کە لەبەندەر ئاباد لەبری مڵکانە بۆمان هاتبوو فرۆشتم بە محەمەدی ئابریشمی دوکاندار بە (١٢) تومەن. (٥) تومەنیشم لە نەنە سەکین وەرگرت. چووم بۆلای ئاخوندی نانەوا لێم پرسی کە چەندمان ئارد لەلای هەیە. گوتی: نزیکەی (٦٠) کیلۆئاردتان لێرە هەیە، منیش (٣٠) کیلۆ ئاردم پێفرشتەوە بە (٣٠) تومەن، کە لێکمدایەوە بەگشتی بوومە خاوەنی (٥١) تومەن. (ئاردەکەش کرێی موڵکانەی ئاوی حەکیمئاوا و ئەشکەزەر بوو) ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە کە چەند بێویژدانییەکی گەورەم کردووە، گەشتکردن بۆ سەردەشت تەنها ئارەزوویەک بوو، نیوەی ئاردی ساڵێک و پارەی یەک بار شووتی کە هاوکارییەکی باش بوو بۆ ئەرک و ماندووبوونی دایکم فرۆشتم، تا بڕۆم بۆ سەردەشت، مانگی مورداد (ئاب) بوو بە پاسەکەی حسێن ڕۆحانی قومی گەیشتمە تاران، لە ڕێگادا خواردنم لەسەر ئاغای ڕۆحانی بوو، کرێشم نەدا و هیچ پارەیەکم خەرج نەکرد. ئاغای حسێن ڕۆحانی لێی پرسیم بۆ کوێ دەچیت؟ گوتم: دەچم بۆ سەردەشت. گوتی: بەدوای داواکاری کەتیرەکەراندا دەڕۆی؟ گوتم: تەخێر.. دەچم تا بزانم ئەو خەڵکە چۆن کەتیرە دەکەن. گوتی: بەڕاستی منداڵێکی

سەیریت، چۆن تەنیا دەتوانیت بڕۆیت بۆ کێوەکانی کوردستان؟ تەنها بۆئەوەی ببنی چۆن کەتیرە دەکرێت؟ ئاخر.. لەوێ جەنگ هەیە. مەلا مستەفای بارزان لەگەڵ حکومەتی عێراقدا لە شەڕدایە، سەربازەکانی وڵاتی خۆیشمان وا لە نێو خاکی عێراقدان. پاشان گوتی: ئامۆزایەکم ئەفسەرە و لەگەڵ کوردەکانی بارزانی دا دژی ڕژێمی عێراقی لەشەڕدایە، گوتم: من دەچم بۆ سەردەشت و بانە نەک بۆ عێراق. گوتی: بۆ هەر شوێنێک دەچیت ئاگاداری خۆتبە. ئەو بەردەوامبوو لە قسەکردن و گوتی: کوردەکان خەڵکانێکی میهرەبان و میواندۆستن. پاشان گوتی: لە شاری قوم چەند پارچەیەک شیرینی بکڕە، باپێت بێت، لەوێ بەکەڵکت دێت. منیش کە لێکم دەدایەوە پارەکەم کەمی دەکرد بۆیە گوتم: پێویست ناکات و نایکڕم! ئەویش پیاوێکی زۆر تێگەیشتوبوو چەند ساڵێک بوو منی دەناسی و هیچ قسەی نەکرد، کە گەیشتینە قوم ئۆتۆمبێلی وەستاند و سەرنشینەکان دابەزین بۆ نوێژکردن. کاتێک سواربووینەوە سەیرمکرد ئاغای ڕۆحانی پێنج پاکەت شیرینی بۆمن کڕی بوو. بەزۆر پاکەتە شیرینییەکانی دا بە من و گوتی: ڕۆژێکی تر پارەکەت لێوەردەگرمەوە. قوم لە ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) شارێکی بچکولانە بوو، لە قەراخ شاردا ڕووبارێک هەبوو، کە ئێستا ناوەندی شارە. پاسەکان لەلای پردە کۆنەکەوە لە تەنیشت ڕووبارەکەوە دەوەستان کە نزیکەی (٢٥٠) مەتر لە مەرقەدی ئیمامی مەعسومەوە دوور بوو. سەرنشینەکان بۆ نوێژ و بۆ سەردانی مەرقەد ڕۆیشتن، هەرلەوێ چەند دوکانێکی شیرینی فرۆشی هەبوو، لە شاری قومەوە تا تاران جادەکە قیرتاو بوو، جادەی قوم و تاران لە گەردەنەی حەسەن ئابادەوە دەڕۆیشت. لەو سەردەمەدا بۆ ئۆتۆمبێلەکان ڕۆیشتن بەو ڕێگایەدا کارێکی ئاسان نەبوو، ئۆتۆمبێل بەیانی زوو لە قوم بەڕێدەکەوت، پاش دووکاتژمێر لە چایخانەکانی نێوان ڕێگا بۆ ساردکردنەوەی ئۆتۆمبێل و پشوودان دەوەستا. کاتژمێر (١٠) ی بەیانی لە گەراج لە جادەی بوزەر جەمهەری لە پاسەکە دابەزیم. ئاغای محەمەدی وەتەنخوا باوکی فەرهادی وەتەنخوای هاوڕێ و هاوپۆلم لە گەراجەکە بوو گوتی: حسێن ئاغا بۆ کوێ؟ گوتم: دەمەوێت بڕۆم بۆ کوردستان بۆلای کەتیرەکەرەکان. گوتی: هیچ بووە؟! گوتم: نەخێر تەنها دەمەوێت بڕۆم بۆلایان و بزانم چۆن کەتیرە دەکەن، پێی سەیر بوو کە بەتەنها دەڕۆم بۆ کوردستان. ئاغای وەتەنخوای بەڕێوەبەری هێڵی یەزد بوو، کە زانی هەر دەڕۆم بۆ کوردستان، گوتی: کە نانی نیوەڕۆمان خوارد، دەتبەم بۆ شەمسی عەمارە ئۆتۆمبێلەکانی کوردستان لەوێوە دەڕۆن.

دوای نانخواردن، ئاغای وەتەنخوا منی گەیاندە گەراجێک لە شەمس عەمارە و بلیتی مەهابادی بۆ وەرگرتم کە هەر خۆیشی پارەکەی دابوو، منی بەڕێکرد بەرەو کوردستان.

له تـارانەوە بـۆ سەردەشـت ڕاسـتەوخۆ ئۆتۆمبێـل نەبـوو، بـۆیە بلیتـی مەهابـادی بـۆ وەرگرتم. بلیتەکەم بۆ مەهاباد بوو بۆیە نەدەچوومە قەزوێن. ڕاستەوخۆ ڕۆیشتم بۆ مەهاباد و پێنج تومەن و نیوم بۆ گەڕایەوە، چونکە کرێی مەهاباد کە (٥٥) ڕیاڵ بوو ئاغا محەمەدی وەتەنخوا پارەکەی بۆدابووم. ئەوسا نرخی دوو شیش کەباب و شیشێک تەماتە و سەوزە و نان و پەرداخێک دۆ تەنها (١٢) ڕیاڵ بوو. ئەوکاتە هێشتا تەرمیناڵە کۆنەکەی تاران دروست نەکرابوو. تەرمیناڵی تاران لە جادەی بوزەر جەمهور بوو، واتە (١٥)ی خـوردادی ئێسـتا و جـادەی ناسرخەسـرەو بەرامبەرشـەمس عەمـارە بـوو. سەرنشـینانی مەهابـاد هەموویـان کـورد بـوون، ژنـان جلـوبەرگی جـوانی کوردییـان لەبەردابـوو، پیـاوانیش شـەرواڵ و مرادخانیـان لەبەردا بـوو. تەنهـا یەک پیـاوی کـورد چـاکەت و پـانتۆڵی لەبەردابـوو. مـن لە تەنیشـت پیـاوێکی کـوردەوە دانیشـتبووم، ئەو بەزمانی کوردی کەوتە قسەکردن لەگەڵمدا، منیش پێمگوت من خەڵکی شاری یەزدم و لە کوردی تێناگەم. پاشان ئەو بەفارسی کەوتە قسەکردن لەگەڵمدا و لێی پرسیم، بۆچی دەچم بۆ مەهاباد، منیش باسی کەتیرەکەرانم بۆ کرد و گوتم: دەچمە سەردەشت. بەزمانی کوردی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دا دەربارەی من کەوتە قسەکردن.

لاوانی ئەمڕۆ گرنگی بابەتی گەشتی لاوێکی گەنجی یەزدی بۆ کوردستان نازانن، دوای چارەسەرکردنی کێشەی زەویوزار، کوردستان شوێنێکی زۆر ئارام بوو. بەتایبەت لەو ساڵانەدا کوردستان ناوچەیەکی داخراو بوو، کوردەکان زۆر بەکەمی هاتوچۆی ناو وڵاتیان دەکرد. لانیکەم ئێستا هەزار ماڵە کورد لە شاری تاران هەیە. بەڵام لە ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) دا بـاوەڕ نـاکەم تەنهـا یەک مـاڵە کـورد لە تـاران هەبـوو بێـت. ئەوکـاتە پاسـەکان لە شـارەکانی یەزد، کرمـان، ئەسـفەهان، کاشـان و سـمنان، ڕاسـتەوخۆ نەدەڕۆیشـتن بۆ کوردسـتان. ئەگەر کەسێک لەم شارانەوە بڕۆیشتایە بۆ کوردستان، دەبوو سەرەتا بچێتە تاران و لەوێوە بڕوات بۆ کوردستان. ئەو سەردەمە سێ چوار کوردی دوورخراوە لە شاری یەزد هەبوون. حاجی خان باوکی ئاغا حسێن وەزیری کـور دبـوو، کە ئەو کـاتە شـیعە و سـوننەی ئێرانـی یەک لە سـەدی ئێسـتا لێک نزیـک نەبـوون، ئەوسـا هێشـتا فەرهەنگـی سـەفەوییەکان لە ئێرانـدا باڵادەسـت بـوو. شـیعە منداڵەکانیان بە سوننە دەترساند، زۆربەی خەڵکیی نەخوێندەوار بوون، گرفتاری نەزانی و دواکەوتوویی بوون، کێشەی شیعە و سوننە هەبوو، گەشتی من بەتەنها بۆ شـوێنێکی نەناس و نارامی کوردستانی سوننە لە ڕوانگەی زۆر کەسەوە جۆرێک بوو لە شێتی. بەڕاستی خۆیشم کەمێک دەترسام، ئاخر بە منداڵی پێیان دەگوتین کە یەهودەییەکان منـداڵ دەکـوژن و خـوێنەکەی دەخـۆنەوە. واتە ئەوان یەکسـەر منـداڵ نـاکوژن، بەڵکـو دەرزیی ئاژەنی دەکەن، منداڵ دەدزن و لە ژێر زەمینەکانی خۆیاندا دەیشارنەوە پاشان

خۆیــان بەشــێوەی بــازنەیی دادەنیشــن و هەریەکێکیــان دەرزییەکــی بەدەســتەوەیە و دەرزییەکە دەکەن بە لەشــی منداڵەکەدا، تا منداڵەکە دەمرێت. دەتوانم سوێند بخۆم کە هەرگیز هیچ یەهودییەک ئەم کارەی نەکردووە. بەڵام بۆچی منداڵانیان بە یەهودییەکان دەترسـاند؟! ئەی بـۆچی دەیـانگوت سـوننەکان ئـاوا و ئەوان؟ یـاخود دەیـانگوت کـوردە سـوننەکان، شـیعەکان سـەردەبڕن. خـۆ دیـارە مـن هـیچ کاتێـک ئەم قسـانەم بە گوێـدا نەدەچــوو. خــۆ ئەگەر گــوێم بــدایە بەم قســانە لەو تەمەنە منــداڵیەدا، بەتەنهــا ڕێگــای کوردستانم نەدەگرتەبەر. کاتێک ئەو پیاوە کوردە لێی پرسیم خەڵکی کوێیت؟ یەکڕاست گــوتم: خەڵکــی شــاری یەزدم. لە مــاوەی یەک چــرکەدا هەمــوو ئەو قســانەی لەبــارەی یەهودییەکـان و سـوننەکان و کوردەکـانەوە بیسـتبووم هەمـووی هـاتەوە بیـرم. پاشـان بەخۆمم گوت ئای چەند کارێکی خراپم کرد، باشە من بەتەنها بۆ کوێ دەچم؟ ئەو پیاوە کوردە شـەرواڵ و مرادخـانی کوردیی لەبەردابـوو. سـمێڵی هێشـتبووەوە و ڕیشـی تاشـی بوو. پیاوێکی زۆر بەڕێز دیاربوو دەستیکرد بە گیرفانیدا و یەک مست نـاوکە کولەکە و بستەی پێدام، من گوتم: نامەوێ. گوتی: جـاری تـر چوویـت بـۆ مەهابـاد؟ گـوتم: نەخێر.. گوتی: ئێستا کە نیوەڕۆیە، تا سبەی بەیانی لەم پاسەدا دەمێنینەوە. ئەو نـاوکە کولەکە و بسـتەیە وەربگـرە و بیخـۆ. منیش لـێم وەرگـرت. ژنێکی کـورد کە لەسـەر کورسـیەکەی بەرامبەرم دانیشتبوو دیاربوو کە فارسی نەدەزانی، ئەویش پارچەیەک شیرینی پێدام. لە نێو ئەو پاسەدا تەنها من کورد نەبووم. پاشـان بـۆم دەرکەوت کە کەسـێکی تـر هەبـوو، ئەویش فارس بوو لە مەهاباد سەرباز بـوو، مـۆڵەتی تەواوببـوو دەگەڕایەوە بـۆ مەهابـاد، بەڵام ئەو لە مــن گەورەتــر بــوو. هەمــوو خەڵــکەکە خواردنیــان پێــدەدام، منــیش لــێم وەردەگرتن و دەم خستە نێو جانتـاکەمەوە. منیش پـارچەیەک لە شـیرینییەکانی (قـوم)م هەڵپچـڕی و بەشـی هەموویـانم دا. چەنـد کەسـێک لە کەرەج سـواربوون، چـونکە جـێگە نەمـابوو لەناوەڕاسـتی پاسـەکەدا دانیشـتن. ئەوانـیش هەموویـان کوردبـوون. کـوردە سـوننەکان کەسـانێکی زۆر میهربـان و بەڕێـزن. ئەو ئاغـا کـوردەی لە تەنیشـت مـنەوە دانیشــتبوو، خــۆی پێناســاندم، نــاوی عوســمانی جەعفەریــی بــوو، گەورەی یەکێـک لە گونـدەکانی نزیکـی سەردەشـت بـوو. لە شـاری مەهابـادیش مـاڵی هەبـوو، زۆرێـک لە خزمەکانی دایـک و بـاوکی ماڵیـان لە مهابـاد بـوو، بۆهەنـدێک کـاری ئیداریی چووبـووە تـاران. پیـاوێکی خوێنـدەوار و زیـرەک بـوو، لەبـارەی کوردسـتان و قـازی مـحەمەدەوە قسەی بۆکردم و گوتی: داهاتی کوردستان فرۆشتنی توونن وئاژەڵدارییە. گوتی: ئێران بۆئەوەی فشار بخاتە سەر قازی مـحەمەد کڕینـی تووتنی کوردستانی قەدەغە کردبوو. ڕووسەکانیش کە لایەنگری قازی مـحەمەد بوون، ئەوانیش تووتنەکەیان نەکڕی. شـەڕ واتە بەدبەختـی و بـێ پـارەیی و بـێ خـۆراکیی. پاشـان عوسـمانی جەعفەریـی گـوتی:

# شازادەی حە مام

له فارسییەوە: نەها سنکامانی

ڕاستییەکە ئەوەیە کە ئیمەی کورد نەمانویست لە ئیران جیاببینەوە، چۆن دەبێت ئەم وڵاتە بکرێتە دووبەشەوە، ئێمە ڕەسەنترین خەڵکی ئێرانین. من ئەوکاتە هیچ لەم قسانە تێنەدەگەیشتم. کەس لەبارەی قازی محەمەد و جیابوونەوەی کوردستان و جەنگی دووەمی جیهانیی هیچی بۆ باس نەکردبووم. لەبارەی جەنگی جیهانی دووەمەوە تەنها شتێکی کەمم دەزانی، چونکە من خۆم بەرهەمی ئەو جەنگەم. یەکێک لە بەلاکانی جەنگ لە ئێراندا نەبوونیی و برسێتی و هەژاریی خەڵک بوو. دایکم لە بنەماڵەیەکی هەژار بووە، باوکیشم لە بنەماڵەیەکی مامناوەند، کە کەمێک موڵک و ئاویان هەبووە. باپیرەم ڕێگەچارەیەکی بۆ برسێتی کچەکەی پەیدا کردووە، کە دایکم واتە یەکێک لە پێنج کچەکەی بداتە پیاوێک کە دوو ژنی تری هەبووە و تلیاکی بووە و کارو کاسپییەکی باشیشی نەبووە. ئەگەر جەنگی جیهانیی دووەم نەبوایە، لەوانەیە من و هەزارانی وەک من لەدایک نەبوونایە. هیچم لەبارەی کوردستانەوە نەدەزانی، بەلام چونکە ڕۆژنامەم دەخوێندەوە ناوی مەلا مستەفا بارزانیم بیستبوو. چەندین جار وێنەی مەلا مستەفا بارزانی لە ڕۆژنامەکاندا چاپ کرابوو. هەواڵی شەڕەکانی مەلا مستەفا لەگەڵ سەربازانی عێراقی لە ڕۆژنامەکاندا بلاودەکرایەوە. بەلام من لەبارەی ناوخۆی کوردستان ڕۆڵی تووتن لە ئابووریی کوردستاندا هیچ هەواڵێکم نەبوو، یەکەمجار وام هەستکرد کە شوێنێک یەک بەرهەمی هەبێت، بە گەمارۆدانی بەرهەمەکەی دەتوانن لەبنیبهێنن. کاتی خۆرئاوابوون بوو ڕێگاکەش خراپ بوو، پیاوێک هەر لە پاسەکەدا بانگی ئێوارەی دا، پاسەکە لەسەر ئاوێک وەستا و هەموو خەڵکەکە دەستنوێژیان گرت و هەموو وەستان بۆ نوێژی بەکۆمەڵ. سەربازەکە گوتی: با ئێمەش لەگەڵ ئەواندا نوێژ بکەین. ئیتر من و سەربازەکەش لەتەک ئەواندا وەستاین و نوێژمان لەگەڵدا کردن. وابزانم بەم کارەمان جۆرێک لە خۆشەویستی لە نێوانماندا دروستبوو. کاتێک کە سواری ئۆتۆمبێلەکە بووینەوە حاجی عوسمان لێی پرسیم: لە مەهاباد کەسێک دەناسیت؟ گوتم: نەخێر کەس ناناسم. گوتی: من لە مەهاباد هەندێک کارم هەیە و ڕۆژێک لەوێ دەمێنمەوە. ئەگەر حەزدەکەیت وەرە بۆ ماڵی ئێمە و شەو لای ئێمەبە. پاشان ڕۆژی دواتر بەیەکەوە دەڕۆین بۆ سەردەشت.. گوندەکەی ئێمە تا سەردەشت فرسەخ و نیوێک نابێت. منیش زۆرم پێخۆش بوو، بۆیە ڕازیبووم. پاسەکە کەوتەڕێ و هەندێک کەس قسەی خۆشیان دەکرد و جێگەکانیان دەگۆڕییەوە، کۆمەڵێک خزم بەیەکەوە بوون کە (١٤-١٥) کەس دەبوون، چووبوونە تاران بۆ سەردانی نەخۆش، جێگاکانی خۆیانیان دەگۆڕییەوە هی دواوە دەچووە پێشەوە و هی پێشەوە دەچوونە دواوە. یەک دوو منداڵیان هاوتەمەنی من بوون. شەو بوو، شوفێرەکە لەبەردەم چایخانەیەکدا وەستا و گوتی: کاتی نان و چای ئێوارەیە. عوسمانی جەعفەریی گوتی: حسین ئاغا تۆ میوانی منیت و هیچ شەرم

مەکە. تۆ ڕازیی بوویت کە لەم مەهاباد میوانی من بیت، بۆیە ئێستا داوات لێدەکەم بۆ نـانخواردنی ئەم ئێـوارەیەش میـوانی مـن بیـت. ئەو (١٤-١٥) کەسـەش لەگەڵ خۆیانـدا خواردنیان هێنابوو، ئاغـای جەعفەریی‌یـان دەناسـی خۆڵقی ئاغـای جەعفەریی‌یـان کرد و گوتیـان خواردنەکەمـان زۆرە، دەبێـت لەگەڵ ئـێمە نـان بخۆیـت. عوسـمانی جەعفەریـی گوتی: ئاخر من میوانم هەیە.. ئەوانیش گوتیـان خـواردن بۆ میوانەکەشت هەیە. لەسـەر مێزێک خوانیان ڕاخست و چایچییەکە چای هێنا و گوتی: ماستی باشمان هەیە، ئاغـای ڕەحمەتـی گەورەی ئەو بنەمـاڵەیە، ڕێـزی زۆری لێگـرتم، سـەربازە تەنهـاکەش لەگەڵ مـاڵێکی (٥-٦) کەسـیدا دانیشـت بـۆ نـانخواردن. ئەم نـانخواردنە بـووە هـۆی ئەوەی کە لەگەڵ ئەو بنەماڵەیەشدا ببمە ئاشنا. ئەوانیش خەڵکی شنۆ بـوون، لە نێو ئەو بنەمـاڵەیەدا کچێکـی (١٤-١٥) سـاڵە واتە هـاوتەمەنی خـۆم هەبـوو، کە جلـوبەرگێکی کـوردی جـوانی لەبەردابوو، لە هەموو تەمەنمدا چاو جوانی وام نەدیبوو. دەنگی عوسـمانی جەعفەریی ڕاپیەڕانـدنم کە گـوتی: خێـرا سـوارببن.. بەخێرایـی خوانمـان کـۆکردەوە و سـواربووین. عوسـمانی جەعفەریـی گـوتی: نـزیکەی (٥٠٠) سـاڵە لە کوردسـتاندا شـەڕ هەیە. کـورد گەلێکـی بێکەسـە و لەنێـوان وڵاتانـدا دابەشـکراون، (٢٠٠) سـاڵە ئنگلیـز کـورد دەچەوسـێنێتەوە و لەنێوان وڵاتانـدا دابەشـی کـردون.. جەعفەریـی گـوتی: ئاغـا حسـێن کاتێک کە چوویتە سەردەشت، ئاگاداربە سەردەشت هاوسنووری عێراقە و لە عێراق دا شەڕ هەیە، مەلا مستەفا لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا شەڕدەکات و لە ئێرانەوە چەک و پـارە و سەربازی بۆ دەچێت. ئیتر من خەوم لێکەوت. دەمەو بەیانی تایەیەکی پاسەکە پەنـجەر بوو، دەبوو هەموو خەڵکەکە لە پاسەکە دابەزن، منیش دابەزیـم هەوای فێنکی کێوەکـانی ڕۆژئاوای وڵات دەهـات بەسـەرماندا چونکە تاریک بـوو هـیچ شـوێنێکم نەدەبینی. بەڵام هەستم کـرد کە لە شـوێنێکین کە دارسـتانی هەیە. سـواربووینەوە دووبـارە بـۆ نـوێژی بەیانی دابەزینەوە. شوفێرەکە گوتی: یەکسـەر دەڕۆیـن بـۆ مەهابـاد، کاتێک چـاوم هەڵێنـا بەیـانی بـوو، سـەیری دەرەوەم کـرد، دیمەنێکـی زۆر جـوان بـوو. دەوروبەری جـادەکە هەمووی سەوز بوو، گەنم دروێنە کرابوو. لە گشت لایەکەوە گێرەیان دەکرد، بەدرێژایـی (١٠٠) کیلۆ مەتر، تاکە یەک تراکتـۆرم نەبینی. لە هەمـوو لایەکەوە هەر مـێگەلە مەڕ بـوو لە کێوە سەرسەوزەکان خەریکی لەوەڕ بوون. ڕەوە ئەسپێک لە نزیک جادەکەوە بـوون، من هەرگیز ئەسپم نەدیبوو، زۆرم بەلاوە جوان بوون. لە یەزد بەهـۆی کەمیی لەوەڕەوە ئەسپ بەخێوناکرێت، بەهەرحاڵ نزیکی نیوەڕۆ گەیشتینە شاری بچووکی مەهاباد.

## شازادەی حەمام

### مەهاباد

عوسمانی جەعفەریی گوتی: گەیشتین. هێشتا ئۆتۆمبێلەکە نەگەیشتبووە گەراج، کە چەند کەسێک دابەزین، بارەکانیان لە پاسەکە داگرت. لە نێو گەراجەکەدا ئاغای ڕەحمەتی ناونیشانی خۆی لە شنۆ پێگوتم و من نووسیم، چونکە خۆی خوێندەواری نەبوو، من ئێستاش ئەو پەڕاوە بچووکەی کە ناونیشانەکەم تێدا نووسی، هەر ماومە. خۆزگە ئەو کاتە کامێرایەکی وێنەگرتنم پێبوایە. ئەحمەد براگەورەی گوڵسەنەم گوتی: کە هاتیت بۆ شنۆ بە هەر کەسێک بڵێیت خالیدی ڕەحمەتی، دەتهێنێت بۆ ماڵی ئێمە. هاوسەری کاک ڕەحمەتی کە فارسی نەدەزانی، بەکوردی چەند قسەیەکی کرد، گوڵسەنەم بۆی کردم بە فارسی و گوتی: دایکم دەڵێت دەبێت هەر بێت بۆ شنۆ. منیش زنجیری جانتاکەم کردەوە و پاکەتێک شیرینی قومم دا بە دایکی گوڵسەنەم. ئەو ژنە نەیهێشت زنجیری جانتاکەم دابخەمەوە، هەندێک خواردنی لە بوخچەکەی خۆی دەرهێنا و کردییە ناو جانتاکەمەوە. دوایین تیری نیگای گوڵسەنەم کاری لە دڵم کرد. ڕەنگە بەسەیرکردنی پێی گوتبم وەرە بۆ شنۆ. دیارە لە کاتی لاوێتی و غرورییدا، ئەم جۆرە ڕاڤەیە بۆ ئەو سەیرکردنە دەکرێت. ئیتر من ڕۆحم لەگەڵ بنەماڵەی ڕەحمەتی بەرەو شنۆ ڕۆیشت و لاشەکەشم بەرەو مەهاباد بۆ ماڵی کاک عوسمانی جەعفەریی. لە یەک کاتدا هەستێک بە مێشکمدا هات، ویستم بڵێم سەرەتا دێم بۆ شنۆ پاشان دەچم بۆ سەردەشت، دواتر بیرم کردەوە کە ڕۆیشتن بۆ شنۆ کۆتاییەکەی باش نابێت، چونکە هیچ کارێکم لە شنۆ نەبوو. خۆ لە سەردەشت یش هیچ کارێکم نەبوو، بەڵام عەقڵم پێیگوتم برۆ بۆ سەردەشت بۆلای ئاشناکانت. خۆ ئەگەر لەبەر خاتری جوتێک چاوی جوان بڕۆم بۆ شنۆ لەوەیە کۆتاییەکەی ئەوە بێت بەبێ چاو بگەڕێمەوە بۆ یەزد، ڕەنگە کارەساتێک ڕوویدات، کە هەرگیز نەگەڕێمەوە. هێشتا لە نێو گەراجەکەدا بووم سەربازە فارسەکە بانگی کردم و گوتی لە نێو کوردەکاندا ئاگاداری خۆتبە! گوتم: ئاگاداری چی

بم؟ گوتی: ئاگاداری هەموو شتێک، ئەگەر کوڕێکی باش بیت لای ئەوان نانت لە ڕۆندایە، خۆ ئەگەر خراپەیەکیش بکەیت، ئەوا سەرت دەبڕن. دیارە ئەو سەربازە سەیرکردنی من و کچەی شنۆیی بینیبوو، بۆیە وا ئامۆژگاری کردم.ماڵی عوسمانی جەعفەریی لە نزیک گەراجەکە بوو، چووینە ماڵیان، دایکی عوسمانی جەعفەریی ژنێکی میواندۆست بوو، یەک وشە فارسی نەدەزانی، ئەو منی بە ئەندامانی خیزانەکەیان ناساند. پاشان لە وشەی میوان و یەزد تێگەیشتم. ئەم ژنە بەتەمەنە بە جلوبەرگی کوردییەوە وەک ئاسک هەڵدەسوڕا. وەکو ژنێکی (٣٠) ساڵە لێرە و لەوێ ڕایدەکرد. زۆر بەخێرایی چای ئامادەکرد. عوسمانی جەعفەریی (٨) منداڵی هەبوو، کوڕێکیانی هاوتەمەنی من بوو لە قوتابخانە بوو، هەر لە مەهابادیش دادەنیشت بڕیاربوو بۆ نیشاندانی شار لەگەڵ مندا بێتە دەرەوە. عوسمانی جەعفەریی خۆی ڕۆیشت بۆ بازاڕ. برایەکی عوسمانی جەعفەریی کە دانیشتووی مەهاباد بوو، خانووی هەردوو براکە بەیەکەوە بوو، تەنها دیوارێک لە نێوانیاندا هەبوو، دیوارەکەش دەرگایەکی تێدا بوو بۆ هاتوچۆ. محەمەدی کوڕی عوسمانی جەعفەریی گوتی: حەزدەکەیت جلی کوردی لەبەر بکەیت؟ گوتم: بەڵێ حەزدەکەم. ڕۆیشت دەستێک جلی کوردیی بۆهێنام و لەبەرمکرد. پاش چەند خولەکێک ڕۆیشتین بۆ کەناری ڕووبارەکە بۆ پیاسەکردن. ئێمە لە یەزد تەنها یەک شوێنمان هەیە کە لە ماوەی (٥٠) ساڵی ڕابردوودا یەکجار لافاوێکی کەمی پێداهاتووە، ڕووبارەکەی مەهاباد ئاوێکی زۆر بوو، دەوروبەری درەخت و باخ بوو. مەهاباد شارێکی پڕ ئاو و کانیاوە، چەندین سەرچاوەی تێدایە، مەهاباد و یەزد جیاوازییەکی زۆریان هەیە، مەهاباد بە کێوی سەرسەوز دەورە دراوە، یەزد بەکێو و زیخەڵان، یەزدییەکان جگە لە زەردەشتییەکان جلوبەرگی تایبەتیان نییە. بەڵام مەهابادییەکان ژن و پیاویان جلوبەرگی تایبەتی خۆیان لەبەردەکەن. هەردوو شار بازاڕیان هەیە. لە بازاڕەکاندا هەموو پێداویستییەکانی کارکردن دەستدەکەوێت. وەک بێڵ، پاچ، خاکەناز، قوڵنگ، زنجیر، قاپ و مەنجەڵ. بەرهەمە دەستییەکانیش تاڕادەیەک زۆربوون، بازاڕی ئەوکاتە وەک بازاڕی ئێستا نەبوو، کە دوکانەکان پڕن لە کاڵا و بەرهەمی وڵاتانی دەرەوە. لە مەهاباد بەرهەمی کێو و شاخەکانیان کۆدەکردەوە، وەک کەتیرە و گیادەرمانی. بازرگانە نێوخۆییەکان لەو ڕووەوە کاریگەرییان هەبوو. ژمارەی دانیشتووانی شاری مەهاباد لەو سەردەمەدا نزیکەی (٢١) هەزار کەس دەبوو. ئەوکات لە بازاڕی مەهاباد یەهودییەکان کەسانێکی دیاربوون. بازرگانی هەرزانفرۆش بوون، دەنی سان زەڕەنگەرێکی یەهودیی بوو، شەمعونی بازرگانیش هەبوو، کە کەسێکی دیار و ناسراو بوو، هەندێک لە یەهودییەکانی مەهاباد پارەیان دەدا بەسوو، بەڵام بڕێکی کەمیان وەک سوو وەردەگرت.

خەڵکیی بەگشتی لێیان ڕازیی بوون. هەندێکیش یەهودیی لە گوندەکاندا دەژیان و خاوەنی زەوی و موڵک و ئاو بوون، جوتیاری و مەڕدارییان دەکرد. من باش لەبیرمە کە دەیانگوت لە گوندی حاجی عەلی کە تەنها دە ماڵی یەهودیی هەیە. ئەرمەنییەکانیش کەم بوون. یەکێک لە گەڕەکەکانی مەهاباد بە (گەڕەکی ئەرمەنیان) ناسرابوو، ئەوانیش خەڵکی باش بوون و خەڵکانی مەهاباد زۆر ڕێزیان لێدەگرتن. بازرگانانی کەتیرەی مەهاباد بریتیبوون لە حاجی محەمەدی شادمان، حاجی عەبدوڵڵای ئهتمام، حاجی یوسفی ئەیزەدی، حاجی جەعفەری ماملێ و چەند کەسێکی تریش. لە بازاڕدا چاومکەوت بە کاک عوسمانی جەعفەریی لە دوکانی براکەی بوو، براکەی هات بۆلام و زۆر بەڕێزەوە هەواڵپرسی لێکردم. کاک عوسمان هەندێک خۆراک و پێداویستی کڕیبوو، تا لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە بۆ گوند، بازاڕی مەهاباد بەگشتی بازاڕی بەرهەمی ناوخۆیی بوو، بەلام بەداخەوە لە ساڵی (١٣٨٧-٢٠٠٨) دا کاتێک سەردانی مەهابادم کردەوە بە ناوبازاڕدا گەڕام هیچ شتێکم نەبینی، کە بەرهەمی خۆماڵیی بێت. تەنانەت بچووکترین بەرهەمی دەستیم نەبینی تا بیکڕم و لەگەڵ خۆمدا بیبەمەوە بۆ مەشهەد. من لەم گەشتەمدا زۆر خۆشحاڵ بووم، هیچ نیگەرانییەکم نەبوو. لە یەزدەوە تا مەهاباد تەنها یەک ڕیاڵم خەرج نەکردبوو. جانتاکەشم پڕبوو لە خواردن. نیوەڕۆ گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. ئەو ژنە کوردە وەکو دایە گەورەم وەکو نەنە سەکینە پێشوازی لێکردم و گوێزانی بۆهێنام تاوەکو ڕیشم بتاشم، کە تازە ڕیشم هاتبوو. کاتێک کاک عوسمان و براکەی هاتنەوە بۆ ماڵەوە و منیان بەجلی کوردییەوە بینی گوتیان ماشائەڵڵا لەم کوڕە کوردە بەڕاستی لێت جوانە و هەر لە کورد دەچیت. کاک عەبدوڵڵای جەعفەریی منی بردە ماڵەکەی خۆی و کتێبخانەکەی خۆی نیشاندام، کە جۆرەها کتێب و گۆڤاری ئەو سەردەمەی تێدا بوو. کاک عەبدوڵڵا هەردوو زمانی فەڕەنسی و ڕووسی بەباشی دەزانی، فەڕەنسی لە کەسێکی یەهودییەوە فێر ببوو، ڕووسی یش لە کەسێکی ئەرمەنییەوە فێرببوو کە لەگەڵ ڕووسیادا بازرگانیی دەکرد. هەر شتێک کە ڕووسییەکان لە سەردەمی جەنگدا چاپیان کردبوو، ئەو دانەیەکی لای خۆی پاراستبوو، ئاغای عەبدوڵڵا کۆڕ و کۆبوونەوەی زانستیی لە ماڵەکەی خۆیدا سازدەکرد. دوانیوەڕۆ دووبارە ڕۆیشتینەوە بۆ بازاڕ. دەیان دوکانی ئاسنگەری لە شارەکەدا هەبوون، کە بێڵ، قوڵنگ، ڕەشمە،، قفڵ و زنجیریان دروستدەکرد. وەک ئێستا نەبوو کە دووکاندارەکان دانیشتوون و ئەو بەرهەمانە لە چین و ماچینەوە دەهێنن و دەیفرۆشن. ئێستا دەتوانم سوێند بخۆم، کە لە ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) دا یەک بێڵ و زنجیر یا قفڵ و تێکڕای پێویستییەکانی جوتیاران هیچی لە دەرەوەی وڵاتەوە نەدەهاتن، بەڵکو هەمووی

دروستکراوی شاری مەهاباد بوون. جگە لە هەندێک پێویستی کەم، وەکو ڕادیۆ و لەمپا کە تازە کەوتبوونە بازاڕەوە، لەو شارەدا هەر دوکانێک خۆی کارگەیەک بوو. ئای کە ئەم داهاتی نەوتە و بێ بەرنامەیی حکومەت چ کارەساتێکی بەسەر ئەم وڵاتەدا هێناوە. شارەکان کاڵایان بۆ گوندەکان کاڵا دەکرد و بەرهەمەکانیشیان لە بازاڕدا ساغ دەکردەوە. پەیوەندییەکانی شار و لادێ پەیوەندیەکی زۆر ماقوڵانە بوو.

سەرمایەدارانی شار لە گوندەکاندا کاریان دەکرد، بازرگانی و پێشەکی کڕین و هێنانی بەرهەمەکانیان بۆ شار. بەڵام ئێستا شارەکان وەکو ئەختاپوس بەڕووی گوندەکاندا وەستاون. کوردەکان ئێواران دوکانیان دادەخست، من و محەمەدیش گەڕاینەوە بۆماڵەوە. شەو خزمەکانی عوسمانی جەعفەریی هاتبوون بۆ ماڵیان، ماڵەکە زۆر قەرەباڵغ بوو، کاک عەبدوڵڵای جەعفەریی، کە دەیزانی من لە کوردی تێناگەم بۆیە داوای لێکردم، کە بچینە دیوی کتێبخانەکەی، کتێب و گۆڤارەکانی کاک عەبدوڵڵای جەعفەریی بەلامەوە زۆر سەرنجڕاکێش بوو، دەمویست سەیری تەواوی کتێبەکان بکەم، محەمەد لێی پرسیم یەزد چۆن شارێکە؟ منیش جیاوازییەکانی مەهاباد و یەزدم بۆ ژمارد. یەزد شارێکی وشک و بێ ئاو، بێ ڕووبار، زەوییەکی تەخت، جادەکانی تەخت و ڕاست، کۆڵانەکانی بەسەریەکەوە و تەنگ و باریکن. بەڵام مەهاباد بەتەواوی پێچەوانەوەی شاری یەزدە و شارێکی کوێستانی پڕ ئاو، ڕووبارێک، مەهاباد شوێنی کشتوکاڵە. شوێنی مەڕدارییە، یەزد شاری کارگە و کرێکار، شاری پیشەسازی دەستچنین و ڕستن ومسگەرییە، شاری یەزد شیعە نشینە بەڵام مەهاباد شارێکی سوننەیە. لە یەزد زەردەشتی زۆرە بەڵام لە مەهاباد ئەرمەنی زۆرە، محەمەد نەیدەزانی زەردەشتی چییە؟ لە هەردوو شاری یەزد و مەهاباد یەهودیی هەیە بەڵام یەهودیی لە یەزد زیاترە. محەمەد گوتی: جیاوازی چییە لەنێوان شیعە و سوننەدا؟ بە کورتی گوتم، (١٥) ساڵ بووم شتێکی ئەو تۆم نەدەزانی لەسەر سوننە تەنها لە منداڵییەوە ئێمەیان بە سوننە دەترساند بەڵام ئێستا کە دەبینم نابێت لە سوننە بترسم، بەڵکو زۆر میهرەبانیشن، یەزد شاری پاسکیل بوو، مەهاباد شاری ئەسپ و سوارچاکی. خۆ ئەگەر یەزد شارێک بووایە لە دامێنی چیا و لە کۆڵانەکانیشی دا بەرزی و نزمی هەبووایە، ئەم هەموو پاسکیلە لەوێ نەدەفرۆشران، یەزد شاری خشت و گڵە، مەهاباد شاری خشت و دارە، مەهاباد ئەوکات شاری دارستانی چڕ بوو، یەزد شاری خۆڵ و زیخەڵان بوو، یەزد شاری چاکەت و پانتۆڵ بوو، مەهاباد شاری جلی کوردی بوو، یەزد شاری بۆق و کارگە بوو، مەهاباد شاری حیلەی ئەسپ بوو. مەهاباد شاری سمێڵ بوو ئەوکاتە من کوردێکی بێ سمێڵم نەبینی، جۆرەها سمێل هەبوو، لە سمێڵی هیتلەرییەوە تاسمێڵی

ستالینی. محەمەد لەگەڵ برایەکی تریدا لە مەهاباد دەیخوێند، سێ خوشکیشی نەچووبوونە قوتابخانە. هاوین بوو هەموو ئەندامانی خێزانەکەیان لە (نیسکاوێ)ی لە نزیک شاری سەردەشت بوون، ئەویش بۆ سبەی لەگەڵ باوکیدا دەچوو بۆ نیسکاوێ. لەلای ئەوانیش کەتیرە دەکرا. تەنها دایە گەورەی لە مەهاباد دادەنیشت. عوسمانی جەعفەریی نۆ خوشک و برای هەبوو. چەند کەسێکیان لە مەهاباد دەژیان. کاتی عەسر کە ئێمە لە ماڵەوە نەبووین ئەو شێرە ژنە کوردە خواردنی بۆ میوانەکان دروستکردبوو، ئەو لە تەمەنی (٧٥) ساڵیدا وەک چەپکە گوڵێکی تەڕو پاراو وابوو، جلوبەرگێکی جوانی دەپۆشی، پێشوازیی لە هەموو میوانەکان دەکرد. ئەگەرچی میوانەکان هەموو منداڵ و نەوەی خۆی بوون. دەبوو بەیانی زوو بەڕێبکەوین بۆ سەردەشت.

## ئۆتۆمبێلەکەی مام ئارام

تەنها ئۆتۆمبێلێک کە لە نێوان مەهاباد و سەردەشت دا هاتوچۆی دەکرد، ئۆتۆمبێلی پیاوێکی ئەرمەنی بوو، کە ناوی مام ئارام بوو. ئەو بەیانیان زوو لە مەهابادەوە بەڕێدەکەوت. من کە لە یەزدەوە هاتبووم هێشتا نەچووبوومە گەرماو و خۆم نەشۆردبوو، هەموو گیانم چڵک و ئارەق بوو، بۆیە بەیانی زوو چووم بۆ گەرماو، لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو کە خاوەنی گەرماوەکە کە زانی من کورد نیم و میوانی خەڵکی مەهابادم، پارەی لێ وەرنەگرتم. سوێندی خوارد کە وەڵڵا لێت وەرناگرم، وشەی (وەڵڵا) دوایین سوێندی کوردەکانە. خاوەنی گەرماوەکە گوتی: تۆ میوانیت، میوان نابێت پارە بدات. کاتێک گەیشتینە گەراج دایکی عوسمانی جەعفەریی کیسەیەک نان و پەنیری پێدام. عەبدوڵڵای جەعفەریی گوتی: هەرکاتێک هاتیت بۆ مەهاباد یەکڕاست وەرە بۆ ماڵی ئێمە، چونکە لەوە تێگەیشت من حەز بە کتێب دەکەم، گوتی: کە هاتی لە ژووری کتێبخانەکە دانیشە و بۆخۆت کتێب بخوێنەرەوە. براکانی عوسمانی جەعفەریی و ژن و منداڵەکانیان زۆریان ڕێز لێگرتم، شیرینەکانی ئاغای ڕۆحانی کە لە قوم بۆی کڕ بووم، بوونە هۆی ئابڕوومەندیی من، ئیتر چووینە گەراج، گەراج وەک گەراجی ئەمڕۆ نەبوو، ئۆتۆمبێلەکەی مام ئارام دۆجێکی باریی بوو، لای دواوەی پڕ بوو لە بار، سەرنشینەکان دەبوو لەسەر بارەکان دابنیشتنایە. پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەش تەنها جێگای دووکەس بوو، دوو پیاوی کورد لەپێشەوە و بەتەنشیت مام ئارامەوە دانیشتبوون. عوسمانی جەعفەریی و من و محەمەد لە دواوە لەگەڵ سەرنشینەکانی تردا سوار بووبووین، عوسمانی جەعفەریی کرێی منیشدا. جادەکە پێچاو پێچ و خۆڵ بوو. جادەکە لە هەموو شوێنێکدا بە تەنیشت ڕووباردا دەڕۆیشت، تەنها کاتێک کەسەردەکەوت بۆ سەر کێوەکان لە ڕووبار دوور دەکەوتەوە. ئەم جادەیە بەهیچ شێوەیەک لە جادەکانی کەوێر و دەوروبەری یەزد نەدەچوو. بەئاغای جەعفەرییم گوت: ئێرە زۆر جوانە گوندەکانی

ئەو کوێستانە بەشێوەی قادرمەیی دروستکرابوون. من لە ژیانمدا هیچ گوندێکم نەدی بوو کە بەشێوەی قادرمەیی دروستکرابێت، هەر ماڵێک بۆ ماڵەکەی پشتیەوە ببوو بەحەوشە. زارچ و ئەشکەزەر و هیمەتئاوا و تەواوی گوندەکانی تری یەزد هەموویان لە دەشتێکی تەختاییدا دروستکرابوون.

خانووەکانی گوندە کوێستانییەکانی یەزد وەکو دێی باڵا و تەرزجان بەشێوازی لەسەریەک و پلیکانەیی نین، من تەنها گوندێکی سەرگردۆڵکە کە بینیم گوندی بیدەی موبید بوو. عوسمانی جەعفەریی گوتی: بەڵێ، کوردستان جوانە و گوندەکانیشی جوانن. بەڵام ئەم گوندانە ئاوی باش و کارەبایان نییە و قوتابخانەشیان تێدا نییە. لە مەهابادەوە تا سەردەشت تەنانەت یەک پزیشک و نەخۆشخانەش نییە، لێپرسراوی فەرمانگەکان کورد نین، ئێمە وا هەستدەکەین تەنها وڵاتەکەیان جەنجاڵ کردوین، ئێمە خۆمان لە هەمووان بە ئێرانیتر دەزانین، بەڵام هەست بە بێگانەیی خۆمان دەکەین، هەندێک لە پیاوانی دەوڵەت ئێمە بەبێگانە دەزانن، ئەم ناوچەیەی ئێمە لە هەموو ئێران دواکەوتووترە و هیچ خزمەتگوزارییەکی تێدانییە. تۆ نازانی چەندە هێز و سوپای ئێرانی چووتە نێو خاکی عێراقەوە. چەندە چەک و پێویستییەکانی ئێرانی دەچێت بۆ عێراق. بەڵام من هیچ لەم قسانە تێنەدەگەیشتم. هەر بۆخۆی قسەی زیاتری کرد و گوتی: بەڵام ئەگەر عێراق بەهێز بێتەوە سەد قات تۆڵە دەکاتەوە. پاشان گوتی: من لە سیاسەت نازانم، خۆ ڕەنگە ئێران لەسەر حەق بێت، کە سەربازەکانی لە نێو خاکی عێراقدا بە جلوبەرگی کوردییەوە شەڕدەکەن. خۆ ئەگەر عێراق هێمن ببێتەوە ئەوا هێرشدەکاتە سەر ئێران. من بۆیە ڕۆیشتبووم بۆ کوردستان تا ببینم چۆن کەتیرە دەکەن و دەمویست تێبگەم بۆچی ساڵانە نزیکەی (٥٠٠) کەسی هەژار و برسی بە مانگانەی (١٠٠) تومەن دەچن بۆ ئەو شاخانە. ئێستا قسەی تر دەبیستم و خەڵکانی ترم بینی. من بەترسەوە هاتبووم بۆ کوردستان ترس لە سوننە، ترس لە کوردەکان، کەچی ئێستا وادەبینم سوننەکان و کوردەکان زۆر میهرەبان و میواندۆستن. ئەی بۆچی هەندێک کەس دەیانەوێت ناکۆکی بخەنە نێوان خەڵکی ئەم وڵاتەوە؟ ئەوە وانەی گەشتە. گەشت واتا دانایی و زانین، هەربۆیەش خودای گەورە لە قورئاندا فەرمویەتی: (سیروا في الارض).

کاک عوسمان گوتی: لە کوردستاندا لە هەر (١٠٠) هەزار کەس، (١٠) کەس خوێندەوار نین، زۆربەی خەڵک فارسی نازانن، لە هەزار ژن، دوو ژن فارسی نازانن. جادەکە زۆر خراپ بوو، ئۆتۆمبێلەکەی مام ئارام یش کۆن بوو، مام ئارام لە ڕۆیشتندا هیچ پەلەی نەبوو، دەگەیشتینە هەر گوندێک دەوەستا بار و خاوەن باری دادەبەزاند، یاخود خەڵکی دیکەی سەردەخست. نێوان مەهاباد و سەردەشت لە (١٢٥) کیلۆمەتر

زیاتر نەبوو، بەڵام بەگشتی ئۆتۆمبێلەکەی مام ئارام ئەو ڕێگایەی بە دوو ڕۆژ و شەوێک دەبڕی. هەندێک جاریش بەدوو ڕۆژ و دووشەو دەگەیشت. ڕۆژی یەکەم بە گوندەکانی هەمزاوا، بێتاس، عەبدوڵڵا کورد، مازەڵە و گەندەدار دا ڕۆیشتین، لە دووریی(٣٥) کیلۆمەتر لە مەهابادەوە گەیشتینە گەردەنەی جەواڵە ڕەشان، ڕێگاکە هەموو پێچاوپێچ بوو، لانیکەم لە چوار گوند بار و سەرنشین دابەزین و سواربوون، ماوەی یەک کاتژمێریش وەستاین و دووتایەی ئۆتۆمبێلەکە پەنچەر بوو. مام ئارام بەهێواشی پەنچەرییەکانی کرد و بەزمانی ئەرمەنی خۆی گوتی: شەو لە گوندی کیتکە دەمێنینەو، نزیکەی (٢٥) کەس لە ژن و پیاو و منداڵ لە سەربارەکانەوە سوار ببوون. وەرزی هاوین بوو هەوا زۆر خۆشبوو، بەڵام گوندی کیتکە لە دامێنی گەردەنەکە بوو، کەمێک ساردبوو، نانی ئێوارەمان خوارد و چەند کەسێک لە گوندی کیتکە خزم و ناسیاویان هەبوو، چوونەماڵی ئەوان و نیوەی سەرنشینەکانیش لە تەنیشت گوندەکەوە جێگایان ڕاخست و لێی خەوتن. چەند کەسێکیش هەر لە نێو ئۆتۆمبێلەکەدا و هەر لەسەر بارەکان خەوتن. بەیانی زوو مام ئارام هاواریکرد، گوتی: موسوڵمانەکان هەڵسن نوێژەکانتان بکەن. ئەمە یەکەم جارم بوو کە بەدەنگی ئەرمەنییەک بۆ نوێژکردن بەخەبەر بێم. مام ئارام گوتی: نوێژەکانتان بکەن و بەڕێدەکەوین. هەموو شتێکی ئەم گوندەم بەلاوە جوان بوو، بەڵام لە هەموویان جوانتر ئەو ژوورە گەورانە بوو کە بەتەپاڵە دروستیان کردبوو، واتە زەخیرە خستنی تەپاڵە بەشێوەی ژووری چوارگۆشە یا بەشێوەی گردۆڵکەیەک، سەربانەکانیان بە دار و پوشوپەڵاش داپۆشیبوو، ناو ژوورەکان پڕ بوو لە تەپاڵە. لەوەش جوانتر ئەوە بوو کە ساڵی (١٣٧٨-١٩٩٩) بەوێدا ڕۆیشتمەوە، ئەو ژوورانە هەر هەبوون. ئێمە لە یەزد شتی لەو جۆرەمان نەبوو، چونکە لە یەزد ئەوەندە وڵاخ زۆر نەبوو تا بتوانین ئەوەندە تەپاڵە بۆ زستان کۆبکەینەوە. کوردەکانی کیتکە زۆر میهرەبان بوون، لەم گوندەدا پیاوێکم بینییەوە کە ناوی عەبدوڵڵای ڕەشید زادە بوو، هەندێک لە سەرنشینەکان خزم و کەسی ئەو بوون، بەیانی زوو چەند نانێکی گەرمی بەسەر سەرنشینەکاندا دابەشکرد و پارەشی وەرنەگرت. ئۆتۆمبێلەکە بەهێواشی لە گەردەنەی کۆشکە دەرەوە سەردەکەوت هەوای فێنکی کێوەکانی کوردستان و میهربانی کوردەکان، منی بەئاگا هێنایەوە، هەرچەندە لە گەردەنە بەزرتر دەبووینەوە چڕیی دارەکان زۆرتر دەبوو، داربەڕوو، دار گوێز یەکجار زۆر بوون. گوندنشینان بەگا و هێستر خەرمانیان دەکوتا، خەڵکەکە بەگشتی هەژار بوون، بەڵام شاد و چالاک بوون. هەر لەسەر ئۆتۆمبێلەکە نانی بەیانیم خوارد. هەر کەسە و هەرچی پێبوو بەشی ئەوانی تری دەدا. جادەیەک کە تەنها یەک ئۆتۆمبێل هاتوچۆی

پیادەکرد، بەدریژایی ڕێگای مەهاباد- سەردەشت تەنها یەک ئۆتۆمبێلم نەدیت، لە قەراخ جادەکە ئەسپ و هێستر و وڵاخسوار کەم نەبوون. جگە لە من هەموو سەرنشینەکان کورد بوون. لەنێو کورددکانیشدا تەنها سێ چوارکەس فارسی‌یان دەزانی لە ژێر گەردەنەی زمزیران ئۆتۆمبێلەکە وەستا و سەرنشینەکان دابەزین. ئاوی ڕووبارەکە زۆر بوو، هەرکاتێت ئۆتۆمبێلەکە لە ڕووبارەکە دەپەڕییەوە خەڵکەکە هەمووی پاڵیان پێوەدەنا. گەردەنەی زمزیران گەردەنەیەکی گەورە و ترسناک بوو، جادەکە گڵ و باریک بوو، وەک مار پێچی خواردبوو، ئۆتۆمبێلەکە بە ناڵە ناڵ بە کێوەکەدا سەردەکەوت. دەبوو دڵی شێر و عەقڵی کەرت هەبووایە کاتێک بەم ڕێگا پڕ مەترسییەدا لەسەر بارێکی بەرزەوە سواری ئۆتۆمبێل ببیت. یەک کاتژمێری مابوو بۆ خۆرئاوابوون کە سەرکەوتینە سەر گەردەنەکە. سەرکەوتن بۆ سەر گەردەنەی زمزیران لانیکەم (٨) کاتژمێری دەویست. داری بەڕوو، گوێز و مازوو یەکجار زۆربوون. ڕێگاکەش بە ناوەڕاستی دارستانەکەدا دەڕۆیشت. لە سەری گەردەنە ئاوی ڕادیێتەری ئۆتۆمبێلەکە گەرم ببوو. لەوێ وەستاین تا ڕادیێتەرەکە بەتەواوی سارد بوەوە.

لە مەهابادەوە تا ئەم شوێنە واتە لە ماوەی دوو ڕۆژدا چوار جار ئۆتۆمبێلەکە گەرم ببوو، کاتی خۆرئاوابوون ئەم دارستانە دیمەنێکی زۆر جوانی هەبوو، بەیانی ڕۆژی سێیەم ئۆتۆمبێلی مام ئارام بەرەو سەردەشت کەوتەڕێ و گەشتینە سێ ڕێیانی نیسکاوێ. کاک عوسمان گوتی: ئەگەر لە سەردەشت قەولت بە کەس نەداوە، وەرە با پێکەوە چەند ڕۆژێک لە نیسکاوێ بین، لە دەوروبەری گوندەکەی ئێمەش خەڵکی یەزد هەن، کە هاتوون بۆ کەتیرەکردن و من خۆم دەتبەم بۆلای ئەوان. گوتم: دەبێت ڕووخسەتم بدەیت، کە یەکسەر بچم بۆ سەردەشت. پێشتر پێم گوتبوو کە دەچم بۆ لای مەقسودخان. هەڵبەت مەقسودخان یەکێک بوو لە دۆستانی کاک عوسمان و گوتی: سڵاوی منی پێبگەیەنە و بە مەقسودخان بڵێ عوسمانی نیسکاوێ هەواڵی پرسیویت. ئۆتۆمبێلەکە لە سێ ڕێیانەکە وەستا و کاک عوسمان و محەمەدی کوڕی دابەزین و بەرەو گوندەکەیان کەوتنەڕێ، ئێمەش پاش ماوەیەک گەیشتینە سەردەشت.

## سەردەشت

نزیکی خۆرئاوابوون بوو، گەیشتینە شارۆچکەی سەردەشت، شارێکی بچووکی جوان بوو، بەسەرچاوەی ئاوێکی زۆرەوە، سەرچاوەیەک کە لە هەموو شاری یەزددا شێوەی نەبوو، مەگەر سەرچاوەی ئاوی غەربال بیزی مەهریز لەو سالانەی کە پڕ ئاوبوو توانیبێتی ئەوەندە ئاوی هەبێت. سەردەشت لە سالّی (١٣٤٢-١٩٦٣) دا لە گوندێک زیاتر نەبوو، کە ژمارەی دانیشتووانی نزیکەی (٤-٥) هەزار کەس دەبوو، سەردەشت زۆر لە مەرزی عێراقەوە نزیک بوو. مام ئارام پێیگوتم: پەلەمەکە با سەرنشینەکان دابەزن خۆم دەتبەم بۆلای مەقسودخان. پاشان بردمی بۆلای مالّی مەقسودخان. مام ئارام منی وەکو دۆستی کاک عوسمان پێناساند. بەلام کاتێک خۆمم پێناساند مەقسودخان گوتی: ئاغای دانشی پێی گوتوم کە تۆ لە یەزدەوە دێیت. پاشان مەقسودخان منی بردە ژوورەوە کە خانوویەکی گەورە بوو، تەویلەیەکی گەورەشی هەبوو. چەند هێستر و یەک ئەسپ لە تەویلەکەدا بوون. چەند فەردە ئاردێک و هەندێک شتی تر لە حەوشەکەدا دانرابوون. خانووەکە دوو نهۆم بوو. مەقسودخان گوتی: ئەمڕۆ لە سەردەشت بمێنەوە، دوو سبەی دەبێت ئارد ببەم بۆ ئاغای دانشی و تۆش دەبەم بۆلای. گوتم: ئاغای دانشی لە کوێیە، گوتی: ئەو لە نێو خاکی کوردستانی عێراقدایە. من یەکسەر ترسم لێنیشت، ئاخر چۆن دەبێت بچمە ناو خاکی عێراقەوە؟! گوتی: ترسایت؟! گوتم: بەلێ.. گوتی: هیچ مەترسە، ئەوێش کوردستانە و خاکی خۆمانە. ئاغای دانشی نزیکەی (١٠-١٥) کیلۆمەتر لەنێو خاکی عێراقدایە، ئەو شوێنە مەلا مستەفای لێیە، چونکە دانشی درەنگ هات، کەتیرەکەرەکانی تر هەموو شوێنەکانیان گرتبوو. کاتێک لە قەزوێنەوە هەوالّیان پێدام کە شوێنێکی بۆ پەیدا بکەم، هەموو شوێنەکان گیرابوون، منیش لەگەلّ نوێنەری مەلا مستەفادا قسەمکرد و لە نێو خاکی کوردستانی عێراقدا کێوێکم بۆ بەکرێگرت. لەوێ گوێنی زۆرە و پڕ بەرهەمتریشە و کەتیرەی زیاتر لێ دەستدەکەوێت. دوو سبەی دەچین بۆلای، هیچ نیگەران مەبە، ئەوێش هەر خاکی

خۆمانە. خانووەکەی مەقسودخان هەم ماڵ بوو هەم عەمبار بوو، هەم شوێنی کارکردن بوو. ئەو نوێنەری چەندین بازرگانی قەزوێن بوو، خۆیشی بەشێوەیەکی سەربەخۆ کرێکاری کەتیرەی هەبوو. دوو سێ نووسەری هەبوو، نزیکەی (٧٥٠) کەسی کەتیرەکەر لەژێر چاودێریی ئەودا کاریان دەکرد. ئەو دەبوو ئارد و شەکر و چا و تەواوی پێداویستییەکانی تر بۆ هەموو کەتیرەکەران ئامادە بکات. هەموو کەتیرەکەشی کۆدەکردەوە و نووسەرەکانی دەچوون دەیانکێشا و دەیاننووسی. لە عەمبارەکانیدا سەدان فەردە ئارد و دەیان فەردە شەکر و چەندین سندوقە چا هەبوو. کاروانی هێسترەکان لە نێوان ماڵی مەقسودخان و کەتیرەکەران دا بەبەردەوامی لە هاتووچۆدابوون. لە نێو ماڵەکەی مەقسودخاندا جەنجاڵی و دەنگە دەنگ زۆر بوو، یەکێک دەیگوت هەندێک ئارد ببەن بۆ ئەسفەجییەکان، یاخود ئەو کارە ئەنجامبدەن، لە نزیکەی (١٥) کەس لە ماڵەکەی مەقسودخان دا تەنها خۆی و کەسێکی تر فارسی‌یان دەزانی. تەنانەت نووسەرەکانیش بەباشی فارسی‌یان نەدەزانی، من لە وشەی ئەسفەجی تێگەیشتم کە مەبەستیان خەڵکی گوندی ئەسفەجی بەهابادی بافوقە، بۆیە لە مەقسودخانم پرسی ئەسفەجییەکان لە کوێن؟ گوتی: لە دەوروبەری نیسکاوێن، ئەو شوێنەی کە کاک عوسمانی لێیە. دوو کاتژمێر بوو گەیشتبوومە سەردەشت، هێشتا جانتاکەم لە حەوشی ماڵەکەدا دانابوو. لەم ماڵەدا ژنانیش کاریان دەکرد، نزیکی خۆرئاوابوون بوو مەقسودخان گوتی: جاریَ برۆ نێوشار بگەڕێ و ئەی بۆچی جانتاکەت، لێرەیە؟ بانگی یەکێکی کرد و من تەنها لە وشەی خانم گوڵە تێگەیشتم، ژنێکی (٦٥) ساڵە لە ژوورەوە هاتە دەرەوە، مەقسودخان بەکوردی قسەی لەگەڵدا کرد و لە وشەی حسێن و یەزد تێگەیشتم. ژنەکە تێیگەیاندم کە جانتاکەم هەڵبگرم و برۆم بۆ نهۆمی دووەم لەویَ جانتاکەم دابنێم و پاشان بڕۆم نێوشار بگەڕێم، ئەو ژنە بە میهرەبانییەوە پلیکانەکانی پیشاندام و گوتی: لێرەوە برۆ. چووەمە سەرەوە، چوومە ژوورێکەوە کە فەرشی تێدا ڕاخرابوو، پشتیی لەسەر فەرشەکان دانرابوون، ژوورەکە بەجوانترین شێوە ڕازابووەوە. لە نهۆمی دوومەوە نیوەی شارم لێ دیار بوو، جانتاکەم دانا و هاتمە خوارەوە، مەقسودخان ڕۆیشتبووە دەرەوە. ئەو ژنە لەگەڵ پیاوێکی کوردا قسەی کرد و پاشان پیاوەکە بەفارسی گوتی: بابڕۆین بۆ نێو شار بگەڕێین. ئەو لە سەربازی فێری فارسی ببوو، بۆ مەشقی سەربازیی چوو بوو بۆ (بیرجەند) و سەربازییشی لە سەبزەوار تەواو کردبوو. کاتێک کە چووبووە سەربازیی، یەکەم جاری بوو لە کوردستان دووربکەوێتەوە. هەر لە سەربازیی فێری فارسی و خوێندن و نووسین یش ببوو. ئەو برازای مەقسودخان بوو. لە مەهاباد کاری دەکرد چەند ڕۆژێک

بوو بۆ پشوودان و هاوکاری مامی هاتبوو بۆ سەردەشت. سەربازییەکەی ببووە هۆی ئەوەی کە لە شیعە نەترسێت. سەردەشت شارێکی بچکۆلانە بوو، بەدەوری مەیدانێکدا بەناوی مەیدانی سەرچاوە، بازاڕ و دوکانەکان هەر بەدەوری سەرچاوەوە بوون. سەرچاوەکە لە دامێنی کێوەکەوە بوو، بنکەی پۆلیسی دارستان کەمێک لە خوارتر بوو. شارەکە دەرمانخانە و نەخۆشخانەی نەبوو. بەڵام تازە پزیشکێکی سەربازیی هاتبووە ناوچەکە. لە نێو خەڵکیدا نەخۆشییەکانی کەچەڵی و چاوئاوسان زۆر بڵاو بوو. خەڵکەکەی زۆر هەژار بوون، تەنها چەند ماڵێک هەبوون کە دەرامەتیان باش بوو، زیاتر بازرگانەکان و بازرگانی کەتیرە گوزەرانیان باش بوو. محەمەد قادر زادە، حاجی ڕەحمانی کەریمی، محەمەد ڕەسوڵی کەریمی، حاجی محەمەد ڕەسوڵ یەحیا پوور، حاجی شێخە مەعروف زادە، حاجی ڕەحیم پووری، حاجی قاسمی ئوتمیش، سلێمانە جوو، موشەجوو دیارترین و چالاکترین بازرگانی کەتیرە بوون. یەک دوو کەسی جوولەکە و چەند کەسێکی موسوڵمان پارەیان دەدا بە سوو کە ناوی ئەوان نانووسم. هەندێک لەوانە کاریان بۆ حاجی ئەحمەدی مازووچی دەکرد کە لە تاران گەورە بازرگانی کەتیرە بوو. هەندێکشیان سەربەخۆ کاریان بۆخۆیان دەکرد. حاجی محەمەد ڕەسول یەحیا پوور چەند کوڕێکی هەبوو دوو کوڕیان ناویان ساڵح و ئیبراهیم بوو.کاتێک کە منداڵ بوون من ئەوانم بینیبوون، لە سەردەشت دوکانەکەیان لە دەوری سەرچاوە بوو، هەندێک لەم بازرگانانە وەکو حاجی محەمەد ڕەسول یەحیاپوور جگە لە کەتیرە و بازرگانی مازوو، سماق، پێستە و ڕیخۆڵەشیان دەکرد. هەندێکشیان خورییان دەکڕی و دەفرۆشت، هەندێک لە کوردەکان بەتایبەت لادێییەکان خۆیان دەچوون بۆ کەتیرە، محەمەد ئەمین ڕۆستەم پوور خەڵکی گوندی گۆرانگان بوو، بە ماڵ و منداڵەوە دەڕۆیشتن بۆ کەتیرە، کە ئەوکات کرێی ڕۆژانەیان (٢٥) ڕیاڵ بوو. عوسمان عوسمانی لە بێورانی سەروو، سەید کەریم حسێنی، ڕۆستەمی ڕۆستەمزادە، مەحمود ڕۆستەم پوور، ڕەحیم گاڵە لە بێوارانی خواروو، ئەمانە هەموو دەچوون بۆ کەتیرە. کاتێک لە مانگی (ئۆردی بەهەشتی ١٣٨٧- ئایاری ٢٠٠٨) چووم بۆ سەردەشت، زۆرێک لەو پیاوانە مردبوون، حاجی مەحمود ڕۆستەم پوور لە تەمەنی (٩٧) ساڵیدا زیندوو بوو، کە یەکێک بوولە بازرگانانی دوکاندار لەنێو بازاڕی مەهاباد، حاجی عبدوڵڵا ئهتمام زیندوو بوو، حاجی محەمەدی شادمان کە تەمەنی (٩٠) ساڵ بوو لە سەر دوکانەکەی دانیشتبوو لە مەهاباد. لە بازرگانەکانی سەردەشت حاجی قادر زادە زیندوو بوو، بەڵام نەمبینی. ئەوکاتە لە نێو سەردەشتدا تەنها یەک ئۆتۆمبێل هاتوچۆی نەدەکرد، چونکە بەهیچ جۆرێک ئۆتۆمبێل نەبوو، ماتورسکیلیش نەبوو، تەنها بنکەی پۆلیس جیبێکی هەبوو، لە

بەردەم بنکەی پۆلیسی دارستانیش هیچ ئۆتۆمبێلێکم نەبینی، هیچ بانکێک لەسەردەشتدا لقی نەبوو، شار بەبێ ئاو بوو لە هیچ ماڵێکدا بۆریی ئاو نەبوو. ئەسپ و هێستر و گوێدرێژ زۆر بوون، باریان پێدەگواستنەوە، شارەکە چەقی کڕین و فرۆشتنی ئالوگۆڕی کاڵاکان و بازرگانی بوو، پارە زۆر کەم بوو خەڵکی لە دوکانەکان پارەیان قەرز دەکرد و دوایی لەبری قەرزەکە شتی تریان دەدانەوە. شەکر و چا و قوماشیان بەقەرز دەکڕی، لەبری ئەوە کاتی کۆکردنەوەی بەرهەم، تووتن، خوریی، کەشک، مەڕی زیندوو، مازوو، سماق، گیادەرمانی و بەرهەمی کشتوکاڵی و مەڕدارییان دەدانێ. دوکانەکان تایبەت نەبوون، کە یەکێک تەنها میوە بفرۆشێت، یا دوکانێکی تر شەکر و چا بفرۆشێت. لە هەموو سەردەشتدا و هەتا لە مەهابادیش دوکانەکان هەموو شتێکیان بەتێکڕا دەفرۆشت، لە پێویستییەکانی خەڵکی و پێویستییەکانی کشتوکاڵی، شەکر، چا، بێل، پاچ، خاکەناز، قوماش، پێڵاو، چرای فتیلە، تووتن و خوریییان دەگۆڕییەوە بە جۆرەها قوماش، قاپی مس و ڕادیۆیان دەگۆڕییەوە بە ڕۆن و کەشک. یەکێک لەو بەرهەمە گرنگانەی لە سەردەشت مامەڵەی پێوەدەکرا گیادەرمانی بوو، کەتیرەش یەکێک بوو لە بەرهەمی پیشەسازییە گرنگەکان کە بۆ دەرەوەی وڵات دەنێردرا. گەورەترین فرۆشیارەکانیشی لادێییەکان بوون، کە بەکاردەهێنرا بۆ پیشەسازییەکانی چنین و قوماش و دەرمانسازیی و شامپۆ. دەوروبەری شار دارستانێکی چڕ بوو، کە زۆرترینیان داربەڕوو و دارگوێزبوون. کاتێک من گەیشتمە ئەوێ گەنم وجۆ دروێنە کرابوو، من لەگەڵ هاوڕێکەم لە جادە بچووکەکەی سەردەشت پیاسەم دەکرد، لەکاتێکدا کە سەردەشتم بەیەزد بەراورد دەکرد، لەو کاتەدا هاوار هەڵسا، کە هێسترێکی چەمووش بەرەڵا ببوو، هەموو کەس هەوڵیاندەدا بیگرنەوە. هێسترەکە بارەکەی فڕێدابوو، توانای ڕاکردنی باشی هەبوو، هیچ کەس نەیتوانی پێشی پێبگرێت، هاوڕێکەی من چوو پێشی پێبگرێت، هێسترەکە بەجادەکەدا گەڕایەوە، درێژی جادەکە لە (٣٠٠) مەتر زیاترنەبوو. هێسترەکە لە من نزیکبوەوە و خۆی لێدام و منیش کەوتم بە زەوییدا. لەناکاو کەسێک گوتی: ئەها کاکە حسێن سڵاو کە ئاوڕمدایەوە سەیردەکەم حاجی غوڵام حسێن دەهستانییە، کە خەڵکی گوندەکانی بەهابادی بافق بوو، ئەویش سەردەستەی کەتیرەکەران بوو، لە قەزوێن، پاکتاوی حیسابم لەگەڵدا کردبوو، لێی پرسیم لە سەردەشت چی دەکەم؟ پێمگوت: بۆیە هاتووم تا بزانم ئێوە چۆن چۆنی کەتیرە دەکەن. گوتی: لە ماڵی کێیت؟ گوتم: لە ماڵی مەقسودخانم، سبەی دەمبات بۆ لای ئاغا دانشی، ئەویش گوتی: دانشی ئەمساڵ درەنگ هات، ڕۆیشتووە بۆ ناو خاکی کوردستانی عێراق، ئەوێ گوێنییەکانی زۆر باشە و کەتیرەی زۆرە. گوتم: خاکی عێراق مەترسی تێدا نییە؟

گوتی: نا بابە، ئەم مەقسود ئاغایە لەگەڵ خەڵکەکانی مەلا مستەفا قەرار و مەداری هەیە، هەر کەسێک پارەیان نەداتێ گۆشاو گۆش سەری دەبڕن، بەڵام ئەگەر پارەیان بدەنێ ئەوا پارێزگاریشی لێدەکەن. پاشان گوتی: وەرە بۆلای ئێمەش لە سەردەشتەوە نزیکین و ئەمڕۆ هاتووم بۆ شار تا هەندێک پێداویستی بکڕم، من بانگی هاوڕێکەمم کرد، کە ناوی بەشیر بوو، ئەویش هات و لە دوکانەکەدا دانیشتین، غولام حسێن لەسەر فەردەیەکی گەورە دانیشتبوو، کیسە و سەبیلەکەی دەرکرد، بەهێواشی کەمێک تووتنی لە کیسەکەی دەرکرد و کردیە سەر سەبیلەکەیەوە زەڕەبینەکەی دەرکرد و لە ڕووی هەتاوەکە ڕایگرت و ڕووناکیەکەی لەسەر تووتنی سەبیلەکەی جێگرکرد و پاش کەمێک دوکەڵ لە تووتنەکەوە بەرزبووەوە، پاشان مژێکی لە سەبیلەکەدا و چەند نەرمە کۆکەیەکی بۆکرد و ئیتر تووتنی ناو سەبیلەکە بە تەواوی ئاگری گرت، دووکەڵ ئەڵقە ئەڵقە لە لوت و دەمی غولام حسێن دەهاتە دەرەوە و ناو دوکانەکەی پڕکرد لە دوکەڵ. غولام حسێن چەند فەردە ئارد و (١٢) داسی کڕی بوو بۆ بریندارکردنی گوێنییەکان تا کەتیرە دەربدەن، (٢٠) گونییەی بەتاڵی کڕی بوو، خاوەنی دوکانەکە کورد نەبوو، بە فارسی قسەی دەکرد، هەموو ئەو شتانەی کە غولام حسێن لێی کڕیبوو لە نێو دەفتەرەکەیدا نووسی، و باسی پارە نەکرا، غولام حسێن دەبێت لەبری پارە کەتیرە بدات بەدوکاندارەکە. غولام حسێن گوتی: ئەمساڵ نزیکەی (٨٠) کرێکاری هەیە و هەمووشیان خەڵکی گوندەکانی بەهابادن، ئەو کاری بۆ بازرگانێکی قەزوێنی دەکرد، دوکاندارەکەش حیسابی لەگەڵ بازرگانە قەزوێنیەکەدا دەکرد، کەتیرەی لە غولام حسێن وەردەگرت و دەینارد بۆ بازرگانەکە، غولام حسێن زۆر پێداگریی کرد، کە من بچم بۆ لای ئەوان لە نزیک سەردەشت، منیش دووبارە لێم پرسیەوە کە ئایا ڕۆیشتن بۆ ناو خاکی عێراق هیچ مەترسی تێدا هەیە. گوتی: ئەگەر لەگەڵ مەقسودخان دا بڕۆیت هیچ مەترسیەکت نییە، چونکە ئەوخۆی پیاوی مەلا مستەفایە. جا کە دڵنیا بووم لەگەڵ مەقسودخاندا بڕۆم بۆ نێو خاکی عێراق مەترسی نییە، گوتم: دەچم بۆلای دانشی و لەوانەیە پاشان سەردانی لای ئێوەش بکەم. گوتی: هەموو سێ شەممەیەک بۆ کڕینی پێویستییەکانمان دێمە سەردەشت، هەردێمەوە ئەم دوکانە، گەر حەزتکرد سەردانی لای ئێمەش بکەیت دوای نیوەڕۆی سێشەممەی داهاتوو وەرە ئەم دوکانە. یاخود خۆت دەتوانی هێسترێک و شارەزایەک بەکرێ بگریت و بێیتە گوندی کانی بی، بەشیر کە بەهۆی ڕاکردنی بەدوای هێسترەکەدا هێشتا هەناسەی سوار بوو، گوتی: من دەزانم کانی بی لە کوێیە، خۆم کاک حسێن تێدەگەیەنم. شاری سەردەشت هیچ شوێنێکی تایبەتی نەبوو تا بچم بۆ بینینی، جگە لەوەی کە هەموو شارەکە بەلای منەوە جوان بوو. من هێشتا کە منداڵ

بووم هەموو بیرو هۆشم لای شاری یەزد بوو. بۆ گەشتی دوور زۆر نەڕۆیشتبووم، شارەکانی یەزد، کرمان، رەفسنجان، مەشهەد، تەبەس، تاران، قەزوێن، کەرەج و هەندێک لە شارەکانی باکوورم دیبوو، بەڵام هەر شاری یەزدم بەلاوە جوان بوو. هەموو ئەو شارانەی کە من دیبوومن بەبەراورد لەگەڵ شاری سەردەشت ئەوان هەموو شاری گەورەبوون و بازاڕی گەورەیان هەبوو، بازاڕەکانیان پڕ بوون لە پیشەسازیی دەستیی، بەڵام بازاڕی سەردەشت، زیاتر بازاڕی کشتوکاڵی و بەرهەمی دارستانی بوون، بازاڕێک بوو، کە بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و بەرهەمی دارستانی لێدەکڕدرا و لەبری پێویستی کشتوکاڵی وەک بێڵ، قوڵنگ، ڕەمەش، نالّی ئەسپ، داس و پێویستییەکانی دیکەی جوتیارانی لێدەفرۆشرا. شتێک کە لە شاری سەردەشت زۆر سەرنجی منی ڕاکێشا، ئەوە بوو لەو شارەدا کەسێکم نەبینی، کە شێوەی لە کەسانی تلیاکی بچێت، بەڵام ئەو سەردەمە لە شاری یەزد لەنێوان هەر (٥-٦) کەسدا یەکێکیان تلیاکی بوو، لە سەردەشت جۆرەها سمێڵ هەبوو، پیاوی بێ سمێڵ زۆر کەم بوو، خەڵکەکەش بەگشتی جلوبەرگی کوردی‌یان دەپۆشی، غولام حسێن گوتی: دەتوانیت نامەیەکم بۆ بنووسیت؟ منیش گوتم: ئەی بۆ ناتوانم، کاغەز و زەرفی لە دوکانەکە وەرگرت و دەستمکرد بە نووسینی نامە بۆ ژنەکەی، گوتی: ماوەی (٤٥) ڕۆژە هاتوومەتە سەردەشت، ئەمە یەکەم نامەیە بۆماڵەوەی دەنووسم، پاشان شتومەکەکانی لە هێستر بارکرد و ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد. من و بەشیر و چەند هاوڕێیەکی بەشیر چووینەوە سەر جادەکە بۆ پیاسەکردن، ئەوکات لە سەردەشت دۆندرمە هەبوو، چووینە دوکانی درۆندرمەفرۆش، بەشیر بە کوردی داوای دۆندرمەی کرد، دۆندرمەیان بۆهێناین و دەستمانکرد بە خواردنی، بەڕاستی دۆندرمەیەکی خۆش و بێوێنە بوو .

# شازاده‌ی حه مام

له فارسییه‌وه: نه‌ها سنگاسانی

## ڕووداوه‌که‌ی حاجی جه‌واد

نزیکی ئێواره بوو له‌گه‌ڵ به‌شیر و هاوڕێکانی چووینه دوکانێکه‌وه، دوکانێک که له به‌رده‌می ماڵێکدا بوو، دوکانێکی ئاسایی نه‌بوو، به‌ڵکو خانوویه‌کی چه‌ند ژووریی بوو. له‌لایه‌کی حه‌شه‌وکه‌وه خیمه هه‌ڵدرابوو، خانووه‌که پڕ بوو له هه‌موو شتێک، هه‌ر له ئه‌شکه‌وتی عه‌لی بابا ده‌چوو، قوماش، چا، شه‌کر، خۆراک، ئارد، هه‌ر شتێک ئه‌وکاته له سه‌رده‌شتدا کڕین و فرۆشتنی پێوه بکرایه له‌م دوکانه‌که‌دا که له کاروانسه‌را ده‌چوو، هه‌بوو.

حاجییه‌ک که ته‌مه‌نی (٤٠) ساڵ ده‌بوو، خاوه‌نی دوکانه‌که بوو، له‌سه‌ر مێزێک له‌نێو دوکانه‌که‌دا دانیشتبوو، ناوی حاجی جه‌واد (ق) بوو، خه‌ڵکی شارێک بووکه ئێستا له‌گه‌ڵ تاراندا تێکه‌ڵ بوه‌ته‌وه. ساڵانه (٦-٧) مانگ بۆکڕین و فرۆشتن ده‌هات بۆ سه‌رده‌شت، هه‌موو شتێکی ده‌کڕی و هه‌موو شتێکی ده‌فرۆشت. دوکانه‌که‌ی پڕ بوو له شتی کۆن. ته‌شتێکی گه‌وره‌ی مسی له‌لای خۆیه‌وه دانابوو، که پڕبوو له پاره‌ی زیویی سه‌رده‌می زوو، حاجی له جاجمی کۆنه‌وه تا جلوبه‌رگی ژنانه کڕین و فرشتنی ده‌کرد. سێ شاگردی کوردی هه‌بوو. چه‌ند که‌سێکی کاروانچی به‌خۆیان و هێسترکانیانه‌وه له به‌رده‌می دوکانه‌که‌یدا بوون، که شتومه‌کی خه‌ڵکیان ده‌برد. مه‌قسودخان له‌م دوکانه دانیشتبوو، هه‌ندێک پیداویستی کڕی بوو بۆ کرێکارانی که‌تیره‌که‌ر که ده‌بوایه سبه‌ی سه‌ردانیان بکات و بۆیانبه‌رێت. کتوپڕ بیرمکرده‌وه که هاتم بۆ سه‌رده‌شت، ئه‌گه‌ر مه‌قسودخان نه‌بوایه من چیم ده‌کرد، ئای منداڵی چاونه‌کراوه، ئاخر چ که‌سێک ته‌نها به (٥٠) تومه‌ن و به‌بێ شاره‌زایی، به‌بێ ناونیشانێک، ته‌نها به بیستنی ناوی ته‌نها که‌سێک له یه‌زده‌وه ڕێگا بگرێته‌به‌ر به‌ره‌و سه‌رده‌شت و دواتر به‌ره‌و سنووری وڵاتی عێراق. تازه‌به‌تازه ده‌ته‌وێت دوو سبه‌ی له‌گه‌ڵ چه‌ند که‌سێکی کورددا، که زمانی فارسی نازانن، بچینه ناو خاکی کوردستانی عێراقه‌وه. مرۆڤ کاتی لاوی، نه‌زانه، بێ ئه‌قڵه، مرۆڤی بێ

ئەقڵ ئازایە، ئازایەتیش یا لە نەزانینەوەیە یاخود لە زیرەکییەوەیە، مرۆڤی گەنج ئازایەتیەکەی زیاتر بەهۆی بێ ئەقڵی و نەزانین و بێ ئەزموونییەوەیە. هەرچەندە تەمەن زیاد بکات ئەزموونیش زیاتر دەبێت، من ناوی هەموو شتەکانم لە بەشیر پرسی و نرخەکەشم، لە حاجی جەواد پرسی، مەقسودخان کاری بۆ بازرگانەکانی تاران و قەزوێن و بۆخۆیشی دەکرد، حاجی جەوادی دوکاندار نرخی هەموو ئەوشتانەی کە مەقسودخان لێی کڕی بوو بە چۆرتکە حیسابکرد و هەموو بایی (٨٥٠) تومەن بوو. مەقسودخان گوتی: ئەویشم لەسەر حیسابەکە بۆ بنووسە. منیش هەموو شتەکانم لە مێشکی خۆمدا لێکدایەوە و بۆم دەرکەوت کە لە (٦٥٠) تومەن زیاتر نابێت، بۆیە بە مەقسودخانم گوت: تکایە بامنش ئەو شتانەی کڕیوەتە کۆیان بکەمەوە. وا بزانم (٢٠٠) تومەن هەڵەی تێدایە، ئەم قسەیەی من لە گەنجێتی و نەزانینەوە بوو. مەقسودخان گوتی: هەڵەی چی تێدایە،، نا، نا هەڵەی تێدا نییە. بەڵام کەمێک بیریکردەوە. بەشیر گوتی: ئەم دوکاندارانە هەڵە ناکەن. منیش گوتم: وابزانم هەڵەی کرد. دووکاندارەکە گوتی: منداڵ برۆ بەلای کاری خۆتەوە، هەڵەی تێدا نییە. کاتێک ئەم قسەیەی کرد تێگەیشتم کە بە ئەنقەست هەڵەکەی کردووە. بۆیە گوتم: باشە چی تێدایە ئەگەر منیش کۆی بکەمەوە. مەقسودخان خەریک بوو ئەوشتانەی کڕیبوونی، دەیخستە جەواڵەوە و گومانیشی پەیدا کردبوو، گوتی: ئێستا چی تێدایە، کە دووبارە کۆی بکەینەوە؟ پاشان ڕوویکردە من و گوتی: دەزانی بە چۆرتکە کۆی بکەیتەوە؟ گوتم: بەڵێ بۆ نازانم!. چۆرتکەکەی دایە دەستم و بە بەشیری گوت: ناوی شتەکانی پێبڵێ با کۆیان بکاتەوە. ناوی هەموو شتەکانیان گوت و کۆمکردەوە، جیاوازییەکە نزیکەی (١٩٠) تومەن بوو، حاجی دوکاندار تووڕە بوو، گوتی: ئەم منداڵە شارەزا نییە و هیچ نازانێت، چۆرتکەکەی لەدەستم وەرگرت. مەقسودخان و بەشیر هچیان لە چۆرتکەکە نەدەزانی، ئیتر پارچە کاغەزێکم وەرگرت و ناوی هەموو شتەکانم نووسی کە مەقسودخان کڕیبوونی و نرخەکەشیم لە بەرامبەردا نووسی و کۆمکردەوە. دیسانەوە جیاوازییەکە (١٩٠) تومەن بوو. مەقسودخان سەری ماچکردم و ڕوویکردە دوکاندارەکە و پێیگوت: ئادەی دەفتەرەکەت بهێنە و هەرچیەکی کە لەم ماوەیەدا بردومە بۆ کەتیرەکەرەکان با دووبارە کۆیان بکەینەوە. دوکاندارەکە گوتی: مەقسودخان دڵنیابە لەو کەلوپەلانەی پێشوودا هەڵەی تێدا نییە و ئیتر دەفتەر بۆچی بهێنم؟ مەقسودخان دەستیبرد بۆ خەنجەرەکەی کە بە بەرپشتێنەکەیەوە بوو! پاشان دوکاندارەکە بەخێرایی چوو دەفتەرەکەی بۆ هێنا. حەوت هەفتە بەسەر هاتنی کەتیرەکەراندا تێپەڕ ببوو، مەقسودخان بەگشتی نۆ جار شتی کڕی بوو، پاش سێ کاتژمێر لێکدانەوە و کۆکردنەوە جیاوازی نێوانیان (٢) هەزار تومەن بوو،

واتە حاجی دوکاندار لەو ماوەکەمەدا (٢) هەزار تومەنی زیادی لەسەر مەقسودخان نووسی بوو. ئەوکات بەو پارەیە دەتوانرا پێنج هێستری باش بکڕێت. مەقسودخان بە توڕەییەوە گوتی: حیسابی ئەو فەردە کەتیرانەش بهێنە کە پێشتر داومن بە تۆ. ئەویش دەفتەری هێنا و کەوتە لێکدانەوە و کۆکردنەوە، لە کەتیرەکە (١٢٠٠) کیلۆ کەمتر نووسرا بوو، کە زۆربەی فەردەکانی بە (٢٠) کیلۆیی نووسی بوو، مەقسودخان گوتی: خۆئەوەتا دەفتەری ئێمەش ئامادەیە کە لە کەتیرەکەرانم وەرگرتووە، ئێمە هیچ فەردەیەکمان لە (٣٥-٤٠) کیلۆ کەمتر نەبووە. مەقسودخان پێیگوت: بەخێرایی پاکتاوی حیسابمان بۆ بکە چیم دەکەوێت، چیت لایە هەر ئێستا بیدەرە دەستم، ئەگەر پارەشت لانییە، کەتیرە دەبەم لەبری، ئیتر هەرگیز مامەڵە لەگەڵ تۆدا ناکەم. حاجی دوکاندار گوتی: کاکە گیان تەنها یەکجار لە حیسابدا هەڵە دەکرێت. مەقسودخان گوتی: وانییە.

بوو بەشەو و دنیا تاریک بوو، چەند چرایەکیان هێنا و چەند کوردێکی تریش هاتنە ژوورەوە بۆ شتکڕین و مامەڵەیان لەگەڵ حاجیدا هەبوو، کە زانییان حاجی لەگەڵ مەقسودخاندا کێشەی مامەڵەیان هەیە، گوتیان دەبێت چاوێک بە حیسابەکانی ئێمەشدا بگێڕیتەوە. حاجی جەواد گوتی: مامەڵەی ئێوە هیچ کیشەیەکی تێدا نییە، بۆیە پێویست بە سەیرکردنەوە ناکات. یەکێک لە کوردەکان کە کەسێکی کەتە و بەخۆوە بوو، پەلاماری زنجیری قەپانەکەیدا لە ملی حاجی جەوادی توندکرد و پێیگوت: ئێستا دووبارە سەیری حیسابەکانمان دەکەیتەوە یان لێرە بتکوژم. مەقسودخان گوێیەکی حاجی جەوادی گرت و ڕایکێشا، پاشان بەدەستەکەی تری گوێکەی تریشی گرت. حاجی جەواد گوتی: هەر ئێستا هەرچی پارەت کەوتۆتە لام دەتدەمەوە. ئەگەر پارەکەش تەواوی نەکرد، ئەوا دەتوانیت کەتیرە ببەیت. لە درەنگانکی شەودا مەقسودخان هەموو حیسابێکی خۆی لەگەڵدا کرد و تا دوا ڕیاڵی کە کەوتبووە لای لێی وەرگرتەوە، نزیکەی (١٢٠) کیسە کەتیرەی لێوەرگرتەوە. هێستریان هێنا و کەتیرەکەیان بارکرد و بردیانەوە بۆ ماڵی مەقسودخان. لە نێو شاردا هەواڵ بڵاوبوەوە کە حاجی جەواد دزە. بەرەدەمی دوکانەکەی جەمەی دەهات، ژمارەیەک کەس بەچرای دەستیەوە چوونە ناو دوکانەکە. حیسابی مەقسودخان کە تەواو ببوو، کڕیارەکانی تر گوتیان: دەی خێرا حیسابی ئێمەش بهێنە پێش. بەڵام کێ حیسابەکەیان بۆ بکات. کەسێک نەبوو خۆشیان خوێندەوارییان نەبوو. بڕیاریاندا کە من حیسابەکەیان بۆ بکەم، منیش هیلاک و ماندووبووم، بۆیە دواجار بڕیاریاندا کە سبەی بەیانی بچم بۆ دوکانەکە. چەند کوردێک دەرگای دوکانەکەیان داخست و قفڵیان لێدا. حاجی جەوادیان برد بۆماڵی خۆیان. حاجی دەیگوت: خۆ من ڕاناکەم وازم لێبێنن. بەڵام ئەوان گوتیان: تۆ ئەمشەو میوانی ئێمەیت. چونکە باوەڕمان

پێت نەماوە، شەو تا کاتی درەنگ مەقسودخان لەگەڵ چەند کەسێکدا خەریکی گواستنەوەی کەتیرەکە بوون لە دوکانی حاجی جەوادەوە بۆ ماڵی خۆیان و قەپانیان دەکرد و لە دەفتەردا دەیاننووسین، من زۆرم برسی بوو، گوڵەخانم بەکوردی بانگی کردم، کە خواردن ئامادەیە. مەقسودخان لەکاتی نانخواردندا سوپاسی منی کرد و گوتی: چاکەی تۆم لەبەرچاوە. گوتم: خان من چیم کردووە! گوتی: چۆن چیت کردووە.. ئەو ساختەچیە دەیویست من لەبنبهێنێت، لە فرۆشتندا شتەکانی گران حیساب کرد بوو، لە کێشانیشدا سووک کێشانی کرد بوون، لە کۆکردنەوەش دا زیادی دەنووسی، بۆ مەگەر من ئێستا وازی لێدەهێنم؟ دەبێت هەموو دەفتەر و حیسابی چەند ساڵ لەمەوپێشی پێبهێنمەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم، خۆ ئەگەر کار وا بڕوات ئەوا دەبێت من شەش مانگی تر لێرە بم و خەریکی لێکدانەوەی حیسابەکان بم. یەکێک لە پیاوانی مەقسودخان هاتە ژوورەوە لە خانی پرسی بەیانی کەی بەڕێدەکەوین؟ مەقسودخان وەلامی دایەوە گوتی: بەیانی پێش هەموو شتێک دەبێت بچمەوە دوکانی حاجی جەواد، بزانم چی هەیە. ئەو شەوە من لە نێو باشترین و جوانترین نوێنی ماڵی مەقسودخاندا خەوتم. بەیانی زوو هێشتا مەلا بانگی نەدابوو. چەند کەسێکی کورد بە چرای دەستیەوە هاتن بەشوێنمدا. من و بەشیر و مەقسودخان نانی بەیانمان نەخوارد لەگەڵ ئەو چەند کوردەدا چووین بۆ دوکانی حاجی جەواد. حاجی جەودیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، دەموچاوی سوور ببوەوە، کوردەکان پێیانگوت دەفتەرەکەت بهێنە. حاجی جەواد هاتە لامەوە بەهێواشی پێیگوتم: کارێکی خراپت کرد، تکایە بڵێ حیسابەکە ڕاستە و هەڵەی تێدا نییە. ئەوکات منیش (٣٠٠) تومەنت دەدەمێ. گوتم: تۆ زۆر هەڵەت کرد. گوتی: (٥٠٠) تومەنت دەدەمێ. گوتم: تۆ کوا پارەت ماوە.. دوێنێ شەو هەرچی پارەت هەبوو داتەوە بە مەقسودخان. گوتی: لەبری ئەو (٥٠٠) تومەنە زیوت دەدەمێ. گوتم: ئاخر (٥٠٠) تومەن زۆر کەمە. گوتی: باشە (٨٠٠) تومەنت دەدەمێ. گوتم: من خەڵکی یەزدم، من دز و درۆزن نیم. ئەمە حیساباتە و دەبێت بکرێت. گوتی: زۆر باشە، دەبێت تۆڵەت لێبکەمەوە و خۆم دەزانم چیت لێدەکەم، وادەزانی هەموو شوێنێک سەردەشتە. مەقسودخان هاواری لێکرد و گوتی: ئەوە چی دەڵێیت.. خێرا دەفتەرەکە بهێنە. کوردێکی تر هات و چووە بەردەمی حاجی جەواد و پێیگوت: ئەوە چی بەو منداڵە دەڵێیت؟. دەی خێرا دەفتەرەکە بهێنە. حاجی جەواد دەفتەری حاجی ڕەحمانی هێنا، بەڵام کە سەیرم کرد دەفتەرەکە بەخەتی شکستە نووسرابوو، من خەتی شکستەم نەدەزانی، هیچ کامێک لە کوردەکان خەتی شکستەیان نەدەزانی. تەنها حاجی جەواد خۆی دەیزانی بۆیە گوتی: من حیسابەکە دەخوێنمەوە و با حسێن کۆی بکاتەوە. کوردێک گوتی: نابێت. پاشان

یەکێکیتر گوتی: مەلا بابا حیسابی شکستە دەزانێت. بە خێرایی کەسێکیان نارد بە شوێن مەلا بابادا. مەلا بابا پیاوێکی تەمەن (٦٥) ساڵ بوو، دەستێک جلی کوردی لەبەردا بوو، هاتە دوکانەکەوە و هەموو لەبەری هەڵسان. مەلا خوێندنەوەی خەتی شکستەی باش دەزانی، ئەو دەفتەرەکەی دەخوێندەوە و منیش بە چۆرتکە کۆمدەکردەوە. هەر لەوێ چا لێنرا، ئەو کات لە سەردەشتدا نانەواخانە نەبوو، چوون لە ماڵێک نانیان هێنا و هێلکەورۆنیان دروستکرد و نانی بەیانیمان خوارد. حیسابی حاجی ڕەحمان تەواو بوو، لە ماوەی (٨) مانگدا (٩) هەزار تومەن هەڵە هەبوو. حاجی ڕەحمان یەخەی جەوادی گرت و گوتی: دەبێت ئێستا هەموو پارەکەم بدەیتەوە، ئەو ڕۆن و کەشک و خورییەش کە پێمداویت هەر ئێستا دەمەوێتەوە، حاجی جەواد گوتی: پارەم نییە پاشان دەتدەمەوە. حاجی ڕەحمان گوتی: ئەم قسانە ناخوات، پارەت نییە، کەیفی خۆتە، لەبری پارە قوماش و شتومەکی ناو دوکانەکە دەبەم. (٣٠-٥٠) کەس هاتبوونە ناو دوکانەکەوە، سەیری ئەو حیساباتانەیان دەکرد و لە نێویاندا چەند ژنێکی بەتەمەنیش هەبوون. ژنێکی (٦٠) ساڵە هاتە پێشەوە و لەگەڵ مەلا بابا کەوتە قسەکردن و بەشێر قسەکانی بۆ وەرگێڕام و گوتی: ئەم ژنە پێرێ هاتووە، قوماشی لێکڕیوە و زیوی داوەتێ. داوا لەمەلا بابا دەکات کە بەزوویی حیسابەکەی ئەو ئەنجام بدات، ژنەکە هاوار هاواری بوو کە لە تەشتەکەدا گەڕا چەند دانە پارەی زیوی کە پێی دابوو دۆزییەوە، چەند دانە پارەی مزەفەر شایی و چەند دانە یەک تومەنی ڕەزا شایی، ژنە لە مەلا بابای پرسی ئەم پارانە نرخیان چەندە؟ یەکێک لە کوردەکان گوتی: لە مەهاباد دوو ڕیاڵی مزەفەر شاهی بە (٧٠) تومەن دەکڕن، حاجی جەواد لە بەرامبەر ڕیاڵێکی دوو زیوی کە نرخەکەی (٧٠) تومەن بوو، (١٥) ڕیاڵی بۆ ئەو ژنە نووسی بوو. حاجی جەواد بایی (٧٥٠) تومەن زیوی لەو ژنە وەرگرتبوو، بەڵام تەنها (٢٨) تومەنی بۆ حیسابکردبوو. ژنە یەخەی حاجی جەوادی گرت و بەئارەزووی خۆی یەک شەپازلەی لە بناگوێیدا و حاجی جەواد وەکو تۆپی لاستیک بەرزبوەوە و کەوتە سەرزەوی. دوکانەکە زۆر جەنجاڵ بوو، دوو ژن و پیاو بە مست و بە پێلەقە دەستیانکرد بە لێدانی حاجی جەواد. نزیکی بانگی نیوەڕۆ بوو کە دوو پۆلیس هاتنە دوکانەکەوە، حاجی جەواد، کە لێدانی زۆری خواردبوو، خوێن بەدەم وچاویدا دەهاتە خوارەوە، ڕوویکردە پۆلیسەکان و گوتی: من شکات لەم منداڵە یەزدییە دەکەم. هەموو تاوانەکە لەژێر سەری ئەودایە. مەقسودخان و کوردەکان گوتیان: سەگباب تۆ دزییت کردووە و کەچی تۆش شکات دەکەیت و تاوانەکە دەخەیتە ملی ئەم منداڵە؟ پۆلیسەکان ویستیان لایەنگیری حاجی جەواد بکەن، یەکێک لە پۆلیسەکان پێیگوتن: بڕۆنەوە بۆ ماڵەکانتان بۆچی ئێرەتان وا قەرە باڵغ کردووە، ژنە کوردێک کە

فارسی تێنەدەگەیشت بێدەنگ بوو، وەکو ئەوەی کە کەسێک قسەی پۆلیسەکەی بۆبکات بە کوردی، لەناکاو ژنە هێرشیکردە سەر حاجی جەواد و چەند ژنێکی تریش پەلاماریاندا، یەکێک لە پۆلیسەکان دەستی یەکێک لە ژنەکانی گرت تا لە حاجی جەوادی دووری بخاتەوە. هەر ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی کە کوردەکان پەلاماری پۆلیسەکان بدەن، هەندێک کەسیش پەلاماری کەلوپەلی ناو دوکانەکەیاندا هەر شتێکیان بەردەستکەوت لە قوماش، سۆپا، هیزە رۆن، کیسە ئارد و کیسە کەتیرە بردیان. حاجی جەواد هاواری دەکرد و بەسەری خۆیدا دەکێشا و دەیگوت: پێش بەو خەڵکە بگرن هەموو دوکانەکەیان تالانکردم. بەلام لەو هەموو جەنجالییەدا نەدەتوانرا هیچ بکرێت، من چاوم لێبوو یەکێک لە پۆلیسەکان هەموو ئەو پارە زیویانەی کە لە نێو تەشتەکەدا بوو کردنییە کیسەیەکەوە و بردنی بۆ حەوشەکەی دواوە. خەریکبوو منیش بکەومە ژێر دەستوپێی خەڵکەوە. بەپەلە رامکردە سەر جادەکە. هەر لە رۆژی قیامەت دەچوو، هەرکەسێک هەر شتێکی بەردەست بکەوتایە هەڵیدەگرت و دەیبرد. یەکێک لە پۆلیسەکان کە لەسەر جادەکە بوو چەند فیشەکێکی بەئاسمانەدا تەقاند، من لەترسا رامکرد بۆ کۆلانەکەی پشتەوە. ئەو پۆلیسەی کە پارە زیوەکانی خستبووە ناو کیسەکەوە. لە دەرگای پشتەوە هاتبووە ناو کۆلانەکە، هەندێک شتی لە هێسترێک بارکردبوو، ئەسپێکیشی پێبوو، تفەنگەکەی لەشان کرد و سوار ئەسپەکە بوو. ریشمەی هێسترەکەشی بەدەستەوەگرت و بەدوای خۆیدا رایدەکێشا. کە چاوی بە من کەوت دەستی برد بۆ تفەنگەکەی گوتم: ئێستا فیشەکێکم پێوە دەنێت. بەلام تفەنگەکەی لە شانیدا رێککرد و پێکەنینێکی ماناداری بۆکردم و رۆیشت. پاش کەمێک چەند کەسێکی تر کە ئەسپ و هێستریان بارکردبوو، لە دەرگای پشتەوەی ماڵی حاجی جەواد چوونە دەرەوە. بەهەمووی کاتژمێرێکی پێنەچوو کە لە ماڵ و لە دوکان و حەوشەی ماڵی حاجی جەوادا دەرزییەکیش نەما. خەڵکی هەموو شتەکانیان برد تەنها چەند گونییەیەکی بەتاڵ مابوو، زیاتر لە باری (١٠٠) هێستر و ئەسپ شتیان لەم ماڵ و دوکانە بارکرد. زیاتر لە (٣٠٠-٤٠٠) کەس هەریەکە و کۆڵێکی لە ئارد و کەتیرە و رۆن وکەشک و شتی تر بە کۆڵی خۆیاندا دا بوو دەیانبرد. خۆ دیار بوو زۆربەی خەڵکەکە بۆ تالانیکردن هاتبوون. منیش تێدامابووم کە دەبێت چیبکەم؟ حاجی جەواد لەسەر جادەکە وەستا بوو هەر هاواری دەکرد و بەخۆیدا دەکێشا. ویستم بچمەوە بۆ ماڵی مەقسودخان کە سەیرمکرد حاجی جەواد خەریکە بەجادەکەدا رادەکات و چەند پۆلیسێکی ئەسپسواری لەگەڵدایە، کە چاوی بەمن کەوت هاواریکرد هەموو کێشەکە لەبن سەری ئەم منداڵەدایە و من شکاتم تەنها لەم منداڵەیە. پۆلیس دەستی منی گرت و

هێنامیەوە بۆ دوکانەکە، دوکانەکە بەتاڵ ببوو هیچی تیانەمابوو، تەنانەت مێز و کورسیی و قەپانەکەشیان بردبوو. حاجی جەواد خەریکبوو سەکتە لێیبدات، هیچ کەسێک لەوێ نەمابوو، پۆلیسەکان تەنها منیان گرتبوو، حاجی جەواد گوتی: گەورەم هەمووی لە ژێر سەری ئەم منداڵەدایە، یەکێک لە پۆلیسەکان گوتی: ئاخر حاجی تۆ دەڵێیت ئەم منداڵە، باشە ئەم منداڵە لە ماوەی نیو کاتژمێردا هەموو دوکانەکەی تۆی بردووە؟ باشە کەلوپەلەکانی بۆ کوێ بردووە؟ حاجی جەواد گوتی: من ناڵێم ئەم شتەکانی بردووە، ئەم منداڵە ئاشووبەکەی دروستکرد. ئەگەر ئەو بگرن و بیخەنە زیندانەوە شتەکانی من پەیدا دەبنەوە، پۆلیس دەستیانکرد بە لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکە. ئەو پۆلیسەی کە زیوەکەشی بردبوو، هات. پاش چەند خولەکێک سەرۆکی پۆلیسەکان بە سواری جێبێک هات. پۆلیسەکان هەموو سڵاویان بۆکرد و ئەویش پرسی ئەوە چی ڕوویداوە؟ حاجی جەواد گوتی: سەرۆکی بەڕێز ماڵم وێران بوو، هەموو ماڵ و دوکانیان تالان کردم، تەنانەت پێڵاوەکانی پێشم براون و نوێن و قەرەوێڵەکەم بۆ نەماوەتەوە. سەرۆک گوتی: هێمنبە و قسەمەکە، یەکێک لە پۆلیسەکان ڕووداوەکەی گێڕایەوە، سەرۆکی پۆلیس گوتی: من نیو کاژمێر لە سەردەشت دوورکەوتمەوە ئەم ڕووداوە خوڵقا، کێ ماڵ و دوکانی ئەم بەندەیەی خودای تالان کردووە؟ حاجی جەواد گوتی: بەڕێز سەرۆکی پۆلیس هەمووی لەژێر سەری ئەم منداڵەدایە. لەو کاتەدا دوو سێ کەس هاتن، کە دراوسێی دوکانی حاجی جەواد بوون و هەموشیان فارس بوون، یەکێکیان گوتی: بەڕێز سەرۆکی پۆلیس ئەوە چیە کە ڕوودەدات، ئەم شارە ئاسایشی تێدا نییە. ئێمەش دەترسین کە دوکانەکانمان تالان بکرێت. هەر کەسە و بەجۆرێک قسەی دەکرد. سەرۆکی پۆلیس ڕوویکردە حاجی جەواد و لێی پرسی تۆ شکاتت لە کێ هەیە؟ ئەویش گوتی: شکات لە هەمووان دەکەم. سەرۆکی پۆلیس گوتی: خۆ من ناتوانم هەموو خەڵکی شار زیندانی بکەم. بۆیە دەبێت تۆ کەسێک دەستنیشان بکەیت، گوتی: من شکات لەم منداڵە دەکەم. ئەم منداڵە دوێنێ هاتووە بۆ ئەم شارە، لە دوێنێوە بەڵایەکی بەسەرمندا هێناوە کە شەمەر بەسەر ئیمام حسێنی دا نەهێناوە. چوار کەسی ترهاتن و خەڵکی دووبارە دەیانویست کۆببنەوە. مەقسودخان و بەشیر و چەند کەسێکی تریش هاتن، بەشیر هاتە لامەوە و گوتی: هیچ مەترسە ناتوانن هیچت لێبکەن، سەرۆکی پۆلیس کە سەیریکرد خەریکە جەنجاڵ دەبێت بەمن و حاجی جەوادی گوت سواری جێبەکەبن. بەدوو پۆلیسی گوت، کە ئاگاداری ناوبازڕبن، و بە پۆلیسەکانی تریشی گوت بگەڕێنەوە بۆ بنکە. من و حاجی جەوادیان لە دواوەوەی جێبەکە سوارکرد، سەرۆکی پۆلیس خۆی جێبەکەی لێدەخوڕی و پۆلیسێک لەلایەوە دانیشت.

حاجی جەواد پێی گوتم، کوڕی سەگ، تۆ چ کارەساتێکت بەسەرمندا هێنا، ماڵت وێران کردم، پێیان دەڵێم کە لە زیندانت قایم بکەن تا هەموو کەسوکارت دێن و ماڵەکەم بۆ دەبژێرن، چونکە تۆ بوویتە هۆی ئەوەی ماڵوێران ببم، بەدوو کۆکردنەوە و لێکدان، منت وەک سەگ لێکرد لەبەرچاوی ئەو خەڵکە. منیش لەترساندا بێدەنگ ببووم. دەمگوت دەبێت چی رووبدات؟ لە هەمووشی زیاتر لەو پۆلیسە دەترسام کە زیوەکانی بردبوو، چونکە دەیزانی کە من ئەوم بینیوە کە زیوەکانی هەڵگرتووە. ئێستا دەبێت چی بەرامبەرم بکات؟! من هەر لە بیرکردنەوەدا بووم، حاجی جەواد دەستیکردەوە بە جنێو پێدانم. جادەکەمان جێهێشت و گەیشتینە بنکەی پۆلیس، لەوێ ژمارەیەکی زۆر ژن و پیاو وەستابوون، سەرۆکی پۆلیس گوتی: حاجی جەواد هەموو شارت وروژاندووە، ئەم هەموو خەڵکە لێرە کۆبوونەتەوە، من وەڵامی چی مەهاباد وتاران بدەمەوە. حاجی جەواد گوتی: من شارم وروژاندووە؟ لەکاتێکدا هەموو ماڵم تالانکراوە و خۆم وەک سواڵکەرم لێهاتووە. خەریکبوو لە جێبەکە دابەزین، کە سەیرمکرد مەقسودخان و بەشیر لە پێش ئێمەدا گەیشتبوون، کەمێک دڵشادبووم، لە جێبەکە دابەزیم و سەیرمکرد هەمان ژن، کە زللەکەی لە بناگوێی حاجی جەواددا هاواری دەکرد سەرۆک سەرۆک، پۆلیسەکان من و حاجی جەوادیان بردە ناو بنکەکەوە، چەند کەسێکی تریش هاتنە ناو بنکەکەوە، پۆلیسەکانی تریش بەسواری ئەسپەوە گەیشتن، سەرۆک بەخەڵکەکەی گوت چیە؟ بۆچی لێرە کۆبوونەتەوە؟ خێرا لێرە بڕۆن، هەر کەسە و بەزمانی کوردی قسەیەکی دەکرد، بەشیر هاتە لای منەوە و منیش لێم پرسی ئەوانە چی دەڵێن؟ گوتی: ئەوانە دەیانەوێت شکات لە حاجی جەواد بکەن، و دەڵێن شتیان داوە بە حاجی جەواد و پارەکەیان وەرنەگرتوەوە. ئێستا داوا دەکەن یا پارەکەیان بداتێ یان شتەکانیان بداتەوە. سەرۆک من و حاجی جەوادی بردە ژوورەوە. خەڵکەکەش فشارێکی زۆر و دەنگە دەنگێکی زۆریان دەکرد، سەرۆک بە دوو پۆلیسی گوت یەک یەک ئەو خەڵکە بکەنە ژوورەوە بابێن بۆلام تا بزانم چیان دەوێت. پێنج ژن بەیەکەوە خۆیان کرد بەژووردا و خێرا خێرا قسەیان دەکرد. سەرۆک پێی گوتن بە فارسی قسەبکەن و بزانم چیتان دەوێت، خۆ دیار بوو هیچ کامێکیان فارسی‌یان نەدەزانی، سەرۆک کورد نەبوو، بەڵام فێری کوردی ببوو. بەشیر هاتە ژوورەوە و گوتی: من وەرگێڕی ئەوانەم و ژنەکان گوتیان ئێمە شکات لەم حاجیە دەکەین، ئەو زیوی لە ئێمە وەرگرتووە نە پارەی داوینەتێ و نە هیچ شتێکی لەبری پێداوین. سەرۆک بە پۆلیسێکی گوت شکاتی ئەم ژنانە بنووسە. حاجی جەواد کردی بەدەنگە دەنگ، سەۆک پێی گوت: حاجی بێدەنگبە خەڵکی شکات لە تۆدەکەن، من چیبکەم؟ تەقەیان لێبکەم؟ ئێرە شوێنی یاسایە و ئەوانیش

شکاتیان هەیە و دەبێت ئێمەش شکاتەکەیان بپرسین، لە ماوەی سێ کاتژمێردا (١٤٠) کەس لە ژن و پیاو شکاتیان هەبوو، حاجی جەوادیش تەنها شکاتی لە من هەبوو، چونکە نەیوێرا شکات لە کوردەکان بکات، دەترسا کە بیکوژن، کات بوو بەدوانیوەڕۆ، ئێمەش هەموو برسی و ماندووبووین. بە بەشیرم گوت زۆرم برسییە، سەرۆک گوتی: بەخودا ئێمەش برسی و تینووین. بەشیر ڕۆیشتە دەرەوە. پاش کەمێک پۆلیسێک هاتە ژوورەوە هەندێک نان و پەنیر و ڕۆنەکەرەی هێنایە ژوورەوە. دیار بوو کوردەکان لە بەردەمی بنکەی پۆلیس چایان ئامادەکردبوو. سەرۆک هەموو کوردەکانی هێمن کردەوە و هەموو هەوڵیان ئەوەبوو کە کێشە دروست نەبێت. بە حاجی جەوادیشی گوت سەیرکە ئەوە (١٤٠) کەس شکاتیان لێکردویت تۆ دەڵێیت ماڵ و دوکانەکەیان دزیویت، باشە تۆ ئێستا شکات لە کێ دەکەیت؟ من کێ دەستگیر بکەم؟ گوتی: من تەنها شکات لەم منداڵە دەکەم کە ناوی حسێنە. سەرۆک گوتی: شکات لە کەسی تر ناکەیت؟ حاجی جەواد گوتی: من شتەکانی خۆمم دەوێتەوە. تا ئەوکاتە سەرۆک هیچی بەمن نەگوتبوو، خۆی کاغەز و قەڵەمی هەڵگرت و ڕوویکردە من و گوتی: ناوت چییە؟. گوتم: محەمەد حسێن پاپولی یەزدی، کەمێک ڕاما و گوتی: تۆ خەڵکی یەزدیت؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: کوێی یەزد؟ گوتم: جادەی ئێرانشەهر، گەڕەکی پشتی باخ. گوتی: لێرە چی دەکەیت؟ گوتم: هاتوم بچم بۆلای کەتیرەکەران، گوتی: لە سەردەشت کێ دەناسیت؟ گوتم: مەقسودخان دەناسم، ئەویش لە دوێنێوە بووینە ئاشنا، پاشان بە پۆلیسێکی گوت بە مەقسودخان بڵێن با بێتە ژوورەوە. مەقسودخان هاتە ژوورەوە، سەرۆک لێی پرسی ئەم برادەرە دەناسیت، گوتی: بەڵێ، ئەوە میوانی منە، دەیەوێت بچێت بۆلای یەزدییەکان کە خەرکی کەتیرەکردنن، سەرۆک بەحاجی جەوادی گوت، تۆشکات لە مەقسودخان دەکەیت؟ حاجی کەمێک ڕاما و گوتی: نەخێر، شکاتم لێی نییە. سەرۆک بە مەقسودخانی گوت : ئەم کوڕە کە میوانی تۆیە و بەڵام حاجی جەواد دەڵێت، ئەم کوڕە ئەم ئاژاوەیەی دروستکردووە، مەقسودخان گوتی: گەورەم حاجی جەواد خۆی ئاژاوەی دروستکردووە. دوێنێ ئەم کاکە خسێنە هات تا حیسابی من و حاجی جەواد بنووسێت و لێکی بداتەوە. بەڵام حاجی جەواد شتەکانی خۆی زۆر بەگران لەسەر ئێمە نووسی بوو، بە پێچەواشەوە شتەکانی ئێمەی زۆر بەهەرزان بۆخۆی دانابوو. هەردوو حیسابەکەی بەهەڵە لەبەرژەوەندی خۆی نووسیبوو، من (١٨٥٠٠) تومەن پارەی ئەو هەڵانەی کە بە ئانقەست نووسیبووی لێم وەرگرتەوە و نزیکەی (١٢٠) کیسە کەتیرەی کەم نووسی بوو، کە ئەویشم لێوەرگرتەوە، ئەوەتا خەڵکانی تریش هاتوون کە دووبارە حیسابەکەیان بکەنەوە لەگەڵیدا. ئەوەش ڕوونبۆتەوە کە زیوی بەهەرزان لەو ژنانە

وەرگرتووە و خەڵەتاندوونی، پارچە زیوێک کە بایی (٧٥٠) تومەنە ئەو تەنها (٢٨) تومەنی پێداون. لەگەڵ ژنەکانیشدا کردوویەتی بەشەڕ، پاشان گوتی کۆتایی ڕووداوەکە من نایزانم چونکە کاتێک بوو بەدەنگە دەنگ، من ڕۆیشتمەوە بۆماڵەوە. بۆ ئیش و کارەکانی خۆم، لەماڵەوە خەریکی ڕێکخستنی کاروبارەکانی خۆم بووم، گوێم لە دەنگی چەند تەقەیەک بوو، پاش نیوکاتژمێر هاتمەوە بۆ سەر جادەکە و لەوێ زانیم کە پۆلیس میوانەکەیان دەستگیرکردوم، بۆیە منیش هاتم بۆ ئێرە. سەرۆک منی بردە ژوورێک کە سێ پۆلیسی تێدابوو، یەکێک لە پۆلیسەکان هەمان ئەو کەسە بوو کە زیوەکانی لەگەڵ خۆیدا بردبوو، سەرۆک لە پشتی مێزێکەوە دانیشت و گوتی: تۆ گوتت خەڵکی شاری یەزدیت؟! گوتم: بەڵێ، وایە. گوتی: من چوار ساڵ سەرۆکی بنکەی گوندی (نیرە)ی یەزد بووم، ئەزانی ئەو شوێنە لە کوێیە، گوتم: بەڵێ دەزانم نزیکی (سەحویدە)، گوتی: ئەو کاتەی من سەرۆکی بنکەی ئەوێ بووم لە ماوەی چوار ساڵدا تەنها یەک شکات لە کەسێک یا لە دزێک نەکرا، من لەوێ زۆر بێکاربووم، هیچ کەسێک درۆی نەدەکرد ئێستا تۆ منداڵی ئەو شارە و ئەو ناوچەیەیت هەرچیت لێدەپرسم بەدڵنیاییەوە ڕاست دەڕۆیت. من دڵنیام کە تۆ درۆزن نیت، چونکە خەڵکی یەزد هەرگیز درۆناکەن و قۆڵبڕ و ئاژاوەگێریش نین، من لە سەردەمی منداڵی و لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا تووشی لەخۆبایی بوون ببووم، ئاخر یەزد تۆ لە کوێ و سەردەشت و مەزری عێراق و ئێران تۆ لە کوێ. وا لێرە دەڵێن خەڵکی یەزد درۆزن نین و کەسانی قۆڵبڕ و فێڵاوی نین، بەم گوتانە زۆر خۆشحاڵ بووم، هەر خەریکبوو باڵم دەگرت، هەم لە دڵی خۆمدا دەمگوت یەزدی بوون گرنگە، هەم بڕوابوون و گەورەییە، بەڵام من ئێستا چیبکەم، لەو ماوەکەمەدا زۆرشت بەمێشکمدا هات. پاشان سەرۆک لێی پرسیم کێ دوکانەکەی تاڵان کرد؟ گوتم: گەر ڕاستت دەوێت تەنها کەسێک نەبوو بەڵکو سەدان کەس بوون و هەرکەسە و شتێکی دەبرد. گوتی: چۆن بوو کە ئەم ڕووداوە ڕوویدا، گوتم: دوێنێ کە من حیسابم کرد دیاربوو کە حاجی جەواد فێڵی کردبوو، ئەمڕۆش ویستم حیسابەکەیان بۆ بکەمەوە، ژنێک هات و گوتی: پارەی زیوەکە چەندە؟ خۆ دیار بوو کە دوو ڕیاڵی مزەفەرەدین شاهی نرخەکەی (٧٠) تومەنە بەڵام ئەو (١٥) ڕیاڵی بۆ حیساب کردبوو، بۆیە ژنەکە پەلاماری حاجی جەوادی دا. پاشان گوتی: ئەو کەسانەی کە دوکانەکەیان تاڵانکرد تۆ دەیانناسیت، خەریکبوو بڵێم یەکێک واتە پۆلیسی خۆتان بوو. بەڵام زوو پاشگەزبوومەوە. کێ دەڵێت سەرۆک لەم دزیەدا هاوبەشی پۆلیسەکە نییە؟ گوتم: من لێرە ناوی کەس نازانم من دوێنێ هاتومەتە ئەم شارە و زمانی کوردیش نازانم. گوتی: مەقسودخان و پیاوەکانی لەو تاڵانییە بەشداربوون؟ گوتم: مە قسودخان دوێنێ شەو

حیسابی لەگەڵدا کرد و پارەکانی خۆی لێوەرگرتەوە و شتومەکەکانیشی هەردوێنێ شەو لێ وەرگرتەوە بردنییەوە بۆ ماڵی خۆیان. ئەمڕۆش تا ئەم کاتە و ئەوەندەی من ئاگاداربم نە مەقسودخان نە یەکێک لە پیاوەکانی هیچ شتێکیان نەبردووە، نزیکەی کاتژمێر شەشی ئێوارە بوو، دووبارە جەنجاڵی لەبەردەمی بنکەکە دروست بوەوە، پۆلیسێک هاتە ژوورەوە و گوتی: سەرۆک ژنان هاتوون و جەنجاڵیان دروستکردووە. گوتی: چییان دەوێت؟ پۆلیسەکە گوتی: دەڵێن ئەوکاکە حسێنە میوانی ئێمەیە و دەبێت هەر ئێستا ئازاد بکرێت.. ئەگەر نا ئێمە بنکەی پۆلیس دەسووتێنین. سەرۆک گوتی: کاکە حسێن ئێمە ئەگەر چەند کەسێک دەستگیر بکەین و بیانهێنینە لای تۆ، تۆ دەتوانی بۆمان دەستنیشان بکەیت کە ئایا لە تالانکردنی دوکانەکە بەشداربوون یا نا؟ گوتم: گەورەم کە جەنجاڵییەکە دروست بوو من لە ترساندا ڕامکردە کۆڵانی پشتەوە من لێرە کەس ناناسم. خۆ ئەگەر هەر لە خۆیشمەوە قسەبکەم ئەوا پارچە پارچەم دەکەن. پاشان سەرۆک گوتی: تۆ ڕاست دەکەیت، بەڕاستی تۆ خەڵکی یەزدیت من هەموو قسەکانی تۆ بەڕاست دەزانم. خەڵکی یەزد شەڕەنگێز نین، بەڵام من ئێستا چیبکەم گوتم: گەورەم خۆ من هیچ کارێکی ناڕەوام نەکردوە تەنها پێیان گوتوم وەرە ئەو حیسابەمان بۆ بکە و منیش چووم. بەڵام حاجی جەواد وا بیردەکاتەوە ئەگەر ئەو شکاتم لێ بکات، ئێوەش بێ لێکۆڵینەوە بەندم دەکەن و خزم و کەسوکارەکەشم دێن و زیانەکانی بۆ دەبژێرن. من خزم و کەسم نییە باوکم مردووە و ئەگەر کەسوکارێکم هەبووایە بەم تەمەنە منداڵییەوە چیم دەکرد لە سەردەشت. سەرۆک گوتی: لەشاری یەزد کێ دەناسیت.؟ گوتم: لە یەزد خەڵک زۆر دەناسم، حاجی گوڵشەن نیریش دەناسم، سەرۆک گوتی: ئەو پیاوێکی زۆر باشە دەیان جار من و بنەماڵەکەمی بانگهێشتکردووە بۆ ماڵی خۆیان بۆ نانخواردن، بەڵام بەداخەوە من نەمتوانی هیچ چاکەیەکی لەگەڵدا بکەم. گوتی: کێی تر دەناسیت؟ محەمەد نیلی زادەش دەناسم، گوتی: من ئەو زۆرباش دەناسم، گوتم: ئەو ناسراوە بە محەمەد مورغابی. گوتی: بەڵێ، بەڵی، باشی دەناسم، ئەو ئۆتۆمبێلەی کە دەچێت بۆ نیر هی ئەوە. گوتم: کوڕە خوشکەکەشی حسێن ڕەجەب زادە دەناسم کەمێک بیری کردەوە و زانیم کە نایناسێت. گوتم: هەر ئەوە کە ناسراوە بە حسێن بۆشکە، گوتی: بابە گیان هەموو هاوڕێکانی من هاوڕێی تۆشن، تۆ خەڵکی باش و ناسراو دەناسیت. گوتم: بەڕێز تۆ خەڵکی کوێیت؟، گوتی: من خەڵکی شوشتەرم بەڵام لەگەڵ یەزدییەکاندا خزمەتیمان هەیە، گوتم: تۆ زاوای یەزدییەکانی؟ گوتی: نەخێر، بەڵام دوو زاوام هەیە، هەردوکیان خەڵکی شاری یەزدن. ئەو پۆلیسەی کە زیوەکانی بردبوو. لەوە دڵنیابوو کە لەبارەی ئەوەوە هیچ ناڵێم ڕوویکردە سەرۆک و گوتی: ئەم کاک حسێنە کوڕێکی باشە، هیچ

کارێکی وای نه‌کردووه تا ئێمه زیندانی بکه‌ین. ئه‌و حاجی جه‌واده خۆی سه‌ره‌تا خه‌ڵکی تالآن کردووه. سه‌رۆک که‌مێک که‌وته بیرکردنه‌وه و پاشان به پۆلیسێکی گوت به حاجی جه‌واد بڵێ بابێته ژووره‌وه. حاجی جه‌واد هات و سه‌رۆک گوتی: حاجی ئه‌م کوڕه یه‌زدیه خۆ کارێکی نه‌کردووه وا تۆ ده‌ته‌وێت شکاتی لێبکه‌یت! حاجی جه‌واد گوتی: ئه‌م کوڕه بووه هۆی ئه‌و ئاژاوه گه‌وره‌یه، که منی تێدا ماڵوێران کرام. سه‌رۆک گوتی: لێپرسراوی چاره‌سه‌ری ئاژاوه‌که منم، له خودا به‌زیاد بێت کێشه‌یه‌کی ئه‌وتۆ ڕووی نه‌داوه، نه جێگایه‌ک ئاگری گرتووه، نه فه‌رمانگه‌یه‌کی میریی تێکدراوه، نه شووشه‌یه‌ک شکاوه، نه که‌سێک دژی ده‌وڵه‌ت قسه‌ی کردووه و نه که‌سێک جوێنیداوه. حاجی گوتی: به‌ڵام دوکانی من تالآنکراوه! سه‌رۆک گوتی: حاجی ده‌نگه ده‌نگ مه‌که، کورده‌کان ده‌ڵێن که بڕوایان به تۆ نه‌ماوه و هاتوون که‌لوپه‌له‌کانی خۆیان له دوکانه‌که‌ی تۆدا بردۆته‌وه، ئیتر تۆ به‌مه ده‌ڵێیت تالآنی؟ حاجی گوتی: ئه‌ی هاوار سوێند به ئیمامی عه‌لی ده‌چمه تاران شکات ده‌که‌م. ده‌چمه لای نوێنه‌رانی گه‌ل و له‌وێ شکات ده‌که‌م، من زۆرترین که‌س و هاوڕێم هه‌یه له تاران و ته‌وریز و مه‌هاباد، ده‌چم ئه‌وانیش تێده‌گه‌یه‌نم، ئاخر چۆن ده‌بێت به‌ڕۆژی ڕووناک ماڵ و دوکانم تالآن بکرێت، که‌چی تۆ پێم ده‌ڵێیت ئه‌وانه هاتوون ماڵ و شتومه‌کی خۆیان بردۆته‌وه. سه‌رۆک پێی گوت حاجی شکات کردن مافی هه‌موو که‌سێکه. تۆش بچۆ بۆ تاران کێت ده‌وێت لای ئه‌و شکات بکه، سوێند به ئیمامی عه‌لی به‌تاوانی نانه‌وه‌ی ئاژاوه و پشێوی کاربه‌ده‌ستانی ساواکت لێ ئاگادارده‌که‌مه‌وه، که تۆ چه‌ند ساڵ له‌مه‌وپێش به‌پێی په‌تی هاتوویته سه‌رده‌شت به‌ڵام ئێستا چۆن بوویت به‌خاوه‌ن خانوو و دوکان له شاره‌کانی تاران وته‌وریز و مه‌هاباد و سه‌رده‌شت. حاجی گوتی: کاسپیم کردووه بۆیه ده‌وڵه‌مه‌ند بووم. سه‌رۆک گوتی: دیاره کاسپیت کردووه به‌ڵام شتومه‌کت به سوپای عێراق فرۆشتووه.حاجی جه‌واد بێده‌نگ بوو، وه‌ک میزڵدانێک که ده‌رزییه‌کی پێدابکه‌یت و هه‌وای تیانه‌مێنێت. پاشان حاجی به‌شێوه‌ی پاڕانه‌وه گوتی: به‌ڕێز تکایه من ژن و ماڵم هه‌یه حه‌یا و ئابڕووم هه‌یه، خه‌ڵکی تالآنیان کردووم که‌چی تۆش پێم ده‌ڵێیت هاوکاری دوژمنت کردووه. ئه‌و پۆلیسه‌ی که زیوه‌کانی بردبوو گوتی: حاجی دوو که‌س له شاگرده‌کانت گه‌واهییان داوه، که باری (١٠٠) هێستر که‌لوپه‌لت ناردووه بۆ سوپای عێراق. بۆ سوپایه‌ک که به‌شێوه‌ی پارتیزانی دێنه خاکی وڵاتمانه‌وه و که‌سانی ئێمه ده‌کوژن، کورده‌کانیش هه‌ر له داخی ئه‌وه‌یه که دوکانه‌که‌تیان تالآن کردووه. سه‌رۆک گوتی: ئایا ده‌زانیت ئه‌گه‌ر دۆسیه‌که‌ت بده‌مه ده‌ست ساواک ئه‌وا له سێداره‌ت ده‌ده‌ن؟ حاجی جه‌واد گوتی: به‌نده‌ی خودا تۆ بۆ واز له من ناهێنیت، دیاره به‌نیازنیت وازم لێبهێنیت. سه‌رۆک گوتی: سوێند به‌خودا،

ئەگەر درێژەی بدەیتێ و کۆنترۆڵی ئەم کێشەیە لە دەست من دەربچێت، ئەو کاتە هەموو شتێکت ئاشکرا دەکەم، ئەوسا خودا دەزانێت چیت بەسەردێت. پاشان حاجی گوتی: بەڕێز من ئێستا چیبکەم؟ سەرۆک گوتی: یەکەم جار شکاتەکەت لەسەر ئەم کوڕە بکێشەوە. دووەم ئەوەیە کە وەڵامی ئەو خەڵکە بدەیتەوە. حاجی گوتی: ئەو خەڵکە تاڵانیان کردووم. سەرۆک گوتی: تۆ کە زیوی ئەو ژنەت کڕیوە خۆی بایی (٧٥٠) تومەنە کەچی تۆ (٢٨) تومەنت داوەتێ، ئەی ئەمە تالاکردن نییە؟ تۆ کە یەک جاجمی (١٠٠) تومەنی لە خەڵک وەردەگریت و دوو مەن (١٢کیلۆ) خورمای ڕەقی دەدەیتێ یاخود مەترێک چیتی یەزدی دەدەیتێ، ئەمە تاڵانیی نییە تۆ کردووتە؟! یەک مەتر چیتی یەزد نرخەکەی (١٥) ڕیاڵەی کەچی تۆ لەسەر ئەو خەڵکە هەژارە نۆ تومەنت حیساب کردووە. دە پێم بڵێ تاڵانیی چییە؟ یاخود لەبری پارەکەیان شتومەکیان بەچارەکە نرخ لێوەردەگریت، کەچی هێشتا تۆ دەڵێیت تاڵان کراوم؟ لە کاتێکدا تۆ پێشتر ئەوانت تاڵان کردووە! حاجی گوتی: ئەوە تاڵانی نییە ئەوە کاسپییە. سەرۆک گوتی: بەخودا ئەوەی تۆ کردووتە تاڵانییە. ئەوەی ئەوان بەسەریانهێناوی ئەنجامی کارە ناڕەواکانی خۆتە، حاجی گوتی: بەڵام خۆ من شتم بە سوپای عێراق نەفرۆشتووە. سەرۆک گوتی: ڕاستەوخۆ پێت نەفرۆشتوون، خۆ ئەگەر وات بکردایە دەمێک بوو دەمخستیتە زیندانەوە، بەڵام بەهۆی کەسانی ترەوە کیسەی ئارد و خواردەمەنی و شتومەکت سێ بەرامبەر بەوان فرۆشتووە، ئێمە لە نێو دوکانەکەتدا چەند جۆرێک پارەی عێراقیمان دۆزیوەتەوە، لەسەر ئەو کارەشت فایلێکت بۆ کراوەتەوە. حاجی ڕوویکردە من و گوتی: ڕۆژێک دێت ئەم تۆڵەیەت لێ بکەمەوە، ئەم کارەساتە تۆ دروستتکرد. سەرۆک گوتی: حاجی تۆ دەتەوێت چیبکەم؟ دە کاتژمێرە من خەریکی کاری تۆم، دەتەوێت لەبەرخاتری تۆ، من هەموو سەردەشت بسووتێنم؟ دەتەوێت ئەو هەموو خەڵکەی کە هاتوون بەر دەرگایان گرتووە، زیندانیان بکەم تۆ کوردستان و ناوچەکەت تووشی ئاڵۆزیی کردووە، ئەگەر پێویست بکات ئەوا تۆ دەکەمە قوربانی ئەم شارە و هەموو ناوچەکە. هەر ئێستا پەلبەستت دەکەم و ڕەوانەی مەهابادت دەکەم، هەڵسە سەرێ لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە بکە، ئەوەتا کوردەکان لە دەرەوە کۆبوونەتەوە و مەڕیان سەربڕیوە و خوانیان ڕازاندۆتەوە و چایان لێناوە. دەیانەوێت هەر لێرە نان بخۆن و شەویش لەم بەردەگاریە بخەون. هەموویان شکاتیان لە تۆ هەیە، خۆئەگەر من تۆیان بدەمەدەست ئەوا هەر لێرە پارچە پارچەت دەکەن، ئەوانە زیوەکانی خۆیان دەوێتەوە، پێمبڵێ ئەو زیوانەت چی لێکرد؟ گوتی: نازانم هەموو دوکان و ماڵەکەم وعەمبارەکەم تاڵانکران، زیوی ئەوانیش ڕۆیشت، سەرۆک گوتی: دەفتەرەکەت لای منە دەینێرم کەسێک لە مەهابادەوە بێت و

پاکتاوی حیسابەکەتان بکات، ئەگەر ئەوان قەرزدارت بوون پارەکەت بدەنێ، خۆ ئەگەر تۆش قەرزداری ئەوان بوویت، ئەوا دەبێت تەواوی پارەکەیان بۆ بگێڕیتەوە، حاجی گوتی: ئەو شتومەکانەی کە براون چی بەسەر دێت، سەرۆک گوتی: نیوەڕۆ کە هاتیت خۆت گوتت کە شکات لە هیچ کەسێک ناکەیت، تەنها لە حسێن نەبێت، ئەوەتا خۆت واژۆت کردووە. ئەم منداڵەش، کە لێرەیە خەڵکی شاری یەزدە، تەنها یەک شەربەتی لەگەڵ خۆی نەهێناوە من خۆم کەفیلی ئەوم کە تەنها یەک کڵۆ شەکری نەبردووە. ئینجا پێی گوت، فەرموو ئەم ژێر بەڵێنامەیە واژۆبکە. تا منیش لەگەڵ کوردەکان قسەبکەم و ئێرە چۆڵ بکەن، خۆ ئەگەر واژۆشی ناکەیت ئەوا من خۆم ئەم حسێنە ئازاد دەکەم و تۆش دەدەمە دەست کوردەکان! حاجی جەواد بە سەر و کەللەی خوێناوییەوە، بە جلوبەرگی دڕاوەوە هەڵساو نووسراوەکەی واژۆ کرد، سەرۆک بانگی مەقسودخانی کرد و گوتی: ئەو میوانە یەزدییەت بەرەوە و بەو خەڵکەش بڵێ لێرە بڕۆن! حاجی جەواد شکاتی لە هیچ کەسێک نییە. مەقسودخان گوتی: بەڵام ئەو خەڵکە شکاتیان لە حاجی جواد هەیە! سەرۆک گوتی: ئەوەتا حاجی جەواد بەڵێنی داوە، کە لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا لێرە سەیری دەفتەری حیسابەکەی بکرێتەوە، ئەگەرخەڵک قەرزداربوون، پارەکەی بدەنێ و ئەگەر حاجیش قەرزدار بوو ئەوا پارەکانیان بۆ بگێڕێتەوە، با ئێستا چەند پیاوێکی ڕیش سپی بێنە ژوورەوە. (١٠-١٢) پیاوی ڕیش سپی و دوو ژنی بەتەمەن هاتنە ژووەرەوە، بەڵێننامەیان لە حاجی جەواد وەرگرت کە لە ماوەی دە ڕۆژدا لەگەڵ ئەو خەڵکە پاکتاوی حیساب بکات. بنکەی پۆلیس بەڵێنیدا تا حاجی جەواد لەگەڵ خەڵک دا حیسابەکەیان یەکلا نەکاتەوە، نەهێڵین لە سەردەشت دووربکەوێتەوە. کاتی بانگی ئێوارە بوو کە کێشەکەیان کۆتایی پێهێنا من لەگەڵ مەقسودخان چوومە دەرەوە. چەند پیاوێکی کورد سەریان ماچکردم، ژنەکانیش نزای خێریان بۆ دەکردم. شەو نزیکەی (٥٠) کەس بۆ بینینی من هاتن بۆ ماڵی مەقسودخان. لە نێو ئەواندا چەند دوکاندارێکی فارس هەبوون باسی باری ئارامی خۆیان لەگەڵ کوردەکان کرد. مەلا باباش لەوێ بوو پێیگوتن ئێوە با حیسابتان ڕوون و ئاشکرابێت خەڵکیش پارێزگاری لە ئێوە دەکات. بەڵام ئەگەر ئێوەش قۆڵی خەڵکیی ببڕن ئەوا وەک حاجی جەوادتان بەسەردێت. میوانەکان تا شەودرەنگ خەریکی نوکتە و قسەی خۆش و پێکەنین بوون. بەشیر هەندێک لە قسەکانی بۆ کردمە فارسی و دەیگوت خەڵکیی زۆر ڕقیان لە حاجی جەوادە، چونکە دزو سووخۆر بوو، خەڵکیی دەمێکە لێی بێزارن، بەڵام بۆ دەرفەتێک دەگەڕان، کاتی ماڵئاوایی یەکێک لە ژنەکان چەندان پارەی زیوی پێدام، پیاوێکیش (٥) دانە (١٠) تومەنی پێدام. هەرچەند هاوارمکرد کە نامەوێت بەزۆر خستیانە گیرفانمەوە.

پیاوەکە گوتی: مـن ئەوپارەیە بەنـاوی هەمـوو خەڵکی شـارەوە دەدەمە تۆ. بڕیـار وابـوو بەیـانی زوو هەڵسین و بڕۆین بـۆ کێو، پاشـان کە گەڕامەوە زانـیم، کە حیسـابی حـاجی جەواد کۆتـایی پێهـاتووە و هەزاران تـومەن قەرزدارە. ئیتـر مـن هـیچ هەواڵـم لە حـاجی جەواد نەما تا سالّی (١٣٧٦-١٩٩٧) کە خەریکی خوێندنەوەی ڕۆژنامەی ئیتلاعـات بووم، وێنەیەکی حاجی جەوادم بینی لە ژێریدا نووسـرابوو: "ئاگاداری، پیاوی گەورە و بەڕێز حاجی جەواد (ق) کە دەیان کاری خێرخوازیی ئەنجامداوە ئەمڕۆ لە تەمەنی (٧٩) سـالّیدا کۆچی دوایی کرد. پرسەکەی لە مزگەوتی.... خودای گەورە بەبەهەشتی شاد بکات.

## هێستر سواری

بەیانی زوو هێشتا خۆر لەسەر لوتکەی کێوەکانی نەدابوو، نان و چای بەیانی ئامادەکرابوو، پیاوەکان هێسترەکانیان بارکرد و بە نۆ کەس نزیکەی (٤٥) هێستریان بارکرد، بارەکانیش بریتی بوون لە ئارد و شەکر و چا و پێویستیەکانی کرێکارانی کەتیرە. هێسترەکان بەسەر پیاوەکاندا دابەشکرابوون، بۆ هەر (١٢) هێستر، سێ پیاو سەرپەرشتی دەکردن. من و مەقسودخان دەبوو بچینە ناو خاکی عێراقەوە. مەقسودخان لێی پرسیم تۆ دەتوانیت سواری هێستر ببیت؟ گوتم: لە تەمەنمدا سواری هێستر نەبووم. گوتی: هیچ مەترسە و بە کوردی چەند قسەیەکی کرد، لە بەشیرم پرسی خان چی دەڵێت؟ بەشیر لە وەڵامدا گوتی: خان دەڵێت پەتۆیەک لەسەر پشتی هێسترێکی پیر ڕاخەن بۆئەوەی تۆ لە سەریەوە سواربیت. گوتم: بۆ هێستری پیر؟ گوتی: چونکە هێستری پیر، هێمنتر بەڕێگادا دەڕوات، هەڵناهاوێژێت و لەقە ناوەشێنێت. من بەهۆی ئەو کارەوە کە لە ماوەی دوو ڕۆژدا ئەنجامم دابوو، زۆر خۆشەویست بووم. دوو کیسە ئاردیان لە هێسترێک بارکرد و پەتۆیەکیان خستە سەر و جانتایەک و دوو کیسەم پێبوو، جانتاکەم پڕبوو لە خواردن، کە لە مەهاباد پێیاندابووم، بەڵام هێشتا جانتاکەم نەکردبوەوە. گوڵەخانیش هەندێک خواردنی بۆ پێچابوومەوە، جانتا و دوو کیسەکەم لەسەر هێسترێکی تر بوون، هەمووان ئامادەی ڕۆیشتن بوون، مەقسودخان گوتی: یائەڵڵا... و هەموویان لە جێگای خۆیان بڵند بوون. پیاوێکی کورد بنباڵی گرتم و وەک چۆلەکە بڵندی کردم و خستیمیە سەر هێسترەکە، لەناکاو مەقسودخان قسەیەکی کرد و پیاوە کوردەکە لە هێسترەکە دایگرتم بە بەشیرم گوت: ئەوە چی ڕوویداوە؟. گوتی: خان دەڵێت دەبێت جلی کوردی بۆ کاکە حسێن بهێنین، ئەو جلانەی ئەو لەبەری کردووە بەکەڵکی ئەو شاخ و کێوە نایەت. بەشیر بەبێ ئەوەی قسەیەک لەگەڵ مندا بکات و لە حەوشەکە ڕۆیشتە دەرەوە، پاش چەند خولەکێک دەستێک شەرواڵ و مرادخانی

کوردیی هێنا و هاتەوە، ڕێک پڕ بەبەری خۆم بوو، جلەکانی خۆم و (٨٠) تومەن لە پارەکانم و شەش دانە پارەی زیوم دایەدەست گوڵەخان، (٢٠) تومەن پارەم لای خۆم مایەوە. جلی کوردیم لەبەر کرد و لە ماوەی چەند خولەکێکدا بووم بەکوڕە کوردێک، بەڵام هیچ وشەیەکی کوردیم نەدەزانی، ئەمجارەیان مەقسودخان بڵندی کردم و خستمیە سەر هێسترەکە و ڕەشمەی هێسترەکەم بەدەستەوە گرت. مەقسودخانیش سوار ئەسپێک بوو، هاوارێکی لە هێسترەکان کرد و هێستری پیر وەک ئیسپرینگ هەڵدەبەزییەوە. من کە پێشتر هەرگیز سواری هێستر نەببووم، ئەوەندەی لە ڕۆیشتن بەرەو کوردستانی عێراق دەترسام، ئەوەندە لە هێسترەکە نەدەترسام. بەشیر ماڵئاوایی لێکردم و لەگەڵ ئێمەدا نەهات ئەو خەڵکانەی کە لەگەڵماندا بوون جگە لە مەقسودخان هیچیان فارسی‌یان نەدەزانی. سەردەشت شارێکی بچکۆلانەبوو، جادەی سەرەکی لە (٣٠٠-٤٠٠) مەتر زیاتر نەبوو، هەموو دوکانەکانی (٢٠-٢٥) دوکان دەبوو، دوو چایخانەشی تێدابوو. لە جادە سەرەکییەکەوە ڕۆیشتین و چووینە دامێنی کێوەکە، مەقسودخان هێسترەکەی ڕاودەنا چونکە (٢٠) خولەک لە دواوە بووین. دەبوایە بگەینەوە ئەوان، هێسترەکە پیربوو، بەڵام ئازا بوو، کیسە ئاردەکانیش بچووک بوون، چونکە دەترسام، خۆم توند بەپشتی هێسترەکەوە گرتبوو. مەقسودخان گوتی: مەترسە، خۆت ناڕەحەت مەکە هەر وا بزانە کە سواری هێستریش نەبوویت. زۆر سەیری ئەو سروشتە جوانەشم دەکرد. دەمگوت خودایە ئێرە لەگەڵ دەوروبەری یەزددا چەند جیاوازە. دەوروبەری سەردەشت هەموو سەوازیی و دارستان بوو. من درەختەکانم نەدەناسین، بەڵام وابزانم داری بەڕوو دارگوێز بوون. پاش نیو کاتژمێر، خان گوتی: ناڕەحەت نیت؟ گوتم: نەخێر.. گوتی: دەبێت بگەینەوە قافڵەکە. ئەسپەکەی چوستوچالاک و بەهێزبوو. دەیویست خێراتر بڕوات، بەڵام خان دەیوست هێواش هێواش بەپێی هێسترەکە بڕوات. چەندە کێشەیە دوو ئاژەڵ بەیەکەوە بڕۆن. بەڵام لە ڕۆیشتندا جیاوازبن. جوانووە ئەسپەکە زۆر سەرکێش بوو، بەڵام هێسترەکە پیر و کەم توانا بوو. ئەسپ ئاژەڵێکە تەنها بۆ سواری دەبێت، زۆر بەخێرایی دەڕوات و زۆر بە هێزە. بەڵام هێستر ئاژەڵێکی باربەرە و هێز و توانای زۆرە، بەڵام لە ڕۆیشتندا وەک ئەسپ خێرا نییە. هێستر کەم دەخوات و باری زیاد هەڵدەگرێت و ڕێگای درێژ دەبڕێت. ئەسپ بەبەراوورد لەگەڵ هێستردا زۆر خێراترە و زووتریش هیلاک دەبێت. پاش یەک کاتژمێر ڕێگا ڕۆیشتین گەیشتینە کاروانەکە، کە بریتی بوون لە (١٠-١٢) هێستر وسێ پیاوی کورد و من و مەقسودخان. ئەوانی دیکەش بەڕێگایەکی تردا ڕۆیشتبوون بۆلای کۆمەڵێکی تری کەتیرەکەران. مەقسودخان لەو ساڵەدا نزیکەی (٧٥٠) کرێکاری هەبوو،

که بەشێکیان هەر کاریان بۆ خودی خان دەکرد، ئەوانی تر کاریان بۆ بازرگانانی قەزوێن دەکرد. مەقسودخان نوێنەری ئەو بازرگانانانە بوو، هەڵبەت مەقسودخان کەتیرەکەی خۆیشی هەر بەو بازرگانانە دەفرۆشت، بەڵام داهاتی بەشەکەی خۆی هەر بۆخۆی بوو. پارەی پێویستی کرێکار و نانخواردن و کرێی ئیجارەی کێوەکان هەر خۆی دەیدا. ئێمە دەبوو ئاودیوی سنوور ببین و بەبەرچاوی بنکەی پاسەوانی سنووریشدا تێنەپەڕین. بێگومان پاسەوانانی سنوور هەستیان بەم سنوور بەزاندنە دەکرد. تەنها لە دووریی (٥٠٠) مەترەوە ئاودیوی سنوور بووین. بەتەواوی هەتاو کەوتبوو کە چووینە ناوخاکی کوردستانی عێراقەوە، دەبوو لە ئاوەڕێژەوە بەرەو کێوەکان بڕۆین. وردە وردە ئەو بڕە گوێنییانەی کە کەتیرە لێدەگیرا دەردەکەوت، نزیکەی (٣-٤) کاتژمێر بەڕێگاوە بووین، کەمەرم کەمێک ئازاری هەبوو، بەڵام فێری هێستر سواریی بووم، دەمتوانی هێسترەکە بەهەوسارەکەی هێواش بکەمەوە. گەیشتینە سەرکانییەکە، خان قسەیەکی کرد و هەموویان ڕاوەستان. خان ڕوویکردە من و گوتی: هێسترەکان ماندوو بوون کەمێک پشوو دەدەین و پاشان دەڕۆین. گوتم: ئێستا من چۆن لەم هێسترە دابەزم. یەکێک لە کوردەکان لەسەر هێسترەکە بڵندی کردم و لەسەر زەوی دابنام. ئای چەند خۆشبوو لەسەر کانییەک، نەسیمی بەیانی، کوێستان، بۆنی سەوزە گیا، کردنەوەی ئاگرێک بۆ سازکردنی چا، بەڵێ ئەمانە هەمووی لەزەت و خۆشی بوون، چێژ لەوەی کە مرۆڤ هەست بکات لە دووریی ماڵ و کەسی خۆت و لە نێو کەسانی نەناسراودا ڕێزێکی زۆرت لێ بگیرێت. لەلایەکی تریشەوە خۆشیم لەوە دەبینی کە پاش چەند کاتژمێرێک هێستر سواریی، چەند هەنگاوێک بەپێ ڕۆیشتین. هەڵبەت ئەوە یەکەم جار بوو لە تەمەنمدا سواری هێستر ببم، سواربوونی هێستریشم بەئازایەتییەکی گەورە دەزانی. کەتیرەکەرانی داماو دەبوو ئەم هەموو ڕێگایە بەپێ ببڕن. یاخود ئەم کرێکارە داماوانە کە ماوەی چوار کاتژمێر بەپێ بەدوای هێسترەکانەوە بوون. بەڵام مەقسودخان نەیگوت ئەو کرێکارانە ماندوو بوون، بەڵکو گوتی: هێسترەکان ماندوو بوون. بەڕاستی لە ڕوانگەی ئابوورییەوە مرۆڤی بێ پارە لە هێستر کەمترە، باشە ئەگەر ڕووداوەکەی حاجی جەواد (ق) نەبووایە، منیان سواری هێستر دەکرد؟ یاخود دەبوو بەپێ بەدوای هێسترەکاندا ڕامبکردایە؟! یا دەبوو هێسترێکم بەکرێ بگرتایە، بەکام پارە؟ خودا گەورە و بەبەزەییە. ئەوەتا لە یەزدەوە تا ناو کوردستانی عێراق، یەک ڕیاڵم خەرج نەکردووە. (٥٠) تومەن و شەش دانە دراوی زیویشم دەستکەوتووە. ئەو هەموو خواردەمەنییەشم پێیە، خۆ ئەگەر بەم شێوەیە بڕوات ئەوا دەتوانم گەشت بۆ ئەمریکاش بکەم. زۆر خۆشحاڵبووم بە بەلاش گەیشتومەتە سەردەشت. لە تەمەنی (١٥)ساڵیدا دەمویست

کەیف بکەم. خۆشیی لە هێسترسواریی، چێژی بەپێ ڕۆیشتنی دوای هێسترسواریی، خۆشیی لەوەی کە من توانیومە تاک و تەنیا بیمە لای ئەو کوردە خۆشەویستانەی کە یەکەم پیاڵە چا تێدەکەن دەیدەنە من و پاشان چا بۆ خۆیان تێدەکەن. لەبارەی منەوە قسەدەکەن، بەڵام من تەنها لە وشەکانی حسێن و یەزد تێدەگەم. خۆشیی لەوەی کەمن مرۆڤێکی گرنگم، خۆشحاڵم لەوەی کە میوانم و هیچ پارەیەک خەرج ناکەم، خۆشحاڵم لەوەی، کە دوو کیسە نانم پێیە بۆ کرێکارانی کەتیرەکەر، خوشحاڵم بەوە کە جلی کوردیم بە بەلاش دەستکەوتوە و لەبەرم کردووە. خۆشحاڵم بەبینینی چاوە جوانەکانی کچێکی شنۆیی. خۆشیی لە بەرنامە دانانی ڕۆیشتن لە سەردەشتەوە بۆ شنۆ، ئەوەندە خۆشحاڵبووم کە بە هیچ جۆرێک بیرم لە ترس نەدەکردەوە لە چوونە ناو خاکی عێراق، بەڕێگای نایاسایی. نەترسان لە ئاژەڵە دڕەندە و کێوییەکان، تەنها ئەگەر شتێکم دەزانی زیاتر خۆشحاڵ دەبووم کە (١٥-١٦) ساڵ دواتر چەند کەسێک بۆ تێپەڕبوون لە هەمان مەرزەوە بە ڕێگای قاچاخدا دەبێت چەند ملیۆن تومەن بدەن بە هەمان کاروانچیانی کورد. تێپەڕیوونی نایاسایی خۆی لەخۆیدا خۆشحاڵییە، بەڵام تێپەڕبوونی نایاسایی بەبێ پارە و پێدانی هێستری خۆرایی و چای خۆڕایی و نانخواردنی بەیانی بەخۆڕایی و ڕێزلێگرتنێکی زۆر زیاتر خۆشحاڵت دەکات. خۆ پیاوان دەزانن، ژنانیش ئەگەر نازانن با باش بزانن پیاو کاتێک کە گەنجە تەنها بەکچێکی چاوڕەش تەسکینی نایەت. منێک لەم ئاو و هەوا پاکەی کێوەکانی کوردستان و لەسەر کانییەک کە وەک کانی بەهەشت وایە، لەم کەشە سەوز و بۆندارەدا بەدەنگی خۆشی باڵندەکان کەوتبوومە بەهەشتێکەوە. بەهەشتێک کە تەنها لە حۆرییەکانی کەم بوو، وەکو هەموو پیاوانی دنیا و بەتایبەتی لاوانی (١٥) ساڵە کە بەیەک چاو ڕەش تەسکینی نایەت، منیش تەنها بەو چاوە ڕەشە شنۆییە تەسکنیم نەهات، سەرەتا ئەو کچە چاو ڕەشە شنۆییە هاتە بەرچاوم. پاشان ئەو کچە چارشێوە سپییەی کە کاتی خۆی لە شاری یەزد بینیبووم، کە ویستم عاشقی ببم. دواتریش ئەو کچەی خزمی خۆم، باشە ئەگەر گەنجێک بیرلە سێ کچ بکاتەوە تاوانی کردووە. تۆ سەیرکە ئایەتوڵڵا شەهید دەستە غەیب ڕەحمەتی خودای لێبێت، کە یەکێک بوو لە زانا گەورەکانی ئیسلام کە هیچ گومانێک نییە لە زانایی و ڕاستگۆیی ئەم بەڕێزە، ئەوەتا بزانە لە کتێبە بەناوبانگەکەی دا بەناوی (زیندووبوونەوە) چی دەڵێت. لە بەهەشتدا کۆشکێکت دەدەنی کە لە یاقووت دروستکراوە، لەو کۆشکەدا (٧٠) خانوو هەیە کە لە یاقووتی سوور دروستکراوە و لە هەر خانوویەکدا (٧٠) ژوور هەیە، کە لە زمڕوودی سەوز دروستکراوە. لە هەر ژوورێکیشدا (٧٠) قەرەوێڵە هەیە و لەسەر هەر قەرەوێڵەیەک (٧٠) فەرشی ڕەنگاوڕەنگ هەیە، لەسەر هەر فەرشێک حۆرییەکی جوان

هەیە. خـودای گەورە توانـا و ئـارەوزویەکی وات دەداتـێ کە لە هەر هەموویـان چێـژ وەربگریـت. هەر لە هەمـان کتێبـدا ئـایەتوڵڵا دەسـتە غەیـب دەفەرمووێـت: "هەمـوو حۆرییەکان هاوتەمەنن و لە تەمەنی (١٦) ساڵیدان". بەم قسـەیە بێت واتە خودای گەورە لەو دنیا (٢٤) ملیۆن حۆرییت دەداتێ. ئەگەر خودای گەورە لەو دنیا (٢٤) ملیۆن حۆریی (١٦) ساڵ بداتە کەسانی خوداپەرست، ئەوا ئەگەر ئێمە لەم دنیایەدا حەزمان لە (٣) کچی جوانی چـاو ڕەش بێت، ئەوا پێمـان دەڵـێن زیادەڕەویـت کـردووە. کاتێک مەقسـودخان گـوتی: بەڕێـدەکەوین. هەمـووان بەخێرایـی هەڵسـانە سـەرپێ. یەکێـک لە کوردەکـان سـەبیلەکەی پـاککردەوە و خسـتیە نـاو کیسـە تـووتنەکەیەوە و کیسەکەشـی بە بەرپشـتێنەکەیدا کـرد و بەپێکەنیـنەوە سـەیرێکی کـردم کە لە بەردەم هێسـترەکەدا وەسـتابووم. بەبێئەوەی کە قسـەیەکم لەگەڵـد بکـات، وەک چۆلەکە بەرزی کـردەمەوە و خسـتمیە سـەر هێسـترەکە. دەنگیـان لە هێسـترەکان کـرد و کەوتـنەڕێ، مەقسـودخانیش خۆی هەڵدایە سەر ئەسپەکەی و ملمان لە کێوەکان ناو هەر چەند سەیرمکرد بڕە گوێنی و درەختەکان زیاتر دەبوون. یەک کاتژمێرمـان بڕی کە لەناکـاودا دوو منداڵی (١٠-١١) ساڵەم بینی لە ژێر بڕە گوێنییەک دەرپەڕین و هـاتنە بەردەمی هێسترەکان و سـڵاویان لێکردین، منداڵەکان خەڵکی بەهاباد بوون و کاریـان بۆ دانشـی دەکرد، مەقسـودخان و کوردەکانیـان دەناسـی، منـداڵەکان منیشـیان ناسـیەوە و گوتیـان ئەوە کـاکە حسـێنە، مەقسـودخان و کوردەکـان وەڵامـی سـڵاوەکانیان دانەوە و بەردەوام بـوون لە ڕۆیشـتن، منداڵەکان بەپێی پەتی بەنێو ئەو هەموو دار و بەرد و دڕکەدا بەدوای ئێمەدا ڕایادەکرد. هەریەکەیان کراسێک و دەرپێیەکی دڕاویان لەبەردابوو، یەک توربەشیان لەملدا بوو بۆ کـۆکردنەوەی کەتیـرە، بەبینینـی ئـێمە خۆشـحاڵ بـوون. پاشـان چـادرێکی لە مـوو دروستکراو دەرکەوت من وامزانی چادری مەڕدارەکانە. چونکە لە سەردەشتەوە تا ئێرە چەندین جار چادری عەشیرەتە کوردەکانم بینی بوو. مەقسودخان لەبەردەم خیمەکەدا لە ئەسپەکەی دابەزی و گوتی: گەیشتین .

## هەژاریی و کێو و کەتیرە

دانشی و کەسێکی تر لە خێمەکە هاتنە دەرەوە، سڵاو و هەواڵپرسی یان لەگەڵ مەقسودخان دەستپێکرد، دانشی کاتێک منی بینی، گوتی: کاکە حسێن بەخێرهاتی، هەرگیز بیرم لەوە نەکردبوەوە کە بتوانیت بێیت بۆ ئێرە! چۆن لە یەزدەوە گەیشتیتە ئێرە؟ بەرەوپیرم ڕایکرد تاکو لەسەر هێسترەکە دامبگرێت، بەڵام مەقسودخان بۆخۆی بنباڵی گرتم و لەسەر هێسترکە بڵندی کردم و لەسەر زەوی داینام. دانشی لەم کارەی مەقسودخان سەری سوڕما.. لە دەموچاویدا سەرسومانی پێوە دیار بوو، کە چۆن من لە یەزدەوە خۆم گەیاندۆتە کێوەکانی کوردستانی عێراق، خۆ دیارە لە قەزوێن پێمگوتبوو، کە دێمە لاتان بەڵام دیارە مەودایەک لە نێوان قسەکردن و بە ئەنجامگەیاندندا هەیە. لەوەش سەری سوڕما کە من چۆن توانیومە سواری هێستر ببم. لەوەش زیاتر سەری سوڕما کە چۆن، مەقسودخان بۆخۆی لەسەر هێسترەکە بڵندی کردم و دایگرتمە سەر زەوی. ئیتر چوومە نێو خێمەکەوە، خێمەیەکی زۆر گەورە بوو، لە دەوروبەری خێمەکە هەندێک هەڵژگ و دڕکوداڵ دانرابوون، هەندێک گیا و گەڵاشیان بەسەر خێمەکەدا دابوو، تەورێک و یەک دوو قوڵکەی گەورەی ئاگرکردنەوە لەبەردەم خێمەکەدا دروستکرابوون، لە ناوەڕاستی خێمەکەشدا قوڵکەیەکی بچووک هەبوو. دانشی هەندێک دار و چیلکە و بڕە گوێنی خستە ناو قوڵکەی ئاگردانەکەوە، ئێمە هەموو بەدەوریدا دانیشتین. بەخێرایی ئاگری تێبەردا و کتری خستە سەر بۆ چالێنان. چەند کوندە ئاوێک و چەند کیسە ئارد و نزیکەی (٤٠-٥٠) فەردە کەتیرە لە نێو خێمەکەدا هەبوون. مەقسودخان لە دانشی پرسی بەرهەمی کەتیرە چۆنە؟ دانشی گوتی: ئەمساڵ زۆر باشە و بەرهەمێکی زۆر هەیە، مەقسودخان گوتی: ئەوە هۆی ئەوەیە کە ئەم زستانە بەفر زۆر باریوە و بڕە گوێنییەکان زۆر بەهێز و جوانن، پاشان لێی پرسی ئایا هیچ کێشەیەکتان هەیە؟ دانشی گوتی: ئەی چۆن، ئەوە چەند شەوێکە دوو سێ ورچ دێن

بۆ نزیکی خێمەکەمان، منداڵەکان دەترسن بۆیە پێویستە پێکەوە بیرێک لەم کێشەیە بکەینەوە. خان گوتی: با منداڵەکان ئاگاداری خۆیانبن و نەترسن، بەڵام شەوانە لە دەوروبەری خێمەکە لە چەند جێیەک ئاگر بکەنەوە. ئەگەر لێتان نزیک بوونەوە ئەوا برسیانە و چەند نانێک لەسەر ڕێگایان دابنێن. ئەوکات نانەکە دەخۆن و دەڕۆن، بەڵام ورياشبن با ئەو منداڵانە بەتەنها نەچن بۆ کارکردن، دوو، دوو و سێ، سێ بڕۆن. بۆخۆیشم چەکدارەکانی مەلا مستەفا دەبینم و پێیاندەڵێم ئەگەر لە دەوروبەری ئێوە ورچیان بینی تەقەی لێبکەن. دانشی گوتی: خودا خێرت بنووسێت، لەوساوە ورچ پەیدابووە، ڕۆژانە سێ چوار فەردە کەتیرە کەمتر کۆدەکەینەوە، چونکە منداڵان دەترسن و ئەم ترسەش بووەتە هۆی ئەوەی کەمتر کاربکەن. نزیکی نیوەڕۆ بوو، کە چا ئامادەکرا، کرێکارەکان کیسە ئارد و شەکر و چاکانیان لە هێسترەکان داگرتبوو. بڕیار وابوو نانی نیوەڕۆ بخۆن، پاشان فەردە کەتیرەکان قەپان بکەن و لە هێسترەکانیان باربکەن و بڕۆنەوە بەرەو سەردەشت. دانشی بانگی کرد هۆ منداڵینە قەپانەکە بهێنن. پاشان ڕوویکردە من و گوتی: کاکە حسێن چۆن بوو کە هاتی؟! گەشتێکی خۆش بوو؟ مەقسودخان گوتی: ئەم کاکە حسێنە شەڕی نایەوە و دواتر ڕووداوەکەی سەردەشتی بۆ دانشی گێڕایەوە. دانشی دەهریی ببوو گوتی: دوکان و عەمباری حاجی جەواد تاڵان کراوە؟! ئەی کەتیرەکەی خۆمان چی لێهاتووە؟ مەقسودخان گوتی: بۆچی تۆش لەوێ کەتیرەت هەیە؟ دانشی گوتی: کەتیرەکەی من لای تۆ بوو. مەقسودخان گوتی: ئەی من ئێستا پێمنەگوتی کە من شەوی پێشتر هەموو کەتیرەکەم بردۆتەوە بۆماڵی خۆمان. کەتیرەی خەڵکانی تریش کە تاڵان کراون دەبێت حاجی جەواد بۆیان ببژێرێت. خۆ هەر لە سەردەشتدا چەند دوکان و خانووی هەیە. دەبێت بیانفرۆشێت و پارەی خەڵکی بەتەواوی بداتەوە. دانشی گوتی: ئەم حاجی جەواد (ق) کە ئێستا پێی دەڵێن حاجی جەواد، چەند ساڵێک لەمەوبەر لە قەزوێن شاگردی حاجی ڕەزا بوو، کاتێک بەرهەمی کەتیرە برەوی پەیدا کرد، حاجی هات بۆ سەردەشت و سەرەتا لەسەر شەقام و کۆڵانەکان بەقاڵێکی دەستگێڕ بوو، هەندێک کەتیرەی بەقەرز دەکڕی و کەلوپەلی دەفرۆشت و لەبری پارە کەتیرەی لێوەردەگرتن، بەڵام ئێستا بووەتە سوڵتانی کەتیرە. بازرگانەکانی قەزوێن لەچاو ئەودا هیچ نین و بووەتە خاوەنی موڵکێکی زۆر، هەموو شتێک دەکڕێت و دەفرۆشێت، هەر لە شیری مریشکەوە هەتا گیانی مرۆڤ و ئێمەش لە نێوان ئەم برە گوێنیانەدا و بەسەرما و گەرما و برسێتی و ترسی ورچ و گورگ و بە هەزار بەدبەختی وەکو گوێدرێژ ڕەنجدەدەین و لەدوای کارکردن تا پارووێک نانمان

دەستکەوێت و بەمەمرەو مەژی بیگوزەرێنین. بەڵام ئەم لاشەخۆرانە لە نێو شارەکاندا، لە نێو دوکانێکی گەورەدا دادەنیشن و خوێنی ئێمە دەمژن.

قەپانیان هێنا و مەقسودخان و دانشی، فەردە کەتیرەکانیان قەپانکردن و منیش لە دوو دەفتەردا بۆم دەنووسین، زیاتر لە (٤٠) فەردە کەتیرە بوو، مەقسودخان گوتی: ئەمڕۆ هەر چەندێکمان بۆچوو لەگەڵ خۆماندا دەیبەین، ئەوەی مایەوە سبەینێ ولاخدار دەنێرم تا بیهێنن بۆ سەردەشت. خان قسەیەکی بۆ یەکێک لەو کەسانەی کە لەگەڵماندا هاتبوو، کرد کە من لێی تێنەگەیشتم، ئەویش بەخێرایی هەڵسا و خۆی فڕێدایە سەرئەسپەکە و بەغاردان ڕۆیشت، پاش (٢٠) خولەک گەڕایەوە دیار بوو کە خان هەواڵی بۆ براکەی ناردبوو کە بۆ نیوەڕۆ خواردنمان بۆ بنێرێت. خوان ڕاخرا و نان و پەنیر و قەیماغ دانرا، دانشی گوتی: مەقسودخان لە هەر شوێنێک بێت خواردن پەیدا دەکات. خان گوتی: خێمەی براکەم لێرەوە زۆر دوور نییە هەر زوو هەواڵم بۆناردبوو کە خواردنمان بۆ ئامادە بکات. پاش نانخواردنی نیوەڕۆ، نیوەی فەردە کەتیرەکەیان بارکردن و لەسەر ڕۆیشتن بوون، مەقسودخان پێی گوتم: هەرکاتێک ویستت بگەڕێیتەوە بەتەنیا نەیەیت بەرەو سەردەشت، بەڵکو هەموو هەفتەیەک ولاخدارەکانی ئێمە دێن بۆ ئێرە و تۆش لەگەڵ ئەواندا وەرەوە. دانشی بە مەقسودخانی گوت: کاکە حسێن میوانی بەڕێزی ئێمەیە، تۆ هیچ خەمت نەبێت. هەرکاتێک ویستی بگەڕێتەوە، خۆم کارئاسانی بۆ دەکەم. لە دانشیم پرسی ئەوە منداڵەکان لە کوێن؟ گوتی: ئەوان لەسەر کارن بەیانیان زوو دەڕۆن و شەوان دەگەڕێنەوە. هەندێکیان لێرەوە دوورترن کەپریان دروستکردووە و شەوانە لەوێ دەخەون و نایەنەوە ئێرە. هەر لەوێش نان دروستدەکەن، پاشان گوتی: هەڵسە با بڕۆین سەردانێکیان بکەین، دانشی کرێکارەکانی کردبوو بە سێ دەستەوە، هەر دەستە و لە شوێنێک کاریان دەکرد. دانشی داردەستەکەی هەڵگرت و بە عەبدوڵڵای گوت: ئێمە دەڕۆین ئاگاداری خێمە و کەتیرەکان بە، یەک کیسە کەتیرە بفەوتێت خۆم دەزانم چیت لێدەکەم. من جانتایەک و دوو کیسەم پێبوو، هێشتا ئەو کیسەیەی لە مەهاباد، ماڵی کاک عوسمان پێیان دابووم نەمکردبووەوە. ئەو کیسەیەشم پێبوو کە گوڵەخان لە سەردەشت خواردنی بۆتێکردبووم. ئەوانەم هەموو لە گۆشەیەکی خێمەکەدا دانا و لەگەڵ دانشی کەوتینەڕێ. هەر سەد مەترێک لە خێمەکە دوورکەوتبووینەوە یەکێک لە ژێر بڕە گوێنییەکدا سڵاوی لێکردین، کە سەیرمکرد منداڵێکی (١٠-١٢) ساڵان بوو، دەموچاوی ڕەش هەڵگەڕا بوو هەتاو سووتاندبووی، توبەرەیەکی لە ملدا بوو خەریکی کۆکردنەوەی کەتیرە بوو لە

بنەگوێنییەکە. دانشی گوتی: دەستت خۆشبێت جوان کۆی بکەرەوە هیچی پێوە جێمەهێڵە.

مانگی مورداد (ئاب) بوو، دوا نیوەڕۆ بوو، هەوا زۆر گەرم بوو، زۆرم تینوو بوو، بەڵام ئاویش نەبوو. لەناکاو لە بن برە گوێنییەکی تردا دوو منداڵی تر هاتنە دەرەوە، من زۆر ترسام، سڵاویان کرد و ئێمەش سڵاومان لێکردن و گوتیان زۆرمان تینووە. دانشی گوتی: وردە وردە بە کەتیرەکردن بڕۆنە خوارەوە لەوێ لە شیوەکەدا ئاو هەیە و ئاو بخۆنەوە. دەی دەستتان خۆشبێت، کەتیرەی باش کۆبکەنەوە. منداڵەکان منیان ناسییەوە. یەکێکیان گوتی: ئەوە کاکە حسێنە! دانشی: گوتی: بەڵی خۆیەتی. ماوەیەکی تر ڕۆیشتین و گەیشتینە چەند کەپرێک، دانشی هاواریکرد: هۆ ڕەسوڵ لە کوێی؟ یەکێک لە ژێر بەردێکەوە هاتە دەرەوە و سڵاوی لێکردین و گوتی: من لێرەم. لە ژێر بەردەکەدا ئەشکەوتێک هەبوو، نزیکەی سێ مەتر دەبوو، دەرکی ئەشکەوتەکە بە بەرد هەڵچنرابوو. بە ئەشکەوتەکەیان دەگوت: کونە کۆتر. چەند کیسە کەتیرەیەکی لێبوو، ڕەسوڵ یەکێک بوو لەسەر دەستەکان، کە پێشیان دەگوتن ئابا. هەر ئابایەک (١٢-١٥) کرێکاری لە ژێر دەستدا بوو، ئاباکان بەگشتی کەسانی بەتەمەن بوون، ئاباکان هەم چاودێری کرێکارەکانیان دەکرد و هەم ئاگاداری کەتیرە کۆکراوەکانیشیان دەکرد. کەتیرەکەشیان نمرە بەند دەکرد. نمرەکردن واتە جیاکردنەوەی جۆری کەتیرەکە لەڕووی جۆر و باشییەوە. دانشی نزیکەی (١٢٠) کرێکار و نۆ سەردەستەی هەبوو، کە هەموویانی لە کێوەکان بڵاوە پێکرد بوو، هەندێکیان دووریان لە خێمەکەی دانشییەوە، دوو فرسەخ ڕێگا دەبوو، ئەمانە نەیاندەتوانی شەوانە هەموویان پێکەوە لە جێیەک کۆببنەوە، شەوانەش هەر دەستەیەک لە ژێر کەپری خۆیاندا کۆدەبوونەوە. ڕەسول خەریکی ژمارە بەندەی کەتیرەکان بوو، کەتیرەی نمرە یەک کە ڕەنگەکەی سپی بوو، پێیان دەگوت جەباری، نمرە دوو ڕەنگی قاوەیی بوو، پێیان دەگوت: گەندە. نمرە سێ ڕەنگەکەی بۆر بوو، پێیان دەگوت: شەفیرە. کرێکارەکان کاتێک کە کەتیرەکەیان کۆدەکردەوە، هەموو جۆرێکیان بە تێکەڵی کۆدەکردەوە، دەیانکردە توبەرەکەی ملیانەوە، ئەمان کەتیرەکانیان دەدایە سەردەستەکان. ئەویش توبەرەکانی بەتاڵدەکردەوە و کەتیرەکەی لەیەکتر جیادەکردەوە. هەر جۆرە و دەیکردە فەردەیەکەوە. باش و خراپ و مامناوەندی لە یەکتری جیا دەکردەوە. ڕەسوڵ منی ناسییەوە و گوتی: خۆ ئەوە کاکە حسێنی گەراجە، ئەوە چۆنە هاتوویت بۆ ئێرە؟. لەناکاو گرمەیەکی بە هێز هات، من کەمێک ترسام، دانشی گوتی: مەترسە، ئەوە دەنگی تۆپی سوپای عێراقە، جار جارێک گوندی کوردەکان تۆپباران دەکات. تۆپەکان تەنها لە گوندەکان دەدرێن، هیچ کات لە کێوەکان نادرێن. هیچ

ترسێک لەسەر ئێمە نییە. ڕەسول هەواڵپرسی لە من کرد. منیش، کە کوندەیەک لەوێ بوو، جامێک ئاوم خواردەوە. لەو ژوورەدا کە نیوە ئەشکەوتێک بوو، ناسرا بوو بە کونە کۆتر، جگە لە چەند کیسە کەتیرەیەک و پارچە بەڕەیەک کە لەسەر زەوی ڕاخرابوو، لەگەڵ پەتۆیەکی کۆنی خراپ هیچی تری لێنەبوو. ئەمە سەرجەم پێویستییەکانی نزیکەی (١٥) کرێکاری کەتیرەکەر بوو. دانشی و ڕەسوڵ لەبارەی کارەکانیانەوە خەریکی قسەکردن بوون، من لە ئەشکەوتەکە هاتمەدەرەوە، سێ کەپر لە نزیک ئەشکەوتەکە دروستکرا بوون، بەڵام کەسیان تیا نەبوو، جگە لە چەند پارچە گونییە دڕاوێک کە بۆ ڕاخستن وبەخۆدادانی شەوانە بەکاریان دەهێنا هیچ شتێکی تری لێ نەبوو. خۆر لەسەر کەل بوو بەرەو ئاوابوون دەچوو، گرمەی تۆپێکی تر هات و ڕاچڵەکیم. باشە بۆچی سوپای عێراق گوندی کوردەکان تۆپباران دەکات!. دانشی هاواری لێکردم، گوتی: کاکە حسێن با بگەڕێینەوە.

منداڵانیش وردە وردە لە کەتیرەکردن بەرەو خێمەکە دەگەڕانەوە، دەنگی گرمە و ناڵەی تۆپەکان بەم کێوە سەرسەوزانە و بە بۆنی خۆشی گیاکان و بە باڵندە جوانەکان، هیچ هۆیەکی نەبوو. لە ڕێگای گەڕانەوەماندا بۆ خێمەکە، چەند کەسێکم لە پیاوانی کەتیرەکەر بینی، کە دەگەڕانەوە بۆ کەپرەکانی خۆیان، سڵاویان کرد و دانشی وەڵامی دەدانەوە لێی دەپرسین کە کەتیرە باشە یان نا، ئەوانیش دەیانگوت بەڕێز بڕە گوێنییەکان کەتیرەیان زۆرە، بەڵام کەتیرەی بەشی عێراق باشترە تا کەتیرەی بەشی ئێران. ئەوان هەموویان منیان بەناوی حسێنی گەراجەوە دەناسی. منداڵێکی تەمەن (١٤-١٥) ساڵ بەپێی پەتی بەدواماندا ڕایدەکرد و دەیگوت ئەرباب بووەستن، هەنگوینی شاخم بۆ هێناون. کە سەیرمکرد محسنۆیە یەک کاسەی گەورە هەنگوینی هێنا بوو، کە گەیشتە لامان ئیتر منی ناسیەوە و گوتی: ئەها تۆ... کە... تۆ ئەوەی گەراج بووی. دانشی گوتی: بەڵێ بەڵێ خۆیەتی کاک حسێنە. دانشی لێی پرسی ئەو هەنگوینەت لە کوێ هێناوە؟ خۆ لە هەنگەڵانی کوردەکانت نەدزیوە؟ گوتی: بەخودا گەورەم من دزیی ناکەم و هەنگوینی ماڵە کوردەکان نییە. بەڵکو لەلای شاخەکەوە پوورە هەنگێک هەیە، لە شوێنێکی سەخت و ترسناکیشدایە، شوێنپێی چەند ورچێکیشی لێیە، من و محەمەد لەوێ هەنگوینمان خوارد و ئەو قاپەشمان بۆ تۆ هێناوە. دانشی هەنگوینەکەی لێوەرگرت و پێیگوت ئاگاداربن لە هەنگەڵانی کەس نزیک نەبنەوە. ئەویش گوتی: بەسەرچاو گەورەم، هیچ خەمت نەبێت. ئێمە بەرەو خێمەکە بەڕێکەوتین و محسنۆ و چەند کەسێکی تر بەرەو کەپرەکەی خۆیان ڕۆیشتن. خۆرئاوا بوو دنیا بولێڵ ببوو، کە گەیشتینە خێمەکە. نزیکەی (٤٠) کەس لە کەپرەکانیاندا لە دەوروبەری خێمەکەی دانشی دەژیان. ئەوانەی

که له خێمەکەدا دەژیـان ورده ورده بەهـۆی تـاریکی شـەوەوه گەڕانەوه بـۆ خـێمەکه و هەرکەسـێک تـوبەرەکەی له ملـی دەکـردەوه و کەتیرکانیـان بەتـاڵ دەکـرد جگه لەوەش هەرکەسـه و هەندێک پـارچه داری لەگەڵ خـۆی هێنـابوەوه بـۆ ژێـر خێمەکه بـۆ ئـاگری شەو و ئامـادەکردنی نـان و چالێنـان. ئاگریـان له ئـاگردانەکەدا کـردەوه و کتریـان خستە سـەر. دوو کەس له سەرپەرشـتیارەکان خەریکبـوون هەویریـان دەشـێلا، تـا نـان دروستبکەن، منداڵانیش هیلاک و مانـدوو لەسـەر زەویەکەی لێـی ڕاکشـان و چاوەڕوانی نـانی وشـکیان دەکـرد ئامـاده بکرێـت و بیخـۆن. منـیش لەسـەر بەردێـک دانیشـتبووم و سەیری ئەو خەڵکه برسـی و مانـدووەم دەکـرد. ئەمـانه له هەمـوو شـتێک بێبەش بـوون، تەنانەت ئاودەستیشیان نەبوو، هەر کەسه له نێـو شـاخەکانەدا لەپاڵ بـرە گوێنێیەک یـان بەردێکدا خۆی خاڵی دەکردەوه. هـیچ کەس له بیـری دروسـتکردنی ئاودەسـت دا نەبـوو، ورده ورده (١٠-١٢) منـــداڵ هـــاتنه لامەوه. ئەو منـــداڵانەش که له قەزوێـــن بەیەکەوه دۆنـدرمەمان دەخـوارد، ئەوانـیش هـاتن. لەناکـاو بیـرمکەوتەوه که مـن له کیسـەیەکدا خـواردنم پێـیه. چـوومه نـاو خـێمەکەوه، ئەو کیسـه خـواردنەم هێنـا، که خێزانـی کـاک عوسمان له مەهاباد پێی دابووم. له جانتاکەشمدا برێک نـان و بسکیت مـابوەوه، هـاتمه بەردەم خێمەکه و بانگی منداڵانم کرد، کیسەکەم کردەوه و گوتم: وەرن خـواردن بخـۆن. منداڵان لێم کۆبوونەوه و خواردنەکەم به سـەریاندا دابەشکرد، هەر زوو کیسـەکه بەتـاڵ بوو، هەر کەسه و شتێکی هەڵگرت، کێکی کۆنه و وشکەوەبووی چەند ڕۆژەیـان وەکو پـاقلاوەی گەرم و تەڕوتـازه دەخـوارد. پێمسـەیر بـوو که مـرۆڤ چـۆن دەبێـت ئەوەنـده برسـیی بێت؟ دانشـی چـاوی له قەرەباڵغی بەردەم خێمەکه بـوو، هـاواری کـرد منداڵینه ئەوه چییه؟ یەکێک لەسەر دەستەکان که پیاوێکی (٤٠) سـاڵ بوو خۆیشی پارچه کێکێکی ڕەقـی پێـنج ڕۆژ لەوەو پێشـی دەخـوارد، گـوتی: حسـێن خـواردنی داوه به منـداڵەکان. دانشی له خێمەکه هـاته دەرەوه بەتاسـەوه سـەیری منداڵەکانی دەکرد، ڕووناکیی مـانگه شەو و ڕووناکیی ئاگری تەنوور و ئاگردانەکه له دەموچاوی دابوو. سـەیرکردنەکەی به جۆرێک بوو وەک ئەوەی بڵێی ئەگەر خواردنت پێیه بەشی منیش بده. هەمـوو له دەوری خێمەکه کۆببوونەوه. بەڵام خـواردنی نـاو کیسـەکه تەواو ببوو. یەک دوو منداڵ کەمێک خواردنیـان له ژێـر جلکەکانیانـدا شـاردبوەوه. چـوومه نـاو خـێمەکەوه تـا کیسـەی خـواردنەکەی تـر بهێنم، ئەو کیسـەیەی که بەیـانی گوڵەخـانم پێیدابووم. یەکێک لەسـەر دەستەکان گوتی: کاکه حسێن با نەبێته شەڕ، ئەگەر خواردنی ترت پێیه بیدەره دانشی با ئەو دابەشـی بکـات. منـیش کسـیەکەم لەسـەر زەوی دانـا، کـاک غـوڵامی سەردەسـته بەدانشی گوت کاکه حسێن خواردنی تری پێیه، تۆ وەره دابەشی بکه. نەمدەزانی چی له

نێو کیسەکەدا هەیە، کیسەکەم کردەوە سەیرم کرد یەک تونگە لە نێو کیسەکەدا بوو، کە پڕبوو لە قاورمەی گۆشت. نزیکەی پێنج کیلۆ دەبوو. هەموویان بە زوویی زانییان، کە حسێن گۆشتی هێناوە و هەموو ڕایانکردە ناو خێمەکەوە. گەورە و بچووک هەموو داوای قاورمەیان دەکرد. دانشی گوتی: مەیکەنە هۆسە، جارێ هەمووتان لە خێمەکە بڕۆنە دەرەوە، کاک غولام تۆش مەنجەڵەکە بخەرە سەرئاگرەکە و هەمووتان قاپەکانتان ئامادە بکەن، ئەمشەو نان و ئاوی گۆشت و قاورمە دەخۆین.

کاتژمێر نزیکەی نۆی شەو بوو، دانشی نیوەی قاورمەکەی کردە ناو مەنجەڵەکەوە و مەنجەڵەکەی خستە سەر ئاگردانەکە، دوو کەوچک ڕۆنیشی تێکرد و دوو کوندە ئاویشی تێکرد. هەویرەکەشیان هێنابووە نزیک تەنوورەکە دوو کەس گونکیان دەبڕی و منداڵێکی (١١-١٢) ساڵیش نانەوا بوو، بەخێرایی کەسێک گونکەکانی پاندەکردەوە و بە تەنوورەکەیەوە دەدا. مەنجەڵە قاورمەکە هاتەکوڵ، دانشی نزیکەی دوو کیلۆ و نیو قاورمە و دوو کەوچک ڕۆن و دوو کوندە ئاوی بۆ نزیکەی (٤٠) کەسی گەورە و بچووک لەبەر چاوگرت بوو. یەکێک لە سەردەستەکان نانەکەی دابەشدەکرد، سێ بەشیان نیوەنانیان دەدانێ. هەندێکیشیان یەک نانیان دەدانێ. پاشان هەمووان بە قاپ و نانەوە ڕیزیانگرت بۆلای مەنجەڵەکە. هەر کەسە و یەک کەوچک ئاوە گۆشتی دەدرایە. ئەگەر کەسێک بەختی هەبووایە ئەوا چەند پلە گۆشتی بچووکی بەردەکەوت. نانەکەیان لە ئاوە گۆشتەکە دەگووشی، زۆر بەتامەزرۆوە دەیانخوارد.

ئەی خودایە خەڵکیی دەتوانن ئەوەندە برسیی بن، دانشی یەک کاسە ئاوە گۆشتی بۆ منیش هێنا و گوتی: کاکە حسێن خواردنی ئەم ئێوارەیەمان لە سایەی سەری تۆوە ئا ئەمەیە. خۆ کەوچک و چەتاڵ هەر نەبوو، هەمووان بەدەست دەیانخوارد. دەستشۆرین و سابوون هەر نەبوو، لە کۆتاییدا پارچە نانێکیان بەقاپەکەدا دەهێنا و دەیانخوارد، ئەمە هەموو قاپ شۆردنەکەیان بوو. گوڵەخان هەندێک نانە بەشەکریشی خستبووە ناو تورەکەکەمەوە. ئەوانەشم لە نێوان دانشی و سەردەستەکاندا دابەشکرد. کاتێک کە خەریکی نان دروستکردن بوون، سەردەستەکان لێپرسینەوەیان لە کرێکارەکان دەکرد. تابزانن کێ زۆرترین و کێ کەمترین کەتیرەی هێناوەتەوە. ئەکبەری کوڕی خاڵە عەباس لە هەمووان ئازاتر بوو، شەش کێل کەتیرەی کۆکردبۆوە. ئەسغەری ئەسفیجی تەمەڵ بوو، لە دوو کێل زیاتر کەتیرەی نەکردبوو. محەمەدی سەردەستە بانگی ئەسغەری کرد، ئەسغەر هاتە ناو خێمەکە، کاک محەمەد پێیگوت: ئەوا من بە دانشی دەڵێم کە ئەمڕۆش کەتیرەکەت کەم هێناوە، بەوجۆرە بۆت ناچێتەسەر تۆ دەتەوێت نانی بەلاش بخۆیت! دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ بەهاباد، لەبری کەتیرە چوویت گیادەرمانیت کۆکردۆتەوە. ئەسغەر

گوتی: کاکە گیان باوەڕبکە بڕە گوێنییەکان کەتیرەیان دەرنەدابوو.. کاک محەمەد گوتی: کوڕی سەگ، کەری کوڕی کەر، من دەزانم تۆ دەتەوێت تەنها گیادەرمانی کۆبکەیتەوە، وا بزانم دەتەوێت لێرە بەشەق بتکوژم.. باشە تۆ بۆ سەیران هاتوویت بۆ ئێرە؟ ئادەی بزانم کیسە گیادەرمانییەکەت بهێنە باسەیری بکەم! ئەسغەر بە گریانەوە هاواریکرد و گوتی: بەخودا هیچ گیایەکم کۆنەکردۆتەوە. کاک محەمەد گوتی: تۆ بوویتە هۆی کێشە بۆ ئێمە دەتەوێت خووی ئەوانی تریش خراپ بکەیت، ئادەی بەڕێز دانشی تکایە وەرە ئێرە، چارەسەرێکی ئەم ئەسغەرە کەرەم بۆ بکە. ئەم توتکە سەگە دەیەوێت لێرە نان بەبەلاش بخوات و گیادەرمانی بۆخەڵکانی تر کۆبکاتەوە. خووی منداڵەکانی تریشی تێکداوە. دانشی هات و گوێچکەی ئەسغەری گرت و گوتی: هەی حەرامزادە، باشە من چەند جار پێمگوتیت کارەکانی خۆت بە جوانی ئەنجامبدە، ئێستا هەموو ئەو گیایەی کۆتکردۆتەوە فڕێی دەدەم، چونکە تۆ دەبێت کەتیرە کۆبکەیتەوە نەک گیادەرمانی. ئەسغەر کە تەمەنی (١٠-١١) ساڵ زیاتر نەبوو، گەردنی هەروەکو قایشی نێرگەلە باریک و لات و ڕەنگزەرد بوو، چاوەکانی زەق ببوونەوە، دەستیکرد بە گریان و گوتی: توخودا دەسکاریی گیاکانم مەکەن، بیکەن بەخاتری ئیمامی عەلی گیادەرمانییەکانم فڕێمەدەن و لێم خەسار مەکەن. کاک محەمەد ئەسغەری لە دانشی وەرگرت و چەند زللـەیەکی لێدا. ئەو چونکە درەنگ گەڕابووەوە خواردنی وەرنەگرتبوو، بۆیە پێیگوت ئەمشەو خواردنت نادەینێ و بەبێ خواردن بخەوە، بەڵکو پەند وەربگریت و ببیتە مرۆڤ. من دوای ئەوەی کە نانە شیرینەکەم دا بە دانشی یەک پارچە نان و کەمێک قاورمەم لە کیسەکەم دەرکرد و لە خێمەکە چوومە دەرەوە تا ئەسغەر بدۆزمەوە، بەڵام زۆر تاریک بوو نەمدەزانی چۆنی بدۆزمەوە لە دڵی خۆمدا گوتم ڕەنگە لە یەکێک لەو کەپرانەدا بێت. هەندێک لە کرێکارەکان لە دەرەوەی خێمەکە بوون، بەتەنیشت ئاگردانەکەوە دانیشتبوون، یەکێک شمشاڵی دەژەنی و یەکێکی تر گۆرانی دەگوت. نزیکەی سەد مەتر لە خێمەکە دوورکەوتمەوە. گوێم لە دەنگی ئاژەڵێک بوو، لە دەنگی چەقەڵ دەچوو، ترسام و ویستم بگەڕێمەوە. دووبارە دەنگەکە هاتەوە گوێم. دەنگەکە زۆر لێم نزیک بوو، لە پشتی بەردێکەوە دەهات، من خۆم مەڵاسدا و بەردێکم هەڵگرت تا تێیبگرم، دیسانەوە دەنگەکە هاتەوە، منیش بەدەنگێکی بەرز گوتم: چغ چغ... سەیرمکرد منداڵێک لە پشتی بەردەکەوە هات، لێم پرسی ئەوە چی دەکەیت، گوتی: لە ئەسغەر دەگەڕێم، چونکە هەرکاتێک لێدان بخوات دێت لەسەر ئەم بەردە دادەنیشێت، یا هەر لێرە دەخەوێت، نیشانەمان شەوانە دەنگی چەقەڵە و بەڕۆژیش دەنگی کەو. ئەم منداڵە هاوتەمەنی ئەسغەر بوو، دووبارە وەک چەقەڵ لووراندییەوە. دواتر لوورەی چەقەڵێک لەو لامانەوە هات، ئەم منداڵە نیوەی

خـواردنەکەی خـۆی نەخواردبـوو، هێنـابووی بـۆ ئەسـغەر، ئەسـغەرمان دۆزیـیەوە لەو ناوشـاخەدا لەسـەر بەردێـک دانیشـتبوو دەگریـا. ئەو منـداڵەی کە بەدوای ئەسـغەردا دەگەڕا، ناوی محەمەد بوو، محەمەد خواردنەکەی دا بە ئەسغەر و منیش پارچە نـان و قاورمەکەم دا بەهەردووکیـان. ئەسغەر گوتی: ئـای خـۆ ئەمە قاورمەیە. محەمەد گوتی: بەڵـێ ئەوە کـاکە حسێن هێنـاویەتی. ئیتـر هەردوکیـان خواردنەکەیـان خـوارد. لەسـەر بەردەکە دانیشـتبووین، ئـاگری ئاگردانەکەمـان لـێ دیـار بـوو، مـحەمەد گـوتی: ئەسـغەر هەموو ڕۆژێک لێی دەدرێت. گوتم: ئەسغەر تۆ بۆچی گیادەرمـانی کۆدەکەیتەوە؟ گوتی: لە گوندەکەی خۆمـان مامۆستاکەمان پێیگوتم: کە ئەم گیایەی بۆکۆبکەمەوە. ئەو نـاوی ئەو گیایانەی پێگوتم: کاتێک ویستم بێم بۆ کەتیرە، مامۆسـتاکەمان گوتی: لە کوردسـتان هەر جۆرە گیایەکی کێویت بینی کۆی بکەرەوە. منیش هەموو ڕۆژێک دەچـم ئەو گیـایانە کـۆدەکەمەوە. کەتیـرەش بەکەمـی کـۆدەکەمەوە. گـوتم: چەنـد جـۆر گیـای کێویـت کۆکردۆتەوە؟ گوتی: لێرە سـەدان جۆر گیـا هەیە، کە هەندێکیان ئەوەندە بۆن و تامیـان خۆشە، مەگەر هەر خودا خۆی بزانێت. هەندێکیشـیان ئەوەنـدە تـاڵە وەکو ژەهـری مـارە، هەیێکیان تامیان سوێرە. هەندێکیشیان بێ تامن، هەندێکیشـان هەیە چەورن. من زۆر حەز بەم گیایانە دەکەم. محەمەد گوتی: ئەسغەر نزیکەی (١٠) فەردە گیادەرمانی کۆکردۆتەوە لە تەنیشت دوو بەردی گەورە شاردونییەتەوە. هیچ کەسێک پێیان نازانێت لە کوێیە! خۆ ئەگەر سەردەستەکەمان بزانێت ئەسغەر دەکوژێت. محەمەد گوتی: ئەسغەر زۆر زیرەکە جارێک کاک محەمەدی سـەردەستە پێیگوت، دەبێت گیایەکـان بخۆیت، ئەویش هەمـووی خوارد. ئەسغەر گیایەکەی زۆر بەلەزەت خواردبوو، پاشان هەردووکیان پێی پێدەکەنین، چـونکە ئەسـغەر تێـری خواردبـوو، ئتیـر نەدەگریـا، هەر لەبـارەی گیادەرمانییەکـانییەوە قسـەی دەکـرد. گـوتی: دەچێتە لای شـوانە کوردەکـان و نـاوی گیاکانیـان لـێ دەپرسـێت، گوتی: کوردەکـان زۆر میهربـانن، ئێمە کاتێک کە برسیمان دەبێت دەچینە لای ئەوان و ئەوانیش ماست و شیر و پەنیر و نانمان دەدەنێ. گوتی: هەندێک لە منداڵانیش خـواردنی کوردەکان دەدزن، بەڵام کوردەکان توڕە نـابن. بەڵام کاتێک کەتیرەی کوردەکـان بدزین زۆر توڕە دەبن. ئەسغەر گوتی: کوردێک هەیە هەندێک ڕۆژ گیایەکـانم لێوەردەگرێت و کەتیرەم دەداتێ. ئەو سوود لەو گیایانە وەردەگرێت بۆ ناو چێشت.

کـات درەنـگ بـوو، گوتیـان دەبێت بچینە کەپرەکـانەوە، مـحەمەد و ئەسـغەر هـاوپۆل بوون و گوتیان مامۆستاکەمان بە عەزیز و مورتەزایان گوتوە کە پەپوولە کۆبکەنەوە، مـورتەزا و عەزیـز لەگەڵ دەسـتەی کـاک حەسـەنن. ئەوان کەپرەکانیـان یەک فرسـەخ لێرەوە دوورە. مورتەزا پەپوولەکانی وەها شـاردۆتەوە کە هیچ کەسـێک نازانێت لەکوێ

داینــاون. ئەسغەر و محەمەد چوون بۆ کەپرەکەیان و منیش گەڕامەوە بۆ لای خێمەکە. دانشی گوتی: کاکە حسێن لە کوێ بوویت؟ بانگم کردی دیار نەبوویت! گوتم: چوومە دەرەوە کەمێک کارم هەبوو، وای زانی ڕۆیشتوم بۆ دەستبەئاوگەیاندن. بەتانییەکی دڕاوی پێدام و گوتی: کاتی خەوە. منداڵەکان دەبێت زوو لە خەو هەڵسن، هەر ئەو بەتانییە دڕاوەی کە دای بەمن باشترینی هەموو بەتانییەکان بوو، بەتانییەکی دڕاویشی بەسەر خۆیدا کێشا، چرا فتیلەکەی کوژاندنەوە و خەوت، خێمەکە بچووک بوو نزیکەی (٨) کەسی تێدا خەوتین، کە هەندێکیان قاچیان لە دەرەوەی خێمەکە بوو. من شەرمم دەکرد، جێگاکەم لە تەنیشت فەردە ئاردەکانەوە چاککرد، چەند خولەکێکی پێ نەچوو کە هەموویان دەستیان کرد بە پرخە پرخ. منیش هیلاک بووم، سواربوونی هێستر و گەڕان بە کێو و شاخدا تەواو هیلاکی کردبووم. تابەیانی ئاگام لە خۆم نەبوو، بەیانی بەدەنگە دەنگی سەرپەرشتیاران، کە بانگیان دەکرد، یاڵڵا هەستن درەنگە، منیش بەدەنگی ئەوان بەئاگاهاتمەوە و لە خێمەکە هاتمە دەرەوە، هێشتا دنیا تاریک بوو. لەلای خێمەکە تەنها دوو مەسینەی لێبوو بۆ دەستبەئاوگەیاندن، کەسێک لەولاوە گەڕایەوە و مەسینەیەکی بەدەستەوە بوو، گوتی: مەسینەکە ئاوی تێدا نییە، دەبێت یان سوود لە کەرسەک وەربگریت یان (٣٠٠-٤٠٠) مەتر بڕۆیت بۆ سەرچاوەی ئاوەکە. یەکێک لە پیاوەکان گوتی: بۆ دەستنوێژگرتن دەچم بۆ سەرچاوەی ئاوەکە، وەرە با بەیەکەوە بڕۆین، بەرەو کا نییەکە ڕامکرد، هێشتا خۆر دەرنەکەوتبوو، بەڵام ڕووناکیی خۆر لە پشت کێوەکانەوە دیار بوو، هەموو کرێکارەکان لە دەوری ئاگردانەکە کۆببونەوە، سەردەستەکان نانیان دابەشدەکرد بۆ هەرکەسێک لەتێک نان بە وشکی و بەبێ پێخۆر. خواردنی هەمیشەیی کەتیرەکەران نانی وشکی بوو، هەر کەسێک پەرداخێکی فافۆن یا پەراخێکی نایلۆنی بەدەستەوە بوو، بۆ چا خواردنەوە، پەرداخی شووشە هەر نەبوو، دانشی بانگی منی کرد و ڕۆیشتمە ناو خێمەکەوە. سێ چوار کەس بەدەوری ئاگردانەکەدا دانیشتبوون، دانشی چای بۆکردمە ناو قاپێکی بچووکەوە، چارۆکەیەکی یەزدی ڕاخستبوو، کە چەند نانێک و قاپێک هەنگوینی لەسەر دانرا بوو، نانی بەیانیمان بەخێرایی خوارد. سەردەستەکان دەیانگوت کە گوێنییەکانی ئەم نزیکانەیان برینداركردوون، ئەمڕۆ یاسەی دەبێت نیو فرسەخ (سێ کیلۆ مەتر) بڕۆین بەو لاوەترەوە خێمەکەمان هەڵدەینەوە، دانشی گوتی: دەبێت قسە لەگەڵ کوردەکان بکەین، نەوەک بچینە سنووری کەتیرەی ئەوانەوە. دانشی پێیگوتم: کاک حسێن تۆ چی دەکەیت؟ گوتم: من لەگەڵ محەمەددا دەڕۆم تا بزانم چۆن چۆنی کەتیرە کۆدەکەنەوە! محەمەدی سەردەستە گوتی: ئێمە ئێستا دەڕۆین و شەو دەگەڕێینەوە. گوتم: قەیدی نییە من لەگەڵ ئێوەدا دێم. بۆ

نیوەڕۆ هەر کەسە و نانێکی وەرگرت، منیش هەر وەکو ئەوان تەنها نانێکم وەرگرت. ڕاستی لە نێو کیسەکەمدا قاورمەم پێبوو، بەڵام نەدەکرا دەریبهێنم، بۆیە نانەکەم خستە گیرفانمەوە و لەگەڵ محەمەددا بەڕێکەوتم، کاک محەمەد هاواریکرد: هۆ تەمبەڵەکان لە کوێن؟ (١٠-١٢) کەس لە دەوری کۆبوونەوە و کاتێک یەکەمین تیشکی زێڕینی هەتاو لە چاومیدا، گەیشتمە لای یەکەم بڕە گوێنی کە دەبوایە بریندار بکرێن. خەڵکەکە هەموو بڵاوەیان لێکرد، ئەسغەریش لە من جیابووەوە. من لەگەڵ کاک محەمەدی سەردەستە بەڕێکەوتم، دەبوایە کاک محەمەد دەستنیشانی ئەوە بکات کە ئایا بڕە گوێنییەکە پێشتر بریندار کراوە یان نا. کاک محەمەد چەند بڕە گوێنییەکی نیشانەکرد، کە دەوروبەرەکەی لە گڵ و بەرد پاک بکەنەوە، کەسێک پاچێکی بەدەستەوە بوو، کە ژێر بڕە گوێنییەکەی هەڵدەکەند بە قوڵی (٢٠) سم و تا بەتەواوی ڕەگەکەی دەردەکەوت و بە بێڵچەی بچووک گڵەکەیان دەردەدا، ئەم کارە دەبوایە (١-٢) کەس زۆر بەخێرایی ئەم کارەیان بکردایە، هەرکەسێک دەبوایە تا ئێوارە بنی (٨٠-١٠٠) بڕە گوێنییان هەڵکەندایە، پاش هەڵکەندنی بنە گوێنییەکان کاری چەقۆلێدان و بریندارکردن دەستپێدەکرد. چۆ نییەتی بریندارکردنی بڕە گوێنییەکان یەکێکە لەک ارە گرنگەکانی کەتیرەکردن. ئەم کارە لە ئەستۆی پیاوە شارەزاکاندا بوو، تەنها ئەو کەسانەی کە زرنگ و هۆشیار بوون، دەیانتوانی ئەم کارە ئەنجامبدەن. بەچەقۆیەکی تایبەت دەبوایە ڕەگ و هەندێک لە لقەکانی بریندارببکەن تا ڕادەیەکی دیاریکراو، دەبوایە چەقۆکە بچوایەتە ناو ڕەگی گوێنییەکەوە، منداڵان و گەورەکانیش دەبوایە چوار دەوری بڕە گوێنییەکانیان بەبەرد و بەدار بتەنیایە، تاوەکو مەڕو بزنی مەڕدارەکان نەیەنە سەری و ئەو شیلەیە نەخۆن کە لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا دەریدەدا. هەر ئەو کەسانە چەند ڕۆژ دواتر دەبوایە بەسەر بڕە گوێنییەکاندا بگەڕانایە و ئەو شیلەیەی کە دەریداوە و پێی دەڵێن کەتیرە کۆی بکەنەوە. دیارە یەک بڕە گوێنی تا دوو سێ جار بریندارەکرا. کەتیرەی جارەکانی دواتر ڕەنگی قاوەیی یان خۆڵەمێشی بوو، کە بەنمرە دوو یان سێ ئەژمار دەکرا. بە دوو کاتژمێر جارێک توبەرەکەی کە بە ملیانەوە بوو، پڕ دەبوو، دەبوایە توبەرەکەیان ببردایە لای سەردەستەکە و بەتاڵیانبکردایە و ئەویش کاری هەموویانی لەبەرچاودەگرت و بەگوێرەی ئەو هێندە کەتیرەیەی کە کردوویانە. لە بەیانی زووەوە تا نیوەڕۆ بەبەردەوامی کاریاندەکرد، نیوەڕۆ لە دەوری سەردەستەکەیان کۆدەبوونەوە. سەردەستەکە خۆی ئاوی دەکردە کتریەکەوە و ئاگری دەکردەوە و چای بۆ لێدەنان. هیچ کەسێک کاتژمێری لە دەستدا نەبوو، بەڵام هەموویان دەیانزانی کاتی نیوەڕۆیە. من و (١٢) کەسی تر لە دەوری کاک محەمەدی سەردەستە کۆبووینەوە. هەر کەسە و نانە

وشکەکەی لەگەڵ چایەکەدا دەخوارد، پارووە نانەکەیان بە وشکی دەخوارد و یەک قوم چایان بەسەردا دەکرد تا نانەکە لە قوڕگیان بچێتە خوارەوە. دەبوایە منیش بەهەمان شێوە نانەکەم بخواردایە، ئەسغەر هێشتا نەهاتبوو دیسانەوە هاوار هاواری کاک محەمەد دەستیپێکرد. دەیگوت ئەم سەگبابە بۆنەهاتەوە، ئەوا ئەمڕۆش درەنگکەوت، دەبێت وەک سەگ بیتۆپێنم. هەموو کرێکارەکان یەکی چوار توبەرە کەتیرەیان هێناوە، بەڵام ئەسغەر تەنها یەک توبەرەی هێناوە. لەو کاتەدا ئەسغەر هاتەوە و توبەرەکەی بەتاڵکرد، کاک محەمەد چەند جوێنێکی پێدا.

گوتی: باشە بۆهەموو ئەوانە هەریەکەی چوار توبەرە کەتیرەیان کۆکردووەتەوە، تەنها تۆ یەک توبەرەت هێناوە. دیسانەوە چوویت گیادەرمانی کۆبکەیتەوە؟ ئێستا ئەو گیایەت لە کوێ شاردۆتەوە، بەس بیدۆزمەوە دەبێت هەمووی بدەمە هێستری کوردەکان. محەمەدی خزمی ئەسغەر لەگەڵ ئەم گروپە نەبوو بەڵکو لە گروپێکی تر بوو، نیو کاتژمێری پێنەچوو کە کاک محەمەد گوتی: یەڵڵا هەڵسن و بڕۆن. خۆیشی خەریکی جیاکردنەوەی کەتیرەکان بوو، منیش بەبێئەوەی بەکاک محەمەد بڵێم هەڵسام و لەگەڵ ئەسغەردا ڕۆیشتم و گوتم: فێرمبکە بزانم چۆن کەتیرە کۆدەکەیتەوە. پاشان لەلای دوو بڕە گوێنییەوە فێربووم، کە چۆن کۆی دەکەنەوە، بە ئەسغەرم گوت تۆ بڕۆ گیا کۆبکەرەوە من لەبری تۆ کەتیرە کۆدەکەمەوە.

چاوەکانی ئەسغەر وەک کارەبا ڕووناکیی دەدایەوە، کە ئێستاش هەر لەبەر چاومە چەند بڕە گوێنییەکی پیشاندام و گوتی: کەتیرەی ئەمانە کۆبکەرەوە، منیش هەر لەم نزیکانە دەبم. گیایەکان تەواو گەورەببوون، گیایەکی زۆری لێبوو، جۆرەها گوڵ و گیا ئەو ناوەیان داپۆشی بوو، هەندێک شوێنیش بەردەڵان و زیخەڵان بوو، بەڵام بەزۆری شوێنەکان گوڵ و گوڵزار بوون، بڕە گوێنییەکی زۆریشی لێبوو، من شوێنەکانی ترم نەدیبوو، بەڵام دانشی دەیگوت ڕاستە ئەمساڵ درەنگ لەچاو خەڵکی تردا هاتین بەڵام وابزانم ئەمساڵ ئێمە لە هەموو کەس زیاتر کەتیرە دەکەین، لێرە بڕە گوێنی زۆرهەیە. پاش کاتژمێرێک توبەرەکەی ئەسغەر پڕ بوو لە کەتیرە و جلەکانی منیش هەمووی بوو بە تەپ وتۆز، بەجلی کوردییەوە زۆر ئاسوودە بووم، دەبوایە بەچیچکانەوە کەتیرە کۆبکەمەوە. چونکە فێر نەبووم ئەژنۆکانم ئازاریان هەبوو، بەڵام زۆر خۆشحاڵ بووم بەوەی کە توانیبووم هاوکارییەکی ئەسغەر بکەم. ئەسغەرهات و پێمگوت: توبەرەکە پڕ بووە. بەخۆشحاڵییەوە گوتی: هەربژیت… توبەرەکەی لێوەگرتم و بەرەو لای کاک محەمەد ڕۆیشت، هێشتا ئەسغەر نەگەڕابووەوە، کە دەنگی تۆپێک هات، ئەمڕۆ دەنگی تۆپەکان بەهێزتربوون، (٥-٦) جار گرمەی تۆپ هات، گرمەکە لە شاخەکان دا دەنگی

دەدایەوە و نەمــدەزانی دەنــگە ڕاســتییەکە لە کــام لاوە دێــت. ئەســغەر لەلای کــاک مـحەمەدەوە هـاتەوە و گـوتم: ئەوە گـونـدەکانی کوردەکـان لەکـام لایەوەن؟ گـوتی: ئەگەر بچینە سەر لوتکەی شاخەکە چەند گوندێک دەبینین. گوتم: تۆ چوویتە سەر لوتکەی شاخەکە؟ گوتی: دووجار ڕۆیشتووم. لەوێ سەنگەر دروستکراوە، چەکداری کوردی لێیە. توبەرەکەم لێوەرگرتەوە و تا ئێوارە چوار جار توبەرەکەم پڕ کرد. زۆر هیلاک و ماندووبووم، قۆڵی کراسەکەم بەدڕکی بڕە گوێنی دڕا و شەرواڵەکەشم خۆڵاویی ببوو. ئێوارە داهات و ئەمڕۆ ئەسغەر شەش توبەرە کەتیرەی برد بوو، کە دەیکردە نزیکەی (١٢) کیلۆ، ڕۆژانـی تـر دوو تـوبەرە یـان ئەو پەڕی سـێ تـوبەرەی کۆدەکردەوە. کـاتی ئێوارە بوو ئەسغەر گوتی: وەرە با شوێنی گیایەکانت پیشان بدەم.

گیایەکانی لە سێ شوێن شاردبۆوە، شوێنە نزیکەکەی پیشانی من دا، کونێکی لە ژێر بەردێکی گەورەدا دۆزی بۆوە. گیایەکەی تێدا حەشـار دابوو، ڕووی دەرەوەی بە کەڵەک دیـوار کـرد بـوو، بە جۆرێـک کە جنـۆکە نەیـدەتوانی بیـدۆزێتەوە. چەنـد فەردەیەکـی کۆکردبووەوە. بەشێوەی چەپک چەپک بەستبوونی ناوی زۆربەی گیایەکانی بە کوردی دەزانی. ئەسغەر گوتی: بۆتە هـاوڕێی دوو شـوان، کە یەکێکیـان پیاوێکی پیرە ئەو نـاوی هەموو گیایەکان دەزانێت و سوودەکانیشیان دەزانێت. گوتی: ئەگەر سبەی لەگەڵ مندا بێیت ئەوا بەیەکەوە دەچینە لای ئەو شوانە. خۆر خەریکبوو ئاوا دەبوو، دەبوایە ئێمەش بگەڕێینەوە بۆ لای خێمەکە. من بە جۆرێک ڕۆیشتم کە کاک مـحەمەد هەستنەکات کە لەگەڵ ئەسغەردا بووم.

ئەو (١٢-١٣) کەسـەی کە لە بەیـانییەوە تـاکو ئێوارە لە کـارکردن بوون، هەموویـان ڕووە و خـێمەکە کەوتـنەڕێ، هەر کەسـە و پێویسـتییەکانی خـۆی بەکـۆڵەوە بـوو، هەندێکیان پاچ و بێڵچە و تەوراس یان پێبوو، کاک مـحەمەد کتری و قۆرییەکەی بە لاشانیدا دا بوو، جگە لەوەش هەر کەسە و بەپێی توانای خۆی هەندێک دار و کۆتەرەی پێبوو، بۆ تەنووری نان و ئاگری شەو. کە من گەیشتمە خێمەکە هەویر شێلدرابوو، کتریـان خسـتبووە سـەر ئـاگر، کاتێـک چـوومە نـاو خـێمەکەوە لە تەنیشـت دانشـیـیەوە دانیشتم و پشتمدا بە کیسە ئاردێکەوە، زۆر خۆشحاڵ بووم. دانشی گوتی: کاکە حسێن لە کـوێ بوویـت، تۆش چوویت کەتیـرە کۆبکەیتەوە؟ گـوتم: هەم گەڕانێکم کـرد و هەم هاوکاری کۆکردنەوەی کەتیرەشم کرد. پیاڵە چایەکی بۆ تێکردم. من لە مەلا بانگدانەوە هەڵسابووم، ئێستا کە شەوە و (١٧-١٨) کاتژمێر کـارم کـردووە، نازانیت ئەو چایەی کە دانشی بۆی تێکردم و خواردمەوە چ تام و لەزەتێکی هەبوو، تا ئێسـتاش هـیچ قـاوەیەکی کەنـاری ڕووبـاری (سـەن) ی پـاریس ئەو تـام و لەزەتەی نەبـووە بەلای مـنەوە، زۆر

هـیلاک بـووم تەنهـا بـۆ ڕەوانەوەی هیلاکـی خـۆم لە خـێمەکە هـاتمە دەرەوە. ئەو دەنـگە دەنگەی دوێنی شەو هەبوو، ئەمشەو نەبوو، زۆری دەنـگە دەنگەی دوێنـی شـەو بەهـۆی تەقەتەقی مەنجەڵ و قاپەکانەوە بوو، ئەمشـەو هەمـوو کرێکارەکـان لە دەرەوەی خێمەکە خواردنەکەیـان تەنهـا نـانی وشـکی و چـا بـوو، چـونکە خـواردنی هەمیشـەییان هەرئەوە بووە، دانشی قابلەمەیەکی بچووکی لەسـەر ئاگردانەکەی نێو خێمەکە دانـابوو کەوچکێ ڕۆنـی تێکـردو ڕۆنەکەی بـاش قرچانـد، پاشـان نـزیکەی یەک کیلـۆ ئـاردی تێکـرد، کە ئاردەکە لە ڕۆنەکەدا باش سووربووەوە، پاشان دەیکردە قابلەمەوە تا نیوەی ئاوی تێکرد، دواتر کە ئاوەکە کوڵا بەسەر دەستەکانی گوت بفەرموون خواردن ئامـادەیە. ئێمە تەنهـا شەش کەس لە نێو خێمەکەدا بووین، چوار سەردەستە و من و دانشـی. خواردنەکەیـان بۆ کردینە قاپێکەوە و نانمان تێگوشـی و دەسـتمانکرد بە خـواردنی، خـواردنێکی نـاخۆش نەبوو لەو شوێنە هەر ئەوە دەستدەکەوت، سەردەستەکان خواردنەکەیـان خـوارد و هەر لەوێ لە دەوروبەری قــوڵکەکە لێــی ڕاکشــان و خەو بــردنییەوە. کــاک محەمەدیــش نـوێژەکەی کـردو ڕاکشـا، کـاک مـحەمەد بە دانشـی گـوت: ئەسـغەر ئەمـڕۆ ببـوو بەپیـاو شـەش تـوبەرە کەتیـرەی هێنـاوە. ئەم منداڵە بەشـەق کاردەکـات دوێنـی شـەو تێهەڵدانی خوارد و بێ شێو سەری نایەوە، بەڵام ئەمڕۆ بووە بە مرۆڤ. کاک مـحەمەد ڕوویکردە مـن و گـوتی: کـاکە حسێن، ئێمە ئەگەر لەم شـاخ و کێوە لە گوێدرێژ نەدەیـن، ئەویـش کارناکـات، ئەوانە بە شــەق و جــوێن کــاردەکەن. دانشــی گــوتی: خــودا بکــات ســبەی هێسترەکان بێن و کەتیرەکە ببەن، چونکە دەبێت خێمەکە تێکبدەین و نیو فرسـەخ بچینە پێشتر. ئەو شوێنەی حەسەنی لێیە هێشتا برە گوێنی زۆری لێیە، کە بریندار نەکراون. دانشی گوتی: کاکە حسێن سبەی بەیەکەوە دەچینە جێگاکەی کاک حەسـەن، منیش کە چاوم چوو بووە خەو، گوتم: بەدڵنیاییەوە لەگەڵتـان دێـم. لەسـەر گو نییەی ئاردەکـان بە جۆرێک خەوم لێکەوتبوو، کە هەمیشە ئارەزوو دەکەم بەو شێوەیە بخەوم. کاتێک دەنگە دەنـگ پەیـدابوو، لە خەو ڕاپەڕیـم وامـدەزانی چەنـد خـولەکێکە نووسـتووم، بەڕاسـتی وامدەزانی، کە تـازە سـەرەتای شـەوە، پـاش چەند خولەکێک تێگەیشـتم کە بەرەبەیـانە و قـوڵکەی نێـو خـێمەکە ڕوونــاکە و کتــریەکەش دەکوڵێـت. لە خێمەکەهــاتمە دەرەوە، سەیرمکرد، کاک محەمەد و کـاک عەلـی نـان و چـا دەدەن بە کرێکارەکان. هەر کەسـە و لەلایەکەوە دانیشتووە و نانی وشکی دەخوات و قومێک چای بەسەردا دەکات. ئەسـغەرم دۆزیەوە و پێمگوت: ئەمڕۆ ناتوانم لەگەڵ تۆ بێم. چونکە دانشـی پێیگوتـوم لەگەڵ ئەودا بچم بۆ شوێنەکەی کاک حەسەن. گوتی: باشە. محەمەد گوتی: من کەمێک لە کەتیرەکەی خـۆمی دەدەمــێ. حەســەنیش گــوتی: منـیش کەمێـک لە کەتیـرەکەی خـۆمی دەدەمــێ،

منداڵەکان هەموویان ئەسغەریان خۆشدەویست، ئەو سوود و ناوی گیادەرمانەکانی پێدەگوتن. ڕۆژێکیان ئەکبەر زۆر نەخۆش بوو ئەسغەر جۆرە گیایەکی کوڵاندبوو، ئاوەکەی پێدابوو، ئەکبەر کە ئاوەکەی خواردبۆوە لە نەخۆشییەکەی چاک ببوەوە. بەیانی زوو هەمووان بە کێوەکەدا وەربوون بۆ کەتیرەکردن. تەنها من و دانشی لە خێمەکەدا مابنەوە. دانشی گوتی: ئەگەر هێسترەکان بێن بۆ کاتژمێر نۆ دەگەنە ئێرە، خۆ ئەگەر نەهاتن ئەوا دەڕۆین بۆلای کاک حەسەنی سەردەستە. زۆری پێنەچوو کە چەند هێسترێک دەرکەوتن، دوو پیاوی کورد بە (١٤) هێسترەوە هاتن، لە پیاوەکانی مەقسودخان بوون، گوڵەخان کولێرە بەچەورەی بۆمن ناردبوو، دانشی گوتی: کاکە حسێن گوڵەخان تۆی زۆر خۆشدەوێت، تۆ چ بەڵایەکت بەسەر حاجی جەواددا هێناوە؟ پاشان گوتی: مەقسودخان لای من گوتویەتی ئەم کاکە حسێنە زەرەری (١٠٠) هەزار تومەنی بۆ من گێڕاوەتەوە. کاروانچییەکان چایان خواردەوە و فەردە کەتیرەکانیان لە هێسترەکانیان بارکرد، ئەو فەردانەی کە نەکێشرا بوون، دانشی کێشانەی کردن و منیش لە دەفتەری دانشی و دەفتەری مەقسودخاندا نووسیمن. خێمەکە بەتاڵ بوو، دانشی لە دەرەوەی خێمەکەوە بانگی کرد هۆ مەملۆ، مەملۆ گەنجێکی (١٨-٢٠) ساڵ بوو، لە نزیک خێمەکەوە کەتیرەی کۆدەکردەوە، خۆی گەیاندە دانشی، دانشی پێیگوت: هەم کەتیرە کۆبکرەوە و هەم ئاگاداری خێمەکەش بە، من لەگەڵ حسێن دا دەچم بۆلای حەسەنی سەردەستە. دانشی دووربینەکەی و داردەستەکەی هەڵگرت و بەڕێکەوتین. چەند هەنگاوێک نەڕۆیشتین کە گوتی: هێواشبە، گەڕایەوە بۆناو خێمەکە، دەبەیەکی مسی لەگەڵ خۆی هێنا، شوێنەکەی کاک حەسەن (٥-٦) کم لە ئێمەوە دوور، دەبوایە لە دۆڵێکەوە سەرەوخوار بڕۆین. دووبارە گەیشتینە دامێنی کێوەکە، نزیکەی (٤٠) کەس لە کرێکارەکانی دانشی لەژێر چاودێری کاک حەسەن دا کاریان دەکرد. کاک حەسەن خۆشی چوار سەردەستەی لە ژێر دەستدا بوو، هەر (١٠) کەس و سەردەستەیەکی هەبوو، حەسەنی سەردەستە بە خانی سەردەستە ناوی دەبرا، وەکو خانی شوانەکان، کە سەرۆکی شوانەکان بوو، دانشی شێوەی بڕە گوێنییەکانی باش دەناسی، دەیزانی کام بڕە کەتیرەی باشی هەیە و کام بڕە کەتیرەی کەمە. دەیزانی کام بڕە کەتیرەکەی نمرە یەکە و کامەش نمرەی دووەم و سێیەمە، چونکە لەتەمەنی حەوت ساڵیەوە چووبوو بۆ کەتیرەکردن، شارەزاییەکی زۆر باشی هەبوو. چەندین جار بۆ کەتیرەکردن بەپێی لە بەهابادەوە ڕۆیشتووە بۆ کێوەکانی (بەجنەوەرد) لە تەمەنی (١٤) ساڵیدا بەڕێگای کەوێردا بەپێ تا زاهیدان ڕۆیشتبوو، لەویشەوە ڕۆیشتبوو بۆ کێوەکانی (تفتان)، باسی یادەوەرییەکانی خۆی بۆ دەگێڕامەوە. باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن لە ساڵی (١٣٢٣-

١٩٤٤) دا، کە بەهـۆی جەنگـی دووەمــی جیهــانییەوە گرانــی بــووە، برسـێتی هەمــوو بەهابادی گرتەوە. بەهۆی جەنگ و وشکە ساڵییەوە. خەڵکی لە بەهاباد لە برساندا گیایان خواردووە، دەیگوت خەڵکە دەوڵەمەندەکە گیای وێنجەیان دەکرد بە چێشت، نانی هەرزن و چەوەندەریشــیان دەخــوارد. هەژارەکــان ئەو خواردنانەشــیان دەســت نەدەکەوت. کوردستان بەهۆی جەنگ و هاتنی سوپای سۆڤیەتەوە نائارام بوو، بازرگانانی قەزوێن پارەیان پێ نەما بوو، بازرگانی کردن بەکەتیرەوە وەستا بوو. باوکم دەیگوت چووم بۆ کێوەکانی تفتان لەوێ هەم کەتیرە هەبوو، هەم لە کوردستان ئارامتر بوو، دەیگوت ئێمە تیپێکی (٦٢) کەسی بووین، درێژایی کەوێرمان بەپێی بڕیوە تا گەیشتیوونەتە (قاین) مـن شتێک دەڵێم و تۆش شتێک دەبیستیت، دەزانیت تێپەڕبوون بە کەوێردا و بە پیادە واتـای چـی؟ دەزانیـت گەشـت بەپیـادەڕەوی لە گونـدەکانی بەهابـادەوە تـا کێوەکـانی گیڤـانی بەجنەوەرد مانای چییە؟ بەخودا تێپەڕبوون بە بیابانەکانی ئێراندا بە پیادە کەمتر نییە لە ڕۆیشتن لە دەریایەکی گەورەدا بەسواری کەشتییەکی شکاو.

مرۆڤی لەپێناویناندا بۆ تێرکردنی سکی برسی چی ناکات. ئێمە لە قاین بەڕێکەوتین بڕیـار بـوو پـاش دە ڕۆژ لە (سەرپیشـە) کۆببینەوە. دەچـووینە هەر گونـدێکەوە خەڵکـی لێمان دەترسان، وایاندەزانی ئێمە دز و جەردەین. بـاوەڕبکە لە هـیچ گوندێکدا خواردنی (٦٢) کەس پەیدا نەدەبوو، ناچار بووین بە هەشت دەستە. هەر دەسـتە و لە شـوێنێکەوە کەوتینـەڕێ. بە سـواڵ و بەکـارکردن و بە برسـێتی خۆمـان گەیانـدە سەرپیشــە، لەوێ هەمووماں کۆبووینەوە لە بەهاباتەوە تـا سەرپیشـە (٢٢) ڕۆژ بەڕێگاوە بووین لەو (٦٢) کەســە، (٣) کەس نەگەیشــتنە سەرپیشــە. دووبــارە لەوێـش لە یەکتـری جیـابووینەوە گەورەکانمان (زابول)یـان دەستنیشـانکرد کە لێی کۆببینەوە، هەندێک دەیـانگوت (زابـول) چۆڵە، هەندێک دەیانگوت ئاوەدانە، هەندێکی تر دەیـانگوت سیسـتان باشـە بچین، چـونکە لەوێ نـان هەیە، هەرچۆنێک بـوو پـاش (١٢) ڕۆژ گەیشـتینە گوندەکانی سیسـتان، چـوار کەس لە ڕێگادا کاری شوانی و بیرهەڵکەندیان دەستکەوتبوو. دۆخـی سیسـتانیش خـراپ بوو، بەڵام هێشتا زۆر لە بەهاباد باشتر بوو، (٨-٩) کەس لە گوندەکانی سیستان کاریان دەستکەوتبوو، چەند کەسێک ببوونە شاگردی حەسیر چنین. بەهەرحـاڵ پاش (٤٢) ڕۆژ (٤٦) کەس لە دۆڵـی (لادیـز) لە داوێنـی تفتـان یەکمـان گـرتەوە. خەڵکـی لادیـزیش کـورد بـوون، لەو کـوردانە بـوون کە لە سـەردەمی شـا عەبـاس دا هـاتبوون بـۆ تفتـان، زیـاتر ئەمانە بەزمانی بلوچی قسەیان دەکرد، بەڵام زۆربەشیان زمـانی کوردیان دەزانی، کـاک عەبدوڵڵای ئەسفەجی گەورەی ئێمە بوو، ئەو چوو بوو بۆ زاهیدان تـا لەگەڵ بازرگاناندا بەڵێننامە بنووسێت. چونکە دەبوو لە پێشدا کەتیرەکە بفرۆشین تاکو بەپارەکەی ئـارود و

خورما بکڕین، شەکر کە هەر نەبوو، لە نێوان گوندەکانی تفتان بڵاوبووینەوە، هەم کڕێکاریمان دەکرد، هەم سواڵمان دەکرد، لەبرساندا گیا و ڕەگە دارمان دەخوارد، پاشان کاک عەبدوڵڵا گەڕایەوە و بەخۆی و چەند کەسێک و چەند بارێکی حوشترەوە کە ئارد و پێویستییەکانی کەتیرەکردنی هێنابوو، لە زاهیدان هیچ بازرگانێکی موسڵمان بەڵێنامەی لەگەڵ کاک عەبدوڵڵا نەنووسیبوو، گوتوبوویان ڕووسەکان بەهۆی جەنگەوە کەتیرە ناکڕن. کە باشترین کڕیاری کەتیرە سۆڤێتییەکان بوون. هەر بۆیە کاک عەبدوڵڵا چووبووە لای چەند بازرگانێکی (سیک) و باسی هەژاری خۆیانی بۆکردبوون، سیکەکان دڵیان پێیان سووتابوو، گوتبویان ئێمە بازرگانی کەتیرە نین، بەڵام لەبەر خاتری ئێوە چونکە هەژارن بەڵێننامەی کڕینی کەتیرەتان لەگەڵ دەنووسین. بۆیە کاک عەبدوڵڵا هەزاران جار نزای خێری بۆ سیکەکان دەکرد و دەیگوت موسڵمانەکان ئامادە نەبوون بەڵێننامەمان لەگەڵدا بنووسن، بەڵام سیکەکان ئامادەبوون و بەڕاستی فریامانکەوتن، خودای گەورە بەهەشتیان پێڕەوا ببینێت. لە داوێنی کێوی تفتان ئاو و گژوگیا زۆرهەبوو، بەڵام کەتیرە کەم بوو، نزیکەی (٣) مانگ کارمانکرد. لە زاهیدانەوە بەبەردەوامی سیکەکان ئارد و خورمایان بۆدەناردین، ئەو ساڵە گرانی بوو شەکر هەر نەبوو، ئارد زۆر کەم بوو، لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا یەک کڵۆشەکرمان نەخوارد، بەڵام خورما هەبوو، کوردەکانی دۆڵی لادێزی تفتان شیر و ماست و دۆیان بەخۆرایی پێدەداین، ئەو کوردانە سوننە مەزهەب بوون، بەڵام بەردەوام چێشتی خێرایان لێدەنا و بەشی ئێمەشیان دەدا. کاتێک ویستمان بگەڕێینەوە دوو کەس لە ئێمە لەلادێز لای کوردەکان مانەوە پاشان لای ئەوان ژنیان هێنا و ئێستاش هەر لەوێن. سەرەتای مانگی ئابان (تشرینی یەکەم) هەموومان گەڕاینەوە بۆ بەهاباد. لەو (٦٢) کەسە سێ کەسی بۆ هەمیشە بێسەروشوێن بوون و ونبوون، (١٥) کەسیش لە شار و گوندەکان کاریان پەیداکردبوو و بۆ هەمیشە لەوێ مانەوە. هیچ کات، هیچ کەسێک نەیزانی ئەو سێ کەسە لە کوێن. دیار نەبوو مردوون یان زیندوون. دانشی بەردەوام بوو لە قسەکردن و گوتی: کەتیرەکردن، کار نییە بەڵکو ڕاکردنە لە دەست مردن. نزیکی نیوەڕۆ بوو هەوا زۆر گەرم بوو گەیشتینە سەر ڕووبارێک، ئاوێکی ڕوون وەکو فرمێسکی چاو، وەک ئاوی کەوسەر لە ڕووبارەکەوە دەهاتە خوارەوە، چەند مشتێک ئاوم خواردەوە، چەند خولەکێک قاچەکانم خستە ناو ئاوەکەوە و پشوویەکی باشم دا لە دانشیم پرسی بۆ کەتیرەکردن چوویتە کوێی تری ئێران؟ گوتی: بۆ ئەم کەتیرە نەفرەتیە نیوەی ئێران گەڕاوم. ڕۆیشتووم بۆ کوردستان، قەزوێن، مەهران، کرمانشان، کێوەکانی بەختیاری، قوچان، و بەجنەوەرد، کێوەکانی کرمان و کێوی تفتان هەمووی چووم. پێڵاوەکانم

لەپێکردەوە و کەوتینەڕێ سەد مەتر دوورکەوتینەوە، دانشی لەناکاو وازی لە قسەکردن هێنا و گوتی: بێدەنگبە و قوڵی گرتم و رایکێشام بۆ پشتی بڕە گوێنییەکەوە و گوتی: مەترسە و لەجێگای خۆت نەجوڵێیت، کە سەیرمکرد، وا ورچێک بەرەو ڕووبارەکە دەڕوات بۆ ئاو خواردنەوە. دانشی داردەستەکەی توند لە دەستیدا گرتبوو. گوتی: نەترسیت بەڵام بۆخۆی لە ترساندا ڕەنگی سپی ببوو. ئنجا دانشی بەهێواشی گوتی: ئەگەر ورچەکە هات بۆلامان ڕانەکەیت بەهێمنی لە دوای منەوە بووەستە، نازانم چەند دانەن، بەڵام هەموو ڕۆژێک ئەم کاتانە بۆ ئاوخواردنەوە و یارییکردن دێنە سەر ڕووبارەکە. ئایا مرۆڤ دەتوانێت ترسی خۆی پێناسە بکات، چەند جۆر ترسمان هەیە، تۆ چەند جار ترساوی، لێدانی دڵم زیادی کرد ویستم ڕاکەم، مێزێکی زۆرم دەهات خەریک بوو بیکەم بەخۆمدا، ئەژنۆکانم لە ترساندا دەلەرزین، هەر نەمدەزانی چیبکەم تەنانەت هۆشی ئەوەم نەبوو ناوی خێرێک بهێنم. تەنها ئەوەندەم گوت ورچی بەڕێز بەڵێندەدەم لێرە بەدواوە هەنگوینەکەت نەخۆم. دایکم هاتە بەرچاوم و پێیگوتم: هەی منداڵی بەرەڵڵای چاو نەکراوە تۆ کارت چییە؟ چوویت بۆ کێوەکانی کوردستانی عێراق بۆ ئەوەی ورچ بتخوات؟.

مرۆڤ کاتێک زۆر ترسا، هۆشیشی لەدەستدەدات. لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەگەر ورچ بمخوات وەڵامم بۆ دایکم چی دەبێت؟ چونکە تا ئەوکاتە تەنها یەک جار ورچم بینیبوو، ئەویش لە باخچەی ئاژەڵانی تاران. بەڵام ورچی باخچەی ئاژەڵانی تاران لە کوێ و و ورچی هەنگوین و ماسی خۆری کێوەکانی کوردستانی عێراق لە کوێ؟ منداڵانی ئەم سەردەمە لە تەلەفزیۆنەوە ورچ دەبینن. لە سەردەمی ئێمەدا تەلەفزیۆن نەبوو، سی دی و ڤیدیۆ نەبوو، تا ژیانی ئاژەڵە دڕەندەکان ببینین، کاتێک کە دەترسێیت لەیەک چرکەدا هەموو ژیانی خۆت دێتەوە بەرچاو. بێ هۆ نییە کە دەڵێن لە کاتی سەرەمەرگدا چاکە و خراپەی خۆت دێتەوە بەرچاو. زۆر ڕاستە کە دەڵێن ترس برای مردنە. ترس جۆرێکە لە هەستکردن بەژیان، مرۆڤ پێویستە بترسێت و بەڕاستی بترسێت تاخۆی هەست بەبوونی خۆی بکات، ورچەکە نزیکەی (١٠) مەتر دوور لە ئێمەوە ڕۆیشت، ورچێکی زۆر گەورە بوو، هێندەی گایەک دەبوو، ئەو ئاژەڵە زۆر بەهێمنی و لە سەرخۆ دەڕۆیشت، دانشی‌یش وەک پەیکەرێک لە پشتی بڕە گوێنییەکەوە دانیشتبوو، منیش لە دوای ئەوەوە بووم. بەهۆی ئەوەی کە زۆر دەترسام ئێستا یادم نییە، کە چۆن دانیشتبووم. خۆ ئەگەر بەنیازی ڕاکردن بوومایە، نەمدەتوانی لە ورچەکە دوور بکەومەوە. بەڵام دانشی بەبێ جوڵە لە پشتی بڕە گوێنییەکەوە دانیشتبوو، گوتی: پەلەمەکە و مەجوڵێ، ڕەنگە مێیەکەی بەدوایەوە بێت. ورچەکە نێر بوو، چەند خولەکێک

دانیشتین، وردە وردە هەستمکرد خەریکە هێمن دەبمەوە. بەڵام میزێکی زۆرم دەهات، دانشی گوتی: هەڵسە بابڕۆین. خۆشی ڕۆیشتە پەنا بڕە گوێنییەکەوە، تێگەیشتم کە ئەویش لەترساندا میزی دێت، من لە کاتی ئەو میزکردنەدا هەستم بەخۆشیەکی زۆر دەکرد، کە هەرگیز ئەو خۆشییە فەرامۆش ناکەم، نەمدەزانی ئەم هەموو ئاوە لە گیانی مندا چی دەکرد؟ ئایا بەهۆی ئەو ئاوەوە بوو لە ڕووبارەکە خواردبوومەوە یا لە ترساندا بوو، بەشێک لە میزەکەشم کردبوو بەخۆمدا.

تا خێمەکەی کاک حەسەن یەک کاتژمێر ڕێگا بوو، دانشی کەمتر قسەی دەکرد، هەستی ڕۆیشتبوو، چەند کەوێک لە ژێر بەردێکدا هەڵفڕین. ئێمە هەردووکمان ترسابووین و شڵەژابووین، دانشی پیاوی شاخ بوو، ساڵی (٤-٥) مانگ لە کێو دەمایەوە. ئەو جۆرەها ئاژەڵی کوێستانەکانی دیتبوو.. دڵنیابوو کە لە هەموویان ترسناکتر پڵنگە. هێشتا نەگەیشتبووینە خێمەکە، کە چەند منداڵێکی کەتیرەکەرمان بینی، سڵاویان لێکردین، خەریکی کۆکردنەوەی کەتیرە بوون، توبەرەی یەکێکیان پڕ بوو لە میوەی کێوی هەنجیری کێوی و تری و جۆرە میوەیەکی تریشیان پێ بوو لە گۆیژ دەچوو، منداڵەکان گوتیان میوە ناخۆن، یەکی چەند هەنجیرێکیان داینێ. لەکاتێک دا کە هەنجیرەکەیان دەدامێ یەکێکیان گوتی: خۆ ئەوە برادەرەکەی گەراجە ئیتر منداڵەکان لێمان کۆبوونەوە. یەکێک لە منداڵەکان ئەو منداڵە بوو کە من لە قەزوێن بانگهێشتی دۆندرمەخواردنم کردبوو، دانشی لە کاتی هەنجیرخواردندا بە منداڵەکانی گوت ئێوە کەتیرە کۆدەکەنەوە یاخود میوەی کێوی؟ ئاگاتان لە خۆتان بێت لەبەر ئاژەڵی دڕندە، یەکێک لە منداڵەکان گوتی: بەڕێز لێرە ورچ زۆر هەیە، بۆیە دەبێت چەند کەس بەیەکەوە بین. منداڵێکی هەشت ساڵ گوتی: گەورەم ورچ ئێمە دەخوات. یەکێکی تر گوتی: بەڕێز ئەکبەر هەرکاتێک ورچ دەبینێ دەرپێکەی پیس دەکات، خۆ ورچ هیچ مەترسییەکی نییە. ئەو منداڵە گوتی: خۆیشی چەند ڕۆژێک لەوە پێش ورچی دیوە و زۆر ترساوە. دانشی گوتی: منداڵینە ئاگاداربن نەچن بەلای هەنگوینی ورچەکاندا، ئەوە زۆر ترسناکە ئەگەر بچن هەنگوینی شاخ کۆبکەنەوە، ئەوا ورچەکان پەلامارتان دەدەن. دەستمان کردەوە بە ڕۆیشتن بڕە گوێنییەکان زۆر پڕ و گەورەبوون. دەنگی شمشاڵی شوان دەهاتە گوێمان لەناکاو سێ سەگی گەورە پەلاماریاندایین، دانشی هاواری کرد، ڕانەکەیت، منیش ڕاوەستام، دانشی داردەستەکەی بە دەستەوە گرتبوو ڕووبەڕوویان وەستا بوو، ئەوانیش لە دووریی دوو مەترەوە دەوەڕین و پەلاماریاندەدایین، دانشی بەرگریی دەکرد، شوانەکە بە خێرایی هات بۆلامان و سەگەکانی دوورخستەوە، ئەمجارەش زۆر ترسام مەرگی خۆمم بینی. هەموو گیانم شەلاڵی ئارەق ببوو. شوانەکە دانشی دەناسی، بەڵام

فارسی نەدەزانی، تەنها وشەی خانی بەکاردەهێنا، پاشان گەیشتینە خێمەکەی کاک حەسەن و کاتژمێر نزیکەی دووی دوانیوەڕۆ بوو، کاک حەسەن منی نەناسییەوە چونکە جلی کوردیم لەبەرکرد بوو، کتوپڕ گوتی: خۆ ئەوە کاکە حسێنە، ئەوە چی دەکەی لێرە؟ باوەشی پیاکردم و گوتی: زۆر خۆشحاڵبووم بەهاتنت. دواتر کتری خستە سەر ئاگر و منداڵێک کە لەوێ بوو پێیگوت ئادەی برۆ بۆلای خێمەی کوردەکان هەندێک ماست بهێنە. ئەوە کاکە حسێن هاتووە پێویستە خواردنێکی شاهانەی بدەینێ. نانی نیوەڕۆمان شاهانە بوو، نان و ماست بە کوڕادەوە. (کوڕادە وەک پیاز وایە) و لە کێوەکانی کوردستانی عێراق زۆر هەیە، دانشی ڕووداوی ورچەکەی بۆ کاک حەسەن باس کردو ئەویش گوتی: بەڕاستی ئەم ورچانە کێشەن بۆ ئێمە، سوپاس بۆ خودا، کە شوانەکان سەگیان لەگەڵدایە. خۆ ئەگەر ڕووداوێکی وەک ئەوەی پار ڕووبدات چی بکەین؟ منیش لێم پرسی پار چی ڕوویدا؟ کاک حەسەن گوتی: پار لە نزیک شاری شنۆ بووین لاوێکی (٢٢) ساڵە کە ناوی ئەحمەد بوو، چوو بووە سەر هەنگوینی ورچەکان، ورچەکەش دەستی لە مەچەکی یەوە بڕی بوەوە و ئیتر ئەو داماوە گیانی لەدەستدا، هەموو دەموچاویشی بە نینۆکەکانی بریندار کردبوو.

ئێستاش هەرچەندە بەم منداڵانە دەڵێم ئاگاداری خۆتانبن و مەچنە شوێنێک کە هەنگوینی لێبێت، بەڵام ئەمانە گوێناگرن و ڕۆژانە دەچن بۆ هەنگوین خواردن، منداڵی ئێستا گوێڕایەڵ نین، کە ئەوەش تاوانی مامۆستاکانیانە، چەند ڕۆژێک لەمەوبەر حەسەنی خاڵە ئەکبەر کاری نەکردبوو، کاک ڕەزاش لێیدابوو، حەسەن گوتبووی کە گەڕاینەوە بۆ بەهاباد لای پۆلیس شکاتت لێدەکەم. کاک ڕەزایش پێی گوتبوو برۆ منداڵی بێکەسوکار برۆ ونبە لەبەرچاوم. منداڵەکە گوتبووی دەچمە لای مامۆستاکەم و لەگەڵ ئەودا دەچم بۆلای پۆلیس و شکاتت لێ دەکەم. کاک ئەکبەر لەسەر قسەی ڕەزا گوتبووی ئەگەر ئەم منداڵانە ببنە خوێندەوار ئەوا بەکەڵکی کەتیرەکردن نایەن، بۆیە پێویستە بیرێکیان لێ بکەینەوە. دانشی گوتی: بە کاک ڕەزا بڵێ خودا گەورەیە، لێیانگەڕێ با ئەمانە ببنە خوێندەوار بەڵکو ببنە هۆی گۆڕانکارییەک لە بەهابادا. دانشی گوتی: کاک ڕەزا زۆر لەم منداڵانە دەدات و پێیبڵێ کەمێک کەشک و ڕۆنیان بۆ دروستبکات، بیاندەنێ تابیخۆن و کەمێک تێرببن. کاتێک کە برسیبن ناچاردەبن بەدوای هەنگویندا بگەڕێن. کاک حەسەن و دانشی کەوتنە وتوویژ لەبارەی کەتیرە و شوێن گۆڕکێی خێمەکان. منیش دووربینەکەی دانیشیم هەڵگرت و لە خێمەکە دووركەوتمەوە.

کات دوانیوەڕۆ بوو بەدووربین سەیری ئەو دەورووبەرەم دەکرد، دۆڵێکی سەوزایی زۆر خۆش لە خوارەوە بوو، بیرم لەوە دەکردەوە و دەمگوت ئەوبەهەشتەی کە باسی

دەکەن ڕەنگە ئەوها بێت، لەناکاو دەنگی تۆپ هات لە دڵی خۆمدا گوتم لە بەهەشتدا کوا ئەم هەموو خەڵکە برسیە هەیە، لە بەهەشتدا کاتێک نان و ماست و کوڕادە دەخۆن هەرگیز ناڵێن خواردنی شاهانەیە. لە بەهەشتدا گوللە تۆپ سەری کەس ناپەڕێنێت، کەواتە ئێرە دۆزەخە! دووبارە بەخۆمم گوت، ئاخر لە دۆزەخدا ئەم هەموو سەوزایی و جوا نییە نییە، دۆزەخ ئەوەندە جوان نییە، پاشان گوتم تێگەیشتم کە ئێرە بەهەشتە بەڵام مرۆڤەکان کردوویانە بە دۆزەخ. هەرئەو ورچەی کە من زۆر لێی ترسام لە ماوەی (١٥) ساڵدا، کە کاک حەسەن خەڵکی هێناوە بۆ کوردستان تەنها یەک کەسی کووشتوە، ئەویش لەسەر ئەوەی کە دەستی بردووە بۆ هەنگوینەکەی، ئەو تەنها کەسێک چوو بوو هەنگوینەکەی بخوات، بەڵام ئەم تۆپبارانە ڕۆژی چەند کەسێک دەکوژێت، کە بەرهەمی ئەم هەموو هیلاکی و ڕەنجکێشانەی ئەم هەموو خەڵکە هەژارە دەخوات؟ بۆچی تەمەنی ئەم کرێکاری کەتیرانە ئەوەندە کورتە؟ ئەوەتا کە ئەکبەری سەکینە لە تەمەنی (٤٥) ساڵیدا مرد. حسێنی خاڵە عەباس لە تەمەنی (٤٢) ساڵیدا مرد. لەم فکر و بیردنەوانەدا بووم، کە لەناکاو بیرم ڕۆیشت بۆ لای ئەو کچە چاوگەشەی شنۆ، هەرکاتێک شێوەی ئەو کچە دەم بەپێکەینە دەهاتەوە بەچاوم دەمگوت دوایی لە سەردەشتەوە دەچم بۆ شنۆ. ماوەیەک بەدووربین سەیرمکرد بەڵام خەیاڵم هەر لای ئەو کچە کوردە شنۆییە بوو.

## عەزیز و مورتەزا و پەپوولە

بەهیچ جۆرێک ئاگاداری هیچ کەسیک نەبووم و کەسم نەبینی بوو، لەناکاو کەسێک گوتی: سـڵاو ئەرێ تـۆ بـرادەرەکەی گەراج نیت؟ گـوتم: بەڵـێ ئەوم و ناویشـم حسـێنە گوتی: منیش ناوم عەزیزە. گوتم: تەمەنت چەندە؟ گوتی: لە پۆلی چوارەمم بچکونەیەکی ڕەشـــی لات و باریـــک، دەرپێیەکـــی جـــاوی لەبەردا بـــوو، لە هەمـــوو لاوە دڕا بـــوو، تـوبەرەبەکی لە ملـدا بـوو، پـڕی کردبـوو، لە کەتیـرە. گـوتم: ئەمـڕۆ چەنـد تـوبەرەت پرکـردووە؟ گـوتی: چـوار تـوبەرە، دەسـتەکانی هەمـوو خـوێن بـوون، یەک تـاک پێڵاوی لەپێـدا بـوو، قـاچەکەی تـری پەتـی بـوو. گـوتم: خواردنـت خـواردووە؟ گـوتی: بەڵـێ خواردوومە. گوتم: چیت خواردووە؟ گوتی: نانم بەئاوی ڕووبارەکەوە خواردووە. گوتم: بەیانی چیت خواردووە؟ گوتی: نان و چا. گوتم: ئەی دوێنێ شـەو چیت خـوارد؟ گوتی: نـان. گـوتم: نانـت بەچـی خـوارد؟ کەمێـک بیـری کـردوە و پاشـان گـوتی: بەددانەکـانم خواردم. چەند سـاڵ لەوەدوا لە شـوێنێک خوێنـدمەوە، کە یەکێک لە سـەرۆک هۆزەکـان، هەمان قسەی بەمامۆستای هۆزنـاس خودالیخۆشـبوو نـادر ئەفشـار نـادری گوتبوو. من یەک پارچە لە نانە شیرینەکەی گوڵەخانم لە گیرفاندا بوو، پێمدا و وەک خـۆی خـواردی، ناتوانم بڵێم وەکو کێ یا چۆن نانەکەی خوارد، تەنها دەبێت بڵێم نـانەکەی وەک منداڵێکی کەتیرەکەر خوارد. پاشان گوتی: وەرە بابڕۆین، شـتێکت پیشـان بدەم. گوتم: لە کوێیە.. دوور نییە؟ گوتی: نەخێر، ئەوەتا نزیکە. گوتم: لێرە ورچ نییە؟ گـوتی: ورچ هـیچ ناکات، کاتێک بینیمان دەبێت بڕۆینە ژێر بڕە گوێنییەک و بەبێ جوڵە دانیشین. گوتم: تـۆ لە ورچ ناترسـیت؟ گـوتی: چـۆن ناترسـم؟ بەڵام کـاک حەسـەن پێیگـوتوین کاتێـک ورچمـان بینـی بـڕۆینە ژێـر بـڕە گـۆنییەک بەبـێ جـوڵە دابنیشـین. کەمێـک ڕۆیشـتین گەیشـتینە چەنـد بەردێکـی تەخـت و گەورە و زەوییەکـی کەمێـک لێـژ و هەڵـدێر. گـوتی: بەڵام بە کەس

نەڵێیت. گوتم: چی بەکەس نەڵێم؟ گوتی: لەو ئەشکەوتەدا شتێکم هەیە هەر شتێکت بینی بەکەس نەڵێیت. گوتم: دڵنیابە بەهیچ کەسێک ناڵێم. لەوێ برە گوێنییەکی گەورە هەبوو لە پشتی برە گوێنییەکەوە ئەشکەوتێک بوو، بەلقی گوێنی دەرگای ئەشکەوتەکەی گرتبوو، ئەشکەوتەکە دەرگاکەی بچووک بوو، لە ناوەوە تەسک و درێژ بوو. عەزیز شخارتەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و بە چەند لقە گوێنییەکی وشک ئاگرێکی کردەوە بۆ ئەوەی ناو ئەشکەوتەکە ڕووناک ببێتەوە، کە چوومە ژوورەوە سەرسام بووم، سەدەها جۆر پەپوولەی لەسەر پەلکە گەڵای پان چەسپ کردبوو، گوتی: ئەوە من و مورتەزا ئەم کارەمان کردووە، چونکە مامۆستاکەمان پێیگوتین کاتێک کە چوونە کێوەکانی کوردستان، هەر پەپوولەیەکتان بینی بیگرن. مامۆستاکەمان کاتی خۆی بۆ کەتیرەکردن، هاتووە بۆ کوردستان.. گوتم: ئەوانەتان چۆن والێکردووە، گوتی: سەرەتا دەرزییەک دەکەین بەسەریدا و پەپوولەکە بەزوویی دەمرێت، پاشان کەمێک کەتیرە دەگرینەوە و بەئاو باڵەکانی پان دەکەینەوە، دەیانخەینە ناو جیوەکەوە، قاپێک لەوێ هەبوو کەمێک کەتیرە و ئاوی تێدابوو. پاشان گوتی: دەبێت کەتیرەکە زۆر بێڕەنگ و ڕوون بێت، پاشان بەهۆی کەتیرەکەوە لەسەر گەڵاکەی دادەنێین ئیتر پێوەی چەسپ دەبێت و پاشان کەمێک بنێشتەتاڵیشی لێدەدەین. گوتم: ئەم کارەی ئێوە کاتی زۆری دەوێت، کاک حەسەن دەزانێت ئێوە پەپوولە دەگرن؟ گوتی: نا.. نازانێت کە ئێمە دەڕۆین پەپوولە دەگرین و کەتیرە کەم کۆدەکەینەوە. گوتم: ئەی مورتەزا لە کوێیە؟ گوتی: ڕۆیشتووە پەپوولە بگرێت، لەوەیە ئێستا بگاتەوە ئێرە، دوێنێ کاک حەسەن ئەوەندەی لە مورتەزادا، هەموو سەر و گوێلاکی شکاند. گوتم: ئەی باشە ئێستا ئێوە چۆن دەتوانن ئەو پەپوولانە ببەنەوە بۆ بەهاباد؟ شانێکی هەڵتەکاند و گوتی: نازانم، گوتی: تۆ هاوکاریمان دەکەیت؟ گوتی: بەڵام بەکاک حەسەن نەڵێیت، کە ئێمە پەپوولە کۆدەکەینەوە. من لەکاری ئەوانەدا سەرم سوڕما بوو، لەوە سەرم سوڕمابوو، کە چۆن ئەم منداڵە وابڕوای بەمن هەیە، بەڵام ئەم منداڵە لەم کەژ و کێوە، هیچ کەسی تری نەدەبینی. هیچ چارەیەکی نەبوو، جگە لەوەی کە بەزوویی ڕاز و نیازی خۆی بۆ من ڕوون بکاتەوە، چونکە من تەنها کەسێک بووم، کە لە ئەوان نەبووم. ئەو (٤٥) ڕۆژ بوو لە بەهابادەوە هاتبوو، جگە لەو چەند کەسەی کە لەدەوروبەری بوون هیچ کەسی تری لە خزم و کەسەکانی خۆی نەدیبوو. بۆیە کاتێک چاوی بەمن کەوت، منی بە تەنها ئومێدی خۆی دەزانی کە دەردە دڵی خۆی بۆ من بکات و ببمە ئومێدێک بۆی تا هاوکاری بکەم..

نیو کاتژمێر دەبوو، کە لە خێمەکەی کاک حەسەنەوە هاتبووم، ویستم بگەڕێمەوە بۆ خێمەکە، گوتم: عەزیز من ئەمشەو لە خێمەکەی لای ئێوە دەمێنمەوە، سبەی لەگەڵ ئێوە

دێم و پەپوولە دەگرم. گوتی: بەڕاست دەمێنیتەوە؟ گوتم: بەڵێ دەمێنمەوە. دەستم خستبوە ناو دەستی بەڵام چ دەستێک زبر زبر هەر لە سمارتە دەچوو. ویستم بگەڕێمەوە، لەناکاو چاوم بە مورتەزا کەوت، کە بۆلای ئێمە دەهات، ئەو کە چاوی بەمن کەوت وایزانی من کوڕە کوردم. عەزیز بانگی کرد و گوتی: مورتەزا، وەرە ئەمە کاک حسێنی گەراجە، مورتەزا هات و سڵاوی کرد. لە عەزیز لاتتر و بچووکتر بوو، دەموچاوی بریندار ببوو، هێشتا شوێنی شکاوەییەکەی بەجوانی دەردەکەوت، خۆئەگەر ئەوکات بچووایە بۆ نەخۆشخانە لانیکەم شوێنی شکاوییەکەی (٢-٣) تەقەڵ دەبوو، عەزیز بە مورتەزای گوت کاک حسێنم بردووە و شوێنی پەپوولەکانم پیشانداوە. مورتەزا گوتی: توخودا ئاگاداربە بەکاک حەسەن نەڵێیت، کە ئێمە پەپوولەمان گرتووە، چونکە ئەگەر بزانێت ئەوا دارکاریمان دەکات. عەزیز گوتی: کاکە حسێن دەڵێت ئەمشەو لای ئێمە دەمێنێتەوە و بەیانیش لەگەڵماندا دێت بۆ کەتیرەکردن. مورتەزا زۆری پێخۆش بوو، بەزوویی دەستی کردە ناو تۆربێنەکەی و (٣) پەپوولەی جوانی دەرهێنا، کە زۆر جوان بوون، یەکێک لە پەپوولەکان زۆر گەورە بوو، نزیکەی (١٠) سم درێژ بوو. گوتی: ئەم جۆرە پەپوولەیە زۆر کەم و دەگمەنە. مورتەزا گوتی: ئەگەر سبەی هاتیت دەچینە سەر ڕووبارەکە بەلای تاڤگەکەوە لەوێ پەپوولەی گەورە زۆر هەیە، کە تاکو ئێستا نەمتوانیوە بیانگرم. مورتەزا و عەزیز گوتیان ئێمە دەچینەوە بۆ ئەشکەوتەکە، خوداحافیزییان لە من کرد و منیش گەڕامەوە بۆ خێمەکە. دانشی و کاک حەسەن لەوێ خەریکی قسەکردن بوون، دانشی گوتی: کات درەنگە، کاک حسێن هەڵسە با بڕۆین. من گوتم: بەڕێز دانشی ئەگەر مۆڵەتم بدەیت حەزدەکەم ئەمشەو لای کاک حەسەن بمێنمەوە، کاک حەسەن گوتی: ئا ئا، ئەمشەو و سبەی شەویش هەر لێرەبە. دووسبەی هێسترەکان دێن و کەتیرەکە باردەکەن، ئەوکاتە لەگەڵ ئەواندا بڕۆرەوە بۆلای دانشی. دانشی گوتی: سبەینێ جێگۆڕکێ دەکەین و دەچینە سەر کانییەکەی (کانی مێو)ی سەروو، کانییەکە وا لە پشت گوندی کانیلان. خاوەنی هێسترەکان دەزانن لە کوێیە، دانشی بەرەو خێمەکەی خۆی بەڕێکەوت. کاک حەسەن گوتی: کاک حسێن ئاگاداریت کە ئێمە لە نێو ئەم کەژو کێوەدا چ ڕەنج و زەحمەتێک دەکێشین لەپێناو پارووە نانێکدا؟ (٤) مانگ وەکو ئاژەڵ کاردەکەین، لە دواییشدا نازانین چی دەبێت. مووەکانی کاک حەسەن سپی ببوون و نیوەی ددانەکانیشی کەوتبوون، دەموچاویشی ڕەش و چرچ و لۆچ ببوو، لات و باڵا بەرزبوو، پشتیشی کەمێک کۆم ببۆوە. لاستیکێکی لە قاچەکانی پێچابوو بەپەت بەستبوونی، شەڕوالێکەی چەند پینەیەکی پێوە بوو، کراسەکەشی چڵکن و چەند پینەکی پێوە بوو، پاشام گوتی: دانشی گوتویەتی تۆ لە سەردەشت حیسابەکانی جەوادە

سووخۆرت ڕاستکردۆتەوە؟ گوتم: خۆ من هیچ کارێکی خراپم نەکردووە، خەڵکی خۆیان دوکانەکەیان تاڵانکردووە. گوتی: کوردەکانماڵی خۆیان بردووەتەوە نەک هی جەوادی سووخۆر. کاک حەسەنیش گوتی: من پار لەسەر حیسابی خۆم هاتم بۆ کەتیرەکردن، کرێکاری هیچ کەسێک نەبووم، ویستم کار بۆخۆم بکەم (٢٦) کرێکاریشم هەبوو، حیسابم لای ئەم حاجی جەوادە بوو، کەتیرەکەی منی بەهەرزان حیساب کردبوو، شەکر و چای بەقەرز دەدامێ، لە کۆتایی ساڵدا کەتیرەکەی بەجۆرێک حیساب کردبوو کە من (٨٥) تومەن قەرزار مامەوە. چونکە ئاگاداربوو، کە هیچ پارەیەکم پێنییە (٦٥) تومەنی بەقەز پێدام کە پاش نۆ مانگ (١١٠) تومەنم لێوەربگرێتەوە، ئەوا ئەمساڵ وەک کرێکارێک لەگەڵ دانشی دا هاتووم. کاک حەسەن گوتی: من خۆم لە دوکانەکەیدا بووم، ژنێکی کورد هات، جووتێک گوارەی زیوی پێبوو، جووتێک پێڵاوی لاستیکی دەویست، حاجی جەواد پێیگوت نرخی یەک جووت پێڵاوی لاستیک یەکسانە بە نرخی جووتە گوارەکەت، ئیتر جووتێک گوارەی زیوی لێوەرگرت و جووتێک پێڵاوی لاستیکی پێدا، کاتێک ژنەکە ڕۆیشت گوتم: حاجی جەواد خودا ئەمجۆرە مامەڵەیەی پێخۆش نییە! ئەویش گوتی: ئەمانە سوننەن سەگ وسەگبابن ماڵیان بۆ ئێمە هەزار جار حەڵاڵە.

منیش پێمگوت: باشە وا ئەوان سوننە و سەگ وسەگبابن خۆ ئێمە شیعەین و لەگەڵ ئێمەشدا هەر وایت. گوتی: ئەوە کاسپییە کاسپی. کاک حەسەن گوتی: من زۆر خۆشحاڵ بووم کە کوردەکان دوکانەکەیان تاڵانکردووە. بەخودا ئەگەر دەستەڵاتم دەبوو، بەکوردەکانم دەگوت دوکانی هەموو بازرگانەکانی بازاڕ تاڵان بکەن.

گوتم: کاک حەسەن تەمەنت چەند ساڵە؟ گوتی: بەبۆچوونی تۆ چەند ساڵ دەبم؟ گوتم: (٦٠-٦٥) ساڵ. گوتی: بەخودا تەمەنم (٣٩) ساڵە، برسێتی و بێچارەیی و بارەبەری و بیابانگەڕیی واپیری کردووم. ئەگەر ئەم کوردە سوننانە ڕەحمیان بەئێمە نەکردایە و بە چەند ڕۆژ جارێک کەشک و پەنیر و ماستیان پێنەداینایە، ئەوا لەم کێو و شاخانەدا تەنها نانی وشکیمان دەخوارد و دەمردین. چەند ڕۆژێک لەمەو پێش سێ منداڵ گێژ ببوون و وڕێنەیان دەکرد. پاشان دەیانگوت سەرمان دێشێ، تێگەیشتم کە نەخۆشییەکەیان برسێتە، چونکە هەر نانی وشکیان دەخوارد، بەم هەموو کارکردن و هیلاکییە، نانی وشک مرۆڤ دەکوژێت. نزیکەی یەک مانگ بوو ئەمانە تەنها نانی وشکیان خواردبوو. لە ماوەی یەک مانگدا تەنها یەکجار کەشک و ڕۆنمان پێدابوون، خودا دەزانێت ئێمەش نیمانە بۆیە خواردنی باشیان نادەینێ. بازرگانەکانی قەزوێن تەنها ئارد و کەمێک شەکر و چامان دەدەنێ، ئێستا ئاردەکەشیان کەمکردۆتەوە، نازانم ئاردەکەیان ئاردی جۆیە یان ئاردی چییە؟ کە هەویرەکە دەکەوێتە ناو تەنورەکەوە و

بۆمـان ناکرێـت بەنـان، ئەو سـێ منـداڵە نەخـۆش بـوون دەگریـان. کەمێک شـەکراومان بەدەمیاندا کرد، کەمێک باشتربوون، نیو فرسـەخ لەولای ئێمەوە گوندێکی کورد بەناوی (سـیار) هەیە، کە سـوپای عێراقـی هەمـوو ڕۆژێـک چەنـد گوللـە تـۆپێکی پێـوە دەنێـت. داماوانە ئاوارەی شاخەکان دەبن و وازیان لە کشتوکاڵەکەیان هێناوە و بە دیار مێگەلە مەڕەکانیـانەوەن. چـووم بـۆ گونـدەکەیان، ئەوان ئـێمە دەناسـن. گـوتم: سـێ منـداڵمان، نەخۆشن و دەبوورێنەوە، ئەگەر شتێکتان هەیە بماندەنێ، تا بیخۆین، ئەوان هیچ فارسـیان نەدەزانـی، منیش چەنـد وشـەیەک کوردیم دەزانـی، هەرچۆنێک بێت، تێمگەیاندن. کـاک حەسەن گوتی: باوەڕبکە نیوەی گوندەکەیان بەهۆی تۆپبارانەوە سووتابوو، پیاوێکی پیر چەنـد قسـەیەکی لەگەڵ کـوڕێکی لاودا کـرد، ئەو لاوە منـی لەگەڵ خـۆی بـرد بـۆلای خێمەیەک کە کەمێک لە گوندەکەوە دوور بوو، لەوێ مەڕێکی دامێ. گوتم: کاکە گیان خۆ من پارەم پێنییە بتاندەمێ. تێیگەیاندم کە پارە وەرناگرێت و وەک خێر مەڕەکەم دەداتێ، مەڕەکەم هێنایەوە و سەرم بڕی، سی و جگەرەکەیم برژاند و منداڵان دەستیان کرد بە خـواردنی، کەمێـک باشـتر بـوون، دوو ڕۆژ مـن گۆشـتاوم بۆدروسـت کـردن و دەرخواردمدان، پاشان هەستمکرد، کە باشتر بوون. کـاک حەسـەن گوتی: من کە خۆم نەخۆشم کاتێک برسی دەبم دەست و قاچم دەلەرزێت و زۆر تووڕە دەبـم، نـانی وشـکی دەخـۆم. بەڵام هـیچ سـوودێکی نییە، چەنـدین جـار منـداڵانی خەڵکـی دارکـاری دەکەم لە خوتوخۆڕایی، دیـارە ئەو منداڵانە کارناکەن، دوو سـێ سـاڵە قوتابخـانە لە گونـدەکەمان کـراوەتەوە، سـێ بەشـی ئەمـانە دەچـنە قوتابخـانە و بەکەڵکـی کـارکردن نـایەن. مامۆسـتاکانیان پێـان گوتـوون کتێبەکانیـان لەگەڵ خۆیانـدا بهێـنن و لەپـاڵ بەردێکـدا کۆببنەوە و خەرکـی خوێنـدنەوەی کتێـب بـن. ئەوانەی کە دەچـنە قوتابخـانە نیـوەی ئەو منـداڵانە کەتیـرە کـۆدەکەنەوە کە نـاچنە قوتابخـانە، ئیتـر نابێـت ئەو منـداڵانە بهێـنم، کە دەچنە قوتابخانە. چەند ڕۆژێک لەمەوبەر منداڵێک خەریکی خوێندنەوەی کتێب بوو، کـاک ڕەزا کتێبەکەی لێوەرگرت و دڕاندی، منداڵەکە پێیگـوت تـۆ چـۆن دەتوانیـت وێنەی شـا بـدڕێنیت... بـابگەڕێینەوە بـۆ بەهابـاد دەبێـت لای مامۆسـتاکەمان شـکاتت لێـبکەم. ئەم منداڵانە تەنها دوو ساڵ چوونە قوتابخانە، ئێستا دەیانەوێت شکاتمان لێبکەن و تووشـی کێشەمان بکەن.

خـۆر خەریـک بـوو ئـاوا دەبـوو، کـاک حەسـەن هەنـدێک قسـەی کـرد و پاشـان بیریکردەوە و گوتی: بەڵکو ئەم منداڵانە بخوێنن و گۆڕانکارییەک بەسەر بەهابادا بهێنن و بـاری نـاوچەکە بەرەو باشـتر بـبەن. منـداڵەکان دەڵـێن یەکێک لە مامۆسـتاکانیان پێـی گوتـوون. ئێـوە کە پارەتـان نییە و کەسـوکارتان نییەو مەڕو ئاژەڵتـان نییە و زەوی و

ئاوتان نییە، تەنها ڕێگەی ڕزگاربوونتان خوێندنە. ئەم مامۆستایانە بیری ئەم منداڵانەیان گۆڕیـوە، کــاک ڕەزا دەڵێـت مــن لەم پیــاوە (٢٠-٣٠) ســاڵە دەدەم، بەڵام یەکێکیــان دەمنـاکەنەوە. بەڵام ئەم منداڵانە شەپازللـەکیان لێدەم دەڵـێن لای مامۆسـتاکەمان و لای پـۆلیس شـکاتت لێـدەکەین. مـن کاتێـک لەگەڵ خەڵـکە بەتەمەنەکـان کێشـەیەکم بـۆ دروستدەبێت، دەیان جوێن بە خوشک و دایکیـان دەڵێم، ئەوان دەم نـاکەنەوە، بەڵام ئەم منداڵانە دوو سێ ساڵ چوونەتە قوتابخانە، ئەگەر گوێیان لە جوێنێک بێت دەجار جوێن دەڵێنەوە، ئەوان ئێمە بە پۆلیس دەترسێنن. هـاوین لە کێوە سـەربەرزەکانی کوردستانی عێــراق لە ژێــر خێمەیەکــی دڕاوی خراپــدا لەگەڵ سەردەســتەیەکی کەتیرەکەرانـــدا دانیشــتبووم ئەو دەیگـوت، ئەم منــداڵە (٨-١٠) ســاڵانە کاتێـک گەورەبــوون و بــوونە خوێندەوارێکی باش و تەمەنیان گەیشتە (٢٥-٣٠) ساڵ کاری گەورە و خزمەتگوزاریی باش پێشکەش دەکەن.

خۆر ئاوا ببوو، کەم کەم پیاوان ومنداڵانی کەتیرەکەر دەگەڕانەوە بۆ لای خێمە و کەپرەکانیان، هەموو هیلاک و ماندوو بوون، گەورەکانیان فەردە کەتیرەکانیان دەهێنا بۆ ناو خێمەکە. کاک حەسەن نزیکەی (٤٠) کرێکاری هەبوو، کرێکارەکانی دانشی سێ بەش بـوون، نـزیکەی (٤٠) کەس لەگەڵ دانشــی دا بــوون، دانشــی لێپرســراوی یەکەم بـوو، نزیکەی (٤٠) کەس لەگەڵ کاک حەسـەندا بـوون، و نزیکەی (٣٥) کەس لە ژێر دەسـتی کـاک ڕەزادا بــوون، کەتیرەکەیــان لەژێــر خــێمەکەدا دادەنــا. خۆشـیان لە دەوروبەری کەپرەکانیــان لەســەر گیــا و بەردەکــان بڵاودەبــوونەوە. خــێمەکە زیــاتر بــۆ پاراسـتنی کەتیرەکە بوو لە باران، کە گەلێک سـاڵ ڕوویـدەدا لە هاویندا بـاران دەبـاری. خـێمەکەش هی مەقسودخان بوو، بۆ ئەوە نەبوو خەڵکەکە لە ژێریدا پشـووبدات، کاتێک هێسـترەکان دەهاتن و کەتیرەکەیان باردەکرد. خێمەکان بەتاڵ دەبوون، جێگای چوار کەس دەبوو کە لە ژێـر خێمەیەکـدا بــخەون. ڕێکخسـتن و شـێوەی کـارکردن لەلای کـاک حەسـەنیش هەروەکو لای دانشـی بـوو، کارەکـان دابەشـدەکران، لە دوای کەتیـرە کۆکردنەوە دەبوو چەند کەسێک لە کانییەکە ئـاو بهێنن، سێ چوار کەسیش هەویریـان دەشـێلا و نانیـان دەکرد. دانشـی نیوەی قاورمەکەی کردبووە دەبەیەکەوە و هێنابووی بۆ گروپەکەی کـاک حەسـەن.. کـاک حەسـەن گـوتی: منـداڵان ئەمشـە و گۆشـتاوی قاورمەمـان هەیە و کـاک حسێن هێناویەتی.

شــەو بـوو، دنیــا تاریـک بـوو، ئەسـتێرەکان دەدرەوشــانەوە، ئــاگری تەنــوور و ئــاگردانەکە، ئەو ناوەیــان ڕوونــاک کردبــۆوە. لە دوورەوە دەنگــی ئــاژەڵە کێوەیەکــان

دەبیستـرا، لـوورە لـووری گـورگ و چەقەڵ دەهـات، لەلایەکـی تریشـەوە حەپە حەپـی سەگەل دەهات.

منیش لەسەر بەردێک دانیشتبووم، سەیری ئەو خەڵکەم دەکرد، کە ڕاخەریـان زەوی بـوو، سەربانەکەشـیان ئاسـمان بـوو، بیـرم لەوە دەکـردەوە کە مامۆسـتا بە منـداڵانی گوتووە ڕێگای ڕزگاری ئێوە تەنها خوێندنە. ئیتر زانیم کە ڕێگای ڕزگاری منیش تەنها خوێنـدنە. گـوتم: واباشـترە هەرچـی زووتـرە بگەڕێـمەوە بـۆ یەزد و لەوێ خەریکـی خوێندنی وانەکانم بم.

مـوتەرزا و عەزیـز هـاتنە لای مـنەوە، وەک ئەوەی کە پشـتیوانییەکیان بۆخۆیـان پەیداکردبێت، زۆر خۆشحاڵ بوون، لە چی خۆشـحاڵ بـوون، خۆیشـم نەمدەزانی، ڕەنگە لەوە خۆشحاڵ بووبن، کە من هیچم بەکاک حەسەن نەگوتووە. یا ڕەنگە لەوە خۆشـحاڵ بووبن، کە من قاورمەم بۆ بردون، یاخود لەوە خۆشحاڵ بوون، کە من سبەی لەگەڵیاندا دەچم بۆ گرتنی پەپوولە. لەپڕێکدا گوتم: منداڵان حەزدەکەن چیرۆکتان بۆ بگێڕمەوە، هەمووان گوتیان بەڵێ، بەڵێ.

لەسـەر بەردێک دانیشـتم و دەسـتم کرد بەگێڕانەوەی چیرۆکی ئەمیر سەرسـەلانی نـاودار، وردە وردە هەمـووان لـێم کۆبوونەوە تەنـانەت گەورەکـانیش هـاتن تـا گـوێ لە چیرۆکەکەم بگرن. کـاک حەسـەنیش هـاتە لامەوە و دانیشت، دەسـتمکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە، تەنهـا ئەوانەی کە خەریکـی نـان دروسـتکردن بـوون، نەهـاتن. گەیشـتمە ئەو شـوێنەی کە خـواجە نوعمـان دەگـاتە دوورگەی ناوەڕاسـتی دەریـاکە، لەو دوورگەیەدا دایکی ئەمیر ئەرسەلان بەتەنها لەوێ دەژیا.. هاواریان کرد، خواردن ئامادەیە.

هەمـووان چیرۆکیـان بیرچـووەوە، هەر کەسـە و قـاپێکی بەدەسـتەوە بـوو بەرەو مەنجەڵەکە دەڕۆیشتن، نزیکەی دوو کیلۆ قاورمەی گۆشـت بـۆ (٤٠) کەس ئامـادەکرابوو، تەنـانەت پەتاتەیەکیشـی تێنەکرابـوو، بەڵام نـزیکەی یەک مەن (٦ کیلـۆ) گیـای کیوییـان تێکردبوو، هەر ئەو گیـایە تـامی گۆشـتاوەکەی زۆر خۆشـتر کردبوو. مورتەزا و عەزیز لەلای مـنەوە دانیشـتبوون، نانەکەیـان لە گۆشـتاوەکە گوشـی، هەربەدەسـتی خـۆلاوی و خوێناوییەوە خواردنەکەیان دەخوارد.

مرۆڤ پێویستە لەم شـوێنانە بێت و خەڵکانی برسـی ببینێت. کاتێک هەمووان تێر بوون لەسەر بەردەکان دانیشتن و گوتیـان کاکە حسێن لەسـەر چیرۆکەکە بەردەوامبە. کـاک حەسـەن گـوتی: لێیگەڕێن باجـارێ نـانەکەی بخـوات، گـوتم: قەینـاکە دوایـی نـانەکە دەخۆم.

ده‌ستمکرده‌وه به‌گێڕانه‌وه‌ی چیرۆکه‌که، به‌ده‌م گوێگرتن له چیرۆکه‌که‌وه ورده ورده هه‌ریه‌که و له‌لایه‌که‌وه خه‌ویان لێکه‌وت. منداڵه‌کان وه‌ک ئه‌وه وابوو که سه‌د ساڵه خه‌ویان لێکه‌وتبێت. شه‌و دره‌نگ ببوو ئه‌وانه‌ی که خه‌ویان لێنه‌که‌وتبوو پێمگوتن، سبه‌ی شه‌و پاشماوه‌ی چیرۆکه‌که ته‌واوده‌که‌ین. ئه‌وانه‌ی که هێشتا خه‌ویان لێنه‌که‌وتبوو، له‌جێگای خۆیان هه‌ڵسانه سه‌رپێ و به‌ره‌و که‌پره‌کانیان ڕۆیشتن. کاک حه‌سه‌ن له به‌رده‌می خێمه‌که‌دا چه‌ند گونییه‌یه‌کی ڕاخست و به‌تانی زیاده نه‌بوو، له نێو که‌پره‌که‌دا به‌تانییه دڕاوێ که‌سێکی تری هێنا بۆ من که خۆی له هیلاکی و ماندووبووندا خه‌وی لێکه‌وتبوو. که‌شێکی خۆش بوو، به‌ڵام به‌ری به‌یانی سارد ده‌بوو، نه‌مزانی چۆن بوو هه‌موان منیان بێدارکرده‌وه، ئاگر کرابوه‌وه بۆ ئاماده‌کردنی به‌رچایی، به‌یانی زه‌رده له‌سه‌ر که‌لی شاخه‌کانی دابوو، من و مورته‌زا و عه‌زیز له‌سه‌ر ڕووباره‌که له به‌رده‌می تاڤگه‌که‌دا بووین بۆ گرتنی په‌پووله. ئه‌وان به شوڵکه‌داری دارستانی قه‌راخ ڕووباره‌که سه‌به‌ته‌یه‌کی گه‌وره‌یان دروستکردبوو، که په‌پووله‌کانیان به‌م سه‌به‌ته‌یه ده‌گرت. به‌کارامه‌ییه‌کی باوه‌ڕ پێنه‌کراوه‌وه سه‌به‌ته‌که‌یان به‌سه‌ر په‌پووله‌کاندا ده‌دا و زۆر ئازایانه په‌پووله‌کانیان ده‌گرت، من لانیکه‌م (١٠-١٢) په‌پووله‌م هه‌ڵفڕاند تا توانیم یه‌ک په‌پووله له ژێر سه‌به‌ته‌که‌وه بگرم. تا نیوه‌ڕۆ نزیکه‌ی (٣٠) په‌پووله‌مان گرت، بڕیارماندا من و مورته‌زا بچینه لای ئه‌شکه‌وته و په‌پووله‌کان به‌سه‌ر گه‌ڵادا چه‌سپ بکه‌ین، عه‌زیزیش بڕوات بۆ کۆکردنه‌وه‌ی که‌تیره، گوتیان ده‌بێت کاتی نیوه‌ڕۆ توبه‌ره‌کان پڕبکه‌ن له که‌تیره و بیبه‌ینه‌وه لای کاک مه‌حه‌ممه‌د که له ژێرچاودێری کاک حه‌سه‌ندا بوو، په‌پووله‌کانمان به‌سه‌ر گه‌ڵاوه چه‌سپکرد، مورته‌زا گوتی: باب‌ڕۆین که‌تیره کۆبکه‌ینه‌وه، وا بڕیار بوو که منیش هاوکارییان بکه‌م، ده‌ست و په‌نجه‌کانی ئه‌و ئه‌وه‌ند زبر ببوون و له‌په‌ده‌ستی وشک و ڕه‌ق ببوون، به‌ڵام ده‌سته‌کانی هه‌ر به‌دڕکی که‌تیره و دڕکه‌کانی تر خوێنیان لێده‌هات، ده‌سته‌کانی من بۆ ئه‌م کاره شیاو نه‌بوون، هه‌ر وه‌ک دوو ڕۆژ له‌وه‌وپێش خوێنیان لێده‌هات، ده‌مویست هه‌ر دڕکێک به‌ده‌ستمدا بچێت به خێرایی ده‌ریکه‌م، عه‌زیز گوتی: لێیگه‌ڕێ دڕکه‌کان خۆیان له‌ده‌ستت دێنه ده‌ره‌وه، ئێستا پێویسته به‌خێرایی که‌تیره کۆبکه‌ینه‌وه، ده‌نا لێدان ده‌خۆین، دوانیوه‌ڕۆش هه‌ر هاوکاریم کردن، نیوه‌ڕۆ یه‌ک پارچه نانی وشکیم خواردبوو، دوانیوه‌ڕۆش نزیکه‌ی یه‌ک کاتژمێر خه‌ریکی په‌پووله گرتن بووین، پاشان عه‌زیز په‌پووله‌کانی به گه‌ڵاکه‌وه چه‌سپ کرد. من و مورته‌زا ڕۆیشتین بۆ کۆکردنه‌وه‌ی که‌تیره. مورته‌زا گوتی: ده‌زانی؟ گوتم: چی ده‌زانم؟ گوتی: به‌ڕاستی پێتبڵێم، گوتم: ئا، ئا پێیم بڵێ.. گوتی: من و عه‌زیز هه‌ندێک ڕۆژ بۆ گرتنی په‌پووله تا نزیکی گوندی کورده‌کان ده‌ڕۆین، گونده‌کانی (دارشمانه) یا

(کانیلان). دوو سێ جار کات درەنگ بوو، ئێمە کەتیرەمان کۆنەکردبوەوە. دەمانزانی ئەگەر بەبێ کەتیرە بگەڕێینەوە، کاک مەحمود لێمان دەدات، هەر بۆیە بەهێواشی چووینە ناو خێمەی کوردەکان و کەتیرەکانی ئەوانمان دزی. چوار ڕۆژ ڕۆیشتین کەتیرەی کوردەکانمان دزی، ڕۆژێکیان چەند کوردێک ئێمەیان گرت و ئەوان دەستیان کرد بە لێدانمان و ویستیان لای خۆیان دەستبەسەرمان بکەن، ئێمەش دەگریان و لە زمانیان تێنەدەگەیشتین، باشبوو، چەند ژنێکی کورد هاتن و لەگەڵ پیاوەکاندا کردیان بەشەڕ و کەتیرەکەش کە هی خۆیان بوو، دایان بە ئێمە و نان و ڕۆنەکەرەشیان داینێ. کورەدەکان زۆر میهربانن، ئێمەش چەند ڕۆژێک لەوەدوا چەند پەپوولەیەکی جوانمان گرت و دامان بە کوردەکان، ئیتر کەتیرەی ئەوانمان نەدزی. ئێستاش بەچەند ڕۆژ جارێک، دەچینە لای ئەوان و، ئەوانیش نان و ڕۆنەکەرەمان دەدەنێ و ئێمەش دەیخۆین، ئەگەر تۆ سبەی بمێنیتەوە دەچینە لای کوردەکان. گوتم: من سبەی دەچم بۆلای دانشی. مورتەزا گوتی: ئاگات لە خۆت بێت لەگەڵ مێگەلە مەڕەکاندا سەگی دڕ هەیە و ئەوانە زۆر ترسناکن و پەلاماری خەڵکی دەدەن. ئەو شەوەش لە بەردەمی خێمەکە خەریکی گێڕانەوەی چیرۆکی ئەمیر ئەرسەلان بووم، خواردنی ئەو شەوەش نانی وشک بوو بە نیو پەرداخ چاوە. بەڵام چ چایەک تەنها کەمێک زەرداو بوو، بۆ هەر کەسێکیش سێ کڵۆ شەکریان پێدەدا، وا بڕیاربوو من سبەینێ لەگەڵ خاوەنی هێسترەکان کە بۆ بردنی کەتیرە دەهاتن، بچم بۆ شوێنە نوێکەی دانشی، کە لەوێ خێمەی هەڵدابوو، بەیانی زوو عەزیز و مورتەزا هاتنە لام و بێدەنگ وەستان و هیچ قسەیەکیان نەدەکرد، و چاوی نیگەرانییان لە من بڕیبوو، دەیانویست من ڕێگاچارەیەک بدۆزمەوە بۆ پەپوولەکانیان. چاوەڕوان بوون کە من شتێکیان پێبڵێم، گوتم: دەتانەوێت لەگەڵ دانشی سەبارەت بە پەپوولەکانتان قسەبکەم. هەردووکیان بەیەکەوە هاواریان کرد نا.. نا نەکەیت پێی بڵێیت، لێمان دەدات. گوتم: باشە هیچ قسەیەک ناکەم تا بزانم چی ڕوودەدات. مورتەزا لە ژێر کراسەکەیدا یەک گەڵای گەورەی دەرهێنا کە چەند پەپوولەی جوانی پێوە چەسپ کرابوو، دەستی درێژکرد بۆ لای من و گوتی: ئەوە بۆ تۆ. عەزیز گوتی: باشی هەڵبگرە، منیش خستمە ناو جلکە کوردییەکانمەوە. مورتەزا گوتی: هەر دەبێت بیگرم. گوتم: چی بگریت؟ گوتی: ئەو پەپوولەیەی کە لە چۆلەکەیەک گەورەترە و زۆر جوانە وەکو.. وەکو... بەڵام نەیتوانی بڵێ وەکو چی.

هەتاو دەرکەوت، دەبوو ڕێگابگرینە بەر بۆ کۆکردنەوەی کەتیرە. مورتەزا و عەزیز ڕۆیشتن و لە پشتی برە کەتیرەکانەوە ون بوون، تا تەواو دوورکەوتنەوە هەر سەیریان دەکرد تا من ببینن. من لەلای خێمەکە قسەم لەگەڵ کاک حەسەن دەکرد، ئەو باسی

یادەوەرییەکـانی خـۆی بـۆدەکردم، پـاش سـێ کـاتژمێر سـێ پیـاوی کـورد بەچەنـد هێسترێکەوە پەیدابوون. دوای ئەوەی چایـان خـواردەوە و کەتیرەکەیـان بـارکرد، منیش لەگەڵ ئەوانـدا ڕێگامـان گـرتەبەر بەرەولای دانشـی. لە ڕووبـارەکەوە تێپەڕین. هەمـوو خولەکێک لە بیری ئەوەدا بووم، کە ئێستا ورچەکەمان لێ پەیدا دەبێتەوە. بەهۆی ئەوەی لەگەڵ سێ کوردی ئـازادا بـووم زۆر نەدەترسـام. دوو سێ جـار ئەو سـەگانەی لەگەڵ مێگەلە مەڕەکاندا بوون، پەلاماریان داین، بەڵام هیچیان پێنەکرا، پاش ماوەیەک گەیشتینە کیوی بڵفەت، خێمەکەی دانشی دەرکەوت، ئەمجارە خێمەکە لەسەر کانیاوێک هەڵدرابوو. لە ڕێگـادا چـاوم لێبـوو، کەتیرەکەران خەریکی کۆکردنەوەی کەتیـرە بـوون، بەرەنـگ و ڕوویەکی پەڕیوەوە بەپێی پەتی توبەرەیان لە مل کردبوو.

لەلای دانشـی خـاوەن هێسترەکان چایان خـواردەوەو کەوتنەڕێ، ئەوان دووشـەممە یـان سێشـەممەی داهـاتوو دەهـاتنەوە و ئاردیـان دەهێنـا و کەتیرەیـان دەبـردەوە، منیش دەبوو یا ئێستا لەگەڵیاندا بڕۆیشتمایە یـا چەنـد ڕۆژێکـی تـر، چاوەڕوانی بکەم. لەپڕێکدا گوتم: دەچمەوە بۆ سەردەشت و لەوێوەوە دەچم بۆ شنۆ تا جارێکی تر چـاوم بەو کچە شـنۆییە بکەوێـتەوە. دووبـارە لە دڵـی خۆمـدا گـوتم دیـارە مـن تێهەڵـدانم هـاتوو، خـۆ یەزدییەکـان لێکدانەوەیان بـۆ هەمـوو شـتێک هەیە، تەنـانەت لەتەمەنـی (١٥) ساڵیشـدا بـۆ بینینی کچێک دەبێت لێکدانەوەت هەبێت، بیرکردنەوە شـتێکی باشـە، لە کۆتاییدا بڕیارمـدا چەند ڕۆژێکی تر لەوێ بمێنمەوە. دوبارە شەو لەبەردەمی خێمەکەدا دانیشـتم و سـەیری خواردنی نانی وشکی ئەو بەدبەختانەم دەکرد. دانشی گـوتی: کـاکە حسـێن جگە لە نـانی وشک و چا هیچ شتێکی ترمان نییە! گوتم: منیش وەکو ئێوە هەمـان شـت دەخـۆم. مـن دوبـارە چیرۆکـی ئەمیـر ئەرسـەلانم بـۆ ئەمـانیش گێـڕایەوە. سـبەی دوسـبەیش هـیچ ڕووداوێکـی ئەوتـۆ نەبـوو، ڕۆژانە لەگەڵ ئەسـغەر و چەنـد منـداڵێکی تـر دەڕۆیشـتم، چیرۆک گێڕانەوەی من بووە هۆی ئەوەی کە هەمووان زیـاتر بمناسـن. مـن لەم بـابەتەدا سوودمەند بووم، چەند کەسێکم لە دەوری ئەسـغەر کۆکردەوە، بڕیارماندا کە ئەسـغەر نیوەی ڕۆژەکە گیادەرمانی کۆبکاتەوە و نیوەکەی تریش کەتیـرە کۆبکـاتەوە. منداڵەکانی تریش هەر یەکە و کەمێک لە کەتیرەکەی خۆیان بدەنە ئەسـغەر تـا لێدان نەخوات. بەڵام لەبری ئەوە ئەسغەر چییان بداتێ؟ دیارە هیچ.

سێ ڕۆژ بوو من لەلای کاک حەسەنەوە هاتبوومەوە بۆ لای دانشی، بڕیار بوو پـاش دوو ڕۆژی تر لەگەڵ کاروانی هێسـترەکاندا بچمەوە بـۆ سـەردەشـت و لەوێوە بـڕۆمەوە بۆ یەزد. بەیانی یەکێک لە کرێکارەکانی کاک حەسـەن بەهەڵەداوان بەرەو لای ئێمە هـات، گەنجێک بـوو تەمەنـی نـزیکەی (٢٠) سـاڵ دەبـوو، لە دوورەوە کە هـات ئەو منـی ناسـی

سڵاوم لێکرد و لێم پرسیم ئەوە چی ڕوەویداوە.. وابە خێرایی ڕادەکەی؟ گوتی: مورتەزا دوو شەوە نەگەڕاوەتەوە بۆ خێمەکە. دوو شەو و ڕۆژە ونبووە چەند بۆی گەڕاوین نەمان دۆزیوەتەوە، کاک حەسەن منی ناردووە تا هەواڵ بدەمە دانشی.

بەم هەواڵە زۆر نیگەران بووم، منیش لەگەڵ ئەودا چووم بۆلای دانشی، دانشی بەبیستنی هەواڵەکە زۆر نیگەران بوو، گوتی: چۆن منداڵێکی (١١) ساڵ، دوو شەو و ڕۆژە ونبووە؟ دانشی داردەستەکەی هەڵگرت و خێمەکەی بە کەسێک سپارد، لەگەڵ کوڕە گەنجەکەدا ڕێگایان گرتەبەر بەرەو لای کاک حەسەن. بە دانیشیم گوت منیش دێم لەگەڵتاندا، منیش داردەستێکم هەبوو، داردەستەکەم هەڵگرت و لەگەڵیاندا ڕۆیشتم، گەیشتینە ڕووبارەکە و ویستم بە دانشی بڵێم، مورتەزا و عەزیز پەپوولە دەگرن، پاشان گوتم با باسی ئەم بابەتە نەکەم جارێ، تا دەچینە لای کاک حەسەن بەڵکو تا دەچینە ئەوێ مورتەزا دۆزرابێتەوە، لە ڕێگادا تووشی دوو شوانی کورد بووین، دانشی شوانەکانی تێگەیاند کە منداڵێکیان نەدیوە؟ گوتیان کەسمان نەدیوە. کاتژمێر یەکی دوانیوەڕۆ گەیشتینە لای کاک حەسەن، کاک حەسەن زۆر نیگەران بوو، گوتی: هەموو شوێنێک گەڕاوین، لە سەری کێوەکەوە تا دامێنی کێوەکە و تەواوی ڕووبارەکەش. مورتەزا بۆتە ئاو و چووەتە ژێر زەوییەوە، کاک ڕەزایش لەوێ بوو، گوتی: ئەمڕۆ سێ ڕۆژە ئەم منداڵە لەکار و کاسپی کردوین و ژیانی لێکردووین بە ژەهرە مار، لەو کاتەدا کە دانشی لەگەڵ سەرپەرشتیارەکاندا دانیشتبوو، من بەخێرایی بەرەو ئەشکەوتەکە ڕۆیشتم. هاوارمکرد مورتەزا، عەزیز، ئێوە لە کوێن؟.. عەزیز پەیدا بوو، کاتێک چاوی بەمن کەوت، دەستیکرد بە گریان، گوتی: مورتەزا ونبووە. گوتم: تۆ نازانیت بۆ کوێ چووە؟ گوتی: سێ ڕۆژ لەمەوپێش کاتی نیوەڕۆ بوو، نۆبەی ئەو بوو کە بچێت پەپوولە بگرێت، گوتی دەڕۆم ئەو پەپوولەیە دەگرم کە لە چۆلەکە گەورە ترە! بەڵام ئیتر نەگەڕایەوە. گوتم: ئەو پەپوولەیەی کە لە چۆلەکە گەورەترە لە کوێیە؟ گوتی: پەپوولە گەورەکان زیاتر لەسەر ڕووبارەکە و تاڤگەکە دەبینرێن. گوتم: دەبێت بچم بە دانشی بڵێم کە مورتەزا چۆتە سەر تاڤگەکە بۆ گرتنی پەپوولە، عەزیز باوەشی پیاکردم و دەستیکردەوە بەگریان و گوتی: بەخودا پێیان بڵێیت ئەوان لە من دەدەن. گوتم: من ناهێڵم لێتبدەن، چونکە دەبێت هەرچۆنێک بێت مورتەزا بدۆزینەوە. ئەگەر ڕاستییەکان بەوان نەڵێین ناتوانین مورتەزا بدۆزینەوە. عەزیز زۆر پێداگری کرد، کە هیچ بە سەرپەرشتیارەکان نەڵێم، چونکە زۆر ترسابوو، دەیگوت مورتەزا بە پەپوولە گەورەکەوە دەگەڕێتەوە ئەو ئێستا بەدوای ئەو پەپوولەیەدا دەگەڕێت، بەهەرحاڵ عەزیزم هێنایە سەر ئەو باوەڕەکە ڕاستییەکە بەسەر پەرشتیارەکان بڵێم و ئەوم لەگەڵ

خومدا برد بۆ خێمەکەی کاک حەسەن. دانشی لەگەڵ کاک حەسەن و کاک ڕەزا دا دەیانویست بچن بۆ گوندی کانیلان بۆ لای کوردەکان، دەیانویست بۆ دۆزینەوەی مورتەزا داوای هاوکاری لە کوردەکان بکەن. کاک حەسەن ڕۆژی پێشوو کەسێکی نارد بوو بۆ گوندی سامۆ، ئەوانیش هیچ هەواڵێکیان نەزانی بوو، من باسی پەپوولەگرتنی عەزیز و مورتەزام بە دانشی و سەرپەرشتیارەکان گوت. دانشی سەرەتا گلەیی لە من کرد، کە بۆچی پێشتر باسی پەپوولەگرتنی ئەو دووانەم بۆ نەکردووە. دانشی بانگی چەند گەنجێکی کرد، چەند کەسێک هاتن و هەموومان هەشت کەس دەبووین، عەزیز پێشمانکەوت بۆلای سەرچاوەی ئاوەکە، پاش ماوەیەک گەیشتینە تاڤگەکە. تاڤگەکە بڵند بوو، ئاوەکە لە بەرزیی پێنج مەترەوە دەڕژایە خوارەوە. هەموولایەک گەڕاین، بەڵام مورتەزامان نەدۆزیوە. کاتژمێر نزیکی چواری دوانیوەڕۆ بوو، کە عەزیز، ئێمەی بردە لای هەڵدێرێکەوە، ئەم هەڵدێرە دیمەنێکی زۆر جوانی هەبوو، بەڵام ترسناکیش بوو، بەرزییەکەی (١٥-٢٠) مەتر دەبوو، شاخەکە بەشێوەی دیوارەیەکی ڕاست بەرزبووەوە.

لەسەر هەڵدێرەکە چەند بڕە گوێنی کەتیرە هەبوو، کە پەپوولەکان لەو شوێنەدا هاتوچۆیان دەکرد و باڵیان لەیەک دەدا، تیشکی زێرینی هەتاویش لەباڵەکانی دەدان و جوانییەکی سەرنجڕاکێشی دروستدەکرد. لەناکاو کاک ڕەزا گوتی: مورتەزا ئەوەتا کەوتۆتە خوارەوە و کراسەکەشی بەبەردەکانی هەڵدێرەکەوە نووساوە، ئیتر بۆماندەرکەوت کە ئەو داماوە لەسەرەوە کەوتوتە خوارەوە و مردووە. دەبوو دەورێکی باش بسوڕاینایەتەوە بەدەوری شاخەکەدا تا بگەینە خوارەوە، بۆلای تەرمەکە. دووان لە گەنجەکان ڕۆیشتنە پێشەوە، دانشی گوتی: ئاگاداری خۆتانبن هەڵنەدێرێن، خۆر لە ئاوابووندا بوو، ئێمەش گەیشتینە خوارەوە، بڕە گوێنی و جۆرەها گیا ئەو ناوەی داپۆشی بوو، گەنجەکان دەگریان و هاواریان دەکرد، مورتەزا، مورتەزا، لەناکاو لە ژێر بڕە گوێنییەکدا، چەند چەقەڵێک دەرپەڕین و ڕایانکرد. لاشەی تێشکاو و ردبووی مورتەزا لەوێ کەوتبوو، دیمەنێک لەمە کارەساتبار تر تەنها لە ساڵی (١٣٥٧-١٩٧٨) لە سەرەتای شۆڕشدا لە نەخۆشخانەی قائیمی مەشهەددا بینیم، لەدوای سووتانی سینە ئەفریقادا. کە چەند تەرمێکی سووتاویان لە حەوشی نەخۆشخانەکە دانابوو. چەقەڵەکان تەواو گۆشتی لاشەکەیان خواردبوو، ئێسقانەکانشی هەمووی شکابوون، بەڵام بەدەموچاو باش دەناسرایەوە، چەقەڵەکان جلەکانیان لەبەریدا دڕاندبوو، هەموومان بۆماوەی دوو خولەک بەدیارییەوە وەستابووین، لەناکاو دانشی گوتی: چاک ماڵوێران بووین... ئێستا چی بکەین؟ هەر کەسە و قسەیەکی دەکرد، لەنێو خاکی کوردستانی عێراقدا، لەپاڵ هەڵدێرێکی جوان و سەرنجڕاکێش و ترسناکدا منداڵێکی گوندەکانی

بەهابادی یەزد لە پێناوی عیشق و خۆشەویستی بۆ پەپوولەدا هەڵدێرا و هەلا هەلا بوو. کاک ڕەزا هاواریکرد: ئەمە هەمووی تاوانی مامۆستاکانیانە کە ئەم منداڵە ئاوای بەسەرهات. کاک حەسەن گوتی: پاش یەک کاتژمێری تر ئێرە تاریک دەبێت، هەر کارێک بکەین دەبێت ئێستا و بەزوویی ئەنجامی بدەین، با هەرچی زووە تەرمەکەی هەڵگرین و بگەڕێینەوە بۆ لای خێمەکە، تەرمەکە کەمێک بۆنی کردبوو، کاک ڕەزا کراسەکەی خۆی داکەند و لە تەرمەکەی پێچا و خستیە سەرشانی و بەڕێکەوتین.

دانشی دەیگوت ئێستا چی بکەین؟ چۆن وەڵامی پۆلیس بدەینەوە؟ کاک ڕەزا گوتی: وەرە با کارێک بکەین ئەم منداڵە بێ کەسوکارە دایکێکی نەخۆش و دوو خوشکی لە خۆی بچووکتری هەیە، باوکیشی مردووە و هیچ کەسی تری نییە، هەر لێرە بەخاکی دەسپێرین و کە گەڕاینەوە هەمووومان سوێند دەخۆین کە ونبووە و نەمان دۆزیوەتەوە. هیچ بە پۆلیس یش ناڵێین.

دوای تەواوبوونی کەتیرە دەچینەوە گوندەکەمان و بەدایکی دەڵێین، کە مورتەزا ونبووە، کاک ڕەزا کە تەرمەکەی لەسەر شان بوو، گوتی: بیرێکی باشە، بەڵام چۆن وەڵامی قوتاخانەکەیان بدەینەوە؟ مەگەر ئەوان وازمان لێدەهێنن، سەرەتای مانگی مهر (ئەیلول) قوتابخانە دەکرێتەوە، ئەو کات مامۆستاکان دەڵێن ئەم قوتابییەی ئێمە چی لێهات و لە کوێیە؟ ناچار پۆلیس ئاگاداردەکەنەوە. پاشان لێکۆڵینەوە دەستپێدەکات، بۆیە دەبێت ڕێگە چارەیەکی تر بدۆزینەوە، یەکێک لە گەنجەکان تەرمەکەی لە کاک ڕەزا وەرگرت. تەرمەکە لە نێوان کاک ڕەزا و گەنجەکەدا دەستاو دەستدەکرا، دنیا تاریک ببوو دامێنی چیا و شیو و دۆڵی پڕ لە دار و درەخت زۆر تاریک بوو. کاک حەسەن شخارتەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و برە گوێنیەیەک وچەند پارچە دارێکی ئاگرتێبەردا بەو ئاگرە ڕێگاکە ڕووناک بوەوە، ڕێگا ڕۆیشتن ئاسانتر بوو. کاتژمێر نۆ و نیوی شەو بوو ئاگری خێمەکەمان لێدەرکەوت، منداڵانیش ئاگرەکەی ئێمەیان بینی و بەرەو پیری ئێمە هاتن. بەگریان و زارییەوە گەیشتینە لای خێمەکە. تەرمەکەیان لەسەر زەوی دانا، دانشی گوتی: بەتانییەک بەسەر تەرمەکەدا بدەن. عەزیز لەسەر زەویەکەدا دانیشتبوو، قاچەکانی مورتەزای گرت بوو دەگریا، ئەوەندە گریا بوو دەنگی دەرنەدەهات. لە خودا و لە ئیمام عەباس دەپاڕایەوە تاکو مورتەزا زیندوو بکەنەوە. دانشی و سەرپەرشتیارەکان رامابوون نەیاندەزانی چی بکەن، دووان لە گەنجەکان چووبوون سەیری تەرمەکەیان کردبوو، کە لە ژێر برە گوێنییەکەدا دانرابوو، توشی ڕشانەوە و هێڵنج ببوون، کاک ڕەزا زۆر توڕە بوو دەستیکرد بە جوێنپێدانیان و گوتی: مەگەر من پێم نەگوتن نەچنە سەر تەرمەکەی و سەیری نەکەن، کاک ڕەزای برسی و ماندوو زۆر توڕە ببوو، جوێنی

بەخۆی و قوتابخانەش دەدا، جوێنی بەخێڵ و تایەفە و هەموو کەتیرەکەران دەدا. هەروەها جوێنی بەدایک و باوکی خۆیشی دەدا، کە ئەویان دروستکردووە، جوێنی دەدا بە بازرگانی بازاڕ، کە نانی ئەوانە دەخۆن. تەنانەت جوێنی بەشاهنشاش دەدا و وردە وردە خەریکبوو جوێن بە خوداش بدات. لەناکاو پەلاماری عەزیزیدا و دەستیکرد بە لێدانی، زۆر بەزەحمەت لە ژێر دەست و پێیدا دەرمانکرد و جوێنی بە باوک و باپیری عەزیز دەدا. سەیرمکرد عەزیز دەلەرزێت و گێژبووە، دەمچاوی سووربووەوە، لێمپرسی هیچت خواردووە؟ گوتی: لەوکاتەوە کە مورتەزا ونبووە، تائێستا نانی وشکیشم نەخواردووە. منیش دەستیم گرت و بردمە ناو خێمەکەوە، نیو قاپ شەکراوم گرتەوە، و دەرخواردمدا، ئەژنۆی خەمی لە باوش گرتبوو. زۆربەیان نانی وشکیان نەخواردبوو، هەرکەسە و قسەیەکی دەکرد و هەرکەسە ڕێگاچارەیەکی پێشنیار دەکرد. کاک حەسەن گوتی: پار کە ورچ ئەو گەنجەی لە شنۆ کوشت چووینە لای پۆلیسی شنۆ و ڕاستیەکەمان پێگوتن، دانشی گوتی: یەکەم ئەو گەنجە لە نێو خاکی ئێراندا مردووە، پاشان تەمەنی (٢٢)ساڵ بوو، خۆی لێپرسراوی خۆی بوو، بەڵام ئێرە خاکی عێراقە، ئەم منداڵە تەمەنی (١١) ساڵە و ئێمە بۆکار لەگەڵ خۆماندا هێناومانە، پێمان دەڵێن بۆچی بەبێ مۆڵەت چووینە نێو خاکی عێراقەوە و بۆچی و بۆچی و بۆچی... هەمووان ماندوو، برسی و توڕەبوون لە دواییدا کاک ڕەجەب، کە لە هەمووان بەتەمەنتر بوو، گوتی: خۆ ئێمە ئێستا (١٠٠) کەس بەکوشت نادەین، کە کەسێک ڕۆیشتووە پەپوولە بگرێت و لە شاخ هەڵدێراوە و مردووە، تکایە سەڵاوات لە دیداری پێغەمبەر لێدەن. هەمووان سڵاواتیان خوێند، گوتی: فاتیحا بخوێنن. هەمووان فاتیحامان خوێند. گوتی: چا ئامادەیە، فەرموون چا بخۆن، فەرموون نانەکەتان بخۆن. سبەینێ تەرمەکە دەبەینە سەر سنوور و کەسێک دەنێرین بەدوای مەقسودخاندا، کە تەکبیرێک بکات. ئێمە لە بەدبەختی و هەژاریی و برسێتی و نەبوونی (٣٠٠) فرسەخ ڕێگامان بڕیوە و لەپێناو پاروووە نانێکدا هاتووین بۆ ئێرە، ئەگەر ئێمە لێپرسراوین ئەو بازرگان و دەڵاڵانەش تاوانبارن. دانشی گوتی: تۆ قسەی بێجێ دەکەیت ئەوان چییان بەسەر بازرگانانی قەزوێن و مەقسودخانەوە هەیە، ئەوان کێشەکەیان لەگەڵ ئێمەدایە. پاشان کاک ڕەجەب گوتی: ئێستا کاتی خەوە بەیانیش کاتی کارکردنە، هەمووان دەچن بۆ کارکردن. دوو سێ کەسمان تەرمەکە هەڵدەگرین و دەچین بۆ سەردەشت خۆ نامانکوژن. خۆ ئەگەر بشمانکوژن ئەوا باشتر، بەسنیە لەم ژیانە چەرمەسەرییە ڕزگارمان دەبێت، سڵاوات لێبدەن و بڕۆن بخەون، خۆیشی چەند گو نییەیەکی هێنا دای بەسەر تەرمەکەدا و چەند بەردێکی خستە سەر، گوتی: تەرمەکە کەمێک بۆنی کردووە، شەو ئاژەڵی کێوی لە

دەوری کۆدەبنەوە، مـن هەر لێـرە دەخەوم و ئێـوە بـڕۆن لە کەپرەکانتانـدا بـخەون، هەنـدێکیان نانیـان نەخواردبـوو، هەڵسـان و ڕۆیشـتن، عەزیـز و سـێ چـوار پیـاو هەڵتروشکابوون، منداڵێک کە لە هەمووان بچووکتربوو، تەمەنی لە هەشت ساڵ زیاتر نەبـوو دەگریـا. سـێ لە منـداڵەکان کە هـاوپۆلی مورتەزابـوون، لەلای عەزیـزەوە دانیشتبوون، منیش هەڵسام گونییەیەکم هێنا و ڕامخست و لەبەردەمی ئەو مندالانەدا لێی خەوتم. جیاوازیم لەگەڵ ئەومندالانە تەنها ئەوە بوو، من لەسەر گونییەیەک خەوتبووم و ئەوان لەسەر زەوی، کاتژمێر دەوروبەری یەکی شـەو بـوو، کە لە گریە و ناڵەی عەزیز بەخەبەرهـاتم، دنیـا تاریـک بـوو تەنهـا ئەسـتێرەکان و چـاوە بـێ ڕووناکییەکـانی عەزیـز دەدرەوشانەوە، پێمگوت: دەبێت پارووێەک نانی وشکی بخۆیت، دووپارچە نـانم بـۆ هێنا و چەند کلۆ شـەکرێکم پێبـوو ئەویشـم پێدا و نـانەکەی بەشـەکرەکەوە خـوارد، دوبـارە خەوتینەوە. سبەی بەدەنگی سەرپەرشـتیارەکان هەموومـان لە خەو هەڵسـاین. گوتیـان پەلەبکەن درەنگە وەک هیچ شتێک ڕووی نەدابێت، هاواریان کرد خێرا نانەکەتـان بخـۆن و بڕۆنەوە. سەرکارەکان گوتیان عەزیز تۆ لێرەبە مەچۆ بۆ کـارکردن تـۆ دەبێت لەگەڵ ئێمەدا بێیـت بـۆ سـەردەشـت، عەزیـز شـاهیدی ڕووداوەکە بـوو، ئەگەر پێویسـت بکـات، دەبێت ڕووداوەکە بە پۆلیس بڵێت. یەکێک لە گەنجەکان گونییەی تەرمەکەی لەژێر بەردا دەرهێنا، خستیە سەرشانی و کەوتینە ڕێگا بەرەو سەردەشت.

دانشی و کـاک ڕەزا و عەزیـز و مـن لەدوای گەنـجەکەوە کە تەرمەکەی لەسـەر شـان بـوو کەوتیـنەڕێ. کـاتژمێر حەوتـی بەیـانی گەیشـتینە لای خـێمەکەی دانشـی هەمـوو کرێکارەکان چووبوونە سـەرکار، چەند کەسـێک لە نزیـک خێمەکە بوون، کـاک مەحمـود چـای لێنـا، دانشـی لەگەڵ ئەویش کەوتە قسـەکردن، کـاک مەحمـود گـوتی: ئەگەر لە مـن دەپرسی؟ هەمـوو ئەو مندالانەی کە لە قوتابخـانەن بەزوویی بنێرەوە بۆ بەهاباد ئەوان لێرە کێشە دروستدەکەن لە ژێر هەر بەردێکدا کتێبکیـان دانـاوە. لە دەوری کـۆدەبنەوە و کتێب دەخوێننەوە، ئەمانە زمـان درێژیمـان لەگەڵ دەکەن، مامۆسـتاکانیان پێیـانگوتون کە بەقسـەمان نەکەن و لاسـاریی بـکەن، ئەم منـداڵە ئامۆژگـاری مامۆسـتاکەی چـووەتە مێشیکیەوە و خۆی بە کوشتداوە و ئێمەشـی تووشـی دەردیسـەری کـردووە. خـۆ ئێسـتا دیار نییە کە چیمان بەسەر دێنن، کـاک ڕەزا گـوتی: کتێبەکانیـان کۆبکەنەوە، مـن هەمـوو کتێبەکانم کۆکردونەتەوە و لە کەپرەکەی خۆمدا شـاردوومنەوە، لە کۆتاییدا بڕیاریاندا کە کاک ڕەزا، عەزیز و ئەسـغەر لەگەڵ خۆیـدا بباتەوە بۆ بەهابـاد، چونکە عەزیـز پەپوولە دەگرێت و ئەسـغەریش گیادەرمـان کۆدەکاتەوە. ئەم مندالانە جگە لە دەردەسـەری هـیچ سـوودێکیان نییە باشـتروایە بگەڕێنەوە بـۆ مـاڵەوە. کـاک ڕەزا دەبێـت هەواڵـی مەرگـی

مورتەزا بەدایکی بگەیەنێت، هەڵبەتە دەیانویست بەبردنی عەزیز و ئەسغەر بۆ بەهاباد دووشـاهیدیان هەبێـت. ئەوان دەترسـان، کە لە بەهابـاد بەهـۆی کەمتەرخەمیـانەوە لە چـاودێریکردنی ئەو منـداڵە دەسـگیربکرێن. پاشـان سەرپەرشـتیارەکان گوتیـان بـا بکەوینەڕێ بەرەو سەردەشت، بزانین لەوێ چی ڕوودەدات. دانشی کەسێکی بەشوێن ئەسغەردا نارد تابیهێنێتەوە، ئەسغەر بەترس و لەرزەوە هات، دانشی پێیگوت یەڵڵا بڕۆ. تەنانەت پێینەگوت، کە بۆ کوێ بڕوات و پێینەگوت کە شتومەکەکانی کۆبکاتەوە، خۆ هیچ شتێکی نەبوو تا کۆی بکاتەوە، تەنها خۆی و جلەکانی بەری بوون، دانشی گوتی: با بکەوینەڕێ کات درەنگە و هەواش خەریکە گەرم دەبێت، دانشـی هەموو شتەکانی بە کاک مەحمود سپارد وتووێژی زیاتر لەگەڵ ئەودا دەکرد، گوتی: ئەگەر پۆلیس کێشەیان بۆ دروستکردن کارەکان ڕووبەڕووی کاک حەسەن بکەنەوە، منیش بێدەنگ بووم، پێش کاتژمێر هەشتی بەیانی کە بەڕێکەوتین. من و ئەسغەر و عەزیز، دانشی، کاک ڕەزا و موارد ئەو گەنجەی کە تەرمەکەی هەڵگرتبوو، کەوتینەڕێ، ئەسـغەر زۆر نـاڕەحەت بـوو، عەزیـزیش دەگریـا، ئەسـغەر لە عەزیـزی پرسـی بـۆ کـوێ دەچـین؟ ئەو گو نییەیە چی تێدایە؟ بۆچی دەگریت؟ عەزیز گوتی: مورتەزا لە کێو هەڵدێراوە و مردووە. ئەسـغەریش هـاوپۆلی مـورتەزا و عەزیـز بـوو، ئەویـش دەسـتیکرد بە گریـان و هـاوار لە ڕێگـا دوادەکەوت، کاک ڕەزا چەند جارێک بـانگی کرد، کەری بەڕەڵا بۆدوا دەکەویت؟ پاشـان هەندێک لێدانی خوارد، قاچێکی پێڵاوی لەپێ دابوو بەڵام قـاچەکەی تـری بـێ پێڵاو بوو، قاچی بریندار ببوو خوێنی لێدەهات، دەبوو بەسەری پەنجە بڕۆیشتایە، هەموومـان تەواو هـیلاک ببـووین. لە ڕێگـادا گەیشـتینە خـێمەی کوردەکـان و کاسـە دۆیـان بـۆ هێنـاین و خواردمانەوە، کەمێک پشـووماندا، ژنێکی کورد کاتێک زانی، کە ئەو منداڵە لە شـاخەکە هەڵدێراوە دەسـتیکرد بە گریـان، کـاتژمێر نـزیکەی (١١) بـوو دانشـی گـوتی: هێواشـبن مەرزەکە چەند مەترێک لێمانەوە دوورە، دەبێت لەپاڵ دارەکانەوە بڕۆین. گوتی: مەترسن لەم لاوە پۆلیس نییە بەڵام بەوریاییەوە بڕۆن، کـاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ بوو هیلاک و ماندوو و تینوو، گەیشتینە ماڵی مەقسودخان.

ئەسغەر قاچی هەموو ببوو بەخوێن، عەزیزیش زۆر لەو باشتر نەبوو، لە ڕێگا چەند جارێک دانشـی و کـاک ڕەزا جانتاکەیـان لێوەرگرتم و بۆیـان هەڵگـرتم و یارمەتیانـدام. بەڵام ئەو گەنجەی، کە یەکڕاست تەرمەکەی هەڵگرتبوو، بێئەوەی کەسێک لێی وەربگرێت و هاوکاری بکات دەڕۆیشت. مەقسودخان لە ماڵ نەبوو، گوڵەخان لەماڵەوە بوو ئەو پێی سـەیر بـوو کە بـۆچی لەم کـاتەدا ئـێمە هـاتووین بـۆ شـار، گوڵەخـان بە میهربـانی و بەشـێوەی دایکـایەتی گـوتی: نانتـان خـواردووە؟ دانشـی تێیگەیانـد کە نەمـانخواردووە.

ئەویش خوانی ڕاخست و نان و پەنیر و کەرە و قاورمەی هێنا. ئەفزەڵی برای بەشیر پەیدابوو، ئەو لە مەهاباد دەیخوێند و فارسی دەزانی، دانشی لێی پرسی خان بۆ کوێ ڕۆیشتووە؟ ئەفزەڵ لە دایە گەورەی پرسی خان بۆکوێ چووە؟ گوڵەخان گوتی: دەبێت لەنێو شاردا بێت، چونکە ئەسپەکەی وا لەحەوشەکەدایە، دانشی بە ئەفزەڵی گوت بڕۆ خان بدۆزەرەوە. ئەفزەڵ هاوتەمەنی من بوو ئەو جلوبەرگانەی کە بەمنیان دابوو، لەبەرم کردبوو، هی ئەفزەڵ بوو، دانشی گوتی: تا خان نەیەتەوە ئەو بابەتە لای کەس باس مەکەن. تەرمەکەمان لە تەنیشت دیواری حەوشەکە دانابوو، تەرمەکە بۆنی کردبوو، سەگەکە دەستیکرد بە حەپە حەپ، گوڵەخان هەرچی دەیویست سەگەکە بێدەنگ بکات بەڵام بێدەنگ نەدەبوو. خان هاتەوە بۆماڵەوە، پاش چەند خولەکێک گوڵەخان تێگەیشت کە کارەساتێک ڕوویداوە، تا ئەو کاتە لە ماڵی مەقسودخان دا هیچ ژنێکی ترم نەبینی جگە لە گوڵەخان و چەند ژنێک کە دراوسێی ماڵی مەقسودخان بوون، لەناکاو (٧-٨) ژن و کچی کورد کە ژن و کچی مەقسودخان بوون، هاتنە ئەو ژوورەوە کە ئێمەی لێ بووین، گوڵەخان ئەسغەر و عەزیزی لەسەر بەردێک دانیشاند، تەشتێک ئاوی شلەتێنی هێنا و قاچی هەردووکیانی شۆرد، پارچە قوماشێکی سپی هێنا و لە قاچیانی پێچا، قاچێکی ئەسغەر زۆر بریندار ببوو، گوڵەخان هەر دوو منداڵەکەی ماچ کرد. مەقسودخان بە دانشی گوت بەڕێز شوشتەری بەڕیوەبەری بنکەی پۆلیس بە مۆڵەت ڕۆیشتووە، خودا بکات جارێ نەگەڕێتەوە، جێگرەی لەو باشترە.. خۆ ئەمەی کە ڕوویداوە تاوانی کەس نییە، بەڵام چوونە ناو خاکی عێراق و هێنانی کرێکارێکی (١١) ساڵە، خۆی لەخۆیدا تاوانە. خان لێیپرسین ئایا ئەم منداڵە کەسو کاری هەیە؟ کاک ڕەزا گوتی: باوکی مردووە و دایکشی نەخۆشە و جگە لە دوو خوشکی بچکۆلانە هیچ کەسی تری نییە، مەقسودخان و دانشی و کاک ڕەزا ڕۆیشتن بۆ بنکەی پۆلیس، ئەفزەڵ لە منی پرسی چی ڕوویداوە، گوتم: مورتەزا ڕۆیشتبوو پەپوولە بگرێت و لە شاخ هەڵدێراوە و مردووە. چەقەڵەکانیش ورگیان هەڵدڕیوە و دڵ و جەرگیان خواردووە، ئەفزەڵ گوتی: ئەی ئەم دوو منداڵەتان بۆچی هێناوە؟ گوتم: عەزیز خزمی مورتەزایە و بەیەکەوە پەپوولەیان دەگرت.. ئەمانە پەپوولەی زۆر جوانیانگرتووە، (٣) پەپوولەم پێبوو کە مورتەزا پێیدابووم، نیشانی ئەفزەڵم دا و پێمگوت: ئەسغەریش گیادەرمانی کۆدەکاتەوە. دانشی بەنیازە ئەم دوو منداڵە لەگەڵ کاک ڕەزادا بنێرێتەوە بۆ یەزد، چونکە دەڵێت ئەم منداڵانە بەکەڵکی کاری کەتیرە نایەن، خووی منداڵەکانی تریش خراپ دەکەن و خۆشیان بەکوشت دەدەن. ژنان و کچان لە دەوری ئەم دوو منداڵە کۆببوونەوە، گوڵەخان کەسێکی نارد کە جل و پێڵاویان بۆ بهێنن. گوڵەخان (٣٠-٤٠) منداڵ و نەوەی هەبوو،

پاش کەمێک دوو دەست جل و دوو جوت پێڵاو بۆ عەزیز و ئەسغەر ئامادەکرا. گوڵەخان ئاوی گەرمکرد و عەزیز و ئەسغەری لە تەشتێکی گەورەدا شۆرد و دووبارە قاچی ئەسغەری پاککردەوە و بە پارچە قوماشێکی دیکەی سپی بۆی پێچایەوە. ژنەکەی مەقسودخانیش هاوکاری گوڵەخانی دەکرد. هەر دوو منداڵەکەیان پاک شۆرد و خاوێنیان کردنەوە. (٥٠) ڕۆژ دەبوو کە لە کێوەکانی کوردستان بوون وخۆیان نەشۆردبوو.

منیش چەند ڕۆژێک بوو خۆم نەشۆردبوو. دەمگوت خۆزەکە منیشیان ئەوها بشۆردایە، بیرم لەوە کردەوە کە بچم بۆ حەمام، بەڵام دەمویست بزانم برادەران کە چوون بۆ بنکەی پۆلیس چیان کردوە. بە ئەفزەڵم گوت تکایە مەسینەیەک ئاو بهێنە با سەرم بشۆرم. سەرم لەلای حەوشەکەوە بەئاو و سابوون شۆرد. ئەوکاتە لەماڵەکاندا و تەنانەت لە شارە گەورەکانیشدا حەمام نەبوو، جا چ لە ماڵەکانی سەردەشت. ڕاستییەکەی کە سەرم شۆرد هۆیەکەی ئەوە بوو، کە دەمویست ئەو چەند مووەی لای سمێڵم بتاشم دەنا هۆی چڵکنی سەرم نەبوو.. ئەویش چونکە لە نێو ئەو کچانەدا کە دانیشتبوون دوو کچی (١٤-١٥) ساڵ هەبوون. ئەگەرچی لەو ڕووداوەی مورتەزا زۆر نیگەران بووم، بەڵام ئەمە نەببووە هۆی ئەوەی کە سەیری ئەو کچە جوانانە و جلوبەرگە کوردییە جوانەکانیان نەکەم.. دووبارە هەستی شنۆ کەوتەوە سەرم، گوتم: هەر ئەم کێشەیە لێرە کۆتاییهات، دەڕۆم بۆ شنۆ. تا چاوم بەو کچە چاوڕەشە جوانە بکەوێتەوە. ڕاستی ئەم دوو کچەش هەر زۆر جوان بوون. ئەم ژنانە چەندە میهرەبانن ئەی چۆن بە ئێمەیان دەگوت سوننەکان کەسانێکی خراپن، کەچی ئەم سوننانەی کە من دەیانناسم خەڵکانێکی زۆر بەڕێز و خزمەتگوزارن، ژنان و کچەکان (٣) پەپوولەکەی منیان لەنێوان خۆیاندا دەستبەدەست دەگێڕا و زۆریان بەلاوە جوان بوون. لە عەزیزیان پرسی، چۆن پەپوولەکان دەگیرێت؟ چۆن لەسەر گەڵا چەسپیان دەکات.. لێیان پرسی چەند پەپوولەی هەیە؟ عەزیز بە ئەفزەلی گوت و ئەویش بەزمانی کوردی بەئەوانی گوت، گوڵەخان لە ئەسغەری پرسی چ جۆرە گیایەکی کۆکردۆتەوە؟ عەزیز ناوی (٢٠-٣٠) جۆر گیای گوت و سوودەکانیشی پێگوتن، گوڵەخان سەری ئەسغەری ماچکرد و ئەسغەر دەستیکرد بەگریان. گوڵەخان لێیپرسی بۆچی دەگریت؟ ئەسغەر گوتی: ئەوەندە ئەرکم کێشا تا ئەو هەموو گیایەم کۆکردەوە، ئێستا هەمووی لە شاخەکە بەجێماوە و نزیکەی (١٠) فەردە دەبێت، ئێستا نازانم چۆن بیهێنمەوە، ئەو هەموو زەحمەتەم بەبەلاش ڕۆیشت. گوڵەخان و ژنەکەی مەقسودخان دڵنەواییان کرد و وردە وردە چەند ژنێکی تر لە خزم و کەسەکانی مەقسودخان هاتن، گوڵەخان بە کچ و نەوەکانی گوت

چایان بۆ تێبکەن. نزیکی خۆرئاوابوون بوو، کە دوو پۆلیس بەسواری ئەسپ لەگەڵ مەقسودخان هاتن، یەکێک لە پۆلیسەکان هەمان پۆلیس بوو کە زیوەکانی حاجی جەوادی کردە کیسەکەوە و لەگەڵ خۆیدا بردنی. پاش چەند خولەکێک، دانشی و کاک ڕەزا و مواردیش هاتن. مەقسودخان لەگەڵ ژنەکەیەدا قسەی کرد و چەند ژنێک لەگەڵیدا چوونە خانووەکەی ئەولاترەوە، دەرگایەک لە نێوان دووخانووەکەدا بوو، خانوویەک تایبەت بوو بە میوان، خانوویەکیش تایبەت بوو بە کەلوپەلی ناوماڵ و عەمباری شتومەک. گوڵەخان و ژنەکەی مەقسودخان و چەند ژنێکی بەتەمەن لامان مانەوە و ئەوانی تر ڕۆیشتنە خانووەکەی ئەودیو، ئێمە هەموو چووینە حەوشەکەوە. تەرمەکەیان هێنا و لە گو نییەکە دەریانکرد. تەرمەکە بۆنی کردبوو، تەنها هەندێک پێست و ئێسقان بوو، گوڵەخان و ژنەکانی تر دەستیانکرد بە گریان، تەنانەت پۆلیسەکانیش زۆر غەمبار بوون و بەخێرایی تەرمەکەیان خستەوە نێو گونییەکەوە. ئەوکاتە نایلۆن نەبوو، تەرمەکەیان خستە سندوقێکی شکاوەوە و خستیانە سەر هێسترێکی تایبەت و بردیان بۆ بنکەی پۆلیس، کاک ڕەزا و موراد مانەوە و نەڕۆیشتن، لە کاک ڕەزام پرسی چی بووە؟ گوتی: مەقسودخان پۆلیسەکانی هێنایە ئەم لاوە و لێکۆڵینەوەیان بەم جۆرە نووسیووە، کە منداڵێکی (١١) ساڵە بەناوی مورتەزا، لە کێوەکانی (هومل) لەنێو خاکی ئێراندا و لە نزیک مەرزی عێراق، لە کێوەکان ون ببوو، خەڵکی ناوچەکە یەک ڕۆژ بەدوایدا گەڕابوون، بەڵام نەیاندۆزییەوە. پۆلیسیان ئاگادارکردۆتەوە و نەقیب (م) چووەتە ناوچەکە و بەهاوکاری خەڵکی ناوچەکە کێوماڵێکیان دەستپێکرد بۆ دۆزینەوەی، ڕۆژی یەکەم نەتوانراوە بدۆزرێتەوە، ڕۆژی دووەم گەڕان بەردەوام بووە و بەئامادەبوونی نەقیب (م) تەرمەکە دۆزرایەوە. مورتەزا لە بەرزییەکەوە کە نزیکەی (١٠٠) مەتر دەبوو، کەوتبووە خوارەوە، ئاژەڵە دڕندەکان بەشێکی تەرمەکەیان خواردبوو، تەرمی مورتەزا بەئامادەبوونی نەقیب (م) گواسترایەوە بۆ بنکەی پۆلیسی سەردەشت، تەرمەکە بۆنی کردووە و تێکچووە، بنکەی پۆلیس چاوەڕوانی لێکۆڵینەوەی پزیشکی یاسایی نییە، پێشنیارکراوە لەبری پزیشکی یاسایی، پزیشکی نەخۆشخانە لێکۆڵینەوە لە تەرمەکە بکات. بنکەی پۆلیسی سەردەشت داوای لە بنکەی مەهاباد کردووە کە ئەو داواکارییانەیان بەفەرمانێک بۆ جێبەجێ بکات، چونکە هیچ کەسێک شکاتکەر نییە. دانشی گوتی: تاکو ئێستا کارەکە بەباشی ڕۆیشتووە، ئەم بەیانییە کاتێک لە بنکەی پۆلیس بووم پزیشکی سوپایان ئاگادارکردبووەوە، کە پزیشکێکی گەنج بوو لە ژوورێکی بنکەی پۆلیسدا زیاتر لە کاتژمێرێک سەیری تەرمەکەی کرد و هۆی مردن و شکانی ئێسقانەکانی و خوێنبەربوون و شکانی سەری دەستنیشانکرد. مورتەزا لە بڵندی

نزیکەی (١٠٠) مەترەوە کەوتۆتە خوارەوە. جگەر و دڵ و ناوسکەکەی لەلایەن ئاژەڵە درِندەکانەوە خورا بوو، گواستنەوەی تەرمەکەشی لە سەردەشتەوە بۆ مەهاباد دەبێتە هۆی پیسبوونی ناوچەکە و تەرمەکە دەبێت هەرچی زووترە بەخاک بسپێردرێت. پزیشکی سوپا بەتەواوی ڕاستی گوتبوو. تەنها شوێنی کەوتنی کێوەکانی هوملی دەستنیشان کردبوو، پزیشکی سوپا نەیدەزانی کە ئەم منداڵە لە کوێ کەوتۆتە خوارەوە. ئەویش هەر ئەو قسەیەی گوت، کە پۆلیس گوتویەتی، لەژێر چاودێری پزشک و بەرەزامەندی پۆلیس دەبێت تەرمەکە لە گۆڕستانی سەردەشت بەخاک بسپێردرێت. بانگی نیوەڕۆ تەرمەکە بەئامادەبوونی دوو پۆلیس و مەقسودخان و دانشی وکاک ڕەزاو من و موارد بەخاک سپێردرا. کاتێک کە تەرمەکەیان خستە گۆڕەوە، سەیرمکرد مەقسودخان ئەو پیاوە کوردە تەمەن (٥٠) ساڵە فرمێسک بەچاوانیدا دەهاتە خوارەوە. دانشی یش دەگریا و دەیگوت خودایە من چی بە سەکینەی داماو بڵێم، ئەو کوڕەکەی لەپێناوی (١١٠) تومەندا بە من سپارد، ئێمە ی هەژار و داماو یەک لە یەک قوڕ بەسەرترین. لە هیچ شوێنێکی لێکۆڵینەوەکەی پۆلیسدا ئاماژە بە ناوەکانی دانشی، مەقسودخان، کاک ڕەزا، کەتیرە، نەکرابوو. بەجۆرێک نووسیبوویان کە وشەی بەهاباد بە مەهاباد دەخوێنرایەوە، منداڵێکی لادێیی کە باوکی مردووە و لە کێوەکانی هومل لەسەر مەرز لە دەوروبەری گوندی سنجوێ لە کێو بەربوەتەوە و مردووە. خەڵکی ناوچەکە پۆلیسیان ئاگادار کردۆتەوە و تەرمەکەش بەئامادەبوونی پۆلیس دۆزراوەتەوە، کەسیش شکایەتی نییە، تا ئێرە هیچ کێشەیەک نەهاتبووە پێش. مەقسودخان (٣٠٠) تومەنی خەرج کردبوو، کفن و دفنیش (٦) تومەن خەرجی دەویست. بڕیاربوو کاک ڕەزا و منداڵەکان بگەڕێنەوە بۆ بەهاباد و (٢٠٠) تومەن بداتە دایکی مورتەزا. دایکی مورتەزا بێوەژنێکی نەخوێندەوار بوو لە گوندی ئەسفیجی بەهاباد دەژیا، نەیدەتوانی ببێتەهۆی دەردەسەری، بەڵام هەمیشە قسە لەسەر ئەوە بوو کە مامۆستاکان بەتایبەت یەکێک لە مامۆستاکان، کە زۆر توندە لەسەر ئەو جۆرە ڕووداوانە. دانشی لێیپرسیم کاکە حسێن تۆ چی دەکەیت؟ گوتم: منیش لەگەڵ کاک ڕەزا و ئەو دوو منداڵەدا دەگەڕێمەوە بۆ یەزد. دوو سێ ڕۆژ جارێک تونۆمبێلەکەی مام ئارام دێت ئەوکات ئێمەش لەگەڵیا دەڕۆین بۆ مەهاباد، بڕیار بوو سبەی بکەوینەڕێ، گوڵەخان هاتە ژوورەوە و قسەیەکی لەگەڵ مەقسودخاندا کرد، ئێمە تێنەگەیشتین دایک و کوڕ باسی چیان کرد. کەسیش نەبوو قسەکانمان بۆ بکات بەفارسی، بەڵام شێوەی قسەکردنی گوڵەخان داواکاری بوو، ژنەکەی مەقسودخانیش هات و کەوتە قسەکردن. پاشان مەقسودخان گوتی: ئەم ژنانە دەڵێن ئەم دوو منداڵە دەگرین یەکێکیان داوای گیادەرمانییەکانی دەکات و ئەوی

تریشـــیان داوای پەپوولەکـــانی دەکـــات. دایکـــم دەڵێــت دەبێــت بــڕۆن گیادەرمـــانی و پەپوولەکانیان بۆ بهێنن. دانشی گوتی: وازیان لێبهێنن پەپوولە و گیا بەکەڵکی چی دێن، وەڵامیـــان مەدەنەوە، بێـدەنگیان بـکەن. مەقسـودخان لەگەڵ دایکـی و ژنەکەی کەوتە قسەکردن. وردە وردە هەموو کچ و ژنەکان هاتنە ژوورەوە و ئەفزەڵیش هـاتە ژوورەوە. قسـەکانی بۆ دەکردین بەفارسـی. دوای نیوەڕۆ دایکی مەقسـودخان چـاوەڕوانی قسـەی کوڕەکەی نەکرد و بـانگی کرد کاوە، کـاوە، تـائیرە وەرە. لەناکـاو پیـاوێکی کوردی (٤٠) ساڵەی بەخۆوە هاتە ژوورەوە، گوڵەخان پێیگوت کە ئەو دوو منداڵە و چەند هێستریک لەگەڵ خۆیدا بەرێت و بچن گیادەرمانی و پەپوولەکان بهێنن، کاوە دەسـتەکانی خسـتە سـەرچاوی بەواتـای بەسـەرچاو. مەقسـودخان گـوتی: قسـەی دایکـم قسـەی مـنە، بەڵام پەلەمەکەن دەبێت بزانین چۆن پەپوولەکـان بهێنن.. ئەو دوو منـداڵە بهێنن. ئەسـغەر و عەزیـز هـاتن و لە ئەسـغەری پرسـی: گیایەکـان لە کوێن و چەندەیە؟ ئەسـغەر گـوتی: گیایەکـان لای بەردە تەختەکـانن و پـڕی (١٠) فەردە دەبێـت. کـاک ڕەزا پێیگـوت کەری خوێڕی چوویتە لای ژنەکان گریاویت؟ لاچۆ بڕۆ ونبە لەبەر چـاوم. ئەسـغەر دەسـتیکرد بە گریان.. گوڵەخان و ژنەکەی مەقسودخان و ژن و کچەکانی تـر هاواریـان لێهەڵسـا کە بۆچی کاک ڕەزا وا لە ئەسغەر توڕە دەبێت. گوڵەخـان دەسـتی لە کەمەری خـۆی نـابوو، لەگەڵ پیاوەکان قسەی دەکرد دیـار بـوو، کە تـوڕە ببـوو. ئەم ژنە کوردە بەتەمەنە وەک منداڵ و نەوەی خۆی بەرگریی لەو دوو منداڵە دەکرد. کـاک ڕەزا و دانشـی لێیدەترسـان، مەقسـودخان گـوتی: پێویسـت ناکـات، دایکـم کە گـوتی: ئەو کـارە بـکەن، دەبێـت بکرێـت، بەتـایبەتی ئێسـتا کە ژنەکـانی تـریش لایەنگـری ئەون. مەقسـودخان لە عەزیـزی پرسـی پەپوولەکانت چۆن ئامادەکردوون؟ عەزیـز گوتی: لەسـەر گەڵا. منیش ئەو پەپولانەی کە پێیان دابووم پیشانی مەقسودخانم دا، ئەویش گوتی: بەڕاستی کـارێکی جوانت کـردووە، لە عەزیـزی پرسـی: چەنـد پەپـوولەت کـۆکردۆتەوە؟ ئەسـغەر گـوتی: زیـاتر لە (٦٠٠) پووپەلە کە لەسەر (٢٠٠) پەڵکە گەڵا چەسپمان کردوون. مەقسودخان گوتی: گیایەکـان دەکەینە گونییەوە و دەیانهێنین، ئەی پەپوولەکـان چۆنی بهێنین؟ خۆ ناکرێت ئەوانیش بکەیـنە گـونییەوە! مەقسـودخان دووبـارە قسـەی لەگەڵ دایکیـدا کـردەوە، گـوتی: دایـکە وازبێنە ئێمە ناتوانین ئەو پەپوولانە بهێنین! گوڵەخان بە تووڕییەوە گوتی: ئێوە بەخۆتـان دەڵێن پیـاو، بەڵام پیـاوی چـی بەکەڵکی یەک کـار نـایەن، مـن بەیـانی بۆخـۆم دەڕۆم و پەپوولە و گیادەرمانی ئەم منداڵە هەژار و بێچارانە دەهێنم. گوڵەخـان ڕوویکردە دانشـی و بەتوڕەییەوە قسـەی لەگەڵ کرد. ئەفزەڵ گـوتی: دایە گەورەم دەڵێت ئێوە بـۆچی ئەم منداڵە هەراژانەتـان هێنـاون و کردوتـانن بە خزمەتکاری خۆتـان. ئێوە لەو شـاخ و داخە

نانە ڕەقیان دەدەنێ و لێیاندەدەن. فەرموون هەڵسن بەزوویی بڕۆن گیا و پەپوولەکانیان بۆ بهێنن، بۆچی وا بێخەم دانیشتوون، دەتانەوێت دەستبکەم بە لێدانتان! گوڵەخان بە ئەفزەڵی گوت خێرا قسەکانی منیان بۆ بکە بە فارسی. مەقسودخان هەڵسا و ڕۆیشتە دەرەوە، دانشی و کاک ڕەزا گوتیان بە گوڵەخان بڵێ بەسەرچاو. هەر ئێستا دەڕۆین گیادەرمانی و پەپوولەکانیان بۆ دەهێنین. بەڵام نازانین پەپوولەکان چۆن چۆنی بهێنین، کچێکی (١٣-١٤) ساڵ کە لەوێ بوو، چەند قسەیەکی لەگەڵ ئەفزەڵدا کرد، ئەفزەڵ گوتی: گوڵ سەنەم دەڵێت سندوقی بۆ دروست بکەن و پەپوولەکان بکەنە نێو سندوقەکەوە. دانشی و کاک ڕەزا کەوتنە بیرکردنەوە کە چۆن ئەو سندوقانە دروستبکەن. دانشی بە ئەفزەڵی گوت بەدایە گەورە بڵێ هێشتا فایلی مورتەزا کۆتایی نەهاتووە، فایلەکە دەنێرنەوە بۆ مەهاباد، لەوەیە پۆلیس ئێمە دەستگیربکات و کاک ڕەزاش دەبێت بگەڕێتەوە بۆ شاری یەزد و هەواڵ بداتە دایکی مورتەزا کە کوڕەکەی مردووە. گوڵەخان گوتی: من بەئێوەم نەگوتوە ئەو کارە بکەن. بەڵکو بە کوڕەکەی خۆمم گوت، کە چەند کەسێک بنێرێت و گیا و پەپوولەی ئەم دوو منداڵە بهێنن. ئەمجارە دانشی تووڕەبوو، ڕوویکردە هەر دوو منداڵەکە و گوتی: توتکە سەگینە، ئێوە بەقسەی مامۆستاکانتان چ بەڵایەکتان بەسەر ئێمەدا هێنا. لەناکاو ژنەکەی مەقسودخان بە فارسیەکی خراپ ڕوویکردە دانشی و گوتی: بۆچی جوێن بەو منداڵانە دەدەیت. خەجاڵەت نابی. ئێمە تا ئەوکاتە نەمانزانی کە ژنەکەی مەقسودخان فارسی دەزانێت. ژنەکەی مەقسودخان بەکاک ڕەزا و دانشی گوت ئێوە منداڵی خەڵکتان کوشت و بەبێ پرسی دایکی لێرە خستانە چاڵەوە. هەڵسن بڕۆن بەلای کاری خۆتانەوە، ئەم منداڵانەش لای ئێمە جێبهێڵن، ئەگەر یەک جاری تر جوێنیان پێبدەن خۆم گۆشتان لە ئێسقانتان جیا دەکەمەوە.

گوڵەخان و بووکەکەی و دوو ژنی تر هەڵسان و ڕۆیشتنە دەرەوە، پاش نیو کاتژمێر پیاوێک بە چەکوچ و بزمار و دووباری هێستر تەختەی تەنکەوە هات و گوڵەخان چەند قسەیەکی لەگەڵدا کرد. ئەو پیاوەش چەند پرسیارێکی لە عەزیز کرد و ئەفزەڵ قسەکانی ئەو پیاوەی کرد بەفارسی و پیاوەکە دەستیکرد بە دروستکردنی سندوقی بچووک، وەکو سندوقی میوەی ئەمڕۆ، بەڵام بە بەرزی نزیکەی (١٠) سم. مەقسودخان خەریکبوو قسەیەک بکات بەڵام لەدایکی ترسا و هیچی نەگوت. ئنجا بە ئێمەی گوت: وەرن با لە ماڵ بچینە دەرەوە. ئێمە هەموو هاتینە سەرشەقامەکە و مەقسودخان بە دانشی گوت: سبەینێ هێسترەکان باربکەن و ئارد و شەکر و چا بەرن و بڕۆنەوە بۆ شوێنی کارەکەتان، لەوسەرەوە کەتیرەکان باربکەن و گیادەرمانی و پەپوولەکان بخەنە

سەرباری هێسترەکان و خۆتان مەگەڕێننەوە بۆ شار و بەهیچ جۆرێک ئێوە لێرە مەبن، چونکە لە شارا وابڵاو بووەتەوە کە منداڵێکی کەتیرەکەر لە شاخ هەڵدێراوە. با کاک ڕەزاش نەچێتەوە بۆ شاری یەزد چونکە لەوەیە دەستگیری بکەن، لێگەڕێن تا ڕووداوەکە کەمێک درەنگ بکەوێت، پاشان هەمووتان بەیەکەوە بڕۆنەوە بۆ یەزد. ئەگەر دایکی مورتەزا شکاتی کرد تا ئەوکات دیاری دەدا، ئەم کاک حسێنە دەچێتەوە بۆ یەزد با ئەو بچێت بەدایکی مورتەزا بڵێت، کە کوڕەکەی هەڵدێراوە و مردووە، (٢٠٠) تومەنیشی دەدەمێ کە بیدات بەدایکی مورتەزا. دانشی و کاک ڕەزا یەکتریان گرت و گوتیان ئەی ئەم منداڵانە چی لێبکەین؟ مەقسودخان گوتی: ئەمانە ببەرەوە بۆ کێو و کاریان پێبکە. دانشی گوتی: بەڵام دایکت دەڵێت گیادەرمانی و پەپوولەکانی ئەم دوانە بهێنن بۆ سەردەشت، بەدڵنیاییەوە دەڵێت خۆشیان بهێننەوە. دایکت و ژنەکەت ئیتر ئەم دوو منداڵە نادەنەوە بە ئێمە بیانبەینەوە بۆ کەتیرەکردن. مەقسودخان گوتی: ئێستا ئێوە سبەی بڕۆنەوە بۆ کێو. گیا و پەپوولەی ئەم منداڵانە بنێرنەوە بۆمان تا خۆم نەڵێم ئێوە نەیەنەوە. خۆم جارێکی تر منداڵەکان دەنێرمەوە لاتان. گەیشتینە بەردەمی دوکانەکەی حاجی جەواد، بینیم چەند کەسێک لە دوکانەکەیدا دانیشتبوون خەریکی حیساب کردن بوون، حاجی جەواد چاوی بەمن کەوت و گوتی: خۆزگە تۆ لەبری ئەو منداڵە لە شاخ هەڵدێرابایە و گورگ ورگ و ڕیخۆڵەتی هەڵدڕیایە. دووان لە کوردەکان کە خەریکی حیسابکردن بوون لەگەڵیا هاوار و قڕەیان بوو. حاجی جەواد گوتی: کاکە هەڵەم کرد خۆ هێشتا حیسابەکە تەواو نەبووە. ئێمە ڕۆیشتین بۆ گورەپانی سەرچاوە و لە چایخانەیەکدا لەسەر کورسیەک دانیشتین. کاک ڕەزا گوتی: ئەگەر دەمزانی وای لێدێت هەر ئەم نیوەڕۆیە دەگەڕاینەوە بۆ کێو. شەو دەگەیشتینە شوێنی خۆمان، بەڵام تازە درەنگە و دنیاش تاریکە و ناگەینەوە جێ. مەقسوخان لە مزگەوت نوێژی کرد، منیش لەگەڵ ئەودا چووم بۆ مزگەوت. کاک ڕەزا گوتی: کاک حسێن ئەمانە سوننەن نابێت تۆ بچیتە مزگەوتیانەوە. گوتم: ئەمانە موسڵمانن مزگەوت، مزگەوتە و من نوێژی خۆم دەکەم. کاتێک گەیشتینە ماڵی مەقسودخان هێشتا دارتاشەکە سندوقی دروستدەکرد. دوو فانۆسیان بۆهێنابوو، لەبەر ڕووناکی فانۆسەکان خەریکی کارکردن بوو، عەزیز و ئەسغەر بزماریان دەدایە دەست، سندوقەکانیان لەسەر یەک دانابوون، گوڵەخان پێیگوتبوو دەبێت (٣٠) سندوق دروستبکات. بۆ نانخواردنی ئێوارە هێلکەورۆن و پەنیر و کەرە و مرەبا ئامادە کرابوو. دارتاشەکەش، کە کارەکەی تەواو کرد بوو، لەگەڵ ئێمەدا نانی خوارد. من گوتم: سبەی لەگەڵ ئێوەدا دێم بۆ کێو. دارتاشەکە گوتی: من ئەم چەکوچ و بزمارانەت دەدەمێ کاتێک پەپوولەکانتان کردنە نێو سندوقەکەوە، دەرگای

سندوقەکە بەچەند بزمارێک قایم داکوتە. بەیانی زوو (١٠-١٢) هێستر بارکران لە ئارد و شەکر و چا. عەزیز و ئەسغەر یشیان لەسەر بارەکەوە سواری هێستر کردن. سێ پیاوی کورد لەگەڵماندا هاتن. گوڵەخان بە کوڕەکانی گوت ئەم مندالانە لەگەڵ خۆتاندا بهێننەوە، ژنەکەی مەقسودخانیش بەمنی گوت، کاکە حسێن ئەو مندالانە لەگەڵ خۆتدا بهێنەوە، ڕێگەمان گرتەبەر، بەمنیشیان گوت، کە سواری هێستر بم. گوتم: هەرکاتێک ماندوو بووم سواردەبم، پاش چەند کات ژمێرێک گەیشتینە خێمەکەی دانشی، نزیکەی (١٥) فەردەی گەورەمـان لەگەڵ خۆمانـدا هێنـابوو، بڕیـار وابـوو (٢-٣) کەس لەگەڵ ئەسغەردا بڕۆن گیادەرمـانییەکە بکەنە فەردەوە و باری بکەن لە هێسترەکان و بیهێننە خـێمەکە. منـیش لەگەڵ دووپیـاوی کـورد و کـاک ڕەزا و مـوراد و عەزیـز بە چەنـد هێسترێکەوە بەرەو خێمەکەی کاک حەسەن ڕۆیشتین. نیوەڕۆ گەیشتین، کاک حەسەن کاتێـک زانـی کە دەبێت پەپوولەکـانی عەزیـز ببەین بـۆ سەردەشـت؛ گـوتی: مـن ئەو پەپوولانە لە شاخەکەوە فڕێدەدەمە خوارەوە. ئەم کەر و خوێڕیانە چ بەڵایەکیان بەسەر ئێمەدا هێنا. کاک ڕەزا گوتی: گوڵەخان و ژنی مەقسودخان و ژنانی تر فشارێکی زۆریان کردۆتە سـەرمان کە دەبێت ئەم کـارە ئەنجامبدەین. خـاوەن هێسـترەکان گوتیـان ئێمە دەبێت هەر ئەمڕۆ بگەڕێنەوە بۆسەردەشت. هەموومـان بەرەو ئەشکەوتەکە ڕۆیشتین، هەموو لایەک هاوکارییان کردین، دوای نیوەڕۆ کەتیرەکان لە هێسترەکان بارکران. ئیتر مـن و دوو منـداڵەکە و کـاک ڕەزا و کوردەکـان بەرەو سەردەشـت کەوتیـنەوەڕێ، درەنگـانێکی شـەو، دنیـا بەتەواوەتـی تاریـک ببـوو، هـیلاک و مانـدوو گەیشـتینەوە بەردەرگـای مـاڵی مەقسـودخان. لەسـەر سەکۆی بەردەمـی ماڵەکەیـان لەسەر جاجمێک لێکەوتم، گوێم لێبوو گوڵەخـان قسـەی دەکرد، تەنهـا لە وشـەی دایک تێگەیشتم، خۆی بەچا و جۆرێک لە شیرینی کوردەوارییی پێشوازی لێکردین، پێیگوتم: کە هەڵسـم بڕۆم و لەو تەشـتی ئـاوەدا قاچەکـانم بشـۆم. لە هەمـوو تەمەنمـدا هێنـدەی ئەو ڕۆژە بە پـێ نەڕۆیشـتووم، کاتێک لە ژێـر ڕوونـاکی لامپـا و چراکانـدا ژن ومنداڵەکان پەپوولەکانیـان بینی هەموویان شەیدایان بوون. مەقسودخان سـەرەتا سـەیری نەدەکردن، پاشـان وردە وردە ئەویش سەیری دەکردن ودەیگوت سـەیرکەن ئەم دوو منداڵە چ کـارێکی جوانیـان کردووە. (١٢) فەردە گیادەرمانی ئەسغەریش لەلایەکی حەوشـەکەی مـاڵی مەقسـودخاندا دانرابـوون. ئەو شـەوە تابەیـانی سـەیری پەپوولەمـان دەکـرد، گوڵەخـان و ژنەکەی مەقسودخان و چەند ژن و کچی تر دەگریان بۆ مورتەزا. گوڵەخـان گوتی: ئەگەر یەزد ئەوەنـدە دوور نەبـوایە منـیش لەگەڵتانـدا دەهـاتم بـۆ یەزد. تـا سەرەخۆشـی لە دایکـی مـوتەرزا بکەم. مەقسـودخان بەمنـی گوت ئەم پەپوولانە هیچ پارەدەکەن؟ گوتم: دیارە

کەسێک هەیە بیانکڕێت. مەقسودخان گوتی: کاتی خەوە بائێستا بخەوین، چووینە سەرجێگا و خەوتین. بەیانی کاتێک بەئاگا هاتم هەتاو کەوتبوو، بەڵام هێشتا ئەسغەر و عەزیز هەر لە خەودابوون. گوڵەخان گوتی: لێیانگەڕێن با بخەون. گوڵەخان ویستی فەردە گیادەرمانەکانی ئەسغەر هەڵپچڕێت. مەقسودخانیش لەسەر سەکۆکە دانیشتبوو، هەندێک لە خاوەن هێسترەکان خەریکی قسەکردن بوون لەگەڵیدا، ژنەکەی مەقسودخانیش هات. گوڵەخان بە ئەفزەڵی گوت بڕۆ بەدوکانداره ورده فرۆشەکە بڵێ بابێت بۆ ئێرە سەیرێکی ئەو گیادەرمانییە بکات. پاش کەمێک پیاوێکی باڵا بەرزی چوارشانەی ڕیش تاشراو بە جلی کوردییەوە هات، تەمەنی نزیکەی (٥٥) ساڵ دەبوو، سڵاوی لە گوڵەخان کرد و ڕێزێکی زۆری بۆ نواند، وەکو منداڵێک لەبەردەم ئەو ژنە (٧٥) ساڵەدا ڕاوەستا، ئەفزەڵ قسەکانی گوڵەخانی بۆ من دەکرد بە فارسی. گوڵەخان لەگەڵ ئەو پیاوەدا کەوتە قسەکردن، گوڵەخان گوتی: بەو منداڵانەم گوتوە لەو کێوە گیادەرمانیم بۆ بهێنن. ئەوەتا هێناویانە بەڵام هەموویان تێکەڵ کردووە، دەمەوێت هەمو جۆرەکان لەیەکتری جیابکەیتەوە، پیاوەکە گوتی: بەسەرچاو، گوڵەخان گوتی: (١٢) فەردەیە، پیاوەکە گوتی: (١٢) فەردەی گەورە گیادەرمانی؟!، پیاوکە بە گوڵەخانی گوت، مەگەر دەتەوێت بازرگانی گیادەرمانی بکەیت؟ گوڵەخان گوتی: منداڵەکان هاوکاریت دەکەن. پیاوەکە دەستیکرد بە جیاکردنەوەی گیایەکان، ئەسغەریش زوو لە خەو هەڵسا و هاتە پێشەوە، بۆ جیاکردنەوە و هاوکاری کردنی کابرای کوردە. پیاوەکە بەبێئەوەی بزانێت ئەسغەر، ئەو گیایانەی کۆکردۆتەوە، پێیگوت ئەو فەردەیە هەڵپچرە و گیایەکان جیا بکەرەوە. چەند منداڵێکی تریش هاتن بۆ هاوکاری کردنیان. منداڵەکان زۆر بەتاسەوە کاریان دەکرد، نانی نیوەڕۆ خورا و منیش هاوکاریم دەکردن. دوای نیوەڕۆ هەموو گیاکان جیاکرانەوە. چەپک چەپک بەستران، پاش چەندین ساڵ بەتەواوی لەیادم ماوە کە ئەسغەر نزیکەی (٢٤٠) جۆر گیادەرمانی کۆکردبوەوە. کاتێک ئەو پیاوە کوردە جۆری گیاکانی دەژمارد، کە گەیشتە (٢٤٠) هاواری لێهەڵساو دەستیبرد بۆ پشتی و خۆی بەدوادا چەمانەوە، هەندێک قسەکرد، ئەفزەلیش هیلاک ببوو، لێمپرسی ئەو پیاوە دوکاندارە چی دەڵێت؟ گوتی: دەڵێت لە دوکانەکانی ئەستەمبوڵیش ئەم هەموو گیادەرمانییە دەستناکەوێت. گوڵەخان لە دوکاندارەکەی پرسی ئێستا کام لەم گیایانە بەکەڵک دێت. ئەو نزیکەی (٢٠-٣٠) جۆری لە شوێنێکەوە بە جیا دانابوو، گوتی: ئەم کۆمەڵەیە بەکەڵک نایەن و بیدەن بە هێسترەکان بابیخۆن. بەڵام ئەوانی تر هەموو باشن و بەکەڵک دێن. ژنەکەی مەقسودخانیش هات و کە ئەو هەموو گیادەرمانییەی بینی سەری سوڕما و پرسیارێکی لە دوکاندارەکە کرد و ئەویش وەڵامی دایەوە. لەناکاو

ژنه‌که‌ی مه‌قسودخان به‌هه‌موو هێزی بۆکسێکی سره‌وانده سه‌ر سنگی کابرا، کابرا که‌وته سه‌ر زه‌وی، هێشتا هه‌ڵنه‌سابوه‌وه که گوڵه‌خان و ژنه‌که‌ی مه‌قسودخان ده‌ستیان له که‌مه‌ریان دانابوو، ڕووبه‌ڕووی وه‌ستابوونه‌وه و قسه‌یان پێده‌گوت، بانگمکرد ئه‌فزه‌ڵ له کوێی؟ ئه‌وه‌چی بوو ڕوویدا؟ ئه‌فزه‌ڵ گوتی: ئه‌و کابرایه ته‌نها نرخی (١٠) تومه‌نی داناوه بۆ هه‌موو ئه‌و گیاده‌رمانییه. ژنه‌کانیش تووره بوون و داویانه به‌زه‌ویدا، هێشتا کابرا له زه‌وییه‌که هه‌ڵنه‌سابۆوه که مه‌قسودخان هات، سه‌ره‌تا به‌لایه‌وه ساده‌بوو، که دایکی یاخود ژنه‌که‌ی له‌که‌سێکیان دابێت و له‌سه‌ر زه‌وی که‌وت بێت. کاتێک گیاده‌رمانییه‌که‌ی بینی پێی سه‌یر بوو، مه‌قسودخان گوتی: ئه‌وه چییه و چی ڕوویداوه. گوڵه‌خان گوتی: دوکانداره‌که گوتویه‌تی ئه‌م گیاده‌رمانییه له بازاڕه‌کانی ئه‌سته‌مبوڵیش په‌یدا نابێت، به‌ڵام خۆی ده‌ڵێت ئه‌م هه‌موو گیایه بایی (١٠) تومه‌نه، خۆ به‌دڵنیاییه‌وه ئه‌مه زیاتر (٢) هه‌زار تومه‌ن ده‌کات. مه‌قسودخان به‌یه‌کێک له پیاوه‌کانی گوت که له‌وێ وه‌ستا بوو، بڕۆ به‌و سێ دوکانداره‌ی تر بڵێ با ئه‌وانیش بێن، پاش چه‌ند خوله‌کێک ئه‌و چه‌ند دوکانداره‌ی تریش هاتن و له به‌رده‌می خان وه‌ستان و خان گیاده‌رمانییه‌کانی پیشاندان و گوتی: ئه‌م گیاده‌رمانییه به‌چه‌ند ده‌کڕن؟ دیار بوو که نزیکه‌ی (١٥) جۆر له‌م گیایانه زۆر نایاب و که‌مبوون و زۆر به‌نرخ بوون، پاش وتوویژێکی زۆر یه‌کێکیان گوتی: من به (٣٥٠) تومه‌ن ده‌یکڕم. مه‌قسودخان گوتی: زۆر باشه خێری لێببینێت. گوڵه‌خان گوتی: نا نا، بابه گیان من به‌و نرخه نایفرۆشم. هه‌ر ئه‌و دوکانداره‌ی که گوتبووی به (١٠) تومه‌ن ده‌یکڕم تا (٢٨٠) تومه‌ن سه‌رکه‌وت. خان به‌دایکی گوت ئه‌گه‌ر نایفرۆشیت چی لێده‌یکه‌یت؟ گوڵه‌خان گوتی: ئه‌گه‌ر ئه‌م دوکاندارانه به (٣٥٠) تومه‌ن بیکڕن، ئه‌وا له ته‌ورێز لانیکه‌م بایی (٢) هه‌زار تومه‌نه. خان گوتی: ئاخر ئه‌و منداڵه ناتوانێت بچێت بۆ ته‌ورێز! گوڵه‌خان گوتی: من خۆم سبه‌ی ده‌چم بۆ مه‌هاباد له‌وێ گیاده‌رمانییه‌کانیش ده‌فرۆشم. هیچ که‌سێک توانای نه‌بوو له‌به‌رامبه‌ر گوڵه‌خاندا قسه‌بکات، دوو کوڕ و کچێکی گوڵه‌خان ماڵیان له مه‌هاباد بوو، ئه‌و ده‌یویست بڕوات بۆ ئه‌وه‌ی و گیاکانیش له‌گه‌ڵ خۆیدا به‌رێت. گوڵه‌خان په‌پووله‌کانیشی نیشاندان و گوتی: ئه‌مانه به‌چه‌ند ده‌کڕن؟ ئه‌وان گوتیان ئێمه په‌پووله ناکڕین. بڕیاردرا که سبه‌ی بڕۆین بۆ مه‌هاباد، شه‌و مه‌قسودخان له مزگه‌وت گه‌ڕایه‌وه و بانگی ئه‌سغه‌ری کرد، ئه‌سغه‌ر هات بۆلای، خان پێیگوت دانیشی تۆی ده‌رکردووه؟ گوتی: به‌ڵێ ده‌ریکردووم. گوتی: ئێستا ده‌ته‌وێ چی بکه‌یت؟ گوتی: دانشی پێیگوتوم که له‌گه‌ڵ ڕه‌زا و کاک حسێن دابڕۆمه‌وه بۆ شاری یه‌زد. خان ڕوویکرده کاک ڕه‌زا و گوتی: ڕووداوه‌که‌ی مورته‌زا لێره چاره‌سه‌ر کراوه، تۆش مه‌چۆره‌وه بۆ یه‌زد چونکه من به‌باشی نازانم، لیگه‌ڕێن با

ڕووداوەکە کەمێک کۆن ببێت. بەیانی ئەسغەر بەرەو برۆنەوە بۆ کێو. بەڵام با ئەسغەر کەتیرە کۆ نەکاتەوە با گیادەرمانی بۆمن کۆبکاتەوە. خان ڕوویکرد ئەسغەر و گوتی: تۆ سبەی دەچیتەوە بۆ کێو، بەڵام بەهیچ جۆرێک کەتیرە کۆنەکەیتەوە، بەڵکو گیادەرمانی بۆمن کۆبکەرەوە. کاک ڕەزا خەریک بوو قسەبکات و گوتی: ئاخر خان، خان قسەکەی پێبڕی و گوتی: کاک ڕەزا مەسرەفی ئەسغەر لەسەر منە و لە یەکەم ڕۆژەوە هەموو مەسرەفێکی لەسەر من حیساب بکەن، دواتر گوتی: ئەسغەر تۆش کارت بەسەر منداڵانی ترەوە نەبێت، ئەسغەر گوتی: بەسەرچاو. کاک ڕەزا گوتی: بەڵام منیش دەبێت بچمەوە بۆ یەزد و هەواڵبدەم بەدایکی ئەو منداڵە کە کوڕەکەی مردووە، خان گوتی: ئەمە کاک حسێنە پیاوێکی ژیر و زیرەکە ئەوەتا بەتەنها لە یەزدەوە هاتووە بۆ سەردەشت، ئێستاش دەچێتەوە بۆ بەهاباد و بەدایکی منداڵەکە دەڵێت، کە چی ڕوویداوە. عەزیزیش لەگەڵ خۆیدا دەباتەوە و دەیداتە دەست دایک و باوکی، پاشان مەقسودخان ڕوویکردە من کردو گوتی: سبەی لەگەڵ گوڵەخان و عەزیزدا، دەچیت بۆ مەهاباد. چەکێکی بانکی پێدام و گوتی: ئەو (٢٥٠) تومەنە لە مەهاباد وەربگرە و بیدە دەست دایکی مورتەزا. پاش کۆتاییهاتنی کەتیرەش دوبارە پارەی تری بۆدەنێرم. ژنەکەی مەقسودخان لەگەڵ خاندا چەند قسەیەکی کرد و ڕۆیشت پاش چەند خولەکێک گەڕایەوە و کڵاوێکی کوردی ژنانەی بەدەستەوە بوو، کە نزیکەی (١٠) دانە پارەی قەوارە گەورەی زیوی پێوە بوو، دایە دەست من و گوتی: ئەوە بدەرە دەست دایکی مورتەزا، ئەگەر پێت باش بوو لە تاران بیفرۆشە و پارەکەی بدەرەوە دایکی مورتەزا. گوڵەخان هەواڵی نارد بۆ مام ئارام ئەمشەو ئۆتۆمبێلەکەی بهێنێتە بەردەم ماڵی ئەوان بۆ بارکردنی (١٠) فەردە گیادەرمانی و سی سندوق پەپوولە، شەو ئۆتۆمبێلەکە هاتە بەردەرگا، ئۆتۆمبێلەکەی مام ئارام وەک تێکڕای ئۆتۆمبێلەکانی تر ناوەوەی کرابوو بە دووبەشەوە. بەشی پێشەوە و بەشی دواوە. بەشی پێشەوە لەلای شوفێرەوە دووکەس دادەنیشت، بەڵام گەلێ جار بەبێ شوفێرەکە چوار کەس دادەنیشت. بەشی دواوەی ئۆتۆمبێلەکەی سەربەتاڵ بوو، باریان لێ باردەکرد و گەشتیارەکان لەسەر بارەکەوە دادەنیشتن. شەو گیادەرمانی و پەپوولەکانمان بارکردن و خەوتین. بەیانی زوو بەرەو مەهاباد بەڕێکەوتین. خۆرهەڵاتبوو، کە من و عەزیز و نزیکەی (٤٥) ژن و پیاوی کورد سواری ئۆتۆمبێلەکەی مام ئارام ببووین. ئۆتۆمبێل بە ڕێگای خۆڵ و پڕ چاڵ و تاسەدا بەرەو مەهاباد کەوتەڕێ. من دەبوو هەڵگری پەیامی مردنی منداڵێکی کەتیرەکەربم. هەڵگری پەیامی مردنی منداڵێک بم، کە تەنها یەک ڕۆژ بینیومە. منداڵێک کە سێ پەپوولەی بەگەڵایەکەوە چەسپ کردبوو، بەیادگاری پێشکەشی منی کردبوو. لەبەرخاتری منداڵێکی تری

## شازاده‌ی حه مام

له فارسییه‌وه نه‌ها سکاسانی

که‌تیره‌که‌ر ده‌بوو بڕۆم بۆ به‌هاباد. له ڕێگای نێوان سه‌رده‌شت و مه‌هاباد جگه له ئۆتۆمبێله‌که‌ی ئێمه هیچ ئۆتۆمبێلێکی تر به ڕێگاکه‌وه نه‌بوو، خه‌ڵکی به‌هێستر و ئه‌سپ گه‌شتیان ده‌کرد. ده‌وروبه‌ری ڕێگاکه پڕ له گژوگیا و دارو دره‌خت بوو، له هه‌ردوو به‌ری ڕێگاوه شوان و مێگه‌له مه‌ڕ زۆر بوون. هه‌ر چه‌ند سه‌د مه‌ترێک و ژماره‌یه‌ک سه‌گ به‌حه‌په حه‌پ سه‌رجاده‌یان لێده‌گرتین. گوڵه‌خان وه‌ک شێره ژن له‌گه‌ڵ ژنه کوردێکی تردا له پێشه‌وه دانیشتبوو، من و عه‌زیز و ژن و پیاو و کوڕه‌کانی تر له‌دواوه سوار ببووین. مام ئارام خه‌ڵکی تری له ڕێگادا داده‌به‌زاند و سواری ده‌کردن. نزیکی خۆرئاوابوون بوو که نزیکه‌ی (١٥) که‌سی تر، خۆیان به ئۆتۆمبێله‌که‌دا هه‌ڵواسی له‌لای شوفێره‌که‌شه‌وه که‌سێک سواربوو. مام ئارام هاواریکرد: که‌سی تر سوار ناکه‌م، به‌ڵام ژماره‌یه‌ک له قه‌راخ شه‌قامه‌که وه‌ستابوون، هه‌رچۆنێک بوو سه‌رکه‌وتن. مام ئارام تووڕه ببوو، ده‌یگوت ناڕۆم به‌ڵام هه‌رچۆنێک بێت ڕازییانکرد که بڕوات. گوڵه‌خان جاروبار بانگی ده‌کردم که ئاگاداری گیاده‌رمانی و په‌پووله‌کانبم. ئێواره بوو، که له گه‌رده‌نه‌ی مه‌ترسیداری زمزیران سه‌رکه‌وتین، ڕێگاکه هه‌موو پێچ و لۆفه بوو، له دامێنی زمزیرانه‌وه تا سه‌ری گه‌رده‌نه دارستانێکی چڕ بوو، هه‌موو جۆره گیا و دره‌ختێکی تێدابوو، زۆربه‌یان داربه‌ڕوو بوون. دارستانێک بوو جۆره‌ها ئاژه‌ڵی کێوی تێدابوو، هه‌ر (٥٠) مه‌تر و جارێک ئۆتۆمبێله‌که ڕاده‌وه‌ستا و ده‌بوو ڕادێته‌ره‌که‌ی سارد بکرێته‌وه. له خواره‌وه‌ی گه‌رده‌نه‌وه تا سه‌ره‌وه لانیکه‌م (١٠) جار هه‌موو نه‌فه‌ره‌کان دابه‌زیین تا ئه‌و ئۆتۆمبێله کۆنه بتوانێت سه‌رکه‌وێت بۆ سه‌ر شاخ. له‌ماوه‌ی (١٦) کاتژمێردا ته‌نها (٣٥ کم) ڕێگامان بڕیبوو. شه‌و له نزیک گوندی کاولان خه‌وتین، گوڵه‌خان له گونده‌که خزمی هه‌بوون. گوڵه‌خان و من و عه‌زیز چووینه ماڵێک و شه‌و له‌وێ خه‌وتین. به‌یانی زوو هه‌ڵسـاین و که‌وتینه‌وه‌ڕێ، ڕێگاکه هه‌مووی خۆڵ و پرتاسه بوو، ته‌نها دیمه‌نی ده‌وروبه‌ری شه‌قامه‌که جوان بوو، هێشتا نیو کاتژمێر بوو ڕگه‌مان گرتبووه‌به‌ر.

## ئایشێ

دوو ژن و کچێک لە قەراغ شەقامەکە وەستابوون، مام ئارام ئۆتۆمبێلەکەی ڕاگرت، ژنە بەتەمەنەکە چووە پێشەوە کە هەر چۆنێک بوو لە تەنیشت گوڵەخانەوە جێگەی خۆی کردەوە. ژنە گەنجەکە و کچەکەش هاتنە دواوە. کچەکە یەکسەر هاتە بەرامبەری من دانیشت. خودایە ئەم کچە کە ڕاستەوخۆ هاتە بەرامبەری من دانیشت، چەندە جوان بوو، دەتگوت پەرییە یاخود حۆرییە، چاوەکانی گەورە و ڕەشتر لە چاوی هەموو ئەو کچانەی کە پشتر بینیبومن. چونکە بەدیقەت سەیرمکرد یەکسەر چووە دڵمەوە. سوڕی خوێنم زیادی کرد و دڵم بەخێرایی کەوتە لێدان. ئەم کچە ئەو کچە بووکە من دەبوو عاشقی بم تاکو ببم بە شاعیر. کاتی خۆی کچێکم لە یەزد بینیبوو، کە زۆر بەلامەوە جوان بوو، بەڵام بەنینۆکێکی ئەم کچە نەدەبوو. کچە شنۆیی چی، ئەویش ئەوەندە جوان نەبوو، کامیان هەڵبژێرم، هەردووکیان. ژنەکان لە ئۆتۆمبێلەکەدا بەیەکەوە قسەیان دەکرد، من کە لە کوردی تێنەدەگەیشتم ڕوانینم لەو کچە دوور نەدەکەوتەوە. کڵاوە کوردییەکەی لەسەریدا بوو لەگەڵ ئەو پلـپلانەی بەکڵاوەکەیەوە بوون جوانتریان کردبوو. کراسە ڕەنگاوڕەنگەکەشی هەمان کراس بوو، کە دەیانگوت لە بەهەشتدا هەیە. لە تەمەنی شەش ساڵیدا لە گۆڵستاندا خوێندبووم کە ئەوەی لە هەرەتی لاویتیدا دەیبینیت و سەرنجت ڕادەکێشێت. من لەماناکەی تێنەدەگەیشتم، لە مەلا نەباتیم پرسی کە مانای ئەو ڕستەیە چییە؟ ئەو مەلا بەڕێزە گوتی: ماناکەی (١٠) ساڵی تر تێدەگەیت، ئێستا هەستدەکەم، کە ساڵێک زووتر دەمەوێت ماناکەی تێبگەم. هەر کچێک دەبینم هەستدەکەم کە ئەمە ئەو کەسەیە کە دەبێت عاشقیی ببم، تاببم بەشاعیر. خودایە من ئێستا چیبکەم. ئەم کچە لەبەردەممدا دانیشتووە، دووری نێوان دەموچاوی من و دەموچاوی ئەو لە (٧٠) سم کەمترە. دووریی نێوان قاچەکانمان تەنها (٢) سم دەبێت، نابێت قاچم بەر قاچی بکەوێت. بەدڵنیاییەوە قاچم بەر قاچی دەکەوێت. ئەم چەپکە گوڵە

له‌به‌رده‌ممدا دانیشتووه، به‌ڕاستی ئه‌مه ئه‌و فه‌روخ له‌قایه‌یه که ئه‌وه‌نده چیرۆکه‌که‌یم گێڕاوه‌ته‌وه. تائێستا هیچ کچێک ئه‌وه‌نده له نزیکمه‌وه دانه‌نیشتووه.

یه‌کێک له ژنه‌کان پرسیارێکی لێکرد و ئه‌و وه‌ڵامی دایه‌وه، ده‌نگه‌که‌ی زۆر خۆش بوو، ده‌نگه‌که‌ی ده‌نگێک بوو که منی ده‌گه‌یانده دنیای جوانی. دڵم زۆر به‌جۆش هاتبوو. شێخ عه‌لی شێخ غولام ڕه‌زا گوتبووی ده‌بێت مرۆڤه‌کان نه‌فسی خۆیان بشکێنن و زاڵببن به‌سه‌ر خۆیاندا، ئه‌گه‌ر به‌سه‌ر خۆیاندا زاڵ نه‌بن، ئه‌وا له‌ودنیا ده‌چنه دۆزه‌خ. ئاگری دۆزه‌خ ده‌یانسووتێنێت. نهۆمی حه‌وته‌می دۆزه‌خ پڕیه‌تی له مار و ئه‌ژدیها و قیری کوڵاوی پیاکراوه، بۆیه ده‌بێت ئاگاداربم که قاچم به‌ر قاچی نه‌که‌وێت. له‌و قه‌ره‌باڵغییه‌دا و له‌نێو ئه‌و هه‌موو سه‌رنشینه‌دا ته‌نها هۆشم لای قاچم بوو تا به‌ر قاچی ئه‌و کچه نه‌که‌وێت. تاکو له‌ودنیا نه‌چمه دۆزه‌خ. له ئۆتۆمبێله‌که‌دا ته‌نها من و عه‌زیز جلوبه‌رگی کوردیمان له‌به‌ردا نه‌بوو. له‌ناکاو ئه‌و کچه جوانه به‌کوردی شتێکی لێ پرسیم به‌ڵام من تێنه‌گه‌یشتم، پاشان به‌فارسی گوتی: تۆ کوردیت؟ گوتم: نه‌خێر، من خه‌ڵکی شاری یه‌زدم. لێی پرسیم: یه‌زد له کوێیه؟ من هه‌ر سه‌یرم ده‌کرد، ئێستاش نازانم له پێناسه‌ی یه‌زد دا چیم گوت. ته‌نها ئه‌وه‌نده تێگه‌یشتم که گوتی: ئه‌ها یه‌زد ئه‌و شاره‌یه که له کتێبی جوگرافیادا نووسراوه، شاری پاقلاوه و شه‌کرله‌مه و په‌شمه‌ک. به‌داخه‌وه که پاقلاوه‌م پێنییه، ده‌نا به‌هۆی ناسینی ئه‌م گوڵئه‌ندامه‌وه شیرینیم ده‌دا به هه‌مووان. به‌ڕاستی هه‌موو شیرینییه‌کانی یه‌زد ده‌ده‌م له‌پێناوی ئه‌م گوڵه‌دا. لێی پرسیم: ده‌چیت بۆ قوتابخانه؟ گوتم: به‌ڵێ. گوتی: له پۆلی چه‌ندی؟ گوتم: ئه‌مساڵ ده‌چمه پۆلی نۆ. له نێوان ئه‌و (٢٠-٢٥) که‌سه‌ی که له دواوه‌ی ئۆتۆمبێله‌که سواربووین ته‌نها من و عه‌زیز فارسیمان ده‌زانی. گوتم: ئه‌وه دایکته؟ گوتی: به‌ڵێ، ئه‌وه دایکمه و دایه گه‌وره‌شم له‌پێشه‌وه سواربووه. دواتر گوتی: ئێمه خه‌ڵکی گوندی هه‌نداوی‌ین، به‌ڵام ماڵمان ئێستا له مه‌هاباده. منیش ده‌چمه قوتابخانه به‌ڵام به‌نیازم بچمه به‌شی سروشتی، بخوێنم له تاران. له دڵی خۆمدا گوتم: ئێستا دایکی یا که‌سێکی تر نه‌ڵێن بۆچی ئه‌م دووانه به‌یه‌که‌وه قسه‌ده‌که‌ن، ئه‌گه‌ر له یه‌زد ده‌بووین، تائێستا چه‌ند که‌سێک پێیان ده‌گوتین بۆ به‌یه‌که‌وه قسه‌ده‌که‌ن، چۆن ده‌بێت کوڕ و کچێکی گه‌نج به‌یه‌که‌وه قسه بکه‌ن. بۆم ده‌رکه‌وت که لێره وا نییه، کوڕان و کچانی کوردستان ئازادترن له کوڕو کچانی یه‌زد. به‌ڵام پێویسته سنووری خۆم بزانم، ده‌مزانی ئه‌گه‌ر تاوانێک بکه‌م پارچه‌ی گه‌وره‌م گوێچکه‌م ده‌بێت! ئۆتۆمبێله‌که له تاسه‌یه‌کیدا وهه‌مووان به‌لادا که‌وتین، منیش ئه‌ژنۆم له ئه‌ژنۆی کچه درا، هه‌مووخه‌ڵکه‌که ئاخ و ئۆفیان کرد، ئه‌ویش پێکه‌نینێکی کرد، ئێستاش پاش (٤٥) ساڵ شیرینی و خۆشی ئه‌و پێکه‌نینه‌م له‌بیره. خودایه، پێکه‌نینه‌که‌ی بۆچی

بوو؟! بۆ من بوو، بۆ ئەوە بوو کە قاچیم بەر قاچی کەوت؟ گوتم: بۆچی دەتەوێت بچیت لە تاران بخوێنیت؟ گوتی: لە مەهاباد بەشی سروشتی نییە، بۆیە دەبێت بچمە تاران. یاخود تەورێز. گوتم: لە تاران خزم و کەست هەیە؟ گوتی: دوو مامم و سێ پوورم هەیە لە تاران و مامێکیشم لە تەورێزە. یەکێک لە ژنەکان شتێکی لێ پرسی، ئەو ویستی وەڵامی ئەو ژنە بداتەوە. بەڵام من حەزمدەکرد زووتر وەڵامی بداتەوە تا لەگەڵ مندا بکەوێتەوە قسەکردن. هەوا گەرم بوو، سەرەوەی ئۆتۆمبێلەکە هەتاو بوو، بەڵام فێنک بوو. شنەبای فێنکی چیاکانی کوردستان هەمووانی شاد کردبوو. بەخۆمم گوت دەبێت ئاگاداری خۆم بم و وریابم تا قاچم بەر قاچی نەکەوێت، ئای چ منداڵێکی ترسنۆکم. ئاخر شێخ عەلی فەرموویەتی: "ئەگەر کەسێک لەم دنیا، هەر کارێکی بەد بکات ئەوا لەو دنیا ئاگری دۆزەخ چاوەڕوانی دەکات". دووبارە ئۆتۆمبێلەکە کەوتە چاڵێکەوە و هەمووان بەسەریەکدا کەوتین. ئەژنۆم بە تەواوی ئازاری پێگەیشت. بەخۆمم گوت وای چەند ئازارێکی خۆش و شیرین بوو. خودایە جارێکی تریش ئۆتۆمبێلەکەمان بکەوێتە چاڵەوە. ئاخر نازانم ئەم نەزانانە بۆچی چاڵەکان پڕدەکەنەوە و چاکیان دەکەن، خۆزگە چاک نەکرانایەوە و شەقامە کە هەمووی چاڵ و چۆڵی بووایە. خۆزگە هەرگیز نەچووبوومایە بۆ مزگەوت و گوێم لە وتارەکەی کاک شێخ عەلی نەگرتایە. ئاخر مانای چییە؟ کە من کچێکی جوان ببینم و نەتوانم بەئارەزووی دڵی خۆم سەیری بکەم و وابزانم کە ئاگری دۆزەخ چاوەڕوانی منە. هاوکات بەخۆمم گوت دەزانیت ئەگەر ئاگام لەخۆم بێت و قاچم بەرقاچی نەکەوێت خودای گەورە لەو دنیا لە پاداشتی ئەوەدا (٧٠) حۆرییم دەداتێ، ئەو حۆریانەی کە کاک شێخ عەلی باسی دەکردن قاچیان لە پارکی گشتییە و سەریشیان لە مەیدانی پەهلەوی (مجاهیدینی ئێستا)، دووبارە کەوتمەوە بیرکردنەوە کە واز لەم کچە شۆخ و شەنگە بهێنم کە هاوتەمەنی خۆمە و باڵاشی ئەوەندە باڵای خۆمە. بە ئومێدی ئەوەی کە ببمە خاوەنی حۆرییەکی یەک کیلۆمەتر درێژ. ئەم حۆرییە درێژانە کوا بە کەڵکی من دێن. دووبارە لە مێشکی خۆمدا گوتم: بەڕاستی من زیاتر لە دۆزەخەکەی کاک شێخ عەلی دەترسم یا لە ئابڕووچوونی خۆم لەبەردەمی گوڵەخان و عەزیزدا یاخود لە لێدانم بەدەستی کوردەکان. با لێدانیش بخۆیت و بدرێیتە دەست پۆلیس یش کێ دەڵێت لەم دەشت و دەرەدا بەڵایەکم بەسەردا نایەت. ئەگەر قاچم بەرقاچی ئەم کچە بکەوێت لەوانەیە هەموو ئەم کارانەم بەسەردا بێت، لەپڕیکا گوتی: دەیانەوێت بمدەن بەشوو. گوتم: تۆ بدەن بەشوو. گوتی: بەڵێ. گوتم: جا تۆ ئەوکاتە چۆن دەتوانی بخوێنیت؟ گوتی: ئەگەر شوو بکەم ئەوکات دەبێت نەخوێنم. گوتم: دەتدەن بە کێ؟ گوتی: دەمدەن بە کەسێک کە باوکی هاوڕێی باوکمە، گوتم: تەمەنی چەندە؟ گوتی:

تەمەنی (٣٠) ساڵە. گوتم: جا تۆ ئامادەیت شووی پێبکەیت؟ گوتی: نەخێر بەڵام هەمووان پێمدەڵێن دەبێت شووی پێبکەم. باوکیشم دەڵێت من تازە قسەم کردووە و بەڵێنم پێداون، منیش گوتوومە شووناکەم. دایکم زۆری لێدام. گوتی: چۆن دەتوانیت لە ڕووی باوکتدا قسە بکەیت. لە دواییدا بەگریان دایکمم ڕازیکرد کە شوونەکەم، دایکم گوتی: ناتوانی لەبەردەم باوکتدا بووەستیت. دواتر پێیگوتم کە دەبێت دایەگەورەم ئاگادار بکاتەوە. تا ئەو بەرگریم لێ بکات. ئێمە لە مەهاباد دادەنیشین. من و دایکم هاتین بۆ لای دایە گەورەم، ئەو لە گوند دادەنیشێت، لەبەردەم ئەودا دەستمکرد بەگریان و گوتم: من نامەوێت شوو بکەم، دەمەوێت بخوێنم. دایە گەورەم، واتا دایکی باوکم وا دێت بۆ مەهاباد و دەیەوێت لەگەڵ باوکمدا قسە بکات. ئەو ناهێڵێت باوکم بە شووم بدات، بەڵکو دەمنێرێت بۆ تاران تا بخوێنم. دایە گەورەم لە هەموان بەتەمەنترە. تەمەنی (٨٠) ساڵە. بەڵام وریا و بەهۆشە. هەموو خزمەکانمان لێی دەترسن و لە قسەی دەرناچن. هەر کەسێک لە قسەی دەربچێت لێیدەدات، دایە گەورەم بەڵێنی پێداوم کە نەهێڵێت باوکم بەشووم بدات. ئەو دەیەوێت ئەمساڵ من بنێرێت بۆ تاران تا لەوێ بخوێنم .ئەو قسەی دەکرد و من چێژم وەردەگرت. ئەمجارەیان ئۆتۆمبێلەکە بە جۆرێک دای لە تاسەیەک، کە من بەپێشدا کەوتم و سەرم بەر شیشی ئۆتۆمبێلەکە کەوت. ئەویش بەلای مندا کەوت. بێ ویستی خۆی دەستی بەرسنگم کەوت. ئاخ خۆزگە سنگم شەق ببوایە و دەستەکانی بچوونایەتە نێو دڵمەوە. من ئامادەبووم دڵی خۆمی پێشکەشبکەم و ببمە خزمەت کاریشی. دەڕۆمە لای باوکی و پێیدەڵیم کە من لە شاری یەزدەوە هاتووم بۆ کارکردن، تۆ کرێکارت دەوێت یان نا؟ دەڕۆم دەبمە کرێکار لەلای باوکی. لەبری کرێش هەموو ڕۆژێک سەیری ئەو کچە دەکەم. ئەویش نابێت چونکە ئەو دەیەوێت بچێت بۆ تاران. ناونیشانی تارانی لێوەردەگرم و لە یەزدەوە دەچم بۆ تاران تا چاوم پێی بکەوێت. یان پێی دەڵێم تۆ وەرە بۆ یەزد بۆ شاری پاقلاوە و شەکرلەمە. باشە لە یەزد بێتە کوێ؟ بێتە ئەو خانووە کەلاوەیەوە. لەپڕێکدا دایکی هەر لەسەر ئۆتۆمبێلەکە خوانی ڕاخست، خوانەکەی بەجۆرێک ڕاخست کە هاتە سەرقاچی هەردووکمان و خەریکبوو شەیتان هەڵەیەکم پێبکات و قاچم بەرم بۆ قاچی، یاخود بەبەهانەی خوان ڕاخستنەوە دەستم بدەم لە قاچی. وتەکانی مەلا نەباتیم بەبیرهاتەوە، کە دەیگوت: هەرکاتێک شەیتان خەریکبوو تووشی هەڵەیەکتان بکات بڵێن: (من شر الوسواس الخناس) هێشتا ئایەتەکەم تەواو نەکردبوو، کە ئۆتۆمبێلەکە، تەکانێکی داو وەستا، مام ئارام لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی و دەستی خستە سەرتایەی ئۆتۆمبێلەکە و گوتی: تایەمان پەنچەرە. هەموومان دابەزین و لە قەراخ شەقامەکە دانیشتین و خوانیان ڕاخست. گوڵەخان یش خوانی ڕاخست و نان

و پەنیـر و کەرەی خسـتە سـەر. دایکـی ئایشـێ یـش خـوانکەی بەتەنیشـت خـوانی گوڵەخانەوە ڕاخست. چەند کولیچەیەکی خستە سەر خوانەکەی. پاشان ئایشێ گوتی: تۆ شیعەیت؟ گوتم: بەڵێ.. من و عەزیز شیعەین. گوتی: وەکو ئێمە نوێژ دەکەن؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: ئێوە دەڵێن عەلی خودایە؟ گوتم: ئەستەغفیرەڵڵا، ئێمە دەڵێین عەلی ئیمامی یەکەمە. گوتی: ئێوە دەڵێن عەلی لە محەمەد گەورەترە؟ گوتم: ئەستەغفیرەڵڵا، محەمەد پێغەمبەرە و عەلی ئیمامە. گوتی: ئەی ئەم کێشەیەی نێوان شیعە و سوننە چییە؟ گوتم: من هیچ شتێک لەو بارەیەوە نازانم. گوتی: خوشکە گەورەکەم شووی بە پیاوێکی شیعە کردووە، هەمیشە لەماڵەکەیاندا شەڕ و ئاژاوەیە. بەڵام ئێستاکە ڕۆیشتوون بۆ عەبادان شەڕ و ئاژاوەیان کەمبوەتەوە. گوتم: بەڵکو تۆش شوو بکەیت بەکەسێکی شیعە. گوتی: مـن ئێسـتا دەمەوێـت بخـوێنم. دایە گەورەی دووبـارە چەنـد کـولیچەیەکی خسـتە سـەر خوانەکەی گوڵەخان. دوو ژنـی بەتەمەن بەیەکەوە قسـەیان دەکرد، دایە گەورەی ئایشێ مـن و عەزیـزی ئاگـادارکردەوە کە کـولیچە بخـۆین. ئـای خـودای گەورە، ئەم کـوردە سوننانە چەند میهرەبان و بەڕێزن، نازانم بـۆچی هەنـدێک کەس وایـان لە ئێمە کردبوو، کە لێیان بترسین. هێزمدایە بەرخۆم و لەو کچە جوانەم پرسی: ناوت چییە؟ گوتی: نـاوم ئایشێ یە. پێم سەیر بوو، تـا ئەو کـاتە نـاوی کچـانەی ئایشـێ‌م نەبیسـتبوو. لە سـاڵەکانی (١٣٣٠-١٩٥١) کاتێـک دەیانوسـت جـوێن و نـاوی سـووک بە کچێـک بڵـێن پێیانـدەگوت ئایشە. ئەو تێگەیشت کە ناوەکەی بەلای منەوە نامۆیە. گوتی: ئێوەی شیعە حەز بەنـاوی ئایشێ ناکەن؟ من بێدەنگ بووم. ئەو گوتی: تۆ ناوت چییە؟ گوتم: نـاوم حسێنە. گوتی: ئێمە حەزرەتی حسێن‌مان زۆر خۆشدەوێت، هەمـوو سـاڵێک بـاوکم لە ڕۆژی عاشـووردا خواردن دروستدەکات و بەسەر هەژاراندا دابەشی دەکات. پاشـان گوتی: ئەو سندوقانە هی ئێوەن؟ گوتم: هی عەزیزە. سەیرێکی عەزیزی کرد. عەزیز بچکۆلانەیەکی لاتـی ڕەش بـوو. گـوتی: هـی ئەو منداڵەیە؟ گوتم: بەڵـێ. گـوتی: ئەو سـندوقانە چـی تێدایە؟ گوتم: پەپوولە. گوتی: ئەم هەمـوو پەپوولەیە زیندوون؟ گوتم: نەخێر. پاشـان بە دایە گەورەی گوت کە ئەو سندوقانە پەپوولەیان تێدایە. ئیتر هەموو کوردەکان زانییان کە سـندوقەکان پەپوولەیـان تێدایە. هەموویـان لە دەورمـان کۆبوونەوە هەر کەسـە و قسـەیەکی دەکرد، هەر کەسـە و پرسـیارێکی دەکرد. عەزیـز وەڵامـی دەدانەوە. کاتێـک زانییـان هـاوڕێکەی عەزیز بەهۆی پەپوولەگرتنەوە لە کێو هەڵدێراوە و مردووە، هەموویان خەفەتبـار بـوون. هەر کەسە و پرسیارێکی دەکرد. ئایشـێ پرسـیارەکانی ئەوانی بـۆ دەکردین بە فارسـی. پیاوێکی بەتەمەن پرسی و گوتی: ئەو کوڕە کە هەڵدێرا و مرد، تەمەنی چەند بوو؟ گوتم: تەمەنی (١١) ساڵ بوو. گوتی: دایک و باوکی چ کارەن. گوتم: باوکی نەمـاوە و دایکیشـی

ژنێکی هەژار و نەخۆشە. ئەو پیاوە کوردە گوتی: تۆ دایکی دەبینیت؟ گوتم: من دەچم بۆ لای ئەو. پیاوە بەتەمەنەکە دەستیکرد بە گیرفانیدا و دوو (١٠) تومەنی پێدام و گوتی: بیدەرە دەست دایکی. چەند کەسێکی تریش هەندێک پارەیان دامێ، سەرجەمی بوو بە (٣٥) تومەن. مام ئارام هەڵسا و هاواریکرد خێرا سواربن ئەمجارە بە جۆرێک سواربووم، کە کەمێک لە ئایشێ وە دوور بووم. باش نەمدەبینی هەردوکمان لە بەرێکەوە دانیشتبووین، هەر ئەو پیاوە کوردەی کە (٢٠) تومەنی پێدام تا بیگەیەنم بە دایکی مورتەزا، بەرانبەرم دانیشتبوو، قاچەکانی بەرزبوون بەسەر قاچی مندا دەکەوت و ئازاری دەدام. زۆر باش بوو کە جێگاکەمان گۆڕدرا. دەنا دەچوومە دۆزەخ، وەیا لێدانم دەخوارد یان هەردوکیان. خەریکبوو خۆر ئاوا دەبوو. هێشتا (٣٥) کم مان مابوو بگەینە مەهاباد. ئەمڕۆ تەنها (٤٠) کم ڕێگامان بڕی. جادەکە لە نزیک مەهاباد باشتر بوو، بەڵام مام ئارام کە خۆر ئاوا دەبوو دەوەستا. لە نزیک گوندێک بووین گوڵەخان لەوێش ناسیاوی هەبوو. شەو لە گوندەکە لەماڵێک خەوتین. هیچ کەسێک فارسی نەدەزانی ئەو ماڵە زۆر ڕێزیان لە من و عەزیز گرت. ڕۆژی دواتر نزکی نیوەڕۆ گەیشتینە مەهاباد، کە ئەوسا شارێکی بچۆکلانە بوو. دانیشتووانی نزیکەی (٢٠) هەزار کەس دەبوو. بە ئایشێم گوت ناونیشانی تارانم بدەرێ. گوتی، باش نازانم ئەوەندە دەزانم، کە گەڕەکی قەیتەرەیە. ئەو کاتە تەلەفۆن و مۆبایل نەبوو ئینتەرنێت و ئیمەیڵ نەبوو. تەنها ناونیشان هەبوو. ئایشێ یش ناونیشانەکەی نەدەزانی. دایکی و دایەگەورەی ماڵئاواییان لە گوڵەخان کرد. دایە گەورەی دەستی خستە سەر سەری عەزیز و پارەیەکی زیوی پێدا. ماڵئاوایی لە منیش کرد، ئایشێ پێیگوتم: بە ئومێدی دیدار. لە دڵی خۆمدا گوتم: "بۆچی نەیگوت خوداحافیز، گوتی بە ئومێدی دیدار.. تازە من ئەو لە کوێ ببینم". بەرچاوم ڕوون بوو، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر چاوم پێیدەکەوێتەوە، بەڵام لە کوێ!. لە مەهاباد، لە تاران، لە یەزد، لە کوێ؟ ئەویش دەیوست من ببینێتەوە. ئەگەر نەیویستایە چۆن دەیگوت (بە ئومێدی دیدار). مرۆڤ کاتێک بیەوێت قسەیەک لە بەرژەوەندیی خۆی لێکبداتەوە لێکیدەداتەوە. نزیکی نیوەڕۆ بوو، (١٢٥) کم ڕێگامان بە دوو ڕۆژ و نیو بڕی بوو، سندوقی پەپوولەکانمان لە گەراجەکە دانا و بەرەو ماڵی براکەی مەقسودخان بەڕێکەوتین. گوڵەخان فەردەکانی بە عەمباری گەراج سپارد و نانی نیوەڕۆمان خوارد. دوانیوەڕۆ گوڵەخان و کوڕەکەی، کە لە مەقسودخان گەورەتر بوو، لەگەڵ من و عەزیزدا ڕۆیشتین بۆ بازاڕ. لە مەیدانی ئارد چەند بازرگانێک هەبوون، کەتیرە و گیادەرمانیان دەکڕی. گوڵەخان لەگەڵ سێ بازرگاندا قسەی کرد و ئەوانمان لەگەڵ خۆماندا هێنا بۆ گەراج. چەند فەردەیەکیان کردەوە و سەیریان کرد. کەوتنە قسەکردن،

گوڵەخـــان داوای (٣) هەزار تـــومەنی کـــرد، ئەوان (٣٠٠) تومەنیـــان دەدا. پـــاش بێنەوبەرەیەکی زۆر لەسەر (١٢٨٧) تومەن ڕێکەوتن. بەڵام کڕیار پارەی تەواوی نەدا و دەبوایە گوڵەخان لەبری پارەکە شتی لێوەربگرێت، وەکو شەکر و چا و ئارد و قوماش... هەرچۆنێک بوو گیادەرمانییەکە فرۆشرا، بەڵام هیچ کەسێک کڕیاری پەپوولەکانی عەزیز نەبوو. تەنها یەکێک لە بازرگانەکان ناونیشانی پیاوێکی کوردی پێداین لە تاران، گوتی: ئەو لە تاران بازرگانی دەکات و بازرگانانی پەپوولە دەناسێت، لە مەهاباد هیچ کەسێک پەپوولە ناکڕێت. هەتا لە تەورێزیش کەس پەپوولە ناکڕێت. ئێمە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. ئەو چەکەی کە مەقسودخان لە سەردەشت پێی دابووم، دام بە براکەی و ئەویش (٢٥٠) تومەنی پێدام. کە بیدەمەوە دەست دایکی مورتەزا، (٢٠٠) تومەنیشی دا بەخۆم. گوتی: مەقسودخان گوتویەتی دەبێت ئەو (٢٠٠) تومەنەی بدەیتێ چونکە زەحمەتت بۆ کێشاوە. گوڵەخان یش (١٠٠) تومەنی پێدام کە بیدەم بە دایکی مورتەزا. نەمدەزانی کە گوڵەخان دەوڵەمەندە یان هەژار بەڵام (١٠٠) تومەن لەو سەردەمەدا زۆر بوو. ئیتر ئێمە کارێکمان نەمابوو لە مەهاباد دەبوو بەرەو تاران بەڕێبکەوین. براکەی مەقسودخان پێیگوتین ئەمشەو لێرەبن و بەیانی زوو بەڕێبکەون. من گوتم دەبێت بچم بۆ حەمام، شتەکانم هەڵگرت و ڕۆیشتم بۆ حەمام. حەمامی میرزا ڕەسوڵ لە ناوەندی شاردا بوو، حەمامێکی کۆن بوو، پێدەچوو تەمەنی (٢٠٠-٣٠٠ )ساڵ ببێت، هەم دوشی هەبوو، هەم خەزان. هەندێ شوێنی لە حەمامی خانی یەزد دەچوو، ئاوی گەرمی باشی هەبوو. ئەگەرچی لە کێویش بەئاوی کانی و ڕووبارەکە خۆم شتبوو. لە حەمام هاتمە دەرەوە و بەرەو مزگەوتی گەورەی مەهاباد ڕۆیشتم، کە مزگەوتێکی سەردەمی سەفەوییەکان بوو، مزگەوتێکی گەورە و خۆش بوو، بە خشتی سوور دروستکرابوو، چەند پایەیەکی بەردینی هەبوو، ئێستا هەندێک کەس بەو شارە دەڵێن سابلاخ. نزیکی ئێوارە بوو، بەپاک و خاوێنی چوومە ماڵی موکەڕەم خانی برای مەقسودخان، منداڵەکانی هەموویان فارسییان دەزانی، لەو سەردەمەدا ئەوان قوتابی بوون. ئەوکاتە لە کوردستاندا کچان زۆر بەکەمی دەچوونە قوتابخانە، بەڵام چوار کچی موکەڕەم خان دەچوونە قوتابخانە و دوو کوڕیشی هەبوون، کە یەکێکیان لە تاران بوو، ئەوی تریان لە مەهاباد بوو. گوتم: دەمەوێت سەردانێکی ماڵی کاک عوسمانی جەعفەری بکەم، موکەڕەم خان گوتی: مەچۆ دەنێرم ئەو بۆ نانخواردن بێت بۆ ئێرە.

ئەوان هاوڕێ و کەسوکاری یەکتر بوون. ئێوارە دوای ئەوەی کە کاک عوسمانی جەعفەری و ژنەکەی هاتن، باسی گیادەرمانی و پەپوولە و مورتەزا هاتە پێشەوە، کاک عوسمان زۆر خەمی خوارد بۆ کەتیرەکەران، بەتایبەت زۆر نیگەرانی مورتەزا بوو، ئەو

بـۆ فرۆشـتنی پەپوولەکـان ناونیشـانی بازرگـانێکی کـوردی پێـداین له تـاران. گـوتی: سەردانی ئەو بکەن، چونکه ئەو بازرگانی تریش دەناسێت. له کاتی نانخواردندا باسی شیعه و سوننه کرا، وەک هیچ بابەتێکی تر نەبێت قسەی لەسەر بکرێت، تەنها بابەتی شیعه و سوننه نەبێت. منداڵان له بارەی شیعه و سوننەوە هیچ شتێکی وایان نەدەزانی. کاک عوسمان گوتی: ئێمەی سوننه هەموومان شیعەین. بەڵام ئێوه که شیعەن سوننه نین و گوتی: ئەوەتا ئیمامی عەلی خەلیفەی چوارەمی ئێمەیە، ڕێزێکی زۆرمان هەیه بۆی و ئەو جێنشینی پێغەمبەره و هەروەها زاوای محەمەدیشە. بەڵام ئێوەی شیعه ئەو خەلیفانه به خەلیفه نازانن که محەمەد کچەکانی خواستون و کردوونی به خێزانی خۆی. ئێوه بوختان بۆ کەسێک دەکەن، که هاوڕێی محەمەد بووه و باوکی خێزانەکەشی بووه، من که تەمەنم (١٥) ساڵ بوو عەزیزیش تەمەنی (١١) ساڵ بوو، هیچ قسەیەکمان نەبوو بەڵکو ئێمه کردەوەمان دەبینی. ئەمان خۆیان به موسڵمانی ڕاستەقینه دەزانی و کردەوەکانیان مرۆڤانه بوو.

من بینیم ژمارەیەکی زۆر له کوردەکان به فارسی قسه ناکەن، بەڵام عاشقی ئێرانن. خۆیان به ڕەسەنترین ئێرانی دەزانن. ژنی موکەڕەم خان زۆر ڕێزی لێگرتین. گوزەرانیشیان باش بوو، ماڵێکی گەورەیان هەبوو له ژوورەکانیاندا فەرشی گەوره و جوان ڕاخرابوون. ژوورێکی تایبەتیان بۆمن و عەزیز دابین کرد، به دۆشەک و لێفه و سەرینی جوان و تازەوە. عەزیز تا ئەو کاته ژوور و نوێنی وا جوان و خاوێنی نەدیبوو. پێش خەوتن بەخۆمم گوت پاش چەند مانگێکی تر دەچم بۆ تاران و هەموو گەڕەکی قەیتەریه دەگەڕێم تا ئایشێ دەدۆزمەوە. پاشان گوتم کارم به گەڕەک نییه، دەچمه بەر قوتابخانەی کچان لەوێ دەیدۆزمەوە. شەو له نێو ئەو نوێنه خاوێنانەندا خەوتم و چەند جارێک خەونم به ئایشێ وه بینی.

## دوبارە بینینەوەی ئایشێ

لە مانگی (مورداد‌ی١٣٤٢- ئابی١٩٦٣) دا ئایشێ لە مەهاباد پێیگوتم: بەئومێدی دیدار و لەیەکتر جیابووینەوە. من ئیتر ئایشێ‌م نەبینییەوە. بەڵام جاروبار یادی چاوە ڕەشەکانی دەهاتەوە بەبیرمدا... چەند ساڵێک تێپەڕی، لە پاریس بانگهێشتکرابووم بۆ کۆنفرانسێکی (پرسی گەلانی ئێران و ئەفغانستان)، وتارەکەی من دەبارەی کوردانی خوراسان بوو. دوای وتارەکەم ژنێک پرسیاری لێکردم، گوتی: ئایا کەسێک لەبارەی پرسی کوردەکانی خوراسانەوە لێکۆڵینەوەی زانستی کردووە؟ گوتم: بەڵێ، دکتۆر مەهدەوی شەهری مامۆستای بەشی کۆمەڵناسی زانکۆ مەشهەد لەبارەی خوێندنەوەی هێڵەکانی لەپی دەستەوە لە ناو کوردەکاندا کاریکردووە. ئەو پرسیاری تریشی هەبوو، بەڵام بەڕێوەبەری کۆنفرانسەکە پێیگوت: کاتمان کەمە، پرسیارەکانت دوای کۆنفراس بکە یاخود هەڵیبگرە بۆ کاتی نانخواردن. لە هۆڵی نانخواردندا مێزێکی شەش کەسی هەبوو، ویستم لەلای مێزەکەوە دانیشم، ئەو ژنە لەگەڵ کچێکی زۆر جواندا هاتە لامەوە بۆ هەمان مێز. داوای یارمەتی لێکردم کە پێکەوە نانبخۆین و پرسیارەکانیشی بکات. گوتم: فەرموون.. لە خۆمم پرسی خودایە من ئەم کچەم لە کوێ بینیوە؟ کچێکی تەمەن (١٧-١٨) ساڵ بوو، کەوتمە بیرکردنەوە ئاخۆ ئەم کچە جوانەم لە کوێ دیوە. ژنەکە کچەکەی پێناساندم گوتی: ئەمساڵ دوا ساڵی ئامادەییەتی حەزدەکات شارەزاییەکی هەبێت لەبارەی کوردەوە. لێم پرسی بەڕێزتان کوردن؟ گوتی: بەڵێ. داوای هەندێک لێکۆڵینەوەی دەکرد لەبارەی کوردەوە و هەندێک پرسی تایبەتی دەویست کە من تێنەدەگەیشتم. نانی نیوەڕۆمان خوارد و گوێم بۆ قسەکانی ئەم ژنە ڕاگرتبوو. هەر لەبیرکردنەوەدا بووم کە ئەم کچەم لە کوێ بینیوە. باشە ئەم کچە جوانە بۆ ئەوەندە ئاشنایە بە من؟ بە دڵنیاییەوە لە شوێنێک بینیومە. ژنەکە بە زمانی فارسی و فەرەنسی قسەی دەکرد، بەڵام کچەکە فارسی نەدەزانی و هەر بە فەرەنسی قسەی دەکرد. لەناکاو

ژنەکە گوتی: بەڕێز دکتۆر حسێنی پاپۆلی تۆ خەڵکی شاری یەزدیت؟ گوتی: من یەکەم جار کە تەمەنم (١٥) ساڵ بوو، لەگەڵ کەسێکی..... من نەمهێشت ئەو قسەکانی تەواو بکات، گوتم: لە ڕێگای سەردەشت بۆ مەهاباد، لە ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣)، خەڵکی شاری یەزددا یەکترتان ناسی تۆ ئایشێ یت؟ لە جێگاکەی خۆی هەلساو گوتی: تۆ.... خۆتانن. تۆ حسێن نیت؟، گوتم: بەڵێ، من حسێنم لە ئۆتۆمبێلەکەی مام ئارام دا بەیەکەوە بووین.گوتی: زیاتر لە (٣٠) ساڵ بەسەر ئەو دیدارەدا تێپەڕیوە. چۆن منت ناسییەوە. گوتم: کچەکەت هەروەکو ئەو سەردەمەی خۆت وایە، تەنها جلوبەرگەکەی کوردی نییە، بەداخەوە کە فارسیش نازانێت. گوتی: ڕاست دەفەرموویت، هەموو کەس پێمدەڵێن کچەکەت لە گەنجیی خۆت دەچێت. سۆنیا کە زانی من چەندین ساڵ لەوەوپێش دایکیم ناسیوە زۆر خۆشحاڵ بوو، ئایشێ تەمەنی لە (٥٠) ساڵ زیاتر بوو، بەلام هێشتا زۆر جوان و ڕازاوە بوو. شەوی دواتر بۆ نانخواردنی ئێوارە بانگهێشتیان کردم. گوتم: بیرتە کە لە مەهاباد پێتگوتم: بەئومیدی دیدار؟ ئەوەتا ئێستا پاش چەندین ساڵ لە پاریس یەکتری دەبینینەوە. دەڵێن: "کێو بەکێو ناگات، بەلام ئادەمیزاد بەئادەمیزاد دەگات". ئەم جیهانە لەوە بچووکترە کە ئێمە بیری لێدەکەینەوە. هاوسەرەکەی ئایشێ خەڵکی دانیمارک بوو، لە کاتی خوێندنی دکتۆرادا لە سویسرا هاوپۆلی یەکتر بوون و ببوونە هاوڕێ و هاوسەر. چەندین ساڵ بوو لە فەرەنسا پێکەوە کاریان دەکرد. هەردووکیان لە (C.N.R.S) واتا (سەنتەری نیشتمانیی بۆ توێژینەوەی زانستی) بەناونیشانی لێکۆڵەر کاریان دەکرد. ئەوان دوو کچ و کوڕێکیان هەبوو. سۆنیا کچە گەورەکەیان بوو، کوردی و فەرەنسی و ئینگلیزی دەزانی، بەلام فارسی نەدەزانی. هەر جارێک کە دەچووم بۆ پاریس هەواڵی ئەوانم دەپرسی. ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤) سۆنیا لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا شوویکرد بە کوڕێکی ڕەش پێستی ئەفریقای باشوور، کە ناسنامەی کەنەدای هەبوو.

ساڵی (١٣٨٦-٢٠٠٧) لە پاریس بووم، ئایشێ بۆ نانخواردنی ئێوارە میوانداری لێکردم، کچەکەشی لە کەنەداوە هاتبوو، لە کاتی نانخواردندا لە سۆنیام پرسی لەبارەی شوناسی خۆتەوە چی دەزانیت؟ گوتی: دایکم کوردێکی ئێرانییە و موسڵمانی سوننەیە، دڵسۆزە بۆ گەلەکەی و وڵاتەکەی و مەزهەبەکەی. باوکم پرۆتستانتێکی دانیمارکییە. هاوسەرەکەشم ئەفریقاییەکی کەنەدیی کاتۆلیکە. خۆیشم تازە ڕوومکردۆتە ئایینی بودایی. بەلام پێش هەر شتێک من مرۆڤم و مرۆڤایەتیم بەلاوە گرنگە. من کوردی دەزانم بەلام ئێرانی نیم، پاسپۆرتەکەم فەرەنسیە. هاوسەرەکەم ئەفریقاییە و لە ئەفریقای باشوور لەدایکبووە. دایکم هەموو ڕۆژێک پێنج جار نوێژ دەکات. باوکم هیچ کات لەبارەی نوێژ و دینی دایکمەوە قسەیەکی نەکردووە. لە ماڵی ئێمەدا هەر کەسە و دینی

خۆی هەیە. ئێمە هەموومان گەیشتوینەتە پلەی مرۆڤایەتی و ڕێز لە دینی یەکتری دەگرین. من بەرهەمی هاوبەشی فەرهەنگی شارستانێتییە جیاوازەکانم. سۆنیا هەروەها گوتی: دایک و باوکی هاوسەرەکەم و خزمەکانیشی لە عەشیرەتی زۆلۆی ئەفریقای باشوورن. ئەوان هەموویان بتپەرستن. سۆنیا گوتیشی: کاتێک من لەگەڵ هاوسەرەکەم سەردانمان کردن، ئەوان بەپێی دابونەریت و مەزهەبی خۆیان منیان بۆ کوڕەکەیان دەستنیشان کردەوە. من زۆر ڕێز لەوان دەگرم.

## فرۆشتنی پەپوولەکان

ڕۆژی دواتر، موکەڕەم خان و گوڵەخان، من و عەزیزیان بە (٣٥) سندوق پەپوولەوە گەیاندە گەراج. بڕیاربوو پاسەکە دوای سەعاتکی تر بکەوێتەڕێ، بۆ سبەی بەیانی دەگەیشتینە تاران. موکرەم خان ئێمەی بەشوفێرەکە سپارد و کرێی تا تارانیشی بۆ داین. خۆمان لەسەر کورسی دانیشتین و پەپوولەکانیشیان لەسەرەوە بارکرد و بە خێمەیەک دایانپۆشی و توند بەستیانن تاکو با نەیانبات. گوڵەخان نان و خواردنی بۆ پێچابووینەوە. لە پاسەکەدا باسی سندوقەکان هاتە پێشەوە.گەشتیارەکان کاتێک زانیان سندوقەکان پەپوولەیان تێدایە، کاتژمێرێک زیاتر قسەو باس لەسەر پەپوولە بوو. ئەوان بە کوردی قسەیان دەکرد وشەی پەپوولەیان زۆر بەکاردەهێنا، منیش لەو وشەیە باش تێدەگەیشتم. کەماناکەی پەروانەی لای ئێمەیە. من ئەو وشەیە هەرگیز فەرامۆش ناکەم چونکە نزیکە لەناوەکەی خۆمەوە. کە ئەوان دەیانگوت پەپوولە من ناوەکەی خۆمم بیردەکەوتەوە، چونکە پەپوولە زۆر نزیکە لە (پاپولی)یەوە، کە ناوەکەی منیش هەرهەمان مانای پەپوولەیە. بەیانی ڕۆژی دواتر لە شەقامی ناسر خوسرەو پشتی بینا گەورەکەی شەمس ئەلعەمارە لە پاسەکە دابەزین، میوانخانەیەک لە شەقامی بوزەر جەمهەری (١٥ی خورداد) لە پشتی گەراجەکەوە بوو، سندوقەکانم خستە سەر عەرەبانەیەک و ڕۆیشتین بۆ میوانخانەکە. خاوەنی میوانخانەکە گوتی: ئەو سندوقانە چیان تێدایە؟. گوتم: پەپوولە. گوتی: پەپوولە چییە؟ پەپوولە بۆچی؟ میوانخانەکە پیس و بۆگەن نەکەن، گوتم: نا، نا. زیندوو نین. گوتی: ئەوانە بەکەڵکی چی دێن؟، گوتم: دەمانەوێت بیانفرۆشین. خاوەنی میوانخانەکە گوتی: لە عەمباری میوانخانەکە دایبنێن. گوتم: یارمەتیمانبدە با لەگەڵ خۆماندا بیانبەینە ژوورە کەمانەوە. ژوورێکی دوو کەسی شەوی بە (٥) تومەن بوو، گوتی: دەبێت تومەنێکی تریشم بدەیتێ لەبەر پەپوولەکان. گوتم: باشە تومەنێکی تریشت دەدەینێ. سندوقەکانمان بردنە ژوورەوە، پاش نیو

کاتژمێر ویستم بڕۆم بۆ ئەو شوێنەی، کە موکەڕەم خان ناونیشانەکەی پێدابووم تا پەپوولەکان بفرۆشم. خاوەنی ئوتێلەکە هاتە لام و گوتی: ئەگەر پەپوولەکانت بۆ بفرۆشم دەبێت تۆ دەلالانەم بدەیتێ. پاشان گوتی: تۆ لە تاران کەسێک دەناسیت؟ گوتم: بەڵێ کاک محەمەد وەتەنخوا کارمەندی گەراجی ترانسپۆرتی بوزەر جەمهەری، کە بەرامبەری خۆتانە و حاجی شاسوار بەڕێوەبەری گەراجی ئوتۆ شەهر. حاجی قوتبەدین، کە پارچەی ئۆتۆمبێل دەفرۆشێت هەر لەم تەنیشتەوە، ناوی چەند شوفێرێکیشم برد، گوتم: ئەوانە هەموویان دەناسم.

چۆن ئەم هەموو خەڵکە دەناسم، و هاتووم بۆ میوانخانە. کاتێک کە ناوی ئەو هەموو خەڵکانەم برد خاوەنی میوانخانەکە گوتی: تۆ خەڵکێکی زۆر دەناسیت، منیش لە خۆمەوە ناوی ئەو هەموو خەڵکەم هێنا تا ئەو واهەستنەکان کە من بێ کەسوکارم. گوتی: تۆ لێرەبە، ئێستا من تەلەفۆن دەکەم بۆ کەسێک کە بێت بۆ ئێرە و پەپوولەکانت لێبکڕێت. پاش نیو کاتژمێر پیاوێک هاتە ژوورەوە، هەر بە ڕەنگورووی‌دا دیاربوو کە پەپوولەکڕ نییە. دەستێک چاکەت و پانتۆڵی قاوەیی لەبەردابوو، کڵاوێکی گەنجانەی لەسەر کردبوو، پێڵاوەکانیشی بەسەر پێوە کردبوو. وەک کەسێکی فشەکەر و خۆبەزلزان هاتە بەرچاوم. سەیری چەند پەپوولەیەکی کرد و گوتی: ئەمانە بۆچی باشن پێویستە هەرچی زووە فرییان بدەنە سەر شەقامەکان. بەڵام لەبەر خاتری کاک جەمال ئەحمەدی خاوەنی میوانخانەکە، من (٥٠) تومەنت دەدەمێ. گوتم: بەو پارانەی نادەم. پاشان گوتی: لەبەر ئەوەی تۆ کوڕێکی ژیر و وریایت و دەڵێن لەم کارەدا کەسێکتان لە شاخ هەڵدێراوە. ئەوا (١٠٠) تومەنت دەدەمێ. گوتم: بەڕاستی تا پرس بەمامم نەکەم نایفرۆشم. ڕوویکردە خاوەنی میوانخانەکە و گوتی: من پێم گوتی ئەم جۆرە مندالانە و مندالانی یەزد بەکەڵکی ئەوە نایەن مامەڵەیان لەگەڵدا بکەیت. لە دەرگاکە ڕۆیشتە دەرەوە و لەگەڵ خاوەنی میوانخانەکە بەیەکەوە لە پلیکانەکانەوە چوونە خوارەوە، منیش بەپێی پەتی و بەهێواشی بەدوویاندا ڕۆیشتم لەسەر پلیکانەکانەوە سەرم کێشایە دەرەوە، گوێم لێبوو بەیەکەوە چپەچپیان دەکرد. گەڕامەوە ژوورەوە و بە عەزیزم گوت، تۆ لە ژوورەوە بمێنەرەوە، منیش چەند پەپوولەیەک دەبەم و دەچم بەشوێن ناونیشانەکەدا. پێمگوت: بچۆرە ژوورەوە و دەرگاکە لەسەر خۆت دابخە، جگە لە من دەرگا لە هیچ کەسێک نەکەیتەوە. ئەگەر کەسێکیش ویستی بەزۆر بێتە ژوورەوە، پەنجەرەی رووی شەقامەکە بکەرەوە و هاواربکە و بانگی خەڵکی سەر شەقامەکە بکە. عەزیز ترسا، بەڵام گوتی: باشە. گوتم: بەولای شەقامەکەدا دەڕۆم ئەگەر کاک محەمەدی وەتەنخوا لەوێ بوو پێیدەڵێم کە لەگەڵ خاوەنی میوانخانەکەدا لەبارەی ئێمەوە قسەبکات. تۆ لە پەنجەرەکەوە سەیربکە و

مـن لەوێوە تێـدەگەیەنم. ئەو سـەردەمە شـەقامی بـوزەر جەمـهـەری زۆر قەرەبـاڵغ بـوو. ئەم شەقامە گەراجی گەورەی تـاران بـوو، بەڵام هێشـتا قەرەبـاڵغییەکەی یەک بەپەنجـای ئێستا نەبوو. خواستی خودا وابوو کاک مـحەمەد لەوێ بـوو، ڕووداوەکەم بـۆ باسکرد و داوام لێکرد کە لەبارەی ئێمەوە قسە لەگەڵ خاوەن میوانخانەکە بکات، ئەویـش تەلەفـۆنی هەڵگـرت و گـوتی: ئەبولقاسـمی خـۆتی؟ دیـارە ئەوان بەنـاوی ئەبولقاسـمی دەیانناسـی. پێیگوت، کە ئەو دوو منداڵە کەسی ئێمەن و بە تۆمان سپاردوون و ئاگاداریـانبە. عەزیـز لەپەنجەرەکەوە سـەیری دەکرد. بەنیشـانەی دەسـتم تێمگەیاند کە دڵنیا بێت. ناونیشـانی ئەو کـوردەی کە لە مەهابـاد ناونیشـانەکەیم وەرگـرت لە شـەقامی سـی مەتـری نزیـک گۆڕەپـانی گومرگ بـوو، چـووم دۆزیمەوە و نـامەکەی مـوکەڕەم خـانم پێدا. گـوتی: مـن کەسێک ناناسم کە پەپوولە بکڕێت. بەڵام دوو پیاوی ئەرمەنی دەناسم کە پێستەو سـەرە ئاژەڵی کێویی لەمن دەکڕن. ئەوانیش دوکانەکەیان لە چوار ڕێیانی ئەسـتەمبوڵە. بچۆ بۆ لای ئەوان. خۆت دەتوانی بەتەنها بڕۆیت یا بێم لەگەڵتا؟ گوتم: بەتەنهـا دەڕۆم. ڕۆیشـتم و دوکـانی ئەرمە نییەکـانم دۆزیەوە. دوکـانی قـاوە فرۆشـیان هەبـوو، دوکانەکەیـان لە سـەرەتای شەقامی جمهوری ئێستادا بوو، پەپوولەکانم پیشانی ئەرم نییەکاندا، یەکەمیـان گـوتی: ئـێمە کڕیـارنین و نـازانین کـێ دەیەوێـت. بەڵام ئەوی تریـان گـوتی: پەلەمەکە. کەسێک کارمەندی باڵوێزخانەی سویسـرایە چەند جارێک پێسـتی ئاژەڵی کێوی لە ئێمە کڕیوە، جارێک باسـی پەپوولەی کـردووە. گـوتی: چەند پەپـوولەت هەیە گـوتم: نـزیکەی (٦٠٠) دانە دەبێت گوتی: چەند جۆرن گوتم: نزیکەی سەد جۆرە، ڕەنگە زیاتریش بێت، و چەند دانەیەکی گەورەشی تێدایە کە بەقەبارەی چۆلەکەیەک دەبن. پەپـوولە بچووکەکـان لەیەک سـانتیمەتر بچووکترن و ڕەنگـاوڕەنگن. ئەرمە نییەکـان تـۆ ئەو پەپـوولانەی وەک نموونە هێناوتن لێرە جێیان بهێڵە و ئێمە قسـەی لەگەڵدا دەکەیـن، بەیـانی خـۆت وەرەوە بۆ وەرگرتنەوە هەواڵەکە. گەڵایەک کە چوار پەپوولەی لەسـەر بـوو دام بەئەرمە نییەکـان و بڕیاریاندا کە سبەی بەیانی سەردانیان بکەمەوە بۆ وەرگرتنەوەی هەواڵەکە. پیـانگوتم: بچۆ بۆ شـەقامی مەنوچەهەری لەوێ بپرسـە. ڕەنگە لەوێ کڕیـار هەبێت چـونکە چەنـد دوکانێکی لێیە شتی شاز دەفرۆشن لەوێشەوە برۆ بۆ کۆلانی پشـتی شـارەوانی، لەوێـش پرسیار بکە. منیش ڕۆیشتم بۆ هەردوو شوێنەکە بەڵام هـیچ کەسێک پەپوولەکڕ نەبـوو. کاتژمێر یەکی دوانیوەڕۆ گەڕامەوە بۆ میوانخانەکە، خاوەنی میوانخانەکە گوتی: کڕیـاری پەپوولەکـان هەیەو (٤٠٠) تـومەنی پێـدەدەن گـوتم: بەو پـارەیە نایفرۆشـم. چـوومە ژوورەکەی خۆمانەوەو، عەزیز گوتی: دوو کەس هاتن لەدەرگایـان دا. بەڵام مـن دەرگـام لێنەکردنەوەو ئەوان گوتیـان پەپوولەکانتـان لـێ دەکڕین بە چوارسـەد تـومەن. گـوتم: تـا

سـبەی دەبێت بووەسـتین. عەزیـز گـوتی: وەرە بـا (٤٠٠) تـومەنەکە وەربگـرین و خێـرا بڕۆینەوە بۆ بەهاباد، گوتم: ئەمشەو دەمێنینەوە، سبەی ئەگەر کڕیارێک نەبوو، ئەوکاتە بیرێکـی تـری لێـدەکەینەوە. نـانی نیوەڕۆمـان لە ژوورەوە خـوارد بـۆ بەیـا نیـیەکەی کاتژمێری دە لە دوکانی ئەرمەنییەکان بووم، ئەرمەنییەکان گوتیان ئەو پیاوە ئامادەیە پەپوولەکانـت لێبکرێـت بەڵام گوتـویەتی دەبێـت هەمـوو پەپوولەکـان ببیـنم. خێـرا بـڕۆ پەپوولەکـان بهێنە. بەخێرایـی گەڕامەوە بۆ میوانخـانەکە و لەگەڵ عەزیـز سـندوقەکانمان هێنـایە خـوارەوە بـۆ سـەر شـەقامەکە. عەرەبـانەیەکی ئەسـپی لە بەردەم منـدا وەسـتا و بانگی کردین ئەهـا کوڕەکـان عەرەبانەتـان دەوێـت؟، گوتم: بەڵـێ دەچـین بـۆ چوارڕێیـانی ئەسـتەمبۆڵ. گـوتی: کـرێیەکەی سـێ تـومەنە. گـوتم: باشـە سـندوقەکانمان خسـتە نێـو عەرەبانەکەوە و سەیرمکرد دوو کەسی وەک پیـاوەکەی دوێنـی خەریکن لەکەڵ خـاوەنی عەرەبانەکەدا قسەدەکەن، عەرەبانەکە کەوتەڕێ، سەیرم کرد خەریکە بەرەو سێ ڕێیـانی سـەرویس دەڕوات، گوتم: سـەری ئەسـپەکەت بسـوڕێنەوە، ئێمە دەچـین بـۆ چوارڕیـانی ئەستەمبوڵ. گـوتی: ئەم دوو پیـاوە دەڵـێن دەچـین بـۆ گۆڕەپـانی شـوش منـیش ڕۆیشـتم بەردەمی ئەسپەکەم گرت و تابیسـوڕێنمەوە، لەناکاو زللـەیەکی بەهێزم لێدراو کەوتمە سەر شەقامەکە، شەقێکیشیان لە عەزیز هەڵداو، ئەویش کەوتە سەر شەقامەکە، خوێن بە خوڕ بەلـوتم دا دەهـاتە خـوارەوە، سەریشـم شـکابوو بەڵام هێزمـدایەبەر خـۆم و ڕامکرد بۆگەراجی ئوتوشەهیر سەیرم کرد. ئەبو فەزڵی شـوفێر و حشـمەتی ئەردەکانی و چەنـد کەس و شـوفێرێکی تـر وەسـتا بـوون، هـاوارم لێکـردن فریامـانکەون سـندوقەکانیان لـێ دزین، گوتیـان کوا؟.. چـی لێهـات. عەرەبـانەکە نـزیکەی (٥٠) مەترێـک دوورکەوتبووەوە. هەمووان بەدوایدا ڕایان کردو کردیان بەهەرا و ئای دز ئای دز خەڵکینە ئەو عەرەبـانەیە دزە و بیگـرن، کـاک حەسـەن سەرپەرشـتیاری گەراجەکەش لەنێوان شـەقامەکەدا وەسـتا بوو هاوارم لێکرد، کاک حەسەن فریاکەوە، ئەو عەرەبـانەیە بگرە. لەپڕێکا ١٠-١٥ کەس خۆیان بەعەرەبانەکەوە هەڵواسی. دوو کەسەکە ڕایانکردو خـاوەن عەرەبـانەکەش گوتی: مـن تـاوانم نییە خۆ مـن نـازانم ئەم سـندوقانە هـی کێن، دوو منـداڵ پێم دەڵـێن بـڕۆ بـۆ چوارڕێیانی ئەستەمبوڵ و دوو پیاوی گەورەش دەڵێن بڕۆ بۆ سـێ ڕێیـانی شـوش. کـاک مـحەمەدی وەتەنخـوا گەیشـتە لامـان و گـوتی: ئەوەچـیە ؟ منـیش بەسـەر هـاتەکەم بـۆ گێـڕایەوە، ئەویـش یەخەی خـاوەن عەرەبـانەکەی گـرت و گـوتی: ئەوە تـۆ دەتەوێـت سندوقی ئەم دوو منداڵە بدزیت. خاوەنی میوانخانەکەش پەیدابوو کـاک مـحەمەد پێیگـوت هەرچییەک هەیە لە ژێـر سـەری تۆدایە. مەگەر مـن دوێنـی پێمنەگوتی: ئەم دوو منداڵە کەسـی مـنن و ئاگاداریـانبە، ئیتـر سـندوقەکانیان لە عەرەبـانەکە داگـرت و منـیش چووم

سەرو چاوم شۆرد و ئەو برادەرانە سندوقەکانیان خستە عەرەبانەی ماتۆڕی سێ تایەوەو دڵنیاییان لە خاوەنەکەی وەرگرت و عەزیز لەلای پێشەوە دانیشت ومنیش لە تەنیشت سندوقەکانەوە سواربووم. بەرەو، شەقامی ئەستەمبوڵ ڕۆیشتین، خاوەنی ماتۆرەکە خەڵکی خورەم ئاباد بوو، لە نەتەوەی لوڕبوو، پیاوێکی زۆرباش بوو، ئەو گوتی: خاوەنی ئەو عەرەبانەیە دزە و هاوکاری دزەکان دەکات چەندین فایلی بۆکراوەتەوە لە بنکەکانی پۆلیس. گەیشتینە بەردەم دوکانی ئەرمەنییەکان گوتیان سندوقەکان بهێننە نێو دوکانەکەوە. ئەو پیاوە لوڕەی خاوەنی ماتۆڕەکە زۆر میهربان بوو خۆی سندوقەکانی لەگەڵ داگرتین و بردماننە نێو دوکانەکەوە، (٤٥) ڕیاڵ کرێم پێدا. یەکێک لە ئەرمەنییەکان ناوی ئیستپان بوو، گوتی: بەیانی وەرن پارەکەتان وەربگرن. لێم پرسی پارەکە چەندە؟ گوتی: من جارێ نازانم کڕیار پێویستە پەپوولەکان ببینێ. پاشان پارەکە بدات. ئەرمەنییەکە گوتی: من لەبری ئێوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەم. گوتم: ئێمە لە تاران دا هیچ کارێکمان نییە دەبێت زوو بگەڕێینەوە بۆ یەزد.ئەگەر دەکرێت ئەمڕۆ پارەکەمان بۆ وەربگرن، ئەرمەنییەکە تەلەفۆنێکی کردو گوتی: کاتژمێر پێنجی دوای نیوەڕۆ وەرن پارەکانتان وەربگرن. ئیستپان گوتی: ئەوە بۆچی لاچاوت شین بۆتەوە و هەموو دەموچاوت سوربۆتەوە. منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە و گوتی: ئای لە کارو کردەوەی مسوڵمان. من و عەزیز بەرەو شەقامی بوزەر جەمهەری ڕۆیشتین. من لەخۆمەوە نیگەران بووم، دەترسام، کە ئەرمە نییەکان پارەکەمان پێنەدەن. دیاربوو عەزیزیش هەر نیگەران بوو، گوتی: باشتر نەبوو ئەگەر هەر لە ئوتێلەکە بمانفرۆشتایە و (٤٠٠) تومەنەکەمان وەربگرتایە؟ گوتم: تازە کارێک بوو کردمان باچاوەڕوان بکەین، بزانین چی دەبێت؟، گەیشتینە تۆپخانە، عەزیز گوتی: بابچین بۆ سینەما. گوتم: باجاری بڕۆین حیسابمان لەگەڵ میوانخانەکە بکەین. سەرەتا چووین بۆلای کاک محەمەدی وەتەنخوا ئەو پێی گوتین بۆچی دوێنی سەرەتا نەهاتنەلای من و ڕۆیشتن بۆ میوانخانەکە. خێرا بڕۆن شتومەکەکانتان بهێنن بۆ ئێرە. ڕۆیشتین بۆ میوانخانەکە خاوەنی میوانخانەکە گوتی: ئێوە منداڵێکی عەجولن. خۆ خەریک بوو منیش بکەن بەدز. گوتم: دەمانەوێ بڕۆین بفەرموو چەندت قەرزارین تا پێتی بدەین. گوتی: دەزانم دەتانەوێ بڕۆن. کاک محەمەدی وەتەنخوا پارەکەی بۆداون، بڕۆن شتەکانتان هەڵبگرن و بڕۆن. ئێمەش کەلوپەلەکانمان هەڵگرتوو گەڕاینەوە بۆلای کاک محەمەد. کاک محەمەد گوتی: بڕۆن ژووری سەرەوەی گەراجەکە بەتاڵە و شتەکانتان لەوێ دا بنێن، فەرموون ئەوەش کلیلەکەی تا ئەو کاتەی لە تاران دەمێننەوە لەو ژوورەدابن. کاک

# شازادەی حەمام

محەمەد باوکی هاوپۆل و هاوڕێی خۆشەویستم فەرهادی وەتەنخوا بوو، کە نزیکەی (٥٠) ساڵ هاوکاروهاوبەشی ئامۆزاکەم بوو.

کاتژمێرسێی دوانیوەڕۆ لەگەڵ عەزیز چووین بۆ سینەما، عەزیز بۆ یەکەمجار بوو، کە بچێت بۆ سینەما بیرم نەماوە، کە فلیمەکە چی بوو! بەڵام لە نیوەی فلیمەکەدا عەزیز گوتی: خۆزگە مورتەزا نەمردایە، باشە ئێمە چی بە دایکی بڵێین، دەستیکرد بەگریان. کاتژمێرنزیکی پێنجی دوای نیوەڕۆ لای دوکانی ئەرمەنییەکان بووین ئیستپان بە زمانە تایبەتەکەی خۆی گوتی: های چ پەپوولایەک بوون زۆر زۆری جەوان بوون، من زۆری قسام کرد، زۆرم پارەکان بۆ ئێوە وەرگرتووە. گوتم: چەندە؟ گوتی: هەژدە هەزار تومەن. گوتم: :چی .. چی.. چەند؟ گوتی: هەژدە هەزار تومەن. من زمانم لاڵ بوو، عەزیز نەیدەزانی هەژدە هەزار تومەن چەندە؟. بەڵام من دەمزانی کە چەند مانگێک پێش ئێستا لە گەڕەکەکەی ئێمە خانوویەکی (٢٥٠) مەتری بەخشتێکی جوان و بەبیری ئاو و کە سێ ژوور و هۆڵێک بوو بە (٥) هەزار و (٥٠٠) تومەن فرۆشرابوو. نرخی پاسێکی تازەی (٤٢) نەفەریی بە (٢٥) هەزار تومەن بوو، دووبارە لێم پرسیەوە چەند؟ هاوڕێکەی ئیستپان گوتی: ئەوە گێژبووی دەڵێ هەژدە هەزار تومان. پارەکە هەمووی سەد تومەنی بوو، ژماردی و پێیدام و ئیستپان ڕووکردە عەزیز و گوتی: هەردوکتان هاوبەشن؟ من گوتم: نەخێر، من هاوبەشی نیم، هاوبەشەکەی لە شاخ هەڵدێراو مرد. ئستپان گوتی: چی؟ چی؟ چۆن مرد؟ . گوتم: بەڵێ ڕۆیشت پەپوولە بگرێت و لە شاخەکە هەڵدێراو مرد. ئەرمەنییەکەی تر گوتی: مەگەر باوکی لەگەڵیدا نەبوو؟ گوتم: نەخەیرناوی مورتەزابوو، باوکی نەماوەو دایکیشی نەخۆشە و لەکێوەکانی بەهاباد دەژین. گوتی: لە کوێ هەڵدێراو مرد؟ گوتم: لە کێوەکانی کوردستان. گوتی: بۆچی چوو بوو بۆ کوردستان؟ ڕۆیشتبوو، پەپوولە بگریت؟. گوتم: نەخێر چووبوو کەتیرە کۆبکاتەوە، منیش چیرۆکی کەتیرەکردنم بۆ گێڕایەوە. ئیستپان بە عەزیزی گوت چی لەو پارانە دەکات؟. گوتی: نیوەی دەدەمە دایکی مورتەزا و نیوەکەی تریش هەرچی باوکم بڵێت. ئستپان گوتی: ئەی باوکی تۆ چ کارەیە، گوتی: باوکم کوێر و فەلەجە و پارەی نییە منی بۆماوەی چوار مانگ داوە بە کرێی بەبری (١١٠) تومەن.

ئێستا باوکم زۆر خۆشحاڵ دەبێت بەم پارەیە. عەزیز ڕوویکردە من و گوتی: من چەند (١١٠) تومەنیم دەستدەکەوێت؟ ئەو دوو ئەرمەنییە بەزمانی خۆیان چەند قسەیەکیان کردو، ئیستپان گوتی: قاوە دەخۆن؟ من گوتم: نا ناخۆین. من لە پرسەکان دا لە شاری یەزد قاوەم خواردبوو. عەزیز گوتی: قاوە چییە؟ ئیستپان گوتی: دانیشن با قاوەتان بۆ بهێنم. سەرو قاوەی بۆتێکردین. ئەرمەنییەکیان گوتی: ئێستا بۆکوێ دەچن؟

گوتم: دەچین بۆگەراج بەڵکو هەر ئەمرۆ بتوانین بگەڕێینەوە بۆ یەزد. ئەوان بەیەکەوە قسەیان دەکرد، منیش پارەکەم خستە نێوگیرفانی کراسەکەمەوە و دوگمەکانم داخستن و ماڵئاواییمان کرد و لە دوکانەکە هاتینە دەرەوە. هێشتا نەگەیشتبووینە سەر شەقامەکە ئیستپان بانگی کردینەوە، گوتی: وەرن بگەڕێنەوە. ئێمەش گەڕاینەوە، هەردوو ئەرمەنییەکە پێیانگوتین (٩) هەزار تومەنی تروەربگرن. واتە (٩٠) دانە سەد تومەنی تریان پێدام. گوتیان ئاگاداربن پارەکەتان لێنەدزن. نرخی (٢٧) هەزار تومەنی ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) بەرامبەر بوو بە (١٤٠) ملیۆن تومەنی ساڵی (١٣٨٥-٢٠٠٦)، خۆ ڕەنگە زیاتریش بێت. من گێژببوم پێم سەیربوو کە پەپوولەکان بایی ئەو هەموو پارە زۆرە بوون، عەزیزیش دەیگوت بەو پارەیە دەتوانم پاسکیلێک بکڕم؟ منیش پێمگوت پاسکیلێک هیچ نییە، بەڵکو دەتوانیت سەد پاسکیلیش بکڕیت. ئەوکاتە پاسکیلی نمرەیەکی بریتانی نرخەکەی(٢٨٠-٣٠٠) تومەن بوو. بە عەزیزم گوت لای هیچ کەسێک قسەنەکەیت کە چەندەمان پارە پێیە. گەڕاینەوە بۆ گەراج و بۆ لای کاک محەمەد ئەویش کاتژمێر (٧) ی ئێوارە ئێمەی بەرەو یەزد بەڕێکرد. ڕۆژی دواتر نزیکی نیوەڕۆ گەیشتینە گەراجی ئەتمینانی یەزد. عەزیز گوتی: با جارێ بڕۆین پاسکیل بکڕین. چووینە دوکانی حاجی کەسائی لە شەقامی پەهلەوی لەلای سینەما سەرویس. پاسکیلێکی باشمان کڕی بە پەمپی هەواو چەند دانە پەنچەریی یەک و قوتوی بچکۆلەوە بە (٢٧٥) تومەن، سوار پاسکیلەکە بووین ڕۆیشتین بۆ ماڵی ئێمە، دایکم بەبینینم زۆر خۆشحاڵ بوو. گوتی: ڕۆڵە ئەوە بۆکوێ ڕۆیشتبووی.. ئەم منداڵە کێیە لەگەڵت؟ گوتم: ڕۆیشتبووم بۆ قەزوێن، سبەینێ دەچم بۆ بەهاباد ئەم منداڵە دەبەمەوە و پاش چەند ڕۆژێکی تر دەگەڕێمەوە.

## بەهاباد و هەژاریی و نەبوونی

بەیانی زوو من و عەزیز ڕۆیشتین بۆ مەیدانی میر چەقماق. ئۆتۆمبێلەکانی بافق و بەهاباد لە گەراجی حاجی عەلی چییەوە دەردەچوون، پاس ڕاستەوخۆ لە یەزدەوە نەدەچوو بۆ بەهاباد، دەبوایە بەسواری ئۆتۆمبێلی باری بڕۆیشتینایە. حسێن علی کاشی خاوەنی پاسی بافق منی بینی. بانگی کردم ئەها حسێن بۆ کوێ؟ گوتم: لەگەڵ عەزیز و پاسکیلەکەی دەمانەوێت بچین بۆ بەهاباد. حسێن علی گوتی: بەپاس تا بافق بڕۆن، بەڵام لە بافقەوە تا بەهاباد دەبێت بەسواری پیکابی باریی بڕۆن. بەڵام پیکابیش هەمو ڕۆژێک نییە بەچەند ڕۆژ جارێک پێکاب دەردەچێت جا ئەوەش کەوتۆتە سەرشانسی خۆتان. لە بافق ماتلی ئۆتۆمبێلی باریی دەبن یا نابن. هێشتا شەقامی بافق بۆ یەزد خۆڵ بوو، لە پشتی دەروازەی شارەوە واتە لە کۆتایی شەقامی سورەبیا (سلیمان فارسی) تەپۆڵکەی خۆڵی دەستپێدەکرد. بەیانی سواری پاس بووین و بەڕێکەوتین دوانیوەڕۆ گەیشتینە بافق لە ڕێگا چوارجار وەستاین. پێشئەوەی بگەینە گوندی فەهرەج پاسەکەمان کەوتە چاڵێکەوە دەبوایە هەموومان دابەزینایەو پاڵ بە پاسەکەوە بنێین. زیاتر لە (٨٠) کەسی گەورەو بچووک سواربوو بوون. لەکاتێکدا پاسەکە خۆی جێگای (٣٥) کەس دەبوو، ناوەڕاستی پاسەکە و سەرەوەی پڕ بوو لەبار چەند بەرخێکیش لەدواوە سوارکرابوون. نزیکەی یەک کاتژمێری پێچوو تا پاسەکە لە چاڵە زیخەکە هاتە دەرەوە. لە ساڵی (١٣٤٥-١٩٦٦) بەدواوە هەمووئەو گردۆڵکە زیخیانە بەهۆی هەڵکەندنی بیری ئاوو دانانی ترومپا لەسەری وردە وردە گۆران بۆ باخ. یەکەم کەس کە لەم شوێنەدا بیری ئاوی هەڵکەند عەلی عەسکەرخان، سەرۆکی شارەوانی یەزد بوو. هەربۆیەش ئەم ناوچەیە بەبیری شارەوانی ناسرا. پاشان بەڕێز (کەشفی پور مەهریزی) لەگەڵ چەند کەسێکی تر، ئەوانیش لەم شوێنەدا بیری ئاویان هەڵکەند. ساڵی (١٣٨٦-٢٠٠٧) کە بۆ ئامادەکردنی بیرەوەرییەکانم ڕۆیشتم بۆ بافق لەو ناوچەیە چەندین باخی گەورە

دروستکرابوون. کشتوکاڵ و باخداری لەم ناوەدا باش پێشکەوتبوو. تەکنۆلۆژیا و سەرمایەداری و هەوڵی یەزدییەکان ئەم بیابان و گردۆلکە و زیخەلانەیان گۆڕی بوو بۆ باخ و ئاوەدانی. لە ساڵی (١٣٤٥-١٩٦٦) دا یەکێک لە خزمەکانی من لەم تەپۆلکە و زیخەلا نییەدا بڕی (٣) هێکتار زەوی کڕی بە دە کاتژمێر ئاوی بیر و بە نرخی هەر مەترێک بە (٥٠) ڕیاڵ. لە ساڵی (١٣٨٧-٢٠٠٨) هەرئەوشوێنە مەتری (١٢٠) هەزار تومانیان پێدەدا خودا بەرەکەت بدات، دیارە خۆ دەزانن، کە بەرەکەت و بیری ئاو یەک بنەمایان هەیە، کاتێک کە دەڵێن خودا بەرەکەت زیادبکات، یەکێک لە ماناکانی ئەوەیە، کە خودا ئاو بدات. ئەگەر خودا ئاو بدات ئەوا هەموو شوێنێک ئاوەدان دەبێتەوە. ئەوەتا لە ماوەی (٤٠) ساڵدا نرخی زەوی (٢٤) هەزار جار زیادی کردووە، تەپۆلکە زیخەلا نییەکانی خودا کاتێک بەئاوی خودا و هێزو بازووی مرۆڤ و ماتۆڕ و تورومپا یەکیان گرت، زەویش نرخ پەیدا دەکات، بەلام هەندێک جارگران بوونیشی پەیوەستە بە بێویژدانی وئابووریی خراپی بەندەکانی خوداوە. ئۆتۆمبێلەکە بەم هەموو سەرنیشی و بارو ئاژەڵەوە گەیشتە بیری خاوەر. کە شوێنێکە لە ناوەڕاستی ئەو بیابانەدا ڕەحمەتی خودا لەو کەسە بێت، کە ئەو بیرەی بەدەست هەڵکەندووە، حەوزی ئاوی بۆ دروستکردووە. کە کەس نازانێت لە چ بەروارێکدا هەڵکەندراوە، ناونراوە بیری خاوەر و هەزاران کەس ئاوی لێدەخۆنەوە و پشووی لێ دەدەن. بەلام نەوەی نوێ کە سوار ئۆتۆمبێلی فێنک کەرەوە و ئۆتۆمبێلی یەخەچاڵدار دەبن و بە شەقامی قیردا گوزەر دەکەن، نازانن من باسی چی دەکەم خۆ ڕەنگە هەندێکیان بزانن باسی چی دەکەم، بەلام تێناگەن لە ڕووداوەکان. جیاوازی هەیە لە نێوان نازانین و گوێ لێبوون دا. ئەم هەموو خەڵکە لەبەر ئەو گەرمایە لە ژێر سێبەری دیوارێک دا ئاوی بۆگەن وپڕ لە کرم دەخۆنەوە. هەموو واهەست دەکەن، کە ئاوی سەرچاوەی کەوسەر دەخۆنەوە، گەرمای کەوێربە جۆرێک هیلاکی کردبووین. کە خۆڵ و تەپ و تۆز گەرووماني پڕکردبوو. ئارەق بە هەموو گیانماندا دەهاتە خوارەوە. کاتێک مشتێک ئاوی بیری خاوەر و ئاوی حەوزی کەوێرمان خواردەوەو دەم و چاومان تەڕکرد، سەدان جار سوپاسی خودای گەورەمان کرد. هەر کەسێک دەهاتە سەرئاوەکە دەیگوت هەزار ڕەحمەت لە دایک و باوکی ئەو کەسەی ئەم بیرەی هەڵکەندووە. لە ماوەی سێ ڕۆژدا. لە بەهەشتەکەی گەردەنەی زمزیرانی نێوان سەردەشت ومەهاباد گەیشتینە دۆزەخەکەی کەوێری نێوان یەزد و بافق. ئەو شیو و دۆڵ و کێوە پڕدارو گوڵ و باڵندە جوانە لە کوێ وئەم بیابان و زیخەلان و وشکییە لە کوێ، ئەو ئاوە ساردو سازگارەی کوردستان لە کوێ و ئەم ئاوە گەرم وبۆگەنەی کەوێر لە کوێ. ئەو کچە سوورو سپی پەریی ئاساییانە لە کوێ و

ئەم کچە داماوو دەموچاو ڕەشە لە کوێ. ئەو جلوبەرگە فراوان و ڕەنگاورەنگە لە کوێ و ئەم جلە ناشیرین وپینەکراوانە لە کوێ!. وام بیرکردەوە کە ڕۆیشتنی خەڵکی بۆ کۆکردنەوەی کەتیرە خۆی لە خۆیدا سەیران وسەفایە.

ڕاکردنە لەدەست گەرما، دیارە کە ئەم بیابانە هەژاری بەرهەمدەهێنێ و ئەو کێو و دارستانەش سەروەت و سامان. لە کاتی بوونی ئیدارەیەکی باش و سەرکەوتوودا لەهەمان بیابان و لەژێر کێوەکانی کەوێردا سامان پەیدا دەبێت، بەڵام بەئیدارەیەکی ناردروست لە بەهەشتی کوردستاندا هەژاریی و برسێتی دروست دەبێت. لە کۆتایی دا پاش چەند ساڵێک بەشێک لەم سامانە واتە دۆزینەوەی کانی ئاسن ڕەونەق و پێشکەوتنێکی بەخشی بەم ناوچەیە.. ئێمە دوو منداڵ عەقڵمان پێنەشکا کە بەو گەرما زۆرە گۆزەیەک ئاو لەگەڵ خۆمان دا هەڵبگرین، ئەوکاتە تەرمۆزە و بتڵی ئاوی سروشتی نەبوو، پیپسی کۆلاش تازە پەیدا ببوو بەڵام هەندێک کەس لەبەر بەرژەوەندی خۆیان دەیانگوت حەرامە. لە بیری خاوەرەوە بەڕێکەوتینەوە، تەواو لە کاتژمێری دووی دوانیوەڕۆ، کە گەرما تەواو هیلاکی کردبووین. پاسە کەمان پەنچەر بوو. هەمومان دابەزیین و هاوکاری شوفێرەکە دەیگوت برغو و سەمونەکانی تایەکە ئەوەندە گەرمن ناتوانم تایەکە بکەمەوە. چەند پارچە قوماشە کۆنیان پەیداکرد تا بەهۆیەوە دەستبەرن بۆ برغو و سەموونەکان لە کاک حسێن عەلیم پرسی بۆچی بەڕۆژهات وچۆدەکەن؟ ئەگەر بەشەو هاتوچۆ بکەن باشتر نییە. گوتی: ئەم شەقامە ئەوەند چاڵ و چۆڵی تێدایە ناتوانین بەشەو پێدا بڕۆین، بۆیە دەبێت بە ڕۆژهاتوچو بکەین.. هەروەها گوتی: شەو هەوا فێنکترە بەڵام دەکەوینە چاڵەکانەوە. هەرکاتێک بەشەو هاتوچۆ بکەین شوێنێکی پاسەکە دەشکێت. کاک حسێن علی خۆی خاوەنی ئۆتۆمبێل بوو، بەڵام شوفێریی نەدەکرد و خوێندەوارییشی نەبوو، یادەورییم لەگەڵ ئەودا زۆرە، جارێک منی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ کرمان. بۆ کاروباری ئۆتۆمبێلەکەی کە لە شوێنێکی تردا باسی دەکەم. بەهۆی ئەوەوە کە من خزمەتێکم بە ئەو کردبوو، ئەویش زۆر ڕێزی لێدەگرتم. شوفێرو هاوکاری شوفێر خەریکی گۆڕینی تایەکە بوون، گەشتیارەکان لەپاڵ سێبەری ئۆتۆمبێلەکە دانیشتبوون. عەزیز گوتی: زۆرم تینووە. منیش بەچەند کەسێکم گوت کەمێک ئاومان بدەنێ، ئەوان هەموو کوزە ئاویان پێبوو، هەموویان گوتیان ئاومان پێنەماوە. حسێن عەلی گوێی لە قسەکانمان بوو، گوتی: ئاوتان دەوێت؟ گوتم: بەڵێ. کەسێک کە لەوێ دانیشتبوو گۆزە ئاوێکی پێبوو. حسێن عەلیش گۆزە ئاوەکەی ئەو کەسەی هەڵگرت ودایە دەست ئێمە و گوتی: ئاو بخۆنەوە، پاشان بەدەنگێکی بەرز چەند جوێنێکی بۆ دایک و باوکی هەمووان نارد و گوتی: ئەوە خێری هەمووان. چونکە ئێوە

لە شــەمەری دەشــتی کەربەلا تاوانبـارترن دوو منـداڵ داوای ئـاو دەکەن، ئێـوە دەڵـێن گۆزەکەمان ئاوی تێدا نەمـاوە. گەیشـتینە بیـری ناسـراوی خـانە پێنچ، خـانە پێنچ واتە (٥) فرسـەخ (٣٠ کـم) ی دەمێنێـت بـۆ بـافق، لێـرەش لەم ناوەڕاسـتی بیابـانەدا حەوزی ئـاو هەبوو. سـاڵی (١٣٨٦-٢٠٠٧) کە چـووم بـۆ بـافق شـەقامەکە (٢٠٠) مەتـر دوور بـوو لەو حەوزەوە. ئیتـر هـیچ کەسـێک پێویسـتی بەئـاوی ئەو حەوزە نەدەبوو، بەڵام هەر دەبوو چاودێری بکرێت، چونکە بۆ ئاوخواردنەوەی ئاژەڵی کێوی و حوشترەکانی ئەو نـاوچەیە بەسـوود بـوو. شـوفێرکە گـوتی: دەوەسـتین بـۆ سـاردکردنەوەی ڕادیـتەری پاسـەکە، خەڵکەکەش دەبوو دابەزن فشاری گەشتیارانی ناو پاسەکە هیچ کەمتر نەبوو لە فشـاری یەکەم شـەوی نێوگۆڕ، لەم گەرمـایە دا و (٨٠) کەس لە پاسـێکی (٣٥) نەفەریـی دا لەگەڵ (٧-٨) سـەر مەڕ و بەرخ دا کە بـۆنی ڕیـخ و میـزی ئەو بێزمانـانە و هیلاکـی وتینـوێتی کـارێکی پێکـردین کە بـاس ناکرێـت، سـواربوونی ئەم پاسـە زۆر ناخۆشـتربوو لە ئۆتۆمبێلەکەی مام ئارام .

هێشـتا سـێ فرسـەخ مـابوو بگەینە بـافق کە سـێ کەس بە کۆڵێکی گەورەوە، لەسـەر شەقامەکە وەستابوون و دەیانویست سواربن. لە کوێ جێگای سـواربوون هەبوو. بەڵام هەرچێنێک بوو سەرکەوتن و سواربوون، کاک حسێن عەلی هاواریکرد: ئەهای پوورە وا لێکراو، وریابە قاچەکانت کۆبکەوە. کاتی خۆرئاوابوون گەیشتینە بافق کە ئەو کاتە تەنهـا کوێرە دێیەک بوو، لە بەردەمـی مزگەوتەکە دا چەنـد دوکانێـک هەبـوو، نانەواخـانەیەک، دوکانێکی وردەفرۆشی و بەقاڵی. خۆ لە پشتی مزگەوتەکەوە بـاخێکی خورمـا هەبـوو کە سـەوزدەچووەوە، کـاک حسـێن عەلـی بـۆ ئۆتـۆمبێلی بـاریی پرسـیاری لە چەنـد کەسـێک کرد.

گوتیـان سـبەینێ ئۆتۆمبێـل دەچێـت بـۆ بەهابـاد، بڕیارمانـدا کە شـەو لە سـەربانی دوکانی نانەواکە بخەوین کە هی هاوڕێیەکی کوڕە پوورەکەی من بوو. لە دوکـانەکە نـان و پەنیرو شووتییەکی بچکولانەم کڕی، لە بەردەمـی نـانەواکەدا خواردمـان نـانەواکە دوو گونییەی دامـێ. گوتی: بـڕۆنە سـەربان. لە پەیـژەکەوە سـەرکەوتین و گونێییەکانمـان لە سـەربانەکە ڕاخسـت، بەڵام سـەربانەکە ئەوەنـدە گەرم بـوو وەک ئـاگر وابـوو. پـاش نیـو کـاتژمێر هەمـووان دوکانەکانیـان داخسـت و بەرەو مـاڵ ڕۆیشـتن، پاسـکیلەکەمان لە بەردەم نــانەواکەدا دانــابوو، عەزیــز هەرچەنــد خولەکێــک جارێــک هەڵدەســا لە سەربانەکەوەسـەیرێکی پاسـکیلەکەی دەکرد، ئـاخۆ ماوەیـان نـا، گـوتم: کـاکە گیـان هـیچ کەسـێک پاسـیکلەکەت نابـات ئێرە بـافقە تـاران نییە، ئەگەر یەک تەشـت ئـاڵتون لەسـەر شەقامەکەش دابنێی سبەی کە هاتیتەوە هەر لە شوێنی خۆیەتی بۆیە دڵنیابە کەس کاری

به‌پاسکیلی تۆ نییه. هه‌وا خه‌ریکبوو ورده ورده فێنک ده‌بوو مێشوله هیلاکیان کردبووین. ئاسمان زۆر ساف و جوان بوو ئه‌ستێره‌کان ئه‌وه‌نده نزم و گه‌وره‌بوون وات هه‌ستده‌کرد که ده‌توانی به‌شتێکی که‌مێک درێژداده‌گیرێن. نازانم خه‌وم لێکه‌وت بوو یان ناسه‌یرم کرد عه‌زیز گو نییه‌که‌ی هه‌ڵگرتووه‌و خه‌ریکه له په‌یژه‌که‌وه ده‌چێته خواره‌وه. گوتم: ئه‌وه بۆکوێ ده‌ڕۆی؟ گوتی: ده‌چم له‌لای پاسکیله‌که‌وه ده‌خه‌وم، هه‌وا ساردبوو شه‌وی ده‌شتی که‌وێرسارده. به‌ڕۆژ گه‌رما هه‌ڵتده‌پروکێنێ به‌شه‌وانیش سه‌رمات ده‌بێت، هیچ چاره‌یه‌کم نه‌بوو جانتا و پاره‌و شتومه‌که‌کانم له ته‌نیشتمه‌وه بوون. بۆ ئه‌وه‌ی گه‌رم ببمه‌وه جانتاکه‌م له باوه‌شی خۆم گرت و خه‌وتمه‌وه به‌بانگی به‌یانی به‌خه‌به‌رهاتم. نانه‌واکه خه‌ریکی هه‌ویر شێلان بوو، هه‌ویره‌که‌ی ئه‌م دیواو دیو ده‌کرد. ئای نان به‌چ زه‌حمه‌تێک دروست ده‌که‌ن، به‌ڵام خواردنی چه‌ند خۆشه.. عه‌زیز له خه‌و دا بوو ئه‌گه‌ر پاسکیله‌که‌ی دوو ساڵ له‌وێ بکه‌وتایه که‌سێک کاری به‌سه‌ریه‌وه نه‌بوو، ئۆتۆمبێلی باری کاتی ئێواره ده‌که‌وته‌ڕێ، نان و په‌نیر و شووتیم کڕی و له‌گه‌ڵ خۆماندا بردمانن بۆ ناو باخه دار خورماکه. له‌ژێر سێبه‌ری داره‌کاندا دانیشتین، دوای نیوه‌ڕۆ ئۆتۆمبێله‌که له‌به‌رده‌می مزگه‌وته‌که‌دا وه‌ستابوو، ٥٠-٦٠ که‌س لێگردببوونه‌وه که هه‌موویان ده‌یانویست سواربین. ئۆتۆمبێله‌که وه‌ک ئۆتۆمبێلی مام ئارام تا سه‌رچه‌مچه‌کانی باری لێبارکرابوو، بڕیاربوو که گه‌وره‌کان له قه‌راخه‌وه سواربن و قاچیان شۆڕ بکه‌نه‌وه‌و به‌دیووی ده‌ره‌وه‌دا، ده‌بوایه ده‌ستیان توند به‌ئاسنی قه‌راخه‌که‌وه بگرتایه، ژن و منداڵه‌کانیش له ناوه‌ڕاسته‌وه دانیشتن، ژن وکچی که‌م تێدا بوو له ٥-٦ که‌س زیاتر نه‌بوون، به‌ڵام پیاوی به ته‌مه‌ن و گه‌وره و گه‌نج زۆر بوون. من به‌نیوه پیاوو عه‌زیز به چاره‌که پیاو ئه‌ژمار ده‌کرا. من ده‌بوایه سێ تومه‌ن کرێبده‌م و عه‌زیز دوو تومه‌ن بدات، له یه‌زده‌وه تاسه‌رده‌شت و له‌سه‌رده‌شته‌وه تائێره. ئه‌مه تاکه جێگا بوو که کرێی ئۆتۆمبێلم بده‌م. خه‌ڵکیان وه‌ک مه‌ڕ سوار ده‌کرد، گرنگ ئه‌وه بوو هیچ که‌سێک پرته‌و بۆڵه‌ی نه‌بوو. خه‌ڵکه‌که له ئۆتۆمبێله‌که‌ی حسێن عه‌لیش دا هه‌ر بۆڵه بۆڵیان نه‌کرد. به‌ڵکو زه‌حمه‌تیان ده‌کێشا و گه‌رمایان ده‌بوو، پاره‌یان ده‌داو گوێشیان له جنێوده‌بوو. چه‌ند کچێکیش سوار بوون، ئه‌م داماوانه چه‌نده ڕه‌ش و ده‌موچاو سووتاوو بوون، جله‌کانیشیان کورت و دڕاو و پینه‌کراو بوو، به‌هیچ شێوه‌یه‌ک له جوانی قه‌دو باڵاو چاو و برۆدا له کچه کورده‌کان نه‌ده‌چوون. هیچ کچێک لێره گه‌ردانه‌و پڵپڵه‌و پاره‌ی زیوییان پێوه نه‌بوو، ئه‌وه‌نده‌ی من بزانم له ته‌واوی به‌هاباد وگونده‌کایشی یه‌ک دانه پاره‌ی زیوی ده‌ستنه‌ده‌که‌وت به‌هیچ شێویه‌ک حه‌زم له کچه‌کانیان نه‌ده‌کرد، به‌هیچ شێوه‌یه‌ک هه‌ستم نه‌ده‌کرد که ئه‌مانه خه‌ڵکانی زه‌حمه‌تکێش و ساده‌و خۆش به‌خت

بووبن. بەڵام هەژاری ونەبوونی و برسێتی، پشتی ئەمانەی شکاندبوو، ئەم بیابانە کەم ئاو کەم لەوەڕگایە دووچاری کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتووان ببوو. ڕژێمە یەک لە دوای یەکەکانیش بەدرێژایی سەدەکان نەیاندەزانی کە لێرەدا خەڵک دەژین. ئەم خەڵکە لێرەدا ئەوەندە هەژار بوون کە هیچ سوڵتان و سەرلەشکرێک بەبیری دا نەهاتووە کە بێت و وڵاتەکەیان داگیربکات، هیچ دەوڵەمەند و سەرمایەدارێک بیری لەوە نەکردۆتەوە بێت و لێرە سەرمایەگوزاریی بکات و خۆی ببێت بەئاغای ناوچەکە.

لەم کەوێرەو لە بیابانەکانی کەوێردا و لە هەموو بافق و بەهاباد دا ئەگەر کەسێک خاونی تەنها (٢٠) سەر بزن بوایە، ئەوا ناوی بە خان دەردەچوو. ئەگەر کەسێک لێرەدا کەمێک ئاوی هەبوایە بۆ ئاودێری ئەوا ئەو کەسە ئاغایەکی گەورەبوو. بەرهەمی هەناردەی ئەم ناوچەیە تەنها مرۆڤی زەحمەت کێش بوو، هیچی تر. پاش چەند هەزار ساڵ هەندێک بیریان لەوە کردەوە کە دەستبکەن بە دەرهێنانی کانەکان بەخۆشی خۆیان بوو بێت یان نا ئەم کەلاوە و ئاواییانەیان کردە خاوەنی نان و نانەوایی، بابگەڕێینەوە بۆ بابەتەکەی خۆمان.

پیاوانی تەمەن سی ساڵە لە پیاوانی تەمەن ٦٠-٦٥ ساڵە دەچوون، پاسکیلەکەی عەزیز بۆمان ببوو بە کێشە، ئەگەر لەلایەکەوە هەڵمانپەرسـاردایە، دیسانەوە جێگای چەند کەسێی دەگرت. بۆیە چووینە سەر ئەو باوەڕە کە لە ناوەڕاستەوە دایبنێین و تایەکانی بۆ سەرەوە بێت، بەڵام لەو هەموو تاسانەدا دەبوایە هەمیشە دەستمان پێوەی بوایە، نەوەکا بکەوتایە خـوارەوە، دوانیـوەڕۆی ڕۆژی چوارشەممە لە بافقەوە بەڕێکەوتین، بەیانی ڕۆژی هەینی گەیشتینە بەهاباد. ئەگەر بمەوێت باسێکی ئەم ڕێگایە و ئەو نارەحەتیانە بکەم کە کێشام، ئێوە گریانتان دێت. باسکردنی ئەم ڕێگایە هەر خۆی سەد لاپەرە نووسینی دەوێت. بەیانی ڕۆژی هەینی لە بەهاباد لە پیکابەکە دابەزین، ئەگەر لە مەکینەی قیمەیان بدامایە ئەوەندە هیلاک نەدەبووم، هەر کاتێک کە بیرم دێتەوە چۆن چۆن لە ئۆتۆمبێلەکەدا دابەزیم. گریانم دێت. هەموو گیانم ئازاری هەبوو، غەرقی تۆز و خۆڵ ببووم. لە عەزیزم پرسی ئایا لە بەهاباد حەمام هەیە تا سەرەتا بچم بۆحەمام. عەزیز گوتی: کە دەیەوێت بە زوویی بگاتەوە گوندەکەی خۆیان و هەرچی زووترە دایک وباوکی ببینێ، لە هەمووشی گرنگتر ئەو دەیویست پاسکیلەکەی پیشانی منداڵانی گوندەکەیان بدات، گوتم: لێرەوە بۆ گوندەکەتان چەند دەبێت؟ گوتی: شەش فرسەخ دەبێت، گوتم: بەچی بڕۆین، گوتی: بە پاسکیلەکە، گوتم: چی؟ بە پاسکیل بچین بۆ گوندەکەتان؟ گوتی: بەڵێ بە پاسکیل خۆ ئۆتۆمبێل ناچێت بۆگوندەکەمان چونکە جادەی نییە. گوتم: ئەی خۆتان چۆن هاتوچۆ دەکەن؟ گوتی: لە بەهابادەوە بەپێی دێین

بۆ ئێره، بەڵام ئێستا بە پاسکیل دەڕۆین. گوتم: خۆتۆ نازانیت پاسکیل لێبخوڕیت و تەنها دوو ڕۆژه پاسکیلت کڕیوه. گوتی: ئێ باشه خۆ تۆ دەزانی، تۆ لێیبخوڕه ومن لەبەردەمتا سوار دەبم، گوتم: هەی ڕەحمەتی خودا له دایک و باوکت، با کەمێک پشوو بدەین ئەوکات بڕۆین. گوتی: نا، با ئێستا بڕۆین، جانتاکەم له داوەوەی پاسکیلەکه بەست و عەزیزم له بەردەمی خۆمەوه سوارکردو دەستمکرد بەپایدەر لێدان. له کۆتایی بەهابادا گەیشتینه حەوز و ئاوێک، خۆم خسته ناو ئاوەکەوه و سەروچاوی خۆمم شۆرد، و ئاوم خواردەوه و دەستێکم به جل و بەرگەکانمدا هێنا، ویستم لەوێ کەمێک دانیشم، عەزیز پەلەی لێکردم که بڕۆین، گوتم: جارێ تۆ بچۆ بۆلای پاسکیلەکه نەبادا جانتا و پارەکانمان لێبدزن. گوتی: له بەهاباد دا دز نییه و هیچ شتێک ون نابێت. گوتم: تۆدەزانیت باوکت له گوندەکەیه یان نا. گوتی: نازانم باوکم نابینایه هەرکاتێک بچێت بۆ بەهاباد هەموو کەسێک دەیناسێت. دواین ماڵی بەهاباد لێمان نزیک بوو. ماڵێک بوو دەرگاکەی کرابووەوه. عەزیز بانگی لێکردن ئەهای ئەهای، یەکێک گوتی: ئەڵیی چی؟ عەزیز گوتی: من عەزیزی کوڕی ئەحمەده کوێرم، باوکمتان نەدیوه؟ خانوویەکی خراپ بوو، پیاوێکی ڕەشی چاو بەقوڵاچوو هاتەدەرەوه، گوتی: باوکت پێرێ، لێرەوه ڕۆیشت بۆ گوندەکەی خۆتان، بەدڵنیایەوه ئێستا لەماڵەوەیه. له دڵی خۆمدا گوتم: خودای گەورە، ئەمه شارەکەیان بێت، دەبێت گوندەکەیان چۆن بێت!. له بەهاباد پیاوێکی ڕیش سپی هەبوو که پێیان دەگوت تەقی خان، ئەم خانه له کوێ و خانی سەردەشت له کوێ؟ که زیاتر له (٨٥٠) کرێکار کاریان بۆدەکرد. خۆ ئەگەر له هەر شوێنێکدا کار هەبێت خانی ئەو شوێنەش بەڕاستی خان دەبێت. که ئەم هەموو خەڵکه هەژار و برسیه بۆماوەی (٤) مانگ کارکردن به (٣١٠) تومەن، هەموو کێوەکانی ئێران تەیدەکەن، خۆ دیاره ئەم تەقی خانه پیاوێکی هۆشیار و وریا بوو، ئەو وای کردبوو، که بەپێی توانا کەمێک کشتوکاڵ لەو ناوچەیه دا بکرێت. واته خەڵکی تا سەردەمی ئەم تەقی خانه نەیاندەزانی خەیار و پیاز و تور چییه؟ هەر چەنده ئەم بەرهەمه ئەوەنده نەبوو که بەشی هەمووان بکات. تەقی خانی بەهابادی خەڵکی هاندەدا تا منداڵەکانیان بنێرنه قوتابخانه. خۆشی منداڵەکانی دەناردە قوتابخانه کوڕێکیشی بوو به باشترین پزیشک له شاری یەزد که ناوی دکتۆرعەباسی تەقویی یە، هەرچەنده من ئەوم نەدیووه. پایدەر لێدەدەم و بەرەو گوندەکەی عەزیز دەڕۆین. ئەو گوندەی که دایکی مورتەزا لێی دەژیا نیو فرسەخ له گوندەکەی ماڵی عەزیز دوورتر بوو. نیو کاتژمێر پایدەرم لێدا بەڵام خۆ شەقام نەبوو هەموو بەردەڵان بوو گەیشتینه جێگایەک، که ئیتر نەماندەتوانی بەپاسکیل بڕۆین. پاسکیلەکەم بەدەستەوه و ڕێگامان گرتەبەر ئەگەرچی ڕێگا نەبوو بەڵکو دۆڵێکی قوڵی

وشک بوو. تاکە تاکە درەخت هەبوو، ئەویش درەختی بیابانی بوون، دیسانەوە هەمان هەڵەی یەزد بۆ بافق، بافق بۆ بەهاباد مان دووبارەکردەوە کە ئاومان لەگەڵ خۆماندا هەڵنەگرت بوو کاتی نیوەڕۆ هیلاک و ماندوو برسی و تینوگەیشتینە چەند کەلاوەیەک، کە شوێنێکی وەک گۆڕستان بوو، خانووەکانیشیان وەک گۆڕ وابوون، خەڵکی لە شوێنێکی تەنگ و تاریک دا دەژیان، خەڵکەکە ڕووت و ڕەجاڵ بوون، پێپەتی و ڕشک و ئەسپێ هەموو گیانیانی گرتبۆوە. وا بزانم هەرگیز سابوون نەهاتبووە ئەو گوندەوە. ژنێک گۆزەیەک ئاوی پێدام کە ئاوێکی گەرم بوو، ئاوی گەرم لەو شوێنە وەکو ئاوی زمزم وابوو، لەوێ چەند پارچە چەوەندەری وشکیان پێداین جگە لەوە هیچ شتێکی تر نەبوو، خەڵکەکان هەر لە مردوو دەچوون، کە لە گۆڕستانەوە هاتبن. خانوویان نەبوو، چاڵێکیان نزیکەی یەک مەتر هەڵکەندبوو لەسەر چاڵەکە چەند دارێکیان ڕایەڵ کردبوو، لەسەر ئەوە شەوە هەندێک دڕک و خاشاکیان ڕاسخت بوو، پاشان گڵیان بەسەردا کردبوو، ناوەوەی ئەم چالانە زۆر نزم بوون، لە نێوئەم مالانەدا تەنها ژن و منداڵ هەبوو، پیاوی تیانەبوو، مەگەر کەسێک کە شەو وکوێرو پەکەوتە بووبێت پیاوان و گەنجەکان و میرمندالان هەموو ڕۆیشت بوون بۆ کاری کەتیرە کۆکردنەوە.. وڵاتەکە بیابانێکی وشک بوو، ئاو وخاک و بەرزایی نەبوو تەنها شتێک کە هەبوو تەنها منداڵ بوو، منداڵەکانیش هەموو توشی چاو یەشە ببوون و هەموو شەل و کەچەڵ بوون، لەم ژوورانەدا دەهاتنە دەرەوە. لە گوندەکەوە کەتیپەڕین هەر خەڵک بوو چاوەڕوانی ئەوەبوون کە ئێمە شتێکیان بدەینێ، منداڵان بەچاوێک نا بەڵکو بەسەد چاو سەیری پاسکیلەکەی عەزیزیان دەکردو دەستیان لێدەدا، چەند منداڵێک تا دەرەوەی گوندەکە لەگەڵماندا هاتن هەر لەبەر خاتری سەیرکردنی پاسکیلەکە، پاش کەمێک گەیشتینە گوندێکی تر. هەموو خەڵکەکەی لە پاسکیلەکە کۆبوونەوە، زۆربەیان پاسکیلیان نەدیبوو. کچان و کوڕانی ٦-٧ ساڵە کە نەچووبوون بۆ کەتیرە دەیان، پرسی کە ئەو پاسکیلەمان بەچەند کڕیوە. وتمان بە (٢٧٥) تومەن دەیانگوت واتە چەند پارە، چەند پارە دەکاتە (٢٧٥) تومەن. بە کچێکی بچکۆلانەم گوت تا ژمارە (٣٠) بژمێرە کاتێک گەیشتە (١٢)، ژمارە (١٣) ی نەگوت و گوتی: (١٤)، پاشان نەیتوانی هیچی تر بژمێرێت. گوتم: بەردەوامبە بژمێرە، گوتی: (١٢) ئیمام و (١٤) مەعسومە، ئیتر تەواو، گوتی: ئیتر ژمارەی تر نییە، گوتم: بەڵام (١٢٤) هەزار پەیامبەر هەیە، گوتی: من شتی وام نەبیستووە، گوتم: هەر کەسێک تا ژمارە (٥٠) بژمێرێت دوو ڕیاڵی دەدەمێ لە نێوان (٣٠-٤٠) منداڵ و خەڵکی گەورە یەک کەس نەیتوانی لە (٣٥) زیاتر بژمێرێت. ئەوان هیچ کاریان بە ژمارە نەبوو، بێ هۆ نەبوو کە لەم گوندانەدا ئەم هەموو کرێکارە بەشێوەی بەکرێدان

دەنێردرانە شوێنەکانی تری ئێران. ئەوانە بەشێوەی بەکرێدان و خزمەتکاری دەڕۆیشتن، ڕۆژێک بە یەکێک لە سەرپەرشتیارانی کەتیرەکەرانم گوت، ئێوە تەنها نانی وشکی و ئاو دەدەن بەم خەڵکە هەژارە، شتێکی تریشیان پێبدەن ئاخر ئەمانە ناتوانن تەنها بەنانی وشکی کاربکەن. گوتی: نانی گەنم لای ئەوانە وەکو گۆشتی ئاسک وایە. لە دیهاتەکانی ئێمەدا خەڵکی نانی هەرزن دەخۆن، چەوەندەری وشک کراوە دەخۆن... لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەی خودایە بۆچی لە بافق هەندێک نانم نەهێنا. دوای نیوەڕۆ بوو، زۆر هیلاک ببووین، عەزیز گوتی: واخەریکە دەگەین، نزیکەی سەد مەتر ڕۆیشتین خانوو دەرکەوتن، باوەڕ بکەن گەورەترین خانوو لە مەتر و نیوێک بەرزتر نەبوو، من ناتوانم باسی ئەم خانووانە بکەم، کە لەم گەشتەدا چاوم پێیان کەوتووە، بۆیە داوای هاوکاری لە مامۆستا محەمەد حسێن شەهریار دەکەم، تازە مامۆستا شەهریار ئەم هۆنراوەیەی دەربارەی خانووەکانی نیشاپور نووسیوە. کەمن دڵنیام خانووەکانی نیشاپور لەچاو ئەم خانووانەوە کۆشکێکی زۆر گەورەن.

**خانەهاشان همە در زیر زمین – وای از ان خانە و ان خانە نشین**

**تنگ و تاریک تر از لانە مور – وحشت انگیز تر از خانە گور**

واتا:

**گشت ماڵەکانیان وا لەژێر زەوین – وای لەم ماڵانە و وای لە ماڵنشین**

**تەنگ و تاریکتر لە شارە مێروو – ترسناکترە لە قەبری مردوو**

عەزیز هاواریکرد: باوکە... باوکە! کوێرێک سەری لە قەبرێکەوە دەرهێناو، یەکەم قسەی ئەمە بوو: ئەوە دەریانکردوویت.. بەزۆر تۆیان ناردۆتەوە؟ بۆچی وا زوو هاتیتەوە؟ عەزیز هاواریکرد: باوکە پارەم بۆهێناویتەوە،.. زۆرم پارە هێناوەتەوە... باوکە پاسکیلیشم کڕیوە... باوکە پارەم زۆر زۆر هێناوەتەوە! پیاوی نابینا دوو هەنگاو لە ماڵەکەوە هاتە ئەملاوە و باوەشی کردەوە، عەزیز خۆی فڕێدایە باوەشی باوکییەوە، باوکی ماچی کرد، عەزیز بەباوکی گوت ئەوە کاک حسێنە و هاوڕێمە، سلاوم لێکرد و چوومە ژوورەوە. ژوورەکەیان (٤X٣) مەتر دەبوو، هەموو خانووەکەیان بریتی بوو لەو ژوورە. باوکێکی نابینا و دایکێکی شەل و کچێک و عەزیز لەو ژوورە بچووکەدا ژیانیان دەگوزەراند. من دواتر لە زۆر شوێنی تری ئێراندا لەم جۆرە خانووانەم بینیوە. لە باشووری خەوان، لەژێر کێوی قاین، لەچاە خەتیب. لە هەندێک لە گوندەکانی دەوروبەری شاری گوناباد. تا دەوروبەری ساڵی (١٣٦٥-١٩٨٦) لەم جۆرە خانووانەدا دەژیان، لە زۆربەی گوندەکانی بیرجەند و سەربێشەو ماخونک- وە سلە هەندێک لە گوندەکانی بەندەر عەباس و بوشەهر، ئەم جۆرە خانووانەم بینیوە. خانوو تەنها

جێگایەک نییە بۆ ئەوەی خەڵکی پشووی تێدا بدات؛ بەڵکو خانوو بۆ کەسێتی و ناسینی خەڵکیشە. خانوو شوێنێکە کە ماهیەتی مرۆڤ دەردەخات ئەو خانووانەی کە ئەوان هەیانبوو تەنانەت بۆ ئاژەڵیش نەدەبوو.

من ئەم جۆرە هەژارییەم جارێکی تر لە ساڵی (١٣٨٠-٢٠٠١) دا بینوەتەوە، ئەویش لە گوندی ماخۆنێک لە سەر پیشەی بیرجەند. کاک ئەحمەدی باوکی عەزیز دەستی لە پاسکیلەکەی عەزیز دەدا و عەزیز رۆیشتە ژوورەوە دایکی ماچی کرد و لەباوەشی گرت. منداڵێکی (١١) ساڵ، دوو مانگ بوو دایک وباوک و خوشکی خۆی نەدیبوو. عەزیز پاش چەند خولەکێک منی بیرهاتەوە و چوو پارچە جلە کۆنێکی هێناو لە ژوورەکەدا رایخست و منیش لەسەری دانیشتم.

دایک و باک و خوشکەکەی لەلای منەوە دانیشتن، هیچ شتێک رووینەدا هەموو دانیشتووانی گوندەکە لێمان کۆبوونەوە. کۆمەڵێک خەڵکی رووت و رەجاڵ دەورەیان داین. هیچ کەسێک پێڵاوی لەپێدا نەبوو، هەر یەکەو پارچە جاجمێکی رەشی کردبوو بە دەرپێ و پارچەیەکشیان کردبوو بە کراس و لەبەریان کردبوو، هیچ پیاوێک یا کوڕێکی ساغ لەودێیەدا نەبوو، ئەوەی هەبوو رۆیشت بوو بۆ کەتیرەکۆ کردنەوە. ئای خۆزگە کەمێک نان و خواردنم لەگەڵ خۆمدا بهێنایە، کاک ئەحمەد هەواڵی یەکەبەیەکەی ناسیاوەکانی لە عەزیز پرسی. پاش نیوکاتژمێر کاک ئەحمەد هەواڵی مورتەزای پرسی، عەزیز بێ وەستان گوتی: لە کێوە هەڵدێرا و مرد و خستیانە گۆڕەوە. ئەم پیاوە نابینایە زۆر خەمبار بوو، گوتی: ئەی هاوار لەو دایکە جگەرسووتاوەی دەبێت چی بکات؟ هەمووان وایانزانی کە مورتەزا لە گوندەکەی سەرەوە مردووە، نەیانزانی بوو کە ئەویش چووە بۆ کەتیرە کردن، پیاوێکی پیری ریش سپی هات و لەلامانەوە دانیشت، لەبارەی مردنی مورتەزاوە پرسیاری کرد، ئەو پیاوە خاڵی دایکی مورتەزا بوو، ئێمەش رووداوەکەمان لە نوکەوە بۆ گێرانەوە خەڵکەکە هەموو ئاخ و ئۆفیان بوو بۆ مورتەزا، زۆر زۆریان خەم بوو هەر لەوێ بریاردرا کە سبەی چەند کەسێک برۆن بۆ گوندەکەی سەرەوە و سەرەخۆشی لە دایکی مورتەزا بکەن. ئەمانە زۆر هەژار بوون بەڵام زۆر بەرەوشت بوون ئەو خەمەیان بە خەمی خۆیان دەزانی. دنیا تاریک بوو، بوو بە شەو خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد، هیچ چرایەک نەبوو، تەنها مۆمیش نەبوو، چەند کاتژمێرێک بوو، کە ئێمە هات بووین، هیچ کەسێک قومە ئاوێکی نەداینێ. هەر ئەو پیرمێردە دەستە نانێکی هێنا بۆ ماڵی کاک ئەحمەد، چێشت و خواردنی تر نەبوو، کاک ئەحمەد نانەکەی لەتکرد و لە سێ بەشی بەشێکی دا بە من و پیاڵەیەک ئاویشی پێدام. شەکر وچا هەر نەبوو. شەوەوەکەی مانگەشەو بوو، ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە دەبریسکانەوە خەڵکی

گوندەکە هەر کەسە و ڕۆیشتبوەوە بۆ ماڵی خۆی. کاک ئەحمەد لە عەزیزی پرسی: پارەت هێناوەتەوە... چەندت هێناوە؟ عەزیز گوتی: (٢٧) هەزار تومەن. کاک ئەحمەد گوتی: چیت گوت؟ هەی منداڵە شێتەکە خۆ تەقی خانی بەهابادیش (٢٧) هەزار تومەنی نییە. دایکیشی بە کۆکەکۆک هاتە پێشەوە و گوتی: چەندت هێناوەتەوە؟ کاک ئەحمەد گوتی: دەڵێت (٢٧) هەزار تومەن. دایکی گوتی: منداڵە و هیچ نازانێت. خۆ شای ئێرانیش (٢٧) هەزار تومەنی نییە. منیش گوتم: ڕاست دەکات ئەوەش پارەکەیە، بەڵام نیوەی هی مورتەزایە، عەزیزیش پاسکیلێکی لەو پارەیە کڕیوە. کاک ئەحمەد گوتی: بەڕاست (٢٧) هەزار تومەنتان لایە؟ گوتم: بەڵێ، لامانە. گوتی: دزیوتانە؟ منیش ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە و باسی پەپوولەکان و دوو پیاوە ئەرمەنییەکانیشم بۆ کرد. کاتێک پارەکانم دایە دەست کاک ئەحمەد، ئەویش دەستی لە پارەکان دەدا و شۆک ببوو. نزیکەی نیو کاتژمێر پارەکانی هەر بەدەستەوە بوو. دایکی عەزیز پارەکانی بەسنگیەوە نووساند و گوتی: بەم پارەیە لە نەخۆشییەکەم ڕزگارم دەبێت و چاک دەبمەوە، منداڵەکانیشم هەتیوو نابن، ئەم هەموو پارەیەتان لە کوێ بوو؟ بۆ مەگەر خەڵکی شێتن ئەم هەموو پارەیە بدەن بە پەپوولە. ئەو ئەرمەنییانە چەند کەسانێکی باش بوون. دایکی عەزیز گوتی: ئەرمەنی مانای چی؟ گوتم: ئەرمەنی بەشێکە لە دینی مەسیح. گوتی: دینی مەسیح مانای چییە؟ گوتم: واتە دینی حەزرەتی عیسا، عیساش پێغەمبەرێک بوو، ئەویش پێغەمبەری خودا بوو. ئەو ژنە کەمئەندامە گوتی: ئێستا ئەم پارەیە حەڵاڵە، حەرام نییە؟ بەڕاستی پێم بڵێن ئەم پارەیەتان نەدزیوە؟ کاک ئەحمەد گوتی: نا نا نەیاندزیوە. پاشان کاک ئەحمەد گوتی: ئەم پارەیە چەندی هی ئێمەیە و چەندی هی مورتەزایە؟ پێشتر حیسابم کرد بوو (١٣) هەزار و (٥٠٠) تومەن هی مورتەزا بوو، مەقسودخانیش (٣٥٠) تومەنی بۆدایکی مورتەزا ناردبوو. ئەمجارەش دایکی عەزیز گوتی: مەقسودخان کێیە؟ عەزیز گوتی: ئەو خانی سەردەشتە. عەزیز گوتی: ئەوانە عومەریین، دایکی هاواریکرد: عومەریی... پارەی ئەوانە حەڵاڵ نییە و ئێمە ئەو پاریەمان ناوێت! عەزیز گوتی: دایکە خۆ ئەوان کەسانێکی زۆر باشن، ئەگەر گوڵەخان کە عومەرییە دڵی بە ئێمە نەسووتایە پەپوولەکان لەو کێوە بەجێدەمان. عومەرییەکان هیچ کارێکیان بەسەر ئێمەوە نییە، ئەوانە زۆر میهربان و باشن، زۆریش گریا بۆ مورتەزا، پارەی زیویشی بۆ دایکی مورتەزا ناردووە، ئەویش وا لای کاک حسێنە.

## ڕاوچییەکی بێویژدان

کاک ئەحمەد بەجۆرێک قسەی دەکرد کە من واهەستم دەکرد، ئەو ڕۆژێک لە ڕۆژان نابینا نەبووە، هەستم دەکرد ئەو پێشتر شتی بەچاوەکانی بینیوە و کوێری زگماک نییە. نانە وشکەکەمان خوارد و کاک ئەحمەد چەند دانە هەڵوژە وشکەی پێدام. گوتم: کاک ئەحمەد تۆ هەر لە منداڵییەوە نابینا بوویت؟ کاک ئەحمەد ئاهێکی هەڵێشکاو و گوتی: نا کاتێک کە ژنم هێنا چاوەکانم ساخ بوو، نۆ ساڵە چاوەکانم کوێر بوون. گوتم: بەچی کوێر بوویت؟ گوتی: چیرۆکەکەی دوور و درێژە. گوتم: هێشتا سەرەتای شەوە، ڕووداوەکەیم بۆ بگێڕەوە. کاک ئەحمەد گوتی: من شارەزای ڕاوکردن بووم، باوکیشم هەر شارەزا بوو، تەمەنم (٨-٩) ساڵ بوو، کە لەگەڵ باوکمدا دەچووم بۆ کێو و بیابانەکان بۆ ڕێبەریکردنی ڕاوچییەکان. هەموو ئەو شوێنانەی کە بۆ ڕاوکردن شیاو بوون، من شارەزایان بووم، هەر لە فەهرەجی بۆمەوە تا گوندی مەسۆ لە کەوێری نەمەک لە نابیند و دیک ڕۆستەم، لە دیهۆک و عیشقای تەبەس تا بیابانی عەقدا هەمووی شارەزام. تەمەنم (١٤) ساڵ بوو، کە دەوڵەمەندەکانی یەزد، کردمان، ئەسفەهان، مەشهەد و تاران دەهاتن بۆ ڕاوکردن، منیان وەک و شارەزای ناوچەکە لەگەڵ خۆیاندا دەبرد. ساڵی (١٣٣٣-١٩٥٤) بوو، عەزیز تەمەنی (٢) ساڵ بوو، دایکیشی دووگیان بوو، ئەوکاتە ڕاوکردن زۆر بوو، هێشتا لە بیابانەکان، گۆڕهەڵکەنە و ئاسک و مەڕە کێوی زۆربوون. ئەو حوشترانەی کە نیشانە نەکرا بوون و بێ خاوەن بوون لە بیابانەکاندا بەرەڵا بوون و زۆر بوون. لەوەڕ و خواردنی باشیان دەستدەکەوت، تەنانەت لە ناوەڕاستی کەوێر گۆلە ئاو هەبوو، دەوری ئەم گۆلە ئاوانە گژوگیا و دار و درەختی بیابانی لێدەڕوا و جۆرەها ئاژەڵی کێوی و باڵندەی لێ بوو. دەوڵەمەندەکان دەهاتن بۆ ڕاوکردنی بزنمژەی گەورە، کە درێژیان لە مەتر و نیو تا دوو مەتر دەبوو، کە ئەوەندە گەورە و بەهێزن و دەتوانن بزنێک قوتبدەن. هەندێکیان دەهاتن بۆ ڕاوکردنی مار. ڕاوچییەکان دەیانویست کەوێر تاڵانبکەن و هیچ گیانلەبەرێکی تێدا نەهێڵن. دەوڵەمەندێکی

## شازادەی حه مام 

ڕاوچی لەگەڵ چەند کەسێکدا دەهات بۆ ڕاو ئەم دەوڵەوەمەندە کوڕێکی گەنجی هەبوو، کە تەمەنی (١٨-١٩) ساڵ بوو، ناوی بێژەن بوو، هەر کاتێک کە دەهات خەڵکی ناڕەحەت دەکرد. خەڵکی ئەزیەتدەدا، بەزەیی بەژن و منداڵی خەڵکیدا نەدەهاتەوە و بێناموسیی دەکرد و لە خەڵکی دەدا. هەر ئاژەڵێک بهاتایە بەرچاوی دەیکوشت. جارێکیان ئەوەندە ئاژەڵە کێوی کوشتبوو، کە نەمدەتوانی هەڵیانبگرم، چەند جار پێمگوتبوو، کە ئەوەندە ئاژەڵ مەکوژە. بەڵام ئەو دەیگوت تۆ زۆر بڵێیی دەکەی، کاری تۆ ئەوەیە کە من بهێنیت بۆ ڕاوکردن. جارێک لە گوندەکەی ئێمەدا پەلاماری کچێکی دا، لە تۆڵەی ئەوەدا خەڵکی زۆریان لێدا، جا ئەو پێی دەگوتم: تۆ ئاگادار بوویت و بەو خەڵکەت گوتوە، بۆیە ئەوەندەیان لێدام. باوکیشی پێی دەگوتم: ئەحمەد تۆ هیچ کارت بەسەر بێژەنەوە نەبێت، ئەو ئازادە هەرچییەک بکات. جارێکیان بە باوکیم گوت کە کوڕەکەی لە گوندەکاندا سەیری کچ و ژنی خەڵک دەکات و قسەیان پێدەڵێت. ئەویش گوتی: کەیفی خۆیەتی، چی دەکات بابیکات... تۆ هەقت نەبێت بەسەرییەوە و قسەش مەکە. خۆ خەڵکی تری شارەزا زۆرن لەگەڵ خۆماندا بیانهێنین، تۆ هەمیشە کێشە و دەردەسەریمان بۆ دروستدەکەیت، ئێمە هاتووین بۆ کەیفی خۆمان، عەرەق دەخۆینەوە، تلیاک دەکێشین، لەگەڵ ژناندا ڕادەبوێرین، ڕاوی ئاژەڵەکان دەکەین. ئەوانە هەمووی کەیفە، کوڕەکەشم هەر کارێک دەکات بۆ خۆی ئازادە و بە کەیفی خۆی دەکات. تۆ دەزانیت هەندێک لە شارەزاکان ژنمان بۆ دەهێنن و بە ئارەزووی خۆمان خزمەتمان دەکەن، بۆیە زۆر لەسەر شت مەڕۆ و بەخراپە باسی خۆم و کوڕەکەم نەکەیت. ئەگەر پارەت دەوێت دەتدەمێ، گەر پارەت ناوێت و ئەوەندە لەسەر شت بڕۆیت ئەوا دەتدەمە دەست پۆلیس. یەکێک لەوانەی کە لەگەڵیاندا بوو، گوتی: لەوانەیە ئەم ئەحمەدە سەر بە (حزبی تودە) بێت. کاک ئەحمەد گوتی: ئەو سەردەمە چەندین گروپ بۆ ڕاوکردن دەهاتن، هەر گروپە و خەڵکی شوێنێک بوون، منیش بڕیارمدا کە ئیتر شارەزایی بۆ ئەم گروپە نەکەم. جارێکی تر ئەم گروپە هاتنەوە کاتی بەهار بوو ساڵی (١٣٣٣-١٩٥٤) بوو، هاتن بەشوێن مندا تاکو لەگەڵیان بڕۆم بۆ شارەزایی. منیش گوتم: ئێستادا کاتی ڕاوکردن نییە، ئاژەڵەکان هەموو بەچکەیان هەیە، لە ئێستادا کوشتنیان تاوانە و من لە گەڵتان نایەم. لەناکاو بێژەن قۆناغی تفەنگەکەی بە هەموو هێزیەوە کێشا بەسەرمدا، گوتی: نازانی ئەگەر کەسێک گوێڕایەڵی قسەکانی باوکم نەبێت، سزاکەی مردنە! تۆ لەگەڵمان دێیت یان نا؟ باوکی ئەو کوڕە و سێ چەکداری تر ئامادەی لێدان بوون، منیش گوتم: باوکت پێی گوتووم خەڵکی شارەزا زۆرە، بڕۆن کەسێکی تر لەگەڵ خۆتان دا ببەن. کاک ئەحمەد گوتی: هەر ئەوەندەم زانی کە زرمەیەک لە سەرم هات ئیترلە هۆش خۆم چووم و ئاگام لە هیچ شتێکی تر نەما، کاتێک هۆش خۆم هاتمەوە وا لە نەخۆشخانەی کرمانم و چاوم

بەستراوە، پزیشکێک هاتە لامەوە و گوتی: خودا ڕەحمی کردووە، کە نەمردی نەشتەرگەریی چاوم بۆ کردوویت. من نەمزانی چی دەڵێت، وامزانی پاشان چاوم دەبینێت. کاتێک تەواو بەهۆش هاتمەوە باوکی بێژەن هاتە لامەوە و گوتی: ئەحمەد ئێستا پۆلیس دێن قسەت لەگەڵ دەکەن. پێیان بڵێ من خۆم بە تفەنگ وام لەخۆم کردووە. تۆ ئەو قسەیە بکە منیش ناوت لە کارگەکەی خۆم دەنووسم و خانەنشینت دەکەم، پارەی زیادەشت بۆ وەردەگرم، خۆ ئەگەر وا نەڵێیت و بڵێیت بێژەن فیشەکی لێداوی، ئەوا بە پۆلیسەکان دەڵێم زمانت ببڕن. ئەو ڕۆژە پۆلیس نەهات سبەی بەیانی چەند کەسێک هاتن و ڕۆیشتن، هەڕەشەیان لێکردم، گوتیان ئەگەر ئەو قسانە نەکەیت، کە باوکی بێژەن پێی گوتووی، ئەوا ژن و کوڕەکەت سەردەبڕین. سبەی نیوەڕۆ پۆلیس هاتن، کەوتنە پرسیارکردن لێم، یەکێک دەستی منی خست بووە نێو دەستی و فشاری دەدا، منی دەترساند. منیش باوکی بێژەن چۆن ئامۆژگاری کردم ئەوها وەڵامم دانەوە. پزیشک و کەسەکەکانی تری نەخۆشخانەکە و پۆلیسەکان پێیان نەگوتم، کە چاوەکانم کوێربوون، هەموو دەیانگوت لە خودا بەزیاد بێت، کە نەشتەرگەرییمان بۆکردوویت، وامزانی باش دەبم، پەنجە مۆریکیان پێکردم، پاش چەند ڕۆژێک چاویان کردمەوە بەڵام هیچ شتێکم نەبینی. دەستم برد بۆ چاوەکانم، وامهەست کرد کە هەرگیز چاوم نەبووە. چاوکانیان دەرهێنابووم، هاوارمکرد گوتم: منتان هەڵخەڵەتاند. بەو هەموو هەڕەشانە واژۆکەیان پێکردم. بڕیار وابوو، کە ناوم وەک کارمەندێکی کارگە بنووسن و مووچەم بدەنێ، بەڵام ئەو کارەیان نەکرد. مانگی یەکەم (٩٠) تومەنیان بەناونیشانی کارمەندی کارگە وەکو مووچە پێدام... ناردیانمەوە بۆ بەهاباد ئەوکاتە ژیانمان خراپ نەبوو، ئەم گوندەم جێهێشتبوو، ماڵم بردبوو بۆ بەهاباد، لەوێ خانووم هەبوو، چەند مانگێک مانگی (٥٠-٦٠) تومەنیان بۆ دەناردم. پاشان شەش مانگ هیچ پارەیەکیان بۆنەناردم. منیش ڕێگەی شارم گرتەبەر و چوومە بەردەمی دەرگای کارگەکە. پاسەوانەکە ڕێگای نەدام بچمە ژوورەوە، منیش هاوارمکرد کەسێک هات و (٤٠) تومەنی خستە دەستمەوە. گوتم: من سواڵکەرنیم. گوتی: ئەی چیت؟ خۆت چاوی خۆشت کوێرکردووە و پارەی خۆت وەرگرتووە. ئەم پیاوە تا ئێستا هاوکاری کردوویت، ئیتر هاوکاریت ناکات. منیش چووم بۆ دادگا و شکاتم کرد، پاش چەند ڕۆژ پێیانگوتم: تۆ خۆت گوتووتە کە بە تفەنگی خۆت چاوی خۆت کوێرکردووە. کوا تفەنگەکەت لە کوێیە؟ بەزوویی بۆمان بهێنە. ئەوەتا فایلیت بۆکراوەتەوە. خەریکبوو، تاوانباریشم بکەن. پاشان زانیم هیچم پێناکرێت. کەسێکی کوێری بێکەسی نەخوێندەواری بێ پارە و پوول لە بەرامبەر ئەو هەموو خەڵکە دەسەڵاتدارە خاوەن پارە و خوێندەوارەدا من دەتوانم چیبکەم؟ ناچار چووم بۆماڵیان لەوێش ڕێگەیان پێنەدام بچمە ژوورەوە. نزیکەی یەک مەن (٦ کیلۆ)

برنج و ده تومه‌نیان پێدام و به‌ناچاری گه‌ڕامه‌وه. تازه ئه‌م کچه‌مان له‌دایکببوو، ته‌مه‌نی سێ مانگ بوو، نزیکه‌ی ساڵێک به سه‌ر کوێربوونی مندا تێپه‌ڕی. به‌ژن و منداڵه‌وه ڕۆیشتمه‌وه بۆ شار دووباره چووممه‌وه به‌رده‌رگای باوکی بێژه‌ن. خزمه‌تکاری ماڵه‌که‌یان منی ده‌ناسی، بانگی کرد، گوتی: ئه‌حمه‌ده کوێر هاتووه به‌خۆی و به‌ژن و منداڵه‌وه. چییان لێبکه‌م؟ ژنه‌که وه‌ڵامی دایه‌وه گوتی: ئه‌م سواڵکه‌رانه وازمان لێناهێنن، بزانه چییان ده‌وێت؟ گوتم: خانم من چاوه‌کانی خۆمم ده‌وێته‌وه. کوڕه‌که‌ت چاوی منی کوێر کردووه، خۆ من سواڵکه‌ر نیم، ده‌رگایان توند به‌ڕووماندا داخست، له ده‌رگاکه‌م دا، که‌سێک هاته لای ده‌رگاکه‌وه و گوتی: ئه‌گه‌ر لێره بووه‌ستیت ته‌له‌فۆن ده‌که‌م بۆ کارگه و که‌سێک بێت لێره دوورت بخه‌نه‌وه. منیش گوتم: وا لێره دانیشتووم با که‌سێک له کارگه‌که‌تانه‌وه بێت و حیسابم له‌گه‌ڵدا بکات، ماوه‌یه‌ک دانیشتین هیچ که‌سێک نه‌هات. پاشان دوو پۆلیس هاتن گوتیان شکاتیان کردووه، که ئێوه سواڵ ده‌که‌ن و ئازاری خه‌ڵکی ده‌ده‌ن، ئه‌م گه‌ڕه‌که‌تان هه‌راسان کردووه، هه‌ستن پێشمان که‌ون بۆ پۆلیسخانه، پاش تکا و پاڕانه‌وه‌یه‌کی زۆر پێنج قرانیان لێ سه‌ندین و ئازادیان کردین. ئێمه‌ش گه‌ڕاینه‌وه بۆ به‌هاباد، بێکار و کاسپی، هه‌رچی پاره‌یه‌کی که هه‌مان بوو، هه‌موویم خه‌رجکرد و خانووه‌که‌شم فرۆشت و هاتمه‌وه بۆ ئه‌م گونده، خه‌ڵکیی ئاوایی ئه‌م خانووچکه‌یه‌یان بۆ دروستکردم و ئێستاش لێره ژیان ده‌گوزه‌رێنین. ئێستا عه‌زیز نانپه‌یداکه‌ری ماڵه‌که‌مانه، جار جار دراوسێکان که هه‌موویان خزمی خۆمانن هاوکاریمان ده‌که‌ن. وه‌ک ده‌بینیت به‌مجۆره ژیان ده‌گوزه‌رێنین... به‌ڵام خودا گه‌وره‌یه.

گوتم: ئێستا کوڕه‌که‌ت (١٣) هه‌زار تومه‌ن پاره‌ی بۆهێناویته‌وه و ئه‌مه پاره‌یه‌کی زۆره، به‌م پاره‌یه ده‌توانیت خانوویه‌ک له شاری یه‌زد بکڕیت. گوتم: به‌ڵێ، ده‌توانی خانوویه‌کی باش به (٥) هه‌زار تومه‌ن بکڕیت... پاره‌که‌ی تریش بکه‌یته ده‌ستمایه، پاشان عه‌زیزی ماچکرد و ئه‌و ژن و مێرده نزیکه‌ی دوو کاتژمێر له‌باره‌ی پاره‌که‌یان له‌گه‌ڵ من وتووێژیان کرد، ده‌چین بۆ کرمان له‌وێ دوکان ده‌کڕین. عه‌زیزیش به‌و شه‌وه خه‌رکی لێخوڕینی پاسکیله‌که‌ی بوو، زیاتر له ده جار پاره‌که‌یان ژمارد. نزکی نیوه‌شه‌و بوو، مانگ له لێواری ئاوابووندا بوو، ڕووناکییه‌که‌ی که‌می کردبوو، هه‌وا فێنیک ببوو، هه‌موومان خه‌وتین من له‌سه‌ر پارچه جله‌کۆنێک خه‌وتم، به‌ڵام قاچم له ئه‌ژنۆمه‌وه له‌سه‌ر زه‌وی بوو. عه‌زیزیش له‌سه‌ر پارچه گونییه‌یه‌ک خه‌وتبوو، کاک ئه‌حمه‌دیش له‌سه‌ر زه‌وی خه‌وتبوو، هیچ ڕاخه‌رێکی له ژێردا نه‌بوو، دایک و کچه‌که‌ش چوونه ژووره‌وه.

## فیداکاریی

بەیانی زوو کاک ئەحمەد لەگەڵ ژنەکەیدا قسەی دەکرد، قسەکانیان لەبارەی دایکی مورتەزاوە بوو. دواتر کاک ئەحمەد و من و عەزیز و چەند پیاوێکی ڕیش سپی و چەند ژنێک ڕێگای گوندی سەرەوەمان گرتەبەر، کە نزیکەی سێ کم دوور بوو. من دەستی کاک ئەحمەدم گرتبوو، ئەویش لەبارەی ڕاوکردنەوە قسەی بۆ دەکردم. پێشتر هەواڵی مردنی مورتەزا بەدایکی گەیشتبوو، شەو کەسێک هەواڵەکەی بۆ بردبوو، دایکی مورتەزا تەمەنی لە نێوان (٢٥-٢٦) ساڵ دەبوو، پیاوەکەی مردبوو، تەنها دووکچی هەبوو، چەند کەس لە خزمە هەژارەکانی، هەژارتر لە هەموو هەژارەکانی دنیا لە دەوری کۆببوونەوە. دایکی مورتەزا زۆر بێتاقەت بوو، بێتاقەت لە برسێتی، بێتاقەت لە هەژاریی، بێتاقەت لە مەرگی کوڕە تاقانەکەی، بێتاقەت لە نانپەیداکەری ماڵ. دەیناڵاند بۆ مەرگی تاقە خۆشەویستەکەی هاوار و ناڵەی لە بێهێزی بوو. هەموو گوندەکە لێی کۆببوونەوە، بەڵام هیچ کەسێک توانای نەبوو پیاڵە چایەک بدات بەمیوانەکان. خۆ نەک هەر لەم گوندەدا بەڵکو لە تێکڕای گوندەکانی ئەو ناوچەیەدا شەکر و چا هەر نەبوو، من هەر چاوم پێنەکەوت. تێکڕای پیاوان و گەنجان و مێرمنداڵانیانی گوندەکان ڕۆیشتبوون بۆ کەتیرەکردن، ئەم کێو و بیابانانە گەورەترین بەرهەمهێنەری هەژاریی بوون. هاوین بوو قوتابخانەش نەبوو، کوێخاکەیان لە خۆیان هەژار تر بوو، کاتێک کوێخا لە بەرامبەرمدا دانیشت بینیم پانتۆڵەکەی هەموو دڕا بوو، کراسەکەشی چەند پینەیەکی پێوە بوو. کوێخا پیرە پیاوێک بوو، چاوێکی کوێر بوو، زۆربەی منداڵانی خوار تەمەنی (٧-٨) ساڵ کە نەچووبوون بۆ کەتیرەکردن، کەچەڵ بوون و چاوەکانیان نەخۆش بوو، لەوە دەچوو توشی تەراخوما بووبن، تەنانەت یەک کەس لە پیرەمێرد و ژن و منداڵ پێڵاوی لە پێدا نەبوو. دوو کاتژمێر دانیشتین هەمووان فاتیحایان خوێند و ڕۆیشتن. کەسێک زەحمەتی کێشابوو، چووبوو لە کانییەکە دوو گۆزە ئاوی هێنابوو، ئاوەکە زۆر گەرم نەبوو، چەند

کەسێک کە لە گوندەکەی خوارەوە لەگەڵ ئێمەدا هاتبوون، گوتیان ئێمە دەگەڕێینەوە. کاک ئەحمەد گوتی: ئێوە بڕۆنەوە، ئێمە تا نیوەڕۆ لێرە دەبین. میوانەکان هەموویان ڕۆیشتن. پاشان کاک ئەحمەد بەدایکی مورتەزای گوت: وەرە بابچینە ژوورەوە. ئەو ژنە بە ناڵەناڵ چووە ژوورەوە. خۆ ئەوە ژوور نەبوو بەڵکو گۆڕ بوو، کاک ئەحمەد پێیگوت: مورتەزا خودا لێی خۆشبێت، هەندێک پارەی بۆ ناردویەتەوە، دایکی مورتەزا بەناڵەوە گوتی: مورتەزا کە مردووە، چۆن پارەی بۆ من ناردووەتەوە؟ کاک ئەحمەد گوتی: مورتەزا لەگەڵ عەزیزدا پەپوولەیان گرتووە، پەپوولەکانیش لە تاران فرۆشراون، ئێستاش پارەیان بۆ تۆ هێناوەتەوە. کاک ئەحمەد دەستی منی گرتبوو توند دەیگوشی. تێگەیشتم کە مەبەستی ئەوەیە، کە من قسەنەکەم. پارەکەی دەرهێنا و لەبەردەم دایکی مورتەزادا داینا. کە سەیرمکرد هەموو پارەکەیە نەک نیوەی پارەکە. هەموو پارەکە (٢٧) هەزار تومەن بوو، (٢٧٥) تومەنی درابوو بە پاسکیل بەڵام مەقسودخان و دایکیشی (٣٥٠) تومەنیان بۆ ناردبوو، کڵاوێکیش کە دەیان پارەی زیوی پێوە بوو، ژنەکەی مەقسودخان بۆی ناردبوو، ئەویش لەگەڵ پارەکەدا دانرابوو. کاک ئەحمەد گوتی: ئەوە (٢٧٠٨٢) تومەنە هەموو هی تۆیە. دایکی مورتەزا گێژببوو، گوتی: ئەم هەموو پارەیە هەمووی هی مورتەزایە؟

با کاتتان زۆر نەگرم، چەند کاتژمێرێکی پێچوو، کە سەرلەبەری ڕووداوەکەی مردنی مورتەزام بۆ ئەو ژنە جگەر سووتاوە گێڕایەوە. لە کۆتاییدا تێگەیشتم کە نابێت بڵێم مورتەزا و عەزیز هاوبەش بوون و نیوەی پارەکە هی عەزیزە. بەڵام من لەوە تێنەگەیشتم کە ئەو (٧) تومەنە کە زیادکرابووە سەر پارەکە کە پێشتر (٢٧٠٧٥) تومەن بوو، لەکوێوە هات؟ ئاخر پیاوێک بەم هەموو هەژاریی و نەبوونییەو بە دوو چاوی کوێرەوە، بەژنێکی کەمئەندامەوە، بەکوڕێکی (١١) ساڵ و کچێکی (٧-٨) ساڵەوە، ئەمە چ کارێک بوو کردی؟ ئایا ئەمە گەورەترین فیداکاری نییە. دایکی مورتەزا گوتی: من ئەم هەموو پارەیە چی لێبکەم. منیش گوتم: باشترین کارێک ئەوەیە کە بچیت بۆ یەزد و خانوویەک بکڕیت، لەوێ بە (٥-٦) هەزار تومەن، خانوویەکی باشت دەکڕیت، بە پاشماوەکەشی کارێکی پێبکە یان دووکانێک بکڕە. گوتی: من لە یەزد هیچ کەسێکم نییە. کاک ئەحمەد گوتی: ئەم کاکە حسێنە هاوکاریت دەکات. بە سەرسوورمانەوە گوتی: ئەم کاک حسێنە هاوکاریم دەکات؟ کاک ئەحمەد گوتی: بەڵێ، ئەو تەمەنی (١٥) ساڵ زیاتر نییە، بەڵام گەنجێکی زیرەک و وریایە، پەپوولەکانی مورتەزا ئەو فرۆشتویەتی. دایکی مورتەزا بڕیاریدا کە بەیانی بەخۆی و دوو کچەکەیەوە بڕۆین بۆ یەزد. بڕیارياندا بەیانی بێن بۆ گوندەکەی خوارەوە و بەیەکەوە بڕۆین بۆ یەزد. من و کاک ئەحمەد و عەزیز

هەڵسان و گەڕاینەوە. لە ڕێگادا بە کاک ئەحمەدم گوت: بۆچی هەموو پارەکەت دا بە دایکی مورتەزا؟ گوتی: ئەو پارەیە هەموو قابلی ئەو ژنەیە چونکە ئەو کوڕەکەی لەو کارەدا مردووە، بەڵام من کوڕەکەم بەسەلامەتی بۆ هاتووەتەوە.

گوتم: ئاخر کوڕەکەی تۆش زەحمەتی کێشاوە و هیلاک بووە. گوتی: ئەوە نییە بەو پارەیە پاسکیلی کڕیوە. گوتم: تۆ ژنەکەت نەخۆشە و پێویستی بە سەردانی پزیشک و بەکڕینی دەرمان هەیە. گوتی: خودا گەورەیە. گوتم: هەر چەندە من حیسابی دەکەم لەو پارەیەی کە درا بە دایکی مورتەزا (٧) تومەنی زیادبوو، ئەم (٧) تومەنە لەکوێوە هات؟ کاک ئەحمەد گوتی: ئەویش هەر هی خۆیان بوو، هەر لەو پارەیە بوو کە تۆ هێنابووت، من سێ جار ئەو حیسابەم کردەوە، دەستیم گرتبوو بەپێ بە شیو و دۆڵێکی بەردەڵاندا دەهاتینە خوارەوە. گەیشتینەوە گوندەکەیان، چەند جارێک لە وەڵامەکە خۆی دەپاراست، گوتی: ئاخر عەزیز بەو پارەیە پاسکیلی کڕیوە. پاشان گوتی: من لە ماڵی خۆمدا خاوەنی (٧) تومەن بووم، کە ئەویش کرێی ڕستن و چنینی موو بوو، واتە گوریسیان دروست کردبوو. ئەو (٧) تومەنە ئەوەبوو، کە گەیشتینە گوندەکە دوای نیوەڕۆ بوو، یەکەمین ماڵ کە لەسەر ڕێگامان بوو لاماندا، نانێکیان پێداین، نانخواردنی ئێوارەی ماڵی کاک ئەحمەد و من کە میوانیان بووم، ئەو تەنها نانە بوو، نزیکی ئێوارە بوو، عەزیز گوتی: وەرە بابڕۆین پەپوولە بگرین، لە کێوکانی دەوروبەر پەپوولەی جواروجۆر هەبوو، بەڵام ژمارەیان کەم بوو، جۆرەکەشیان کەم بوون. بەڵام جوان بوون، کۆتایی مانگی مورداد (ئاب) بوو، گژوگیا وشک ببوو، بەڵام عەزیز (٢-٣) کیلۆ ڕەگی گیایەکی خۆراکیی بۆ خواردنی ئێوارە کۆکردەوە. شەویش کاک ئەحمەد دووبارە یادەوەرییەکانی خۆی بۆ گێڕاینەوە، یادەوەریی ڕاوچییە پارەدارەکان و لەناچوونی دارستانەکان، باسی چاکەی خەڵکانی کرمان و یەزد و شارەکانی دەوروبەری کەوێری دەکرد. ناوی سەدەها ڕاوچی هێنا، کە ئەو دەیناسین، گوتم: کە تۆ ئەو هەموو خەڵکە دەناسیت بۆچی سەردانی ئەوانت نەکردووە؟ گوتی: خۆمن سواڵکەرنیم، من تەنها دەچمە بەردەرگای کەسێک، کە کوڕەکەی چاوەکانی لێ سەندووم. من سەردانی هیچ کەسێکی تر ناکەم. چەند کەس لە ڕاوچییانی یەزد و کرمان و ڕەفسنجان هاوکارییان بۆمن هێناوە، بەڵام لێم وەرنەگرتوون، خودا گەورەیە. خودا زۆر لەوان گەورەترە. گوتم: دەتۆ وەرە بۆ یەزد. گوتی: بێم چیبکەم. گوتم: وەرە دەستفرۆشی بکە و تۆ دەنگێکی زۆر خۆشت هەیە، لەوێ گۆرانی بڵێ، بەڕاستی ئەو دەنگی هەموو گیانلەبەرێکی دەگوتەوە، کە ئەوەش هونەرە، دەنگی کەڵەشێری بەجۆرێک لاسایی دەکردەوە، کە خەڵکی وایاندەزانی لەو شوێنە کەڵەشێر هەیە. گوتی: خۆ من ئیتر ناتوانم لەم خانوچکەیەدا بژیم، زۆر

حەزدەکەم منداڵەکانم بچنە قوتابخانە، خۆم بەنیازم چەند ڕۆژێکی تر سەردانی شاری یەزد بکەم، یەکێک لە ڕاوچییەکان خەڵکی شاری یەزدە و چەند جارێک وەک شارەزا لەگەڵیدا ڕۆیشتووم بۆ ڕاو گوتوویانە، ئەگەر بچم بۆ یەزد ئەوا هاوکاریم دەکات. خۆ هەموو ڕاوچییەکان وەک بێژەن و باوکی بێویژدان نین. من تەنها جارێک گوێم لێنەبوو، کە ئەم پیاوە ناڵە ناڵ بکا و جوێن بدات و یا نزای خراپ بکات، کاک ئەحمەد لەدایکبووی ساڵی (١٣١٠-١٩٣١) بوو، تەمەنی (٣٣) ساڵ بوو، پیاوێکی گەورە و کەتە و بەهێز بوو. شەو چەند پارووە نانێکمان بە هەندێک گیای کێویەوە خوارد کە لەگەڵ کەمێک ڕۆن لەسەر ئاگر سورکرابووەوە.

## دایکی مورتەزا

بەیانی تازە خۆر هەڵاتبوو، کە مەعسومە خانم و دوو کچە بچووکەکەی گەیشتنە ماڵی کاک ئەحمەد. دەبوایە زوو بکەوینەڕێ، هەموو کەلوپەلەکانی مەعسومە خانم، بنەگونییەک بوو، پارەکانیشی کردبووە نێو کیسەکەوە لە ملی خۆی کردبوو. ماڵئاواییمان لە ماڵی کاک ئەحمەد کرد و کەوتینەڕێ. نزیکەی دوو کاتژمێر ڕێگەمان بڕیبوو، گەیشتینە گوندێک هەر دوو کچەکە زۆر هیلاک ببوون. مەعسومە خانم گوتی: دەڕۆم بزانم ولاخێک بە کرێ ناگرم. ئەو ڕۆیشت و ولاخێکی بەکرێگرت. منیش لە ماڵێک هەندێک نان و پەنیرم کڕی. مەعسوومە خانم دوو گۆزەی کڕی، گۆزەکانمان پڕکردن لە ئاو و خستمانە نێو خورجێنی ولاخەکەوە. هەر دوو منداڵەکەشمان سواری ولاخەکە کرد. نان و پەنیر و ئاومان خوارد چوارقۆڵی بەرەو بەهاباد کەوتینەڕێ. ژنێکی نەخۆشی جەرگ سووتاو، دوو کچۆڵە بە ئومێدی چارەنووسێکی باشتر ڕێی یەزدیان گرتبووەبەر. کچەکان قسەی سەیر سەیریان دەکرد، دەیانگوت دەچین چاومان بە مورتەزا دەکەوێت، مەعسومە پرسی: کوڕەکەمتان لە کوێ بە خاک سپاردووە؟ دەتوانم بچمە سەر گۆڕەکەی؟ گوتم: بەڵێ، ڕۆژێک دەچین... نان و پەنیری دەخوارد و بەدوای ولاخەکەدا ڕایدەکرد و سوپاسی خودای گەورەی دەکرد و هێواش هێواش دەگریا، ولاخەکە زۆر بەخێرایی دەڕۆیشت.

مەعسومە دەبوو بەدوایدا ڕاکات، مەعسومە هەشت ڕیاڵ کرێی ولاخەکەیدا تاکو بەهاباد. نزیکی نیوەڕۆ بوو، کە گەیشتینە بەهاباد، عەسر پیکابێک دەڕۆیشت بۆ یەزد، هەمان پیکاب بوو، کە من و عەزیز پێی هاتبووین، بەهەمان شێوە بگرە خراپتریش، لە بەهابادەوە ڕۆیشتینە بافق. ڕێگای نێوان بافق و بەهابادمان بەدوو شەو دوو ڕۆژ بڕی. لە بافقەوە تاکو یەزد بە پاسەکەی کاک علی حسێن هاتینەوە. ڕۆژی سێیەم گەیشتینە

گەراجی حاجی عەلی چی. مەعسومە بە (٦٣٠٠) تومەن تا نیوەڕۆ بووە، خاوەنی خانووی خۆی کە لە نزیک بازاڕی غولام عەلی سیا بوو.

خانوویەک بە ڕووبەری نزیکەی (٢٢٠م٢) کە چوار ژوور و هەیوانێک و ژێرزەمین و بیرێکی ئاو. کاتێک خاوەن خانووەکە زانی بێوەژنە و دوو منداڵی هەیە، (٢٠) تومەنیشی خاتر گرت. ژیانی ئەو ژنە و دوو منداڵەکەی لێرەدا زۆر بەکورتی باسی دەکەم، ئەگەر تەمەن مەودا بدات، ئەوا لە جێگایەکی تردا دەینووسم. مەعسومە بەڕێنمایی کەسێکی شارەزا لە کاروباری ڕستندا دوو ئامێری قوماش چنینی کڕی و بەدوو کرێکارەوە، خەریکی کاری چنین بوو، کچەکانیشی چوونە قوتابخانە کچە گەورەکەی ساڵی (١٣٥٣-١٩٧٤) لە زانکۆی ئەسفەهان وەرگیرا.

مەعسومە لەگەڵ کچەکانیدا شاری یەزدیان جێهێشت و ڕۆیشتن بۆ ئەسفەهان. کچە گەورەکەی بوو بە مامۆستای بیرکاری لە ساڵی (١٣٨٥-٢٠٠٦) دا خانەنشین کرا. کچە بچووکەکەشی بووبە پەرستار و لە ساڵی (١٣٨٦-٢٠٠٧) دا، لە یەکێک لە نەخۆشخانە حکومیەکانی ئەسفەهان دوایین ساڵی خزمەتی بوو. مەعسومە خۆیشی چووە قوتابخانەی شەوانە و فێری نووسین و خوێندنەوە بوو، کاتێک کە ماڵی چوو بۆ ئەسفەهان، کارگەکەشی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ئەسفەهان، لە ساڵی (١٣٨٨-٢٠٠٩) دا کارگەیەکی گەورەی هەبوو کە نزیکەی (٤٥٠) کرێکارکاریان تێدا دەکرد. لەو ساڵەدا و لە تەمەنی (٦٦) ساڵی دا کارگەکەی فرۆشت و بەپارەکەی خەریکی کڕین و فرۆشتنی زەویی بوو. ساڵی (١٣٨٦-٢٠٠٧) ڕۆژێک میوانیان بووم، خانوویەکی گەورەی جوانیان هەبوو، لە گەڕەکی مەردئاوچی ئەسفەهان، لە هەمان ساڵدا ببووە خاوەنی بازاڕێک کە زیاتر لە (٢٠) دوکانی تێدا بوو. یەکێک لە زاواکانی لەلای خۆیەتی و کاری بۆ دەکات، هەمیشە جوانترین و باشترین ئۆتۆمبێل لە حەوشەکەیاندایە. شوفێرەکەشی هەمیشە چاوەڕوانی فەرمانی حاجی خانم دەکات، شوفێرێک بە ئۆتۆمبێلێکی بیجۆوە، خەریکی شت کڕینی ماڵەکەیەتی، حاجی مەعسومە خێرەومەندە و سەرپەرشتی دەیان منداڵی بێکەس دەکات، و لە چەندین کاری تری خێرییدا بەشداریی کردووە.

## بەسەرهاتی کاک ئەحمەد و عەزیز

با بگەڕێینەوە بۆ بەسەرهاتی کاک ئەحمەد، چەند ڕۆژ دواتر کاک ئەحمەد ماڵەکەی هێنا بۆ یەزد، لە ژوورێکی کرێدا، لە یەکێک لە کاروانسەراکانی پشتی میر چەقماق نیشتەجێ بوون. ژنەکەشی لە نەخۆشخانە خەوێنرا و پیاوێکی خێرخواز تێچووەکەی گرتە ئەستۆی خۆی. ئەم ژنە کەمئەندامە لە نەخۆشخانەوە گواسترایەوە بۆ شوێنی تایبەتی کەمئەندامان، ماوەیەکی زۆر لەگەڵ نەخۆشی سیل دا ململانێی کرد. کاک ئەحمەد دەستفرۆشێکی سادە بوو، چەندین ساڵ لە دەوروبەری میر چەقماقی یەزد و شەقامی پەهلەوی کۆن دەگەڕا و شتی دەفرۆشت. دوکاندارەکان پێیاندەگوت، کە لاسایی ئاژەڵەکان بکاتەوە، ئەویش وەک خۆیان لاسایی دەنگی زۆربەی ئاژەڵەکانی دەکردەوە. وەکو ورچ هاواری دەکرد. ئەو هەرگیز سواڵی نەدەکرد. بەڵام زۆر جار خەڵکی گسک و گوریسیان بەچەند بەرامبەر لێدەکڕی. یەک دوو ساڵ عەزیز دەستی باوکی دەگرت و بەشەقامەکاندا دەیگێڕا. عەزیز دەچووە قوتابخانە و کاتێ کە دەهاتەوە لەگەڵ باوکیدا گوریس و حەسیر و خەڕەک و خورمایان دەفرۆشت. ئەو سەردەمە خەڵکی بافق بەگەڵای خورما حوشتر و گوێدرێژ و ورچیان دروستدەکرد. کە بەهەموویان دەگوت کەڵەشێری خورما. من چەند ساڵێک هەواڵم لە عەزیز نەبوو، لە زانکۆی مەشهەد وەرگیرام و ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) لیسانسم وەرگرت، هەر لە زانکۆش سەربازییم تەواوکرد. وابزانم بەهاری (١٣٥٢-١٩٧٣) بوو، کە عەزیز بۆ زیارەت هاتبوو بۆ مەشهەد، ناونیشانی منی لە هاوڕێ بافقیەکەم وەرگرتبوو، هاتە سەردانم ئەو قۆناغی ئامادەیی پێ تەواو نەکرابوو، وەک کرێکارێک لە کانی ئاسنی بافق کاری دەکرد. لەبارەی کارە قورسەکەیەوە قسەی بۆکردم بەدرێژایی چەندین ساڵ چەندین هەزار پەپوولەی کۆکردبووەوە. نەیدەزانی لە کوێ بیانفرۆشێت، کە هاتە لام منیش ناونیشانی دوکانی ئەرمەنییەکانم پێدا، لە چوار ڕێیانی ئەستەنبوڵ سەرەتای شەقامی شا -

# شازادەی حه مام

جمهـوری ئیسـتا- بازاڕیـک هەیە لە نێـو بـازارەکەدا دوکـانی یەکەم، کە قاوەفرۆشـە یەکێکیان ناوی ئیستپانە. عەزیز ڕۆیشت و ماوەیەک هیچ هەواڵی ئەوم نەدەزانی. سـاڵی (١٣٦٨-١٩٨٩) لە زانکۆی فیردەوسی مەشهەد، خەریکی وانە وتنە وەبووم، نامەیەکم لە سویسراوە بۆ هاتبوو، نامەکە عەزیـز نووسـیبووی، یەکێک لە هاوڕێکانی پێیگوتبوو، کە مـن لە زانکۆی مەشـهەد وانە دەڵێمەوە. ئەو لە نامەکەیدا نووسـیبووی، کە لە سویسـرا دادەنیشـێت و ناونیشـانی خـۆی بـۆ نووسـیبووم، نووسـیبووی ئەگەر ڕۆژێـک ڕێمکەوتە سویسـرا دەبێت سـەردانی بکەم، نووسیبووشـی بەبینی مـن خۆشـحاڵ دەبێت، ژمـارەی تەلەفـۆنی خۆیشـی بـۆ نووسـیبووم. چەنـدین جـارلە نەورۆزدا کـارتی پیرۆزبـایی بـۆ ناردووم. چەند سـاڵێک دواتر بەگەشتێکی (١٠) ڕۆژی ڕێمکەوتە سویسرا، گوتم: واباشـە بـڕۆم عەزیـز ببینم، لە پشـتی دوایـن کـارت، کە بـۆی نـاردبووم، ناونیشـان و ژمـارەی تەلەفـۆنی نووسـیبوو. لە شـاری بـۆرن کۆنفراسـێک هەبـوو، کە دوو ڕۆژی دەخایانـد، منیش لەو کۆنفراسەدا بەشداربووم. بەنیازبووم (٨) ڕۆژ لە سویسرا بمێنمەوە، تەلەفۆنم بۆ عەزیز کرد و گوتم: من لە سویسرام. زۆری پێخۆش بوو، گوتی: دوای کۆنفرانسـەکە دەبێت میوانی مـن بیت! پاش چاکوچۆنی پێمگوت، ناونیشـانەکەم لایە و خـۆم دێم بـۆ ماڵتان ڕۆژ و کاتژمێرمان دیاریکرد. دەبوایە لە بۆرنەوە بچمە ژنێڤ، چونکە عەزیز لە نزیک ژنێڤ دادەنیشت. کۆنفرانس تەواوبوو منیش بە تاکسی بەرەو ژنێڤ کەوتمەڕێ، کاتێک تاکسی منی بردە لای ماڵیـان خـانوویەک لە بـاخێکی گەورەدا کە پڕبوو لە گوڵ، سەرم سوڕما، وامزانی هەڵەم کردووە، سێ جار سەیری ناونیشانەکەم کردەوە. شـەقام و ژمارەی مـاڵ هەرهەمـان ئەوە بـوو، کە لە ناونیشـانەکەدا نووسـرابوو، بـاخێک بـوو کە زیاتر لە (٢٥) هەزار مەتر و خـانوویەکی گەورەو جوانی تێدابوو، بەپارەی ئەو خـانووە دەتـوانرا تەواوی بەهابـاد و بـافق بکڕیـت. گـوتم: بەخـودا عەزیـز لەم بـاخ و خـانووەدا باخەوانە. کۆڵانەکە هێمن بوو، تەنانەت باڵندەش دیـار نەبوو، خەریکبوو زەنگ لێبدەم، کەسـێک لە پەنجەرەیەکـی گەورەوە بـانگی لێکـردم، بەزمـانی فەرەنسـی گـوتی: ڕەنـگە بەڕێزتان کاک حسێن بن، گوتم: بەڵێ، کڵاوەکەی سەری داگرت و ڕێزێکی زۆری لێنـام. دەرگـایەکی گەراجـی گەورەی بەروومـدا کـردەوە و دەسـتی درێژکـرد و جانتـاکەی لێـوەرگرتم. جانتـاکەم جلـوبەرگ و چەنـد پـاکەت پـاقلاوەی حـاجی عەباسـی خەلـیفەی تێدابوو. خەڵکی یەزد لە وڵاتێکی ئاوهـادا چ پێویسـتی بەدیـارییە، پاسەوانەکە بەزمـانی فەرەنسی و زۆر بەئەدەبەوە، گوتی: کاک عەزیـز چـاوەڕوانی ئێوەیە. منیش زۆر سـەرم سوڕمابوو لە جوانی ئەو باخ و گوڵ و گوڵزارە. هێشـتا چەنـد هەنگاوێک نەڕۆیشـتبووم، کە دەرگـای کۆشـکەکە کـرایەوەو لە سـەرەوەی پلیکانەکـانەوە یەکێـک هـاواریکرد، ئەی

بەخێربێیت. پیاوێکی (٤٥) ساڵەی کەشخە بەجل و بەرگێکی جوانەوە، دەستەکانی کردەوە تا من لەباوەش بگرێت. بەڵێ.. ئەوە عەزیز بوو، عەزیز خاوەنی ئەم خانووە بوو. خێزانەکەشی خەڵکی سویسرابوو، زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم. کچێکی بچووکی (٧-٨) ساڵە دەستی منی گرت و گوتی: باوکم بەمنی گوتووە کە مامەم دێت، تۆ مامی منیت. کورە شەش ساڵانەکەشی بەفارسی و بە فەرەنسی لە هەواڵی منی پرسی.. عەزیز کچێک و کوڕێکی هەبوو، من لە ساڵۆنێکی زۆر گەورەی ڕازاوەی کریستاڵیدا وەستابووم، سەرگەرمی سەیرکردنی خانووەکە بووم. خزمەتکارەکەی ڕێنوێنی کردم بۆ ژوورێک، خانووەکە سێ نهۆم بوو، (١٦) ژوور و چەند ساڵۆنی گەورەی هەبوو، کتێبخانەیەکی جوان و گەورەی تێدا بوو، ئەو ژوورەی، کە بۆ من دانرابوو، کتێبخانەیەکی جوان و گەورەی تێدابوو، حەمامێکی گەورەی تێدابوو، هەر بەتەنیشت ژوورەکەوە شوێنی مەلەکردن هەبوو. سیستەمێکی ئەلکترۆنی زۆر نایاب دانرابوو، کاتی عەسر بوو، عەسرانەیەکمان پێکەوە خوارد و هەواڵی باوکی و خوشکەکەیم پرسی. عەزیز گوتی: باوکم لە سویسرایە، ماڵی لە نزیک ماڵی خۆمانە، و شەو دەچین سەردانی دەکەین، بەڵام پێشتر ئاگاداری ناکەین و کتوپڕ دەچین تا بزانم تۆ دەناسێتەوە. بۆ نانخواردن دەچینە لای ئەو بەڵام پێینالێم کە تۆ هاتوویت. دایکی عەزیز ساڵی (١٣٥٣-١٩٧٤) لە یەزد مردبوو. خۆیشی کۆتایی ساڵی (١٣٥٣-١٩٧٤) هاتبوو بۆ سویسرا، بۆ یەکەمجار ڕێکخراوێکی کۆکردنەوەی پەپوولە ئەویان بانگهێشتی سویسرا کردبوو، تا فێری کۆکردنەوە و ئاگادارکردنی پەپوولە ببێت. ئەو لە کۆتایی ساڵی (١٣٥٤-١٩٧٥) دا بەیەکجاری لە سویسرا جێگیربووبوو. هەر زۆر زوو بۆخۆی ببوو بە بازرگانی پەپوولە. لە ماوەی چەند ساڵێکدا فێر ببوو، کە کام جۆری پەپوولە نایابە و جۆرەها پەپوولەی جیهانی دەناسی، ئەو گوتی: ساڵی (١٣٦٠-١٩٨١) ساڵێکی باش بوو بۆ من، بە چەند شێخێکی عەرەب ئاشنا بووم، کە حەزیان لە جۆرەکانی پەپوولە بوو، یەکێک لەوانە پەپوولەی زۆر نایابی دەویست، ڕۆژێک وێنەی پەپوولەیەکی جوانی بۆ هێنابوم و گوتی: ئەم پەپوولەیە لە باشووری ئەرژەنتین دەستدەکەوێت، وێنەکەی پێدام و گوتی: ئەگەر ئەم پەپوولەیەت بۆ پەیداکردم بەهەر نرخێک بێت من دەمەوێت. منیش ڕۆیشتم بۆ ئەرژەنتین چوار مانگم پێچوو تا چوار دانە لەو پەپوولەیەم دەستکەوت. خۆ لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا چەند هەزار پەپوولەی ترم گرت (١٠-١٢) کرێکار و ئۆتۆمبێل و پێویستییەکانم پێبوو. نیوەی سەرمایەی ئەو کاتەی خۆم واتە (٤٠) هەزار دۆلارم خەرج کرد بۆ گرتنی پەپوولە، بە دەیان سندوقی پەپوولە و بە چوار دانە پەپوولەی جوانەوە گەڕامەوە بۆ سویسرا. هەواڵم بۆ شێخە قەتەرەییەکە نارد، کە

پەپوولەکانم هێناوە. کاتێک چاوی بە پەپوولەکان کەوت دەیان جار ماچی کردم و گوتی: چەندت بدەمێ؟ منیش لە دەمم دەرچوو گوتم: (٤٠٠) هەزار دۆلار. بەبێ وەستان چەکێکی نووسی و پێیدام. بەم پارەیە خۆم گرت و دەستمکرد بە کاسپی کردن، وردە وردە سەرمایەکەم زیاتر دەبوو، ئێستا هەموو ڕێکخراوەکانی پەپوولە من دەناسن. ئێستا لە جیهاندا کڕیاری یەکەم و سوودوەرگری یەکەم منم. دوای من ڕێکخراوی لێکۆڵینەوەی پەپوولە دووەمە. هەر پەپوولەیەک کە من و ئەو ڕێکخراوە نەمانەوێت، واتە بێکەڵکە. من بەشێوەی جیاواز ئەمانە دەستەبەندی دەکەم بۆ وڵاتانیان دەنێرم، ئەم پەپوولانە کڕیاری باشیان هەیە، ئێستا من لە چەندین وڵاتی جیهاندا هاوبەشم هەیە، کە ئەوان پەپوولەم بۆ دەنێرن و فێرمکردون، کە چۆن پەپوولە بگرن و چۆن بیانپارێزن لە نەخۆشیی و چۆن دەستەبەندییان بکەن و ئاگاداریان بکەن. ئەگەر حەز دەکەیت سبەی دەچین دامەزراوەکەم ببینە هەر (٤٠ کم)، لێرەوە دوورە لە شاخێکە هەر لە وڵاتی سویسرا.

دیارە عەزیز بازرگانی پێستەی بەنرخیشی دەکرد، وتم ئەی ئەم خانووەت چۆن کڕی؟ گوتی: یەکێک لە هەوادارانی پەپوولە لێرە نیشتەجێ بوو، کە پیاوێکی عەرب بوو، منیش هاتوچۆی ئێرەم دەکرد، دڵی بەخانووەکەوە نەمابوو، دەیویست بیفرۆشێت و پارەشی بەلاوە گرنگ نەبوو، منیش پێمگوت ئەم خانووەم دەوێت، ئەویش گوتی: با بۆ تۆ بێت، و چەندم پارە دەدەیتێ بەزیاد بێت. منیش سەرەتا (٢٥٠) ملیۆن دۆلارم پێدا، پاشانیش (١٠٠) ملیۆنی ترم پێدا، بەڵام خانووەکە، نرخی زۆر لەوە زیاترە کە من پێمداوە.

کێوەکانی کوردستان، کێوەکانی بەهاباد و کێوەکانی سویسرام بەیەکەوە بەراورد کرد، خەوتن لە ژێر ئاسمان و لەسەر زەوی لەسەر درک و گیادا لەگەڵ خەوتن لە ژوورەکانی کۆشکێک کە لەلایەن شێخی عەرەبەوە دروستکراوە، بەراورد دەکرد. عەزیز ئەمانەی هەموو بەدیاری خودا دەزانی، کاتێک خۆر ئاوا بوو، گوتی: کاتی بانگە، نوێژ دەکەیت؟ خۆ ئەگەر وای نەگوتایە نوێژم نەدەکرد. ژنەکەشی لە بنەماڵەیەکی سویسرایی بوو، کچی خاوەن بانکێکی بازرگانی پەپوولە بوو، ژنێکی زۆر میهرەبان و سەنگین بوو. عەزیز ساڵی (١٣٦٤-١٩٨٥) ژنی دووەمی بۆ باوکی هێنابوو. شەو هەموومان بەیەکەوە چووین بۆ ماڵی باوکی، ماڵێکی باشی هەبوو، هەموو شتێکی تەواو و جوانی تێدا بوو. ژنێکی تەمەن (٣٠) ساڵە بەجل و بەرگی پێشخزمەتیەوە دەرگای بەڕوومانـدا کردەوە. ڕێنوێنی کردین بۆ هۆڵی میوان، کاک ئەحمەد خێزانەکەی ژنێکی تەمەن (٦٠) ساڵەی ئێرانی بوو، ژنێکی زۆر بەڕێز و بوو، لیسانسی هەبوو لە دەروونناسیدا، عەزیز ئەم

ژنەی بۆ باوکی پەیدا کردبوو. کاتێک کاک ئەحمەد هاتە ژوورەوە نەوەکانی دەوریاندا. عەزیز بە باوکی گوت میوانێکمان هەیە بزانم دەیناسیتەوە یان نا، گوتم: سڵاو کاک ئەحمەد. هەر کە گوێی لە سڵاوەکەی من بوو، باوەشی بۆکردەمەوە و گوتی: حسێن هاوڕێی کۆنی خۆشەویستم. بەخێرهاتی، بۆچی زوو ئاگادارتان نەکردم تا گایەک یا مەڕێک لەبەر پێتا سەرببڕم. کاتژمێر (١٠) ی شەو خواردن ئامادەبوو، کاتێک خزمەتکارە سویسرییەکە کورسییەکانی بۆ دواوە کێشا و، کاک ئەحمەدی لەسەر کورسییەک دانیشاند و بەروانکەی بەدەوری ملیەوە پێچا، من نەمدەتوانی پێش بە فرمێسکەکانم بگرم، کە لە خۆشیدا دەهاتنە خوارەوە. عەزیز بەشێوە زمانی بەهابادی قسەیەکی لەگەڵ باوکی کرد، کاک ئەحمەدیش ئەم هۆنراوەیەی خوێندنەوە، (واندر آن ظلمت شب آب حیاتم دادند - وای لەو شەوە تاریکەی کە ئاوی ژیانی پێدام).

دوای نانخواردن کاک ئەحمەد زۆر پێداگریی کرد، کە لای ئەو بمێنمەوە. ئەو شەوە تا نیوەشەو کاک ئەحمەد یادەوەرییەکانی خۆی بۆ دەگێڕامەوە. خێزانەکەی کاک ئەحمەد ژنێکی هۆشیار و زرنگ بوو، چەند کاتژمێر هۆنراوەکانی شانامەوە حافز و مەولەوی و هۆنراوەکانی نیزامی بۆ کاک ئەحمەد دەخوێندەوە. ئەم ژنە بەڕێزە دەیگوت تواناکانی ئەحمەد بۆ لەبەرکردنی هۆنراوە یەکجار زۆرە، نزیکەی هەموو شانامە و دیوانی حافزی شیرازی لەبەرکردبوو. کاک ئەحمەد ئەندامی ڕێکخراوی نابینایانی سویسرایە، ئەو ڕێکخراوە بەردەوام کۆبوونەوەیان لە ناوەندی سویسرا و وڵاتانی دەرەوە هەیە. من (٧) ڕۆژی پڕ لە یادگاری لە سویسرابووم، وەکو شازادەیەک خزمەتیان دەکردم، سێ ڕۆژ لە ماڵی کاک ئەحمەد و چوار ڕۆژ لە ماڵی عەزیز بووم. دوایین ڕۆژ عەزیز کلیلی ئەو ژوورەی پێدام، کە تیایدا دەنووستم، گوتی: خۆت فراوانیی ماڵی ئێمەت دیوە، هەرکاتێک هاتیت بۆ سویسرا ئەم ژوورە ژووری خۆتە. ڕۆژێک لە کاک ئەحمەدم پرسی: هیچ هەواڵێکی ئەو گەنجە دەزانیت، کە بەفیشەک کوێری کردیت ؟ گوتی: بەڵێ، خودا شفای خێری بدات. دواتر گوتی: پێش شۆڕشی ئێران، باوکی بەهۆی ئالوودەبوونی بە تلیاک زۆربەی سامانەکەی خۆی لەدەستدا. کاتی شۆڕشیش کرێکارەکانی و خەڵکی تر، دەستیان بەسەر بەشێکی تری سامانەکەی دا گرت، ئەم پیاوە بەهۆی نەبوونی و دەستکورتییەوە لە ساڵی (١٣٦٧-١٩٨٨) دا کۆچی دوایی کرد. بێژەنیش هەمان ئەو کوڕەی کە فیشەکەکەی بەمنەوە نا، بەهۆی زۆر کێشانی تلیاکەوە، ئەو سامانەی لە باوکیەوە بۆی بەجێمابوو هەمووی لەدەستدا، چەند ساڵێک لەدوای مەرگی باوکی، بە ژن و منداڵەوە لەسەر شەقامی باکووری ئێران تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بوو، گوایە زۆری شەراب خواردبووەوە، لەدواییدا منداڵەکەی مرد و خۆیشی ئیلفیج بوو، پاشان

ژنەکەشی لێی جیابووەوە. چونکە هیچیان نەمابوو، دەستیان زۆر کورت ببوو، بێژەن لە شاری تاران لە ئاسایشگە دانراوە و لەوێ چاودێری دەکرێت و بەخێوی دەکەن.

نیوەڕۆیەک لە ماڵی کاک ئەحمەد بووم، چووبووم بۆ ماڵئاوایی کاک بەرائەت کە بازرگانێکی فەرشفرۆشی تەورێزی بوو، ئەویش لەوێ بوو، ئەویش هاوڕێی عەزیز بوو، لە ئێرانەوە فەرشی بۆدەهێنان. لە ماڵی عەزیز و باوکیدا لانیکەم (١٠٠) مەتر فەرشی ئاوریشیمی زۆر نایاب هەبوو، هەمووی ئەم کاک بەرائەتە لە تەورێزەوە بۆی هێنابوون، دوای نانخواردن لەگەڵ کاک بەرائەت کەوتمە گفتوگۆ، کاک بەرائەت گوتی: دیارە تۆ دەمێکە کاک ئەحمەد دەناسیت، گوتم: بەڵی، لە ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) وە دەیناسم. گوتی: دەزانیت بۆچی چاوەکانی لەدەستداوە، گوتم: بەڵێ زۆر باش دەزانم. کاک بەرائەت گوتی: ئەم پیاوە فریشتەیە و هەروەکو ئیمامی عەلی وایە. گوتم: چۆن؟ گوتی: شتێکت پێدەڵێم بەلام لای هیچ کەسێک باسی نەکەیت، چونکە ئەگەر کاک ئەحمەد بیبیستێتەوە تووڕە دەبێت. گوتم: فەرموو قسەبکە، دڵنیابە، کەس لێم نابیستێت. گوتی: کاک ئەحمەد لە ڕێگای منەوە مەسرەفی چاودێری ئەو پیاوە ئیفلیجە دەکات، کە کاک ئەحمەدی کوێر کردووە. ئەو پیاوە ئێستا پارووە نانێکی نییە، لە خانەی پەککەوتەکان لە نهۆمی خوارەوە دانرابوو. کاک ئەحمەد بەمنی گوت بەڵکو بیگوازیتەوە بۆ باشترین ئاسایشگەی تاران. کاک بەرائەت گوتی: ماوەی پێنج ساڵە مەسرەفی ئاسایشگەکە کاک ئەحمەد دەیداتە من و منیش لە ئێران دەیخەمە سەر حیسابی ئاسایشگە، کاک ئەحمەد پێیگوتووم کە نابێت هیچ کەسێک ئەمە بزانێت، بە تایبەتی نابێت بێژەن بیزانێت. تەنها عەتار، مەولەوی، حافز و ئەبوالخیر دەتوانن وەسفی کەسانی نموونەیی وەکو کاک ئەحمەد بکەن. چ کەسێک دەتوانێت چاوپۆشی لەو زوڵمە گەورە یە بکات، ئایا من و تۆ؟ دەتوانین ئاوا چاوپۆشی لە زوڵمێک بکەین، کە بەرامبەرمان کرابێت. یەکێک بەدەستی ئانقەست هەردوو چاوی کەسێک کوێربکات و هاوکاری نەکات و بێویژدانانە لەبەردەرگای خۆی دەریبکات. بەلام ئەم سەرەڕای ئەو زوڵمەش کە لێیکراوە، هێشتا دەستی یارمەتی بۆ ئەو بێویژدان و دڵبەردە درێژ دەکات.

## دانشی و بازاڕی قەزوێن

لە بەسەرهاتەکانی کاک ئەحمەدەوە با بگەڕێینەوە بۆ بەسەرهاتەکانی کەتیرەکەران، کۆتایی مانگی میهر بوو (تشرینی یەکەم) دانشی لە قەزوێنەوە گەڕابووەوە، لە ژووری ئیدارەی گەراج دانیشتبوو، کاتێک منی بینی زۆر خۆشحاڵ بوو، چاکوچۆنییەکی گەرممان کرد و گوتی: بۆیە لێرە دانیشتم تاکو تۆ بێیت و بتبینم. پێمبڵێ دایکی مورتەزا چی کردو چی ڕوویدا؟ عەزیزت چی لێکرد؟ بەسەرهاتی فرۆشتنی پەپوولەکانم بۆ گێڕایەوە، دانشی دە جار گوتی: بەچەندتان فرۆشت؟ گوتم: (٢٧) هەزار تومەن. گوتی: دەستی منتان بڕی؟ کێ بۆ ئەو مستە پەپوولەیە ئەم هەموو پارەیە دەدات؟ مەگەر خەڵکی شێتن، ئەی پارەکەتان چی لێکرد؟ هەموو چیرۆکی کارەکەی کاک ئەحمەد بەقسەی ئەو ئەحمەدە کوێرم بۆ باسکرد لەگەڵ کڕینی خانوو بۆ دایکی مورتەزا، سەرلەبەریم بۆ گێڕایەوە. دانشی گوتی: پێویستە دایکی مورتەزا ببینم، و سەرەخۆشی لێبکەم. بڕیارماندا کە بەیەکەوە بچین بۆ سەردانیان. لە گەراجی تەئمیناتی یەزدەوە تا بازاڕی غولام عەلی دە خولەک ڕێگا زیاتر نییە. گوتم: ئەی ئەسغەر چۆنە؟ گوتی: ئەسغەر لەگەڵ گرووپی کەتیرەکەران دە ڕۆژ زووتر گەڕایەوە بۆ یەزد، ڕۆیشتەوە بۆ بەهاباد. دانشی گوتی: مەقسودخان (١٦٨٠) تومەنی دابە ئەسغەر، دایکی مەقسودخانیش گیادەرما نییەکەی بە (١٢٨٠) تومەن بۆ فرۆشت بوو. بەبێ کەم و زیاد پارەکەی دابوو بەئەسغەر، بۆ ئەو ماوەیەش کە ئەسغەر گیادەرمانی بۆ ئەوان کۆکردبووەوە بۆ ئەوەش (٤٠٠) تومەنی پێدابوو. دانشی گوتی: ئەمساڵ کەتیرە باش بوو، بەڵام من تەماعم کرد دەبوایە (٢٠ ی شەهریوەر – ١٠ ی ئەیلول) کارەکەم تەواو بکردایە. بەڵام سەیرمکرد کەتیرە زۆرە دە ڕۆژ زیاتر ماینەوە. لەو ماوەیەدا باران باری، بارانەکەی بەجۆرێک بوو، کە لە ئەرز و ئاسمانەوە، ئاو هەڵدەستا، (١٥) ڕۆژ بوو هێسترەکان نەهاتبوون، کۆتایی کەتیرە بوو، هەموویان دەیانویست کەتیرەکانیان لە کێوەکان بهێننە خوارەوە،

هێستر نەبوو تا کەتیرەکانمان بهێنینەوە بۆ سەردەشت. بارانباری و ئاو چووە ژێر کەتیرەکەمانەوە و هەمووی شۆردەوە. خێمەکەشمان دڕابوو، ئاوی دادەدا، هەرچی هەمان بوو بەسەر کەتیرەکەماندادا بەڵام هیچ سودێکی نەبوو. بەرهەمی کاری (١٥) ڕۆژمان لەنێوچوو، هەموو سوودەکەشی لەو (١٥) ڕۆژدا بوو. بەڵام هێشتا ئەمساڵ داهاتمان باش بوو. بارانبارین چوار ڕۆژ بەردوام بوو. منداڵان هەموو تەڕببوون، هەتا ئاردەکەشمان تەڕ ببوو، منداڵەکان هەموو نەخۆش کەوتن و نانیشمان نەبوو، بەهەزار بەدبەختی و دەردەسەری وەکو لەشکرێکی تێکشاو خۆمان گەیاندە سەردەشت. جگە لە ئێمە سەدەها کەس لە کەتیرەکەرانی تر خۆیان گەیاند بووە سەردەشت، کۆڵانەکانی سەردەشت پڕ ببوون لە کەتیرەکەر. خەڵکی سەردەشت زۆر باشبوون بۆمان، مەقسودخان هەوڵێکی زۆریدا سەدان کەسی لە ماڵی خەڵێکدا جێکردەوە. کوردەکان چەندین ڕۆژ خواردنیان پێداین، و جلوبەرگیان دا بە منداڵان. ئێمە تەنها مەقسودخانمان بینی بوو، وامانەزانی هەموو کوردەکان دەوڵەمەندن بەڵام ئەم ڕووداوە وایکرد کە بچینە ماڵە کوردە هەژارەکانیشەوە، خانووی زۆربەیان لە خانووەکانی بەهابادی ئێمە خراپتر بوون، ئەوانیش دووچاری هەژاریی ببوون. مەقسودخان و چەند بازرگانێکی تر لەڕووی سامانەوە لە ئەوانی تر جیاواز بوون. کەسانێک ئێمەیان لە ماڵەکانی خۆیاندا داڵدەدابوو کە خۆیان نان نەبوو بیخۆن. بەڵام ئەوان سەرەتا ئێمەیان تێردەکرد، (١٨) کەس لە گرووپی عەلی مەحمودی کە ئەویش سەرکارێک بوو وەکو دانشی، لە ماڵی کوردێک سێ ڕۆژ میوان ببوون، دوایی زانیبویان کە خاوەن ماڵ خۆی و ژن و منداڵەکەی ئەم سێ ڕۆژە چووبوونە تەویلەی وڵاخەکانیانەوە، بەخودا ئێمە ئەو کارە بۆخۆیشمان ناکەین. جا چ بۆخەڵکانی نەناسراو، لەدوای بارانەکە هەموو کەتیرەکەران دەیانویست بێن بۆ مەهاباد ئۆتۆمبێلی مام ئارام هەموو، خەڵکەکەی پێنەدەگوێزرایەوە. جادەی سەردەشت بۆ مەهاباد بە کەتیرەکەران داپۆشرابوو. هەر کەسە بەچەند نانێکەوە بەپێی پیادە بەرەو مەهاباد کەوتبوونە ڕێگا. نزیکەی (٩٠٠) کەس لە دەوروبەری سەردەشت بووین باران بووە هۆی ئەوەی هەموومان لە کێوەکانەوە سەرەو خوار ببینەوە. زۆربەی خەڵکەکە لە سەردەشتەوە بەپێ هاتن بۆ مەهاباد. من ڕۆژی چوارەم منداڵەکانم یەکراست لە مەهابادەوە بەڕێکرد بۆ یەزد، خۆم (٣-٤) ڕۆژ مامەوە، تا حیسابەکەم لەگەڵ مەقسودخان دا بکەم، مەقسودخان کێشی کەتیرەکەی پێدابووم. بۆ بازرگانە قەزوێنییەکانی نووسی بوو کێشی ئارد و شەکر و چا پارەی هەموو نووسیبوو. (٢٠) ی میهر گەیشتمە قەزوێن، هەمان بازرگان کە تۆش بینیبووت، دوو ڕۆژ خەریکی لێکدانەوەی حیسابەکەی من بوو، ئەو هەموو کرێیەکەی ئێمەی بە (٥٦٠٠)

تومەن حیساب کردبوو، کەتیرەی بەهەرزان دەستکەوتبوو، من بەڵننامەم ئیمزاکرد بوو، بەڵام ئەوان کەتیرەیان بە نرخی ساڵی پار بۆ حیسابکردبووم. لە ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) سۆڤیەتییەکان نرخی کەتیرەیان لە (٤٥٪) زیادکردبوو، بۆ ئەمساڵ ئەگەر کەتیرەیان بە نرخی ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) حیسابکردایە ئەوا (٢٢) هەزار تومەنم وەردەگرت، بەڵام بە نرخی ساڵی (١٣٤١-١٩٦٢)، من (٥٦٠٠) تومەن قەرزدار دەبوومەوە، هەرچەندە هەوڵمدا قسەم لەگەڵ کردن، هیچ سوودی نەبوو. ڕۆیشتم بۆلای حاجی ئەبو توراب، ئەو حاجیەی کە بۆ مەراسیم چووینە ماڵیان. کەوتمە قسەکردن لەگەڵیدا. گوتم: حاجی بۆچی بەم جۆرە حیسابم لەگەڵدا دەکەن، گوتی: بەڵێننامە... بەڵێنامەیە. گوتم: من خوێندەوارییەکی باشم نییە، بەڵام تۆ دەتەوێت نرخی کەتیرە بە نرخی ساڵی پار لەمن بکڕیت. ئاخر ئەوە ویژدان نییە... زۆرم قسە لەگەڵ کرد، بەڵام هیچ سوودی نەبوو. پاشان گوتم: تۆ گوتت، ئەگەر زیانمانکرد دەیخەینە سەر حیسابی ئەبولفەزڵ عەباس، ئێستا خودا هەڵناگرێت دوای شەش مانگ وەکو گوێدرێژ کۆڵبەریمان کردووە بە (٥٦٠٠) تومەن قەرزدارییەوە بەرەو یەزد بڕۆمەوە. حاجی گوتی: من لەگەڵ ئەبوفەزڵ عەباس دا هاوبەشم نەک لەگەڵ تۆدا. گوتم: کەواتە حاجی هەرچی نان وخواردنێکی لە مەراسیمەکەدا کە پێتداوین لەپارەکە بیگێڕەوە. گوتی: حیسابکراوە. من گەڕامەوە و لە حاجی میرزا عەباس نووسەری حاجیم پرسی، گوتی: (٢٧٥) تومەنم هەقی خواردنی نانی بەیانی و نانی ئێوارە لەسەر تۆ نووسیوە. گوتم: من، وامزانی پارەی ئەومەسرەفە لەسەر حیسابی ئیمام حسێنە، میزرا گوتی: بازرگانەکان سەرەتا، سەد بەرامبەر زیاتر لەوە لە خەڵک وەردەگرنەوە. پاشان لەسەدا یەکی بۆ ئیمام حسێن خەرج دەکەن. ئەم کارانە و مەراسیم و پێدانی خواردنی بەیانی و ئێوارە بۆ بازارگەرمییە، نووسەری ئەم دوو بازرگانە بەحیساب موسڵمانە، گوتی: (٥٦٠٠) تومەن چۆن دەدەیت؟ گوتم: نیمە تابیدەم. گوتی: برۆ حەواڵە (چەکی پارە) بکرەو بیدەرە ئێمە، بەڵام دوو شاهید پشتی حەواڵەکە واژۆ بکەن، گوتم: حەواڵە ناکرم سەیرم کرد دوو حەواڵەی (٢٥) هەزار تومەنی لەبەر دەمم دانراون تا واژۆیان بکەم، گوتم: ئەوە حەواڵەی (٢٥) هەزار تومەنییە. گوتی: ئەی باشە سوودەکەی تا ساڵێکی تر چی لێدێت؟ گوتم: ئەم قسانە هی خۆتە یا هی حاجییە؟ گوتی: ئەگەر من ئەو قسانەم بکردایە نووسەری حاجی نەدەبووم، بەڵکو لە جێگای حاجی دەبووم. گوتم: من تاسبەی لە قەزوێن دەبم سبەینێ حەواڵەکان واژۆ دەکەم. ئاغا میرزا نارەحەت بوو بەڵام چارەشی نەبوو، ڕۆیشتم بۆ فەرمانگەی تەلەفۆن. بروسکەم بۆ مەقسودخان نارد کە سبەی کاتژمێر (١٠) بەیانی لەلای تەلەفۆن بێت، تا قسەی لگەڵدا بکەم، سبەینێ بەسەرهاتەکەم بە مەقسودخان گوت، ئەویش گوتی:

سبەی خۆم دێم بۆ قەزوێن، مەقسودخان خۆی گەیاندە قەزوێن، بەیەکەوە چووین بۆ مـاڵی حـاجی، هەردوو حـاجی لە ژوورەوە بـوون مەقسـودخان گـوتی: ئەمسـاڵ سـاڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) یە بـۆچی ئێوە کەتیـرەی دانشـی بەنرخـی سـاڵی (١٣٤١-١٩٦٢) دەکڕن؟ هەردوو حـاجی گوتیـان دانشـی بەڵێننـامەی بەم شـێوەیە واژۆ کـردووە. ئەگەر بەڵێننامەکەی واوژ نەکردایە نەماندەنارد بۆ کوردستان. ئێمە چوار مانگی تەواو پارەی شەکر و چا و هەموو پێویستیەکانی ئەوانمـان دابین کردوە. مەقسودخان گـوتی: ئەو پارەیەی کە ئێوە پێتان داوە تەنها کرێی ئۆتۆمبێلە. ئەو شەکر و چا و ئاردەش ئێوە بە قەرز پێتان داوە، هەردوو حاجی گوتیان بەڵێننامە، بەڵێننامەیە. مەقسودخان گوتی: جا ئەگەر وابێ ئەوا منیش یەک کیلۆ کەتیرەتان لە کوردستانەوە بۆ نانێرم. خۆم کەتیرەکە دەفرۆشم و لەگەڵ دانشی و سەردەستەکانی تر تەسویەی حیساب دەکەم، حاجی ئەبوو توراب ڕوویکردە مەقسودخان و گوتی: ئەمە کاسپیکردن نییە، تۆ دەیکەیت، بەڵکو ئەمە سـەرانە لێسـەندنە. مەقسـودخان گـوتی: ئێمەی کـورد شـەو و ڕۆژ زەحمەت دەکێشـین لەپێنـاو یەک پـاروەوە نـانی حەڵاڵدا. ئێسـتا ئێمە سـەرانە وەردەگـرین یـان ئێوەی دزی خاوەن تەکیە و مەراسیم؟ ئەگەر نرخی کەتیرەکە بە حیسـابی ئەمسـاڵ حیسـاب نەکەیت ئەوا هەرچـی کەتیـرە هەیە لە نێـوان هەژارانـدا دابەشـی دەکەم. حـاجی گـوتی: منـیش شـکاتت لێدەکەم. مەقسـودخان بەهەمـوو هێـزیەوە یەک زللـەی لەلاچـاوی حـاجی دا و لەسەر کورسیەکەی خستیە خوارەوە و بەزەویدا کەوت. مەقسودخان قاچی خستە سـەر سکی و دەستی لە قوڕگی توندکرد و گوتی: ئێستا لەنێوتدەبەم تا نەتوانی شکات بکەیت، من وامزانی مەقسودخان بەتەنهـایە، نەمزانی چەند کەسێکی تری لەگەڵ خۆی هێنـاوە. کوردەکانی تریش هاتنە ژوورەوە خەڵکی بـازاڕ لێمـان کۆبوونەوە. یەکێک گـوتی: بـڕۆن پۆلیس ئاگاداربکەنەوە با بەخێرایی بێن بۆ ئێرە. یەکێک لە کوردەکان گوتی: یەک پۆلیس بێتە ئێرە ئەم حاجییە وەک سەگ دەتۆپێنم. هەر چۆنێک بـوو لێکیـان کردنەوە، بڕیـاردرا چوار پیاوی ڕیش سپی بێن و هەمـووان بەیەکەوە کێشـەکە چارەسـەر بکەن. لە کۆتـایی دا کێشـەکە چارەسەر کراو بڕی (١٧٨٠٠) تومەنیـان پێدام، هەڵبەت هەر کەمتر بـوو لەو پارەیەی کە پێویسـت بـوو پێمبـدەن، بەڵام گرنـگ ئەوە بـوو پارەکەیـان دا. پـاش چـوار کـاتژمێر لە ژوورەکە هـاتینە دەرەوە. مـن پـارەکەم لەبەردەم مەقسـودخان دانـا و گـوتم: خان تۆ لە کوردستانەوە لەبەر خاتری من هاتوویت. لانیکەم شتێک لەم پارەیە هەڵگرە. چاوی لێ مۆڕکردمەوە و سەیرێکی کردم باوەڕ بکە هەموو گیانم کەوتە لەرزین. دانشی گوتی: خۆ دیارە لە قەزوێن بازرگانی بەویژدان زۆرە، وەکو حاجی سوڵتان کە پیاوێکی زۆر باش بوو یا بازرگانیکی کەتیرە لە مەشـهەد حـاجی ئاغـای توتنچیـان. حـاجی ئاغـای

ئەلستیان ئەمانە هەموویان بازرگانی بەویژدان و باش بوون، بەڵام ئەم دوو حاجییە قەزوێنییە، کە لەگەڵ ئیمام عەباسدا هاوبەش بوون، کاریان قوڵبڕین بوو. ئێمە ئەمە یەکەم ساڵمان بوو کە لەگەڵ ئەواندا کاربکەین.

دانشی بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: ئەم دەڵاڵانە هەموویان خوێنمژن، خوێنی خەڵک و خوێنی کرێکار و خوێنی هەژاران دەمژن. دانشی گوتی: ئەم شایە سوپای خوێندن و سوپای بەرگری نەخۆشی دروستکردووە. دەیەوێت ئاسمانمان بەسەردا بتوێنێتەوە. دەیەوێت دەسەڵاتی دەوڵەمەندەکان زیاد بکات، هەر ئەم شایە ئەگەر دژایەتی دەسەڵاتی دەوڵەمەندەکانی بازاڕ نەکات حیسابی تەواو دەبێت. گەورەترین دوژمنی ئەم خەڵکە دەڵاڵەکانن. نەفرەتی خوایان لێبێت. باشترینەکانیان حەرامخۆر و سووخۆرن بۆ قوڵبڕینی خەڵکی سەدان سوێندی درۆ بەخودا و بە پێغەمبەر و بەئیمامی عەلی دەخۆن. دانشی گوتی: ئەگەر من لە جێگای شا دەبووم، سەرەتا حیسابم لەگەڵ دەڵاڵەکان و پاشان لەگەڵ خانەدانەکاندا دەکرد. پاش دوو کاتژمێر قسەکردن، ئینجا دانشی گوتی: پێویستە بڕۆین بۆلای دایکی مورتەزا. مەقسودخان (٣٠٠) تومەنی پێداوم تا بیدەمێ. نازانم ئەگەر مەقسودخان بیزانیایە کە پەپوولەکانی بە (٢٧) هەزار تومەن فرۆشراوە ئەو پارەیەی دەنارد یان نا. ئێستا من دەبێت بچم و ئەو (٣٠٠) تومەنەی پێبدەم. کەوتینە ڕێ و دانشی گوتی: ئەو دایکە بێچارەیە کوڕەکەی بە من سپارد بوو، من زۆر شەرمەزارم. وەرە بابڕۆین شتێکیان بۆ بکڕین. لە ڕێگادا فەرشێکی بچکولانەی کڕی، فەرشەکەی هەڵگرت و ڕۆیشتین بۆ ماڵی مەعسومە. مەعسومە کاتێ دانشی بینی دایە پرمەی گریان و گوتی: دانشی، من کوڕەکەم بە تۆ سپارد، بەڵام ئامانەتدارێکی باش نەبوویت! دانشیش دەستیکرد بە گریان و سەرەخۆشی لێکرد. دایکی مورتەزا گوتی: کە دەیەوێت بچێت بۆ سەر گۆڕی کوڕەکەی، دانشی بەڵێنی پێدا کە ساڵێکی تر بیبات بۆ سەردەشت. مەعسومە گوتی: تا ساڵێکی تر جەرگم دەبێتە کەباب. تا خۆم بەسەر گۆڕەکەی دا نەدەم و تێر نەگریم باری لەشم سووک نابێت. دانشی گوتی: دەچم بۆ بەهاباد و تا زستان نەهاتووە بیرێکی لێدەکەمەوە. کاتێ لە ماڵی مەعسومە هاتینە دەرەوە شەو بوو، دانشی گوتی: کاک حسێن من ئیتر ناچم بۆ کاری کەتیرە. کارگەی ئاسنی بافق کرێکاری دەوێت دەیانەوێت ڕێگای ئاسن بۆ بافق ڕابکێشن. دەچم بزانم چ کارێکم دەستدەکەوێت. بەڵکو شانسم هەبێت بمکەنە چاودێر. گوتی: بەخوێندەوار بوونی منداڵان و توانەوەی ئاسن و دروستکردنی ڕێگای ئاسن و کانی ئاسن و کانە مسەکانی سەرچەشمە و کارگەکانی یەزد و کرمان و بستەسازی ڕەفسنجان و بەتایبەت پەیدابوونی بیری قوڵی ئاو، یەک دوو ساڵی تر

کەتیرەکردن باوی نامێنێت. هەمان ساڵ باسی قیرتاوکردنی شەقامەکانی یەزد بۆ بافق دەکرا. پاشان گوتی: لە ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) دا تاک تاکە کرێکار بۆ کەتیرەکردن دەچن بەرەو مەهاباد، گۆڕانکاری ئابووریی و کۆمەلایەتی و تەکنەلۆژیا لە دەیەی چل دا کۆتایی سەردەمێک بوو، کۆتایی سەردەمی بەکرێگیران و ئەسیری و بێگاری و برسێتی بوو. سەردەمی کار و کریکاری دەستیپێکرد. سەردەمێک بوو، کە هەژارانیان بە جۆرێکی تر دەچەوساندەوە بەلام بارودۆخیان لە سەردەمی پێشوو باشتر بوو.

## بەسەرهاتی ئەسغەر

سەدان منداڵ و پیاوی گەورەو برسی دەڕۆیشتن بۆ کەتیرەکردن و بەبرسیێتی دەگەڕانەوە، سێ بەشی پیاون، دوای چوار مانگ کاری تاقەتپڕوکێن بەهەزار کوێرەوەریی، کە هیچ ئاژەڵێک نەیدەتوانی بەرگەی بگرێت. ئەوپەڕی (١٠٠) تومەنیان بۆ دایک و باوکیان دەهێنایەوە، نیوەی پیاوان (١٥٠-٢٠٠) تومەن کرێیان هەبوو، پیاوان بەپێیپەتی دەڕۆیشتن و بەپێیپەتی دەگەڕانەوە، جلوبەرگیان دڕابوو، کە دەهاتنەوە دڕاوتر بوون، ڕوویان لە برسان دا چرچ ببووە و کاتێک کە دەهاتنەوە زیاتر چرچ ببوون. پاداشتی چوار مانگ کارکردن، چوار مانگ نەفس شکان، چوار مانگ سەرکوتکردنی خواستەکانیان لانی هەرە زۆری (٣٠٠) تومەن بوو. تەنها ئیمتیازێک کە لەم گەشتانەیاندا ئەوە بوو کە ئەم خەڵکە ئاگادار دەبوون کە جگە لە گوندەکانی بەهاباد جێگای تریش لەم جیهانەدا هەیە و ئاگادار دەبوون کە شارانی گەورە لەم وڵاتەدا هەیە، ئاگادار دەبوون، کە جگە لە مەزهەبی خۆیان مەزهەبی تریش هەیە، درکیان بەوە دەکرد کە کەسانی میهرەبان و داوێنپاک زۆرن لەم وڵاتەدا. ئاگاداری ئەوە دەبوون کە هەموو شوێنێک وەکو بیابانەکانی ئەوان نییە، لە جێگاکانی تری ئێراندا دارستان و ڕووبار هەیە، هەستیاندەکرد کە لە بەرامبەر گەرمای سووتێنەری ناوچەکەی خۆیاندا، ناوچەی فێنک و ئاو و هەوای سازگاریش لە ئێراندا هەیە، ئەم گەشتانە زۆر شتیان فێری ئەو خەڵکانە دەکرد، لە هەمووی گرنگتر ئەوەبوو، کە زۆر بەباشی تێدەگەیشتن کە زۆر کەس بەهۆی هیلاکی و زەحمەتی ئەمانەوە سوودمەند دەبوون، ڕۆژێک لە چایخانەیەکدا لە قەزوێن خەریکی خواردنی گۆشتاو و سەوزە بووم. یەکێک لە لێپرسراوانی گروپێکی کەتیرەکە، کە ئەویش هەر خەریکی خواردنی گۆشتاو و سەوزە بوو، پێمگوت، لەم گەشتانەدا کە دەیکەیت چی دەبینیت؟ کە لە گوندەکەی خۆتاندا نییە؟ گوتی: ئەم

گۆشتاوه و ئه‌م سه‌وزه‌یه. که‌وا ئێستا ده‌یخۆم، ئه‌و گوتی: بۆ یه‌که‌مجار تۆوی پیاز و تۆی تورم له قه‌زوێن بینی و کڕیم و ڕۆیشتمه‌وه له گونده‌که‌ی خۆماندا چاندم.

ئه‌و گه‌شتانه چاو و گوێی خه‌ڵکی که‌وێری بۆ هه‌موو شتێک کرده‌وه. ئه‌مانه برسی ده‌بوون، زه‌حمه‌تیان ده‌کێشا، به‌رگه‌ی توانج و قسه‌ی ناشیرینیان ده‌گرت، به‌ڵام ئاگاداره‌بوونه‌وه که جگه له‌م جیهانه‌ی ئه‌وان جیهانێکی تریش هه‌یه. ئه‌م گه‌شتانه شێوازی تێگه‌یشتنی ئه‌وانی زیاد ده‌کرد و شێوازی فێربوونی تازه ده‌چووه مێشکیانه‌وه. ڕۆژێک پیاوێکی ته‌مه‌ن (١٦-١٧) ساڵ پێیگوتم: کاک حسێن ته‌نها ڕێگای ڕزگاربوونی ئێمه کۆچکردنه له کێوه‌کانی به‌هاباد و چوونه قوتابخانه‌یه، ئێمه له‌م کێوانه گیرۆده بووین، بۆیه ده‌بێت گونده‌کانمان چۆڵبکه‌ین. چونکه هیچ سه‌رمایه‌یه‌کمان نییه، ته‌نها سه‌رمایه‌مان چوونه قوتابخانه‌یه. گوتم: ئه‌م قسانه له کوێوه فێربوویت؟ گوتی: له مامۆستای قوتابخانه‌که‌وه، پاشان ئه‌و پرسیاری له من کرد و گوتی: ئایا ڕاستده‌کات ئه‌وها نییه؟ منیش که خۆم به‌جۆرێکی تر که‌تیره‌که‌ر بووم، بڕیارمدا که به‌رده‌وامبم له خوێندن تا له‌م چوار دیواری شاری یه‌زد ڕزگارم ببێت، قسه‌کانی ئه‌وم سه‌لماند. با بگه‌ڕێینه‌وه بۆ به‌سه‌رهاتی ئه‌سغه‌ر، هاوینی ساڵی (١٣٤٣-١٩٦٤) جارێکی تر چوومه‌وه بۆ قه‌زوێن، نزیکه‌ی یه‌ک مانگ هه‌مان کاری پێشووم کرد، واته ئۆتۆمبێله‌کان له یه‌زده‌وه ده‌هاتن و منیش ده‌بوایه کرێ و پاره‌ی گه‌راج له بازرگانه‌کان وه‌ربگرم. کرێکه‌م به‌ته‌واوی ده‌دا به شوفێره‌که و پاره‌ی گه‌راجم له ڕێگای بانقه‌وه ده‌نارده‌وه بۆ یه‌زد. شه‌وانیش له هه‌مان میوانخانه‌ی سه‌ر گه‌راجی ته‌هماسپی ده‌خه‌وتم، عه‌قڵم پێنه‌ده‌شکا، که هه‌ندێک پاره وه‌ک کرێ بۆ خۆم هه‌ڵگرم. به‌ده‌ستی به‌تاڵ هاتم بۆ قه‌زوێن و به‌ده‌ستی به‌تاڵ ده‌گه‌ڕامه‌وه بۆ یه‌زد. له گه‌ڕانه‌وه‌شدا که‌سێک نه‌یگوت مانگێکه له قه‌زوێنی و کارت بۆ ئێمه‌کردووه، ده‌ستتخۆش بێت، یا نه‌یانگوت با که‌مێک پاره‌ت بده‌ینێ. من به‌کرده‌وه ئه‌م کاره‌م به‌بەلاش ده‌کرد. عه‌قڵم پێنه‌ده‌شکا، که‌مێک پاره هه‌ڵگرم، ئه‌وانیش عه‌قڵیان پێنه‌شکا و پاره‌یان پێنه‌دام. له ساڵی (١٣٤٣-١٩٦٤) هه‌مان شت دووباره بووه‌وه. هه‌مان خه‌ڵکانی به‌دبه‌ختی چاره‌ڕه‌ش، هه‌موو ئه‌و که‌سانه‌ی برسێتی ئه‌وانی گوێڕایه‌ڵ کردبوو، له به‌رامبه‌ر هه‌موو نائارامییه‌کان شکور بوون، له هیچ جێگه‌یه‌ک نارەزاییان ده‌رنه‌ده‌بڕی، له به‌رامبه‌ر برسێتی، تینوێتی، له هه‌مووشی خراپتر نه‌بوونی توالێت بوو، کاتێک له‌سه‌ر زه‌وی گه‌راجی ئه‌تمینانی یه‌زد و گه‌راجی ته‌هماسپی قه‌زوێن ده‌خه‌وتن، سوپاسگوزاری خودا بوون، ئه‌گه‌ر جارێک خاوه‌نی کارێک یه‌ک شووشه کۆلای تێکه‌ڵی ده لیتر ئاو بکردایه و ئه‌گه‌ر پیاڵه‌یه‌ک له‌م ئاوه‌یان ده‌ستبکه‌وتایه، جه‌ژنیان بوو. ده‌یانگوت شه‌ربه‌تی بیبسیمان خواردووه، ئه‌گه‌ر که‌سێک

کەمێک چێشتی خێری پێبدانایە، هەزاران جار سوپاسیان دەکرد. زۆرێک لەم هەژارترین هەژارانی ئێران لە سالانی (١٣٣٠-١٣٤٠_١٩٥٠-١٩٦٠) زیاتر لە (٣) هەزار کیلۆ مەتری پیادە بە ئۆتومبێلی باریی و پاس دەرۆیشتن و دەگەڕانەوە، چوار مانگ کاریان دەکرد، تا بۆ تەواوی ساڵێک (٣٠٠) تومەن پارە بهێننەوە بۆ ماڵ و منداڵیان. من زیاتر لە (٦٥) کەس لە کەتیرەکەران دەناسم، کە لە تەمەنی دەوروبەری (٤٠) ساڵیدا مردوون، برسێتی نەیهێشت تەمەنێکی درێژیان هەبێت. دەیان کەس لەوانە دەناسم، کە کچەکانیان لە ماڵە دەوڵەمەنـدەکانی یەزد، کرمـان و رەفسـنجان، کـارەکەر بـوون، لەپـێش ئەمانیشـدا زەحمەتکێشـان و رەنجـدەران ببـوونە هـۆی دەوڵەمەنـدبوونی چەنـدین کەس، خـاوەنی گەراجەکـان و بازرگانـانی بـازاڕ و دوکاندارەکان بەهـۆی ڕەنجـی ئەم ڕەشـوڕووتانەوە بوونە ملیۆنێر. -ملیۆنی ئەو سالانە چەند ملیاری سالی (١٣٨٧-٢٠٠٨) بوو-. یەکێک لە دەوڵەمەنـدە خـاوەن کارگەکـانی یەزد، کە کەسـێکی زۆر زیـرەک و زانسـتخواز بـووە، دەنووسـێت دروسـتبوونی سروشـتی شـارو نـاوچە بەجۆرێـک بـووە، کە ئەگەر خەڵکـی کـاربکەن ئەوا ژیـانێکی خـۆش و باشـیان دەبێـت، و ئەگەر کـارنەکەن بەحەسـرەت و داخەوە دەمـردن. لێـرەدا پرسـیار ئەوەیە، کە ئایـا ئەوان زیـاتر کاریـان دەکـرد یـاخود کرێکارانی کارگەکانیان؟ دیارە ئەوان زیاتر ڕەنجیانداوە یا بیرهەڵکەنەکان کە لە قولایی (١٠٠) مەتـر کارێزەکـان پـاک دەکەنەوە؟ ئەوان زیـاتر کـاردەکەن یـاخود کرێکـارە دەسـتچنەکان؟ شـاگردی مسـگەرەکان، شـاگردی سـەراجەکان، ئەم کەتیـرەکەرانە؟ بەویـژدانەوە کامیـان زیـاتر کاردەکـات؟ کـام لەم شـاکردانە دوو شـەفت و سـێ شـەف کاردەکەن؟ و لە لەندەن خانوویان هەیە، پاشان کارکردن دەبێت هاوتابێت بەسەرمایە و هاوتابێت بە بەرهەمهێنانی خەڵکانی تر، چۆنییەتی ژیان لە بەرزییدا بێت. ئەوانەی کە سەرمایەیان نییە، ئەوانەی، کە دەیانەوێت نانی بازووی خۆیان بخۆن، دیارە بەکارکردن کاروباریان باشتر دەبێت، بەلام نابنە خاوەنی ژیانێکی ئاسوودە. دیارە پێناسـەی ژیانی ئاسوودە بۆ هەر کەسێک مانایەکی تایبەتی هەیە، بۆ ئەو کەسەی کە دوای پێنج سال کـارکردن دوو ڕۆژ پشـوودەدات مانـایەکی هەیە، بـۆ ئەو کەسـەش کە لەسـالێکدا شـەش مانـگ لە لەنـدەن و پـاریس دەژی مانـایەکی تـری هەیە. کاتێـک کە گـوێ لە دەردە دڵـی کەسانی وەکو دانشی، ئەکبەری تەیموری، موحسین بەگی سـالحی، میـرزای کـازمی پـور و غولامی حسێن دەهستانی دەگریت، ئەمـانە ئەنجـامی قسـەکانیان یەکێکە، یەک شـتیش بەرهەمدەهێنن. دانشی کەسێکی کێوی و کەم خوێندەوار، بەلام بەئەزموون بوو سـالەها لەپێناو کەتیرەدا بـۆ ڕۆژهەلات و ڕۆژئـاوای ئێران گەشـتی کردبـوو، بەدرێژایی نـزیکەی (٤٠) سال لە بازاڕەکانی زۆربەی شارە گەورەکانی ئێران مامەڵەی کردبوو، ئەو چەندین

ساڵ جگە لە کاتی کەتیرەکردن، بۆ کرێکاری ڕۆیشتبوو بۆ کوێت دوو ساڵیش هەر بۆ کرێکاری ڕۆیشتبوو، بۆ کاراجی و بۆمبای لە هیندستان. ئەم پیاوە زۆر باش و بەڕەوشتە، هەموو هۆکارەکانی دەزانی، ئەو دەیگوت دەبێت سەدەها مرۆڤ لەسەر دڕک و داڵ و بەسکی برسیی بخەون تا کەسێک بتوانێت لە دۆشەک و لێفەی گەرم و نەرمدا بخەوێت. ئەو دەیگوت هیچ سەرمایەیەکمان نییە، ئەگەر سەرمایەی کار و کاسپی ساڵێکمان دەبوو، تا کۆتایی ژیانمان لە پێشەوە دەبووین، یا دەیگوت من دەیان جار سەردانی بانکەکانم کردووە، ویستوومە قەرز وەربگرم، بەڵام بەڵگەی سەنەدیان دەویست ئاخر خوانەناسەکان ئێمە لەو بیابانە و لەم کوێرە گوندانەدا بەڵگەمان لە کوێ بوو؟ بانکەکانیش لە سوودخۆرەکان خراپترن. گەشتکردن بۆ شوێنە جیاوازەکانی ئێران و دەرەوەی وڵات و هێرشی بێگانەکان لە (شەهریوەری ١٣٢٠- ئەیلولی١٩٤١) دا، خۆماڵیکردنی نەوت، خەباتی خودالێخۆشبوو دکتۆر محەمەد موسەدیق، بەرچاوڕوونییەکی سیاسیان پێدابوو، ئەو دەیگوت ئەم چاکسازییانەی زەویوزار و خۆماڵکردنی لەوەڕگاکان لە بەرامبەر چاکسازی بازاڕدا سفرە، بێ هۆ نییە، کە نیما یوسیج دەڵێت :

**من از این دونان شهرستان، نیم - خاطره پرورد کوهستانی ام**
**کز بدی بخت در شهر شما - روزگاری رفت و هستم مبتلا**

واتا:

**من لە زەبوونانی نێو شارەکان نیم - یادەوەریی، پەروەردەی کوێستانەکانم**
**کە من بەد بەختم لە شاری ئێوە - ڕۆژگار تێپەڕی و من گیرۆدە ماوم**

یەکێک لە ماناکانی پێشکەوتن شارنشینییە، شەهریار لە هۆنراوە بەرزەکەیدا (حەیدەربابا) چەند جوان دەڵێت "چاک، ئێمەیان بەناوی پێشکەوتنەوە فریوداوە".

لە کۆتایی (مورداد ١٣٤٣- ١٠ی ئابی ١٩٦٤) بەیانی بوو لە هەیوانی گەراجی ئەتمیناندا دانیشتبووم، چاوەڕوانم دەکرد تا گەشتیار بێن و بلیتیان بۆ ببڕم. ژنێک، کە بەبەژن و باڵایدا دیار بوو، کە لادێیە، هاتە گەراجەکە و سڵاوی کرد، منیش وەڵامم دایەوە. گوتی: بلیتی مەهابادم دەوێت. گوتم: ئۆتۆمبێلمان نییە بۆ مەهاباد. گوتی: لە کام گەراجەوە دەتوانم بچم بۆ مەهاباد؟ گوتم: هیچ گەراجێک ڕاستەوخۆ لە یەزدەوە ناچێت بۆ مەهاباد، دەبێت بڕۆیت بۆ تاران و لەوێوە بڕۆیت بۆ مەهاباد. قسەکانی بە تێکەڵوپێکەڵی دەکرد نیگەرانی لە ڕەنگ و ڕوویدا دیار بوو، بەشێوەزاری بەهابادی قسەی دەکرد، گوتی: ئاخر من هەرگیز نەچوومەتە تاران، دەترسم لە تاراندا ون ببم.

گوتم: بۆچی دەتەوێت بچیت بۆ مەهاباد؟ گوتی: کوڕەکەم نەخۆش کەوتووە و لە نەخۆشخانەیە. نیگەرانیەکانی زیادیکرد، دەموچاوی تەواو تێکچووبوو. گوتی: باشە من چیبکەم، خۆ دەبێت زۆر زوو بگەمە مەهاباد؟ گوتم: کوڕەکەت لە مەهاباد چی دەکات؟ بە گریانەوە گوتی: کوڕەکەم ڕۆیشتبوو بۆ کەتیرە. ڕۆیشتبوو گیادەرمانی کۆبکاتەوە، ئێستا بروسکەیان بۆ کردووم، کە لە نەخۆشخانەیە، دەترسم شتێکی خراپ ڕوویدا بێت، دەبێت زوو بگەمە مەهاباد. کاتێک گوتی کوڕەکەم ڕۆیشتبوو بۆ کۆکردنەوەی گیادەرمانی، دڵم ڕاپەڕی، گوتم: کوڕەکەت ناوی چییە؟ گوتی: ناوی ئەسغەرە. گوتم: ئەسغەر بۆچی نەخۆشە؟ گوتی: نازانم... گوتم: بروسکەکەت لایە؟ گوتی: بەڵێ، لامە. دەستی برد بۆ باخەڵی و بروسکەکەی دەرکرد و دایەدەستم، نووسرابوو، "بەهاباد – یەزد پۆلیس گوندی ... دایکی ئەسغەر، سڵاو ئەسغەر لە نەخۆشخانەی شێر و خورشیدی مەهابادە، تکایە بەزوویی وەرە بۆ مەهاباد.. برات موکەڕەم.." گوتم: پاریش کوڕەکەت ڕۆیشتبوو بنۆکەتیرە؟ گوتی: بەڵێ. گوتم: پار (١٦٨٠) تومەنی بۆ هێنابوویەتەوە؟ گوتی: بەڵێ. تۆ ئەمە چۆن دەزانیت؟ گوتم: من حسێنم هاوڕێی ئەوم. گوتی: تۆ هاوڕێی ئەسغەریت؟ گوتم: بەڵێ.. دایەپرمەی گریان و گوتی: توخودا.. ڕێنوێنیم بکە چۆن بچم بۆ مەهاباد.. دەترسم کوڕەکەم وەک مورتەزای لێ بەسەرهات بێت، دەترسم چاوم پێینەکەوێتەوە. کەمێک بیرم کردەوە و گوتم: من لەگەڵتا دێم بۆ مەهاباد. ئاهێکی قوڵی هەڵکێشا و گوتی: لەگەڵما دێیت؟ یەکەم ئۆتۆمبێلی تاران دوانیوەڕۆ بەڕێدەکەوت. هەواڵم نارد بۆ دایکم کە من دەڕۆم بۆ مەهاباد. گوتی: تۆ بەڕاست لەگەڵما دێیت بۆ مەهاباد؟ گوتم: بەڵێ. دوانیوەڕۆ کەوتینەڕێ. (١٦٨٠) تومەنی داهاتی ساڵی ڕابردووی ئەسغەر هاوکارییەکی باش بوو، دایکی دەیتوانی بەو پارەیە سەردانی مەهاباد بکات. بۆ سبەینێ لە تاران بووین و ڕۆژی دواتریش پێشنیوەڕۆ گەیشتینە نەخۆشخانەی مەهاباد. ئەسغەر ماوەی شەش ڕۆژ بوو، بێ هۆش بوو، هێشتا هۆش خۆی نەهاتبووەوە. یەکێک لە سەرپەرشتیارانی کەتیرە، کاک ڕەحمەتوڵلا لە نەخۆشخانەکە بوو، ئەفزەڵیش لەوێ بوو. دایکی ئەسغەریان بردە لای پزیشکەکە. پزیشک گوتی: ئەوی لەدەستمان هاتبێت کردومانە. ئەوی تریشمان بەخودا سپاردووە. بەدایکیان گوتبوو، کە ئەسغەر لە کێو هەڵدێراوە، بەڵام ڕووداوەکە شتێکی تر بوو. با، ڕووداوەکە لە زمانی کاک ڕەحمەتوڵلاوە ببیستین.

ئەسغەر کەتیرەی کۆ نەدەکردەوە، ئەسغەر کاری بۆ ئێمە نەدەکرد، ئەو گیادەرمانی بۆ مەقسودخان کۆدەکردەوە، ئەسغەر دوو فرسەخ دوور لە سەردەشت کاری دەکرد. پیاوێکی غەریبە چاوی پێدەکەوێت کە دەزانێت بەتەنهایە، پەلاماری دەدات و لاقەی

دەكات. ئەسغەریش دەستدەكات بە هاواركردن، منداڵێكی (٨) ساڵی خەڵكی ئەو گوندانە گوێی لە هاواری ئەسغەر دەبێت، ڕادەكات بەدەم هاوارەكەوە، كە سەیردەكات وا پیاوێكی كەتەی زل خۆی بە ئەسغەرەوە نووساندووە، ئەمیش دەترسێت و خۆی لەپاڵ بەردێكی گەورەدا حەشاردەدات. منداڵەكە چاوی لێدەبێت ئەم پیاوە زلە چی لە ئەسغەر دەكات، بەڵام دەترسێت و هیچ ناڵێت. خۆ ئەگەر ئەو پیاوە، ئەم منداڵەی ببینیایە ئەوا دەیكوشت. پاش تەواوبوونی كارە قێزەونەكەی بەردێكی گەورە دەكێشێت بەسەری ئەسغەردا، ئیسقانی نێوچاوانی دەشكێنێت و بێهۆش دەكەوێت. ئەو پیاوە درەندەیە وادەزانێت كە ئەسغەر مردووە، واتە ویستیویەتی بیكوژێت. پاشان ڕادەكات و ئەو ناوە جێدەهێڵێت. ئەو كورە منداڵەش بەدەم هاوارەوە ڕادەكات و دەچێت كەتیرەكەرەكان ئاگادار دەكاتەوە، ئەوانیش بە خێرایی ڕادەكەن و دەچن بە هانایەوە و دەیدۆزنەوە پاشان ئەسغەر بەبێ هۆش دەهێنن بۆ سەردەشت. لەوێ پزیشك خوێنبەربوونەكەی دەوەستێنێت و دەڵێت دەبێت بە خێرایی ببرێت بۆ مەهاباد. ئۆتۆمبێلی پۆلیس ئەسغەر دەبات بۆ مەهاباد. كوردەكان كە دەزانن لە ناوچەكەیاندا كارێكی وا ناشیرین ڕوویداوە، كە تا ئەو ڕۆژە شتی وا لەو ناوچەیەدا ڕووی نەداوە، دەڵێن دەبێت ئەو كەسە بدۆزینەوە كە ئەم كارە دڕندانەی كردووە. بۆ هەموو لایەكیش ئاشكرا ببوو، كە ئەو كەسە كورد نییە و خەڵكی ناوچەكەش نییە. سەدەها كەس لە خەڵكی ناوچەكە بەسواری ئەسپ و بەپیادە كەوتنە گەڕان بە ناوچەكەدا بۆ دۆزینەوەی ئەو كەسە. ژن و پیاوێكی زۆریش چوونە بەردەم بنكەی پۆلیسی سەردەشت و سوێندیان خوارد، كە ئەگەر پۆلیس ئەو كەسە دڕندەیە نەدۆزێتەوە ئەوا بنكەی پۆلیس دەسووتێنن. هەواڵەكە بە هەموو لایەكدا بڵاوبووەوە. پۆلیسی مەهاباد و كوردستان و ئازەربایجانیش هاتن بەو ناوەدا بڵاوبوونەوە. تا ئەو كەسە دەستگیربكەن. مەقسودخان و دایكیشی وەك شێر دەیاننەڕاند، سەدان كرێكاری كەتیرەی مەقسودخان و هەزاران لە خەڵكی گوندەكان لە سەدان گوندەوە لای هەر بەرد و ژێر دارێكدا بڵاو ببوونەوە. ئەو كەسە دڕندەیەش زانیبووی كە بە شوێن ئەودا دەگەڕێن. ڕۆژی سێیەم لە یەكێك لە گوندەكانی نزیك مەهاباد دەستگیردەكرێت. پۆلیسەكان ویستیان بەسەلامەتی بیهێنن بۆمەهاباد. ئەو پیاوە دڕندەیە كورد نەبوو، بەڵكو خەڵكی شوێنێكی دەوروبەری تاران بوو. هەر لەوێ دانینا بە تاوانەكەیدا. خەڵكی ئەو گوندە ڕێگایان بە پۆلیس نەدا كە بیبەن بۆ مەهاباد، پەلاماریاندا و پارچە پارچەیان كرد و هەر لەوێ چاڵێكیان بۆ هەڵكەند و كردیانە چاڵەكەوە. كاك ڕەحمەتوڵڵا بەردوام بوو لە قسەكانی و گوتی: ئێستا ئەم منداڵە لە لێواری مەرگدایە. پاشان گوتی: موكەڕەم خان پێیگوتووم، كە بروسكە بكەم بۆ دایكی

نارد تا بێت بۆ ئێرە. بەڕاستی تۆش کارێکی باشتکردووە، کە هێناوتە. نزیکی نیوەڕۆ بوو، کە ژنی موکەڕەم خان و ژنی مەقسودخان و ژنی کاک عوسمانی جەعفەری هاتن بۆ نەخۆشخانە، کە منیان بینی خۆسحاڵ بوون و دڵنەوایی دایکی ئەسغەریان کرد و هیوای چاکبوونەوەیان بۆ ئەسغەر خواست. داوایان لێکردین، کە لەگەڵیاندا بڕۆینەوە بۆماڵەوە. دایکی ئەسغەر پێیگوتن ئەو لە نەخۆشخانە دەمێنێتەوە، بۆ مەگەر دەکرا کە ئەم دایکە لە قەرەوێڵەی تاقە کوڕە (١٢) ساڵەکەی کە تاقە کەسی پەیداکەری نان و بژێو و هەموو ئومێد و پشتوپەنای بوو، جیابکرێتەوە و لێی دووربکەوێتەوە. ژنەکەی کاک عوسمان گوتی: کاک حسێن تۆ ماندوویت هەڵسە بابڕۆین بۆ ماڵی ئێمە. منیش لەگەڵیاندا ڕۆیشتمەوە.

دوانیوەڕۆ دووبارە هاتمەوە بۆ نەخۆشخانە، ئەسغەر هەر بێهۆش بوو، ئێوارە موکرەم خان لەگەڵ دوو پزیشکی تایبەت لە تەورێزەوە هات. بیری لێبکەرەوە خانێکی کورد ڕۆیشتبوو بۆ تەورێز بۆ چ کارێک؟ لەبەر خاتری منداڵێکی بێ باوک، بێ کەسوکار، کە نە هاوزمانی بوو نە هاومەزهەب، چووبوو لەوێوە پزیشکی هێنابوو. موڕەکەم خان هیچ لێپرسراوێتییەکی ئەسغەری لەسەر شان نەبوو، ئەو تەنها مرۆڤ بوو وازی لەکار و ژیانی خۆی هێنابوو. دەبێت چەند هەزار تومەنی خەرجکردبێت تاوەکو منداڵێک، منداڵێکی کرێکار، کرێکاری براکەی لە مردن ڕزگار بکات. دیارە ئەو کارەی لەگەڵ ئەم منداڵە (١٢) ساڵەدا کرا. لە کوردستاندا هاوپەیوەندییەکی باشی دروستکردبوو، ڕۆژانە زیاتر لە (١٠٠) کەس لە خەڵکی مەهاباد و دەوروبەری دەهاتن بۆ هەواڵپرسین. شەو چووم بۆ ماڵی موکەڕەم خان، پزیشکەکانیش شەو لەوێ مانەوە، بەیانیش سەردانی نەخۆشخانەیان کردەوە و خۆیان ئەسغەریان تیمار کرد و پێیانگوتن کە ئەم نەخۆشە بنێرن بۆ تەورێز. موکەڕەم خان ویستی بیبات بۆ تەورێز، یاخود بۆ تاران، بەڵام پزیشکەکانی مەهاباد ڕێگەیان پێنەدا، دایکی ئەسغەر وەک شێتی لێهاتبوو. کاتێک کە زانی چ بەڵایەک بەسەر کوڕەکەیدا هاتووە. بینیبووی کە پەرستارەکان پاشەڵی بۆ دەشۆن و پاکی دەکەنەوە و دەرمانی دەکەن. لە پەرستارەکەی پرسیبوو، بۆچی کۆمیشی برینداربووە؟ پەرستارەکەش ڕووداوەکەی بۆ گێڕابووەوە. ئەو داماوە بەبیستنی ئەو هەواڵە سەدان جار نیگەرانییەکانی زیادی کرد. دەگریا و دەیناڵاند بەگریانەوە پێیگوتم: کاتێک کوڕەکەم چاکبووەوە ئیتر ناچمەوە بۆ بەهاباد.. خەڵکی گوندەکەمان قسە بەکوڕەکەم دەڵێن.. کوڕەکەم بۆ هەر شوێنێک بەرم نایبەم بۆ بەهاباد. ئێوارەی هەمان ڕۆژ ئەسغەر هاتەوە هۆش خۆی. چاوەکانی کردەوە و دایکی ناسیەوە! دایکی ئەسغەر کەوتە دۆخێکەوە پێناسە ناکرێت، ناتوانم بڵێم خۆشحاڵ و شادبوو،

وشـه‌کانی خۆشـحاڵی و شـادی کەمـن بـۆ ئەو خۆشـیەی کە لە ڕووخسـاری ئەو ژنەدا ببینم. هەستمکرد، کە ئەوەندە خۆشحاڵە ئەگەر خەڵکانی بێگانەی لێنەبوایە، دەستیدەکرد بە سـەما کردن، یەک بەخۆی هـاواری دەکرد: کوڕەکەم هـۆش خـۆی هـاتەوە. ئەسـغەر گیان هۆشی هاتەوە. بەهۆش هاتەوە... ئەو دایکە وەک شـێتی لێهـاتبوو. ئەو لەو کـاتەوە کە بروسکەکەی بەدەست گەیشتبوو، تا بە هۆشـهاتنەوەی ئەسـغەر، هیـچ نەخەوتبوو. لە یەزدەوە تـا مەهابـاد جگە لە ئـاو هیـچ شـتێکی تـری نەخواردبـوو. چەنـد جـارێکی تـر هاواریکرد: ئەسغەر بەهۆش هاتەوە، بەهۆش هـاتەوە.. لەناکـاو خۆیشـی کەوت بەزەویدا و بێهۆش بوو. ئەویشیان لەسەر قەرەوێڵەیەک لە تەنیشت کوڕەکەیەوە خەواند. دکتۆر و پەرستار لێی کۆبوونەوە چەند دەرزییەکیان لێدا، پاش مـاوەیەک هـۆش خـۆی هـاتەوە، پزیشکەکە گوتی: بێهێز و ماندووە، پێویستە پشـووبدات. پاشـان دکتـۆرەکە بەمـن و بەو سێ ژنە کوردەی ئەوێی گوت: ئەو چارەسـەرەی کە پزیشـکە تەورێزییەکـان ئەنجامیانـدا زۆر سـەرکەوتبووە. بۆ سبەی ئەسغەر بەتەواوی هۆش خۆی هاتەوە. مـن (١٢) ڕۆژ لەو ناوچەیە مامەوە چووم بۆ سەردەشت، ئەو سـاڵە کەتیرەکردن زۆر کەمبوو، دانشـی بـۆ کەتیرەکردن نەهاتبوو، دەیانگوت کانە ئاسنەکانی بـافق کرێکاری دەوێت، خەڵکێکی زۆر ڕۆیشـتبوون بـۆ کـانە ئاسـنەکان و ببـوون بە کرێکـار لە ڕێگـای ئاسـنی بـافق. ژمـارەی کرێکارانی کەتیرە نیوەی ژمـارەی سـاڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) بـوو. ڕۆیشـتم بـۆ سـەردەشـت و چووم بۆ مـاڵی مەقسودخان، گوڵەخان لاچـاوی مـاچکردم، منداڵەکانیشـیان بە بینینـی مـن خۆشـحاڵبوون. پـاش دوو کـاتژمێر مەقسـودخان هـاتەوە و هەواڵـی دایکـی مـورتەزا و عەزیـزی پرسـی، گـوتم: دایکـی مـورتەزا زۆر باشـە و عەزیـزیش بـاوکی ڕێگەی نەداوە بچێـت بـۆ کەتیرەکـردن، گوتـوویەتی کـوڕەکەم لە شـاخ هەڵـدەدێرێت. کاتێـک گـوتم: کە پەپوولەکانمـان لە تـاران داوە بە (٢٧) هەزار تـومەن، مەقسـودخان بـاوەڕی نەدەکرد، کە دڵنیا بوو، بەڕاستی پەپوولەکانمان بەو نرخە فرۆشتووە، سەری ماچ کردم. گوڵەخـانیش زۆری پێخۆشـبوو. ڕۆژێـک لە سەردەشـت بـووم، چـوار ڕۆژ لە کێوەکـانی دەوروبەری گوندەکانی بێورانی سـەروو، بێورانی خـواروو بـووم. لەلای موحسـین بەگـی سـاڵحی، کە پیـاوێکی پیـر و گەورەی کەتیـرەکەران بـوو، ئەو زیـاتر لە (٤٧) سـاڵ ڕۆیشـتبوو بـۆ کەتیرەکـردن، زیـاتر لە (٣٠) سـاڵ هـاتبوو بـۆ کوردسـتان (١٢) سـاڵ ڕۆیشـتبوو بـۆ خۆراسـان. چەنـد سـاڵیش لە زاهیـدان کەتیـرەی کردبـوو. یـادەوەریی زۆری لە کەتیرەکردندا هەبوو. دەیگوت لە ساڵی یەکەمی کەتیرەکردنەوە بیرمکردبووەوە کە پاش دوو سێ سـاڵ لە کـارکردن، بـۆ خـۆم سـەرمایەیەک بەدەستدەهێنم و ئیتـر خـۆم بەو پارەیە کـار و کاسـپی دەکەم. بەڵام بیرکـردنەوەکەم هەڵە بـوو، ئەم دەڵاڵ و بازرگانـانە

بەجۆرێک دەمانچەوسێننەوە و خوێنمان دەمژن کە نەکەوینە سەر پێی خۆمان و دەبێت تا مردن کار بۆ ئەوان بکەین. ئەوان بێ ماندووبوون و هیلاکی ساڵ بەساڵ داهاتیان باشتر دەبێت و دەوڵەمەندتر دەبن، ڕەحم بەهیچ کەسێک ناکەن، حکومەتیش هاوکاری ئێمە ناکات، من (٤٧) ساڵە کاردەکەم هەر ساڵە و کارم بۆ سەدان کەس پەیداکردووە. ئەم حکومەتە و ئەم بانکانە (٢٠) هەزار تومەن بەمن نادەن تا چاوم لەدەستی سووخۆرەکان نەبێت. شەوێکی مانگەشەو بوو، لەبەر ئاگر دانیشتبووین، موحسین بەگ دەردەدڵی خۆی دەکرد، هەندێک کەس وایاندەزانی، کە ئەم پیاوە هەژارە پشت چەماوەیەی کەوێر هیچ نازانێت، بەڵام پیاوێکی زۆر تێگەیشتوو بوو، شەوی دووەم کاک موحسین لەبارەی خوداڵێخۆشبوو دکتۆر محەمەد موسەدیق و خۆماڵیکردنی نەوت، مەلا مستەفا، بەعسیەکان قسەی بۆ دەکردین، زۆر بەڕێزەوە باسی دکتۆر موسەدیقی دەکرد و دەیگوت دکتۆر موسەدیق، ڕاپەڕی و خۆماڵیکردنی نەوتی ئێرانی گرتە ئەستۆی خۆی. زۆربەی وڵاتانی کیشوەری ئەفریقیا تەنانەت جەزائیریش لە ژێر دەستی ئیمپریالیزمدا بوو، کەناڵی سویس خۆماڵی نەکرا بوو، خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران یەکەمین خۆماڵیکردنی جیهانی سێیەم بوو. موحسین بەگ کە (٤٧) ساڵ سەدەها مرۆڤی بۆ رزگارگردن لە مەرگ و برسێتی لەگەڵ خۆیدا لە بەهاباد و بافق و یەزدەوە بردووە بۆ کێوەکانی خۆراسان و کوردستان. دەیگوت خۆزگە بەڕێز موسەدیق لەبری خۆماڵیکردنی نەوت سەری ئەم دەڵاڵ و بازرگانانەی پانبکردایەتەوە. چونکە بەڕاستی ئەوان زۆر لە ئینگلیز خراپترن. کاک موحسین دەیگوت ئێمە هەموو شتێک دەزانین، بەڵام دەستمان کورتە، ناتوانین هیچ بکەین، بەڵام ڕۆژێک دێت، کە ئەم خەڵکە هەژارە تۆڵەی خۆیان لە زۆردارەکان دەکەنەوە. شەوی سێیەم بوو، هەمووان خەوتبوون، من مابووم، ئاگر مابوو، ئەستێرەکان و کۆمەڵێک بیرکردنەوە. ئەمساڵ کەس پەپوولە ناگرێت، کەسێک گیادەرمانی کۆنەدەکردەوە، یا ئەگەر منداڵان کاری تریان بکردایە، من ئاگادار نەبووم، مردنی مورتەزا هەمووانی غەمبارکرد بوو، دیارە زۆر کەس مردنی مورتەزایان بیستبوو. بەڵام هیچ کەسێک نرخی پەپوولەکانی نەدەزانی، نازانم ئەگەر نرخی پەپوولەکانیان بزانیبایە بە هیچ جۆرێک پەپوولە لە کوردستاندا نەدەما و هەموانیان دەگرت. خەڵکەکە هەمووی مات و مەلوول بوون، هەمو برسی و نائومید بوون کەسێک نەبوو، کە ئارەزووییەکی هەبێت، گەورترین ئارەزووی پیاوان تێکردنی سکی ژن و منداڵەکانیان بوو، گەورەترین ئارەزووی هەندێک لە منداڵانیش کڕینی پاسکیل بوو. ئەم خەڵکە کە بەیانیان لە خەوهەڵدەستان پارووە نانێکی وشکیان لەگەڵ چایەکدا دەخوارد و ڕێگای کێوەکەیان دەگرتەبەر و قەدی بڕە گوێنییەکانیان بریندار

دەکرد. ڕۆژانی تریش شیلەی کەتیرەکەیان لێدەکردەوە و دەیانکردە نێو ئەو تووبەرەیەی کە بەملیاندا هەڵواسرابوو. زۆربەشیان نیوەی هەقدەستی کارەکەیان هەر لە سەرەتاوە وەرگرتبوو. بەو پارەیە ئازوقەیان کڕیبوو بۆ ژن و منداڵ، بۆ دایک و خزمەکانیان ناردبووەوە. کاتێک لە کێوەوە گەڕامەوە بۆ سەردەشت دووبارە هەمووان خۆشحاڵبوونەوە و مەقسودخان (١٠٠) تومەنی پێدام کە بیدەم بەدایکی مورتەزا، گوتم: ئەو وەزعی زۆر باشە. گوتی: قەیدی ناکە، ئەوەی بۆ ببە. گوتم: دایکی مورتەزا دەیەوێت بێت بۆ سەردەشت بۆ سەر گۆڕی کوڕەکەی، وابڕیاربوو دانشی لەگەڵ خۆیدا بیهێنێت، بەڵام ئەمساڵ دانشی نەهات بۆ کەتیرەکردن. مەقسودخان گوتی: بە دایکی مورتەزا بڵێ ئەگەر هات بۆ مەهاباد بچێت بۆ لای براکەم، چەند لە مەهاباد و سەردەشت بمێنێتەوە ئەوا میوانی ئێمە دەبێت و لە یەزدەوە تا سەردەشت و گەڕانەوەشی هەر چەند پارەی خەرجکرد ئەوە لەسەر حیسابی من دەبێت. پاش (٥) ڕۆژ گەڕامەوە بۆ مەهاباد و ئەسغەر باشتر ببوو، وردە وردە بەپێی خۆی دەڕۆیشت و خواردنیشی دەخوارد. دایکیشی باشتر ببوو. دایکی ئەسغەر ناوی بیبی جان بوو، سەیدیش بوو. بە بیبی جانم گوت من دوو ڕۆژی تر دەگەڕێمەوە بۆ یەزد، تۆ چی دەکەیت؟ گوتی: من لە کوڕەکەم جیانابمەوە، بەم منداڵەشەوە بۆ بەهاباد ناگەڕێمەوە. بۆ هەر شوێنێکی تری جیهان بڕۆم بەڵام بۆ بەهاباد و بافق ناڕۆم. من ناتوانم پێش بە قسەی خەڵکی بگرم. پێمگوت ئەگەر پێتخۆشە لەگەڵ ژنی کاک عوسمان جەعفەری یا ژنی مورەکەم خان قسەدەکەم تا لێرە لە مەهاباد کارێکت بۆ بدۆزنەوە. ئەگەر تۆ لێرە دەمێنیتەوە، ئەوا من پێیان دەڵێم... کەمێک بیری کردەوە، گوتی: لێرە؟ گوتم: ئەی بۆ کوێ دەچیت؟ گوتی: باشە ئەگەر لێرە کار هەبوو ئەوا دەمێنمەوە. ڕۆیشتم بۆ ماڵی کاک عوسمانی جەعفەری، لەگەڵ خێزانەکەیدا قسەم کرد و ئەویش گوتی: بەجەعفەری دەڵێم و پاشان ئاگادارت دەکەمەوە. شەو کاک عوسمانی جەعفەری و خێزانەکەی هاتن بۆ نەخۆشخانە بۆ سەردانی ئەسغەر. خێزانی کاک عوسمان بە بیبی جانی گوت، ئەگەر دەتەوێت لە مەهاباد بمێنیتەوە لە ماڵی ئێمەبە و کوڕەکەشت دەنێرینە قوتابخانە. بیبی جان گوتی: بمێنمەوە چیبکەم؟ ئەویش گوتی: لە ماڵی ئێمە کاربکە. بیبی جان قبوڵی کرد. کاک عوسمانی جەعفەری گوتی: خواردن و خەوی خۆت و کوڕەکەت لەسەر من، مانگی (٣٠) تومەنیشت پێدەدەم. نزیکەی (١٢) ڕۆژ بوو لە سەردەشت و مەهاباد بووم، ئەو ڕۆژە ویستم بگەڕێمەوە، چووم سەردانی نەخۆشخانەم کرد، تا ماڵئاوایی لە بیبی جان بکەم. بەڵام ئەو گوتی: پەشمیان بوومەتەوە لێرە نامێنمەوە، دەڕۆم لە یەزد دادەنیشم، لەوێ کارێک پەیدا دەکەم. گوتم: بۆ لێرە نامێنیتەوە؟ گوتی: ئەمان سوننەن و پیسن.

گوتم: بەندەی خودا کێ گوتی ئەمانە پیسن؟ ئەمان موسڵمانن، مەگەر نابینیی ڕۆژی پێنج جار نوێژدەکەن؟ مەگەر نابینی چۆن خزمەتی کوڕەکەی تۆ دەکەن؟ دوو کاتژمێر قسەم لەگەڵدا کرد، تێمگەیاند، کە ئەوان موسڵمانن، زۆربەی موسڵمانەکان سوننەن. لە هەر (١٠٠) موسڵمانێک لانیکەم (٨٥) کەسیان سوننەن. پیسیش نین بەڵکو زۆریش پاکن.. ئێستا ئەگەر بگەڕییتەوە بۆ یەزد لەوێ چی دەکەیت؟ گوتی: دەڵێن کارگەی پەموو پاککردن کرێکاری دەوێت. گوتم: بەختت هەیە لە مەهاباد لەماڵی ئەم بازرگانە گەورەیەیت، ئێرە ئاو و هەوایەکی خۆشی هەیە و کاریشت بۆ پەیدابووە، ئێستا چەند مانگێک لێرە بمێنەوە، پاشان ئەگەر حەزت لێنەبوو بگەڕێرەوە بۆ یەزد. پێشمگوت: بۆ ئاگاداریت کوردەکان زۆر میهرەبانن، ئەوەتا لەبەر خاتری کوڕەکەی تۆ موکەڕەم خان چووە لە تەورێزەوە پزیشکی هێناوە. ئێتر گوتی: باشە، من لە مەهاباد دەمێنمەوە. دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ گوڵەخان و مەقسودخان لە سەردەشتەوە هاتن بۆ مەهاباد. گوڵەخان چەند جۆر مرەبای بۆ ئەسغەر هێنابوو. مەقسودخان (٤٠٠) تومەن پارەی دا بە بیبی جان و گوتی دوایی پارەی تریشی دەدەمێ. کاتێک مەقسودخان و گوڵەخان زانییان کە بیبی جان دەیەوێت لە مەهاباد بمێنێتەوە زۆر خۆشحاڵبوون. کاتی ماڵئاوایی، بە بیبی جانم گوت: نایەیت بۆ بەهاباد شتومەکەکانت بهێنیت؟ گوتی: هیچ شتێکم نییە لەوێ، تەنها ناسنامەکانە ئەوانیشم لەگەڵ خۆمدا هێناون. من دوای دوو ڕۆژ هاتمەوە بۆ یەزد. پاش(٤٠-٥٠) ڕۆژ کاتێک موحسین ئاغا گەڕایەوە بۆ یەزد، هەواڵی ئەسغەرم پرسی گوتی: زۆر باشە و لە نەخۆشخانە دەرچووە. من ئێتر نەچوومەوە بۆ مەهاباد. ساڵی دواتر کاتێک کەتیرەکەران لە مەهابادەوە گەڕانەوە هەواڵی بیبی جانم لێدەپرسین، گوتیان دەزانین کە حاڵیان باشە بەڵام نەمان بینیون.

## بینینەوەی ئەسغەر لە تاران

ساڵی (١٣٦٧-١٩٨٨)، لە زانکۆی مەشهەد وانەم دەوتەوە، ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (رشد)ی جواگرافیایی بووم، لەگەڵ خوداڵێخۆشبوو دکتۆر حسێن شکوئی کە یەکێک بوو لە باشترین جوگرافیاناسانی ئێران، ئۆفیسی گۆڤاری رشدی جوگرافیا لە تاران لە شەقامی ئیرانشەهر بوو، خەریکی پێداچوونەوەی بابەتێک بووم، بەڕێز وەحیدی شێخولئیسلامی خاوەنی ئیمتیازی گۆڤارەکە، پیاوێکی زرنگ و شارەزا بوو، من لەو ساڵەدا ڕاسپێردرابووم کە کتێبخانەی دکتۆر محەمەد گەنجی، مامۆستای دیاری زانکۆی تاران بۆ کتێبخانەی پارێزگای مەشهەد بکڕم. بەڕێز وەحیدی شێخولئیسلامی، گوتی: ئێمە دراوسێیەکی کوردمان هەیە کە چەند ساڵێکە لە مەهابادەوە هاتووە بۆ تاران، ژمارەیەک کتێب و گۆڤاری هەیە، کتێبەکانی باشن و بەکەڵکن، دەیەوێت بیانفرۆشێت، ئایا تۆ دەتوانیت کارێک بکەیت کە ئەو کتێب و گۆڤارانە بۆ پارێزگای مەشهەد بکڕیت و بەبەرەکەتی ئیمام ڕەزا، ئەم کتێبانە بەپارێزراوی بمێننەوە. لەو ساڵەدا (١٥) ڕۆژ جارێک دەڕۆیشتم بۆ تاران. بڕیارماندا جاری دواتر لەگەڵ وەحیدی شێخولئیسلامی بۆ بینینی کتێبەکان سەردانی ماڵی ئەو برا کوردە بکەین. پاش چەند ڕۆژێک ئاگاداری کردمەوە کە خاوەنی کتێبەکان ئێمەی بۆ نانخواردنی ئێوارە بانگهێشتکردووە. بەڕێز وەحیدی شێخولئیسلامی پێیگوتم کە دراوسێ کوردەکەیان کەسێکی زۆر ڕۆشنبیر و زیرەکە. خۆی بازرگان بووە، بەهۆی جەنگەوە هاتووەتە تاران، سەرجەم کتێبەکانیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. لە ماڵەوە جێگەیان نییە، کتێبەکانی لە ژێرزەمینی خانووەکەدا داناوە. پاش (١٥) ڕۆژ کە چوومەوە بۆ تاران لەگەڵ وەحیدی شێخولئیسلامی چووین بۆ ماڵی ئەو پیاوە. کاتێک چووینە ژوورەوە کاک وەحید بەم جۆرە منی پێناساند، گوتی: بەڕێز جەعفەری، منیش هاوارمکرد بەڕێز جەعفەری من حسێنی یەزدم. حسێنی یەزدی (٢٥) ساڵ لەمەوبەر، ئەوکاتە تەمەنم (٤٠) ساڵ بوو،

ئاغـای جەعـفەری تەمەنـی (٨٤) سـاڵ دەبـوو، ئەم پیـاوە بەڕێـزە چەنـد خولەکێـک منـی لەبـاوەش گـرت و بەکـوردی بـانگی خێـزانەکەی کـرد و چەنـد قسـەیەکی کـرد. کاتێـک خێـزانەکەی هـات و گـوتی: ئەم پیـاوە دەناسـیت، ئەویـش چەنـد چـرکەیەک وەسـتا و سـەیریکردم، گوتی: تۆ حسـێنی یەزد نیت؟ گوتم: بەڵـی ئەوم، حسـێنم. ئەو ژنە تەمەن (٧٦) سـاڵە مـاچی کـردم و پـاش (٢٥) سـاڵ زۆر بـاش منـی ناسـییەوە. کـاک وەحیـد شێخولئیسـلام سـەری سـوڕما بـوو گـوتی: ئێـوە زۆر بـاش یەکتـری دەناسـن. کـاک عوسمانی جەعفەری چیرۆکی یەکتر ناسین و هـاتوچۆی نێوان تـاران و مەهابـادی لە سـاڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) دا و بەسـەرهاتەکانی تـری بـۆ کـاک وەحیـد گێـڕایەوە. لەکـاتی نـانخوارنی نیـوەڕۆدا لە کـاک عوسـمانی جەعفەریـم پرسـی: ئەسـغەر و دایکـی چیـان بەسـەرهات؟ مـن لە سـاڵی (١٣٤٣-١٩٦٤) بەدواوە هـیچ هەواڵێکـی ئەوانـم نەدەزانـی. خێزانی جەعفەری گوتی: بیبی جـان سـاڵ و نیوێک لە مـاڵی ئێمە دا بـوو، نـازانم ئـاو و هەوای مەهابـاد بـوو یـا خـواردن و خـۆراکەکەی بـوو یـاخود هەردوکیـان، دەموچـاوی سوور و سپی ببوو، ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەنگوڕووی جوانتر دەبوو، ئـاخر ئەم بەندەی خودایە بە ژنێکی (٤٥) ساڵە مەزەندە دەکرا، لەکاتێکدا تەمەنی (٢٧) سـاڵ زیـاتر نەبوو. لە (١٥) ساڵیدا منداڵی ببوو. پیاوێکی خانەدانی مەهابادی ژنەکەی مردبوو، سێ منداڵی بەسەردا کەوتبوو، ناوی مـحەمەد عومەر بوو، ئەم پیاوە ناسیاوی خۆمـان بـوو، زۆر هـاتوچۆی یەکتریمان دەکرد، تەمەنی نزیکەی (٥٠) ساڵ دەبوو، گوزەرانی زۆر باش بـوو، موڵکێکی زۆری لە مەهابـاد و دەورەبەری هەبوو، ئاژەڵێکی زۆریشـی هەبوو، کەسێکی سیاسـیی بوو، لەشـولارێکی بەهێز و جوانی هەبـوو، زۆر ژن و کچ دەیانویسـت شـووی پێبکەن. بەڵام ئەو بیبی جانی خۆشدەویست و بیبی جانی خواست. ئێستا سێ منـداڵی لێی هەیە. پاشـان گـوتی: ئەسـغەریش چـوو بـۆ قوتابخـانە و زۆر زیـرەک بـوو، هاوینـان دەچـوو گیادەرمانی کۆدەکردەوە، لە تـاران دبلۆمی وەرگرت و لە بەشـی دەرمانسـازی زانکۆی تـاران وەرگیـرا. سـاڵێک دوای شۆڕشـی ئێـران زانکـۆی تەواو کـرد. بـاوکی (مـحەمەد عومەر) بۆ خوێندنی زیاتر ناردی بۆ بریتانیا. ساڵی (١٣٦٣-١٩٨٤) گەڕایەوە بۆ ئێران لە زانکۆ خەریکی کـارکردنە، کەواتە دۆزینەوەی دکتـۆر ئەسـغەر لە زانکـۆ، کـارێکی ئاسـان بوو. بۆ سبەینێ تەلەفۆنم بـۆکرد، زۆرخۆشـحاڵ بـوو. لە تـاران چەنـدین جـار یەکتریمـان دەبینی. ئێستا ژنی هێناوە و دوو منداڵیشی هەیە. بڕیارماندا هەر کاتێک دایکی هـات بـۆ تـاران ئاگـادارم بکـاتەوە، تـا بچـم بـۆ دیـدەنی بەڵام هەر ڕێکنەکەوت، یـا کاتێـک دایکـی دەهات بۆ تاران من لەوێ نەبووم یا کە من لە تاران بووم ئەو لە مەهاباد بوو.

## بینینەوەی چاوەڕواننەکراوی بیبی جان

ساڵی (١٣٨٣-٢٠٠٤) بانگهێشتکرابووم بۆ وڵاتی ئەفریقای باشوور، لە تارانەوە تا دوبەی بە فڕۆکەی ئێران ڕۆیشتم، دەبوو لە دوبەی تا جۆهانسبورگ بە فڕۆکەی دوبەی بڕۆم. لەوێش دەبوایە چوار کاتژمێر لە فڕۆکەخانەی دوبەی چاوەڕێبم. کاتێک کە بەرەو هۆڵەکە چووم ژنێکم بینی کە جانتایەکی قورسی پێبوو، منیش هاوکاریم کرد، لە هەڵگرتنی جانتاکەدا. هەر بەهۆی ئەو هاوکارییەوە کەوتینە قسەکردن. ئەم ژنە تەمەنی (٦٥) ساڵ بوو، ژنێکی ڕێکوپێکی وریا بوو، لێی پرسیم: تۆ بۆ کوێ دەچیت؟ گوتم: بۆ ئەفریقای باشوور دەچم. گوتم: ئەی تۆ بۆ کوێ دەچیت؟ گوتی: دەچم بۆ لەندەن بۆ لای منداڵەکانم. ئەم ژنە گوتی: من هەمیشە لە تارانەوە ڕاستەوخۆ دەڕۆیشتم بۆ لەندەن، بەڵام ئەمجارە بلیت نەبوو، بۆیە ناچار بووم بلیتی دوبەی وەربگرم. داوای لێکردم، کە ڕێنمایی بکەم. چونکە ئەویش دەبوو سێ کاتژمێر و نیو لە فڕۆکەخانە بمێنێتەوە، بڕیارماندا بڕۆین بەیەکەوە چایەک بخۆینەوە. گوتم: تۆ خەڵکی کوێیت؟ گوتی: خەڵکی مەهابادم، گوتم: کوردیت؟ گوتی: بەڕەگەز کورد نیم، بەڵام نزیکەی (٤٠) ساڵە لە مەهابادم و پیاوەکەم کوردە.

گوتم: منیش لە مەهاباد چەند ئاشنایەکی کۆنم هەیە، گوتی: کێ دەناسیت؟ گوتم: زۆر کەس، بنەماڵەی جەعفەری کە بازرگانە و کەسێکی خوێنەریشە، بەڵام ئێستا چەند ساڵێکە لە تارانە. گوتی: کاک عوسمانی جەعفەری و خێزانەکەی زۆر باش دەناسم. گوتم: موکەڕەم خان کە برای مەقسودخانی ناودارە، ئەویش دەناسم. گوتی: موکەڕەم خان چەند ساڵێکە مردووە! بەڵام مەقسودخان تەمەنی لە دەوروبەری (٨٥) ساڵیدایە. گوتم: گوڵەخانی دایکیشیان دەناسم. گوتی: گوڵەخان نزیکەی (٢٠) ساڵە مردووە. گوتم: تۆ هەموو ئەوان دەناسیت. گوتی: بەڵێ هەموویان دەناسم. پاشان گوتی: تۆ خەڵکی

کوێیت؟ گوتم: من خەڵکی یەزدم. گوتی: چۆن ئەمانە دەناسیت؟ گوتم: نزیکەی (٤٠) ساڵ لەمەوپێش لەگەڵ کەتیرەکەراندا ڕۆیشتووم بۆ کوردستان.

ئیتر سەیرێکی کردم و پاشان جوانتر سەیری کردمەوە و یەک مشتی بەمێزەکەدا کێشا کە کەسانی دەورەبەرمان هەموویان ئاوڕیاندایەوە. گوتی: تۆ حسێنی پاپولی نیت؟ گوتم: بەڵێ... ئەوم... گوتی: منیش... دایکی... ئەسغەرم! من لە جێگاکەی خۆم هەڵسام و گوتم: تۆ بیبی جانیت؟ گوتم: من بەبەردەوامی هەواڵی تۆم لە دکتۆر ئەسغەر پرسیوە. ئەویش گوتی: کوڕەکەم هەمیشە باسی تۆ دەکات، منیش زۆر حەزم دەکرد، کە چاوم پێت بکەوێت. دوو جاریش هاتم بۆ تاران بەڵام تۆ لەوێ نەبوویت. گوتی: ئەمڕۆ کە بەڕێکەوتم، ئەسغەریش لە فرۆکەخانە بوو، چۆنە یەکتریتان نەدیوە؟ گوتم: دنیا ئەوهایە، من پێش سێ مانگ ئەسغەرم بینیوە، بەڵام ئەمڕۆ لە فرۆخانەی تاران نەمبینی. بەڵام (٤٠) ساڵە تۆم نەدیوە، کەچی ئەوەتا لە فڕۆکەخانەی دوبەی دەتبینم. گوتی: سەرەتای ساڵی (١٣٤٤-١٩٦٥) هەر لە مەهاباد لەگەڵ پیاوێکی کورددا هاوسەرگیریم کرد. لێی پرسیم: ئەسغەر ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕاویتەوە؟ گوتم: بەڵی، بۆی باسکردووم. هێشتا دوو کاتژمێر کاتمان مابوو. بیبی جان، لەبارەی ژیانی خۆی و باشی کوردەکانی مەهابادەوە قسەی بۆکردم. گوتی: پاش (٤٠) ساڵ من ئێستا خۆم بەکورد دەزانم. گوتم: بیرتدێت لە باسکردنی شیعە و سوننەدا دەترسایت؟ گوتی: وەڵڵا عەقڵم پێنەدەشکا، ئێستا هاوسەر و منداڵەکانم سوننەن و من و ئەسغەریش شیعەین. هەرگیز لەسەر سوننەبوون و شیعە بوون کێشەمان نەبووە. گوتی: دەزانیت ئێستاش ئەسغەر بۆ کۆکردنەوەی گیادەرمانی لە هەفتەیەکدا یەک، دوو ڕۆژ خوێندکارەکانی دەبات بۆ کێوەکانی ئێران؟ گوتم: بەڵێ دەزانم چەند جارێک هاتووە بۆ مەشهەد و بەیەکەوە چووین بۆ کێوەکانی شیروان. بیبی جان گوتی: نزیکەی (٢٠) ساڵ دەبێت، هەموو ساڵێک بۆ ماوەی مانگێک تا مانگ و نیوێک دەچم بۆ لەندەن بۆ سەردانی منداڵەکانم. گوتم: ئەو سەردەمە ناخۆشە بەسەرچوو، کە لە بەهاباد بوون. گوتی: من هەمیشە هەوڵدەدەم کە وا بیربکەمەوە، لە مەهاباد لەدایکبووم و هەرگیز بەهابادم نەدیوە. گوتم: لەوکاتەوە کە چوویت بۆ مەهاباد هیچ جار چوویتەوە بۆ یەزد؟ گوتی: هەرگیز لە یەزد و بافق و بەهاباد کارێکم نەبووە. دایک و باوک و هاوسەرەکەم مردبوون، لەوێ جگە لە هەژاریی و بێداریی و برسێتی و ڕق و کینە شتێکی ترم نەبوو. هەرگیز نامەوێت یادی ئەو ڕۆژە پڕ نەهامەتیانە بکەمەوە. بیبی جان گوتی: ئێمە لەو ئەشکەوتانەی بەهاباد گرفتار بووین، هیچمان نەدەزانی، مرۆڤ پێویستە گەشت بکات، تا خەڵکانی تر بناسێت. گوتم: بێ هۆ نییە کە خودای گەورە فەرموویەتی: (سیروا في الارض). گوتی: پیاوەکەم

سوننەیە بەڵام منی ناردە قوتابخانەی گەورەکان و فێری خوێندەواریی بووم. ئێستا زمانی ئینگلیزی یش دەزانم. گوتم: یادەورییەکانت بنووسەوە. گوتی: ناتوانم ڕۆژێک تۆ وەرە بۆ مەهاباد من دەیانڵێم و تۆش بیاننووسەوە.. بە ئومێدی ئەو ڕۆژە.

**کۆتایی**

**سوپاس و پێزانین:**

لە ناخی دڵەوە سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی هەر یەک لەو ئازیزانەی خوارەوە دەکەم کە بێگومان ئەگەر ماندووبوون و دڵسۆزیی ئەوان نەبووایە، هەرگیز ئەم کتێبە نەدەگەیشتە دەست خوێنەران:

- فەرەیدون حەکیم زادە کە بەرگەکانی ١ و ٢ و ٣ ی فارسییەکەی پێشکەشکردم.
- د. کارزان محەمەد کە بەرگی چوارەمی فارسییەکەی پێشکەشکردم.
-ساڵح بێچار کە زۆر بەوردی پێداچوونەوە و دارشتنەوەی بۆ وەرگێرانەکە کرد.
- عەتا مەحمود خاوەنی چاپخانەی کارۆ بۆ هاوکاریی و ڕێنماییەکانی.

وەرگێڕ



**تەها سێکانیانی و محەمەد حسێ، پاپلی یەزدی**

**نووسەر و وەرگێڕی کتێبەکە، مەشهەد، هاوینی ٢٠١٧**



شازادەی حەمام .. بیرەوەریی نووسەرێکە لە قاڵبی ڕۆماندا.یاخود ڕۆمانێکە بە ستایلی گێرانەوە بەڵام گێرانەوەیەکی پڕ چێژ وسەرنجڕاکێش.
شوێن و کاتی بەشێکی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ( شازادەی حەمام) لە شارەکانی مەهاباد و سەردەشتی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە و نووسەر زۆر واقیعییانە و بە ویژدانەوە باسی چاکە و میهرەبانی کورد دەکات و ڕاستی و حەقبێژیی دەخاتە سەرووی مەسەلەی دەمارگیریی نەتەوەیی و ئایینییەوە.
شازادەی حەمام..لێوانلێوە لە ئەزموونی تاڵ و شیرین کە هەر یەکێک لەو ئەزموون و بەسەرهاتانە دەبنە مایەی لێڕامانی خوێنەر و کاریگەریی لەسەر دنیابینی جێدەهێڵێت.
شازادەی حەمام ... پەیوەندییە چینایەتییەکان لە گۆشەنیگایەکی جیاوازتر لەوەی هەیە، پیشاندەدات و زۆر نهێنی شاراوە ئاشکرا دەکات

## ساڵح بێچار

بەرگ : ئیبراهیم ساڵح



[بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە]
٠٧٥٠١١٧٣٩٢١٠
هەڵەبجە

نرخ : ١٠٠٠٠